سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٣

# بریسکەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٣

# بریسکەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

Nawrasi, Said
نورسی، سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹۶۰م.
بریسکه کان / به دیعوززه مان سه عیدی نوورسی؛ دایناوه فاروق ره سوول یه حیا.--
تهران: احسان، ۱۳۸۵.
۸۶۴ص.--(سه رجه می په یامه کانی نوور؛ ۳)
ISBN: 964-356-432-0
کردی.
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کتابنامه: به صورت زیرنویس.
۱. اسلام -- عقاید. ۲. تفاسیر اهل سنت -- قرن ۱۴. ۳. ایمان. الف. یحیی، فاروق رسول، ۱۹۵۰ - م، مترجم. ب. عنوان.
۴ب ۹ن/BP۲۰۳ ۲۹۷/۴۱
کتابخانه ملی ایران ۸۴-۱۰۰۲۷م

# بریسکه‌کان

مؤلف: بدیع‌الزمان سعید نورسی
مترجم: فاروق رسول یحیی
ناشر: نشر احسان
تیراژ: ۱۰۰۰ نسخه
نوبت چاپ: اول - ۱۳۸۵
چاپ: چاپخانه مهارت

فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران - خیابان انقلاب - روبروی دانشگاه - مجتمع فروزنده - شمارهٔ ۴۰۶ - تلفن: ۶۶۹۵۴۴۰۴
فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران - خیابان ناصر خسرو - کوچه حاج نایب - شمارهٔ ۱/۱۱ - تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ - ۱۱۴۹۵

ISBN: 964-356-432-0
شابک: ۹۶۴-۳۵۶-۴۳۲-۰

نشر احسان

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فَنَادى في الظُلُمات أنْ لا إله إلاّ أنتَ سُبْحانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظالمين﴾ (الانبياء:٨٧).

﴿إذْ نادى ربّه أنّي مَسّني الضرُّ وأنتَ أرحَمُ الراحـــمين﴾ (الأنبياء:٨٣).

﴿فإنْ تَولّوا فَقُلْ حَسْبِيَ الله لا إلـــه إلاّ هـــو عَليـــه تَوكّلـــتُ وهـــوَ رَبُّ العَـــرش العَظيمِ﴾(التوبة:١٢٩).

﴿حَسْبُنا الله وَنِعْمَ الوَكيلُ﴾ (آل عمران:١٧٣).

لاحولَ ولاقوةَ إلاّ بالله العَليِّ العَظيمِ.

يا بَاقي أنتَ البَاقي  يا بَاقي أنتَ الباقي.

﴿للذينَ آمَنُوا هُدىً وشفاءً﴾ (فصلت:٤٤).

ئەم بەشەی یەکەمی مەکتووبی سی و یەکەم، شەش بریسکەی لەخۆ گرتووە و، هەریەکەیان نوورێکی درەخشانی نێوان گەلێ نووری ئەو وشە پیرۆزە ناوبراوانە باس دەکات. هەروەك خوێندنیشیان لە هەموو کاتێکدا، بە تایبەت لە نێوان نوێژی شێوان و خەوتناندا، چەندین پاداشت و ئاکامی بەنرخ بەرهەم دەهێنێت.

# بریسکەی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَذا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغاضِباً فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنادى فِي الظُّلُماتِ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ (الأنبياء:٨٧)

پاڕانەوەکەی حەزرەتی یوونسی کوڕی مەتتا – دروودی لەسەر بێت – یەکێکە لە پاڕانەوە هەرە مەزن و جوانەکان و، هۆکارێکی تابلێی گرنگە لە قبوول بوون و گیرابوونی نزا و پاڕانەوەدا.

بەسەرهاتی حەزرەتی یوونسیش بەناوبانگە و، پوختەکەی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

حەزرەتی یوونس خرایە ناو دەریاوە و، نەهەنگیش هەڵیلووشی و، شەپۆلە سەختەکانی دەریاش دایان بەسەریدا و، شەویش پەردە تاریکەکەی خۆی بەسەردا دادایەوە. بەم چەشنە، ترس و بیم لە هەموو لایەکەوە سەری تێکرد و، هەموو هۆیەکی هیوا و ئومێدی لێ بڕا.. ئا لەم کاتەدا، پاڕانەوە نەرم و نزا بەکوڵ و بێ گەردەکەی: ﴿لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بوو بەهۆی ڕزگاربوونی.

نهێنیی گەورەی ئەم پاڕانەوەیە، ئەوەیە کە:

لەو بارودۆخە سامناکەدا هەرچی هۆکاری ماددی هەن، هەموویان دەستەوسان مان و نەیانتوانی بۆ فریاگوزاریی حەزرەتی یوونس – دروودی لەسەر بێت – هیچ کارێك ئەنجام بدەن. چونکە ئەو کەسەی کە دەستەڵاتی بەسەر "نەهەنگ"دا هەیە و بەسەر "دەریا" و "ئاسمان" و "شەو"دا زاڵە، هەر تەنها ئەو کەسەیە کە دەتوانێت لەو بارە پەرێشانە ڕزگاری بکات. چونکە شەوەزەنگ و دەریای پڕ لە شەپۆل و نەهەنگی سامناك – پێکەوە – هێرشیان بۆ هێنابوو. کەواتە هیچ هۆکارێك و هیچ کەسێك ناتوانێت ڕزگاری بکات و بیگەیەنێتە لێواری ئارامی و ئاسوودەیی، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە

جڵەوی "دەریا" و "نەهەنگ" و "شەو"ی بە دەستە و هەموو شتێك لە ژێر فەرمانیدایە، تەنانەت ئەگەر سەرجەمی بەدیهێنراوان لەو تەنگانەیەدا خزمەتگوزاری حەزرەتی یوونس بوونایە و لە فەرمانەکانی دەرنەچوونایە، هێشتا هەر نەیاندەتوانی هیچ سوودێکی پێ بگەیەنن!

کەواتە "هۆکارەکان" هەرگیز کاریگەریی ڕاستەقینەیان نییە! ئەوەبوو حەزرەتی یوونس - دروودی لەسەر بێت - بە "عين اليقين" بینیی کە هیچ پەنایەك نییە ڕزگاری بکات لەم تەنگانەیەی کە بە فەرمانی خوا هاتووەتە ڕێی، تەنها ئەوە نەبێت کە پەنا بەرێتە بەر خواوەندی بەدیهێنەر و سازێنەری هۆکارەکان. ئەمەشی بەهۆی نەهێنیی "ئەحەدییەت"ەوە بینی کە لە ڕووناکیی نووری درەخشانی "تەوحید"ەوە پیشانی درا. بە ڕادەیەکی وا کە ئەم پاڕانەوە تەوحیدییە بێ گەردە "دەریا" و "نەهەنگ" و "شەو"ی کرد بە فەرمانبەرداری گوێڕایەڵ بۆ ئەنجامدانی خواستەکانی. بەڵکو ئەم پاڕانەوەیە، بەهۆی ڕووناکیی "تەوحید"ی خاوێن و بێ گەردەوە، ناوسکی تاریکی نەهەنگەکەی وەکو ناو کەشتییەکی بن دەریایی بێ وەی لێکرد کە بە ئارامی بە ژێر دەریادا دەڕوات. تەنانەت ئەم پاڕانەوەیە، بەهۆی ڕووناکیی "تەوحید"ەوە ئەو دەریا پڕ لە شەپۆل و دەنگ و هەرایەی بۆ حەزرەتی یوونس وەك سەیرانگەیەکی هێمن و ئارام لێ کرد. ئیتر ئەم نزایە، بە بۆنەی ئەم ڕووناکییەوە، ڕووی ئاسمانی لە هەور بۆ پاك کردەوە و بە ڕوونی پیشانی دا و، مانگیش بە چەشنی گڵۆپێك کە بەسەریدا شۆڕ بووبێتەوە پەردەی لەسەر ڕوخساری خۆی بۆ لادا!

بەم جۆرە، هەموو ئەو دیاردە ئازاربەخشانەی کە لە هەموو لایەکەوە هەڕەشەیان لێ دەکرد و تەنگیان پێ هەڵچنی بوو، ئێستا بەهۆی نووری "تەوحید"ەوە وایان لێ هات کە ئاوڕی هاوڕێیانە و دڵسۆزییان لێ دەدایەوە و، بە خۆشەویستییەوە خۆیان لێ نزیك دەخستەوە. تا ئەو کاتەی بە بێ وەیی هاتەدەر و، بە چاوی خۆی میهرەبانیی خواوەندی بەبەزەیی لە ژێر سێبەری بڕکەی "کوولەکە"دا بینی کە بۆی شین کرد.

دەسا با ئێمەش لەبەر تیشکی ڕووناکیی ئەو پاڕانەوەیەدا سەیرێکی خۆمان بکەین، چونکە لە ڕاستیدا ئێمە لە بارودۆخێکی وەهادایین کە چەندین جار لەوەی حەزرەتی یوونس سامناکترە..

چونکە ئەو "شەو"ەی کە باڵی بەسەر ئێمەدا کێشاوە، "ئاینده"یە. ئەوەتا گەر بە چاوی بێ ئاگاییەوە سەیری ئایندەمان بکەین، دەبینین تاریك و سامناك دیارە، بەڵکو سەد ئەوەندەی شەوەزەنگەکەی حەزرەتی یوونس - دروودی لەسەر بێت - تاریکترە..

"دەریا"کەشمان بریتییە لە دەریای ئەو "ڕووداو"ە زۆرانەی کە دێنە ڕێی گۆی زەویمان. چونکە هەر شەپۆلێك لە شەپۆلەکانی ئەم دەریا مەزنە هەزاران تەرمی لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە. کەواتە دەریاکەمان سەد هێندەی ئەو دەریایەی کە حەزرەتی یوونسی خرایە ناو، تاریکتر و سامناکترە.

"نەهەنگ"ەکەشمان ئەو "دەروونە بەدخواز"ەیە کە لە خۆماندا هەڵمان گرتووە، چونکە ئەویش نەهەنگێکە و دەیەوێت ژیانی هەمیشەییمان قووت بدات و بە یەکجارەکی بیسڕێتەوە. ئەم نەهەنگە زۆر لەوەی حەزرەتی یوونسی هەڵلووشی دڕترە؛ چونکە ئەوپەڕی توانای نەهەنگەکەی حەزرەتی یوونس لەوەدا بوو کە دەیتوانی ژیانێکی سەد ساڵیی ئەمدنیای لەناو ببات، بەڵام نەهەنگەکەی ئێمە دەیەوێت سەدان ملیۆن ساڵی ژیانێکی هەمیشەیی و پڕ لە ئارامی و خۆشیی ئەودنیامان پایەماڵ بکات!

کەواتە چار نییە تەنها ئەوە نەبێت کە شوێن پێی حەزرەتی یوونس - دروودی لەسەر بێت - هەڵبگرین و بەسەر شاڕێگاکەی ئەودا بڕۆین و، بە تەواوی پشت لە هۆکارەکان هەڵبکەین و، بە یەکجارەکی و پڕ بە دڵ و بە هەموو هەست و نەستێکمانەوە ڕوو بکەینە پەروەردگارمان کە سازێنەر و ڕێکخەری هەموو هۆکارەکانە و، پەنای بۆ ببەین و بڵێین:

**﴿لا إلهَ إلاّ أنْتَ سُبْحانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظّالِمينَ﴾!**

هەروەها بە "عین الیقین" ئەو ڕاستییەش بزانین کە ئێمە بە بۆنەی گێلی و بێ ئاگایی و گومڕاییمانەوەیە وا: ئایندەکەمان، کە چاوەڕێمانە و.. دنیاکەمان، کە تیایداین و.. دەروونە بەدخوازەکانمان، کە لە خۆماندان، تێکڕا پیلانیان بۆ ساز کردووین و هێرشیان بۆ هێناوین. هەروەها لەوەش دڵنیا بین کە هیچ کەسێك نییە بتوانێت ترس و بیم و وەهمەکانی ئایندە و، بەڵا و گیروگرفتەکانی دنیا و، فڕوفێڵ و پیلانەکانی دەروونی بەدخوازمان لێ دوور بخاتەوە جگە لەو کەسەی کە ئایندە و، دنیا و، دەروونمان لە ژێر فەرمان و دەستەڵاتیدایە.

ئایا جگە لە بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی، کەسی تر هەیە ئاگاداری وردترین و شاراوەترینی هەموو ئەندێشە و ختوورەیەکی دڵ و نهێنییەکانی دەروونمان بێت و،

بتوانێت بەهۆی هێنانەدی و بەرپاکردنی قیامەتەوە تاریکیی ئایندەمان بۆ ڕووناك بکاتەوە و، لە نێوان هەزاران شەپۆلی سەختی ڕووداوی دنیا ڕزگارمان بکات؟

نەخێر، هیچ کەسێك شك نابەین جگە لەو خواوەندە گەورەیە. چونکە ئەگەر ویست و فەرمانی ئەو نەبێت، ئەوا هیچ شتێك نەیدەتوانی لە هیچ جێگایەکدا و بە هیچ جۆرێك دەستی یارمەتی و فریاکەوتن بۆ هیچ شتێکی تر درێژ بکات.

جا مادەم ئەمە ڕاستیی حاڵی ئێمەیە، ئەوا با دەستی پاڕانەوە بۆ خوا بەرز بکەینەوە و، چاو لەو نزا بێ گەرد و جوانە بکەین کە نەهەنگەکەی بۆ حەزرەتی یوونس وەکو کەشتییەکی ژێر دەریایی لێ کرد و، دەریاکەشی بۆ کرد بە سەیرانگایەکی جوان و، بە مانگی چواردەش شەوی بۆ ڕووناك کردەوە و.. ئێمەش وەکو ئەو بڵێین:

﴿لا إلهَ إلاّ أنْتَ سُبْحَانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظّالِمينَ﴾..

بەم پێیە، دەستی نزا و لالانەوەی بەکوڵ بەرز بکەینەوە و، بە وتنی: ﴿لا إلهَ إلاّ أنْتَ﴾ داوا لە ڕووی میهرەبانیی خواوەند بکەین کە ئاوڕ لە داهاتوومان بداتەوە و.. بە وتنی وشەی: ﴿سُبْحَانَكَ﴾ش ئاوڕی پێ بدەینەوە بە لای دنیاکەماندا و.. بە وتنی ڕستەی: ﴿إنّي كُنْتُ مِنَ الظّالِمينَ﴾یش تکای لێ بکەین کە بە ڕووی بەزەییەوە بۆمان بڕوانێت، تاکو ڕووناکیی ئیمان و قورئانی پیرۆز هەموو "داهاتوومان" بگرێتەوە و.. ترس و بیمی "شەوەکەمان" ببێت بە ئارامی و دڵنیایی و.. "ئەرك و فەرمانبەریی ژیانیشمان" بە گەیشتنە لێواری ئاسایش و ڕۆشتنە ناو گۆڕەپانی بەرینی ڕاستیی ئیسلام، کۆتایی پێ بهینیت، کە ڕاستییەکە وەك کەشتییەکی مەعنەوی وایە و قورئانی پیرۆز ئامادەی کردووە. ئیتر بە سواری ئەم کەشتییە، لە دەریای "ژیان"دا و بەسەر شەپۆلی "ساڵ و سەردەمەکان"دا دەڕۆین و دەگەڕێین. ئەو ساڵ و سەردەمانەی کە ئەگەر بە چاوی بێ ئاگایی و دوور لە ئیمانەوە سەیریان بکەین، دەبینین چەندین تەرمی لە ژمارەبەدەریان هەلگرتووە و، لە دوای یەك هاتنی ئالوگۆڕەکانی ژیان و مردنیش ئەو تەرمانە ڕووەو نەمان و نەبوون فڕێ دەدەن. بەلام کە لەبەر ڕووناکیی قورئانی پیرۆزدا سەیری ئەم دیمەنە سامناکە دەکەین، دەبینین لە ڕاستیدا چەند دیمەنیکی جیا جیا و نوین و، یەك لە دوای یەك دەگۆڕرین و تازە دەبنەوە.

ئەم تازەبوونەوە بەردەوامەش کاریکی وا دەکات کە مرۆڤ بە چاوی پەند وەرگرتن تەماشای سامناکیی زریان و بوومەلەرزەی دەریاکان بکات و، ئەمەش بۆ بیرکردنەوە لە

بەدیـهێنراوانی خـوای گـەورە هـانی بـدات.. ئیـتر بـەم پێیـە ئـەو دیمەنانـە، بـەهۆی تازەبوونـەوەیان، لـە پێش‌چـاودا جـوان و ڕوونـاك دەبـن و، ئنجـا دەروونـە بەدخوازەکانیشمان ناتوانن بەسەرماندا زاڵ بـن، بـەڵکو بـەهۆی ئـەو نهێنی‌یـە جـوان و ناسکەی کە قورئانی پیرۆز پێمان دەبەخشێت، ئێمـە بەسـەر ئـەواندا زاڵ دەبین. تەنانـەت بەو پەروەردەیەی کە لـە قورئـانی پیرۆزەوە وەری دەگریـن، چەشنی سـواربوونی ئەسـپ سـواری ئـەو دەروونـە بەدخوازانـە دەبین و جڵـەویان بـە دەسـتی خۆمانـەوە دەگریـن و، دەیانکەین بە هۆیەکی خێر و سوودبەخش بۆ دەستکەوتنی ژیانێکی هەمیشەیی.

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

بەهۆی ئەوەی کە "ماهییەتی مرۆڤ" چەندین شتی جۆراوجۆری تێدا کۆبووەتـەوە، ئـەوا هـەروەك بـە بوومەلـەرزەی زەوی و سەرتاسـەری گـەردوون لـە کـاتی بـەرپابوونی قیامەتدا ئازاری پێ دەگات، بە هەمان جۆر بە "تا"یەکی ئاسـاییش ئـازاری پـێ دەگـات.. هـەروەك لـە ئەسـتێرە کلکدارەکـانی ئاسمـان هـەڵدێت، لـە میکرۆبێکـی بچووکیـش دەترسێت.. هەروەك ئەم دنیا گەورەیەی خۆش دەوێـت، مـاڵ و خانووبەرەکەشـی خـۆش دەوێت.. هەروەك حەزی لە بەهەشـتی هەمیشـەیی‌یە و تاسـەمەندیەتی، هـەر بـەو جـۆرەش باخچە بچووکەکەی خۆی خۆش دەوێت و حەزی لێیەتی!

جا مادەم ئەمـە حـاڵی مرۆڤـە، ئـەوا دەبـێ پـەروەردگار و گـەورە و پەرسـتراو و پـەنا و پشتیوانی مرۆڤ تەنها ئەو کەسـە بێـت کـە دەسـتەڵاتی بەسـەر هـەموو شـوێنێکی زەوی و ئاسماندا هەیە و، جڵەوی سەرجەمی شتانی، لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلـەستێرەکان، بە دەستەوەیە.

کەواتە ئەم مرۆڤە هەمیشە پێویستیی تابڵێی زۆری بەوە هەیە کە ڕوو بکاتە بەدیهێنەری مەزنی خۆی و، بە لاڵانەوەی بەکوڵ لێی بپاڕێتەوە و، وەك حـەزرەتی یوونـس - دروودی لەسەر بێت - بڵێت:

﴿لا إلهَ إلاّ أنْتَ سُبْحَانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظّالِمينَ﴾!

﴿سُبحَانَكَ لا عِلمَ لنا إلا ما عَلّمتَنا إنّكَ أنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

# بریسکەی دووهەم

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نادى رَبَّهُ أَنِّـــي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (الأنبياء:٨٢)

ئـەم نـزا و پاڕانەوەیـەی پێشـەنگی ئـارامگران حـەزرەتی ئـەیيووب - درووودی خـوای لـەسەر بێـت - تاقی کراوەیە و، کاریگەریيەکی تەواو بەسوودی هەیە. پێویستە ئێمەش لـە موناجات و پاڕانەوەکانماندا سوود لە نووری ئەم ئایەتە پیرۆزە وەربگرین و بڵێین:

ربِّ ﴿أَنِّـــي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾!

چیرۆکی بەناوبانگی حەزرەتی ئەيیووب - درووودی خوای لەسەر بێـت - بە پوختـی بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

ئەم پێشەوا ئارامگرە، ماوەیـەکی درێژخایـەن ئـارامی لـەسـەر نەخۆشـیيە قورسـەکەی گرت، بە ڕادەیەك کە زام و برین هەموو ئەندامەکانی جەسـتەی گرتـەوە، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشدا هەر لـەسەر ئـارامگرتن بـەردەوام بـوو، چونکـە چـاوەڕوانی پاداشـتە مەزنـەکـەی خوای گەورە و بەتواناى دەکرد. بەڵام کاتێ کە ئەم نەخۆشـیيە پتر پـەرەی سـەند و کـرم دایە "دڵ" و "زمان"ی، کە تەنها بەم دوانەش خوا دەناسرێت و یادی ئەوی پێ دەکرێتەوە، ئـا لـەم کاتـەدا هـانـای بـردە بـەر خـواوەنـدی میـهرەبان و ئـەو موناجاتـە نـەرم و پـاك و خەمناکەی کرد و فەرمووی:

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾!

ئەمەش تەنها لـە ترسی ئەوەی کە ئیتر نەتوانێت بـە تـەواوەتی پەرستشـەکانی جێبـەجێ بکـات و، کـەموکووڕی ڕوو بکاتـە بەندایەتیـیەکانی، نـەك بـۆ مەبەسـتی چاکبوونـەوە و حەوانەوەی خۆی. ئەوەبوو یەکسـەر خـوای گـەورەی میـهرەبان ئـەو پاڕانـەوە پـاك و نـزا بێ گـەردەی بـە شـێوەیەکی دەراسـا(معجز) گیـرا کـرد و شـیفای تـەواوی پێ بەخشـی و نیعمەتی خۆی بەسەردا باراند.

ئەم بریسکەیە پێنج سەرنجی وردی تێدایە:

**❑ سەرنجی یەکەم:**

لە بەرامبەر زامە دیار و بەرچاوەکانی حەزرەتی ئەییووبەوە - دروودی لەسەر بێت - ئێمە گیرۆدەی چەندین ئازار و زام و نەخۆشیی مەعنەویی نادیارین کە لە "گیان" و "دڵ"ماندا دروست بوون. ئەو نەخۆشی‌یە مەعنەوی‌یانەش لە ڕادەیەکی وادان کە ئەگەر دیوی ناوەوەمان بۆ دەرەوە و دەرەوەشمان بۆ ناوەوە هەڵبگێڕینەوە ئەوا دەردەکەوێت کە ئێمە زۆر لە حەزرەتی ئەییووب زیاتر لەش بەبار و گیرۆدەی زام و نەخۆشی‌یەکانین!

چونکە ئەو هەموو گوناهانەی دەیانکەین و، ئەو شوبهە و گومانانەش کە خۆیان دەگەیەننە مێشك و دڵ و دەروونمان، چەندین زامی قووڵ و خوێناوی لە ناخی "دڵ" و "گیان"ماندا واڵا دەکەن.

ئنجا لە لایەکی تریشەوە، زام و برینەکانی حەزرەتی ئەییووب - دروودی خوای لەسەر بێت - تەنها ژیانی کورت و کەم خایەنی ئەم دنیایەی ئەوی خستبووە مەترسی‌یەوە، کەچی زامە مەعنەوی‌یەکانی ئێمە ژیانی هەمیشەیی ئەودنیامان دەخاتە مەترسی‌یەوە!

کەواتە ئێمە چەندین جار زیاتر لەو پێغەمبەرە مەزنە - دروودی لەسەر بێت - پێویستمان بە موناجاتەکەیەتی. بە تایبەتی کە ئەگەر بزانین لە بریی ئەو کرمانەی کە لە برینەکانی ئەو پێغەمبەرە ئارامگرەوە سەریان کرد و دابوویانە دڵ و زمانی، ئێمە چەندەها گومان و دوودڵی - کە لە زامە مەعنەوی‌یەکانمان و گوناهـ و کردەوە خراپەکانمانەوە پەیدا بوون - ناخی دڵی داگیر کردووین، کە مەڵبەند و نیشتەجێی "ئیمان"ە! بۆیە ئیمانەکەمان جێی پێ لێژ دەبێت و لەسەر ئارامی و دڵنیایی خۆی نامێنێتەوە..

هەروەها ئەو گومان و دوودڵی‌یانە خۆیان دەگەیەننە "زمان"مان، کە ئیمانی ناو دەروونمان دەردەبڕێت. ئیتر خۆشی و چێژ و لەزەتی ئیمانی لێ دەسێنێتەوە و دووری دەخاتەوە لە یاد و ناوبردنی خوای گەورە تا بە جارێ کپ و بێ دەنگی دەکات!

بەڵێ، گوناهـ لە ناودڵدا جێی خۆی دەکاتەوە و لق و پەل بۆ ناو قووڵایی دڵ دەهاوێت و، لەوێوە دەست بە بڵاوکردنەوەی لەکە و تاریکایی‌یەکانی خۆی دەکات و، ئیمانی لێ دەردەهێنێت. ئیتر ئەو دڵە وەك بەرد ڕەق دەبێت و، چۆڵ و تاریك دادێت.

جا لەبەر ئەوەی هەموو خراپکاری و گوناهێك ڕێگایەکی بەرەو کافربوون لێ دەبێتەوە، ئەوا گەر لە سەرەتاوە بە پەشیمان بوونەوە و داوای لێبووردن لە خوای گەورە

ئاسەوارەکانی ئەو گوناهە لا نەبرێت و پاك نەکرێتەوە، ئەوا دوایی لە ناخدا دەبێت بە کرمێکی مەعنەوی یاخود مارێکی مەعنەوی و بە دڵی مرۆڤەوە دەدات!

با ئەوەش بەم نموونەیەی خوارەوە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر کەسێك بە دزی‌یەوە گوناهێك ئەنجام بدات و شەرمیش لەوە بکات کە پێی بزانرێت، ئەم مرۆڤە بوونی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانیی بەلاوە گران دەبێت و، تەنها نیشانە و بیانوویەکی بێ‌نرخی بەلاوە سەروزیادە بۆ ئەوەی حەزی خۆی دەربڕێت کە دان بە بوونیاندا نەنێت!

نموونەیەکی تر:

ئەو کەسەی گوناهێکی هێندە گەورە بکات کە بەرەو دۆزەخ بیداتەبەر، ئەگەر پەنا بۆ خوای گەورە نەبات و داوای لێبوردنی لێ نەکات و پشتی پێ نەبەستبێت، ئەوا لە کاتی بیستنی ئازار و ناخۆشی‌یەکانی دۆزەخدا، لە ناخی دەروونەوە حەز بە نەبوونی دۆزەخ دەکات! تا لە ئەنجامدا وای لێ دێت کە بە ئاسایی‌ترین نیشانە یان بە شوبهە و گومانێکی بێ‌نرخ پڕ کێشیی نەسەلماندنی بوونی دۆزەخ بکات!

نموونەیەکی تر:

ئەو کەسەی فەرزەکان بەجێ‌ناهێنێ و وەك پێویست فەرمانی بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئەنجام نادات، لە هەمان کاتدا دڵی لە سەرزەنشتی فەرماندەیەکی ئاسایی ئازار دەچێژێت کە لە بەرامبەر بەجێ‌نەهێنانی فەرمانێکی ئاسایی‌یەوە ئاراستەی کردبێت، سستی کردنی ئەو کەسە لە بەجێ‌هێنانی ئەو فەرزانەی کە لە چەندین فەرمانی خوای گەورەدا بۆی دەرکراوە، دڵتەنگی و تاریکی‌یەکی یەکجار زۆر لە "گیان" و "دەروون"ی‌دا دروست دەکات. ئەم دڵتەنگی‌یەش پاڵی پێوە دەنێت کە هەروەك لە دەروونەوە ئارەزوو دەکات، پڕ بە دەمیش هاوار بکات و بڵێت: "خۆزگە خوای گەورە فەرمانی بە کردنی ئەو پەرستشە نەدایە"! دیارە ئەو ئارەزووەش بۆنی ئینکاری و دوژمنایەتی‌یەکی مەعنەویی لێ دێت بەرامبەر بە خوایەتیی خوای گەورە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەگەر بێ‌نرخترین گومان لە بارەی بوونی خواوەندەوە ڕوو بکاتە ئەو دڵە، حەزی پێ دەکات. وەك بڵێی بەڵگەیەکی گومان بڕی دەست کەوتبێت! ئاشکرایە کە بەم کارەی دەرگایەکی گەورەی زەرەرمەندیی لە ڕوودا والآ دەبێت..

بەڵام ئەم بەدبەختە بەخۆی نازانێت کە بەم ملنەدان و نکوولی‌کردنەی، خۆی کردووە بە نیشانە بۆ تیری دڵتەنگی و تاریکی‌یەك ملیۆنەها جار لەو دڵتەنگی‌یە کەمەی لە ئەنجامی

سستی کردنی لـە بەندایـەتیدا هەستی پێ دەکـرد گـەورەتر و تاریکـتر بێـت. وەکـو ئەو کەسـەی کـە لـە پێوەدانـی مێشـووله هـەڵبێت و لـەتاوا خـۆی بخاتـە بـەردەمی مـار و هەژدیهاکان!

جـا بـا لـە ڕۆشنایی ئـەم سێ نموونەیـەدا، لـە نـهێنیی ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە تێبگـەین کـە دەفەرموێ:

﴿بَلْ رانَ عَلى قُلُوبِهِمْ مَا كانُوا يَكْسِبُون﴾ (المطففين:١٤).

❑ **سەرنجی دووهەم:**

هەروەك لە وتەی بیست و شەشەم، لە باسی نهێنیی قـەدەری خـوای گـەورەدا، ڕوون کراوەتەوە:

مـرۆڤ – لـە سێ ڕووەوە – مـافی سکاڵای نییـە لـە دەسـت ئـەو بـەڵا و نەخۆشـی و گیروگرفتانەی کە دێنە ڕێی ژیانی:

❍ *ڕووی یەکەم:*

خوای گەورە کاتێ بەرگی "بوون"ی بە بەری مرۆڤ پۆشیوە، کردوویـەتی بە بەڵگـە لەسەر وردەکاریی سنعەت و دروستکراوانی خۆی و، مرۆڤی لە شـێوەی نموونەیەکیشدا بەدی هێناوە کە بەرگی "بوون"ی بە بەر دەبڕێت و دەستکاری و ئـاڵوگۆڕ لـەو بەرگـەدا دەکات. بەمـەش درەوشـانەوە جۆراوجۆرەکـانی نـاوە جوانـەکانی خـۆی لـە بوونـەوەردا پیشان دەدات.

جا هەروەك ناوی "الشافي"ی خواوەند داخوازی بوونی نەخۆشییە، بـە هـەمان جـۆر ناوی "الـرزاق"یـش داخـوازی بوونـی برسێتییە.. بەم جـۆرە دەردەکـەوێت کـە خـوای گەورە خۆی خاوەنی موڵکـی بوونـەوەرە و بـە ویستی خـۆی دەستکاری و ئـاڵوگۆڕ لـە موڵکەکانیدا دەکات.

❍ *ڕووی دووهەم:*

ژیـان بەهـۆی گیروگـرفت و بـەڵا و موسـیبەتەکانەوە پاڵفتـە دەبێـت و، لـە ڕێـی نەخۆشی و کارەساتەکانەوە پاك دەبێتەوە و بەروبووم دەبەخشێت و دەگاتە ئامانجـەکانی. ئیتر لەم ڕێگایەوە دەتوانێت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

بەڵام ئەو ژیانە ئاساییەی کە لەسەر یەك ڕەوت و شێوە و بـە بێ هیـچ ئـاڵوگۆڕێك و بە خۆشی و حەوانەوە لە مرۆڤ دەچێتە سەر، گەلـێ نزیکە لـەو "نـەبوون"ەی کـە شـەڕ و

خراپەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، تا ئەو "بوون"ەی کە خێر و فەرێکی ئاشکرا و لەبەرچاوە. تەنانەت ئەو جۆرە ژیانە ڕێگایەکە بۆ ڕۆشتن بەرەو نەبوون.

○ ڕووی سێهەم:

دنیا تەنها خانەی تاقیکردنەوەیە، واتە جێی ئەنجامدانی کردەوە و پێشکەشکردنی عیبادەتە، نەك جێی خۆشگوزەرانی و حەسانەوە و پاداشت وەرگرتن..

لەبەر ئەوە، هەموو نەخۆشی و گیروگرفت و موسیبەتێك، بە مەرجی ئارامگرتن و شوکرانەبژێری - جگە لەو گیروگرفتانەی ڕوو دەکەنە ئایین - زۆر لەگەڵ ئەو کردەوە و عیبادەتانەدا گونجاوە، چونکە یارمەتیی ئەوکردەوە و پەرستشە دەدات و پشتی دەگرێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە سکاڵا کردن لە دەست ئەو نەخۆشی و گیروگرفتانە بە کارێکی هەڵە و نابەجێ دادەنرێت، بەڵکو دەبێ شوکرانەیان لەسەر بکرێت، چونکە ئەو نەخۆشی و گیروگرفتانە هەموو سەعاتێکی ژیانی خاوەنەکانیان دەکەن بە پەرستشی ڕۆژێکی تەواوەتی.

بەڵێ، پەرستش دوو جۆرە: جۆرێکی بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێت و جۆرەکەی تریشی بە "دڵ". جۆری یەکەمیان لای هەموان ئاشکرا و زانراوە. جۆری دووهەمیش ئەوەیە کە: نەخۆشی و گیروگرفتەکان وا لە مرۆڤ دەکەن هەست بە دەستەوسانی و لاوازیی خۆی بکات، خۆ کە هەستیشی پێ کرد، ئەوا پەنا دەباتە بەر خواوەندی بەسۆز و میهرەبانی خۆی و ڕووی تێدەکات و پشتی پێ دەبەستێت. بەمەش پەرستشێکی پاك و بێگەردی پێشکەش دەکات. ئەم جۆرە پەرستشە گەلێ خاوێنە و هەرگیز ڕیای تێکەڵ نابێت.

جا ئەگەر ئەو مرۆڤەی کە دووچاری گیروگرفت و نەخۆشی دەبێت، ئارام بگرێت و بیر لە پاداشتە زۆرەکەی لای خوای گەورە بکاتەوە و شوکرانەبژێر بێت، ئەوا هەموو سەعاتێکی ژیانی بۆ دەبێت بە عیبادەتی ڕۆژێکی تەواوەتی. بەم جۆرە، تەمەنە کەم و کورتەکەی بۆ دەبێت بە تەمەنێکی دوور و درێژ. بەڵکو هەندێکیان هەموو خولەکێکی ژیانیان بۆ دەبێت بە پەرستشی ڕۆژێکی تەواوەتی.

کاتی خۆی زۆر بەزەییم بە "حافز ئەحمەدی موهاجیر"دا دەهاتەوە، کە یەکێك بوو لە برایانی ئاخیرەتم. چونکە بە نەخۆشییەکی سەختەوە دەتلایەوە. پاشان ئەم ختوورەیەم بە

دڵدا هات کە: (مزگێنیی بدەرێ و پیرۆزبایی لێ بکە، چونکە هەموو خولەکێکی ژیانی، کە بەو جۆرە لێی دەگوزەرێت، بە پەرستشی ڕۆژێك بۆی دەژمێررێت)!

لە ڕاستیشدا هەمیشە ئارامگر و شوکرانەبژێر بوو.

**❑ سەرنجی سێهەم:**

هەروەك لە "وتەکان"ی پێشوودا ڕوونمان کردووەتەوە:

ئەگەر هەر مرۆڤێك بیر لـە ڕابـوردووی ژیـانی خـۆی بکاتـەوە، ئـەوا چ بـە دڵ و چ بـە زمانی دەڵێت: "داخی بە جەرگم".. یاخود دەڵێت: "سوپاس بۆ خوا"! واتـە یـان زۆر لـە داخی ژیانی ڕابوردوویدایە، یاخود سوپاسی خوای گـەورەی لەسـەر دەکـات. جـا ئـەو کەسـەی کـە داخـی ژیـانی ڕابـوردووی لـە دڵدایـە و لـە زمانیـەوە ئـەم خـەم و پەژارەیـەی دە دەکەوێت، هۆکـەی تەنـها لەدەستچوونی ژیـانی شـادمانی و خۆشـحاڵیی کاتـەکانی ڕابوردوویەتی، چونکـە لەدەستچوونی خۆشـی - خـۆی لـە خـۆیدا - ناخۆشـی و ئـازارە. بەڵکو کاتی وا دەبێت خۆشی و چێژێکی کەم ئازارێکی زۆر و بـەردەوام لـە دڵـدا بـەجێ دەهێڵێـت. جـا بیرکردنـەوەی مـرۆڤ لـە خۆشـییەکانی ژیـانی ڕابـوردووی - بـێ هیـچ گومانێك - دڵی دەگووشێت و خەفەت و ئازار لەسەر زمانی دەچۆڕێنێت..

بـەڵام ئـەو چێـژە مەعنەوییـە بەردەوامـەی کـە مـرۆڤ لـە نـەمانی ئازارەکـانی ڕابوردوویەوە هەستی پێ دەکات، زمانی دەخاتە شوکرانەبژێریی خوای گەورە.

ئەمەش حاڵەتێکی سروشتییە و هەموو مرۆڤێك بۆ خۆی هەستی پێ دەکات.

جا ئەو کەسەی کە دووچاری گیروگرفت یان نەخۆشییەك دەبێت، جگە لـەو چێـژە مەعنەوییـەی باسمـان کـرد، ئەگـەر بـیریش لـەو پاداشـتانەی دوارۆژ بکاتـەوە کـە خـوای گەورە بۆی داناوە و، سەرنج لەوەش بدات کـە ژیانـە پـڕ لـە دەردیسـەرییەکەی ئێرەی لـەوێ بـۆی دەبێـت بـە ژیـانێکی هەمیشـەیی و درێژخایـەن، ئـەوا ئـەو مرۆڤـە تەنـها بـە ئارامگرتنەوە ڕاناوەستێ، بەڵکو بەرەوژوورتر هـەنگاو دەنێـت و شـوکرانەی لەسـەر پێشکەش دەکات و بە "قەدەر"ی خوای گەورەش ڕازی دەبێت. دیارە ئەو کاتەش زمـانی دەکەوێتە شوکرانەبژێری و دەڵێت:

"الحمد لله علی کل حال، سوی الکفر والضلال"!

لەناو خەڵکیدا باوە کە دەڵێن:

"ژیانی دەردی سەری و پڕ لە گیروگرفت، درێژخایەنە"!

بەڵێ ڕاستە.. بەڵام نەك بەو واتایەی کە هەندێ کەس پێیان وایە: بەهۆی دڵتەنگی و ئازارەکەیەوە دوور و درێژە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بە وێنەی تەمەنێکی درێژخایەن بەروبوومی گەورە و بەنرخ بۆ ژیانی مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت!

**❑ سەرنجی چوارەم:**

هەروەك لە مەقامی یەکەمی وتەی بیست و یەکەمدا ڕوونمان کردووەتەوە:

ئەگەر بێت و مرۆڤ ئەو هێز و توانای ئارامگرتنەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە بەم لا و ئەو لادا بڵاوی نەکاتەوە و لە ئەندێشە و ترس و خەفەتدا پەرتەوازەی نەکات، ئەوا هەر تەنها ئەو هێزە سەروزیادە بۆ ئەوەی بەرەنگاریی هەموو گیروگرفتێکی پێ بکات، بەڵام وەهم و بێئاگایی و پشت بەستن بە ژیانی دنیا و بە هەمیشە زانینی ئەم ژیانە، هێزی ئارامگرتنی مرۆڤ ناهێڵن و لە نێوان ئازارەکانی ڕابوردووی و مەترسییەکانی ئایندەدا هێز و توانای مرۆڤ پەرتەوازە دەکەن. تا لە ئەنجامدا ئەو هێزی ئارامگرتنەی کە خواوەند بە مرۆڤی بەخشیوە هێندە کەم دەبێتەوە کە لە بەرامبەر هیچ بەڵا و گیروگرفتێکدا خۆی پێ ڕاگیر نەکرێت.. دەبینیت ئەو مرۆڤە لای ئەم و ئەو سکاڵا دەکات، تەنانەت هەندێ جار لای خەڵکی - خوا پەنامان بدات - سکاڵا لە دەست خوای گەورە دەردەبڕێت! بەڵکو وەك شێتی لێ دێت و دەری دەخات کە هیچ توێشوویەکی ئارامی لە لا نەماوە!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ مافی دەربڕینی ئەم چەشنە سکاڵایەی نییە، چونکە ڕۆژانی ڕابوردوو ئەگەر بە گیروگرفت و ناخۆشی ڕۆشتبنە سەر، ئەوا ئێش و ئازارەکانیشیان بەسەرچووە و خۆشی و حەوانەوەیان بەجێ هێشتووە.. تەنگژەکانی بەسەر چوون و ماندوویی و نارەحەتییەکانیشی ڕۆشتوون، بەڵام خێر و پاداشتەکانیان ماوەتەوە. کەوابوو نابێ سکاڵایان لە دەست بکرێت، بەڵکو پێویستە مرۆڤ شوکری خوای گەورە بکات لەسەر ئەوەی کە ئازارەکانی ڕۆشتوون و بەسەرچوون.

هەروەها کارێکی ڕاست و دروست نییە کە مرۆڤ لەدەست ئازار و بەڵا و گیروگرفتەکان بێزار ببێت و ڕقیان لێ هەڵبگرێت، بەڵکو دەبێ پەیوەندیی خۆشەویستانەیان لەگەڵدا ببەستێت! چونکە ئەو ژیانەی کە بەو شێوەیە لە مرۆڤ دە، وات ە سەر، بەهۆی ئەو ئازارانەوە، دەبێت بە ژیان و تەمەنێکی درێژی ئەوتۆ کە بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ مرۆڤ بەرهەم بهێنێت.

لەبەر ئەوە، گەر مرۆڤ بەشێکی زۆری هێزی خۆڕاگری و ئارامگرتنی خۆی لە بیرکردنەوەی ئازارەکانی پێشووی‌دا لەناوببات، ئەوا هەنگاوی بەرەو کرداری شێتانە ناوە.

ڕۆژانی داهاتووش، لەبەر ئەوەی کە هێشتا نەهاتوون و نازانرێت چۆن دەبن، ئەوا بیرکردنەوە و دەربڕینی بێ‌تاقەتی هەر لە ئێستاوە لە دەست ئازار و گیروگرفت و ناخۆشی‌یەکانی ئەو ڕۆژانە ڕەفتارێکی تابلێی دوور لە ژیری‌یە! چونکە هەروەك ئەو کەسەی کە هەر ئێستا و لە ترسی برسی بوون و تینوبوونی سبەینێ و دووسبەی‌دا هەتا دەتوانێت گەدەی خۆی بە خواردن و خواردنەوە دەئاخنێت، بە کەسێکی نەفام دادەنرێت، بە هەمان جۆر بیرکردنەوە و ترس و بیمیش هەر لە ئێستاوە لە دەست نەخۆشی و ئازارێکی ئایندە کە لە حوکمی "نەبوو"دایە، بە نەفامی و بێ‌عەقڵی دەژمێررێت، بە ڕادەیەك کە ئەو کەسەی ڕەفتاری وا دەنوێنێت سەرەڕای ئەوەی ستەم لە خۆی دەکات، خۆیشی دادەبەزێنێتە ئەو ئاستەی کە هیچ کەسێك بەزەیی پێدا نەیەتەوە!

**بە پوختی:**

هەروەك "شوکرانەبژێری" نیعمەتی پێ زیاد دەبێت، "سکاڵاکردن"یش پەرە بە موسیبەت و گیروگرفتەکان دەدات و خاوەنەکەی لەوە دووردەخاتەوە کە خەڵکی بەزەیی‌یان پێدا بێتەوە.

پیاوێکی خواناسی خەڵکی "ئەرزڕۆم" لە یەکەم ساڵی جەنگی جیهانیی یەکەمدا گرفتاری نەخۆشی‌یەکی سەخت بوو. کاتێ ڕۆشتم بۆ سەرلێدانی، خەفەت و سکاڵای خۆی لە لا دەربڕیم و وتی:

(سەد ڕۆژی ڕەبەقە خەو نەڕۆشتووەتە چاوەکانم)!

منیش زۆر بەم هەواڵە دڵگران بووم و بەزەییم بە حاڵی‌دا هاتەوە. پاشان ئەمەی خوارەوەم بیرکەوتەوە و، پێم وت:

(برام! ئەو سەد ڕۆژەی ڕابورد، لەبەر ئەوەی ڕۆشتوون و بەسەرچوون، جێگای دڵخۆشین. کەواتە هیچ بیرێکیان لێ مەکەرەوە و سکاڵایان لە دەست دەرمەبڕە، بەڵکو شوکری خوای گەورە بکە لەسەر ئەوەی کە تەواوی کردوون و، لەم گۆشەیەوە بڕوانە بۆ ئەو سەد ڕۆژەی ڕابوردوو!

ڕۆژانی داهـاتووش، لەبەر ئەوەی کە هێشتا نەهاتوون، پشت بە خواوەند ببەستە بۆیـان و هەمیشە میهرەبانیی ئەو لە پێش‌چاوی خۆت دابنێ.. پێش ئەوەی لـێت بـدرێ مەگری.. لە هیچ مەترسە.. شێوە و ڕوخساری "بوون" بە "نەبوون" مەدە. بەڵکو هەمـوو بیر و هۆشـێکت بۆ ئەم سەعاتەی ئێستای ژیانت تەرخان بکە، چونکە هێزی سـەبر و ئارامت تەنها بەشی ئەوە دەکات کە لە بەردەم ئازارەکانی ئەم کاتەتدا ڕابوەستیت. وەك ئەو سەرکردە نەزانە مەبە کـە هـەموو هێزەکانی خۆی بـەم لا و ئـەولادا بـڵاو کـردەوە و، هێزەکانی دەستە ڕاست و دەستە چەپی دوژمنیش کە بەو دەرفەتەیان زانـی وەك هـەڵێك قۆزتیانەوە و یەکیان گـرت و بـە هێزێکی یـەکجار کـەمەوە هاتنـە سـەریان و لـەناویان بردن!

برای ئازیزم! تۆ بەم جۆرە مەبە، بەڵکو هـەموو هێزەکـانت بـۆ ئـەم سـەعاتەی ئێستات کۆ بکەرەوە، چاوەڕوانی میهرەبانیـە فراوانەکـەی خـوای گـەورە بـە و بـیر لـە پاداشتی پاشەڕۆژ بکەرەوە. سەرنج لە نەخۆشی‌یەکەت بدە کە لەم دنیا براوەیەدا تووشـت بـووە و لە پاشاندا بۆت دەبێت بـە تەمـەنێکی درێـژی هەمیشـەیی. ئیـتر لـە بریـی ئـەم سـکاڵا تاڵـە، شوکرانەبژێریی دڵخۆشکەر و زۆر پێشکەشی خواوەندی گەورەی بەدەستەڵات بکە).

کە لەم قسـانەم بوومـەوە، ئـەو مرۆڤـە نەخۆشـە خواناسە دڵـی کرایـەوە و ڕوخسـاری گەشایەوە و وتی:

(سوپاس بۆ خوا! وا بەشێکی زۆری ئازارەکەم ڕۆشت و لەسەر شانم سووك بوو)!

❐ **سەرنجی پێنجەم:**

ئەم سەرنجە سێ مەسەلەی لەخۆ گرتووە:

◆ *مەسەلەی یەکەم:*

"موسیبەت" کاتێ بە موسیبەتی ڕاستەقینە دادەنرێـت و بـە ڕاسـتی زیانبـەخش دەبێـت، کە ڕووی لە ئایین و باوەڕ کردبێت، کە ئەویش بەوە چارەسەر دەبێت مرۆڤ هانا بۆ لای خوای گەورە ببات و لـێی بپاڕێتەوە.

بـەڵام ئـەو گرفـت و موسیبەتانەی کـە ڕوویـان لـە ئـایین نـەکردووە، لـە ڕاسـتی‌دا موسیبەت نین، چونکـە بەشێکیان ئاگادارکردنـەوەن لـە لایـەن خـوای گـەورەوە بـۆ بـەندەکانی تـاکو لـە خـەوی بـێ ئاگـایی بێداریـان بکاتـەوە، بـە وێنـەی ئـەو ئاگـادار کردنەوەیەی کە شـوانەکان لـە کـاتی بڵاوبوونـەوەی مـەڕەکانیاندا بـەکاری دەهێنـن و

بەردێکیان تێ دەگرن و، مەڕەکانیش بەوەدا دەزانن زیادەڕەوییان کردووە و، یەکسەر دەگەڕێنەوە بۆ لەوەڕگە و لای شوانەکەی خۆیان! هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، هەندێ بەڵا و موسیبەتیش هەن کە دەبنە ئاگادارکردنەوەیەکی پەروەردگار بۆ بەندەکانی.

بەشێکی تریشیان دەبن بە لابەر(کفارة)ی گوناه و هۆی سڕینەوەی خەتاباری.

بەشێکی تریش دیارییەکی خواییە بۆ دڵدانەوە و ئارامی بەخشین بەو دڵانە، ئەمەش لە ڕێی نەهێشتن و لابردنی ئەو بێئاگاییەی تووشی مرۆڤ دێت و، لە ڕێی ئەوەشەوە کە موسیبەت و گیروگرفت وا لە مرۆڤ دەکەن هەست بە ڕادەی ئەو بێ دەستەڵاتی و دەستەوسانی و هەژارییەی خۆی بکات کە ئاوێتەی سروشتی بوون.

بەڵام ئەو موسیبەتەی کە لەشێوەی نەخۆشیدا ڕوو دەکاتە مرۆڤ - هەروەك لە پێشدا باسمان کرد - موسیبەتی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو بەزەییەکی خواوەندە بۆ بەندەکانی خۆی. چونکە "نەخۆشی" مرۆڤ لە چڵکی گوناهەکان پاك دەکاتەوە، وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ:

"ما مِن مُسلمٍ يُصيبُه أذىً إلاّ حاتَّ اللهُ عنه خطاياه كما تُحاتُّ ورقُ الشجرِ"(١).

حەزرەتی ئەییووب - دروودی لەسەر بێت - کاتێ کە لە خوا پاڕایەوە، لەبەر خۆی و بۆ مەبەستی حەوانەوەی ژیانی دنیای نەپاڕایەوە، بەڵکو پاش ئەوەی نەخۆشییەکەی گەیشتە ڕادەیەك کە نەیدەتوانی بە زمان ناوی خوای گەورە بهێنێت و بە دڵیش یادی خوا و بیر لە دروستکراوەکانی بکاتەوە، ئەو کاتە پەنای بردە بەر میهرەبانیی خوا و داوای چاکبوونەوەی لێ کرد، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەرك و فەرمانبەرێتیی بەندایەتی بە تەواوی جێبەجێ بکات. ئێمەش دەبێ لە پاڕانەوەکانماندا یەکەم مەبەستمان چاکبوونەوەی زام و برینەکانی دڵ و دەروونمان بێت کە لە گوناهباری و خراپەکارییەوە تووشمان بووە.

سەبارەت بە نەخۆشییە ماددییەکانیشمان، کە دەبنە کۆسپ لە ڕێی بەندایەتیماندا، دەبێ پەنا بۆ خوای گەورە بەین و بە ڕاستی لێی بپاڕێینەوە، بێ ئەوەی هیچ سکاڵا و وتەیەکی ناڕەوامان لە دەم دەربچێت، چونکە مادەم ئێمە ئەوپەڕی ڕەزامەندیمان لە پەروەردگارێتیی خوای گەورە هەیە، ئەوا دەبێ هەرشتێکیش لە لایەن خواوەندەوە بێت

---

(١) رواه البخاري ومسلم. واتە: هەر موسلمانێك هەر ئازارێکی تووش بێت ئەوا خوای گەورە بەو ئازارە گوناهەکانی لێ هەڵئەوەرێنێت وەك ئەوەی درەخت گەڵاکانی لێ ئەوەرێتە خوارەوە. (وەرگێر)

پێی ڕازی بین و ملکەچی و تەسلیم بوونی خۆمانی بۆ دەربـبڕین.. بەڵام هەر سـکاڵایەك پەلپ و بیانوو گرتنی تێدا بێت لە قەزا و قەدەری خـوای گـەورە، یـان داخ و خەفەتی لە بەرامبـەرەوە دەربـبڕێت، ئـەوا وەکو ئەوە وایە کە ڕەخنە لـە "قـەدەری خـوا" بگرێـت و میهرەبانی‌یە زۆرەکەی تۆمەتبار بکات! خۆ ئاشکرایە هەرکەسێك ڕەخنە لە قەدەری خوا بگرێت ئەوا "قەدەر" بەسەر ئەو کەسەدا سەر دەکەوێت و هەرکەسیش تۆمەت ئاراستەی میهرەبانیی خواوەندی میـهرەبان بکـات، لـە سۆز و میهرەبانی‌یەکەی بێ بـەش دەبێـت! هـەروەك بەکارهێنانی دەستی شکاو لـە تۆڵەسەندنەوەدا زیـاتر دەیشـکێنێت، سـکاڵا و ڕەخنەگرتن و دەربڕینی بێزاریش بەرامبەر بە ئازار، بە هەمان جۆر ئازارەکە پتر دەکـات و پەرەی پێ دەسێنێت!

◆ *مەسەلەی دووهەم:*

هـەر موسـیبەتێکی مـاددی تـا بـە گـەورە تەماشـا بکرێـت، گـەورەتر دەبێـت. بـە پێچەوانەوەشە هەتا بە بچووك سەیر بکرێت، بچووك دەبێتەوە.

بۆ نموونە: ئەو شتانەی کـە لـە شـەودا بە ئەندێشـەی مرۆڤدا دێن، هـەتا بیریـان لـێ بکاتەوە و بایەخیان پێ بدات، لە بەرچاوی‌دا پتر گەورە دەبن. بـەڵام گـەر پشـت گوێیان بخات، نامێنن!

یان ئەگەر مرۆڤ شارە زەردەواڵەیەك بورووژێنێت ئەوا زیـاتر هێرشـی دەکەنـە سـەر، بەڵام گەر گوێیان نەداتێ، بڵاوەی لـێ دەکەن!

هـەموو یـەکێك لـە گرفتـە ماددی‌یەکانیش بـە هـەمان جـۆرە، چونکـە ئەگـەر مـرۆڤ گرنگی و بایـەخێکی گەورەی پێ بـدات، ئـەوا لـە جەسـتەوە تێپـەڕ دەبێـت و دەڕواتـە ناخەوە و لە دڵدا جێی خۆی دەکاتەوە، ئیتر لەوێوە دەبێت بە گرفتێکـی مەعنەوی و بـەرە بەرە زیاد دەکات و پـەرە دەسێنێت تـا دەبێتـە پاڵپشـتی گرفتـە ماددی‌یەکـە و درێژەی پێ دەدات.

بەڵام هـەرکات مـرۆڤ، لـە ڕێی "ڕازی بوونـی بـە قـەزای خـوا" ڕیشـەی هـەموو خەفەت و داخێکی لە دڵی خۆی‌دا دەرهێنا و، پشتی بە میهرەبانیی خواوەند بەست، ئـەوا نەخۆشی‌یە ماددی‌یەکەشی بەرەو کزی دەڕوات تا لـە ئـەنجامدا تـەواو دەبێـت و نـامێنێت، بە وێنەی ئەو درەختەی کـە ڕیشـەکانی دەردەهێنرێت، لـق و پـەل و گەڵاکانیشـی وشـك دەبن!

ڕۆژێکیان – بۆ دەربڕینی ئەم ڕاستییە – ئەم وتانەی خوارەوەم لەبەر خۆمەوە وت:

کاکی داماوی بێچارە!

واز لە سکاڵا و هاوار بهێنە و، پشت بە خوای گەورەی خۆت ببەستە..

چونکە سکاڵا – خۆی لە خۆیدا – بەڵایەکی ئاوێتەی بەڵایە و گوناهێکە لە دووتوێی گوناهبارییدا.

گەر بە بۆنەی ئەم بەڵایەتەوە "بەڵابەخش" بناسیت و بیدۆزیتەوە، ئەوا بەڵاکەت لە ڕاستیدا دەبێت بە بەخششێکی مەزن و سەفایەکی یەکجار زۆر.

بەڵام دنیاکەت – بە بێ خواناسی – سەرانسەر ئازارە و هەردەم ڕوو لە نەمانە.

کەواتە واز لە سکاڵا بهێنە و، لەم بەڵایەدا پشت بە خوا ببەستە و، قازانجی شوکرانەبژێری دەستی خۆت بخە، چونکە زەردەخەنەی گوڵ لە شەوقی ڕووی: "بولبولی عاشقیەتی"!

بۆچی لە دەست بەڵایەکی بچووك هاوار دەکەیت، لە کاتێکدا کە پڕ بە دنیا کۆڵی بەڵات لەسەر شانە؟!

زەردەخەنەی "تەوەککول" لە ڕووی بەڵادا بنوێنە، با ئەویش بە پێکەنین بەرەو ڕووت بێتەوە..

چونکە هەتا ئەو لە پێکەنیندا بێت، ئەوا هێدی هێدی بچووکتر دەبێتەوە، تا بە تەواوی نامێنێت.

بەڵێ، هەروەك مرۆڤ گەر بە ڕووی گەش و خەندانەوە پێشوازی لە دوژمنەکەی بکات ئەوا کەفوکوڵی ڕق و قینی نێوانیان کەم دەبێتەوە تا دەگاتە ئەوەی دوژمنایەتیی لە نێوانیاندا نەمێنێت، تەنانەت دوژمنایەتییەکەیان دەبێت بە ئاشتی و تەبایی، بە هەمان جۆر گەر مرۆڤ پشت بەخوای گەورە ببەستێت و لەو ڕێیەوە پێشوازی لە بەڵا و گیروگرفتەکان بکات، ئەوا سەرجەم گیروگرفتەکانی کۆتاییان پێ دێت، تەنانەت ئاسەواریشیان نامێنێت.

◆ *مەسەلەی سێهەم:*

هەموو سەردەمێك حوکمێکی تایبەتی خۆی هەیە. جا لەم سەردەمەی خۆماندا، کە "بێئاگایی" تیایدا پەرەی سەندووە، "بەڵا"ش شێوەی خۆی گۆڕیوە! واتە ئەوەی

سەبارەت بە هەندێ کەسەوە بە گرفت و "بەڵا" دادەنرێت، بۆ هەندێکی تر بە گرفت و بەڵا دانانرێت، بەڵکو جۆرێکە لە چاکە و بەزەیی خوا سەبارەت بەوان!

جا لەبەر ئەوەی من هەندێ لە بەڵادارانی ئێستا بە بەختەوەر دەزانم - بە مەرجێ ئەو بەڵایە ڕووی نەکردبێتە ئایینەکەیان - ئەوا پێم وا نییە بەڵاکانیان زیانبەخش بن تا ڕقم لەو بەڵایە بێتەوە! هەر لەبەر ئەوەشە کە بەزەییم بەو کەسانەدا نایەتەوە. چونکە سەرنجم داوە: هەرکام لەوانە کە هاتوون بۆ لام و سەردانیان کردووم، لەچاو هاوەڵانی تری خۆی زیاتر دەستی بە ئایینەکەیەوە گرتووە و پەیوەندیشی لەگەڵ دواڕۆژدا لە هی ئەوان گەلێ گەرموگوڕتر بووە! لەمەوە تێگەیشتم کە: نەخۆشیی ئەو جۆرە کەسانە "بەڵا" و موسیبەت نییە، بەڵکو یەکێکە لە نیعمەتە زۆر و لە ژمارە نەهاتووەکانی خوای گەورە، چونکە هەرچەند ئەم نەخۆشییە لەم دنیا کەم خایەن و فانییەدا ئازارێکی کەمی خاوەنەکەی دەدات، بەڵام سوودێکی زۆری بۆ ژیانی هەمیشەیی دواڕۆژی ئەو کەسە تێدایە و، بۆی دەبێت بە جۆرە پەرستشێکی بێگەرد و خاوێن!

بەڵێ، ئەم لاوەی کە ئێستا لە نەخۆشییەکەیدا دەستی بە فەرمانەکانی خواوە گرتووە و بەجێیان دەهێنێت، لەوە نەدەچوو - گەر تەندروستیی تەواو بوایە - ئەو فەرمانانەی جێبەجێ بکردایە! بەڵکو لەوانەیە، بەهۆی لاوی و هەڵوێستە نارەواکانی ڕۆژگارەوە، بەرەو خراپکاری هەنگاوی بنایە.

* * *

# کۆتایی

خوای باڵادەست بۆ مەبەستی دەرخستن و پیشاندانی دەسەڵاتی ڕەها و بەزەیی هەرە فراوانی خۆی: "بێ دەسەڵاتی" و "هەژاری"یەکی لە ئەندازەبەدەری لە سروشتی مرۆڤدا داناوە. مرۆڤیشی بە جۆرێ بەدی هێناوە کە لە چەندین لاوە "ئازار" و "خۆشی" بچێژێت، تاکو نەخش و نیگارە ڕەنگین و زۆرەکانی ناوە جوانەکانی خۆی لەودا دەربخات.

دەبینین خوای گەورە مرۆڤی لە شێوەی مەکینەیەکدا بەدی هێناوە کە سەدان ئامێری تێدایە و هەریەك لەو ئامێرانەش "ئازار" و "خۆشی" و "پاداشت" و "تۆڵە"ی تایبەتیی خۆیان هەیە. وەك بڵێی: ئەو ناوە جوانانەی خوای گەورە کە لە جیهاندا دەدرەوشێنەوە - ئەو جیهانەی کە مرۆڤێکی گەورەیە - بە هەمان جۆر لە مرۆڤیشدا - کە جیهانێکی بچووکە - بدرەوشێنەوە.. جا هەروەك لایەنە سوودبەخشەکانی مرۆڤ (وەك: تەندروستی و خۆشحاڵی و شتانی تر) بە وێنەی مەکینەیەکی شوکرانەبژێریان لێ دێت، بە هەمان جۆر ئامێرەکانی تری ئەم مەکینەیەش بە موسیبەت و نەخۆشی و ئازار دەکەونە گەڕ و، ئەو "هەژاری" و "بێ دەسەڵاتی"یەی مرۆڤ دەردەخەن، ئیتر نەك تەنها بە زمانێك، بەڵکو بە زمانی هەموو ئامێرێك لە ئەندامەکانی، پەنا دەباتە بەر خوا و لێی دەپاڕێتەوە. واتە مرۆڤ بەم جۆرە شتانەی کە کاری تێدەکەن و ڕێی لێ دەگرن، وەکو پێنووسێکی گەورە وایە کە هەزاران پێنووسی تری لێ بووبێتەوە و بەسەرهاتەکانی ژیانی پێ بنووسێت، چ لەسەر لاپەڕەکانی ژیانیدا و، چ لەسەر لاپەڕەکانی "لەوحی میسالی"دا، هەروەها تابلۆیەکی ڕازاوەی لە ناوە جوانەکانی خوا پێ دروست دەکات و، وەك چامەیەکی هۆنراوەی بەسۆز و تابلۆیەکی ئاگادارکردنەوە(لوحة إعلان)ی لێ دێت کە بە باڵای نیعمەتەکانی خوادا دەخوێنن.

ئیتر بەم جۆرە ئەرکی فەرمانبەرێتیی ناو سروشتی خۆی بەجێ دەهێنێت.

# بریسکەی سێهەم

**شتێك لە "چێژ و هەست و نەستەکان" ئاوێتەی ئەم بریسکەیە بووە. بۆیە تکام وایە بە پێوەرەکانی زانستی "مەنتیق" هەڵنەسەنگێنرێت، چونکە جۆش و خرۆشی هەست و نەستەکان ئاوڕ لە تەرازووەکانی "بیر" نادەنەوە و زۆر گوێش بە دەستوورەکانی "ژیری" نادەن!**

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿كُلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وجْهَهُ لهُ الْحُكْمُ وَإليهِ تُرجَعُونَ﴾** (القصص:٨٨).

دوو ڕستە هەن کە دوو حەقیقەتی گرنگ دەردەبڕن و تەفسیری ئەم ئایەتە مەزنە دەکەن، بە ڕادەیەك کە هەندێ لە شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی کردوویانن بە پوختەی ویردەکانیان و خەتمەی تایبەتیی خۆیانی پێ ئەنجام دەدەن. ئەو دوو ڕستەیەش بریتین لە: "یا باقی أنت الباقی.. یا باقی أنت الباقی"!

جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو ڕستەیە گەلێ واتای مەزنی ئەم ئایەتەیان تێدایە، ئەوا چەند سەرنجێك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دوو حەقیقەتە باس دەکەین کە ئەم دوو ڕستەیە دەریاندەبڕن.

✿ **سەرنجی یەکەم:**

وتنی یەکەم جاری: "یا باقی أنت الباقی" دڵی مرۆڤ لە غەیری خوای گەورە دادەبڕێت و جۆرە نەشتەرگەرییەك لە دڵدا ئەنجام دەدات و لە غەیری خوای دادەماڵێت. ڕوونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە:

لەبەر ئەوەی مرۆڤ چی‌یەتی(ماهیـة)یەکی گشـتیی تێدا دانراوە، ئەوا لـە چەندین ڕێگـاوە و بـە چـەندەها جـۆر پـەیوەندیی لەگـەڵ زۆربـەی بوونـەوەراندا هەیـە. جـا ئـەو چی‌یەتی‌یە گشتی‌یەی مرۆڤ هێندە توانا و لێـهاتنی خۆشەویستیی تێدایـە کـە لـە ناخـەوە سەرانسەری بوونەوەرانی بە گەرمی و توندوتیژی خـۆش بوێـت! ئـەوەتا هـەروەك خانـە و لانەکەی خۆی خۆش دەوێت، ئەم دنیا مەزنەشی خۆش دەوێـت.. هـەروەها وەك دڵـی بـە باخچەکەی خۆی خۆشە، بە هەمان جۆر دڵی بـە "بەهەشـتی بـەرین"یـش دەکرێتـەوە و لـە ناخــەوە ئارەزوومەندیــەتی. بــەڵام خــۆ ئــەو بوونەوەرانــەی کــە مــرۆڤ لــەم دنیایــەدا خۆشەویستیی خۆی بـۆ ئاراسـتە کـردوون هیچیـان نامێننـەوە، بـەڵکو تێکـڕا لەسـەر ڕێـی گەشتی نەماندا بـە خێرایی و بـەردەوامی دەڕۆن و هـەنگاو دەنێـن! بۆیـە مـرۆڤ هەمیشـە ئازاری جودایی دەچێژێـت و، خۆشەویسـتی‌یە لەبن‌نەهاتووەکەشی بـۆ دەبێـت بـە مایـەی ئازارێکی مەعنەویی بێ‌کۆتـایی، لـە ئەنجامی قوسـوور و کەمتەرخەمی‌یـەوە بەرامبـەر بـەو خۆشەویستی‌یە نەبڕاوەیەی کە لە ناخی‌دا دانراوە.

کەواتـە ئـەو ئازارانـەی کـە بەدەسـت ئـەو خۆشەویسـتی‌یەوە دەیـانچێژێت هـی کەمتەرخەمی کردنی خۆیەتی لە بەجێهێنانی ئەرکـەکانی ئـەو خۆشەویستی‌یەدا. چونکـە توانا و لێهاتنی خۆشەویستیی بۆ ئەوە دراوەتێ ئاراستەی ئەو کەسەیان بکات کە خاوەنی جوانیی هەتاهەتایی و ڕەهایە، کەچی مرۆڤ بە باشی و لە جێی شیاوی خـۆی‌دا بـەکاری نەهێنا و بـەرەو بوونـەوەرە فـانی و لـەناوچووەکان ئاراسـتەی کـرد، بۆیـە بـە ئـازاری جودایی و لێکدابڕانی لەو خۆشەویستە فانی‌یانەی گیرۆدە دەکرێت و سزا دەدرێت!

جا کاتێ کە مرۆڤ : "یا باقي أنت الباقي" دەڵێتەوە، بـۆ ئەوەیـە کـە: بـە تـەواوی لـەو کەمتەرخەمی‌یانە دەستبەردار ببێت و بە یـەکجارەکی پەیوەندی‌یـەکانی بـەو خۆشەویستە فانی‌یانەوە بپچڕێت، پێش ئەوەی کە ئەوان دەسـت لـەم دابشـۆن و پشـتی لـێ هەڵبکـەن! پاشان دووپات کردنەوەی ئەم ڕستەیە بۆ ئاراستە کردنی بیر و ڕوانینی مرۆڤە تەنها ڕووەو خۆشەویستی باقی و هەمیشەیی کە خوای گەورەیە.

واتە مرۆڤ لە ڕێی دووپات کردنەوەی ئەم ڕستەیەوە، دەڵێ:

(ئەی خوای گەورەم! جگە لە تۆ کەسی تر بە ڕاستی و دروسـتی نامێنێتـەوە. هـەرچی شـتی تری غەیری تۆ هەیە هەر هـەموویان فانی و لـەناوچوون. خۆ ئاشکراشـە کـە شتی

فانـی و لـەناوچوو شـایانی خۆشویستنی بـەردەوام و عیشـقی هەمیشـەیی نیـیە و هێنـدە ناهێنێت ئەو دڵەی پێوە پەیوەست بکرێت کە هەر لە سەرەتاوە بۆ هەمیشـەیی و مانـەوە و نەمری بەدی هێنراوە. جا مادەم بوونەوەرە فانییەکان من بەجێ دەهێڵن و بە ڕێی خۆیاندا دەڕۆن، ئەوا پێش ئەوەی بەجێم بهێڵن من دەست لەوان بەردەدەم و وازیان لـێ دەهێنـم و دەڵێم: "یا باقی أنت الباقی"..

واتـە بەوپـەڕی دڵنیاییەوە لـەو باوەڕ و یەقینـەدام کـە جگـە لـە تۆ - ئـەی خـوای گەورەم! - کەسی تر "باقی" نییە و، هەر شتێکیش لە بوونەوەراندا دارای "مانەوە" بێت هەرتۆ مانەوەت پێ بەخشـیوە و هێشتووتەتەوە. کەواتـە دەبێ مـرۆڤ تەنـها لـە نـاوەندی خۆشویستنی تۆ و لـە بازنـەی ڕەزامـەندیی تۆدا ئەوانـەی خـۆش بوێـت، دەنـا هیچیـان شایستەی ئەوە نین کە دڵیان پێوە پەیوەست بکرێت)!

ئـەم چەشنە حاڵەتـە، کـارێك دەکـات کـە "دڵ"ی مـرۆڤ واز لـەو خۆشەویسـتانەی بـهێنێت کـە لـەوەوپێش بـە جۆرێکـی بێسـنوور خۆشیدەویسـتن، چونکـە لـەم جـۆرە حاڵەتانـەدا مـرۆڤ مۆری فـەنا و نـەمان بەسەر ڕووی هـەموو ئـەو شتانەوە دەبینێـت کـە زووتـر جوانیـی تێـدا دەبینین و، هـەموو ئـەو پەیوەندییانـەش دەبچڕێـن کـە لـەوەوپێش مرۆڤیان پابەندی بوونەوەران کردبوو. دەنـا گـەر دڵـی مـرۆڤ واز لـەو خۆشەویستانەی نەهێنێت، ئەوا بە ئەندازەی ئەوان زام و ئازاری خـەم و حەسرەت لـە نـاخی دڵـیدا پـەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن.

ڕستەی دووهەمی: "یا باقی أنت الباقی"ش وەك مەڵهەمێکی شیفابەخش و سـارێژکار وایـە بەسـەر زامـی ئـەو نەشـتەرگەرییەدا دەهێـنرێت کـە ڕسـتەی یەکـەم لـە "دڵ" و پەیوەندییەکانیدا کردی. چونکە ئەم ڕستەی دووهەمە ئەوە دەگەیەنێت کە:

(ئەی خوای گەورە! هەر تۆم بەسە باقی بێت، چونکە مانـەوەی تۆ لـە بریـی مانـەوەی هەموو شتێکی ترە.. مادەم تۆ هەیت، ئەوا هەموو شتێکی ترم هەیە)!

بەڵێ، هـەرچی "جوانـی و چاکـە و کـەماڵ" بەسـەر ڕوخسـاری بوونەوەرانـەوە دەبینرێن و مایـەی خۆشویستنی ئـەو بوونەوەرانـەن، لـە ڕاستیدا، چـەند ئاماژەیـەکن بـۆ "جوانی و، چاکە و، کەماڵ"ی خواوەند کە باقیی ڕاستەقینەیە و، تێکڕا چەند سێبەرێکی

کزی ئەو جوانــی و چاکـە و کەماڵـەن کـە لـە پشتی چـەندەها پـەردەی زۆر و زەبـەندەوە دەرکـەوتوون، تەنانـەت چـەند سایە و سێبەرێکن بۆ سـێبەرەکانی درەوشـانەوەی نـاوە جوانەکانی خوای گەورە!

✿ **سەرنجی دووهەم:**

عیشقێکی توندوتیـژ بۆ "مانـەوە" لـە سروشتی مرۆڤدا هەیـە. تەنانـەت - بـە گومـانی خۆی - جـۆرە مانەوەیـەك لـە هـەموو خۆشەویستەکانیدا دەبینێـت. بگـرە هیـچ شـتێکی خۆش ناوێت گەر - بە وەهمی خۆی - "مانـەوە"ی تێـدا نـەبینێت! بـەڵام هـەر کـە بـیر لـە نەمانی ئـەو شتانە دەکاتـەوە و فـەنا و تیاچوونیـان دەبینێـت، لـە قوڵایــی نـاخی خۆیـەوە گرفتاری خەم و پەژارە دەبێت و ئاخ و حەسرەتی گەرمیان بۆ هەڵدەڕێژێت!

بەڵێ، هەرچی ئاخ و حەسرەت و پەژارەی جۆرەکانی "جودایی" هەن، هەرهەموویان چەند دەستەواژە و داخ هەڵڕشتنێکی خـەمناکن کـە لـە "عیشـقی مانەوە"ی نـاو نـاخی مرۆڤـەوە سـەرچاوە دەگـرن. چونکـە گـەر وەهمـی مانـەوە نەبوایـە هـەرگیز مـرۆڤ هیـچ شتێکی نەدەویست. تەنانەت دەتوانرێت بوترێ کە:

یەکێك لە هۆکارەکانی بوونی "جیهانی مانەوە و بەهەشتی هەمیشەیی" ئـەو ئـارەزووە بەتینە ڕەگداکوتاوەی ناو ناخی سـروشـتی مرۆڤە بۆ "مانەوە"و "هـەتـاهەتایی" و، ئـەو نـزا و لاڵانەوە گشتی و هەمەلایەنەشیەتی کە بـە کـەفوکوڵ و گـەرموگوڕی بـۆ "مانـەوە" دەیکات! بۆیە خـواوەندی شکۆمەندی "باقی" بەدەم ئـەو ئـارەزووە توندوتیـژەی مرۆڤـەوە ڕۆشت و دوعا و نزای کاریگەر و بەکوڵی لـێ گیرا کرد و، جیهانێکی "بـاقی"ی بـۆ ئـەم مرۆڤە "فانی"یە بەدی هێنا. چونکە ئایـا دەگونجێ بەدیهێنـەری بەخشـندە و میـهرەبان ئەو دوعا و نزا گشتی و بەردەوام و ڕەوا و خاوێنە گیرا نەکات کە گرۆی مرۆڤ - بـە زمـانی حـاڵ و گوفتـار - لـە نـاخی پێویستیی سروشتیی خـۆی و لـە قوڵایـی حـەز و ئـارەزووە بەتینەکانیەوە دەیکات، لە کاتێکدا کە هەر ئەو خواوەندە بەخشـندە و میهرەبانـە دوعـای زمانی حاڵی گەدە(معدة)ی بچووکی مرۆڤ گیرا دەکات و چەندەها جۆر خواردەمەنیی بـەتام و لـەزەتی بـۆ بـەدیدەهێنێت و ئـارەزووی جوزئیـی "مانـەوە"ی بـۆ تـێر و دڵنیـا دەکات؟!

دیارە نەخێر.. هەزار هەزار جار نەخێر! گەلێ مەحاڵە دەست بە ڕووی ئەم نزا و لالانەوەیەی مرۆڤەوە بنێت کە داوای "مانەوە"ی پێ دەکات. چونکە گیرانەکردنی نزا و لالانەوەی ئاوا، پێچەوانەی: دانستی هەمیشەیی و، دادگەریی کامڵ و، میهرەبانیی فراوان و، توانستی ڕەهای خوای گەورەیە!

جا مادەم مرۆڤ شەیدا و تاسەمەندی "مانەوە"یە، ئەوا سەرجەم چێژ و کەمالاتیشی - بە هەمان جۆر - شوێنکەوتەی "مانەوە"ن..

ئنجا مادەم "مانەوە"ش سیفەتێکی تایبەتە بە خواوەندی "باقی"ی شکۆمەند و..

مادەم ناوەجوانەکانی ئەو خوایەش تێکرا "باقی"ن و دارای مانەوەن و، ئاوێنە دەرخەرەکانی درەوشانەوەکانی ئەو ناوانەش ڕەنگی درەوشانەوەی ناوەکان دەگرن و لە حوکمی ئەودا دەبن، واتە جۆرە "مانەوە"یەك بەدەست دەهێنن..

ئەوا پێویستترین و مەزنترین ئەرکێك کە دەکەوێتە ئەستۆی مرۆڤەوە، بریتییە لەوەی کە:

پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو "باقی"یە شکۆمەندەدا پتەو بکات و، بە تەواوەتی دەست بە ناوە جوانەکانیەوە بگرێت. چونکە هەر شتێك لە پێناوی ئەو "باقی"یەدا بەخت بکرێت، جۆرێك لە جۆرەکانی "مانەوە"ی دەست دەکەوێت!

جا ئەم حەقیقەتە، ڕستەی دووهەمی: "یا باقي أنت الباقي" دەری دەبڕێت و، زامە مەعنەوییە قووڵەکانی مرۆڤ ساڕێژ دەکات. هەروەك دڵنیاییش بەو حەز و ئارەزووە بەتینەی "مانەوە"ی ناو ناخی سروشتی دەبەخشێت.

✿ **سەرنجی سێهەم:**

لەم دنیایەدا کاریگەریی "کات" بۆ لەناوبردنی شتان جیاوازە و لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر دەگۆڕێت. چونکە هەرچەندە بوونەوەران بە چەشنی بازنە هاوچەقەکان لەناو یەکتریدان، کەچی لە ڕووی نەمان و لەناوچوونیانەوە حوکمیان جیاوازە..

ئەوەتا هەروەك بازنەی جووڵەی میلەکانی: چرکەژمێر و کاتژمێری هەر سەعاتێك - لە ڕووی خێراییەوە - لە یەکتر جیاوازن، با لە ڕواڵەتیشدا لە یەك بچن.. مرۆڤیش بە هەمان جۆرە، حوکمی "زەمان" بۆ هەریەکە لە بازنەکانی: جەستە و، دەروون و،

دڵ و، ڕۆحی ئەو جیاوازە. چونکە لە کاتێکدا کە دەبینیت ژیان و مانەوەی "جەستە"ی مرۆڤ پابەندی مانەوەی ئەو ڕۆژە یان ئەو سەعاتەیە کە تیایدا دەژی و، ڕابوردوو و ئاییندەی نییە.. کەچی دەبینیت بازنە و مەیدانی بوون و ژیانی "دڵ"ی هێندە فراوانە کە چەندەها ڕۆژی پێش ئێستا و دوای ئێستاش دەگرێتەوە! تەنانەت بازنە و مەیدانی ژیانی "ڕۆح"ی مرۆڤ لەوەش گەلێ گەورە و مەزنترە، چونکە چەندەها سالی پێش ئەمڕۆ و چەندەها سالی دوای ئەمڕۆش لە خۆی دەگرێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم توانا و لێهاتنە: گەر "دڵ" و "ڕۆح"ی مرۆڤ بە: ناسین و پەرستنی خوای گەورە و، خۆشویستنی پەروەردگار و بەدەستهێنانی ڕەزامەندییەکانی، ژیانیان بەدەست هێنابێت، ئەوا - لەم ڕێیەوە - تەمەنە فانییەکەی "جەستە" تەمەنێکی هەمیشەیی لە ئامێز دەگرێت، تەنانەت لە خانەی نەمری و هەمیشەییدا ئەم تەمەنە "باقی"و نەبڕاوەیەی بۆ بەرهەم دەهێنێت. کەواتە ئەم تەمەنە "فانی"یە وەك تەمەنێکی "باقی" و هەمیشەیی لێ دێت!

بەلێ، بەسەربردنی تەنها یەك چرکە لە پێناوی: خواوەندی حەق و "باقی"دا و، بۆ خۆشویستنی و، پلە بەرزبوونەوەی مرۆڤ لە ناسینیدا و، لە ڕێی ڕەزامەندییەکانی ئەودا، بە سالێکی تەواو دادەنرێت. بەلکو ئەو چرکەیە ژیانێکی باقی و هەمیشەییە و هەرگیز "نەمان" بە خۆیەوە نابینێت. بەلام گەر سالێکی تەمەن - کە بێ گومان تەواو دەبێت و نامێنێت - لە پێناوی خوای گەورەدا بەسەر نەبرێت، ئەوا وەك چرکەیەکی کتوپڕی وایە. کەواتە ژیانی بێئاگایان هەرچەندەش درێژ بێت هێشتا وەك چەند دەم و ساتێکی کەمخایەن وایە، کە تەنها چرکەیەکیش تێپەڕ ناکات!

ئەم وتە بەناوبانگەی خوارەوە دەبێت بە بەلگەی ئەم ڕاستییە، ئەوەتا دەلێت:

"سِنَةُ الفِراقِ سَنَةٌ، و سَنَةُ الوِصالِ سِنَةٌ"!

واتە: تەنها یەك چرکەی ماوەی جودایی و لێکدابڕان هێندە بە لای مرۆڤەوە درێژ خایەنە کە دەلێی سالێکی تەواوە، کەچی ماوەی یەك سالی ڕەبەقی بەیەكشادبوون هێندە کورت و کەمخایەنە کە وەك ماوەی یەك چرکە وایە!

بەلام من بە پێچەوانەی ئەم وتە بەناوبانگەوە دەلێم:

یەك چرکەی تەمەن کە مرۆڤ لە بازنەی ڕەزامەندییەکانی خوای گەورە و لە پێناوی خواوەندی "باقی" و شکۆمەندیدا بەسەری ببات، واتە یەك چرکەی ئەم بەیەكشادبوونە، نەك هەر تەنها وەك سالێك وایە، بەڵکو بە وێنەی پەنجەرەیەکی ئەوتۆیە کە بەسەر ژیانی باقی و هەمیشەییدا بڕوانێت! هەروەها ئەو جودایی و لێکدابڕانەش کە لە نیگای ڕوانینی بێئاگایی و گومڕاییەوە بە جودایی و لێکبڕان دەردەکەوێت، نەك هەر سالێکی ڕەبەق وەك چرکەیەك لێ دەکات، بەڵکو هەزاران ساڵ دەکات بە ماوەی تەنها یەك چرکە لە پێش چاوی مرۆڤدا!

پەندێکی تر هەیە لەوەی پێشوو بەناوبانگترە و پشتی ئەم بۆچوونەی ئێمە دەگرێت، دەڵێت:

أرضُ الفلاةِ معَ الأعداءِ فنجانٌ     سَمٌّ الخِياطِ مع الأحبابِ ميدانُ(١)!

خۆ ئەگەر بمانەوێت ڕوویەکی "ڕاست"ی ئەو وتەیەی پێشوو دەربخەین، ئەوا بەم جۆرە دەبێ کە:

ماوەی بە یەك شادبوونی بوونەوەرانی "فانی" ماوەیەکی گەلێ کورتە، ئەوەتا ماوەیەکی فانییە و لەناو دەچێت و نامێنێت. خۆ هەرچەندەش درێژە بکێشێت هەر هێشتا بە کەم دادەنرێت، چونکە بە ماوەی چاوترووکاندنێك بەسەردەچێت و دەبێت بە خەون و خەیاڵێکی کاتی و ڕێبوارانەی ئەوتۆ کە دوای نەمانی خۆی خەم و پەژارە لە دڵدا بەجێ دەهێڵێت. کەواتە "دڵی مرۆڤ" کە تامەزرۆ و تاسەمەندی "مانەوە"یە لە سالێکی تەواوی ئەم چەشنە بەیەك شادبوونانە، مەگەر تەنها بە ئەندازەی ماوەی یەك چرکە، دەنا هیچ تام و لەزەتێکی لێ ناچێژێت..

بەڵام جودایی هێندە درێژخایەنە و مەودا و مەیدانەکەشی ئەوەندە فراوانە کە تەنها ماوەی یەك چرکە، بە قەدەر سالێکی ڕەبەق، بەڵکو بە ئەندازەی چەندەها سالی زۆر، جودایی تێدا کۆ دەبێتەوە. چونکە "دڵ"ی مرۆڤ کە موشتاقی مانەوە و تاسەمەندی نەمرییە، هێندە خەم بە جودایی دەخوات کە تەنانەت جودایی ماوەی یەك دانە چرکەش ئازاری دەرخوارد دەدات و بە چەشنێك پێوەی دەتلێتەوە کە دەڵێی کەوتووەتە ژێر باری

(١) واتە: دەشتایی فراوان و بەرین هێندەی فنجانێك بچووکە ئەگەر تیایدا لەگەڵ دوژمناندا بژیت، کونیلەی دەرزیش وەکو گۆڕەپانێکی گەورە وایە، ئەگەر تیایدا لەگەڵ دۆست و هاودەماندا بیت. (وەرگێڕ)

ئازاری قورسی چەندین ساڵی جوداییەوە! چونکە جودایی ماوەی ئەو یەك چرکەیە چەندەها جۆری لەژمارەبەدەری جودایی تری یاد دەخاتەوە.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە ڕابوردوو و ئایندەی هەموو جۆرە خۆشەویستییە نزمە ماددییەکان، پڕن لە چەندەها جۆری لێکدابڕان و جودایی. جا بەو بۆنەیەوە، ئێمەش دەڵێین:

خەڵکینە!

ئایا دەتانەوێت تەمەنی کەم و فانیی خۆتان بگۆڕن بە تەمەنێکی باقی و درێژخایەن؟ تەنانەت بە تەمەنێك کە بەروبوومی سوود و قازانجتان بۆ بگرێت؟

مادەم وەڵامتان "بەڵێ"یە، کە وەڵامێکە مرۆڤێتیی مرۆڤ داخوازیەتی، ئەوا تەمەنتان لە پێناوی خواوەندی "باقی"دا بەسەر ببەن، چونکە هەر شتێك ڕوو لە "باقی" بکات، یەکێك لە درەوشانەوە باقییەکانی ئەوی دەست دەکەوێت!

جا مادەم مرۆڤ زۆر بە توندوتیژی داوای تەمەنێکی درێژ دەکات و ئارەزوومەندی مانەوەیە و، "هۆکار"ێکیشی لە بەردەمدایە کە ئەم تەمەنە فانییەی بۆ بگۆڕێت بە تەمەنێکی ئەوتۆ کە لەناوەرۆکدا درێژبێت.. ئەوا بێ هیچ گومانێك، گەر مرۆڤ مرۆڤێتیی خۆی لەدەست نەدابێت، زۆر بە گەرمی و پەرۆشەوە بە دوای ئەو "هۆکار"ەدا دەگەڕێت و هەموو شوێنێکی بۆ دەپشکنێت و تێدەکۆشێت کە ئەو شتە گونجاوە بکات بە کردارێکی بەرجەستە و لەبەرچاو. بێ هیچ گومانێکیش بە هەموو هەڵسوکەوت و جموجوولەکانیەوە بەرەو ئەو ئەنجامە دەکەوێتە ڕێ.

ئەو هۆکارەش ئەمەیە کە:

بۆ خوا کار بکەن.. لەبەر خوا بە یەك بگەن.. لە پێناوی خوادا تێبکۆشن.. با هەموو جموجووڵ و ڕەفتارێکتان لە چوارچێوەی ڕەزامەندیی خوا (واتە: بۆ خوا.. لەبەر خوا.. لە پێناوی خوا)دا بێت.. ئەو کاتە دەبینن کە هەموو خولەکەکانی ئەم تەمەنە کورتەتان بووە بە چەندەها ساڵی زۆری درێژخایەن.

"شەوی قەدر" ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات، چونکە هەرچەندە لە خۆیدا یەك تاقە شەوە، کەچی - بە دەقی قورئانی پیرۆز - لە هەزار مانگ باشترە، واتە لە حوکمی هەشتا و ئەوەندە ساڵدایە!

ئاماژەیەکی تریش بۆ ئەم ڕاستی‌یە هەیە، کە بریتی‌یە لەو قاعیدەیەی لە لایەن ئەهلی ویلایەت و حەقیقەتەوە سەلماوە و پێی دەوترێ: "فراوان بوونی کات"(بسط الزمان) و، میعراجی پێغەمبەر ﷺ بە کردەوە دەیچەسپێنێت و دەری‌دەخات. ئەوەبوو چەند خولەکێکی کەم لەو میعراجەدا هێندەی ماوەی چەندەها ساڵ فراوان بوون و، سەعاتەکانی میعراج بە ئەندازەی هەزاران ساڵ فراوانی و هەمەلایەنگیری و درێژی‌یان بەدەست هێنا. چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی میعراجەوە ڕۆشتە ناو جیهانی بەقاء(مانەوە)ەوە. خۆ ئاشکرایە کە چەند خولەکێکی کەمی جیهانی "باقی" جێی هەزاران ساڵی جیهانی "فانی"ی تێدا دەبێتەوە.

هەروەها - جگە لە میعراج - ئەو ڕووداوە زۆرانەش کە بەسەر ئەولیا و پیاوچاکاندا هاتوون، ڕاستیی: (بسط الزمان) دەچەسپێنن. چونکە هەندێك لەو ئەولیایانە لە ماوەی یەك خولەکدا ئەوەندە کاروباریان ئەنجام داوە کە خەڵکی تر مەگەر لە ماوەی یەك ڕۆژدا ئەنجامی بدەن.. هەندێکی تریان لە ماوەی یەك سەعاتدا هێندە کاری گرنگی ڕایی کردووە کە بەلای خەڵکەوە بە ماوەی ساڵێك ئنجا ڕایی دەکرێن.. هەندێکی تریشیان لە ماوەی یەك خولەکدا هەموو قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە!

جا ئەم چەشنە ڕیوایەتانەی کە لەوانە دەگێڕێنەوە هەرگیز گومان توخنیان ناکەوێت، چونکە ڕاوی‌یەکان هەموویان پیاوچاك و ڕاستگۆن و خۆیان زۆر بەرزتر ڕاگرتووە لەوەی کە دابەزنە ئاستی قسەی دەمهەڵبەست و درۆ ڕێکخستن. چ جای ئەوەی کە ڕووداوەکانیش گەلێ زۆر و موتەواتیرن و لە ئەنجامی بینین و چاوپێکەوتنەوە ڕاوی‌یەکان دەیانگێڕنەوە. کەواتە هەرگیز گومانیان تێدا نی‌یە و، "فراوانبوونی کات" ڕاستی‌یەکی چەسپاوە(١).

---

(١) خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿قالَ قائِلٌ منهم كَمْ لَبِثْتُمْ قالُوا لَبِثْنَا يوَماً أو بعضَ يومٍ﴾ (الكهف:١٩)، ﴿وَلَبِثُوا في كَهْفِهِم ثلاثَ مِائـــةٍ سِنِينَ وَازْدادُوا تِسْعاً﴾ (الكهف:٢٥).
ئەم دوو ئایەتەی سەرەوە بەڵگەن لەسەر: کورتبوونەوەی کات(طي الزمان) هەروەك ئەم ئایەتەی خوارەوەش بەڵگەیە لەسەر فراوانبوونی کات(بسط الزمان):
﴿وإنَّ يَوْماً عِنْدَ رَبِّكَ كَألْفِ سَنَةٍ مما تَعُدُّون﴾ (الحج:٤٧). (دانەر)

خۆ جۆرێکی هەیە کە هەموو کەسێك باوەڕی پێیەتی و تەسدیقی دەکات، کە بریتی‌یە لەو خەونانەی مرۆڤ دەیانبینێت و، هێندە حاڵ و بارودۆخی تێدا بەسەر دێت و ئەوەندەش قسەی تێدا دەکات و لەزەت و ئازاری تێدا دەچێژێت کە لە جیهانی بێداری‌دا پێویستیان بە ڕۆژێکی تەواو تەنانەت لەوانەیە بە چەندەها ڕۆژ ببێت!

**پوختەی ئەمانەی کە باس کران:**

هەرچەندە مرۆڤ بەدیهاتوویەکی "فانی"یە، کەچی بۆ "مانەوە" بەدی هێنراوە، چونکە بەدیهێنەرەکەی بە وێنەی ئاوێنەیەکی وێنەدەرەوەی درەوشانەوە باقی‌یەکانی خۆی بەدیی هێناوە و.. چەند ئەرکێکی ئەوتۆشی خستووەتە ئەستۆی کە بەرهەمی "باقی" دەبەخشن و.. بە شێوەیەکی هێندە جوانیش ڕوخساری ئەوی کێشاوە کە کردوویەتی بە خولگەی نەخشونیگاری درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی.

لەبەر ئەوە، بەختەوەری و کارمەندیی بنەڕەتیی ئەم مرۆڤە لەوەدایە کە:

بە هەموو هێز و ئەندام و هەستێکی و بە سەرجەم توانا و لێهاتنە سروشتی‌یەکانیەوە ڕوو بکاتە ئەو "باقی"یە و.. لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا هەنگاو بنێت و.. دەست بە ناوە جوانەکانیەوە بگرێت و.. بە وێنەی دووپات کردنەوەی "زمان"ی، بە سەرجەم لایەنە ناسکەکانی چەشنی "دڵ"و "ڕۆح" و "ژیری"یشی، هەمیشە: "یا باقي أنت الباقي" دووپات بکاتەوە!

هو الباقي، هو الأزلي الأبدي، هو السرمدي، هو الدائم، هو المطلوب، هو المحبوب، هو المقصود، هو المعبود.

﴿**سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ**﴾.

﴿**رَبَّنَا لا تُؤاخِذْنَا إنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا**﴾.

# بریسکەی چوارەم

(ناوی: "منهاج السنة" بۆ ئەم پەیامە پەسەند کرا)

## ڕێبازی سوننەت

**هەرچەند مەسەلەی "ئیمامەت" بابەتێکی فەرعی‌یە لە ئیسلامدا، بەڵام لەبەر زۆریی بایەخ پێدانی لە لایەن کتێبەکانی زانستی کەلام و ئوسوولی دینەوە، لە نێوان "بابەتەکانی ئیمان"دا جێی بۆ تەرخان کراوە و، لەم ڕووەوە پەیوەندیی بە خزمەتە سەرەکی‌یەکەمانەوە بۆ دروست بووە کە خزمەتی قورئان و ئیمانە. بۆیە بە شێوەیەکی جوزئی باسی لێوە کراوە.**

بسم الله الرّحمن الرّحيم

**﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ ما عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ ۞ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللّٰهُ لا إلهَ الاّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾**(التوبة:١٢٨-١٢٩).

**﴿قُلْ لا أَسْئَلُكُم عَلَيْهِ أَجْراً إلاّ الْمَوَدَّةَ في الْقُرْبَى﴾** (الشورى: ٢٣).

وا لە نێوان "دوو مەقام"دا ئاماژە بۆ کۆمەڵە ڕاستی‌یەکی مەزن دەکەین کە لە دەریای ئەم ئایەتە مەزنانەدا شەپۆل دەدەن:

## مەقامی یەکەم

"لە چوار سەرنج پێکهاتووە"

❑ **سەرنجی یەکەم:**

ئەم سەرنجە، کەماڵی میهرەبانی و بەزەیی نەبڕاوەی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە نەتەوەکەی دەردەخات:

بەڵێ، چەندین ڕیوایەتی صەحیح هەن مەودای میهرەبانیی کامڵ و شەفەقەتی تەواوی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە نەتەوەکەی دەردەخەن، وەك ئەو ڕیوایەتەی کە ڕوونی دەکاتەوە: لە ڕۆژی حەشری مەزن و لەو دەمەدا کە هەموو کەسێك تەنانەت پێغەمبەرانیش - درووديان لەسەر بێت - لەتاو سام و شکۆ و هەیبەتی ئەو ڕۆژەدا دەڵێن: "نفسي.. نفسي"، پێغەمبەری ئازیز ﷺ لەو ڕۆژەدا دەفەرموێ: "أُمّـتي.. أُمّـتي"(١). جا هەروەك ئەم ڕیوایەتانەی کە شەفەقەتی مەزنی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر نەتەوەکەی ڕوون دەکەنەوە ئەمەیان گەیاند، لە کاتی لەدایکبوونیشیدا دایکی بەڕێزی گوێی لێ بووە کە بەو ساوایی‌یەشی هەر بە نزای: "أُمّتي.. أُمّـتي" لالاوەتەوە، هەروەك لای ئەهلی کەشفی ئەولیا و پیاوچاکانەوە پشت ڕاست کراوەتەوە. جگە لەمانە، سەرجەمی ژیانی بەپیت و پیرۆزی و، ئەو ڕەوشتە ڕەنگین و بەرز و بەسۆز و میهرەبانی‌یانەش کە لە سەرانسەری ئاسۆکانی جیهاندا بڵاوی کردنەوە، کەماڵی سۆز و بەزەیی و شەفەقەتی ئەو دەردەخەن، هەروەك - لە ڕوویەکی ترەوە - پێغەمبەر ﷺ خۆیشی شەفەقەتە مەزنەکەی بەرامبەر نەتەوەکەی بە پێویستیی بێ‌سنووری خۆی دەرخستووە بەو سڵاواتانەی کە نەتەوەکەی پێشکەشی دەکەن. ئەمەش مەودای پەیوەندی‌یە میهرەبانەکەی پێغەمبەر ﷺ بە سەرجەمی بەختەوەری‌یەکانی نەتەوەکەیەوە، دەردەخات.

لە ڕووناکیی ئەم میهرەبانی‌یە گشتی و سۆز و بەزەیی‌یە فراوانەی ئەم ڕابەرە میهرەبانەدا ﷺ دەردەکەوێت کە: پشت هەڵکردن لە سوننەتی پیرۆز و خاوێنی، لە ڕاستی‌دا ناشکوری و بێ‌نەزانینێکی گەلێ گەورەیە، تەنانەت بە مردنی ویژدانیش لە قەڵەم دەدرێت. بەڵێ، لەم دەرەنجامە تێبگە و بۆ خۆت لێکی بدەرەوە.

### ❑ سەرنجی دووهەم:

پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە ناوەندی ئەرکی گەورە و گشتیی "پێغەمبەرایەتی‌یەکەی"دا، میهرەبانی‌یە مەزنەکەی خۆی بەرامبەر چەند کاروبارێکی جوزئی و تایبەتی دەرخستووە. جا بەکارهێنانی ئەو شەفەقەتە مەزن و میهرەبانی‌یە فراوانە بۆ ئەو بابەت و کاروبارە جوزئی‌یانە بەپێی "ڕواڵەت" لەگەڵ گەورەیی ئەرکی پێغەمبەرێتی‌دا ناگونجێ. بەڵام بەپێی

---

(١) جزء من حديث الشفاعة الطويل، والحديث بطوله أخرجه البخاري برقم: ٣٣٤٠ و ٣٣٦١ و ٤٧١٢ ومسلم برقم: ١٩٤ والترمذي برقم: ٤٥٥١ "تحفة" كلهم من حديث أبي هريرة رضي الله عنه، باختلاف في السياق. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەی "اللمعات"ەوە).

"ڕاستی و واقیع" ئەو بابەتە جوزئی و كارە تایبەتی‌یانە، نوێنەر و پێشەنگی سەرەتای زنجیرەیەكن كە لە داهاتوودا ئەركی گشتیی پێغەمبەرایەتی‌یەكەی دەگرنە ئەستۆ، بۆیە ئەو بایەخە زۆرەی بە نوێنەری ئەو زنجیرەیە داوە.

بۆ نموونە: ئەو شەفەقەتە زۆر و گرنگی‌یە لەڕادەبەدەرەی كە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر حەزرەتی حەسەن و حسەین - لە تافی منالّی‌یاندا - نواندی، تەنها خۆشەویستی و شەفەقەتێكی سروشتی و هەڵقوڵاوی هەستی پەیوەندیی خزمایەتی نی‌یە، بەڵكو جگە لەمەش، لە سەرچاوەی ئەو بەسیرەتەوە هەڵقوڵاوە كە دەبینێت ئەم دوانە سەرەتای زنجیرەیەكی نوورانیی ئەوتۆن لە داهاتوودا ئەركێكی گرنگی "پێغەمبەرایەتیی مەزن"ی ئەو ڕادەپەڕێنن و، هەریەكەیان سەرچاوە و نوێنەر و پێشەوای كۆمەڵێكی گەورەی میراتگری پێغەمبەر ﷺ دەبن.

بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ لەبەر گەلێ كەسی میراتگری ئەركی پێغەمبەرێتی‌یەكەی، ئەوانەی كە وەك "مەهدی" وان و هەڵگری شەریعەتە بێ‌گەردەكەین و لە نەوە و وەچەی نوورانی و پیرۆزی حەزرەتی حەسەنن وەك شێخی گەیلانی[1]، حەزرەتی حەسەنی لە ئامێز گرتووە و بەكەماڵی سۆز و شەفەقەت و میهرەبانی‌یەوە سەری ماچ كردووە. چونكە پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە ڕێی بینایی و بەسیرەتی پێغەمبەرێتی‌یەوە ئەو ئەركە خاوێن و مەزنانەی بینیوە كە ئەو بەڕێزانە لە داهاتوودا دەیانگرنە ئەستۆ. بۆیە پێشەكی ڕێزی لە كار و خزمەتگوزاری‌یەكانیان ناوە و، لە بریی هەموویان، وەك نیشانەیەكی ڕێز و پێزانین و هاندان، سەری حەزرەتی حەسەنی ماچ كردووە!

---

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە سالّی ٤٧٠ی كۆچی لە گەیلان هاتووەتە دنیا و، لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامی‌یەكانی ئەو ڕۆژگارەی لای زانایانی پایە بەرزی بەغدا خوێندووە. یەكێكە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چەندەها كەس لە گاور و جوولەكەكان لە خزمەتی‌دا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستی‌دا تۆبەیان كردووە و دەستبەرداری كردەوە خراپەكان بوون. چەند كتێبێكی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الرباني). لە سالّی ٥٦١ك لە تەمەنی نەوەد سالّی‌دا كۆچی دوایی كردووە و لە قوتابخانەكەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە ڕۆڵی كاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو فەسڵانە دەكەین كە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) خوا لێی خۆش بێت، لە بەرگی یەكەمی (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری كردوون، هەروەها كتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسینی: (د. ماجد عرسان الگيلاني). (وەرگێر)

پاشان ئەو بایەخە مەزنەی کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە حەزرەتی حسەینی داوە و سۆزی گەرم و بەتینیشی بەرامبەری دەربڕیوە، لەبەر ئەو پێشەوا و مەردە مەزنانەیە کە میراتگری ڕاستەقینەی پێغەمبەریتییەکەین و چەشنی "مەهدی" وان و لە نەوەی نوورانیی حەزرەتی حسەینن، وەك: حەزرەتی "زەینولعابیدین"[(١)] و "جەعفەری صادق"[(٢)]. بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ لەبەر هەموو ئەو گەورە مەردانەی کە لە داهاتوودا سەری ئیسلام بەرز دەکەنەوە و لە دوای خۆی ئەرکی پێغەمبەرایەتییەکەی ڕادەپەڕێنن، گەردنی حەزرەتی حسەینی ماچ کرد و شەفەقەتی لەڕادەبەدەر و کەماڵی بایەخ پێدانی لە ئاستدا دەربڕی!

بەڵێ، ڕوانینی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هێشتا لە دنیادا بووە و لە باشترین سەدەی بەختەوەریدا ژیاوە بە "دڵی هاوڕاز و ڕاهاتووی لەگەڵ غەیبی پەنهان"دا مەیدانی حەشری بەرینی ناو جیهانی ئەودنیای هەتاهەتایی بینیوە.. ئەو ڕوانینەی کە هەر لەسەر زەوییەوە بەهەشتی ناو ئاسمانە بەرزەکانی پێ دیوە و سەیری مەلائیکەتی پێ کردووە.. کە ڕووداوە شارراوەکانی پشتی پەردەی تاریك و دێرینی (هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە، دروودی لەسەر بێت) چاو لێ بووە، تەنانەت بە بینینی خواوەندی مەزنیش شەرەفمەند و بەختەوەر بووە.. بێ هیچ گومانێك ئەم ڕوانینە نوورانی و بەسیرەتە داهاتووبینە، قوتبە گەورەکان و پێشەوایانی میراتگری ئەرکی پێغەمبەرایەتی و مەهدییانی داهاتووی نەوەی حەزرەتی حەسەن و حسەینی دیوە و، لە بریی هەموو ئەوانە، سەری ئەمانی ماچ کردووە!

بەڵێ، ماچکردنی سەری حەزرەتی حەسەن - خوای لێ ڕازی بێت - لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەشێکی گەورەی شێخی گەیلانیی تێدایە!

---

(١) زەینولعابیدین: (٣٦-٩٤ کۆچی) ناوی عەلی و کوڕی حەزرەتی حسەینی کوڕی حەزرەتی عەلییە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. هێندە سەرقاڵی خواپەرستی بووە کە بە نازناوی "زەینولعابیدین" و "سەججاد" ناوبانگی دەرکردووە. باپیری سەرجەم ساداتی حسەینییە. لەلایەن خەلکی ڕۆژگاری خۆی بە: (زانست و تەقوا و تەوازوع و ئارام و پێشەوای شارەزای ڕازەکانی قورئان و سوننەت و ئیمانی دامەزراو) ناسراو بووە. کۆمەڵێ ئامۆژگاری و گوفتاری پڕ لە پەند و دانستی دوای خۆی بەجێ هێشتووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئیمام جەعفەری صادق (٨٠-١٤٨ك/٦٩٩-٧٦٥ز) کوڕی ئیمام محەممەد باقری کوڕی ئیمام عەلی زەینولعابیدینی کوڕی حەزرەتی حسەینە، خوا لە هەموویان ڕازی بێت. یەکێکە لە گەورە مەردانی تابیعین و پلەیەکی بڵندی لە زانستدا بووە و چەند کەسێکی پایە بەرزی وەك ئیمامی ئەبوو حەنیفە و ئیمامی مالیك دەرسیان لە لا خوێندووە. لە دایك بوون و کۆچی دواییشی لە شاری مەدینەدا بووە. (وەرگێڕ)

❏ سەرنجی سێهەم:

واتای ئایەتی: ﴿إِلاّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ - بەپێی تەفسیر و بۆچوونێك - ئەوەیە کە: پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە کاتی ئەنجامدانی کاری پێغەمبەرێتی‌یەکەی‌دا جگە لە خۆشویستنی ئالی بەیتەکەی هیچ پاداشتێکی تری لە کەس ناوێت.

ئەگەر بوترێت: کەواتە بەپێی ئەم واتایە پاداشتێك لە ڕووی خزمایەتی‌یەوە ڕەچاوکراوە، کەچی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات:١٣) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی لە ڕووی: (خۆ نزیك کردنەوەی مرۆڤەوە لە خوای گەورە، بە تەقوا) بەردەوام دەبێت.. نەك لە ڕووی (خزمایەتی‌یەوە).

لە وەڵامدا دەڵێین:

پێغەمبەر ﷺ بەو ڕوانینە هاوڕاز و ئاشنا لەگەڵ غەیبەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، بینیبووی کە: لە داهاتوودا ئالی بەیتی وەك درەختێکی مەزن و نوورانی‌یان لێ دێت، لق و پەل بۆ سەرجەمی جیهانی ئیسلام دەهاون و.. زۆربەی ڕەها و گشتیی ئەو کەسانەش کە چینە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامی بەرەو خێر و ڕاستەشەقامی هیدایەت ڕێنمایی دەکەن و، نموونەی بەرجەستەی هەموو کەماڵاتی مرۆڤن، لەناو ئالی بەیتدا سەر هەڵدەدەن.

هەروەها پەردەی لە ڕووی ئەوەش لاداوە کە: دوعای نەتەوەکەی لە تەحیاتی نوێژدا سەبارەت بە "ئالی بەیت" لای خوای گەورە گیرا بووە، کە بریتی‌یە لە: "اللهم صل على محمدٍ وعلى آل محمد، كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم في العالمين، انك حميد مجيد". واتە هەروەك زۆربەی ڕابەرانی نوورانی و هیدایەتدەرانی نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - پێغەمبەرن و لە نەوە و ئالی ئەون، بە هەمان جۆر، پێغەمبەر ﷺ بینیویەتی کە قوتبەکانی ئالی بەیت لە داهاتووی نەتەوەی حەزرەتی موحەممەددا ﷺ بە چەشنی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل ئەرکی مەزنی خزمەتگوزاریی هەمەلایەنە و جۆراوجۆری ئایینی ئیسلام دەگرنە ئەستۆ و ڕایدەپەڕێنن، لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دراوە کە بڵێت: ﴿قُلْ لا أَسْئَلُكُم عَلَيْهِ أَجْراً إِلاّ الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ و داوای خۆشویستنی ئالی بەیتی لە نەتەوەکەی کردووە.

ئەو بەڵگەیەش کە پشتی ئەم ڕاستی‌یە دەگرێت ئەوەیە کە لە ڕیوایەتی تردا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "يا أيها الناس إني قد تركت فيكم ما إن أخذتم به لن تضلّوا:

كتاب الله وعترتي أهل بيتـــي"(١) چونکە ئـالی بـەیت سـەرچاوە و پارێزگـارانی سـوننەتی خاوێنی پێغەمبەرن ﷺ و یەکەم کۆمەڵن شوێنپێ هـەڵگرتنی سـوننەتیان لـە ئەستۆ نـراوە. بەم جۆرە و بەم واتا و ناوەرۆکانـەی ئێستا لـێرەدا بـاس کـران، ڕاستیی ئـەم فەرموودەیـە ڕوون دەبێتەوە. واتە بە: شوێنکەوتنی تەواوەتیی قورئـان و سـوننەتی پـیرۆز. بـە واتایـەکی تر: مەبەست لـە ئـالی بـەیت لـە ڕووی ئـەرکی پێغەمبەرایەتی‌یـەوە: شـوێنپێ هـەڵگرتنی سـوننەتی پێغەمبـەرە ﷺ، چونکـە ئـەو کەسـەی واز لـە سـوننەتی پـیرۆز دەهێنێـت – لە ڕاستی‌دا – لە ئالی بەیت ناژمێررێت و هەرگیز ناکرێ لایەنگری ڕاستەقینەی ئـالی بـەیت بێت.

پاشان حیکمەتی ویستی پێغەمبـەر ﷺ لـە کۆکردنـەوەی نەتەوەکـەی لـە دەوری ئـالی بەیتدا ئەوەیە کە: پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە ڕوخسەتێکی خوایی، زانیبووی: بـە تێپـەڕبوونی کـات وەچـەی ئـالی بـەیت زیـاد دەبن و ئـایینی ئیسـلامیش لـە ژیـانی موسڵمانانـدا بـەرەو لاوازی دەڕوات، جـا لــە کــاتێکی ئــاوادا کۆمــەڵێکی هاوپــەیوەندی و یــەکگرتووی لەوپەڕی هێز و زۆری‌دا بۆ موسڵمانان بە پێویسـت دادەنرێت، تـاکو ببێـت بـە مەڵبـەند و تەوەرەیـەك بـۆ بـەرەوپێش‌چوونی جیــهانی مەعنــەویی ئیســلام. پێغەمبــەر ﷺ ئەمــەی بــە "ڕوخسەتی خوای گەورە" زانیوە و، ویستوویەتی نەتەوەکەی خۆی لەو ڕۆژگارانەدا لـە دەوری ئالی بەیتی جەم بکات.

بەڵێ، هەرچەند لە ئیمان و بیر و باوەڕدا ئالی بەیت پێشکەوتووتر نین بەسـەر کەسانی تردا، بەڵام لە ملکەچبوون و لایەنگرتن و "وەلاء"دا بۆ ئیسـلام گەلـێ پێشیان دەکـەون، چونکە ئەوان بە فیطــرەت و وەچـە و سروشـت وەلائیـان بـۆ ئیسـلامە، وەك ئاشکراشـە لایەنگیری و وەلائـی سروشتی، بـا لاواز و نادیـار و تەنانـەت لەسـەر ناحـەقیش بێـت، لـە لایەن خاوەنەکەیەوە وازی لـێ ناهێنرێت، چ جای وەلاء و لایـەنگیری بـۆ ڕاستی‌یەك کـە زنجیرەی باپیرانی پەیوەستی بوون و گیانیان لە پێنـاودا بـەخت کـردووە و شـەرەفمەندی و سەربەرزی‌یان پێ بەدەست هێنـاوە. دیـارە ڕاستیی ئـاوا، لەوپـەڕی هـێز و لـە چڵەپۆپـەی شەرەفمەندی‌دایە و لەسەر ڕێی "ڕاست"ی ڕوون و ئاشکرایە. ئایا کەسێك بە ڕوونـی لـە

---

(١) حديث صحيح، أخرجه الترمذي برقم: ٣٧٨٦ والطبراني في الكبير: ٢٦٨٠ وللحديث شواهد كثـــيرة. أنظر الأحاديث الصحيحة رقم: ١٧٦١. (وەرگێڕ – لەچاپە عەرەبی‌یەکەی "اللمعات"ەوە).

ناخی خۆی‌دا هەست بە مەودای ڕەسەنایەتیی ئەم وەلاء و لایەنگیری‌یە سروشتی‌یە بۆ ئیسلام بکات، دەتوانێت دەستبەرداری ببێت و وازی لێ بهێنێت؟

جا ئالی بەیت بەم دەست پێوەگرتنە توند و گەرمەیان بە ئیسلامەوە - کە ئیلتیزام و دەستپێوەگرتنێکی سروشتی‌یە - "نیشانەی ئاسایی" لەسەر ڕاستیی ئایینی ئیسلام وەك "بەڵگەی بەهێز" وایە لە لایان، چونکە ئەوان بە سروشت لایەنگری ئیسلامن، بەڵام کەسانی تر دوای قەناعەت‌کردنیان نەبێ لە ڕێی "بەڵگەی بەهێز"ەوە، ئیلتیزام بە ئیسلامەوە ناکەن!

**❑ سەرنجی چوارەم:**

لێرەدا بەبۆنەی ئەوەی کە لە سەرنجی سێ‌هەمدا باس کرا، ئاماژەیەکی کورت بۆ مەسەلەیەك دەکەین کە زیاد لە پێویست بە گەورە گیراوە، بە ڕادەیەك کە لە ناو کتێبەکانی عەقائیددا جێی کراوەتەوە و لەگەڵ بناغەکانی ئیماندا دەماودەم باس کراوە. ئەویش مەسەلەی: کێشەی نێوان ئەهلی سوننەت و شیعەکانە، کە بریتی‌یە لەوەی:

ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: (حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - چوارەم خەلیفەی ڕاشیدە و، حەزرەتی ئەبووبەکر - خوای لێ ڕازی بێت - لەو گەورەترە و شایانتری جێ‌نشینی‌یە، بۆیە لە پێشدا خەلافەتی گرتە ئەستۆ).

شیعەش دەڵێن: (مافی خەلافەت هی حەزرەتی عەلی بوو - خوای لێ ڕازی بێت - بەڵام ستەمی لێ کراوە و هەر ئەویش لە سەرجەمی موسڵمانان گەورەتر و مەزنترە).

پوختەی ئەو بەڵگانەش کە بۆ دەعواکانیان دەیهێننەوە ئەوەیە کە گەلێ فەرموودەی زۆر و زەبەندە سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - هەیە و.. مەرجەع و پێشڕەوی زۆربەی ڕەهای ئەولیا و تەریقەتە سۆفی‌یەکانە، بەو ڕادەیەی کە نازناوی: "سلطان الأولیاء"ی بەوپەڕی شایستەیی لێ نراوە.. جگە لە سیفەتە لەڕادەبەدەرەکانی تریشی، وەك: زانست و ئازایەتی و خواپەرستی کە لەودا بەرجەستە بووبوون.. سەرباری ئەو پەیوەندی‌یە توند و تۆڵەش کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە حەزرەتی عەلی و ئالی بەیتی نەوەی ئەو دەری‌بڕیوە.. هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە حەزرەتی عەلی لە هەموان گەورەتر و پایەدارترە، کەواتە خەلافەت مافی ئەو بووە، بەڵام لێی زەوت کراوە!

**وەڵام:**

دان پێدانان و تەسدیق کردنی چەندین جارە و دووپاتبووی خودی حەزرەتی عـەلی بـۆ سێ خەلیفەکانی پێش خۆی و، گوێڕایەڵی کردنی بۆیان و، گرتنە ئەستۆی فەرمانبەریی "شیخ القضاة" لە سەردەمی ئەواندا و، ئەندامێتیی لــە دەستەی "أهـل الحـل والعقـد"دا بـۆ ماوەی زیاتر لە بیست ساڵی حوکمڕانیی خەلیفەکانی پێشوو.. هـەموو ئەمانـە، دەعـوای شیعەکان زامدار دەکەن.

پاشان فتووحاتی ئیسلامی و جیـهادی دوژمنـانی لـە سـەردەمی هەرسـێ خەلیفـەکانی پێشوودا، بە پێچەوانەی ئەو ئاشـووب و ڕووداوانـەی لـە سـەردەمی خەلافـەتی حـەزرەتی عەلیدا ڕوویان دا، بە هەمان جۆر دەبنە مایەی زامداربوونی دەعوای شـیعەکان لـە ڕووی خەلافەتەوە.

واتە دەعوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت حەق و ڕەوایە.

**ئەگەر بوترێ:**

شیعە دوو بەشن. یەکەمیان: شیعەی ویلایەت و، دووهـەمیان: شیعەی خەلافـەت. بـا ئـەم بەشـەی دووهـەم لەبـەر تێکـەڵبوونی سیاسـەت و ئامـانج و مەبەستە تایبەتییـەکان لــە دەعواکەیاندا، بە ناحەق دابنێین، بـەڵام خـۆ بەشـی یەکـەم ئامـانج و تـەماعی ڕامیاریـیان نییە؟ جگە لەمە، شیعەی ویلایەتیش ڕۆشتوونەتە ڕیزی شیعەی خەلافەتەوە، بەو واتایـەی کە: بەشێك لە ئەولیایانی تەریقەتە سۆفییەکانیش پێیان وایە حـەزرەتی عـەلی لـە هـەموان گەورەترە و، بەم جۆرە تەسدیقی دەعوای شیعەی خەلافەت دەکەن کە لایەنی سیاسەتیان گرتووە؟

**وەڵام:**

دەبێ لە دوو گۆشەوە سەیری حەزرەتی عەلی بکرێت:

یەکـەم: گۆشـەی گـەورەیی و چاکەکارییـە کەسییەکان و پلــەی بــەرزی خــودی حەزرەتی عەلی.

دووهـەم: گۆشـەی نوێنەرایـەتی کردنی بۆ کەســێتیی مەعنــەویی ئــالی بــەیت. دیــارە کەسێتیی مەعنەویی ئالی بەیت ئاوێنەیەکە جۆرێکی تایبەتیی ماهییەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەداتەوە و تیایدا دەردەکەوێت.

لە ڕووی گۆشە و لایەنی یەکەمەوە: سەرجەمی ئەهلی حەقیقەت و لە پێشەنگی هەموویانەوە حەزرەتی عەلی خۆیشی - خوای لێ ڕازی بێت - حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر - خوایان لێ ڕازی بێت - لە پێش هەموانەوە دادەنێن، چونکە بینیویانە: پلەی ئەم دوانە لە خزمەتکردنی ئیسلام و نزیکیپانەوە لە خوای گەورە، لە هی هەموان بەرزترە..

بەڵام لە ڕووی گۆشە و لایەنی دووهەمەوە، کە بریتییە لەوەی: حەزرەتی عەلی نوێنەری کەسی مەعنەویی ئالی بەیتە[1]: دەردەکەوێت کەسی مەعنەویی ئالی بەیت، لەو ڕووەوە کە نوێنەری حەقیقەتی موحەممەدییە، هیچ شتێك ناگاتە ئاستی بەراورد لەگەڵداکردنی. سەرجەمی ئەو فەرموودە زۆرانەش کە سەبارەت بە چاکە و پایەبەرزیی حەزرەتی عەلی دەدوێن و ستایشی دەکەن، لەم ڕووی دووهەمەوەیە. ئەوەش کە پشتی ئەم ڕاستییە دەگرێت ڕیوایەتێکە بەم واتایە:

"إنَّ نسلَ كلِّ نبـــيٍّ منه، وأنا نسلي من علي"[2].

هۆی زیاتر بڵاوبوونەوەی ئەو فەرموودانەی کە پایەبەرزی و ستایشی حەزرەتی عەلی باس دەکەن لە چاو ئەو فەرموودانەی کە لە چاکەی خەلیفە ڕاشیدەکانی تر دەدوێن، ئەوەیە کە: ئەهلی سوننەت و جەماعەت - کە ئەهلی حەقن - لە بەرامبەر هێرشی خەواریج و ئەمەوییەکانەوە بۆ سەر حەزرەتی عەلی و هەوڵدانی ناڕەوای شکاندنی شان و شکۆی، ڕاپەڕیوون و ئەو ڕیوایەتانەیان سەبارەت بە حەزرەتی عەلی بڵاوکردووەتەوە. بەڵام خەلیفە ڕاشیدەکانی تر بەم ئەندازەیە دووچاری ڕەخنە و تانەی

(١) "ابن الجوزي" لە کتێبی "مناقب الإمام أحمد بن حنبل" ص ١٦٣دا لە بارەی فەزڵی ئەم هاوەڵانەوە دەڵێت: "قال عبدالله بن أحمد بن حنبل: حدث أبي بحديث سفينة، فقلت: يا أبت! ما تقول في التفضيل؟ قال: في الخلافة أبوبكر وعمر وعثمان. فقلت: فعلي بن أبي طالب؟ قال: يا بني علي بن أبي طالب من أهل البيت لا يقاس بهم أحد. (وەرگێڕی چاپی عەرەبی)

(٢) والحديث نصه: إنّ الله جعل ذرية كل نبي في صلبه، وجعل ذريتي في صلب علي بن أبي طالب. (أخرجه الطبراني برقم: ٢٦٣٠ عن جابر رضي الله عنه، وفي سنده يحيى بن العلاء كذاب. وساق الذهبي هذا الحديث في ترجمته (الميزان ٣٩٨/٤). وقال الهيثمي في المجمع (٣٣٣/١٠): فيه يحيى بن العلاء وهو متروك. والحديث أخرجه الخطيب في التأريخ من حديث ابن عباس رضي الله عنه. قال ابن الجوزي: حديث لا يصح فيه المرزبان. قال: ابن الكاتب كذاب ومن فوقه الى المنصور ما بين مجهول وغير موثوق به إهــــ. وفي الميزان (٥٨٦/٢) قال الذهبي في ترجمته :عبدالرحمن بن محمد الحاسب، لا يدرى من ذا؟ وخبره كذب، روى الخطيب.. الخ، ثم ساق الحديث. وانظر فيض القدير ٢٢٣/٢ - ٢٢٤ وضعيف الجامع الصغير برقم ١٥٨٩. (وەرگێڕی چاپی عەرەبی).

دوژمنانیان نەهاتوون، بۆیە ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش هۆکاری بڵاوکردنەوەی ئەو فەرموودانەیان نەبینی کە لە فەزڵ و چاکە و پایەبەرزی‌یان دەدوێن.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ڕوانینی داهاتووبینی پێغەمبەریتی‌یەکەیەوە، بینیبووی کە: حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - گیرۆدەی گەلێ ڕووداوی دڵتەزێن و ئاشووبی ناوخۆیی دەبێت، بۆیە بە فەرمووده پیرۆزەکانی هاوچەشنی: "مَن كنتُ مولاه فعليٌّ مولاه"[1] دڵی حەزرەتی عەلیی دەداتەوە، تاکو لە نائومێدی ڕزگاری بکات و، ڕێنمایی نەتەوەی ئیسلامیشی کردووە کە لەو ڕۆژگارانەدا گومانی خراپی پێ نەبەن.

شیعەی ویلایەت بە ئەندازەی شیعەی خەلافەت بەرپرسیاری ئەو خۆشەویستی‌یە زیاد لە پێویستەی حەزرەتی عەلی و بە باشتر زانینی - لە ڕووی تەریقەتەوە - نین، چونکە ئەهلی ویلایەت - بەپێی ڕێبازەکەیان - بە چاوی خۆشەویستی‌یەوە بۆ ڕابەرەکەیان دەڕوانن، خۆ ئاشکرایشە ئەو کەسەی خۆشەویستیی لە دڵدایە زیادەڕەوی لە خۆشویستنەکەی‌دا دەکات و پێی خۆشە پلەی خۆشویستراوەکەی گەلێ لە پلە ڕاستەقینەکەی خۆی بەرزتر بێت و هەر لەو باوەڕەشدایە! جا ئەو کەسانەی کە ئەم چەشنە خۆشەویستی و حاڵەتانەی دڵ و دەروونیان بەسەردا زاڵە، لە دەمی کەفوکوڵ و زاڵبوونی خۆشەویستی بەسەریاندا چاوپۆشی‌یان لێ دەکرێت، بە مەرجێ باشتر زانینی حەزرەتی عەلی لە ڕووی ئەم خۆشویستنەوە سنوور نەشکێنێت و دەم بۆ پیاهەڵخوێندن و دوژمنایەتیی خەلیفە ڕاشیدەکان درێژ نەکات، دەنا لە چوارچێوەی داب و ڕەفتاری ئیسلامی دەردەچێت.

بەڵام شیعەی خەلافەت لەبەر ئەوەی ئامانجی سیاسی تێکەڵ بە دەعواکەیان بووە، ئەوا ناتوانن لە دوژمنایەتی و غەرەزی شەخسی ڕزگاریان ببێت و، مافی چاوپۆشی لێکردن لە دەست دەدەن و لێی بێ‌بەش دەکرێن! تەنانەت ئەوانە داخی دڵیان بەرامبەر حەزرەتی عومەر لە شێوەی خۆشویستنی حەزرەتی عەلی‌دا دەردەبڕن بە ڕادەیەك کە وتەی: "لا لحب علي بل لبغض عمر"یان تێدا بەرجەستە بووە! چونکە "قەومییەتی ئێرانی" لەسەر دەستی حەزرەتی عومەردا - خوای لێ ڕازی بێت - زامدار کرا، جگە لەمەش هەڵگەڕانەوەی عەمری کوڕی عاص لە حەزرەتی عەلی خوای لێ ڕازی بێت و، شەڕکردنی عومەری کوڕی سەعد لەگەڵ حەزرەتی حسەین - خوای لێ ڕازی بێت -

---

(١) صحيح، أخرجه أحمد والترمذي. انظر: الصحيحة: (١٧٥٠) والفيض ٦/٢١٨ بۆ درێژەی سەرچاوەکان بڕوانە: (اللمعات ص ٢٤). (وەرگێڕ)

لەو جەنگە جەرگبڕ و دڵتەزێنەدا.. هەموو ئەمانە، داخ و ڕق و دوژمنایەتی‌یەکی زۆریان بۆ ناوی "عومەر" لە لای شیعەکان بەجێ‌هێشتووە!

بەڵام شیعەی ویلایەت مافی ڕەخنەگرتنیان لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بۆ نی‌یە، چونکە ئەهلی سوننەت هەروەك لە شان و شکۆی حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - داناگرن، لە هەمان کاتیشدا بە چەشنێکی ڕاستەقینە و گەرم و گوڕ و بێ گەرد خۆشیان دەوێت و، لەم خۆشویستنەشدا خۆیان لە زیادەڕەوی دەپارێزن، چونکە لە ڕێی فەرموودەی پیرۆزەوە زیان و مەترسی‌یەکانی ئەو چەشنە خۆشەویستی‌یە خراوەتە ڕوو.

ئنجا ئەو ستایشانەی پێغەمبەریش ﷺ کە لە چەند فەرموودەیەکی‌دا سەبارەت بە شیعەی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - ڕایگەیاندووە، ئەوا لە ڕاستی‌دا ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەگرنەوە، چونکە هەر ئەوانن بەپێی ئیستیقامەت و لانەدان لە ڕاستە شەقام شوێن حەزرەتی عەلی کەوتوون. کەواتە هەر ئەوانن شیعە "واتە دەستەی شوێنکەوتە"ی ڕاستەقینەی حەزرەتی عەلی، خوای لێ ڕازی بێت!

لە فەرموودەی صەحیحدا بە ڕاشکاوی مەترسی و زیانی زیادەڕەوی کردن لە خۆشویستنی حەزرەتی عەلی، کتومت، وەك مەترسیی زیادەڕەوی لە خۆشویستنی حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - لە لایەن گاورەکانەوە، لە قەڵەم دراوە[1].

**ئەگەر شیعەی ویلایەت بڵێن:**

دوای دان‌نان بە چاکەکاری‌یە دەراساکانی حەزرەتی عەلی‌دا - خوای لێ ڕازی بێت - ناکرێت حەزرەتی ئەبووبەکری بەسەردا پێش بخرێت.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەگەر چاکەکاریی کەسیی حەزرەتی ئەبووبەکر یان هی حەزرەتی عومەری فارووق، خوایان لێ ڕازی بێت و، ئەو خزمەتگوزاری‌یە مەزنانەی لە ڕووی میراتگریی

---

(١) دەقی فەرموودەکە بەم جۆرەیە: عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "يا علي فيك مثل عيسى أبغضته اليهود حتى بهتوا أمه وأحبته النصارى حتى أنزلوه المنزل الذي ليس له". هەروەها حەزرەتی عەلی فەرموویەتی: "يُهلَك فيّ رجلان: مُفرطٌ في حبّي ومُفرطٌ في بغضي".
أخرجه عبدالله في زيادات المسند ١٦٠/١ والنسائي في الخصائص (٢٧) وابن الجوزي في العلل المتناهية ٢٢٣/١ والبخاري في التأريخ ٢٥٧/١/٢ وأحمد في فضائل الصحابة ١٠٨٧ و ١٢٢١ و ١٢٢٢. واسناده ضعيف من أجل الحكم بن عبدالملك القرشي. وقال الحاكم في المستدرك: صحيح الإسناد و لم يخرجاه. (بڕوانە: اللمعات ص ٣٥). (وەرگێڕ)

پێغەمبەرەوە ﷺ لە سەردەمی خەلافەتیاندا ئەنجامیان دا، هەموو ئەمانە بخرێنە تایەکی تەرازووەوە و، ئنجا تایبەتکاری‌یە دەراساکانی حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و موجاهەدەی ڕووداوەکانی سەردەمی خەلافەتی و ئەو جەنگە خوێناوی و دڵتەزێنە ناوخۆیی‌یانەی کە بە ناچاری ڕووبەڕوویان بووەوە و ئەو بەدگومانی‌یەی کە لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەوە هاتنە ڕێی.. گەر ئەمانەش بخرێنە تاکەی تری تەرازووەکەوە، ئەوا بێ هیچ گومانێك تای حەزرەتی صدیق، یان تای حەزرەتی عومەری فارووق یان هی حەزرەتی "ذوالنورین" - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - قورستر دەبێت. ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەم تا قورسی‌یەی ئەوانیان دیوە و، فەزڵدانی ئەوانیان بەسەر حەزرەتی عەلی‌دا لەو ڕوانگەیەوە بووە.

پاشان پلەی "پێغەمبەرایەتی" گەلێ بەرز و باڵاترە لە هی "ویلایەت"، بە ڕادەیەك کە یەك درەشانەوەی "پێغەمبەرایەتی" کە بە کێشی یەك درەم بێت، لە باتمانێك درەوشانەوەی "ویلایەت" بە باشتر دادەنرێت، وەك لە وتەی دوازدەهەم و بیست و چوارەمی کتێبی "وتەکان"دا چەسپاندوومانە. جا لەم گۆشەنیگایەوە، بەشی حەزرەتی صیدیق و فاروق - خوایان لێ ڕازی بێت - لە میراتگریی پێغەمبەر ﷺ و دامەزراندنی ئەحکامەکانی پێغەمبەرایەتی، لە لایەن خواوەندەوە زیاد کراوە. پشتگیریی خواوەند بۆیان و سەرکەوتنیان لە کاروباری خەلافەتی سەردەمی خۆیاندا، بەڵگەیە بەدەست ئەهلی سوونەت و جەماعەتەوە، ئنجا لەبەر ئەوەش کە چاکەکاری‌یە شەخسی‌یەکانی حەزرەتی عەلی لە حوکم و بایەخی ئەو بەشە زۆر و زیادەی ئەوان کەم ناکاتەوە کە لە میراتگریی پێغەمبەرەوە ﷺ پێیان دراوە، ئەوا حەزرەتی عەلی لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەردا پلەی "شیخ القضاة"ی دراوەتێ و بۆ خۆیشی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئەوان بووە.

ئایا ئیتر ئەهلی حەق "کە ئەهلی سوننەت و جەماعەتن" و، حەزرەتی عەلی‌یان بە ڕاستی خۆشدەوێت و ڕێزی دەگرن، چۆن ئەو کەسانەیان خۆش ناوێت کە خودی حەزرەتی عەلی خۆشی دەویستن و ڕێزی لێ دەنان؟!

با ئەم ڕاستی‌یەی سەرەوە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

پیاوێکی یەکجار دەوڵەمەند، سامان و میراتە زەبەندەکەی بەسەر منداڵەکانی‌دا دابەش کرد. بیست باتمان زیوی لەگەڵ چوار باتمان زێڕدا بە یەکێکیان بەخشی و، یەکێکی

دیکەیان پێنج باتمان زێڕ و پێنج باتمان زیوی پـێدا و، یـەکێکی تریشیان پێـنج باتمـان زێـڕ و سێ باتمان زیوی بەرکەوت.. بێ گومان ئەم دوانەی دوایی، هەرچەندە لەچاو یەکەمدا لـە ڕووی "چەندایەتی"یەوە کەمتریان بەرکەوتووە، بەڵام لـە ڕووی "چۆنێتـی"یـەوە زیاتریـان وەرگرتووە.

لەبـەر ڕوونـاکیی ئـەم نموونەیـەدا دەڵێـین: ئـەو زیـادە کەمـەی زێـڕی حەقیقـەتی: "ئەقرەبییـەتی ئیلاهـی" لـە بەشـەکەی حـەزرەتی ئەبووبـەکر و عومـەردا کـە لـە ڕووی میراتگریی پێغەمبـەر ﷺ و دامـەزراندنی ئـەحکامی پێغەمبەرایەتی‌یـەوە، بۆیـان دەستنیشـان کراوە، گەلـێ قورس و زیاترە لە چاکەکاری‌یە شەخسـی‌یەکان و گەوهـەری ویلایـەت و "قوربی ئیلاهـی" کـە حـەزرەتی عـەلی - خـوای لـێ ڕازی بێـت - پێـی بەهرەمەند بـووە. کەواتە دەبێ لە کاتی بەراورد کردنـدا لـەم گۆشەیەوە بڕوانرێـت و بایـەخی پـێ بدرێـت، دەنا گەر بەراوردەکە لەگەڵ ئازایەتی و زانیـاریی شەخسـی و لایـەنی ویلایـەتدا بکرێـت، شێوەی حەقیقەت دەگۆڕێت و لە بەرچاودا دەئاڵۆزێت.

پاشان حەزرەتی عەلی - خوای لـێ ڕازی بێـت - لـەو لایەنـەوە کـە لـە زاتـی خـۆیدا نوێنـەری کەسـی مەعنـەویی ئـالی بەیتـە و، لـە ڕووی مـیراتگریی (موتڵـەق و ڕەهـای) پێغەمبەریشەوە ﷺ ئـالی بـەیت لـە کەسێتیی ئـەودا ڕەنگـی داوەتـەوە، لـەم لایەنـەوە، هیـچ کەسێکی پێ ناگات، چونکە نهێنیی گەورەیی پێغەمبەری مەزن ﷺ لەم لایەنەدایە.

شیعەی خەلافەت لە بەردەم ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا جگە لە شـەرمەزاری مـافی هیچی تریان نی‌یە! چونکە ئەوان لە لاف لێدانی خۆشویستنی زیاد لە پێویستی حـەزرەتی عەلیدا لە شان و شکۆی دادەگرن، تەنانەت ڕێڕەوەکەیان دەیانگەیەنێتـە ئـەو دەرەنجامـەی کـە بـە ڕەفتـار و خـووی نابـەجێ و نەشیاو بـۆ حـەزرەتی عـەلی قـایل بـبن، ئـەوەتا دەڵێـن: حـەزرەتی عـەلی - خـوای لـێ ڕازی بێـت - بـە "ڕواڵـەت" ڕەزامـەندیی لـە حـەزرەتی صیددیق و فارووق - خوایـان لـێ ڕازی بێـت - دەربڕیـوە، هەرچـەندەش لەسـەر ناحـەق بوون. بەم کارەی، خۆی لە مەترسیی ئەوان پاراستوە"! بە زاراوەی شیعەکان "تَقِيَّـــة"ی بەکارهێناوە. بـەو واتایـەی کـە: لێیـان ترسـاوە و لـە کارەکـانی‌دا ڕیـایی لـە ڕوویـاندا نواندووە!!

ئێمەش دەڵێین: ئەم پاڵەوانە مەزنەی ئیسلام کـە بـە شایستەیی نازنـاوی: "أسد الله"ی بەدەست هێنـاوە و، لای هـەردوو صددیـق پێشـەوا و وەزیـر بـووە.. وەسـف کردنی ئـەم

پاڵەوانە بە: ترسنۆك و ڕیاکار و دەرخستنی خۆشەویستیی درۆینە بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕاستیدا خۆشیناوێن و، شوێنکەوتن و ملکەچکردنی بۆ کەسانێکی ناحەق زیاتر لە بیست ساڵی ڕەبەق و مەرایی بۆکردنیان لە ترسنۆکیدا، هەرگیز بە خۆشویستن دانانرێت و، حەزرەتی عەلی دەست بە ڕووی ئەم جۆرە خۆشەویستییەوە دەنێت!

بەم جۆرە دەرکەوت کە: ڕێڕەوی ئەهلی حەق بە هیچ جۆرێك و لە هیچ ڕوویەکەوە لە شان و شکۆی حەزرەتی عەلی داناگرێت و، هەرگیز لە خوو و ڕەفتارەکانیدا عەیبدار و تۆمەتباری ناکات و، ترس و ڕیاکاری ناداتە پاڵ مەردێکی چاونەترسی وەك ئەم پاڵەوانە بەجەرگە و، دەڵێن: (گەر حەزرەتی عەلی خەلیفە ڕاشیدەکانی بە حەق نەزانیبایە، تەنها بۆ ماوەی یەك خولەکیش پشتی نەدەگرتن و ملی بۆ فەرمانیان کەچ نەدەکرد)!

بەو واتایەی کە حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - زانیی ئەوان لەسەر حەقن و دانی بەفەزڵ و چاکە و پلە و پایەیاندا نا و، بەم پێیە ئازایەتییە لەڕادەبەدەرەکەی لە پێناوی خۆشویستنی حەقدا بەخت کرد.

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

زیادەڕەوی و کەمڕەوی(الإفراط والتفريط) لە هیچ شتێکدا باش نییە. ڕاستەشەقامیش ئەو سنوورە ناوەندیە کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت هەڵیان بژاردووە.

بەڵام بەداخەوە، هەروەك هەندێك بیر و بۆچوونی دەستەی "خەواریج" و (کەسانی تری ئەم ڕۆژگارە) لە ژێر پەردەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا خۆی داپۆشیوە، بە هەمان جۆر بەشێك لە شەیدایانی سیاسەت و مولحیدانیش ڕەخنە ئاراستەی حەزرەتی عەلی دەکەن و دەڵێن: "بە تەواوی لە بەڕێوەبردنی دامودەزگای خەلافەتدا سەرکەوتوو نەبووە، چونکە لەبەر ئەوەی شارەزای سیاسەت نەبووە ئەوا لە سەردەمی خۆیدا نەیتوانیوە بە ڕێکوپێکی سەرکردەیی نەتەوەی ئیسلام بکات".

بەرامبەر بەم تۆمەتە ناڕەوایە، شیعەکان ڕق و بێزارییان بەرامبەر ئەهلی سوننەت هەڵگرتووە، کە لە ڕاستیدا قاعیدە و دەستوورەکانی ئەهلی سوننەت و بناغەکانی ڕێڕەوەکەیان، هەرگیز داخوازی ئەم چەشنە دەرەنجام و بیرەڵۆکانە نین، بەڵکو پێچەوانەکەیان دەچەسپێنن. لەبەر ئەوە هەرگیز ناکرێ ئەهلی سوننەت بەو چەشنە بیرانە تاوانبار بکرێن کە لە لایەن خەواریج و مولحیدەکانەوە سەرهەڵدەدەن.

ئەهلی سوننەت گەلێ زیاتر لەچاو شیعەکان وەلاء و خۆشەویستی‌یان لە دڵدایە بەرامبەر حەزرەتی عەلی. ئەوەتا لە گشت وتار و دوعایەکیاندا حەزرەتی عەلی بەو سەنا و ستایش و پایەبەرزی‌یەی شایانیەتی ناو دەبەن، بە تایبەت "ئەولیا و پیاوچاکانی دەروون خاوێن" کە زۆربەی زۆر و ڕەهایان لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن. چونکە ئەو پیاوچاك و ئەولیایانە حەزرەتی عەلی‌یان بە ڕابەر و گەورەی خۆیان داناوە. کەواتە نابێ شیعەکان ڕووی دوژمنایەتی ئاراستەی ئەهلی سوننەت بکەن و واز لە خەواریج و مولحیدان بهێنن کە دوژمنی هاوبەشی شیعە و ئەهلی سوننەتن. تەنانەت هەندێ لە شیعەکان، لە داخی ئەهلی سوننەتدا، واز لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەهێنن!

بەهەرحاڵ، گەلێ درێژەمان بەم مەسەلەیە دا، چونکە بە زۆری لە لایەن زانایانەوە باس کراوە.

دەسا ئەی ئەهلی حەق، کە ئەهلی سوننەت و جەماعەتن!

ئەی ئەو شیعانەی کە خۆش ویستنی ئالی بەیتتان کردووە بە ڕێبازتان!

یەکسەری و خێرا ئەم کێشەیەی نێوانتان هەڵگرن کە دارای هیچ ناوەرۆك و ڕاستی‌یەك نی‌یە و، لەهەمان کاتدا زیانبەخش و ناڕەوایە. دەنا گەر ئەم کێشەیەی نێوانتان لا نەبەن، ئەو زەندەقەیەی کە ئێستا بەوپەڕی هێز و دەسەڵاتەوە حوکمڕانیی لەدەستدایە، یەکێکتان بۆ لەناوبردنی ئەوی تر وەك چەك و ئامراز بەکاردەهێنێت و پاشان بۆ خۆی ئەو ئامرازەش تێکدەشکێنێت!

کەواتە دەبێ دەستبەرداری ئەو بابەتە جوزئی‌یانە ببن کە کێشەی نێوانتان دەوروژێنن، چونکە ئێوە هەمووتان ئەهلی تەوحیدن و سەدان پەیوەندیی پیرۆز و خاوێنتان لە نێواندایە کە بۆ برایەتی و یەکگرتن بانگتان دەکەن.

* * *

## مەقامی دووهەم

تەرخان دەکرێت بۆ ڕاستیی دووهەمی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا... ﴾[1].

* * *

(١) ئەم مەقامە سەربەخۆ دانراوە، کە بریسکەی یازدەهەمە. (دانەر)

# بریسکەی پێنجەم

ئەم بریسکەیە پەیامێك دەبێت کە لە ناوەندی پازدە پلەدا ڕاستی‌یە مەزنەکەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران:١٧٣) دەردەخات. بەڵام ئێستا نووسینی ئەم پەیامە دواخرا: چونکە زیاتر پەیوەندیی بە بیرکردنەوە و زیکرەوە هەیە تا پەیوەندیی بە زانست و حەقیقەتەوە. بۆیە بە عەرەبی نووسرا[١].

* * *

# بریسکەی شەشەم

لە بارەی ڕونکردنەوەی: (لا حولَ ولا قوةَ إلاّ بالله)ەوەیە، کە ئەویش حەقیقەتێکی گرنگی هەڵقوڵاوی گەلێ ئایەتی پیرۆز دەردەبڕێت و، ئەم بریسکەیە لە نزیکەی بیست پلەی فیکری‌دا ڕوونی دەکاتەوە و، ئەویش - بە وێنەی بریسکەی پێنجەم - لە دەمی زیکر و بیرکردنەوەی گەشتی ڕۆحیم لە خۆمدا هەستم پێ دەکردن. بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندی‌یان بە چێژی ڕۆحی و حاڵەتی دڵەوە زیاتر هەیە تا پەیوەندی‌یان بە زانست و حەقیقەتەوە، وا بە باش زانرا کە لە کۆتایی (بریسکەکان)ەوە - نەك لە سەرەتاکەیەوە - دابنرێت[٢].

* * *

---

(١) هەر لەبەر ئەوەش خراوەتە ناو بریسکەی عەرەبیی بیست و نۆهەمەوە. پاشتریش مامۆستا نوورسی بە زمانی تورکی "تیشکی چوارەم"ی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو پلانە داناوە. (وەرگێڕ)

(٢) بۆیە خرایە ناو بریسکەی عەرەبیی بیست و نۆهەمەوە. (وەرگێڕ)

# بریسکەی حەوتەم

تایبەتە بە حەوت جۆری هەواڵدانی غەیبی لە کۆتایی سوورەتی "الفتح"دا

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿لَقَدْ صَدَقَ اللهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرامَ إِنْ شَاءَ اللهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذلِكَ فَتْحاً قَرِيباً ۞ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً ۞ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْراةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْئَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾. (الفتح:٢٧-٢٩).

ئەم سێ ئایەتەی سوورەتی "الفتح" گەلێ ڕووی ئیعجازیان تێدایە.

لە ڕاستی‌دا یەكێك لە (دە) ڕووە هەمەكی و گشتی‌یەكانی ئیعجازی قورئان بریتی‌یە لە "هەواڵدانی غەیبی" كە لەم ئایەتانەدا بە حەوت هەشت ڕوو دەردەكەون:

● **ڕووی یەكەم:**

ئایەتی: ﴿**لَقَدْ صَدَقَ اللهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرامَ إِنْ شَاءَ اللهُ آمِنِينَ...**﴾ تا كۆتایی ئایەتەكە، هەواڵێكی بێ گومانی فەتحی مەككە ڕادەگەیەنێت، پێش ئەوەی فەتح بكرێت! ئەوەبوو دوای دوو ساڵ وەك ئەم ئایەتە هەواڵی دابوو، شاری مەككە فەتح كرا!

● ڕووی دووهەم:

ئایەتی: ﴿فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً﴾ ڕایدەگەیەنێت کە ڕێکەوتنی حودەیبییە هەرچەند لە ڕواڵەتدا لە بەرژەوەندیی موسڵمانان دەرناکەوێت و تا ڕادەیەك سەرکەوتنی قورەیشی بەسەر موسڵماناندا تێدایە، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ دوارۆژی موسڵمانان وەك فەتحێکی مەعنەویی گرنگی لێ دێت و دەبێت بە کلیلێك بۆ فتووحات و سەرکەوتنەکانی تر و، ڕایگەیاند کە هەرچەند ئێستا بەبۆنەی ئەم ڕێکەوتنەوە شمشێرە ماددیەکان خرانە ناو کێلانەوە، بەڵام لە ڕاستیدا قورئانی پیرۆز شمشێرە ئەڵماسییە تیشك بەخشەکەی خۆی دەرکێشا و، "ژیری" و "دڵەکان"ی پێکەوە فەتح کرد، چونکە بەهۆی ئەم ڕێکەوتنەوە هۆز و تیرەکانی ئەم ناوچەیە بواریان بۆ ڕەخسا تێکەڵی یەکتری بین و لە نزیکەوە لە هەڵسوکەوتی یەکتر شارەزا بین و، لەم ڕێیەوە ڕەوشتە مەزنەکانی ئیسلام بۆ خەڵکی ئاشکرا بوون و بەسەر ملنەدان و سەرسەختیی کافراندا سەرکەوتن و، ڕووناکییەکانی قورئانی پیرۆز پەردە چڕ و ئەستوورەکانی دەمارگیریی بێزلێکراوی قەومایەتی و خێڵایەتیی ئەوانی بە تەواوی دڕاند.

بۆ نموونە: "خالیدی کوڕی وەلید"ی بلیمەتی بواری جەنگ و "عەمری کوڕی عاص"ی بلیمەتی بواری سیاسەت، کە هەرگیز نایانەوێت سەریان بۆ هیچ شتێك نەوی بکەن و لە بواری بلیمەتیی خۆیاندا کەسیان بەسەردا سەربکەوێت، ئەو شمشێرەی قورئان کە لە ڕێکەوتنی حودەیبییەدا بریسکایەوە، بەسەر هەردووکیاندا بەڕادەیەك سەرکەوت کە هەر بۆ خۆیان ڕۆشتن بۆ شاری مەدینە و گەردنی خۆیان تەسلیمی ئایینی ئیسلام کرد و بە گوێڕایەڵی و نەوازشی سەربەستانە ملیان بۆ دانەواند و سەریان بۆ نەوی کرد، تەنانەت خالیدی کوڕی وەلید "شمشمێری دەرکێشراوی خوای گەورە" گەیشتە ئەو پلەیەی کە چەندەها فتووحاتی ئیسلامیی لەسەر دەستدا ئەنجام درا!

***پرسیارێکی گرنگ:***

هاوەڵە بەڕێزەکانی ئەو پێغەمبەرەی کە خۆشەویستی پەروەردگار و سەرداری هەردوو جیهانە ﷺ، لە کۆتایی جەنگی ئوحود و سەرەتای جەنگی حونەیندا بتپەرستانیان بەسەردا سەرکەوتن. ئایا چ حیکمەتێك لەمەدا هەیە؟

**وەڵام:**

چونکە بتپەرستەکانی ئەو کاتە کەسانێکی زۆری وەك خالیدی کوڕی وەلیدیان تێدا بوو کە قەدەری خوا دەیزانی لە ئایندەدا وەك گەورە هاوەڵانی ئەو ڕۆژگارەیان لێ دێت. جا لەبەر ئەوەی بە تەواوەتی عیززەت و سەربەرزی‌یان نەشکێت، حیکمەتی خوای گەورە خواستی لەسەر ئەوە بوو کە بەرامبەر چاکەکاری‌یەکانی داهاتوویان پاداشتێکی پێش وەخت و زوویان بداتەوە! واتە لەو جەنگانەدا چەند هاوەڵێکی ئایندەی بەسەر چەند هاوەڵێکی ڕابوردوودا سەرخست، تاکو هاوەڵانی ئایندە لە ترسی بریسکانەوەی شمشێری ئیسلام موسڵمان نەبن، بەڵکو موسڵمان بوونیان تەنها ئەنجامی تامەزرۆیی و تاسەمەندی‌یان بێت بۆ تیشکی حەقیقەت، هەروەها تاکو جوامێری‌یە سروشتی‌یەکەی ئەوان ڕسوایی زۆر نەچێژێت.

● **ڕووی سێهەم:**

ئەم ئایەتە پیرۆزە، بە دەستەواژەی: ﴿**لا تَخَافُون**﴾ هەواڵیان دەداتێ کە ئێوە بەوپەڕی سەربەستی و نەترسی‌یەوە دەڕۆنە ناو "المسجد الحرام" و تەوافی دەوری کەعبە دەکەن. ئەم هەواڵەش لە کاتێکدا ئایەتەکە ڕایگەیاند کە زۆربەی هۆز و خێڵەکانی دوورگەی عەرەب و دەوروبەری شاری مەککەی پیرۆز و تەنانەت زۆربەی تیرەی قورەیشیش تێکڕا دوژمنی موسڵمانان بوون. جا ئەم هەواڵە ئەوە ڕادەگەیەنێت کە ئێوە لە نزیکترین کاتی ئایندەدا دەڕۆنە ناو ئەو مزگەوتەوە و، بەبێ ترس و بیم تەواف دەکەن و، خەڵکی دوورگەی عەرەبیش سەری گوێڕایەڵیتان بۆ دادەنەوێنێت و، تیرەی قورەیشیش دێنە ڕیزی ئیسلامەوە و ئاسایش و ئارامی باڵ بەسەر هەموو لایەکدا ڕادەکێشن. ئەوەبوو لە دوایی‌دا ڕووداوەکان هەر بەو جۆرە هاتنەدی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە پێشتر هەواڵی دابوو.

● **ڕووی چوارەم:**

ئایەتی پیرۆزی: ﴿**هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ**﴾ هەواڵێکی تەواوەتی و بێ گومان دەدات کە ئەم ئایینەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە لایەن خواوەندەوە هێناویەتی، لە دوایی‌دا بەسەر هەموو ئایینەکاندا سەردەکەوێت. ئەم هەواڵەشی لە کاتێکدا ڕاگەیاندووە کە ئایینەکانی "گاور و جوولەکە و مەجووس" سەدان ملیۆن کەس شوێنیان کەوتبوون و ئایینی ڕەسمیی چەند دەوڵەتێکی مەزنی ئەوسای وەك چین و ئێران و ڕۆمان بوون و، پێغەمبەر ﷺ هێشتا بە تەواوی بەسەر هۆزەکەی خۆیشی‌دا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابوو. ئا لەم کاتەدا ئەم ئایەتە بەوپەڕی یەقین و

دڵنیایی و بێ گومانی هەواڵی سەرکەوتنی ئایینەکەی ئەوی دا بەسەر هەموو ئایینەکانی تر و سەرجەمی دەوڵەتەکانی ئەو ڕۆژگارەدا، داهاتووش بە زاڵبوونی دەستەڵاتی ئیسلام هەر لە زەریای خۆرهەڵاتەوە بۆ زەریای خۆرئاوا، تەسدیقی ئەم هەواڵە غەیبی‌یەی قورئانی پیرۆزی کرد.

● **ڕووی پێنجەم:**

**﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَراهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْوَاناً سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾.**

واتای ئەم ئایەتە بە ڕاشکاوی دەری‌دەخات کە: هاوەڵە بەڕێزەکان، لە دوای پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - گەورەترین و بەڕێزترین کەسی گرۆی ئادەمیزادن، لەبەر ئەو ڕەوشتە بەرز و تایبەتکاری‌یە بڵندانەی کە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیاندا دیار و نمایانە. لە هەمان کاتیشدا ئەم ئایەتە سیفەتە جیاواز و تایبەتی‌یەکانی یەك بە یەکی چینەکانی هاوەڵە بەڕێزەکان لە داهاتوودا دەردەخات. هەروەك بە واتای ئاماژەیی(ئیشاری) - وەك لای لێکۆڵەران دەرکەوتووە - بەدوای یەکدا هاتنی ئەو خەلیفانە دەردەخات کە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ دەبن بە جێنشینی، جگە لەوەی کە دیارترین سیفەتی تایبەتی و بەناوبانگی هەر یەکەشیان ڕادەگەیەنێت. چونکە:

فەرمایشتی: **﴿وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾** حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق دەگەیەنێت کە بە سیفەتی "لەگەڵ بوون" و "هاوەڵێتیی" تایبەتی پێغەمبەر ﷺ بەهرەمەند بووە. تەنانەت بە وەفاتیشی پێش جێنشینەکانی تر هەر ئەو "لەگەڵ بوون" و "هاوەڵێتی"یە تایبەتی‌یەی بەدەست هێناوە!

هەروەك فەرموودەی خواوەند: **﴿أَشِدَّاءُ عَلَى الكُفَّارِ﴾**یش حەزرەتی عومەر دەگەیەنێت، کە بە فتوحاتی سەردەمی خەلافەتەکەی سەرجەم دەوڵەتەکانی جیهان دەخاتە لەرزە و سام دەهاوێتە دڵیانەوە، ناوبانگی دادگەریشی وەك هەورەبروسکە ستەمکاران ڕادەچڵەکێنێت.

هەر ئەم ئایەتە پیرۆزە بە وشەی: **﴿رُحَماءُ بَينَهُمْ﴾** هەواڵی حەزرەتی عوسمان - خوای لێ ڕازی بێت - ڕادەگەیەنێت. چونکە لە کاتێکدا کە گەورەترین ئاشووب لە مێژوودا

ئامادە کرابوو، ئەو بە خوێنڕشتنی نێوان موسڵمانان ڕازی نەبوو، بەڵکو بە کەماڵی میهرەبانی و بەزەیی خۆی ئەوەی پێ باشتر بوو کە لەو پێناوەدا گیانی بەخت بکات و خۆی بە دەستی مردن بسپێرێت! ئەوەبوو بە ستەملێکراوی لە کاتی خوێندنی قورئانی پیرۆزدا شەهید کرا.

هەروەها فەرمایشتی خواوەند: ﴿تَراهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْوَاناً﴾ ئاماژە بۆ بارودۆخ و ڕەفتارەکانی حەزرەتی عەلی دەکات، خوای لێ ڕازی بێت، کە بە کەماڵی شایستەیی و لە کەماڵی زوهد و خواپەرستی و هەژاری و دەستپێوەگری‌دا ئەرکی خەلافەتی گرتە ئەستۆ و، ڕەوتی "بەردەوامبوونی" لە سجوود و ڕکووعدا بۆ مەساری ژیانی خۆی هەڵبژارد، کە ئەمەش هەموو خەڵکی سەری تەسدیقی بۆ دادەنوێنن. جگە لەمە، ئەم ئایەتە هەواڵی ئەوەش دەدات کە حەزرەتی عەلی بەرپرسیاری ئەو جەنگانە نی‌یە کە لە داهاتوودا و لە سەردەمی خەلافەتی‌دا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و، تەنها مەبەستی ئەو لەو جەنگانەدا بەدەستهێنانی فەزڵ و ڕەزامەندیی خوای گەورەیە.

● **ڕووی شەشەم:**

**﴿ذلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْراةِ﴾**ە، لە دوو لایەنەوە هەواڵی غەیبی لێرەدا هەیە:

*لایەنی یەکەم:*

هەواڵی ئەو وەسفانەی هاوەڵەکان دەدات کە لە تەوراتدا باس کراون و سەبارەت بە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لە حوکمی غەیبدان. چونکە هەروەك لە مەکتووبی نۆزدەهەم (موعجیزاتی ئەحمەدی)دا ڕوون کراوەتەوە، وەسفی هاوەڵانی ئەو پێغەمبەرەی لە ئاخرزەماندا دێت لە تەوراتدا بەوە کراوە کە لای ڕاستیەوە: "معه ألوف الأطهار" یان "معه رايات القديسين" بەو واتایەی کە: هاوەڵانی گوێڕایەڵ و بەندەی پیاوچاك و ئەولیای خوای گەورەن، بۆیە بە "قديسين" و "أطهار" وەسف کراون.

جا هەرچەندە بەهۆی وەرگێڕانی تەوراتەوە بۆ زمانە جۆراوجۆرەکان گەلێ دەستکاریی تێدا کراوە و ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە، کەچی هێشتا بە چەندین ئایەتی زۆری خۆی تەسدیقی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کۆتایی سوورەتی "الفتح" دەکات کە دەفەرموێ:

**﴿ذلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْراةِ﴾!**

*لایەنی دووهەمی هەواڵدانی غەیبیی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە:*

﴿**ذلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْراةِ...** ﴾ هەواڵی ئەوە ڕادەگەیەنێت کە هاوەڵە بەڕێزەکان و شوێنکەوتووانیان دەگەنە پلەیەکی ئەوتۆی خواپەرستی کە نوور و ڕووناکیی ناو ڕۆحی ئەوان لە دەموچاویاندا تیشك دەدات و، لە ئەنجامی سوژدەبردنی زۆریشیاندا بۆ خوای گەورە نیشانەی ویلایەت و سەلاحەت لە ناو چاوانیاندا دەردەکەوێت.

بەڵێ، "داهاتوو"ی ڕۆژگار بەوپەڕی یەقین و ڕوونی و ئاشکرایی ئەم هەواڵەی تەسدیق کرد، چونکە حەزرەتی "زەینولعابدین" - خوای لێ ڕازی بێت - کە لە ماوەی تەنها یەك شەو و ڕۆژدا هەزار ڕکات نوێژی دەکرد و.. "تاووسی یەمانی"ش - خوای لێ ڕازی بێت - کە سەرباری بارودۆخی شڵەژاوی سیاسیی ئەو سەردەمە، چل ساڵی ڕەبەق نوێژی بەیانیانی بە دەستنوێژی خەوتنان بەجێ‌هێنا و.. کەسانێکی زۆری تری وەك ئەمان، یەکێك لە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەیان ئاشکرا کردووە کە دەفەرموێ:

﴿**ذلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْراةِ**﴾!

● **ڕووی حەوتەم:**

﴿**وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْئَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ**﴾.

ئەم بڕگەیەش، بە هەمان جۆر، لە دوو لایەنەوە هەواڵی غەیبیی تێدایە.

*لایەنی یەکەمیان:*

هەواڵدانی وەسفەکانی هاوەڵانی بەڕێز لە "ئینجیل"دا، سەبارەت بە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارەوە ﷺ هەواڵێکە لە حوکمی غەیبدایە!

بەڵێ، لە ئینجیلدا چەندین ئایەت هەن وەسفی ئەو پێغەمبەرە دەکەن کە لە ئاخرزەماندا دێت. وەك: "ومعه قضيب من حديد وأمّته كذلك" بەو واتایەی ئەو پێغەمبەرە ﷺ خاوەن شمشێرە و فەرمانی جیهادی پێیە و هاوەڵانیشی بە هەمان جۆر خاوەن شمشێرن و فەرمانی جیهاد کردنیان پێ دراوە و، وەك حەزرەتی عیسا نییە - دروودی لەسەر بێت - کە خاوەنی شمشێر نەبووە. جگە لەمەش، ئینجیل دەریدەخات کە ئەو پێغەمبەرەی شمشێری پێیە دەبێ بە سەرداری جیهان، چونکە ئایەتێکی ئینجیل دەڵێت: "سأذهب كي يجئ سيد العالَم"!

لەم دوو بڕگەیەی ئینجیلەوە تێدەگەین کە هاوەڵە بەڕێزەکان هەرچەند لە سەرەتادا کەمی و لاوازییان پێوە دیارە، بەڵام لە ڕاستیدا وەك تۆوی چێنراوی سەوزبووی زەوی وان و، بە چەشنی ڕووەکی گەشەکردوو بەرز دەبنەوە و هێز بەدەست دەهێنن، بە ڕادەیەك کە کافران ڕقیان لێیان بێتەوە، بەڵکو بە شمشێرەکانیان سەرانسەری جیهانی ئەو دەمە بۆ ئیسلام ملکەچ دەکەن و دەیچەسپێنن کە پێغەمبەری ئازیزی سەرکردەیان ﷺ بە ڕاستی سەرداری هەموو جیهانە. جا ئەم واتایەی کە ئەم ئایەتەی ئینجیل گەیاندی، هەمان واتای ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی "الفتح"ە!

*لایەنی دووهەم:*

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵە بەڕێزەکان هەرچەندە لە دەمی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەدا لەبەر کەمی و لاوازییان بەو ڕێکەوتنە ڕازی بوون، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم و بە خێرایی، هێز و سام و شکۆیەکی گرنگ بەدەست دەهێنن، بە ڕادەیەك کە بەرهەم و گوڵەگەنمی ئەو مرۆڤایەتییەی کە دەستی قودرەتی خواوەند لە کێڵگەی زەویدا سەوزی کردبوو، لەبەر بێئاگایییان لە خوای گەورە، لەچاو گوڵەگەنمی بڵند و بەهێز و بەرهەمبەخش و بەپیتی ئەماندا، کورت و ناتەواو و بێ پیت و بەرەکەت دەبێت، تەنانەت هاوەڵان لە ئایندەدا هێندە زۆر و بەهێز و خاوەن توانا و دەستەڵات دەبن کە چەندین دەوڵەتی گەورە بە چەشنێ گرفتار دەکەن کە بە ئاگری ڕق و قین و حەسوودیی خۆیانەوە بتلێنەوە.

بەڵێ، "ئایندە" بە جوانترین شێوە ئەم هەواڵە غەیبییەی خستەڕوو.. جگە لەمە، هەر لەم هەواڵە غەیبییەدا ئاماژەیەکی تری پەنهان هەیە، ئەویش بریتییە لەوەی کە:

دوای ئەوەی ستایشی هاوەڵە بەڕێزەکانی کرد لەسەر ڕەوشت و ڕەفتارە گرنگ و بەرزەکانیان، حاڵ و مەقام داخوازی ئەوە بوو کە بەڵێنی پاداشتێکی گەورەیان پێ بدرایە، کەچی بە وشەی: ﴿مَغفِرة﴾ ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی چەند هەڵەیەکی گرنگ لە ئەنجامی چەند ئاشووبێکەوە لە نێوان هاوەڵەکاندا ڕوو دەدات، چونکە وشەی ﴿مَغفِرة﴾ واتە لێخۆشبوون بەڵگەی بوونی کەمتەرخەمی و ناتەواویی ئەو شتەیە کە وشەکەی بۆ بەکارهێنراوە، دیارە لەو چەشنە کاتانەدا گرنگترین خواستی ئەوان و مەزنترین چاکەی خوایی بەرامبەریان "لێخۆشبوون" دەبێت. چونکە لەو دەمانەدا مەزنترین پاداشت چاوپۆشی و سزانەدانە.

جا هەروەك وشەی: ﴿مَغفِرة﴾ بەڵگەی ئەم ئاماژە نیانەیە، بە هەمان جۆر پەیوەندیشی بە سەرەتای سوورەتەکەوە هەیە کە دەفەرموێ: ﴿لِيَغفِرَ لَكَ اللهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ (الفتح:٢). ﴿مَغفِرة﴾ واتە لێخۆشبوون لێرەدا مەبەست پێی لێخۆشبوون نییە لە گوناهی ڕاستەقینە، چونکە پلەی "پێغەمبەرایەتی" دارای "عیصمەت"ە، کەواتە لێرەدا هیچ گوناهێك لە گۆڕێدا نییە، بەڵکو تەنها مژدەی لێخۆشبوونێکە کە لەگەڵ پلە و پایەی "پێغەمبەرایەتی"دا بگونجێت. ئەم مژدەدانی هاوەڵە بەڕێزانەش بە "لێخۆشبوون" لە کۆتایی سوورەتەکەدا نەرمی و نیانییەکی تر دەهاوێتە سەر ئەو ئاماژەیە!

ئێمە لێرەدا لە (دە) ڕووە ئیعجازییەکانی ئەو سێ ئایەتە پیرۆزەی کۆتایی سوورەی "الفتح" نەدواین، بەڵکو تەنها باسی ڕووی ئیعجازمان لە هەواڵدانی غەیبیی ئەو سێ ئایەتە کرد، بەڵکو تەنها لە حەوت ڕووی ڕووە زۆر و زەبەندەکانی ئەم چەشنە هەواڵدانە دواین.

لە کۆتایی وتەی بیست‌وشەشەمدا، کە تایبەتە بە قەدەر و جوزئی ئیختیارییەوە، ئاماژە بۆ بریسکانەوەیەکی گرنگی ئیعجاز کراوە لە داڕشتن و پەیوەندی و بارودۆخی پیتەکانی ئەم ئایەتەی دواییدا. جا ئەم ئایەتە بە هەموو ڕستەکانیەوە: ڕووی لە هاوەڵە بەڕێزەکانە، دەستەواژەکانیشی: حاڵەت و بارودۆخی ئەوان دەگرێتەوە، هەروەك وشەکانیشی: وەسفی ئەوان ڕادەگەیەنێت. چونکە بە پیتەکانی و دووپاتبوونەوەی ژمارەیان ئاماژە بۆ ئەصحابی بەدر و ئوحود و حونەین و هاوەڵانی "صُفَّة" و "بیعة الرضوان" و هاووێنەیان لە هەموو چینەکانی هاوەڵە بەڕێزەکان دەکات. هەروەك بە حسابی پیتی ئەبجەدی و "تەوافوق" کە جۆرێك و کلیلێکە بۆ عیلمی "جەفر" گەلێ نهێنیی تر دەگەیەنێت.

﴿سُبحانكَ لاعلمَ لَنا إلاّ ما عَلمتنا إنَّك أنتَ العَليمُ الحَكيم﴾.

* * *

# پاشماوه

**ئەو هەواڵە غەیبییانەی کە بە واتــای ئامــاژەیی ئایەتــەکانی کۆتـایی ســوورەتی "الفتح" ڕایانگەیاندن، ئەم ئایەتــەی خــوارەوەش بــە ئامــاژە هــەمان واتــا و هــەواڵ ڕادەگەیەنێت، بۆیە لێرەدا لێی دەدوێین.**

بسم الله الرّحمن الرّحيم

**﴿... وَلَهَديناهُمْ صِراطاً مُسْتَقيماً ۞ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَالرَّسُولَ فَأُولئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّنَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَداءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولئِكَ رَفِيقاً﴾**

(النساء:٦٨-٦٩)

لە نێوان هەزاران سەرنجی وردی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا، تەنها ئاماژە بۆ دوو سەرنج دەکەین:

❖ **سەرنجی یەکەم:**

قورئانی پیرۆز هەروەك بە ناوەرۆك و واتای ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوی "ڕاستییەکان" ڕوون دەکاتەوە، بە هەمان جۆر لە ڕێی شێواز و شێوە و ڕوخسارەکانیشیەوە گەلێ واتای ئاماژەیی بە دەستەوە دەدات، چونکە هەموو ئایەتێك چەند چینێکی زۆری واتای لەخۆگرتووە. جا لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز لە زانستی هەمەلایەنگری خواوەندەوە نازڵ بووە، ئەوا دەکرێ گشت واتاکانی مەبەست و جێی نیاز بن، چونکە واتاکانی قورئان تەنها بە یەك دوو واتاوە بەند نین و چەشنی گوفتاری مرۆڤ نییە کە بە ویستی کەسیی خۆی و بیری جوزئی و بەرتەسکی مرۆڤانەی لە چەند واتایەکی کەمدا دایاندەڕێژێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە: تەفسیرنووسان گەلێ حەقیقەتی بێسنووری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیان ڕوون کردووەتەوە.

ئنجا جگە لەوانەش گەلێ ڕاستیی تر هەن کە هێشتا تەفسیرنووسان ڕوونیان نەکردوونەتەوە، بە تایبەت بیت و ئاماژەکانی قورئان، کە جگە لە واتا ڕاستەوخۆکانیان گەلێ زانستیی گرنگی تریان تێدایە.

❖ **سەرنجی دووهەم:**

**﴿مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَداءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أولئِكَ رَفِيقاً﴾**.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی دەکاتەوە کە: ڕێڕەوانی ڕاستەقینەی شارێگای ڕاست و ئەوانەی کە نیعمەتەکانی خوای گەورەیان پێ بەخشراوە، کۆمەڵی پێغەمبەران و کاروانی صیددیقان و پێڕی شەهیدان و دەستەی پیاوچاکان و ڕیزەکانی تابیعانن. جا هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەم ڕاستییە دەردەخات، بە ڕاشکاوی کاملترین کەسانی ئەو پێنج بەشانەی جیهانی ئیسلام و سەردار و پێشەوایانی هەر پێنج بەشەکەش لە ڕێی باسکردنی سیفەتە بەناوبانگەکانیانەوە، ڕادەگەیەنێت. پاشان - لە ڕوویەکەوە - بە بریسکانەوەیەکی ئیعجاز و لە ڕێی جۆرێکی هەواڵدانی غەیبییەوە، پێشەوایانی ئایندەی ئەو پێنج بەشە و ئەو بارودۆخەی بەسەریاندا دێت، دەستنیشان دەکات.

بەڵێ، هەروەك وشەی: **﴿من النبيـــين﴾** ڕاستەوخۆ ڕووی لە پێغەمبەری ئازیزە ﷺ، بڕگەی: **﴿والصديقين﴾**یش ڕووی لە حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیقە و، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە دووهەم کەسە لە دوای پێغەمبەر ﷺ و یەکەم جێنشینیەتی و، ناوی "الصديق" ناونیشانی تایبەتیی ئەوە و لە لایەن سەرجەمی نەتەوەی ئیسلامەوە بەو نازناوە ناسراوە و، سەرقافڵەی صیددیقانە.

هەروەك بە وشەی: **﴿والشـــهداء﴾** ئاماژە بۆ حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلی دەکات، خوایان لێ ڕازی بێت، هەروەها بە ڕاگەیاندنێکی غەیبی ڕایدەگەیەنێت کە ئەم سیانە لە دوای حەزرەتی صیددیق - خوایان لێ ڕازی بێت - ئەرکی خەلافەت دەگرنە ئەستۆ و، لە ئەنجامدا شەهید دەبن و، بەمەش فەزڵێکی تر دەخەنە سەر کردارە چاکەکانی تریان.

ئنجا هەروەك بە وشەی: **﴿والصّالحين﴾** ئاماژە بۆ هاوەڵانی "صوففە" و "بەدر" و "بيعة الرضوان" دەکات، بە واتای ڕاشکاوی ڕستەی: **﴿وَحَسُنَ أولئك رَفيقاً﴾**ش گوێبیست تاسەمەند و تامەزرۆی شوێنکەوتنی ئەوان دەکات و، جوانیی شوێنپێ هەڵگرتنی تابیعین بۆ هاوەڵەکان دەردەخات و، بەواتای "ئاماژەیی"ش پەنجە بۆ حەزرەتی حەسەن - خوای

لێ ڕازی بێت - ڕادەکێشـێت کە پێنجەم خەلیفەی دوای چوار خەلیفەکانی ترە و، تەسدیقی فەرمانی ئەو فەرمووده پیرۆزەی پێغەمبەریش ﷺ دەکات کە دەفەرموێ: "الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة"(١). چونکە هەرچەند ماوەی خەلافەتی حەزرەتی حەسەن کەم بووە بەڵام دارای گرنگییەکی گەلێ مەزنە.

**پوختەی قسە:**

ئایەتی کۆتایی سوورەتی "الفتح" بۆ چوار خەلیفە ڕاشیدەکان دەڕوانێت، وەك ئەم ئایەتەش بۆی ڕوانین و، لە ڕێی جۆرێکی هەواڵدانی غەیبییەوە ئاماژەی بۆ داهاتووی بارودۆخی ئەوان کرد و پشتی ئایەتەکەی کۆتایی سوورەی "الفتح"ی گرت.

"هەواڵدان لە غەیب" کە یەکێکە لە جۆرەکانی ئیعجازی قورئان، گەلێ بریسکانەوەی ئیعجازیی زۆر و لە ژمارەبەدەری هەیە. کەواتە ترنجاندنی هەواڵە غەیبییەکانی قورئان لە چل تا پەنجا ئایەتدا، لە لایەن زانایانی ڕواڵەتبینەوە، ئەنجامی تێڕوانینێکی ڕواڵەتییانەی ڕووتە، چونکە لە ڕاستیدا زیاد لە هەزار ئایەت ئەم هەواڵدانەیان تێدایە، بگرە هەندێ جار چوار پێنج هەواڵی غەیبی لە تەنها یەك ئایەتدا کۆ دەبنەوە.

﴿ربَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نَسينَا أَو أَخْطأنا﴾.

﴿سُبحَانَكَ لا عِلمَ لنا إلا ما عَلّمتَنا إنّك أنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

* * *

# بریسکەی هەشتەم

به پشتیوانیی خوا لە ناوەندی کۆمەڵە پەیامێکی تردا بڵاو دەکرێتەوە

---

(١) صحيح: عن سفينة أن الرسول ﷺ قال: (الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة، ثم ملك بعد ذلك) رواه أحمد والترمذي وأبو يعلى في مسنده وابن حبان في صحيحه. (صحيح الجامع الصغير برقم: ٣٣٣٦ قال المحقق: صحيح). (الفتح الرباني للساعاتي: ٢٣/١٠) وفي سلسلة الاحاديث الصحيحة: ٤٦٠ بعدة سياقات. (وەرگێر - لە چاپی عەرەبیی: "اللمعات"ەوە).

# بریسکەی نۆهەم

**هەموو کەسێك ناتوانێت کەموکوڕی‌یە وردەکانی "وحدة الوجود" ببینێت و پێویستی بەو زانینە نابێت، کەواتە پێویستی بە خوێندنەوەی ئەم "بریسـکە"یـەش نی‌یە!**

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و بەوەفا و دڵسۆزی بێ گەردم!

هۆی نەناردنی نامەی سەربەخۆ بۆ "عەبدولمەجید"ی برام[1] ئەوەیە کە ئەو نامانـەی بـۆ ئێوەی دەنێرم مەبەستیان پێ دێتـە دی. چونکـە "عەبدولمەجید" لـە دوای "خلووصی"[2] برایـەکی بـەتوانا و قوتابی‌یـەکی جیددی‌یـە و، هـەموو بـەیانی و ئێوارەیـەك لەگـەڵ

---

(١) بچووکترینی براکانی مامۆستا نوورسی‌یە. بەشێکی زۆری لـە پەیامەکانی نـوور کـردووە بـە عـەرەبی، هەروەك "إشارات الإعجاز" و "المثنوي العربي النوري"یشی کردووە بە تورکی. لـە پێشدا مامۆستای زمانی عەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانستە ئیسلامی‌یەکان بووە لە پەیمانگای باڵای شـاری "قۆنیـا". لـە ساڵی ١٩٦٧ز لە تەمەنی هەشتاوسێ ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٢) بەڕێز "خلووصی یەحیا گیل" یەکێکە لە قوتابییانی دێرینی مامۆستا نوورسی لە "بارلا" و، ئەو دەمە ئەفسەر بووە لە پلەی "نەقیب"دا. هەر پرسیارێکی سەبارەت بە بابەتەکانی ئیمان ببوایە دەیناردن بۆ مامۆستا نوورسی و ئەویش وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. پاشـان بـە ڕێنمـایی مامۆسـتا خـۆی ئـەم وەڵامانـە کۆکرانـەوە و نـاونران "مەکتووبات". ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٦ز و لە تەمەنی نەوەدویەك ساڵی‌دا کۆچی ماڵئاوایی لـە دنیـا کـرد. خـوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

خلووصی‌دا، تەنانەت هەندێ جار پێش ئەویش، ناوی دەهێنم. ئنجا "صەبری" و "حەققی ئەفەندی"ش سوود لە نامەکانم وەردەگرن و پێویست ناکات نامەی سەربەخۆیان بۆ بنێرم. چونکە خوای گەورە نیعمەتی خۆی بە تۆ بەخشیوە و کردوویتی بە برای پیرۆز و گەورەی ئەوان. کەواتە تۆ لە بریی من نامە بۆ "عەبدولمەجید" بنێرە و دڵنیای بکە، با دڵتەنگ نەبێت، چونکە من دوای "خلووصی" بیر لەو دەکەمەوە.

□ **پرسیاری یەکەمتان:**

کە پرسیارێکی تایبەتە و، لە بارەی ئیمزاکەی باپیرتانەوەیە کە بە ناوی: "سەیید محەممەد"ەوە کردوویەتی. (واتە ئەوە دەگەیەنێت کە لە ئالی بەیت بێت)!

برام! من ناتوانم لەسەر بناغەی: (زانست و کەشف و لێکۆڵینەوە) وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە. بەڵام پێشتر بە هاوەڵانم دەوت:

"خلووصی لە تورکەکانی ئێستا و لە کوردەکانیش ناچێت، چونکە تایبەتکاری‌یەکی تری تێدا دەبینم".

ئەوانیش لەم بۆچوونەمدا پشتیان دەگرتم و دەیانوت:

دەرکەوتنی ئەو ڕەسەنایەتی‌یەی کە لە "خلووصی"دایە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەهرەمەندی بەخششی خواوەندی حەق بووە، بەپێی ئەو دەستورەی کە دەڵێت:

**"داد حق را قابلیت شرط نیست"** [1].

پاشان بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بزانە کە پێغەمبەر ﷺ دوو جۆر ئالی هەیە:

یەکەم: ئالی وەچە و نەسەبی.

دووهەم: ئالی ئەو لە ڕووی کەسی مەعنەوی و نوورانیی پێغەمبەرەوە ﷺ. واتە لە ڕووی پێغەمبەرایەتی‌یەکەیەوە.

بێ هیچ گومانێك تۆ بەر ئالی دووهەم دەکەویت. سەرەڕای ئەوەی کە بە قەناعەتی - بێ بەڵگەی - خۆم لە ئالی یەکەمیشدایت، چونکە پێم وایە باپیرت بە مفتە و لە خۆڕا وشەی "سەیید"ی لە ئیمزاکەی‌دا بەکارنەهێناوە.

---

(١) واتە: بەخششی خوای گەورە قابیلییەت و لێهاتوویی لە زاتی مرۆڤدا بە مەرج ناگرێت. نووسەر ئەمەی لە بەیتێکی مەولانا جەلالەددین وەرگرتووە لە ژێر ناونیشانی: (بیان آنکە عطـای حق و قدرت موقوف قابلیت نیست) کە دەقەکەی بەم جۆرەیە:

چارەء آن دل عطای مبدلیست داد او را قابلیت شرط نیست

سەرچاوە: (مثنوی معنوی) دفتر پنجم – ص ٧٧٠ چاپ ششم، انتشارات علمی ١٣٧٤هـ ش. (وەرگێڕ)

❑ **پوختەی پرسیاری دووهەمتان:**

برای ئازیزم!

شێخ محێدینی عەرەبی[1] وتوویەتی:

"إنَّ مخلوقيةَ الروحِ عبارةٌ عن انكشافِها".

برام! تۆ بەم پرسیارەت منی لاوازی کۆڵەوار ناچاری وتووێژ دەکەیت لەگەڵ بلیمەتی "حەقیقەت" و هەڵکەوتووی عیلمی ئەسرار: "محێدینی عەرەبی"دا! بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە باس و لێکۆڵینەوەکەمدا پشت بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز دەبەستم، ئەوا دەتوانم لەو هەڵۆیە بەزرتریش بفڕم، هەرچەندە لەخۆمدا وەکو "مێش"ێك وابم!

برام! محێدینی کوڕی عەرەبی خەڵکی ناخەڵەتێنێت، بەڵکو بۆ خۆی دەخەڵەتێت! چونکە هەرچەندە ئەو بۆخۆی لەسەر ڕێی هیدایەتە، بەڵام لە هەموو نووسینەکانیدا هیدایەتدەری غەیری خۆی نییە.. ئەوەی ئەو دیویەتی، ڕاستە بینیویەتی. بەڵام "حەقیقەت" ئەوە نییە کە دیویەتی!

باسی "ڕۆح" لە وتەی بیست و نۆهەمدا ئەو ڕاستییەی ڕوون کردووەتەوە کە پرسیارەکەتانی لەبارەوە کراوە.

بەڵێ، ڕۆح، لە ڕووی ماهییەتەوە، یاسایەکی "ئەمری"یە، بەڵام "بوونی دەرەکی"ی لەبەر کراوە. کەواتە یاسایەکی زیندووە و خاوەنی بوونی دەرەکی(وجود خارجي)یە.

شێخ محێدین کاتێ کە بۆ "ڕۆح"ی ڕوانیوە تەنها لە ڕووی ماهییەتەکەیەوە سەیری کردووە و لە ڕوانگەی مەشرەبی "وحدة الوجود"ەوە پێی وایە شتان هەموویان "ئەندێشە"ن!

---

(١) ناوی ئەبووبەکر محەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی محەممەدی کوڕی عەرەبیی طائیی ئەندەلوسییە و بە "محێدینی کوڕی عەرەبی" بەناوبانگە و لە نێوان ساڵەکانی: (٥٦٠ - ٦٣٨ ك / ١١٦٥ - ١٢٤٠ ز)دا ژیاوە و نازناوی "الشيخ الأكبر"ی لێ نراوە. یەکێکە لە پێشەوایانی زانستەکانی سەردەمی خۆی. لە شاری "مەرسییە"ی ئەندەلوس لە دایك بووە و پاشان ڕۆشتووە بۆ "ئەشبیلییە" و، گەشتێکی بە وڵاتانی شام و ڕۆم و میسر و عێراق و حیجازدا کردووە و، خەڵکی میسر لە دژی ئەو "شطحات"ەی لە زاری دەرچووبوون لێی ڕاپەڕیبوون و تەنانەت هەندێکیشیان هەوڵی کوشتنیان دابوو، بەڵام خرایە بەندیخانەوە و پاشان "عەلیی کوڕی فەتحی.بوجائی" بۆی تێکۆشا و لە بەندیخانە ڕزگاری کرد. دوای ئەوە لە "دیمەشق"دا گیرسایەوە و هەر لەوێشدا کۆچی دوایی کرد. بەناوبانگترینی بەرهەمەکانی بریتین لە: "الفتوحات المكية" و "فصوص الحكم" لە تەصەووف و دەروونناسیدا. بڕوانە: الأعلام ٢٨١/٦ فوات الوفيات ٢٤١/٢ ميزان الإعتدال ١٠٨/٣ جامع كرامات الأولياء ١١٨/١ شذرات الذهب ١٩٠/٥. (وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی "شێخ محێدین" ڕێبازێکی سەربەخۆی گرتووەتەبەر و، خاوەنی مەشرەبێکی گرنگ و کەشف و بینینی نائاسایی و لە عادەت بەدەرە، ئەوا هەندێ جار لە ناچاریدا پەنا دەباتە بەر چەند تەئویلێکی لاواز و زۆر لەخۆکردن، تاکو هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆز لەگەڵ مەشرەب و بینینە کەشفییەکانی خۆیدا یەك بخات، کە ئەمەش "ڕاشکاوی"ی ئایەتەکان زامدار دەکات!

ئێمەش لە چەندین پەیامی تردا ڕێبازی ڕاست و ڕەوانی قورئان و ئەهلی سوننەتمان لەم ڕووەوە ڕوون کردووەتەوە.

"شێخ محێدین" بۆ خۆی خاوەنی پلە و پایەیەکی تایبەتییە و یەکێکە لە وەرگیراو(مقبول)ەکان. بەڵام بە کەشفە دوور لە قاعیدە و بێ دەستوورەکانی، سنووری شکاندووە و، بڕیارەکانی لە زۆر مەسەلەدا پێچەوانەی بڕیاری جەماوەری زانا لێکۆڵەرەکانە[1].

هەر لەبەر ئەوەشە کە تەریقەتە تایبەتییەکەی ئەو تەنها بۆ ماوەیەکی کەم مایەوە و لە "صەدرەددینی قۆنیەیی"[2] بەو لاوە زیاتر بڕی نەکرد و بەردەوام نەبوو. ئنجا بە دەگمەن ڕێ دەکەوێت سوودێکی بە ئیستیقامەت و ڕاست و ڕەوا لە بەرهەمەکانی وەربگیرێت، هەرچەندەش خۆی لە خۆیدا شێخێکی مەزن و پلەبەرز و قوتبێکی هەڵکەوتووی بێوێنەی زەمانی خۆیەتی. ئەوەتا زۆربەی زانایانی ئەصفیا و لێکۆڵەر خەڵکی بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی هان نادەن، تەنانەت هەندێکیشیان خەڵکی لێ قەدەغە دەکەن.

---

(١) ئەمە تەنها ڕای مامۆستا نوورسی نییە سەبارەت بە زانستە کەشفییەکانی شێخ محێدین، بەڵکو ڕای گەلێ زانای تریشە لە گەورە مەردانی ئیسلام. بۆ نموونە ئیمامی ڕەبانی (شێخ ئەحمەدی فارووقیی سەرهەندی) لەم بارەیەوە لە مەکتووبی (٢٦٦)ی مەکتووباتەکەیدا دەفەرموێ: (زۆربەی زانستە کەشفییەکانی ئەو [ شێخ محێدین ] کە پێچەوانەی زانستەکانی ئەهلی سوننەتن، لە ڕاستییەوە دوورن و، مەگەر مرۆڤێکی نەخۆش یان کەسێکی تەواو چاولێکەر، دەنا کەس شوێنی ئەو کەشفیاتانە ناکەوێت). بڕوانە: چاپە فارسییە تازەکەی (مکتوبات امام ربانی)١/٥٨٥ انتشارات صدیقی – زاهدان ١٤٢٥هـ یان چاپە عەرەبییەکە ١/٢٧٧ دار الکتب العلمیة – بیروت. (وەرگێڕ).

(٢) صەدرەددین: ناوی محەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی محەممەدی کوڕی یووسفی قۆنیەیی ڕۆمییە. لە گەورە قوتابی و موریدانی شێخ محێدینە. چەند بەرهەمێکی هەیە، وەك: "النصوص في تحقیق الطور المخصوص"، "إعجاز البیان في تفسیر أم القرآن". بڕوانە: الأعلام ٦/٣٠، طبقات المفسرین ٢/١٠٣، تذکرة الحفاظ للذهبي ١٤٩١، طبقات الأولیاء ٤٦٧، الطبقات الکبری للشعراني ١/٢٠٢. (وەرگێڕ – لە چاپی عەرەبیی "اللمعات"ەوە).

ڕوونکردنەوەی جیاوازیی سەرەکیی نێوان مەشرەبی شێخ محێدین و مەشرەبی زانایانی لێکۆڵەر، پاشان باسکردنی سەرچاوەی هەردوو لایان، لە ڕاستیدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی وردی خەستوخۆڵ و تاوتوێ کردنێکی بەرز و فراوان هەیە.

بەڵێ، جیاوازییەکەی نێوان هەردوو لا گەلێ ورد و قووڵە و، سەرچاوەکەش هێندە بەرز و بڵندە کە شێخ لەسەر هەڵەکەی تاوانبار نەکراوە و هەر بە مەقبوولی لە لای زانایان ماوەتەوە. چونکە ئەگەر ئەو جیاوازییە و سەرچاوەکەی، بە "بیر و زانیاری و کەشف" ئاشکرا و بینراو بوونایە، ئەوا ئەو مەشرەب و ڕێبازە بە تێکشکانێکی سامناك و هەڵەیەکی گەورە بۆ شێخ لە قەڵەم دەدرا.

جا لەبەر ئەوەی جیاوازییەکە تەواو ورد و قووڵە، ئەوا هەوڵ دەدەین کە هەڵەی شێخ تەنها لەو مەسەلەیەدا دەربخەین و، ئەو جیاوازی و سەرچاوانە لە نموونەیەکی تەواو پوختدا ڕوون بکەینەوە.

بو نموونە:

"خۆر" لەناو ئاوێنەدا دەردەکەوێت. کەواتە ئەم ئاوێنەیە "مەظرووف" و "مەوصووف"ی خۆرە. بەو واتایەی کە لە ڕوویەکەوە "خۆر" لەو ئاوێنەیەدا هەیە و، لە ڕوویەکی تریشەوە ئاوێنەکەی ڕازاندووەتەوە بە ڕادەیەك کە بووە بە سیفەتی تیشکدەر و دەرخەری ئاوێنەکە.

خۆ ئەگەر ئەو ئاوێنەیە ئاوێنەی کامێرای وێنەگرتن بێت، ئەوا وێنەی خۆر - بە شێوەیەکی چەسپاو - دەگوێزرێتەوە بۆ سەر کاغەزێکی ناسکی تایبەتی.. جا لەم حاڵەتەدا، چ ئەو خۆرەی کە لە ئاوێنەکەدا دەبینرێت و، چ ماهییەت و سیفەتەکەشی کە لەسەر کاغەزەکە وێنەی گیراوە و، چ ڕازاندنەوەی ئاوێنەکەش بەو خۆرە کە لە ڕادەیەکدایە دەڵێی "خۆر" بووە بە سیفەتی ئەو ئاوێنەیە.. ئەم خۆرە، لەم حاڵەتەدا، غەیری خۆرە ڕاستەقینەکەیە، چونکە ئەوە خودی "خۆر" نییە، بەڵکو بریتییە لەوەی کە "درەوشانەوەی خۆر" ڕۆشتووەتە ناو "وجوود"ێکی ترەوە!

خۆ هەرچەندەش بوونی ئەو خۆرەی کە لە ئاوێنەکەدا دەبینرێت خودی ئەو خۆرە ڕاستەقینەیەی دەرەوە نییە، کەچی لەبەر پەیوەندیی بەو خۆرەی دەرەوە و ئاماژەکردنی بۆی، وا گومان براوە کە خودی ئەو بێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم نموونەیە:

ئەگەر بوترێ: "جگە لە خۆری ڕاستەقینە هیچی تر لە ئاوێنەکەدا نی‌یە"، دەکرێ ڕاست بێت، گەر مەبەست پێی ئەوە بێت کە ئاوێنەکە "زەرف"ە و مەبەستیش بە خۆرەکەی ناوی بوونە دەرەکی‌یەکەی بێت .

بەڵام گەر بوترێ:

"وێنەی ئەو خۆرەی کە لەسەر ئاوێنەکە دیارە و حوکمی سیفەتی ئاوێنەکەی وەرگرتووە.. هەروەها ئەو وێنەیەش کە ڕۆشتووەتە سەر کاغەزەکە: خودی خۆرە"..

دیارە ئەمە هەڵەیە.

واتە دەستەواژەی: "خۆر جگە لەناو ئاوێنەکە لەناو هیچی تردا نی‌یە" دەستەواژەیەکی هەڵە دەبێت. چونکە ئەوەتا وێنەیەکی خۆر لەسەر ئاوێنەکە دەردەکەوێت و، وێنەیەکی تریشی هەیە کە لە پشت ئاوێنەکەوە لەسەر کاغەزەکە دەرکەوتووە و، هەریەکەیان خاوەنی "وجوود"ێکی تایبەتە بە خۆیەوە. خۆ هەرچەندەش ئەم دوو "وجوود"ە لە درەوشانەوەی خۆرەوە سەرچاوەیان گرتووە، کەچی هیچیان خودی "خۆر" نین!

"زەین" و "ئەندێشە"ی مرۆڤیش وەك ئەم نموونەی ئاوێنەیە وان، چونکە:

ئەو زانیاری‌یانەی کە لە ئاوێنەی "بیر"ی مرۆڤدان، ئەوانیش دوو ڕوویان هەیە. ئەوەتا لە ڕوویەکەوە "زانین"ن و، لە ڕوویەکی تریشەوە "زانراو"ن!

جا ئەگەر "زەین" بە دەفری ئەو زانراوە دابنێین، ئەوا ئەو شتە (مەوجوودە، زانراوە) دەبێت بە زانراوێکی زیهنی، کەواتە وجودی خۆی وجودێکی جیاوازە..

بەڵام گەر وا دابنێین کە"زەین"بووە بە مەوسووفی ئەو شتەی چووەتە ناویەوە و بووەتە سیفەتی زەین، ئەوا بە "زانین" دادەنرێت و خاوەنی بوونی دەرەکی دەبێت. تەنانەت گەر ئەو شتە زانراوە خاوەن "وجوود" و "جەوهەر"یش بێت ئەوا هەر وجوودێکی خاریجیی لاوەکی دەبێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم دوو نموونەیە:

"گەردوون" ئاوێنەیە.. "ماهییەت"ی هەموو مەوجوودێك، بە هەمان جۆر، ئاوێنەیە..

ئەم ئاوێنانەش خوای گەورە بە توانستی ئەزەلیی خۆی بەدی‌یاندەهێنێت و "بوون"یان پێ دەبەخشێت.

كه‌واته هه‌موو مه‌وجوودێك – له‌ ڕوویه‌كه‌وه – ده‌بێت به‌ ئاوێنه‌ بۆ یه‌كێك له‌ ناوه جوانه‌كانی خواوه‌ند و، یه‌كێك له‌ نه‌خشونیگاره‌كانی ئه‌و ناوه ده‌رده‌خات.

جا ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌سه‌ر مه‌شره‌بی "شێخ محێدین"ن، جیهانیان له‌و ڕووه‌وه بۆ ده‌ركه‌وتووه‌ كه "ئاوێنه" و "ده‌فر" و "مه‌وجوودی میسالی"ی ناو ئاوێنه‌كه‌یه و، پێیان وایه كه: دانه‌وه‌ی وێنه‌ی شتان له‌ناو ئاوێنه‌كه‌دا خودی ئه‌و شتانه‌یه و، و وتوویانه: "لا موجود إلا هو" بێ ئه‌وه‌ی بیر له‌ پله‌كانی تری "بوون" بكه‌نه‌وه. ئیتر له‌م ڕێیه‌وه هێنده كه‌وتنه هه‌ڵه‌وه تا گه‌یشتنه ئه‌وه‌ی ئینكاریی ئه‌و ده‌ستووره بنه‌ڕه‌تی‌یه بكه‌ن كه ده‌ڵێت: "حقـائق الأشياء ثابتة"!

به‌ڵام ئه‌هلی حه‌قیقه‌ت، به‌هۆی ئه‌وه‌ی میراتگری میراتی پێغه‌مبه‌رن ﷺ و، پشتیان به ده‌قی ڕاشكاوی قورئان و ئایه‌ته ڕوون و ئاشكراكانی به‌ستووه، پێیان وایه:

ئه‌و نه‌خشونیگارانه‌ی كه به توانست و ویستی خوای گه‌وره له ئاوێنه‌ی بوونه‌وه‌راندا هه‌ن، ئاسه‌واری خوای گه‌وره‌ن و، هه‌موو "مه‌وجوود"ێك له لایه‌نی خوای گه‌وره‌وه "بوون"ێكی دراوه‌تێ كه هه‌ر ئه‌و خواوه‌نده خۆی به‌دیی‌هێناوه.

ئنجا هیچ مه‌وجوودێكی تر "ئه‌و" نی‌یه تاكو بوترێ: "لا موجود إلا هو"! چونكه شتانی تر خاوه‌نی "بوون"ی خۆیانن و ئه‌م بوونه‌شیان تا ڕاده‌یه‌ك جێگیر و چه‌سپاوه. خۆ هه‌رچه‌نده‌ش له چاو بوونی خواوه‌نددا "بوون"ێكی لاوازه و ده‌ڵێی ئه‌ندێشه و خه‌یاڵه، به‌ڵام هه‌رچۆن بێت هه‌ر دارای "بوون"ێكه كه خواوه‌ندی خاوه‌ن توانستی ئه‌زه‌لی، به ویست و توانستی خۆی، پێی به‌خشیوه.

ئه‌و "خۆر"ه‌ی كه له‌ناو ئاوێنه‌دا ده‌بینرێت، خاوه‌نی بوونێكی تری جیایه، جگه له بوونه ده‌ره‌كی‌یه‌كه‌ی خۆی..

هه‌روه‌ها خاوه‌نی بوونێكی ده‌ره‌كیی لاوه‌كی‌یه كه به ئارایشتی خۆی ئاوێنه‌كه ڕه‌نگ ده‌كات، ئه‌وه‌تا ئاوێنه‌كه ئه‌وی تێدا ده‌رده‌كه‌وێت..

هه‌روه‌ها خاوه‌نی بوونێكی ده‌ره‌كیی لاوه‌كیی تا ڕاده‌یه‌ك چه‌سپاوه، كه بریتی‌یه له‌و وێنه‌یه‌ی كه له‌سه‌ر كاغه‌زه‌كه‌ی پشتی ئاوێنه‌كه‌وه نه‌خشێنراوه..

جا هه‌روه‌ك خۆر – به وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه – خاوه‌نی چه‌ندین "بوون"ی ئاوایه، به هه‌مان جۆر: ئاوێنه‌ی گه‌ردوون و ئاوێنه‌كانی ماهییه‌تی شتانیش دارای چه‌ندین "بوون"ی وه‌هان. چونكه نه‌خشونیگاری ئه‌و به‌دیهاتووه ڕواڵه‌تی‌یانه‌ی كه به

لـێ‌دەرەوشانەوەی نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە و بـە ویسـت و ئیختیـار و توانسـتی خواوەند نەخشـێنراون، خـاوەنی "وجـوود"ێکـی پـەیدابوو(حـادث)ی غـەیری وجـوودی خواوەندی "واجب الوجود"ن و، بە توانستی خواوەند چەسپاوی(الثبات) بەم وجوودەی ئەوان بەخشراوە.

بەڵام گەر ئەو پەیوەندییە بپچڕێت، ئەوا شتان هیچیـان نـامێنن و یەکسـەر تیـادەچن. کەواتە هەموو شتێك، بۆ مانەوەی خۆی، لـە هـەموو دەم و سـاتێکدا پێویستی بەوەیـە کـە "بەدیهێنەر"ی بیهێڵێتەوە. چونکە "حەقیقەت"ی شتان هەرچـەندەش جێگیر و چەسپاوە، بەڵام ئەم چەسپاوی و جێگیربوونەی لە لایەن زاتی خۆیانەوە نییە، بەڵکو بە چەسپاندن و جێگیرکردنی خواوەند دەستیان دەکەوێت. بەم جۆرە، دەرکـەوت کـە وتەکـەی "شـێخ محیّدینی عەرەبی":

(ڕۆح بەدیهاتوو نییـە، بـەڵکو حەقیقەتێکـە لـە جیـهانی "ئـەمر" و سـیفەتی "ئـیرادە"وە هاتووە)، وتەیەکە پێچەوانەی واتای ڕاشکاوی گەلـێ دەقی زۆر و زەبەندەیە. هەروەك لە ڕوونـاکیی ئـەو لێکۆڵینەوانـەی پێشـوودا دەردەکـەوێت کـە کێشـەکەی لـێ ئـاڵۆزاوە و تیایدا خەڵەتاوە. چونکە "مەوجوود"ە لاوازەکانی نەدیوە!

هەرگیزاوهەرگیز ناکرێ ئەو مەوجوودانەی کە ناوە جوانەکانی چەشـنی: "الخلاق، الرزاق"یان تێدا دەردەکەوێت، چەند شتێکی وەهمی و ئەندێشەیی بن! چونکە مادەم ئـەو ناوانە هەموویان دارای "حەقیقەت"ن، ئەوا ئەو ئاوێنانەش کە ئەوانیان تێـدا دەردەکـەون، بە هەمان جۆر، خاوەنی حەقیقەتی دەرەکین.

❑ **پرسیاری سێ‌هەمتان:**

لەم پرسیارەدا داوای دەرسێك دەکەن کە ببێت بە کلیلێك بۆ: "زانستی جەفر"!

**وەڵام:**

براام! ئێمـە، لـەم خزمەتـەدا، بـە ویسـت و کارسازیی خۆمـان کـار ناکـەین، بـەڵکو "ئیختیار"ێکی ئـەوتۆ کـە لـە سـەرووی ئیختیـاری خۆمانەوەیـە و خـێری تێدایـە بۆمـان و، "ویست"ێکیش کە لە دەرەوەی ویستی خۆماندایە، بەسەر ئیختیار و کارەکانماندا زاڵە!

ئەوەش بزانن کە: "زانستی جەفر" لەبەر ئەوەی کەیف و زەوقێکی تێدایە، ئەوا مرۆڤ بەخۆیەوە سەرقاڵ دەکات و لە کار و خزمەتـە ڕاستەقینەکەی خـۆی دووری دەخاتـەوە. تەنانەت هەندێ جـار بـەو کلیلـە چـەندەها نـهێنیی قورئـانم بۆ حـەل دەبوو، کـەچی هـەر

ئەوەندەی بە شەوق و حەزەوە ڕووم تێدەکرد، یەکسەر دەرگام لە ڕوو دادەخرا! پاشان دوو حیکمەتم لەمەدا بینی:

*یەکەمیان:*

ئەوەیە کە دەگونجێ مرۆڤ بکەوێتە بارێکی وەهاوە پێچەوانەی ئەو ئەدەبە پێویستە بێت کە شایانی دەستووری: "لا یعلم الغیب إلا الله"یە.

*دووهەمیان:*

ڕێنمایی کردنی خەڵکی بۆ لای ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان، لە ڕێی هێنانەوەی بەڵگە بەهێزەکانەوە، هێندە فەزڵ و چاکە و تایبەتکاریی تێدایە کە سەد ئەوەندە زۆر و باشترە لەوەی کە لە ڕێی زانستە پەنهانەکانی وەك: "زانستی جەفر"ەوە ڕێنمایی بکرێن! چونکە بەڵگە چەسپاوە بەهێز و گومانبڕەکان هیچ بوارێك بۆ ئەوە ناهێڵنەوە کە مرۆڤ هەڵوێستی ناڕەوا و بێ ئەدەبی بەرامبەر کارمەندییە موقەددەسەکەی بنوێنێت.

بەڵام "زانستی جەفر" و زانستە پەنهانەکانی هاوچەشنی، لەوانەی کە بە دەستوور و یاسای ڕێك و زۆر و زەبەندە قایم و مەحکەم نەکراون، دەگونجێ لە لایەن کەسانی فێڵبازی خۆتێهەڵقورتێنەوە بە خراپی بەکاربهێنرێن.

ئەوەش بزانە کە هەرکات بۆ خزمەتی ڕاستییەکان پێویست بەو زانستە هەبێت، ئەوا خوای گەورە بەپێی پێویست و بە چاکە و میهری خۆی، شتێکمان لەو زانستە پێ دەبەخشێت.

ئنجا بیشزانە کە: ئاسانترین و خاوێنترین و جوانترینی کلیلەکانی "زانستی جەفر" بریتییە لە: جۆرەکانی ئەو "تەوافوقانەی" کە لە ناوی: "البدیع"ەوە سەرهەڵدەدەن و، تیشکێکی ئەو نوورەیان لە تەوافوقی وشەی "الله"دا دەرخست و، ئەو بەرهەمانەشیان نەخشاند کە ئێمە بڵاویان دەکەینەوە و، هەندێکیشمان لە چەند جێگایەکی پەیامی "کەرامەتی غەوثی"دا ڕوون کردووەتەوە.. یەکێك لەوانە ئەوەیە کە:

ئەگەر "تەوافوق"ەکە شتێکی لە چەند ڕوویەکەوە دەرخست، ئەوا لە ڕاستیدا "ئاماژە"یەکە لە پلەی "بەڵگە"دا. تەنانەت هەندێ جار یەك "تەوافوق" لەگەڵ هەندێ نیشانەدا وەکو بەڵگەیەکی لێ دێت و جێگای "بەڵگە" دەگرێتەوە.

بە هەرحاڵ، لەم کاتەی ئێستادا، ئەم ئەندازەیە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکەت سەروزیادە. خۆ هەرکات پێویستیی زیاتر و جیددیتان پێی هەبوو، ئەوا بەپێی پێویست بۆتان باس دەکرێت.

❑ **پرسیاری چوارەمتان:**

واتە پرسیاری ئیمامی مزگەوتەکە (عومەر ئەفەندی) نەك پرسیاری تۆ، کە دەڵێت: "پزیشکێك"ی بەدبەخت دەڵێ کە گوایا: حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - باوکی هەیە و، بە خەیاڵی خۆی و بە تەئویلێکی شێتانە دەیەوێت ئایەتێکی قورئان بکات بە بەڵگەی خۆی[1].

ئەو پزیشکە کۆڵەوارە، کاتی خۆی ویستبووی جۆرە نووسینێك بهێنێتە کایەوە کە بە پیتی لێکپچڕاو(مُقَطَّع) بنووسرێت، تەنانەت هەوڵیشی بۆ دابوو. هەر ئەو کاتەی کـە ئەو پزیشکە لەو هەوڵەدا بـوو، زانیـم کـە لـە هەڵسوکەوتی زەندیقەکانەوە هەستی کـردووە دەیانەوێت پیتە ئیسلامییەکان نەهێڵن. وەك بڵێی ویستوویەتی بەربەستێك بـۆ ئـەو لافاوە بەخوڕەمە دابنێت. بەڵام هەوڵەکەی مایەپووچ و بێ‌ئەنجام دەرچوو.

ئێستاش لـەم مەسـەلەیە و لـە مەسـەلەی دووهەمیشـدا، هەستی بـە هێرشـی سـەختی زەندیقەکان کردووە بۆ سەر بناغەکانی ئـایینی ئیسـلام. پێـم وایـە بـەم تەئویلـە بێ‌نرخـەی دەیەوێت دەرگای سوڵح و ئاشتی بخاتە سەرپشت!

بەڵام دەبێ بە دڵنیاییـەوە بزانرێـت کـە: حـەزرەتی عیسـا - دروودی لەسـەر بێـت - باوکی نەبووە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە و دەقە ڕوون و بێ‌گومانەکانی تر ڕوونی دەکەنەوە:

﴿**إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللهِ كَمَثَلِ آدَمَ**﴾ (آل عمران:٥٩).

لەبەر ئـەوە، هـەرگیز گـوێ بـە قسـەی ئەوانـە نـادرێت کـە دەیانـەوێت ئـەم ڕاسـتییە ڕەسەن و ڕەگداکوتاوە بگۆڕن! تەنانەت هەر بایـەخیش بـە قسـەیان نـادرێت. گوایـا پێـی

---

(١) ئەو کەسـەی کـە سـەرکردەیی چواریـەکی گـرۆی مرۆڤی گرتووەتـە ئەستۆ و، لـە ڕوویەکەوە خـۆی لـە ڕەگەزی مرۆڤەوە گۆڕی بە مەلائیکەت و، زەویی بەجێ‌هێشت و ئاسمانی کرد بـە نشینگەی خۆی.. ئەم تاکە مرۆڤـە نائاسـایی‌یەی کـە ئەمـە حاڵـە دەراسـاکانیەتی، دەبـێ شـێوەیەکی ئـەوتۆی هـەبێت کـە لـە یاسـای "وەچەکەوتنـەوە - التناســل" بـەدەر بێـت. لـە هـەمان کاتیشـدا ناگونجـێ کـە بـە تـەئویل و لـە ڕوویـەکی گومانلێکراوی نەزانراوی ناسروشتی، تەنانەت بە بچووکترین و نزمترین شێوەی یاسـای وەچەکەوتنـەوە، ئەو یاسایەی بەسەرا بسەپێنرێت. هەروەك هیچ ناچاری‌یەکیش بۆ ئەم کارە لەگۆڕێدا نی‌یە.
یاشان ڕاشکاویی قورئان لەم باسەدا هەرگیز بـوار بـە تـەئویل کـردن نـادات. گەلـێ جێـی سەرسووڕمانە! ئایا دەکرێ چـەندەها یاسـای چەسپاوی توندوتۆڵ کـە هـەرگیز کـەلێنیان تێدا دروسـت نـەبووە، چەشنی یاسای ڕەگەزی مەلائیکەت و یاسـای ڕاشـکاویی قورئـان، ئەم یاسایانە بڕووخێنرێن لـە پێناوی تـەعمیر و پینـەکردنی یاسای "وەچەکەوتنەوە" کە لە سەد و یەك ڕووەوە کون و کەلێنی تێ بووە! (دانەر)

وایە: کاری پێچەوانەی یاسای "وەچەکەوتنەوە" مومکین نی‌یە و، دەچێ دەست بە چەند تەئویلێکی لاوازەوە دەگرێت.

بێ گومان هیچ "یاسا"یەك نی‌یە چەند دانەیەکی شاز و دەگمەن و لە یاسا دەرچووی نەبێت و، هیچ "دەستوورێکی گشتی"ش نی‌یە کە بە چەند دانەیەکی نائاسایی تایبەتمەند نەکرابێت.

هەروەها ناگونجێ کە هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ئێستا یاسایەك هەبێت کە تاکێکی شازی نەبێت.

ئەوەتا یەکەم شت: هەر ئەم یاسایە (یاسای وەچەکەوتنەوە) لە ڕووی سەرەتاوە و بە دەست پێ‌کردن و کۆتایی هاتنی دووسەد هەزار جۆری زیندەوەران کەلەبەر و کەلێنی تێکەوتووە! واتە بابەگەورەی یەکەمی ئەو زیندەوەرانە، کە وەك "ئادەم"ی ئەو جۆر و ڕەگەزانە وان، بازیان بەسەر ئەو یاسایەدا داوە! واتە دووسەد هەزار لەو باوکانە لە ڕێی دایك و باوکەوە نەهاتوونەتە دنیا، بەڵکو لە دەرەوەی ئەم یاسایە "بوون"یان پێ بەخشراوە!

پاشان هەر بە چاوی خۆمان لە هەموو بەهارێکدا بەشی هەرەزۆری سەد هەزار جۆری زیندەوەران و، ئەندازەیەکی لەژمارەبەدەری دانەدانەی ئەوان دەبینین، کە لە دەرەوەی ئەم "یاسای وەچەکەوتنەوە"یە و لەسەر ڕووی گەڵاکان و لەناو ماددە گەنیوەکاندا، بەدی دەهێنرێن!

جا ئیتر یاسایەك کە بە چەندین تاك و دانەی شازی تا ئەم ئەندازە و ژمارە زۆر و زەبەندەیە، چ لە سەرەتا و چ لە هەموو ساڵێکدا، پشت گوێ بخرێت و بازی بەسەردا بدرێت، پاشان کەسێك بێت و ژیری‌یەکەی جێی ئەوەی تێدا نەبێتەوە کە لە ماوەی هەزار و نۆسەد ساڵدا مرۆڤێك هەبێت لەو یاسایە شاز بێت و، بەرامبەر دەقە بێ گومانەکانی قورئان دەست بە چەند تەئویلێکی بێ‌نرخەوە بگرێت.. دەڵێم: ئایا دەبێ ئەو کەسە چەندە نەفام و گەلحۆ بێت؟! بۆ خۆت ئەمە لێك بدەرەوە.

دەبێ بشزانین: ئەو شتانەی کە ئەو بەدبەختانە ناوی: "یاسا سروشتی"یەکانیان لێ دەنێن، لە ڕاستی‌دا "یاساکانی عادەتی خوای گەورە"ن. کە دەرەوشانەوەیەکی هەمەکیی "ئەمر" و "ویست" ی خواوەندن. بە ڕادەیەك کە هەندێ جار خوای گەورە ـ لەبەر چەند

حیکمەتێك - ئەو عادەتانەی خۆی دەگۆڕێت و، بەم کارەش زاڵبوونی ویست و ئیختیاری خۆی بەسەر هەموو شتێك و هەموو یاسایەکدا، دەردەخات و، لە هەندێ تاك و دانەی نائاساییدا عادەتەکەی واز لێ دەهێنێت. ئایەتی: ﴿**إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللهِ كَمَثَلِ آدمَ**﴾ ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە.

❑ **پرسیاری دووهەمی** "عومەر ئەفەندی" سەبارەت بەو پزیشکە:

ئەو پزیشکە لەو مەسەلەیەدا وەکو شێت ڕەفتاری کردووە و، گرفتاری نەزانی و گەوجایەتییەکی وەها بووە کە شایانی گوێ لێگرتن و بایەخ پێدان نییە. چ جای ئەوەی وەڵام بدرێتەوە! چونکە ئەو بەدبەختە دەیەوێت ناوەندێك لە نێوان کوفر و ئیماندا دروست بکات.

جا من وەڵامی پرسیارەکەی "عومەر ئەفەندی" دەدەمەوە، نەك هی قسە بێنرخەکەی ئەو پزیشکە. بۆیە دەڵێم:

"عیللەت"ی ئەمر و نەهییەکانی شەرع: "ئەمر و نەهیی خواوەند"ە. ئنجا "بەرژەوەندی" و "حیکمەتەکان"یش چەند هۆکارێکی تەرجیحدەرن و، دەگونجێ لە ڕووی ناوی: "الحكيم"ەوە ببن بەهۆی پەیوەندی پێوەکردنی ئەمر و نەهییەکانی خواوەند.

بۆ نموونە:

ئەو کەسەی لە سەفەردایە، نوێژە چوار ڕکاتییەکان کورت دەکاتەوە. جا ئەم کورت کردنەوەیە، "عیللەت"یش و "حیکمەت"یشی تێدایە. عیللەتەکە بریتییە لە: "سەفەر". حیکمەتەکەش ئەو "مەشەققەت"ەیە کە لە سەفەردا هەیە. کەواتە ئەگەر "سەفەر" لە گۆڕێدا هەبوو ئەوا با "مەشەققەت"یشی تێدا نەبێت، هەر نوێژ کورت دەکرێتەوە. بەڵام ئەگەر لەماڵەوە سەد "مەشەققەت" بێتە ڕێی مرۆڤ، ئەوا مادەم "سەفەر" لە کایەدا نییە هەرگیز نوێژی پێ کورت ناکرێتەوە. کەواتە بوونی "مەشەققەت" هەندێ جار لە سەرانسەری سەفەردا، سەروزیادی ئەوەیە بکرێت بە "حیکمەت"ی کورتکردنەوەی نوێژ و، بۆ ئەوەش کە "سەفەر" ببێت بە "عیللەت"ی ئەو کورتکردنەوەیە.

جا لەسەر بناغەی ئەم قاعیدە شەرعییە، هەرگیز بەپێی گۆڕانی "حیکمەتەکان" حوکمەکانی شەرع گۆڕانکارییان تێدا ناکرێت، بەڵکو بەپێی "عیللەت"ە ڕاستەقینەکان ئەو حوکمانە دەگۆڕێن.

کەواتە، گۆشتی "بەراز" - وەك ئەو پزیشکە باسی کردووە - زیانی هەیە بەپێی ئەو قاعیدەیەی کە دەڵێت: "هەرکەس گۆشتی بەراز بخوات سیفەتەکانی دەگرێت"(١)!

خۆ جگە لە زیانی ئەو نەخۆشییانەی کە لە خواردنی گۆشتی بەرازەوە پەیدا دەبن، گەلێ نەخۆشی و زیانی تریشی تێدایە کە ئەو پزیشکە نایانزانێت، چونکە ئەو گیانلەبەرە وەکو ئاژەڵە ماڵییە سوودبەخش و بێ زیانەکان نییە، بەڵکو خواردنی گۆشتەکەی زیانی زیاترە لە سوودەکانی. ئەمە جگە لەوەی کە پیوە بەهێزەکەی بەراز گەلێ زیانی پزیشکی بەجێ دەهێڵێت لە ولاتانی تری غەیری ولاتە سارد و کوێستانەکانی خۆرئاوادا. تەنانەت چەسپاوە کە گەلێ زیانی مەعنەوی و ڕاستەقینەی تێدایە.

جا ئەم چەشنە حیکمەتانەن کە بوون بە "حیکمەت"ی حەرامبوونی گۆشتی بەراز و پەیوەندیکردنی "نەهی"ی خوای گەورە بە خواردنی. خۆ مەرجیش نییە کە ئەو حیکمەتە لە هەموو دانە و تاکێکدا بێتەدی و، ئینجا هەرگیز بە گۆڕانی ئەو حیکمەتە لە دانەیەکەوە بۆ دانەیەکی تر و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە هەرگیز "عیللەت"ەکە ناگۆڕێت. جا ئەگەر "عیللەت" نەگۆڕا، ئەوا حوکمەکەش ناگۆڕێت.

دەبا لە ڕووناکیی ئەم قاعیدەیەدا قسەکانی ئەو پزیشکە بەدبەختە هەڵبسەنگێنرێت کە لە ڕۆحی شەریعەتەوە دوورن!

کەواتە ئەو قسانەی کە ئەوی بەدبەخت بەناوی شەریعەتەوە دەیانڵێت، بایەخیان پێ نادرێت. چونکە خواوەندی بەدیهێنەر گەلێ ئاژەڵی نەفامی هەیە کە لە شێوەی فەیلەسووفدا بەدیی هێناون!

---

(١) هەرچەندەش ولاتانی خۆرئاوا لە بواری شارستانیتی و زانستە مرۆڤایەتییە نوێکاندا بە چەشنێکی دەراسا پێشکەوتوون و بەرز بوونەتەوە، کەچی گومڕابوونیان بە وێنەی بەراز لەناو تاریکستانی فەلسەفەی ماددی و "مەتاهە"ی سروشتدا، تابڵێی پێچەوانەی ئەو زانست و پێشکەوتنەیانە. بۆیە دەپرسم و دەڵێم: تۆ بڵێی خواردنی گۆشتی بەراز ڕۆڵی لەمەدا نەبێت؟! بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە میزاجی مرۆڤ بە گوێرەی خواردنەکانی دەگۆڕێت، ئەو پەندە بەناوبانگەیە کە دەڵێت: "هەر کەس چل ڕۆژ لەسەر خواردنی گۆشت بەردەوام بێت، گرفتاری دڵڕەقی دەبێت"! (دانەر)

## پاشکۆی ئەو پرسیارەی کە سەبارەت بە "محیّدینی عەرەبی"یەوە کرا:

**پرسیار:**

"ئیبن عەرەبی" مەسەلەی "وحدة الوجود" بە بلندترین پلەی "ئیمـان" دادەنێت. تەنانـەت کەسـانێکی زۆری ئـەولیا مەزنـەکانی ئـەهلی عیشـق لـەو ڕێبـازەدا شـوێنی کەوتوون..

کەچی تۆ دەڵێیت:

ئەم ڕێبـازە مـەزنترین پلـەی ئیمـان و ڕێبـازی ڕاستەقینە نی‌یـە، بـەڵکو مەشرەبێکە هـی ئەهلی مەستی و ئیستیغراق و شەوق و عیشقە.

جا ئەگەر وایە، ئەوا بە پوختی: بەرزترین پلەکانی "تەوحید"مان بۆ باس بکە، ئەوەی کە ڕاشکاویی قورئان و میراتگریی پێغەمبەرایەتی ڕوونیان کردووەتەوە.

**وەڵام:**

کۆڵەوارێکی هەژاری وەك من، کە خاوەنی هیچ گرنگی و بەهایـەك نی‌یـە، لـە کـوێ دەتوانێت خۆی لەو پلە بەرز و بڵندانـە بئـاڵێنێت و، بـە عـەقڵی کـورت و کـول و کاسـی خۆی "داوەریی ژێری"یان تێدا ئەنجام بدات! چونکە ئەم کارە سەد ئەوەندە لـە سـەرووی توانای منەوەیە. بەڵام وا زۆر بە پوختی دوو سەرنج باس دەکەم کە لـە ڕێژنـەی بەرەکـەتی قورئانی پیرۆزەوە ڕژانە ناو دڵمەوە، بەو ئومێدەی کە سوودیان تێدا بێت.

سەرنجی یەکەم:

گەلـێ هۆکار هەن کە مرۆڤ بەرەو مەشرەبی "وحدة الوجود" کێش دەکەن..

*هۆکـــاری یەکـــەم:* ئـــەوان نـــەیانتوانی مـــەزنترین پلـــەی: "بەدیهێنـــەرێتیی پەروەردگاری"(خلاقیة الربوبیة) لە زەینی خۆیاندا جێ بکەنەوە و، لە "دڵ"یشـیاندا ئـەوە جێگیر بکـەن کـە: خـواوەنـد - بـە تـەنیایی خـۆی - جڵـەوی هـەموو شتێکی لــە دەسـتی پەروەردگارێتیی خـۆیدا دانـاوە و، هـەموو شتێك بـە توانسـت و ئیختیـار و ویسـتی ئـەو بەدی دەهێنرێت..

لەبەر ئەوەی کە ئەوان نەیانتوانی پەی بەمانە بەن، ئەوا خۆیان بە ناچار زانی کە بڵێن: (هەموو شتێك خوای تەعالایە). یان: (هیچ شتێك - جگە لەو - وجوودی نییە). یان: (بوونەوەران خەیاڵ و ئەندێشەن). یان: (بوونەوەر جۆرێکە لە خۆدەرخستن و جیلوەی ئەو).

*هۆکاری دووهەم:* سیفەتی: "عیشق" بە جۆرێکە هەرگیز "جودایی" ناوێ و لێی هەڵدێت.. مرۆڤی: "عاشق"یش هەردەم لەتاو جودایی و لێکدابڕانی لە خۆشەویستەکەی لەرزی لێ دێت و، چەندە لە دۆزەخ دەترسێت هێندەش لە دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەی دەترسێت و، بە توندی لە دەست "نەمانی" هەڵدێت.. هەروەها چەندەش زات و ڕۆحی خۆی خۆش دەوێت بەو ئەندازەیەش بەیەك شادبوونی پێخۆشە و حەزی لێیەتی.. چۆن لە ڕادەبەدەر تاسەمەندی دیداری بەهەشتە، بە هەمان جۆریش موشتاقی نزیکبوونەوەیە لە خوای گەورە..

لەبەر ئەوە، مرۆڤی "عاشق" پێی وایە کە دەستگیرکردن لە داوێنی درەوشانەوەی "ئەقرەبییەتی ئیلاهی" کارێك دەکات "جودایی" و لێك دوورکەوتنەوە لە حوکمی "نەبوو"دا بێت و، لەو گومانەدایە کە "بەیەك شادبوون" و "بەیەك گەیشتن" هەمیشەیین، ئەمەش بە: "لا موجود إلاّ هو" دەردەبڕێت.

جا لەبەر ئەوەی ئەو عاشقانە بەهۆی مەستیی عیشق و بە داخوازیی شەوقی مانەوە و بەیەك شادبوون، پێیان وایە کە "وحدة الوجود" مەشرەبێکی "حاڵ"ی وەهایە لەوپەڕی چێژ و خۆشیدایە، ئەوا بۆ خۆڕزگارکردن لە چەندەها جودایی و لێکبڕانی سامناك داڵدەی خۆیان لە مەسەلەی "وحدة الوجود" دا دەبیننەوە.

واتە: سەرچاوەی سەرهەڵدانی هۆکاری یەکەم بریتییە لەوەی کە:

"ژیری"ی ئەوان پەیی بە هەندێ لە ڕاستییە یەکجار بەرز و بڵندەکانی "ئیمان" نەبردووە و نەیتوانیوە بە تەواوی لێیان تێ بگات، هاودەم لەگەڵ ئەمەشدا "ژیری"یەکانیان - لە ڕووی ئیمانەوە - بە تەواوی شتانیان لێ دەرنەکەوتووە.

سەرچاوەی سەرهەڵدانی هۆکاری دووهەمیش:

دەرکەوتنی لەڕادەبەدەری "دڵ"ە، کە بەهۆی کاریگەریی عیشقەوە بە جۆرێکی دەراسا و لە سنووربەدەر بڵاوی و فراوانی بەدەست هێناوە.

کەچی ئەو پلە هەرە بەرزەی "تەوحید" کە ئەولیا هەرە مەزنەکان، واتە: ئـەصفیاکانی پلـەی "بێـداری" و میراتگرانی میراتی پێغەمبەرایـەتی، لـە ڕاشـکاویی قورئـانی پـیرۆزدا دەیبینـن، پلەیــەکی گەلــێ بــەرزە. چونکــە پلــەی هــەرە مــەزنی: "پــەروەردگاریێتی" و "بەدیهێنـەریێتی" خواوەنـد دەگەیـەنێت و، گشــت نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە بـە ڕاستەقینە دەبینێـت و، پارێزگـاریی بناغـەکانی ئیمـان دەکـات، بێ ئـەوەی هاوسـەنگیی ئەحکامەکانی "پەروەردگاریێتی" بشێوێنێت. چونکە ئەوانەی لەم پلەیەدان دەڵێن:

خوای گەورە لە ڕێی ئەحەدییەتی زاتی خۆی و خاوێنیی لە جێ و شوێن و، بە بێ هیچ هۆکارێك، ئاگارداری هەموو شتێکە و، هیچ شتێك لە بازنەی زانینی ئەو بـەدەر نییـە و، بە زانستی خۆی هـەموو شتێکی دەستنیشـان کـردووە و، بـە ویستی خۆیشـی تـەرجیحی داوە و تایبەتمەندی کردووە و، بە توانستەکەشی بەدیی هێنـاوە و هێشتوویەتیەوە. چونکـە خوای گەورە هەروەك چۆن یەك دانە شت بەدی دەهێنێت و ویستی لەسەری دەبێـت، بـە هـەمان جـۆر سەرانسـەری گــەردوونیش بـەدی دەهێنێــت و کاروبـاری دەســازێنێت.. هـەروەها وەك چـۆن بـە" ئاسـانی" یـەك تاقـە گـوڵ دروسـت دەکـات، بـە هـەمان ئاســانی بەهاری مەزنیش بەدی دەهێنێت، کەواتە بەدیهێنانی هیچ شتێك ڕێ لە بەدیـهێنانی شتانی تر ناگرێت و، ئەو شتانەی کە خواوەند ڕووی بەدیهێنانیان ئاراستە دەکات، لەت لەت و بەش بەش نابن. کەواتە خوای گەورە (بە ڕاپەڕاندنی کارەکانی و بـە توانسـت و زانسـتی خۆی) لە هەموو کات و شوێنێکدا ئامادەیە و، هیـچ کـەرت بـوون و دابـەش بوونێـك لـە ڕاپەڕاندنی کارەکانیدا نییە.

لـە وتــەی شــازدەهەم و، مەبەســتی دووهــەمی هەڵوێســتی دووهــەمی وتــەی ســی و دووهەمدا، ئەمەمان ڕوون کردووەتەوە و بە جوانی چەسپاندوومانە.

وا لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە (چونکە نموونە دەمقاڵێی تێـدا نـاکرێت) هەرچـەندەش ئـەم نموونەیـە گەلــێ ناتـەواوە و مەبەستەکە بـە تـەواوی بـە دەستەوە نـادات. بـۆ ئــەوەش دەیهێنینەوە تاکو خوێنەر لە هەندێ جیاوازیی نێوان ئەو دوو مەشرەبە تێبگات:

گریمـان "تــاوس"ێکــی نائاســایی بێوێنــە هــەبێت، کــە تــابڵێی گــەورە و لەوپــەڕی ڕازاوەییدا بێت و، بتوانێت لە ماوەی چاوتروو کاندنێکدا لە خۆرهەڵاتـەوە بـۆ خۆرئـاوا بفـرێت و لـە یـەك چـر کــەدا باڵـەکانی لـە باکــوورەوە بـۆ باشــوور بکاتـەوە و دایشـیان بخاتەوە و، سەدان هەزار نەخش و نیگاری نـاوازەی لەسـەر نەخشـابێت، بـە ڕادەیـەك کـە

هەموو یەکێك لە "پەڕ"ی باڵەکانی بەوپەڕی جوانی ناوازەیی داهێنان و وردەکاریی تێـدا کرابێت.

ئنجا بـا ئێستا وا دابنێین کە دوو کەس هەن سەیری ئەم تاووسە سەیرە دەکەن و، دەیانەوێت بە هەردوو باڵی: "دڵ" و "ژیری" بەرەو پلە بەرزەکانی ئەم باڵندەیە بفڕن و بگەنە ئاستی ئارایشتە نائاسایی و لەڕادەبەدەرەکەی.

یەکەمیان: سەرنجی تێڕامـانی خـۆی ئاراستەی بـارودۆخ و قەڵافـەت و نـەخش و نیگارەکانی قودرەتی دەراسای سەر یەك بە یەکی "پەڕ"ەکانی ئەو تاووسە کرد و، لێرەوە نوقمی عیشق و تاسەمەندی و خۆشەویستیی ئەم باڵندەیە بوو. ئیتر بەکارهێنانی "ژیری" و بیرکردنەوەی قووڵی خستە لاوە و، دەستی بە عیشقەوە گرت. بەڵام سەرنجی دا کـە: ئەو نەخش و نیگارە خۆشەویستانە وەك خۆیان نامێننەوە، بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گۆڕانیـان بەسـەردا دێـت و، ئـەو خۆشەویسـتانەی کـە ئـەوین و خۆشەویسـتیی خـۆی ئاراسـتە کردبوون، هەموو ڕۆژێك دەڕۆن و ئاوا دەبن!

جـا لـە کـاتێکدا کـە دەبـوو بیوتایـە: ئـەم نەخشـونیگارە وردانـە جـێ دەسـتی نیگارکێشـێکی ئـەوتۆن کـە خـاوەنی پلـەی "بەدیهێنـەرێتیی هەمـەکی"یـە و، دارای "تـەنیایی"یـە لـە زاتـی خـۆیدا و، لـە تویـێ "وەحدانییـەت"ە ڕاستەقینەکەشـیدا "پەروەدگارێتی"یەکی ڕەهای هەیـە.. کەچی نـەیتوانی پـەی بەمانـە ببـات و هەسـتیان پـێ بکات و، دڵی خۆی بەوە دایەوە کە دەیوت:

"ڕۆحی ئەم تاووسە هێندە بـەرز و بڵنـدە کـە بەدیهێنەرەکـەی لـەناو خۆیدایـە!.. یـان خۆی بووە بە خودی بەدیهێنەرەکەی! هەروەها ئەو ڕۆحە لەگەڵ جەستەکەیدا بـووە بـە یـەك و، لەبـەر ئـەوەش کـە جەسـتەکەی لەگـەڵ ڕوخسـارە ڕواڵەتی‌یەکـەیدا یـەکیان گرتووە، ئەوا تەنها کەماڵی ئەو ڕۆحە و بەرزیی ئەو جەستەیەن کە بەم شێوە ناوازەیـە ئەو درەوشـانەوانە دەردەخـەن. بە ڕادەیـەك کـە لـە هـەموو خولـەکێکدا نەخشـێکی نـوێ و جوانی‌یەکی تازەوەبوو پێش‌چاو دەخەن. کەواتە ئـەم بەدیهێنانـە نوێیانـە بـە ئیختیـارێکی ڕاستەقینە ڕوونادەن، بەڵکو دەرکەوتن(جلوة) و خۆدەرخستن(تظاهر)ن.

بەڵام کەسی دووهەم، دەیوت:

(ئەم نەخش و نیگارە هاوسـەنگ و ورد و ڕێکـە، بـە دڵنیـایی، داخـوازی ئەوەیـە کـە: ویسـت و ئیختیـار و ئامـانجێکی تێـدا بێـت و، هـەرگیز ناگونجـێ ئەمانـە "دەرکـەوتن" و

"خۆدەرخستن" بن. چونکە هیچ درەوشانەوە و دەرکەوتنێك بە بێ ویست و ئیختیار پەیدا نابن).

بەڵێ، "ماهییەت"ی ئەو تاووسە گەلێ قەشەنگ و جوانە، بەڵام هەرگیزاوهەرگیز ئەو ماهییەتە "بکەر" نییە، بەڵکو "کارتێکراو"ە و، ناگونجێ لەگەڵ بکەرەکەیدا یەك بگرن.. "ڕۆح"ەکەشی گەلێ بەرزە، بەڵام هەرگیز "بەدیهێنەر" و "دەستێوەردەر" نییە، بەڵکو لە "دەرخەر" و "خولگە" بەولاوە هیچی تر نییە. چونکە هێندە وردەکاری لە هەموو "پەڕ"ێکی جەستەیدا هەیە کە تەنها بە "دانست" ئەنجام دراوە و، هێندەش ئارایشتی تێدایە کە بە "توانست"ێکی ڕەها ڕازاوەتەوە. دیارە هەرگیز ناگونجێ کە ئەمانە بە بێ "ویست" و "ئیختیار" ئەنجام بدرێن.

جا ئەم بەدیهاتووە ناوازانەش کە: ئەوپەڕی "دانست" لە ناوەندی کەماڵی "توانست" و.. کەماڵی "میهرەبانی" و "پەروەردگاریتی" لە نێوان کەماڵی "ئیختیار"دا دەردەخەن.. هەرگیز ناکرێ ئەنجامی: دەرکەوتن(جلوة) و هاووێنەی ئەو بن..

چونکە ئەو نووسەرەی کە ئەم تۆمارە زێڕینەی نووسیوە، هەرگیز ناکرێ خودی تۆمارەکە بێت! هەروەها ناشگونجێ لەودا یەکیان گرتبێت! ئەو تۆمارە تەنها هێندە پەیوەندیی بە نووسەرەکەیەوە هەیە کە نووکی قەڵەمەکەی ئەوی بەرکەوتووە!!

لەبەر ئەوە، ئارایشتی جوانیی ئەو تاووسە - کە مەبەست پێی بوونەوەرانە - جگە لەوەی کە نامەیەکە و لە لایەن قەڵەمی نووسەرەکەیەوە هاتووە، هیچی تر نییە.

وا ئێستا سەرنج لە تاووسی بوونەوەران بدە و، ئەو نامەیە بخوێنەرەوە و، بە نووسەرەکەی بڵێ:

ماشاءَ اللّٰه..

تبارکَ اللّٰه..

سبحانَ اللّٰه..

خۆ ئەو کەسەی لەو گومانەدایە کە: نامەکە خودی نووسەرەکە بێت.. یان بە ئەندێشەی خۆی پێی وابێت نووسەرەکە لەناو نامەکەدایە.. یان لەو وەهمەدا بێت کە نامەکە ئەندێشەیە و وجودی نییە.. بێ گومان ئەو کەسە، بە پەردەی "عیشق" ژیریی خۆی داپۆشیوە و، وێنەی ڕاستەقینەی "حەقیقەت"ی نەدیوە.

گرنگترینی ڕووەکانی ئەو جۆرانەی "عیشق" کە دەبنە هۆی ئەوەی مرۆڤ مەشرەبی "وحدة الوجود" پەسەند بکات، بریتی‌یە لە: "عیشقی دنیا"! چونکە هەر ئەوەندەی عیشقی دنیا - کە مەجازی‌یە - دەگۆڕێت بە عیشقی حەقیقی، یەکسەر دەبێت بە: "وحدة الوجود".

گەر کەسێك کەسێکی تری بە عیشقی مەجازی خۆشویست، هەر هێندەی "نەمان"ی خۆشەویستەکەی دەبینێت، ناتوانێت ئەو "نەمان"ە لە دڵی خۆی‌دا جێ بکاتەوە، بۆیە خۆشویستنی حەقیقی ئاراستەی خۆشەویستەکەی دەکات و دەست لە داوێنی حەقیقەتێك گیر دەکات تاکو دڵی خۆی پێ بداتەوە و، دەچێ بە عیشقێکی حەقیقی سیفەتی "مانەوە" بە خۆشەویستەکەی دەبەخشێت و، دەڵێت:

خۆشەویستەکەم ئاوێنەی جوانیی "خۆشەویست" و "پەرستراو"ی ڕاستەقینەیە!

ئەو کەسەش کە ئەم دنیا مەزنەی خۆش دەوێت و سەرانسەری گەردوونی کردووە بە مەعشووقی خۆی، بە هەمان جۆرە، چونکە هەرکات قامچیی "نەمان" و شووڵی "جودایی" لە خۆشەویستەکەی دەسرەوێنرێت، یەکسەر خۆشویستنە مەجازی‌یەکەی دەگۆڕێت بە حەقیقی و، ئیتر ئەو شەیدایە - لە ناچاری‌دا - پەنا دەباتە بەر "وحدة الوجود" تاکو خۆشەویستە مەزنەکەی لە "نەمان" و "جودایی" ڕزگار بکات!

جا ئەگەر ئەو کەسە خاوەنی ئیمانێکی بەرزی ڕەگ داکوتاو بێت، ئەوا ئەم مەشرەبەی بۆ دەبێت بە پلەیەکی بڵندی نوورانی و بەنرخ و مەقبووڵ، وەك ئەوەی "ئیبن عەرەبی" و هاوچەشنی.. دەنا لەوانەیە بکەوێتە نێوان چەندەها گرفتی زۆر و، نوقمی "ماددیات" و "هۆکارەکان" ببێت!

بەڵام "وحدة الشهود" زیانی تێدا نی‌یە و، مەشرەبێکی بەرزی ئەهلی بێداری‌یە.

اللهم أرنا الحق حقا وارزقنا اتباعه.

**﴿سُبْحَانَكَ لاعِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.**

* * *

# بریسکەی دەهەم

پەیامی
زڵڵەی میهرەبانی

﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ ما عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَراً وَمَا عَمِلَتْ مِنْ سُوءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَها وَبَيْنَهُ أَمَداً بَعِيداً وَيُحَذِّرُكُمُ اللهُ نَفْسَهُ وَاللهُ رَءُوفٌ بِالعِبَادِ﴾ (آل عمران: ٣٠)

ئەم "بریسکە"یە نهێنی‌یەك لە نهێنی‌یەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوون دەکاتەوە، لە ڕێی باسکردنی چەند زڵلەیەکی میهرەبانی و پەروەردەیی‌یەوە کە لەو برایانەم دران لەم خزمەتە خاوێن و پیرۆزەی قورئاندا کار دەکەن. ئەو زڵلانەش کە لێیان درا لە ئەنجامی چەند هەڵە و لەبیرچوون و بێ‌ئاگایی‌یەکەوە بوو کە لە سروشتی هەموو مرۆڤێکدا هەن.

جا لێرەدا زنجیرە کەرامەتێك ڕوون دەکرێنەوە کە خوای گەورە لە خزمەتکردنی قورئانە پیرۆزەکەی‌دا پیشانی دەدات. ئەو جۆرە کەرامەتەی شێخی گەیلانیش - قُدِّسَ سِرُّهُ - ڕوون دەکەینەوە کە - بە ئیزنی خوا - چاودێریی ئەم خزمەتە دەکات و هانا بۆ لای خوای گەورە دەبات و لێی دەلاڵێتەوە کە خزمەتگوزارانی ئەم ڕێگایە بپارێزێت.

ئەو کەرامەتەش بۆ ئەوە ڕوون دەکەینەوە تاکو کارگوزارانی ئەم ڕێگایە لە ئیخلاس و دڵسۆزی و دامەزراوی و هەڵمەت و لێبڕانیاندا زیاتر بەردەوام و دامەزراو بن.

بەڵێ، کەرامەتی کارکردن بۆ ئەم خزمەتگوزاری‌یە بەرزە، کە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆزە، سێ جۆرە:

*جۆری یەکەم:*

بریتی‌یە لە ئامادەکردنی هۆکارەکانی کار و خزمەت و، هاندانی کارگوزاران بۆ خزمەتکردن.

*جۆری دووهەم:*

لابردن و دوورخستنەوەی زیانەکانی ئەم ڕێگایە و، تەمێ کردنی ئەوانەیە کە دەبنە کۆسپ لە ڕێگایدا، بە سزادانیان.

سەبارەت بەم دوو جۆرەیان، بەسەرهات و ڕووداوی زۆر هەیە[١]. جا لەبەر ئەوەی نەبێتە مایەی بێزاری، ئەوا باسکردنیان بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین. بەڵام ئێستا "جۆری سێهەم" دەست پێ دەکەین، کە باسکردنی لەچاو ئەوان سووکتر و تێگەیشتنیشی لەوان ئاسانترە.

*جۆری سێهەم:*

ئەم جۆرەیان بریتی‌یە لەوەی کە خزمەتگوزارە دڵسۆزەکانی ڕێگای خزمەتکردنی قورئان، هەر کاتێ سستی و کەمتەرخەمی ڕوو بکاتە کارەکەیان، ئەوا زللەی میهرەبانی و بەزەیی دەخۆن و، بەم جۆرە بێدار دەکرێنەوە. ئنجا ئەوانیش بەمە ڕادەچڵەکێن و هۆشیار دەبنەوە و، بە پەلە و لێبڕانەوە، جارێکی تر دەست بە کار و خزمەتی خۆیان دەکەنەوە.

ڕووداوەکانی ئەم بەشە لە "سەد" ڕووداو زیاترن. بەڵام لێرەدا نزیکەی بیست ڕووداوێك دەگێڕینەوە کە هەندێکیان بەسەر براکانماندا هاتوون. دەوازدەیەکیان زللەی میهرەبانی‌یان لێ درا، بەڵام شەش‌حەوتێکیان زللەی توندوتیژی سەرزەنشتیان خوارد، کە یەکەمیان من(سەعید)ی هەژار بوو!

ئیتر لەم ڕێیەوە بە تەواوی دڵنیا بووم لەوەی کە تاکو بە کاری تایبەتیی خۆمەوە خەریك بووبێتم و، ئەم کارە تایبەتی‌یانەش لە خزمەتکردنی قورئاندا سستیان کردبێتمەوە، یان تەنها خەریکی شتە تایبەتی‌یەکانی خۆم بووبم و وتبێتم: "من چیم لە خەڵکی داوە"؟ یەکسەر زللەیەکم لێ دراوە و بێدار کراومەتەوە! لەبەر ئەوە، لەوپەڕی دڵنیاییدام کە ئەم سزایە ئەنجامی سستی و پشتگوێ خستنی ئەرکی سەرشانمە لە خزمەتکردنی قورئاندا. چونکە ئەو زللەیەم بە پێچەوانەی ئەو مەبەستە لێ دەدرا کە -لە ڕاستیدا- بەرەو بێ‌ئاگایی دەیبردم.

---

(١) بۆ نموونە: ئەوانەی کە بە چاوی کەم سەیری قوتابییانی نووریان دەکرد و ئازاریان دەدان، بە چەندین جار لەو ئازارە زیاتر لە دنیادا سزا درانەوە، با ئازاری قیامەتیش لەولاوە بووەستێ کە زۆر لە هی دنیا توند و سەختترە. (دانەر)

پاشان لەگەڵ براکانمدا سەرنجی ئەو بەسەرهات و بێدارکردنەوە پەروەردگارییە زۆرانەمان دا کە بەسەر برایاندا هاتبوون. پاش سەرنجدان لە یەك بە یەکیان، بۆمان دەرکەوت کە هەرکات کاروباری خزمەتی قورئانیان پشتگوێ خستبێت، ئەو زللانەیان بە پێچەوانەی مەبەستەکانیانەوە لێ دراوە! لەبەر ئەوە، قەناعەتی تەواومان بۆ دروست بوو کە ئەو سزا و ڕووداوانە یەکێکن لە کەرامەتەکانی خزمەتی قورئان.

● **نموونەی یەکەم**: ئەم "سەعید"ە هەژارەی دەرگانەی خوایە!

چونکە لە کاتێکدا کە خەریکی وتنەوەی وانەی حەقیقەتەکانی قورئان بووم بە قوتابییەکانم لە شاری "وان"، لەم کاتەدا ڕووداوەکانی لەمەڕ "شێخ سەعیدی پیران"[١] بەرپرسانی دەوڵەتیان خستبووە نیگەرانی و مەترسییەوە. خۆ هەرچەندەش ئەو کاربەدەستانە لە هەموو کەسێك بەدگومان بوون، بەڵام هیچ خراپەیەکیان بەرامبەرم نەنواند و هیچ بەڵگەیەکیشیان بە دەستەوە نەبوو تاکو بیانووم پێ بگرن. هەر بەم جۆرەش ڕەفتاریان لەگەڵ کردم هەتا لە خزمەتکردنی قورئاندا بەردەوام بووم. بەڵام کاتێ لە بەرخۆمەوە وتم: "من چیم لە خەڵکی داوە" و بیرم لە تەنها خۆم کردەوە و، لە مەیدانەکە کشامە دواوە و ڕۆشتمە ناو ئەشکەوتەکانی چیای "ئەرەك" تاکو خۆم بۆ قیامەت دەرباز بکەم.. کاتێ ئەم هەنگاوەم نا، هاتن لەو ئەشکەوتانە دەریانهێنام و گرتیانم و، لە پارێزگاکی خۆرهەڵاتەوە(وان) بەرەو پارێزگاکی خۆرئاوا(بوردوور) ڕەهەندە(نفي)یان کردم!

ئنجا کاربەدەستانی ئەم شارەش زۆر بە توندی چاودێریی دوورخراوەکانیان دەکرد و، دەبوو هەموو ئێوارەیەك دوورخراوەکان لە لای پۆلیس خۆیان پیشان بدایە و، بەم کارەش ئامادەبوونی خۆیان دەربخستایە. بەڵام من و قوتابییە دڵسۆزەکانم، لەبەر خزمەتگوزاریی قورئان، لەم کارەدا لە خەڵکانی تر جیا کراینەوە. بەم جۆرە هیچ کاتێ بۆ دەرخستنی ئامادەبوونم نەڕۆشتمە ئەوێ و کەسم لە کاربەدەستانی ئەوێ نەناسی. تەنانەت کاتێ کە "فەوزی پاشا"[٢] هات بۆ "بوردوور"، والیی شار سکاڵای ئەم کارەی

---

(١) شێخ سەعیدی پیران یەکێکە لە شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی و، باپیریشی خەلیفەی مەولانا خالید بووە. لە بەرواری ١/٢/١٩٢٥ز شۆڕشی دژی کاربەدەستانی تورکیا هەڵگیرساند و لە ١٥/٤/١٩٢٥دا کۆتایی بە شۆڕشەکەی هێنرا و، ئنجا دادگای شۆڕشی کەمالی لە ڕۆژی ٢٩/٦/١٩٢٥دا بڕیاری لە سێدارەدانی لەسەر شێخ سەعید و چل و حەوت کەسی تر لە شاری دیاربەکر جێبەجێ کرد. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست (مارشال فەوزی چاقماق)ە کە ئەو دەمە سەرۆك ئەرکانی سوپای تورکیا بووە. (وەرگێڕ)

ئێمەی لە لا کردبوو. ئەویش لـە وەڵامدا وتبووی: "ڕێزی بگـرن و کارتـان بەسـەریەوە نەبێت"!

لە ڕاستیدا تەنها کەرامەتی خزمـەتکردنی قورئـانی پیرۆز بـوو ئـەم گوفتارەی لـە دەم دەرکرد! چونکە کاتێ پـاش ئـەو ڕووداوە ئـارەزووی ڕزگـارکردنی خـۆم و چـاککردنی ئاخیرەتی خۆمم بەسەردا زاڵ بووەوە و، بە جۆرێکی کاتی سستی ڕووی کردە کارەکـانم لە خزمـەتکردنی قورئـاندا.. ئـا لـەم کاتـەدا و، بـە پێچەوانـەی ئـەو مەبەستەی چـاوەڕوانم دەکرد، سزایان دام! واتە لـە بـوردوورەوە بـەرەو جێگایـەکی تـر ڕەهـەندەیان کـردم، کـە شاری "ئیسپارتە" بوو.

دیسانەوە لەوێ دەستم کردەوە بە کارکردن بۆ قورئانی پیرۆز. بەڵام پـاش تێپـەڕبوونی بیست ڕۆژ بەسەر ئەم خزمەتگوزاریـەی قورئـاندا، هـەندێ لـەو کەسـانەی مەترسـییان هـەبوو، جـار لـە دوای جـار دەهـاتن ئاگاداریـان دەکردمـەوە و دەیـانوت: "لەوانەیـە کاربەدەستانی شار ئەم کارەی تۆیان پێ باش نەبێت! کەواتـە ئـارام بگـرە و پەلـە مەکـە". لەمەوە بایەخدان بە تەنها خۆم و دواڕۆژی تایبەتیی خـۆم بەسـەرمدا زاڵ بـووەوە و، داوام لە برادەرانم کـرد نەیـەن بـۆ لام! بـەم جـۆرە خـۆم لـە مـەیدانی کـار کشـاندە دواوە. ئنجـا جارێکی تر دوور خرامەوە و بۆ جێگایەکی تری سێهەم، کە "بارلا"یە، ڕەهەندە کرام!

لە "بارلا"شدا هـەر کـات سستی ڕووی بکردایـەتە کـارکردنم بـۆ قورئـان و، بایـەخم تەنها بە خودی خۆم بدایـە و تەنـها هـەوڵم بـۆ چارەسـەرکردنی کاروبـاری قیامـەتی خـۆم بوایە، یەکێك لـە هەژدیـهاکانی ئـەهلی دنیـا بەسـەرمدا زاڵ دەبـوو، یـان مونـافیقێك ڕێـی پێدەگرتم و شەڕی پێ دەگێرام!

جا برایانم! من ئامادەم هەشتا ڕووداوی وەك ئەم جۆرەتان بۆ بگێڕمـەوە، کـە تەنـها لـە مـاوەی ئـەو هەشـت سـاڵەی مانـەوەمدا لـە بـارلا بەسـەرم هـاتوون. بـەڵام لـە ترسـی بێزاربوونتان هەر ئەوانەی پێشووم لـێ باس کردن.

دەسا براکانم!

وا من هەندێکم لەو زللەی میهرەبانییانە باس کرد کە لێم دران. جا ئەگەر ڕێم بدەن ئەو زللانەش بگێڕمەوە کە لە ئێوە دراون، ئەوا دەیانگێڕمەوە. هیواداریشم دڵگران نەبن. خۆ ئەگەر هی واشتان تێدا بێت حەز بە گێڕانەوەی نەکات، ئەوا ناوی ناهێنم.

● **نموونەی دووهەم**: "عەبدولمەجید"ی برامە، کە یەکێکە لە قوتابییە خۆبەختکار و کارگوزار و دڵسۆزەکانم.

کاتی خۆی خانوویەکی جوانی لە شاری "وان" هەبوو، گوزەرانیشی لەوێ بە گوێرەی دڵ بوو. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بە دەرس وتنەوە خەریك و سەرقاڵ بوو.

جا کاتێ کە خزمەتکردنی قورئان پێویستی کرد بەرەو شوێنێکی دووری سەرسنوور بڕۆم، ویستم لەگەڵ خۆمدا بیبەم. بەڵام ئەو بەمە ڕازی نەبوو، وەك بڵێی پێی باش بێت منیش نەڕۆم، چونکە لەوانەیە کارەکە شتێکی لە بارەی سیاسەتەوە تێکەڵ ببێت و، دوور نییە دووچاری ڕەهەندەییشی بکات و، وای بە باش زانی کە هەر لەوێ بمێنێتەوە. ئیتر بەم جۆرە لەگەڵماندا بەشداریی نەکرد.

بەڵام زللەیەکی میهرەبانیی وای لێ درا کە پێچەوانەی مەبەستەکەی خۆی هاتە دی و، هەرگیز چاوەڕێی شتی وای نەدەکرد. ئەوەبوو لەوێ ڕەهەندەیان کرد و لە خانووە جوانکیلەکەی دوور خرایەوە و ناچار کرا بڕوات بۆ "ئەرگانی"[1]!

● **سێهەم نموونە**: "**خلووصی**"یە، کە یەکێکە لە هەرە خزمەتگوزارەکانی قورئان.

کاتێ ڕۆشتەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە هەموو لایەکەوە هۆکارەکانی لەزەتبردن لە جوانی و بەختەوەریی دنیا دەورەیان دا و، لە دوای ماوەیەکی درێژخایەنی جودایی و دووری بە دیداری دایك و باوکی شاد بووەوە و، بە پۆشاکی ئەفسەری و ڕوتبەی بەرزەوە گەڕایەوە شارەکەی خۆی، ئا لەم کاتەدا دنیای خۆش و ڕەنگین هاتە پێش‌چاو! ئەمەش وای لێ کرد کە هەندێ کەمتەرخەمی و سستی لە خزمەتگوزاریی بێ گەردی قورئاندا بنوێنێت.

*بەڵێ، ئەوانەی لە بواری خزمەتکردنی قورئاندا کار دەکەن، دەبێ یان پشت لە دنیا هەڵبکەن، یان دنیا پشت لەوان هەڵدەکات. تاکو بەوپەڕی لێبڕان و ئیخلاس و چوست و چالاکییەوە کارەکانیان ڕابپەڕێنن!*

جا هەرچەندە "خلووصی" مرۆڤێکی خۆڕاگرە و دڵی ئەوەندە دامەزراوە کە لە جێی خۆی نابزوێت، کەچی ئەم بارودۆخە دنیاییە جوانەی کە لە ڕوویدا پێکەنی، سستی کردەوە و، زۆری نەخایاند زللەیەکی میهرەبانیی لێ درا. ئەوەبوو بە درێژایی دوو ساڵی

---

(١) ئەرگانی: قەزایەکی سەر بە پارێزگای "ئەلازیغ"ی تورکیایە و (٠٠٥ کم) بەرەو خۆرئاوا لە "وان"ەوە دوورە! (وەرگێڕ)

ڕەبەق چەند مونافیقێك ژیانیان لێ تاڵ کرد و هیچ بەشێکیان لە تام و لەزەتی دنیا بۆ نەهێشتەوە. هەتا وایان لێ کرد بێز لە دنیا بکاتەوە و پشتی تێبکات و، دنیاش بێز لەم بکاتەوە و پشتی لێ هەڵبکات. ئنجا بەوپەڕی چوست و چالاکی هاتەوە ژێر سایەی ئالای خزمەتگوزاریی قورئان و بە توندی دەستی پێوە گرتەوە.

● **چوارەم: "حافظ ئەحمەدی موهاجیر"ە**[1].

وا خۆی ئەوەتان بۆ دەگێڕێتەوە کە بەسەری هاتووە:

(بەڵێ، من دان بەوەدا دەنێم کە لە خزمەتکردنمدا بۆ قورئانی پیرۆز ئیجتیهادم کرد و، لە ئیجتیهادەکەشمدا بە هەڵەدا چووم. چونکە تەنها بیرم لە ڕزگارکردنی ئاخیرەتی خۆم کردەوە و، هەر هێندەی ئەم حەز و ئارەزووەم تێدا بووژایەوە، یەکسەر لە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز سست و خاو بوومەوە و، زللەیەکی میهرەبانیم لێ درا، هەرچەندەش زللەیەکی توند و ئازاربەخش بوو، بەڵکو لە ڕاستیدا زللەیەکی سەخت و سەرزەنشتێکی بەتین بوو ئاراستەم کرا. لە خوای گەورە ئومێدەوارم بیکات بە کەفارەتی ئەو بێئاگاییەی کە لە خزمەتگوزاریی قورئاندا دووچاری بووم. ڕووداوەکەش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

مامۆستا بەو بیدعەتانە ڕازی نەدەبوو کە تازەکی هێنرابوونە کایەوە[2]. جا لەبەر ئەوەی کە ئەو مزگەوتەی نوێژی جەماعەتم تێدا دەکرد لە نیشتەجێی مامۆستاوە نزیك بوو، ئنجا مانگە پیرۆزەکانی: "ڕەجەب، شەعبان، ڕەمەزان"یش لە هاتندا بوون، ئەوا ئەم وتوویژانەی خوارەوەم بە دەروونندا هات و نەفسم پێی وتم:

ئەگەر بە شێوە بیدعەتەکە نوێژ نەکەم ئەوا لە کارەکەم قەدەغە دەکرێم. خۆ ئەگەر واز لە مزگەوتیش بهێنم و نەبم بە ئیمامی نوێژکەران ئەوا پاداشتێکی زۆرم لەکیس دەچێت، بە تایبەتی لەم سێ مانگە پیرۆزەدا. سەرەڕای ئەوەی کە خەڵکی گەڕەکیش لەسەر وازهێنان لە نوێژی جەماعەت ڕادێن.

جا من ئا لەم کاتەدا و لە دەروونەوە حەزم دەکرد مامۆستا - کە لە گیانی خۆم بەلامەوە ئازیزترە - بۆ ماوەیەکی کاتی گوندی "بارلا" بەجێبهێڵێت و بۆ جێگایەکی تر

---

(١) یەکێکە لە "قوتابییانی پێشینی پەیامەکانی نوور لە "بارلا" و بە درێژایی مانەوەی مامۆستا نوورسی لە بارلا پەیوەندیی بە مامۆستاوە بووە. لە ساڵی ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێر)

(٢) واتە: بانگدان و نوێژکردن و قورئان خوێندن بە زمانی تورکی، کە بەشێك بوون لەو بیدعەتە نوێیانەی لە ساڵەکانی بیستەوە تا ساڵی ١٩٥٠ز لە تورکیا بە زەبر و زەنگەوە پیادە دەکران. (وەرگێڕ)

بڕوات، تاکو بە جۆرە بیدعیی‌یەکە پێشنوێژی بکەم! بەڵام من ئەوەم لـەیادچوو کـە ئەگـەر مامۆستا - با بۆ ماوەیەکی کـاتییش بـێ - ئـێرە بەجێ‌بـهێڵێت، سستی ڕوو دەکاتـە خزمەتگوزاریی قورئان..

ئا لـەم کاتـەدا بـوو کـە سزا درام[1] و، سزاکەشـم هەرچـەند بـە بـەزەیی بـوو، بـەڵام زللـەیەکی ئەوەندە توند و بەهێز بوو کە لە دوای سێ مانگ هۆشم بە خۆمدا هاتەوە!

جا ئومێدی زۆرم بە میهرەبانیی فراوانی خوای گـەورە هەیـە کـە هـەموو خولـەکێکی ئەو موسیبەتەم بۆ بکات بە خواپەرستیی ڕۆژێکی تـەواوەتی، وەك مامۆستا خـۆی - بـەو ئیلهامەی کـە خـوا پێـی بەخشیوە - پێـی ڕاگـەیاندم. چونکـە ئـەو هەڵـەیـەم بـەهۆی هیـچ هـاندەرێکی دەروونـی و کەسـی‌یەوە نـەبوو، بـەڵکو هۆکـەی تەنـها هەڵـەکردنم بـوو لـە ئیجتیهاد و بۆچوونەکەمدا و هـی ئـەوەبوو کـە بـیرم تەنـها لـە دواڕۆژی ئـەودنیای خـۆم و پاداشت پەیداکردنم بۆ "تەنها خۆم" کردەوە)!

● **پێنجەم: "حەققی ئەفەندی"**یە.

لـەبەر ئەوەی خۆی لێرە ئامادە نی‌یە، وا من لە بریی ئەو دەیگێڕمەوە، هەروەك لە بریـی خلووصی گێڕامەوە و، دەڵێم:

حـەققی ئەفـەندی، بەوپـەڕی ڕێکوپێکـی، کـار و ئـەرکی سەرشـانی خـۆی لـە خزمەتگوزاریی قورئاندا بەجێ دەهێنا. بەڵام کاتێ کە بەرپرسێکی هەرزە و نـەفام کـرا بـە "قایمقام"، حەققی ئەفەندی بیری کردەوە لەوەی کـە هـەموو ئـەو پەیامانـەی لـە لای هـەن، بیانشـارێتەوە. ئەمەش لەبەر ئـەوەی نـەوەك خـۆی و مامۆسـتاکەی بـە هۆیانـەوە تووشـی زیان و ئازار ببن. ئیتر بە شێوەیەکی کاتی وازی لە خزمەتگوزاریی نوور هێنا.

بەڵام یەکسەر زللـەیەکی میهرەبانیی ئاراستە کرا، چونکە دەعوایەکی لەسەر کرایەوە کە خەریك بوو ناچـاری بکـات هـەزار لـیرە بـدات تـا ڕزگـاری ببێـت لێـی! بـەم جـۆرە، سـاڵێکی ڕەبەقی بە هەڕەشە لێکراوی بردەسـەر. تـاکو لـە ئەنجامدا گەڕایـەوە لامـان بۆ کار و فەرمانبەری‌یەکەی خۆی و داوای خزمەتگوزاریی قورئانی کرد. ئیتر خواوەند لەو گێژاوە دەربازی کرد و حوکمەکەی لەسەر هەڵگرت و تەبریە بوو.

پاشـان کاتـێ کـە دەرگـای مـەیدانێکی نـوێ بـۆ خزمـەتکردنی قورئـان لـە قوتابییـان کرایەوە، کە بریتی بوو لە نووسینەوەی قورئـانی پیرۆز بـە خـەتی دەسـت و بـە جۆرێکـی

[1] لێرەدا سزاکەی باس نەکردووە، لەوانەیە بە پێویستی نەزانیبێت باسی بکات. (وەرگێڕ)

تازە و جوان[١]، حەققی ئەفەندی بەشی خۆی دراین و، جزمێکی تەواوی قورئانی بە ڕێکوپێکی و جوانی نووسی‌یەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی پێی وابوو کە لە باری گوزەرانەوە لە تەنگانەدایە، ئەوا بە بێ ئەوەی ئێمەش پێی بزانین پەنای بردە بەر وەکیلیی دەعوای خەڵکی لە دادگاکاندا، کاتێکی زانی زللەیەکی تری میهرەبانیی لێ درا. چونکە ئەو پەنجەیەی کە قورئانی پیرۆزی پێ دەنووسی‌یەوە لە شوێنی خۆیدا نوشتایەوە! ئێمەش لەبەر ئەوەی ئاگاداری کارەکەی ئەو نەبووین، سەرمان سووڕدەما و نەماندەزانی هۆی ئەمەی بەسەر پەنجەیدا هات چی‌یە؟ چونکە وای لێ کرد نەتوانێت لە خزمەتکردنی قورئاندا بەردەوام بێت!

پاشان تێ گەیشتین کە ئەم خزمەتە پیرۆزە نایەوێت ئەو پەنجە پاکانە تێکەڵی شتی چەپەڵ بن[٢]. وەك بڵێی پەنجەکە بە زمانی حاڵ دەدوێت و دەڵێت: "نابێت لەم لاوە لە نووری قورئانی پیرۆز هەڵمبکێشیت و پاشان بچیت لەولاوە نوقمی تاریکستانی دەعواکانم بکەیت"! هەرچۆن بێت ئەمە بێداری کردەوە.

بە هەرحاڵ، من خۆم لە جێی خلووصی دانا و لە بری ئەو بەسەرهاتەکەیم گێڕایەوە. حەققی ئەفەندیش وەك ئەو وایە. جا ئەگەر بەمە ڕازی نەبێت کە لە وەکیلیی ئەو گێڕامەوە، با خۆی بەسەرهاتی ئەو زللەیە بگێڕێتەوە کە لێی درا.

● **شەشەم "بەکر ئەفەندی"یە**[٣].

لەبەر ئەوەی خۆی لێرە نی‌یە و، هەروەك لە بریی "عەبدولمەجید"ی برام گێڕامەوە، لە بریی بەکر ئەفەندیش دەیگێڕمەوە، چونکە وەکو یەك وان و، پشت بە ئیخلاس و وەفا و

---

(١) چونکە ئەو کاتانە لە تورکیا قورئانی پیرۆز بە پیتی عەرەبی قەدەغە کرابوو. ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەم قورئان نووسینەوەیەی کە لەم پەیامەدا باسی هەیە بە جۆرێکی وا نووسرایەوە کە هەرچی وشەی (الله) هەیە لە لاپەڕەکانیدا لە ئاستی یەکتر دەرچووبوون، تاکو ئەم لایەنەی ئیعجازی قورئان پیشانی ئەو کەسانە بدات کە لە مەسەلەی ئیعجازی قورئاندا هەر لەوەندە تێدەگەن کە بە چاو ببینن. خۆشنووسی بەناوبانگی کورد حامیدی ئامیدی - خوا لێی خۆش بێت - بە خەتە جوانەکەی خۆی دانەیەکی لەبەر ئەو قورئانە نووسی‌یەوە کە ئەو قوتابییانەی نوور نووسیبوویانەوە. شایانی باسە: ئەم موصحەفە دەستخەتەی حامیدیش چەندین جار چاپ کراوە و بڵاو کراوەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) چونکە دەعواکانی دادگا حەق و ناحەقی تێدا تێکەڵ بە یەکتر دەبن. (وەرگێڕ)

(٣) یەکێکە لە قوتابی‌یانی پێشینی پەیامەکانی نوور. ساڵی ١٨٩٨ز لە بارلا لە دایك بووە و ساڵی ١٩٥٤ز لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

برادەرییە ڕاستەقینەکەی و دامەزراویی لە خزمەتدا دەبەستم و، دەبم بە وەکیلی خۆی لە گێڕانەوەی ڕووداوەکەدا:

هەروەك "سلێمان ئەفەندی"[(١)] و "حافظ تۆفیقی شامی"[(٢)] و برا خۆشەویستەکانی هاووێنەیان دەیگێڕنەوە:

ئەو کەسەی "وتەی دەهەم"ی لە ئەستەمبووڵ بە چاپ گەیاند بەکر ئەفەندی بوو. ئنجا ویستمان پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"ش هەر لەوێ چاپ بکەین، ئەمەش لە پێش هاتنی ئەم پیتە لاتینییانەی ئێستا. ئەوەبوو نامەیەکم بۆ نارد و تیایدا بۆم نووسی کە: (پارەی چاپکردنی ئەم پەیامە و پەیامەکەی تریشت بۆ دەنێرین).

بەڵام کاتێ کە لێکی دابووەوە پارەکە دەکاتە چوارسەد لیرە و دەیشیزانی من لە چ هەژارییەکدام، ئەوا ویستبووی بە پارەی خۆی چاپی بکات. ئنجا بە خەیاڵیدا هاتبوو کە من ڕازی نیم ئەو پارەی چاپەکە بدات، دەروونی لەخشتەی برد و دەستی بە چاپکردنی پەیامەکە نەکرد! لە ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیەشیدا زیانێکی گەورە لە خزمەتگوزاریی قورئان کەوت. پاشان کە دوو مانگ بەسەر ئەمەدا تێپەڕی نۆسەد لیرەی لێ دزرا! ئەمەش زللەیەکی میهرەبانی بوو کە لە بەرامبەر سستی کردنیەوە لە کارەکەیدا لێی درا!

لە خوای گەورە داواکارین ئەو سامانە لەدەست چووەی بە خێر و سەدەقە بۆ بنووسێت.

● **حەوتەم: "حافظ تۆفیق"ە**، کە بە نازناوی "شامی" بەناوبانگە. وا خۆی بەسەرهاتەکەیتان بۆ دەگێڕێتەوە:

بەڵێ: من چەند کارێکی وام ئەنجام دا کە لە خزمەتگوزاریی قورئان سستیان کردمەوە و، لە ئاکامی ئەمەشدا زللەم ئاراستە کرا. بەوپەڕی بێ گومانیشەوە دڵنیام

---

(١) ئەم سولەیمانە هەشت ساڵی ڕەبەق لە بارلا خزمەتی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی نووری کردووە و، نموونەی ڕاستی و وەفا و دڵسۆزی بووە. ساڵی ١٩٦٥ ز کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٢) لە نێوان ساڵەکانی (١٨٨٧ - ١٩٦٥)زدا ژیاوە و لە قوتابییانی پێشینی پەیامەکانی نوورە. بۆیە پێی وتراوە (حافظ) چونکە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە و، پێیشی وتراوە (شامی) چونکە ماوەیەکی زۆر لە شامدا لەگەڵ باوکی ماوەتەوە. مرۆڤێکی زانا و خاوەن تەقوا و صەلاحەت بووە. لە "بارلا" و بەندیخانەکانی "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" هاودەمی مامۆستا نوورسی بووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

لەوەی کە ئەو زللەیەم بەو هۆیەوە لێ درا. چونکە ئەو کارانەی کە پێیانەوە سەرقاڵ بووم و لەو خزمەتە سستیان کردمەوە، لە ئەنجامی هەڵە و نەزانینم بوو لە بیرکردنەوە و بۆچوونەکانمدا.

*زللەی یەکەم:*

کاتێ مامۆستا نووسینەوەی قورئانی پیرۆزی بە سەرماندا دابەش کرد، من نووسینەوەی سێ جزمم بەرکەوت، چونکە خواوەند نیعمەتی خۆشنووسیی خەتی عەرەبیی وەك نووسینی خەتی قورئان پێ بەخشیوم. جا شەوق و خۆشحاڵیی نووسینەوەی قورئان، لە نووسینەوەی پەیامەکان سستیان کردمەوە. جگە لەوەی کە هەندێ لە خۆبایی‌بوونیشم لەمەوە تووش بوو، چونکە لەم کارەدا خۆم لە هاوەڵەکانم پتر بە سەرکەوتوو دەزانی، بەهۆی ئەوەی کە هیچ پێویستی‌یەکم لە خۆمدا شك نەدەبرد بە هیچ کەسێك سەبارەت بە نووسینی خەتی عەرەبی، بە ڕادەیەکی وا کە مامۆستا کاتێ ویستی لە بارەی نووسینی خەتی عەرەبی‌یەوە هەندێ ڕێنمایی و ئامۆژگاریم بکات، هەندێ لەخۆم بایی‌بووم و وتم: "ئەمە ئیشی خۆمە.. دەیزانم.. پێویستم بە پێوتن نی‌یە"!

لە ئەنجامی ئەم هەڵەیەمدا زللەیەکی میهرەبانیم چەشت. کە بریتی بوو لەوەی نەمتوانی بگەمە پلەی هاوەڵەکانم لە نووسینەوەدا، چونکە ئەوان لە جوانیی نووسینەوەکەدا پێشمکەوتن! منیش سەرم لەم کارە سووڕ دەما و دەموت: خۆ من پێشیان کەوتبووم، ئەی بۆچی وا دواکەوتم؟ بەڵام ئێستا تێ‌دەگەم کە ئەوەی من سەرم لێی سووڕدەما بریتی بوو لە زللەیەکی میهرەبانیی خواوەند و، کەرامەتی خزمەتکردنی قورئان لێی دام. چونکە ئەم خزمەتە لەخۆبایی‌بوون قبووڵ ناکات.

*زللەی دووهەم:*

دوو حاڵەتم لەخۆمدا شك دەبرد کە لەگەڵ خاوێنیی کارکردندا بۆ قورئانی پیرۆز نەدەگونجان و، لە ئەنجامیشیانەوە زللەیەکی توندوتیژم لێ درا. ئەو دوو حاڵەتەش ئەوە بوون کە:

خۆمم لە وڵاتەکەدا بە غەریب دەزانی، بەڵکو لە ڕاستیشدا هەر غەریب بووم. جا بۆ نەهێشتنی بێزاریی غەریبی و نامۆیی، تێکەڵیی کەسانێکم کرد کە بەهۆی دنیاوە لە خۆیان بایی بووبوون. ئیتر لەوانەوە فێری ڕیاکاری بووم! جگە لەوەش، بە بۆنەی گوێ

نەدانم بە دەستوورە گرنگەکەی مامۆستا سەبارەت بە قەناعەت و دەستپێوەگرتنەوە، هەژاری و دەستکورتی سەری تێ کردم - ئەمەش سکاڵای حاڵ نییە - هەرچەندەش مامۆستا ئاگاداری ئەم شتانەی کردم، تەنانەت هەندێ جاریش سەرزەنشتی دەکردم. بەڵام - بە داخەوە - نەمتوانی لەم گێژاوە خۆم دەرباز بکەم. وا داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم.

جا ئەم دوو حاڵەتەی باسم کردن، شەیتانەکانی جینی و ئینس دەرفەتیان لێ وەرگرت و، خزمەتگوزاریم بۆ قورئان سستی ڕووی تێ کرد و، بەم هۆیەوە زللەیەکی توندوتیژم خوارد، بەڵام هی میهرەبانی بوو. ئیتر بێ هیچ گومانێك دڵنیا بووم لەوەی کە ئەم زللەیەم لەوێوە بۆ هاتووە.

زللەکەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

هەرچەند بۆ ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەق نووسەرەوەی پەیامەکانی نوور بووم و مامۆستا دەیوتن و منیش دەمنووسینەوە و تێکەڵییەکی ئاوا گەرموگوڕ و خەستوخۆڵم لەگەڵ ئەم پەیامانەدا هەبوو، کەچی - بە داخەوە - لە نوور و ڕووناکیی ئەو پەیامانە هێندەم دەست نەکەوت کە ئەوانی تر لە ماوەی هەشت مانگدا دەستیان دەکەوت!

جا من و مامۆستا - هەردووکمان - سەرمان لەم کارە سووڕدەما و دەمانوت: دەبێ هۆکاری ئەمە چی بێت؟ واتە: بۆچی ڕووناکیی حەقیقەتەکانی قورئان تێکەڵی ناو دڵم نابن؟! گەلێ بە دوای هۆکارەکانی ئەم دیاردەیەدا گەڕاین. وا ئێستا بەوپەڕی بێگومانییەوە دەزانین کە:

ئەو حەقیقەتانە یەکپارچە نوور و ڕووناکین. دیارە "ڕووناکی" هەرگیز لەگەڵ "ڕیا" و "کلکە لەقێ"دا بۆ خەڵکی کۆنابێتەوە! هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە ڕووناکییەکان لێم دوورکەوتنەوە و سەبارەت بە من وەك شتێکی نامۆیان لێ هات.

لە خوای گەورە داواکارم ئیخلاسی تەواوم لە کارکردندا پێ ببەخشێت و، لە "ڕیا" و "زەلیل بوون لە بەردەم ئەهلی دنیا"دا بمپارێزێت.

تکا لە هەمووشتان دەکەم - بە تایبەت مامۆستا - کە بە کوڵ دوعام بۆ بکەن.

بەندەی پڕ قسوور:

حافظ تۆفیقی شامی

● **هەشتەم: "سەیرانی"یە.**

ئەم برایە هاوشانی "خەسرەو"ە[1] و یەکێکە لە قوتابییە زیرەك و چالاکەکانم و، لەو کەسانەیە کە زۆر موشتاقی "پەیامەکانی نوور"ن.

ڕۆژێکیان ڕای قوتابییانی ئیسپارتەم سەبارەت بە مەسەلەی "تەوافوق" وەرگرت، کە کلیلێکە بۆ نهێنییەکانی قورئانی پیرۆز و زانیاریی پیتەکان(علم الحروف).

هەموو قوتابییان بەوپەڕی گەرموگوڕی لە گفتوگۆکەدا بەشدارییان کرد، ئەم نەبێت! ئنجا بەوەشەوە ڕانەوەستا کە بەشداری نەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی بایەخی بە شتی تر دەدا، دەیویست منیش وا لێ بکات واز لەو حەقیقەتانە بهێنم کە عیلمی یەقینم پێیان هەیە. پاشان نامەیەکی توندوتیژی بۆ ناردم کە لە دەروونەوە گەلێ کاری تێ کردم و، لە بەر خۆمەوە وتم: "داخی گرانم ئەم قوتابییە وریایەم لەدەست چوو". هەرچەندەش ویستم مەسەلەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە، بەڵام بێسوود بوو، چونکە بابەتەکە شتی تری تێکەڵ بووبوو.

لە پاش ئەمە، زللەیەکی میهرەبانیی لێ درا و، نزیکەی ساڵێك ڕۆیشتە بەندیخانەوە.

● **نۆهەم: "حافظ زوهدیی گەورە"یە.**

ئەم برایە سەرپەرشتیی ئیش‌وکاری قوتابییانی نووری شاری "ئاگروس"ی دەکرد. بەڵام وەك بلێی بەو پلە و ڕێزە بەرزەی کە قوتابییانی نوور هەیانە و بەهۆی پەیڕەوی‌کردنیانەوە لە سوننەتی پیرۆز و خۆپاراستنیان لە بیدعەت، دەستیان کەوتووە، ئەم پێی ڕازی نەبێت و، حەزی کرد ئەم پلەیەی لای ئەهلی دنیا دەست بکەوێت! لەبەر ئەوە، کارمەندییەکی لە دنیاپەرستان وەرگرت کە بریتی بوو لە: فێرکاریی بیدعەتێکی خراپ!

---

(١) خەسرەو: ساڵی ١٨٩٩ز لە شاری ئیسپارتە لەدایك بووە و ساڵی ١٩٧٧ز لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە. لە پێشەنگی ئەو کەسانەوەیە کە سەدان نوسخەیان لە پەیامەکانی نوور بە دەستخەت نووسیوەتەوە و لە ناخۆشترین بارودۆخدا بڵاوی کردوونەتەوە و، بەشێکی زۆری ژیانی خۆی لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا لە بەندیخانەکانی: ئەسکیشەهر و دەنیزلی و ئافیووندا بەسەر بردووە و، بە سەرپەرشتی و ڕێنمایی مامۆستاش موصحەفێکی نایابی نووسیوەتەوە بۆ دەرخستنی ئیعجازی قورئان لەمەڕ ڕێك دەرچوونی وشەی (الله) لە یەك بە یەکی لاپەڕەکانی ئەو موصحەفەدا. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

بەڵێ، ئەو کارمەندییەی گرتە ئەستۆ. بەمەش هەڵەیەکی گەورەی کرد کە پێچەوانەی مەسلەك و ڕێبازی ئێمەیە، چونکە ڕێبازمان بریتییە لە: شوێنکەوتنی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ.

پاشان زللەیەکی تاڵێی سامناکی خوارد، چونکە ڕووداوێکی وای بەسەر هات کە نزیك بوو ئابڕووی خۆی و کەسوکاریشی بەجارێ ببات!

ئەو ڕووداوە - بە داخەوە - حافظ زوهدیی بچووکیشی گرتەوە، هەرچەندە شایانی زللە نەبوو.

لە خوای گەورە داواکارین کە ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە وەك نەشتەرگەرییەك لێ بکات بۆ دڵ و دەروونی و، هێندەش"دڵ"ی لە دنیا دوور بخاتەوە کە تەنها لە پێناوی خوای گەورەدا بۆ قورئانی پیرۆز کار بکات، تاکو لە قیامەتدا سوودی پێ بگەیەنێت.

● **دەهەم: "حافظ ئەحمەد"ە**، خوا لێی خۆش بێت.

ئەم برایە بۆ ماوەی سێ ساڵی ڕەبەق پەیامەکانی نووری دەنووسییەوە و لە ڕووناکییەکانی ئەم پەیامانەی هەڵدەگۆزی و، بەوپەڕی خۆشەویستییەوە سەرگەرمی ئەم کارەی خۆی بوو.

پاشان تێکەڵی ئەهلی دنیا بوو، بەو نیازەی کە لە ئازاریان ڕزگاری ببێت و بتوانێت ئامۆژگاری و قسەی باشیان بۆ بکات. ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە حەزی دەکرد سەبارەت بە ئیشوکاری دنیا و گوزەرانەوە هەندێ دەست فراوانی پەیدا بکات. ئیتر لەم ڕێیەوە ئەو شەوقەی جارانی کز بوو. دنیاویستانیش لەم لایەنەوە سوودیان لە لاوازیی ئەو بینی. لە ئەنجامی ئەمەشدا سستی ڕووی کردە کارەکانی لە خزمەتکردنی قورئاندا و، پاش ئەمە دوو زللەی لێ درا:

یەکەمیان ئەوەبوو کە: هەرچەند دەستکورت بوو، کەچی خێزانەکەی پێنج کەسی تری زیاد کرد! ئنجا بە ڕاستی کەوتە تەنگانەی گوزەرانەوە!

دووهەمیان ئەوەبوو کە: هەرچەندە مرۆڤێکی هەست ناسك بوو، تەنانەت هیچ قسەیەکی لە کەس قبووڵ نەدەکرد، کەچی بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت بوو بە داردەستی کەسانێکی فێڵباز! بە ڕادەیەك کە بە تەواوی پلەوپایەکەی خۆی لە دەست دا و، وای لێ هات زۆر کەس دەنگیان لێ دابڕی و، بەم جۆرە هاوەڵێتیی ئەوانی لەدەست دەرچوو، تەنانەت دوژمنایەتیشیان کرد.

بە هەرحاڵ.. لە خوای گەورە داواکارین لە ئێمە و لەویش خۆش ببێت و، یارمەتیی بدات لەو بێئاگاییەی بێدار ببێتەوە و بە باشی لە هەموو شتێك تێبگات و، بگەڕێتەوە بۆ ئەرکی خۆی لە خزمەتی قورئانی پیرۆزدا.

● **یازدەهەم:**

لەوانەیە بە نووسینی ئەو زللەیەی لێی دراوە ڕازی نەبێت. لەبەر ئەوە، لێرەدا هیچی لە بارەوە نانووسین.

● **دوازدەهەم: "ماموستا غالب"ە**(١)، خوا لێی خۆش بێت.

ئەم برایە بەوپەڕی ڕاستی و ئیخلاسەوە لە نووسینەوەی پەیامەکاندا خزمەتگوزاریی تابلێی گەورە و زۆری ئەنجام دا و، لە بەردەم هیچ گیرو گرفتێکدا - با زۆر گەورەش بووبێت - لاوازیی نەنواند و، زۆربەی کات ئامادەی دەرسەکان دەبوو، بەوپەڕی شەوق و بایەخدانیشەوە گوێی لەو دەرسانە ڕادەگرت و، پەیامەکانیشی بۆ خۆی دەنووسییەوە. تەنانەت هەموو "وتەکان" و "مەکتووبات"یشی لای یەکێکی تر بە حەقدەستی سی لیرە بۆ خۆی نووسییەوە. مەبەستیشی لەم نووسینەوەیەدا ڕێنمایی برادەرەکانی و بڵاوکردنەوەی پەیامەکان بوو لە شارەکەیدا.

پاش ئەمە، بەهۆی خەیاڵ و ختوورەی چەند مەترسییەکەوە، لە کارکردن سستی ڕووی تێکرد و بە وێنەی جارانی نەما لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکاندا! بەم جۆرە، ڕووناکیی ئەم پەیامانەی لە بەرچاوی خەڵکی داپۆشی.

کتوپڕ ڕووداوێکی ئازاربەخشی ئەوتۆی بەسەردا هات کە بەهۆیەوە بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لە خەم و خەفەتدا بوو. جاران بە بۆنەی بڵاوکردنەوەی پەیامەکانەوە چەند کارمەندێکی دەوڵەت دوژمنایەتییان دەکرد، بەڵام دوای ئەم ڕووداوە ژمارەیەکی زۆری ستەمکاران بوون بە دوژمنی.

بەم جۆرە، چەند برادەرێکی ئازیزی لەدەست خۆی دا.

---

(١) ئەحمەد غالب، مامۆستای قوتابخانە بووە. ساڵی ١٩٠٠ز لەدایك بووە و ساڵی ١٩٤٠ز کۆچی دوایی کردووە. لە قوتابییانی پێشینی پەیامەکانی نوورە. هەروەك شاعیر و خۆشنووسیش بووە. دیوانێکی دەستنووسی شیعری دوای خۆی بەجێ هێشتووە. (وەرگێڕ)

● **سیازدەهەم: "حافظ خالید"ە**[1]، خوا لێی خۆش بێت.

وا خۆی بەسەرهاتەکەیتان بۆ دەگێڕێتەوە:

کاتێ کە بەوپەڕی شەوق و حەماسەتەوە لە ڕەشنووسیی پەیامەکانی نووردا بەردەوام بووم، کارمەندییەکی بەتاڵ (کە پێشنوێژیی مزگەوتی گەڕەکەکەمان بوو) لە ئارادا بوو. جا لەبەر ئەوەی زۆر حەزم لە پۆشینی جوببە و مێزەری زانایان دەکرد، ئەوا بە جۆرێکی کاتی لە کارەکەم سست بوومەوە و لاوازی ڕووی کردە هیممەت و شەوقم لە خزمەتی قورئاندا. بەم جۆرە و بەهۆی نەزانیمەوە لە مەیدانی کار و خزمەتگوزاریی قورئان کشامە دواوە. کاتێکم زانی زللەیەکی میهرەبانیم بە پێچەوانەی مەبەستەکەمەوە لێ درا! چونکە هەرچەند موفتی گەلێ بەڵێنی دامێ کە لەو شوێنە دامبمەزرێنێت و، هەرچەندەش زووتر نزیکەی نۆ مانگ ئەم کار و ئەرکەم ئەنجام دابوو، کەچی ئامانجەکەم نەهاتەدی و لە کردنەبەری جوببە ومێزەر بێبەش کرام!

ئیتر دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو زللەیەم ئەنجامی کەمتەرخەمی کردنم بوو لە کار و خزمەتی قورئانی پیرۆزدا. چونکە جاران لە کاتی دەرسدا مامۆستا بە تایبەتی ناوی منی دەهێنا. جگە لەوەی کە ڕەشنووسەکانیشم دەنووسییەوە.

جا خۆکشاندنەوەم لە مەیدانەکە، بە تایبەتی لە نووسینەوەی ڕەشنووسەکان، ئەوانی دووچاری تەنگانە و گیروگرفت کرد.

بە هەرحاڵ.. سوپاس بۆ خوای گەورە کە تێی گەیاندین چ زیانێکمان کردووە بە بۆنەی ئەم کەمتەرخەمییەمان لە کار و خزمەتدا و، هانی داین کە جارێکی تر بڕۆینەوە ناو ڕیزی کارگوزارانی خزمەتی قورئان و فێری کردین کە ئەم بانگەوازە پیرۆزەی قورئان بانگەوازێکی چەندە بەرز وبڵندە و، ئنجا باوەڕ و متمانەمان پەیدا کرد بەوەی کە ڕابەرێکی مەزنی وەکو شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - پشتگیری کارەکەمانە و بە وێنەی مەلائیکەت پاسەوانی ئەم بانگە پیرۆزەیە.

بەندەی هەرەلاواز: حافظ خالید

---

(١) ناوی تەواوی: (حافظ خالید عومەر لوتفی)یە و ساڵی ١٨٩١ز لە "بارلا" لە دایك بووە و ساڵی ١٩٤٦ز لە ئەستەمبووڵ کۆچی دوایی کردووە. ماوەیەك لە بواری فێرکردن و پەروەردەدا کاری کردووە و پاشان وازی لێ هێناوە و بووە بە پێشنوێژی یەکێك لە مزگەوتەکانی بارلا. ساڵی ١٩٣٠ز "ئەنوەر"ی کوڕی کۆچی دوایی کردووە و مامۆستا نوورسیش پەیامێکی پرسەنامەی بۆ ناردووە کە ئێستا مەکتووبی حەڤدەهەمە لە کۆمەڵە پەیامی "مەکتووبات" و، بە کوردیش لە "پەیامی بیماران" و "ڕابەری خوشکان"دا بە ناوی: (پرسەی منالێك) بڵاومان کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

● **چواردەهەم**: سێ سووکەڵە زڵلەی میهرەبانی‌یە کە لە سێ "مستەفا" ناو دران.
*یەکەمیان*: "مستەفا چاوش"ە، خوا لێی خۆش بێت[١].

ئەم برایە خزمەتی مزگەوتە بچووکەکەی دەکرد؛ نەوت کردنە سۆپا و تەنانەت ئامادەکردنی شقارتەش، لە ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەقدا، ئەم برایە گرتبوویە ئەستۆ و، وەك دواییش زانیمان پارەی هەموو ئەمانەی لە گیرفانی خۆی دەدا. ئنجا لە نوێژی جەماعەت، بە تایبەت لە شەوانی جومعەدا، مەگەر کارێکی زۆر پێویست ناچاری بکردایە، دەنا هەرگیز دوا نەدەکەوت.

ڕۆژێکیان یەکێك لە ئەهلی دنیا دەرفەتی لە دڵپاکیی ئەم وەرگرتبوو، پێی وتبوو:

"بە حافظ فلان بڵێ - کە یەکێکە لە نووسەرەوانی پەیامەکانی نوور - مێزەرەکەی دابگرێت پێش ئەوەی ئازار بدرێت و بە زۆر لەسەری لا ببرێت! بە جەماعەتی مزگەوتیش بڵێ: بە دزی‌یەوە بانگ نەدەن"[٢]!

ئەو مرۆڤە دنیایی‌یە بێ‌ئاگایە نەیدەزانی گەیاندنی ئەم هەواڵە بەلای کەسێکی ڕۆح بەرزی وەك مستەفا چاوشەوە کارێکی قورسە. بەڵام مستەفا، لەبەر دەروون پاکیی خۆی، هەواڵەکەی گەیاندبوو!

هەر ئەو شەوە لە خەودا "مستەفا"م دی هەردوو دەستی پیس بووبوون و، لە پشت سەری قایمقامەوە دەڕۆشت و بە یەکەوە دەهاتنە ژوورەکەم!

بۆ بەیانی پێم وت:

- برام! مستەفا! ئەمڕۆ کێت دیوە؟ لە خەوندا تۆم دی هەردوو دەستت پیس بووبوون و لە پشت سەری قایمقامەوە دەڕۆشتی؟

وتی:

- ئای داخی گرانم! کوێخاکە قسەیەکی پێ سپاردم کە بە حافظ فلانی نووسەرەوەی پەیامەکانی ڕابگەیەنم، بێ ئەوەی بزانم چ فێڵێکی تێدایە.

---

(١) مستەفا چاوش ناوی تەواوەتیی: "خلووصی مستەفا"یە و ساڵی ١٨٨٢ز لە دایك بووە. لە "بارلا" خزمەتی مامۆستا نوورسیی کردووە. لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣٩ز و لە تەمەنی پەنجاوحەوت ساڵی‌دا دنیای فانیی جێ‌هێشتووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست ئەوەیە کە ئەوان دوو بانگیان دەدا، یەکەمیان: بە ئاشکرا و بە شێوە بیدعی‌یەکەی کە بە زەبروزەنگ لە لایەن دەوڵەتەوە سەپێنرابوو. دووهەمیان: بە پەنهانی و بە شێوەی شەرعی لەناو مزگەوتدا! (وەرگێڕ)

هەر لەو ڕۆژەدا هەندێ نەوتی بۆ مزگەوت هێنابوو. ئەو ڕۆژەش، بە پێچەوانەی ڕۆژانی پێشوو، دەرگای مزگەوت کرابووەوە و کارژەلەیەك ڕۆشتبووە ناو حەرەمی مزگەوتەکە و شوێنی نزیکی بەرماڵەکەمی لەنوێژ بردبوو. ئنجا کە یەکێکی تر ویستبووی ئەو جێگایە بشوات، هیچی دەست نەکەوتبوو نەوتەکە نەبێت. ئەویش بێ ئەوەی هەست بە بۆنی نەوتەکە بکات بە ئاوی زانیبوو، بۆیە بەرماڵەکەی پێ شۆردبوو، ئنجا بە پاشماوەکەی ئاوڕشێنی دەوروبەری مزگەوتی کردبوو! وەك بڵێی مزگەوتەکە بە زمانی حاڵ بە "مستەفاچاوش" بڵێت:

– (لەمەولا پێویستمان بە نەوتی تۆ نییە، چونکە هەڵەیەکی گەورەت کرد)!

هەست نەکردنی ئەو کەسەش بە بۆنی نەوتەکە، ئاماژەیە بۆ ئەم گوفتارە مەعنەوییەی مزگەوتەکە. تەنانەت ئەو ڕۆژە و شەوی جومعەی پیرۆزیش مستەفا نەیتوانی بەشداریی نوێژی جەماعەت بکات، هەرچەندەش هەوڵی دابوو بێت بۆ مزگەوت.

پاشان بە چەشنێکی پاك و بێ گەرد لە هەڵەکانی خۆی پەشیمان بووەوە و، بە دڵێکی بەکوڵ و پاڕانەوەی زۆرەوە داوای لێخۆشبوونی لە دەرگانەی خوای گەورە کرد و، سوپاس بۆ خوا دڵپاکی و نیازخاوێنیی لە عیبادەتدا – سەر لە نوێ – دەست کەوتەوە.

*دوو "مستەفا" ناوەکەی تر:*

یەکەمیان: "مستەفا"یە کە لە قوتابییە چالاکەکانە و خەڵکی گوندی "قولە ئۆنوو"یە، ئەوی تریشیان هاوەڵەکەیەتی کە "حافظ مستەفا"یە.

لەو کاتەدا بە قوتابییانم ڕاگەیاندبوو کە: لەبەر ئەوەی خزمەتی قورئان زیانی پێ نەگات نامەوێ هیچ کەسێك لە جەژندا سەرم لێ بدات، مەگەر بە تاکە کەسی، چونکە چاودێری و تەنگ پێهەڵچنینی ئەهلی دنیا لەو کاتەدا لەسەرم زۆر توند بوو. کەچی دەبینم کتوپڕ سێ کەس بە یەکەوە شەو هاتن بۆ لام! خۆ ئەگەر باری کەش و هەوا لەبار بێت ئەوا نیازیان وایە بەیانی شەبەق بڕۆن! ئیتر نە من و نە سلێمان و نە "مستەفا چاوش" هیچ تەگبیرێکمان بۆ حەزەر کردن نەکرد و، هەریەکەمان ئەم کارەی خستبووە ئەستۆی ئەوی ترەوە.

بە هەرحاڵ.. ئەوان لە پێش نوێژی بەیانیدا خواحافیزییان کرد و ڕۆشتن. یەکسەر زللەکەیان لێ درا، کە بریتی بوو لە تۆف و زریانێکی سەختی ئەوتۆ کە ماوەی دوو

سەعاتی خایاند و بە درێژایی ئەو زستانە شتی وامان نەدیبوو. ئێمەش خەمی ئەوان دایگرتین و دەمانوت: ڕزگاریان نابێت.

هێندە خەفەتم بۆ خواردن کە تا ئێستا خەفەتی وام بۆ کەس نەخواردووە. پاشان ویستم سلێمان بۆ زانینی هەواڵیان بنێرم - چونکە حسابی تەگبیری حەزەری نەکردبوو - بەڵام "مستەفا چاوش" وتی:

- ئەگەر سلێمان بڕوات، ئەویش لەوێ گیر دەخوات و ناتوانێت بێتەوە.. ئنجا دەبێ من بڕۆم بە دوایدا و لەوێ بمێنمەوە.. ئنجا عەبدوڵڵا چاوش دێت بە دوای مندا.. ئنجا یەکێکی تریش بەو جۆرە دێت بە دوای ئەودا..

لەبەر ئەوە، کارەکەمان دایە دەست خوای گەورەی بەتوانا و، هەمووومان بە یەك دەنگ وتمان: "توکلنا علی الله".

* * *

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە کە:**

"ئەو گیروگرفتانەی کە دێنە ڕێی برا تایبەتەکان و برادەرەکانت، تۆ بە: تەمێ کردنی پەروەردگاری و زللەی گلەیییان لەقەڵەم دەدەیت، بەهۆی سستی و کەمتەرخەمییانەوە لە خزمەتکردنی قورئاندا. کەچی ئەوانەی نەیاری خزمەتکردنی قورئان و دوژمنی ئێوەن، بەوپەڕی خۆشی و ئارامی ژیانیان لێ دەگوزەرێت. جا ئایا بۆچی ئەو کەسەی هاوڕێی قورئانە زللەی لێ دەدرێت، بەڵام دوژمنەکەی هیچ گیروگرفتێکی تووش نابێت"؟!

**وەڵام:**

پەندێکی پڕ لە دەرس و عیبرەتی پێشینان دەڵێت: "الظلم لا یدوم، والکفر یدوم"(١).

هەڵەی خزمەتگوزارانی قورئانیش، وەك ئەوە وایە ستەمیان لەو خزمەتە کردبێت. ئنجا ئەگەر ئەو خزمەتگوزارانە وریا بن، ئەوا خێرا بۆ سەر ڕێگای ڕاست دەگەڕێنەوە..

بەڵام دوژمن تەنها لە پێناوی گومڕاییدایە کە لە دژی قورئان و خزمەتی قورئان ڕادەوەستێت و، ئەو سنوورشکاندنەی کە بەرامبەر خزمەتی قورئان دەیکات - بە خۆی بزانێت یان نەزانێت - لە ڕیزی کوفر و بێبڕواییدایە.

---

(١) واتە: ستەم بەردەوام نابێت، بەڵام کوفر بەردەوامە. (وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی كوفر شتێكی بەردەوامە، ئەوا زۆربەی كافران بەم زوویی‌یە زڵلەیان لێ نادرێت. چونكە هەروەك ئەو كەسانەی تاوانی بچووكیان كردبێت، هەر لە "قەزا" و "ناحیە"كاندا سزا دەدرێن، بەڵام ئەوانەی تاوانی گەورەیان كردووە بۆ دادگا گەورەكانی "جەزا" دەبرێن، هەر بەو جۆرەش ئەو هەڵە بچووكانەی كە ئیمانداران و هاوڕێیانی قورئان دەیكەن، یەكسەر و بە زوویی هەر لە دنیادا بەشێك لە سزاكەی دەچێژن، تاكو ببێتە كەفارەتی ئەو هەڵە و گوناهانەیان و بە تەواوی پاكیان بكاتەوە.

بەڵام تاوانی گومڕایان، ئەوەندە گەورەیە كە ئەم دنیا كەم و كورتە جێی تۆڵە لێ سەندنەوەی ئەوانی تێدا نابێتەوە. لەبەر ئەوە، تا كاتی هاتنەپێشەوەی جیهانی هەمیشەیی ئەودنیا و دادگای گەورەی ئەوێ، مۆڵەت دەدرێن. تاكو دادگەریی خواوەند تۆڵەیان لێ دەسێنێتەوە. لەبەر ئەوە، زۆربەی جار لەم دنیایەدا سزا نادرێن.

ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرموێ: "الدنیا سجن المؤمن، وجنة الكافر"[1] ئاماژەیە بۆ ئەم ڕاستی‌یەی باسمان كرد. واتە مرۆڤی ئیماندار هەندێ سزای كەمتەرخەمی‌یەكانی هەر لەم دنیایەدا وەردەگرێت. كەواتە دنیا، سەبارەت بە ئیماندار، جێگای سزا و تۆڵە سەندنەوەیە. سەرەڕای ئەوەی كە هەر ئەم دنیایە لەچاو نیعمەتەكانی بەهەشتدا كە خوای گەورە بۆ ئیماندارانی ئامادە كردووە، ئەشكەنجە و بەندیخانەیە.

بەڵام كافران لەبەر ئەوەی بە هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، هەندێ پاداشتی كردەوەكانیان لەم دنیایەدا وەردەگرن و، سزای تاوانە گەورەكانیان بۆ قیامەتی هەمیشەیی هەڵدەگیرێت و، دنیا سەبارەت بەوانەوە جێی نیعمەت و خۆشی‌یە.

دەنا مرۆڤی ئیماندار هەر لەم دنیایەدا ئەوەندە لەزەت و نیعمەتی مەعنەویی دەست دەكەوێت كە بەختەوەرترین مرۆڤی بێ ئیمان دەستی ناكەوێت. كەواتە لە ڕاستی‌دا مرۆڤی ئیماندار هەر لەم دنیایەدا زۆر لە مرۆڤی كافر بەختەوەرترە. وەك بڵێی ئیمانی مرۆڤی ئیماندار وەك بەهەشتێكی مەعنەوی وایە لە ڕۆحی‌دا و، كافرێتیی مرۆڤی كافریش وەك دۆزەخێكی مەعنەوی وایە لە ماهییەتی‌دا!

**﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.**

---

(١) رواه مسلم وابن ماجه والترمذي وأحمد عن أبي هريرة. بڕوانە: مسلم "٢٩٥٩". واتە: دنیا بەندیخانەی ئیماندار و، بەهەشتی مرۆڤی كافرە. (وەرگێڕ).

# بریسكەی یازدەهەم

## (پلیكانەی سوننەت و چاری دەردی بیدعەت)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿لَقَدْ جاءَكُم رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ ما عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾(التوبة:١٢٨)

مەقامی یەكەمی ئەم ئایەتە پیرۆزە بریتی‌یە لە پەیامی "ڕێبازی سوننەت". مەقامی دووهەمیشی ئەم پەیامەیە كە بریتی‌یە لە "پلیكانەی سوننەت":

﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾

(التوبة:١٢٩)

﴿قُلْ إِنْ كُنتم تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ (آل عمران:٣١)

**"لە نێوان سەدان سەرنجدا كە لەم دوو ئایەتەدا هەن، یازدە سەرنجی ورد بە پوختی ڕوون دەكەینەوە".**

**❐ سەرنجی یەكەم:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "مَنْ تمسك بسنّتي عند فساد أمتي فله أجر مئة شهيد"[1].

بەڵێ، شوێنكەوتنی سوننەتی بێ گەرد و خاوێنی پێغەمبەر ﷺ، بێ هیچ گومانێك، كارێكی تابلێی بەنرخ و بەرزە. بە تایبەت لە كاتی پەرەسەندن و زاڵبوونی "بیدعەت" و

---

(١) رواه ابن عدي في الكامل وعزاه المنذري في الترغيب والترهيب للبيهقي. والثابت في الصحيح قوله ﷺ: "إن من ورائكم زمان صبر، للمتمسك فيه أجر خمسين شهيداً منكم" أخرجه الطبراني في الكبير ١٠٣٩٤ والبزار ١/٣٧٨ وقال الهيثمي في المجمع (٧/٢٨٢): ورجال البزار رجال الصحيح غير سهل بن عامر البجلي وثقه ابن حبان. اهـ. وفي الصحيحة (٤٩٤): قال عن اسناد الطبراني: وهذا إسناد صحيح رجاله كلهم ثقات رجال مسلم. (وەرگێڕ)

خراپکاریی نەتەوەدا، لەم جۆرە کاتانەدا نرخی گەلێ بەرزترە، چونکە چاودێری کردنی ئاسایی‌ترین سوننەت و ڕەویەی پێغەمبەر ﷺ تەقوایەکی مەزن و ئیمانێکی بەهێزی دامەزراو دەگەیەنێت، بەهۆی ئەوەی شوێنکەوتنی ڕاستەوخۆی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ یەکسەر ئەو خۆشەویستە دەخاتەوە یادی مرۆڤ. ئەم یادخستنەوەیەش دەبێت بەهۆی یادکردنەوە و هەست کردن بە ئامادەبوونی چاودێری(مراقبة)ی خواوەند. تەنانەت لەو کاتانەدا کە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەری ﷺ تێدا ڕەچاو دەکرێت، ئاسایی‌ترین هەڵسوکەوتی ئاسایی و کاروباری سروشتیی وەك: خواردن و خواردنەوە و نوستن و هاوچەشنیان، هەموویان دەبن بە ڕەفتاری پەسەندی شەرعی و پەرستش و، پاداشتیان لە بەرامبەرەوە بۆ دادەنرێت.

چونکە مرۆڤ بەو کارە ئاسایی‌یەی خۆی، شوێن‌پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ ڕەچاو دەکات و، ئەوەی بیر دەکەوێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی شەریعەتە و، ئنجا بە دڵ ڕوو دەکاتە بەدیهێنەری ڕاستەقینەی شەرع کە خوای گەورەیە. ئیتر دڵنیایی و ئاسوودەیی دەڕژێتە ناو دڵیەوە و جۆرە پەرستشێکی لەم ڕێیەوە دەست دەکەوێت.

بەم جۆرەی لە سەرەوە باس کرا، بۆمان دەرکەوت کە: هەرکەسێك سوننەتی پیرۆز و ڕووناکی پێغەمبەر ﷺ بکات بە عادەت و دابی ژیانی، ئەوا لە ڕاستیدا هەموو عادەتەکانی خۆی کردوون بە "عیبادەت" و، دەتوانێت هەموو تەمەنی خۆی بکات بە تەمەنێکی بەردار و بەرهەم بەخشی ئەوتۆ کە پاداشتی لەسەر وەربگرێت.

**❑ سەرنجی دووهەم:**

ئیمامی ڕەببانی (ئەحمەدی فاروقی، خوا لێی ڕازی بێت)[1] فەرموویەتی:

---

(١) "ئیمامی ڕەببانی" (٩٧١ - ١٠٣٤ ك) ناوی "ئەحمەدی کوڕی عبد الأحد"ە و خەڵکی "سەرهەند"ی هیندستانە و نازناوی بە "فاروقی" بڵاوبووەتەوە چونکە لە نەوەی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتابە، خوای لێ ڕازی بێت. نوێکاری ئایین(مجدد) بووە لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی کۆچیدا و بە ڕاستیش ئەرکی تازەکردنەوەی بەجێ‌هێناوە. لە زانیاری‌یەکانی سەردەمی خۆیدا دەستێکی تابڵێی باڵای بووە، جگە لەوەی کە خاوەنی ڕۆحێکی پەروەردەکراو و دەروونێکی پاك و ئیخلاصێکی کەم وێنە بووە لە بەندایەتییدا بۆ خوای گەورە و، خاوەنی دڵێکی هەمیشە بێدار بووە. چەندین جار پلە و پایەی بەرزی دراوەتێ هیچیانی وەرنەگرتووە. ئەو ئاشووبەی (ئەکبەرشا)ی هیند بۆ لەناوبردنی ئیسلام هەڵی گیرساند، ئەم زاتە توانیی بەرەنگاری ڕابوەستێت و، دەوڵەتی مەغۆلی لە ئیلحاد و بێ‌بڕوایی و بەرهەمی‌یەوە بگێڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پەیڕەوی بەیعەت و برایەتی و ڕێنمایی خەڵکی‌یەوە و، توانیی "تصوف" لەو شتانەی تێکەڵی بووبوون و لێڵیان کردبوو، پاك بکاتەوە. بەم چەشنە ئیمامی ڕەببانی بە خۆری تیشك بەخشی قوتابخانەی نەقشبەندی دەژمێررێت. بانگەکەی بە شێوەیەکی بەربڵاو لە نیوەدوورگەی هیندا بڵاو بووەوە و،

(ئەو کاتانەی کە پلەکانی: "سەیر و سلووکی ڕووحی"م دەبڕی، دەمبینی: گەشاوەترین و بەرزترین و ناسکترین و هێمن و ئارامترینی چینەکانی ئەولیا، ئەوانەن کە شوێنکەوتنی سوننەتی پیرۆزیان کردووە بە بناغەی تەریقەتەکانیان. تەنانەت وەلیە عەوامەکانی ئەو چینە، گەلێ جوانتر و بەڕێزتر دەبینران لە چاو ئەولیایانی تایبەتیی چینەکانی تردا)[1].

بەڵێ، ئیمامی ڕەببانیی نوێکاری هەزارەی دووهەم - خوا لێی ڕازی بێت - ڕاستی فەرمووە. چونکە ئەو کەسەی دەست بە سوننەتی پیرۆزەوە دەگرێت و دەیکات بە بناغەی کارەکانی، شایانی پلەی "مەحبووبییەت"ە[2] لە ژێر سایەی پێغەمبەری خۆشەویستی خوادا ﷺ.

### ❑ سەرنجی سێهەم:

کاتێ ئەم "سەعید"ە هەژارەی دەرگانەی خوا تێدەکۆشا لە دۆخی "سەعیدی کۆن" دەربچێت، دڵ و ژیریم لە بەرامبەر زریانێکی مەعنەویی سامناك و لە ناوەندی ڕاستییەکاندا لەرزەیان پێ کەوت و تلێر بوونەوە. چونکە لەو کاتەدا وا هەستم دەکرد کە وەك بڵێی دڵ و ژیریم تاوێك لە ئاسمانەوە دەکەونە خوارەوە بەرەو زەوی و تاوێکی تریش لە زەوییەوە بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە! بەهۆی ئەوەی کە لە لایەکەوە کەس ڕابەرم نەبوو، لە لایەکی تریشەوە دەروونی بەدخوازم لە خۆی بایی بووبوو..

جا لەو کاتەدا (کە من لەم دابەزین و بەرزبوونەوەیەدا بووم) هەریەك لە سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ و ڕەچاو کردنی ئاساییترین ڕەویەی ئەوم وەك قیبلەنمایەك بینی کە ڕووکاری کەشتییەکانی ناو دەریا دەستنیشان دەکات و، دەمبینی کە هەریەکەیان وەك چرایەك وایە چەندین ڕێی تاریك و زیانبەخشی لەژمارەبەدەر ڕووناك دەکاتەوە.

کاتێ لەو گەشتە ڕۆحییەمدا لە ژێر پاڵەپەستۆی چەندین تەنگ پێ هەڵچنین و کۆڵی گەورە و قورسدا ماندوو دەبووم، هەتا شوێن ئەو مەسەلانەی سوننەتی پیرۆز دەکەوتم کە

---

یەکێك لە بەروبوومەکانی: (ئۆرەنگ زیب)شای خوانناس بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا سەری ئیسلام و موسلمانان بەرز بووەوە و کافرانیش سەرشۆڕ کران. تەریقەتەکەی بەهۆی گەورەزانای بەناوبانگی کورد: "مەولانا خالیدی نەقشبەندی"یەوە (١١٩٢-١٢٤٢ك) لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبووەتەوە. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی جێهێشتووە، بەناوبانگەکەیان: "مەکتووبات"ە کە "محەممەد موراد مەنزیلەوی" کردوویە بە عەرەبی. (وەرگێڕ)

(١) لە چەندین شوێنی مەکتووباتی ئیمامی ڕەببانیدا ئەم واتایە دووپات بووەتەوە، بۆ نموونە بڕوانە مەکتووبی دووسەد و شەستەم. (وەرگێڕ)

(٢) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: ﴿قُلْ إِنْ كنتم تحبّونَ اللهَ فاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ (آل عمران: ٣١). (وەرگێڕ)

پەیوەندییان بەو بارە ڕۆحییەمەوە هەبوو، هەستم بە لەش سووکی دەکرد. وەك ئەوەی سوننەتی پیرۆز هەموو کۆڵە قورسەکانم بۆ هەڵبگرێت و، ئەرکەکانی سەرشانم لەکۆڵ بکاتەوە! ئیتر بەم چەشنە و بە خۆتەسلیم‌کردنی تەواوەتیم بۆ سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، لە پەژارەی وەسوەسە و دوو دڵیی وەك: "ئایا ئەم کارە بەرژەوەندیی تێدایە یان نا؟ کارێکی ڕەوایە یان نا؟" ڕزگارم دەبوو.

ئنجا هەرکات دەستم لە سوننەت هەڵدەگرت، یەکسەر شەپۆلی گیروگرفتەکان زیاد دەبوون و، ڕێگا نەزانراوەکانیش زیاتر سەخت و پڕ لە هەڵەت و تەماوی و، کۆڵەکانیش پتر قورس دەبوون. لە کاتێکدا کە من لەوپەڕی کۆڵەواری و کورت‌بینیدا بووم و ڕێگاش تاریك داهاتبوو. بەڵام هەر ئەوەندەی دەستم بە سوننەتەوە دەگرت و شوێنی دەکەوتمەوە، هەستم دەکرد کە یەکسەر ڕێگام لە بەردەمدا ڕووناك دەبووەوە و، ئارامی و ئاسایشی تێدا دەبینرا و کۆڵەکانیش سووك دەبوون و، کۆسپ و تەگەرەکانیش نەدەمان.

بەڵێ، لەو ماوەیەی ژیانمدا ئەو دیاردەیەم بەو جۆرە بینی، ئیتر بەو هەستکردن و بینینەی خۆم تەسدیقی بڕیار و فەرمایشتەکەی ئیمامی ڕەببانیم کرد.

❐ **سەرنجی چوارەم:**

ماوەیەك لە بارێکی ڕۆحیی سەیردا بووم، کە لە ئەنجامی بیرکردنەوە و تێڕامانم لە "یادی مردن" و باوەڕبوونم بە کێشەی "مردن ڕاست و بێ گومانە" و، بیرکردنەوەی دوور و درێژ و بەردەوامم لە: نەمان و لەناوچوونی جیهان، ئەو بارە ڕۆحییەم بۆ دروست بوو. چونکە لەو ماوەیەدا خۆمم لە ناوەندی جیهانێکی سەیردا بینی:

ئەوەبوو کە ڕوانیمە دەوروبەرم، دەبینم من تەرمێکم لە لای سەرووی سێ تەرمی مەزن و گرنگەوە ڕاوەستاوم:

*یەکەم*: تەرمی مەعنەویی هەموو ئەو زیندەوەرانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی کەسیی منەوە هەیە و، ئێستا مردوون و لە گۆڕی "ڕابوردوو"دا نێژراون، کە من ئێستا لە سەروویەوە ڕاوەستاوم لە ڕاستیدا کێلی گۆڕی ئەو تەرمەم!

دووهەم: تەرمێکی گەلێ مەزنە و، ئەو هەموو جۆرە زیندەوەرانە دەگرێتەخۆ کە پەیوەندییان بە ژیانی تێکڕای مرۆڤایەتییەوە هەیە و، ئێستا مردوون و لەو گۆڕە مەزنەی ڕابوردوودا نێژراون کە جێی گۆی زەویی تێدا دەبێتەوە. منیش تەنها وەك خاڵێکی ئەوتۆ

وام کە بە زوویی دەکوژێتەوە و وەك مێروولەیەکی بچووك وام کە خێرا دەمرێت، لەسەر ڕووی ئەم سەردەمەی کە کێڵی ئەو تەرمەیە!

سێهەم: ئەو تەرمە مەزنەی کە لە کاتی بەرپابوونی قیامەتدا ئەم گەردوونە لە خۆیدا دەپێچێتەوە. جا لەبەر ئەوەی مردنی گەردوون لەو کاتەدا کارێکی ڕاستە و دێتەدی و هیچ گومانێکی تێدا نییە، ئەوا وەك ئێستا ڕوو بدات ئاوا بە چاو دەمبینی.

لەو کاتەدا سەرسوورمان هەموو لایەکی دەروونی داگرمتەوە و سام و شکۆی سەختیی گیان کێشانی ئەو تەرمە مەزنەم لێ نیشت و، مردنی خۆیشم - کە ئەویش دێت و هیچ گومانێکی تێدا نییە - دەبینی وەك ئێستا ڕوو بدات! لەم کاتەدا هەموو بوونەوەران پشتیان لێ هەڵکردم و بە تەنیایی بەجێیان هێشتم و ڕۆشتن، وەك ئەوەی کە ئایەتی: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا... ﴾ ئاماژەی بۆ دەکات. لەو کاتەدا هەستم دەکرد کە گیانم بەرەو ئایندەیەکی درێژخایەنی ڕووەو هەمیشەیی ڕاپێچ دەکرێت، کە وەك زەریایەکی بێ لێوار وایە دەبێ مرۆڤ - بییەوێت یان نەیەوێت - خۆی بهاوێتە ناوی.

کاتێ من لەم بارە سامناکە گیانییەدا بووم و خەم و پەژارە بە توندی دڵ و دەروونی دەگووشیم، فریاگوزاری و یارمەتیم لە قورئانی پیرۆزەوە بۆ هات، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە هات بە هانامەوە کە دەفەرموێ:

﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾.

بە ڕادەیەك کە ئەم ئایەتە بۆ من بوو بە کەشتییەکی دڵنیایی و هێمنی و ئارامیبەخش لەو زەریا بێ لێوارەدا. ئیتر "گیان"م بە دڵنیاییەوە ڕۆشتە سایە و پەنای ئەم ئایەتە پیرۆزە و، هەر ئەو کاتەش تێگەیشتم کە ئەم ئایەتە جگە لە واتا ئاشکرا و ڕاشکاوەکەی، واتایەکی ئاماژەییشی هەیە. ئنجا دڵدانەوەی خۆمم لەو واتایەدا دۆزییەوە و، ئەم ئایەتە دڵنیایی و ئاسوودەیی پێ بەخشیم.

بەڵێ، واتای ڕاشکاوی ئەم ئایەتە پیرۆزە، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

ئەگەر گومڕایان گوێ لە قورئان ڕانەگرن و پشت لە شەریعەت و سوننەتی تۆ هەڵبکەن، تۆ خەمیان پێ مەخۆ. بەڵکو بڵێ: تەنها خوای گەورەم بەسە و سەروزیادمە و، پشتی پێدەبەستم و، هەر ئەو جێی نیازە کە لە بریی ئێوە کەسانی ترم بۆ پەیدا بکات شوێنم بکەون، چونکە عەرشی مەزنی ئەو خواوەندە دەورانەدەوری هەموو شتێکی داوە و، نە یاخیبووان دەتوانن لە دەستی هەڵبێن، نە ئەوانەش یارمەتیی لێ وەردەگرن بێ فریاگوزاری و یارمەتیی ئەو دەمێننەوە.

جا هەروەك واتای ڕاستەوخۆی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕاشـكاوی ئـاوا دەفـەرموێ، واتـا ئاماژەیی‌یەکەشی دەفەرموێت:

(ئەی بەرەی مرۆڤ! ئەی ئەو کەسەی پێشەوایی و ڕابەریی مرۆڤ دەکات!

ئەگەر سەرجەمی بوونەوەران بەجێت بهێڵن و، بە ڕێی نەماندا بڕۆن و تیابچن..

ئەگەر هەموو زیندەوەران لێت جیا ببنەوە و ڕێی مردن بگرنەبەر..

ئەگەر هەموو خەڵکی بڕۆن و بە تەنیایی بەجێت بهێڵن و لە گۆڕستانەکاندا نیشتەجێ ببن و بگرسێنەوە..

ئەگەر گومڕایان پشت هەڵبکەن و گوێت لێ نەگرن و لە تاریکیدا بگەوزێن..

تۆ گوێیان مەدەرێ و خەم مەخۆ و زویر مەبـە. بـەڵکو بڵـێ: خـوای گـەورەم بەسـە و سەروزیادمە. چونکە من گەر ئەوم ببێت ئەوا هەموو شتێکم هەیە.

کەواتە ئەو کۆچکردووانە بەرەو "نەبوون" نەڕۆشتوون، بەڵکو بـەرەو وڵاتێکـی تـری خواوەندی خاوەن عەرشی مەزن دەڕۆن و، خـوای گـەورە لـە بریـی ئـەوان ئەندازەیـەکی تری لە ژمارەبەدەری سەربازە گوێڕایەڵەکانی خۆی دەنێرێت.

ئەوانەش کە لە گۆڕستانەکاندا نیشتەجێ بوون، وا مەزانە لەناوچوون، بـەڵکو بـەرەو جیهانێکی تر دەگوێزرێنەوە و خواوەند لە بریـی ئـەوان چـەند فەرمانبـەرێکی تـر دەنێرێت دنیایـان پێ ئـاوەدان دەکاتـەوە و دەیانخاتـە شـوێنە چۆڵـەکانی ئەوانـەی پێشـوو. هـەر ئـەو خواوەندە دەتوانێت لە بریی ئەوانەی کە ڕێی گومڕاییان گرتەبەر و ڕۆشتن، کەسـانێك بنێرێت گوێڕایەڵی بن و لـە ڕێـی ڕاسـت لا نـەدەن. کەواتـە هـەر تەنـها ئـەو فریـادڕەس و جێی نیاز و مایەی پشت پێ‌بەستنە و لە بریی هەموو شـتێکە. هـەرچی شتی تـر هـەن جێـی ئەو خواوەندە و جێی یەك ئاوڕدانەوەی میهرەبانیی ئەو بەرەو بەندەکانی، ناگرنەوە).

بەم جۆرە و بەهۆی ئەم واتـا ئاماژەیی‌یـەی کـە لـەم ئایەتـە پـیرۆزەوە هەسـتم پـێ کـرد، وێنەی ئەو سێ تەرمە سامناکەی منیان ترساند، گـۆڕان بـە شـێوەیەکی تـر کـە سەرانسـەر دڵدانەوە و جوانی بوو. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

بوونـەوەران لـە نمایشـێکی گـەورەدا دێـن و دەڕۆن، تـاکو هـەموو یـەکێکیان ڕۆڵ و کاری خـۆی لـەو خزمەتگوزاری‌یانـەدا تـەواو بکـات کـە هەمیشـە بـەردەوامن و، پاشـان لێپرسراوی و کاری نوێ و بەردەوام وەربگرنەوە لە ناوەندی گەشت و گوزارێکی پڕ لـە ئـەرك و پـەند و دانـاییدا، لـە سـایەی بەڕێوەبەرایـەتیی دانایـەکی میهـرەبان و دادگـەر و

بەتوانا و شکۆمەند و، لـە نـاوەندی پەروەردگاریێتی‌یـە مـەزن و، دانایی‌یـە لەڕادەبـەدەر و، میهرەبانی‌یە فراوانەکەی‌دا.

❏ **سەرنجی پێنجەم:**

**﴿قُلْ إِنْ كنتم تحبّونَ اللهَ فاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾** (آل عمران: ٣١).

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە جۆرێکی بێ‌گومان مەودای گرنگی و پێویستیی شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ڕادەگەیەنێت.

بـەڵێ، ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە بـەهێزترین و چەسـپاوترین بەشـەکانی "پێوانـەی دەراوێتـەیی"[1] یـە، کـە یەکێکـە لـە پێوانـەکانی زانسـتی ژیربێژی(مـەنتیق). چونکـە لـەم پێوانەیەدا ئەمەی خوارەوە بە نموونە دەهێنرێتەوە:

"ئەگەر خۆر هەڵبێت، ئەوا ڕۆژ دەبێتەوە".

ئەمە نموونە و پێشەکی‌یە بۆ ئەو ئەنجامە ئیجابی‌یەی کە دەڵێت:

"خۆر هەڵهات، کەواتە ڕۆژ بووەتەوە".

هەروەها دەیشبێت بە نموونە و "پێشەکی" بۆ ئەم ئەنجامە سەلبی‌یە:

"ڕۆژ نەبووەتەوە، کەواتە خۆر هەڵنەهاتووە".

جا ئەم دوو ئەنجامە "سەلبی و ئیجابی‌یە" بە چەشنێکی بێ‌گومان لە زانستی ژیربێژی‌دا چەسپاون.

ئەم ئایەتەش بە هەمان چەشنە، چونکە دەفەرموێ:

"ئەگـەر خواتـان خـۆش دەوێـت دەبـێ شـوێن خۆشەویستەکەی بکـەون، خـۆ ئەگـەر شوێنی نەکەوتن، ئەوا دەردەکەوێت کە خواتان خۆش ناوێت"! چونکە ئەگەر بـە ڕاستی خۆشەویستیی خواتـان لـە دڵـدا بێـت، ئـەوا ئـەم خۆشەویستی‌یە شـوێنکەوتنی سـوننەتی پیرۆزی "خۆشەویستەکەی خوا" بەرهەم دەهێنێت.

---

(١) لـە زاراوەکـانی زانسـتی مەنتیقـە. لـەم زانستەدا بـە گشـتی دوو جـۆر پێوانـە هـەن. یەکـەمیان: پێوانـەی پێکەوەیی(قیاس إقتراني) دووهەمیان: پێوانەی دەراوێتەیی(قیاس إسـتثنائي). سـەبارەت بـە پێوانـەی یەکـەمیان ئەوەیە کـە بـە دوو پێشـەکی ئـەنجامێك بەرهـەم دێنن. وەك ئـەم نموونەیـە: "شـادمان مرۆڤێکـی دانایـە، هـەموو مرۆڤێکی دانـاش لێبوردەیـە، کەواتـە شـادمان لێبوردەیـە". ڕسـتەی یەکـەم و دووهـەم دوو پێشـەکی‌یەکانن، سێ‌هەمیش پێـی دەوترێـت: "ئـەنجام". نموونـەی "پێوانـەی دەراوێتـەیی" مامۆسـتا نوورسـی خـۆی لـە دەقەکـەی سـەرەوەدا هێناویەتی. (وەرگێڕ)

بەڵێ، ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا بێت، گوێڕایەڵیشی دەبێت. گومانیش لەوەدا نی‌یە کە کورت‌ترین ڕێ بۆ لای خوای گەورە کە لە هەموو ڕێگاکان ڕاست‌تر بێت و لە هەمووشیان زیاتر لای خوا پەسەند بێت و پێچاوپێچی تێدا نەبێت، لە ناوەندی گشت ڕێگاکانی گوێڕایەڵیی خوادا، ئەو شاڕێگا و ڕاستەشەقامەیە کە پێغەمبەری خۆشەویستی خوا ﷺ گرتوویەتیە بەر و بە سوننەتی خۆی ڕوونی کردووەتەوە.

بەڵێ، کارێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو خواوەندە دەستڕەنگین و سەخاوەتمەندەی ئەم گەردوونەی تا ئەم ڕادەیە بە ناز و نیعمەت و بەخشایشەکانی خۆی پڕ کردووە، داوای شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری لە بەرامبەر ئەو نیعمەت و بەخشایشانەی خۆیەوە لە خاوەن هەستان دەکات..

هەروەها ئاشکرایە، ئەو خواوەندە دانا و شکۆمەندەی کە تا ئەم ڕادەیە بە موعجیزاتی بەدیهێنراوانی خۆی ئەم گەردوونەی ڕازاندووەتەوە، لەگەڵ ئەو کەسەی کە هەڵبژاردەی نێوان خاوەن هەستانە، دەدوێت و، ڕوونکردنەوە و گەیاندنی فەرمانەکانی خۆی بۆ بەندەکانی بەو دەسپێرێت و دەیکات بە پێشەوایان..

هەروەها شتێکی ڕوونە، ئەو خواوەندە جوان و خاوەن کەماڵەی کە ئەم گەردوونەی کردووە بە دەرخەر و پیشاندەری درەوشانەوە لەژمارەبەدەرەکانی جوانی و کەماڵی خۆی، تەواوترین باری بەندایەتی بەو کەسە دەبەخشێت کە لە هەموو کەسێك زیاتر گشت نموونەکانی بەدیهێنراوە ناوازەکانی خواوەندی تێدا کۆبووەتەوە، کەسێ کە لە هەموان تەواوتر جوانی و کەماڵ و ناوە جوانەکانی خواوەندی دەرخستووە، ئەوانەی کە خواوەند خۆی حەزی لە دەرخستنیانە..

بەڵێ، تەواوترین باری بەندایەتی بەو دەبەخشێت و، دەیکات بە پێشەوایەکی نموونەیی جوان بۆ خەڵکی و هانیان دەدات بۆ شوێن‌پێ هەڵگرتنی، تاکو ئەوانیش شتێکی هاوچەشنی ئەو بارە ناسك و جوانەی ئەویان لێ دەربکەوێت.

**بە کورتی:**

خۆشویستنی خوای گەورە داخوازی شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ دەبێت و، ئەم خۆشەویستی‌یە - بێ هیچ گومانێك - ئەو شوێنکەوتنە بەرهەم دەهێنێت.

دەسا خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە بەشێکی زۆری لەم شوێنکەوتنە دەست دەکەوێت. بەدبەختی و زەرەرمەندیش بۆ کەسێ کە ڕێزی شایستەی سوننەتی پیرۆز ناگرێت و، بەناو بیدعەتدا هەنگاو دەنێت و ڕەفتاری پێ دەکات.

❑ **سەرنجی شەشەم:**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

"كل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار"[1].

واتە: دوای ئەوەی یاسا و دەستوورەکانی شەریعەت و سوننەتی پیرۆز بەوپەڕی ڕێکوپێکی و بەپێی بەڵگەی ئایەتی ﴿اليَومَ أَكْمَلْتُ لَكُم دينَكُم﴾ (المائدة: ٣) تەواوبوون و دامەزران، دوای ئەمە ئەگەر ئەو دەستوورانە بە جوان نەزانرێن و شتی تر بهێنرێتە جێیان و، بیدعەتی وا پەیدا بکرێت کە وا بگەیەنێت - خوا نەخواستە - ئەو یاسا و دەستوورانە ناتەواو بن، دیارە ئەم کارە ئەوپەڕی گومڕایی‌یە و جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ ئەنجامێکی تری نی‌یە.

سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ چەندین پلەی هەیە:

هەندێکیان: "واجب"ن، کە هەرگیز نابێ پشتگوێ بخرێن و جێبەجێ نەکرێن. ئەم بەشە لە کتێبەکانی شەرعدا بە درێژی چەسپاون و ڕوون کراونەتەوە و، لەو جۆرەن کە بە هیچ شێوەیەك دەستکاری و ئاڵوگۆڕ ناکرێن.

بەشێکی تریان لە چەشنی "نەوافیل"ن. ئەمانەش لە خۆیاندا دوو بەشن:

بەشێکیان ئەو سوننەتانەن کە تایبەتن بە پەرستشەوە، ئەمانەش لە کتێبەکانی شەریعەتدا ڕوون کراونەتەوە و هەر ئاڵوگۆڕێك تیایاندا بە "بیدعەت" دادەنرێت.

بەڵام دوابەش کە ناوی "داب و ڕەویە"ی لێ نراوە و، لە کتێبەکانی بەسەرهاتی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ باس کراوە، ڕەفتار نەکردن بەم بەشەیان بە "بیدعەت" دانانرێت، بەڵام هەرچۆن بێت جۆرە سەرپێچی کردنێکی داب و ڕەویەکانی پێغەمبەرە ﷺ و، وەرنەگرتنی ڕێژنەی ڕووناکیی ئەوە و، ڕەفتار نەکردنە بە ئەدەبی ڕاستەقینە.

ئەم بەشەیان بریتی‌یە لەو کردار و ڕەفتارانەی پێغەمبەر ﷺ کە لە بابەتەکانی عورف و داب و هەڵسوکەوتی سروشتی‌یەوەن و بە "تەواتور" پێمان گەیشتوون و زانیومانن، وەك زۆر لەو سوننەتانەی کە ئەدەبی گوفتار ڕوون دەکەنەوە و، بارەکانی خواردن و خواردنەوە و نوستن دەردەخەن، یان ئەوانەی پەیوەندی‌یان بە تێکەڵیی خێزانەوە هەیە.

---

(١) جزء من حديث صحيح أخرجه أحمد ومسلم والنسائي وابن ماجه والبيهقي عن جابر رضي الله عنـــه. وزيادة: "وكل ضلالة في النار" هي عند النسائي فقط، وسندها صحيح. (بە پوختی لە "اللمعات"ەوە)

ئەمانە کە پێیان دەوترێت: "ئاداب"، واتە داب و ڕەویەکانی پێغەمبەر ﷺ هەرکەسێك بە دوایاندا بگەڕێت و شوێن‌پێی پێغەمبەریان ﷺ تێدا هەڵبگرێت، ئەوا هەموو "عادەت"ەکانی دەکات بە "عیبادەت". واتە هەموو هەڵسوکەوتێکی ئاسایی ڕۆژانەی دەبن بە پەرستش و، بەم بۆنەیەوە لە لێشاوی نووری ئەو ئەدەبە بەرز و پیرۆزە پێغەمبەرانەیە بەهرەمەند دەبێت. چونکە ڕەچاوکردنی ئاساییترین و بچووکترین شت لەو ئادابانە، پێغەمبەری مەزن ﷺ دەخاتەوە یادی مرۆڤ، ئەمەش نوور و ڕووناکی دەڕێژێتە ناو دڵیەوە.

گرنگترینی سوننەتە پیرۆزەکان ئەوانەن کە لە جۆری نیشانەکانی ئیسلامن و پەیوەندی‌یان بە دروشمەکانی خواناسی(الشعائر)یەوە هەیە. چونکە ئەو نیشانانە بە پەرستش دادەنرێن و، لەو مافە گشتی‌یانەن کە تایبەتن بە هەموو کۆمەڵەوە. جا ئەگەر لە هەموو کۆمەڵدا تەنها یەك کەس ئەنجامیان بدات، ئەوا هەموو کەسێکی ئەو کۆمەڵە سوودیان لێ وەردەگرێت، خۆ ئەگەر هیچ کەسیش نەچێت بەلایاندا و جێ‌بەجێ‌یان نەکات، ئەوا هەموو کەسێك لەو کۆمەڵەدا تاوانبار دەبن و گوناهی بەجێ‌نەهێنانیان لە ئەستۆی هەموویاندا دەبێت.

ئەم جۆرە نیشانە و دروشمانە دەبێ ئاشکرا بکرێن و، گەلێ بەرز و بڵندترن لەوەی کە دەستی ڕیاکاری‌یان پێ بگات، با لە جۆری سوننەتی "نەوافیل"یش بن، چونکە ـ لەم ڕووەوە ـ لەو فەرزانەی کە تاکە کەس ئەنجامیان دەدات، گرنگترن.

❐ **سەرنجی حەوتەم:**

سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ خۆی لە خۆی‌دا ئەدەبە. هیچ بابەتێکی نی‌یە ئەدەب و نوورێکی تێدا نەبێت. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

"أدّبني ربّي فَأحْسَنَ تأديبي"[(١)].

بەڵێ، هەرکەسێك بە وردی سەیری ژیانی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بکات و، بە باشی ئاگاداری سوننەتی خاوێنی بێت، بە تەواوی دڵنیا دەبێت لەوەی کە خوای گەورە هەرچی بناغە و دەستووری ئەدەب هەیە لە لای خۆشەویستەکەی خۆی کۆی کردوونەتەوە.

---

(١) حديث معناه صحيح، ولكن لا يعرف له إسناد ثابت، بروانه: (كشف الخفاء ١/٧٠). (وەرگێڕ)

کەواتە ئەو کەسەی واز لە سوننەتی خاوێنی ئەو دەهێنێت و دوور دەکەوێتەوە لێی، ئەوا لە ڕاستیدا خۆی لە سەرچاوە و بناغەی هەموو ئەدەبێك دوور خستووەتەوە. دیارە ئەو کاتە، وەك وتوویانە:

"بــی أدب محروم باشد أز لطف رب"[(١)].

بەم پێیە، خۆی لە خێر و فەڕێکی زۆر گەورە بێ بەش کردووە.

**پرسیار:**

چۆن دەتوانین بەرامبەر خواوەندی ئاگادار و زانای پەنهان، کە چاوی لە هەموو شتێکە و هیچ شتێکی لێ ناشاررێتەوە، ئەدەب بنوێنین؟ ئەوەتا هەندێ باری وا لە ژیانی مرۆڤدا هەن، کە شەرمەزاری دەکەن و، ناشتوانرێت لە خوای گەورە بشاررێنەوە، لە هەمان کاتیشدا شاردنەوەی ئەم چەشنە کاروبارە نەشیاوانە یەکێکە لە جۆرەکانی ئەدەب؟

**وەڵام:**

*یەکەم:* خواوەندی بەدیهێنەری شکۆمەند، هەروەك سنعەتی خۆی بە شێوەیەکی جوان لە بەرچاوی بەدیهێنراواندا دەردەخات و، شتە نەشیاوەکان دەخاتە ژێر چەندین پەردەوە و دایاندەپۆشێت و نیعمەتەکانیشی بە چەشنێك ئارایشت داوە کە چاوی مرۆڤ تاسەمەندە بۆ بینینیان.. هەر بە هەمان جۆریش خواوەند داوا لە بەدیهێنراوان و بەندەکانی خۆی دەکات کە ئەوانیش بە جوانترین شێوە لە پێش‌چاوی بەندە خاوەن هەستەکانی خوادا خۆیان دەربخەن. چونکە ئەگەر لە چەند بارێکی نالەبار و نەشیاودا و بە چەند شێوەیەکی ناشیرین و بێزلێکراو دەربکەون، ئەوا ئەم کارەیان دژی ئەدەبی جوان و ڕەویەی بەرز دەبێت و لە هەمان کاتیشدا بە سەرپێچی دادەنرێت لە بەرامبەر پاك و پیرۆزیی ناوە جوانەکانی خواوەندەوە، چەشنی ناوەکانی: "الجميــل، المزيّــن، اللّطيف، الحكيم".

---

(١) واتە مرۆڤی بێ ئەدەب لە چاوپۆشی و لێبوردەیی پەروەردگار بێ بەش دەبێت. ئەم وتەیە لە بنەڕەتدا بەشێکە لە بەیتە شیعرێکی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی کە تیایدا دەڵێت:

از خــدا جوئيم توفيــق ادب　　بــی ادب محروم شد از لطف رب

بڕوانە: (مثنوی معنوی) دفتر يكم - ص١٦ چاپ ششم، انتشارات علمی ١٣٧٤ هـ.ش . (وەرگێڕ)

بەم جۆرە، بۆمان دەرکەوت کە شوێنکەوتنی ئەو ئەدەبەی لە سوننەتی خاوێنی پێغەمبەردایە ﷺ، لە ڕاستیدا ڕەفتار کردنە بە ئەدەبی ڕاستەقینەی خاوێن کە ئەویش لە نێوان ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری شکۆمەنددایە.

دووهەم: هەروەك پزیشك، لە ڕوانگەی ئەوەی کە کاری پزیشکی ئەنجام دەدات و چارەسەری بۆ نەخۆشەکانی دەستنیشان دەکات، بۆی هەیە تەماشای حەرامترین شوێنی ئەو کەسە بکات کە لێی حەرامە، بەڵکو لە کاتی ناچاریدا ئەو شوێنانەی پیشان دەدرێت و، ئەم کارەش بە پێچەوانەی ئەدەب دانانرێت، بەڵکو بە یەکێك لە داخوازیەکانی کاری پزیشکی دەژمێررێت. کەچی هەر ئەو پزیشکە نابێ سەیری ئەو شوێنە حەرامانە بەو چاوەوە بکات کە پیاوە، یان ئامۆژگارە، یان زانایە، چونکە هەرگیزاو هەرگیز ئەدەب ڕێ بە دەرخستنی ئەو شوێنانە نادات بەو ناونیشانانە بۆ هیچ کەسێك. بەڵکو بە کارێکی ناڕەوا و نەبوونی شەرم و ئابڕوو لە قەڵەمی دەدات..

خواوەندی بەدیهێنەری شکۆمەندیش - ولله المثل الأعلـــــى - چەندین ناوی زۆر و جوانی هەیە و، هەریەك لەو ناوانەش ڕووناکی و دەرکەوتنی تایبەتیی خۆی هەیە..

بۆ نموونە: هەروەك ناوی: "الغفار" واتە: لێبوردە، داخوازی بوونی گوناهە و، ناوی: "الستار" واتە: داپۆشەر، داخوازی بوونی کەمتەرخەمیی مرۆڤە.. ناوی: "الجميل"یش واتە: جوان، بە بینینی شتی ناشیرین و ناڕەوا و نەشیاو ڕازی نییە. ئنجا هەموو ئەو ناوانەی خواوەندیش کە لە بارەی "جوانی" و "کەماڵ"ەوەن وەك ناوەکانی: "اللطيـــف، الكريم، الحكيم، الرحيم" داخوازی ئەوەن کە هەرچی شت هەیە لە جوانترین شێوە و باشترین باری گونجاودا بن.

جا ئەم ناوانەی کە لەمەڕ "جوانی" و "کەماڵ"ی خواوەندن، بۆ ئەوەی جوانیی خۆیان بنوێنن، داخوازی ئەوەن: بوونەوەران لە بارودۆخێکی جواندا بن و، لە بەردەم مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی و جینی و مرۆڤدا بە جوانترین و شایستەترین ئەدەب ڕەفتار بکەن.

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە ئەو دابانەی لە سوننەتی خاوێنی پێغەمبەردان ﷺ ئاماژەن بۆ ئەم ئادابە بەرزانە و، ئاوڕدانەوەن بۆ لای دەستوور و نموونەکانیان.

❑ **سەرنجی هەشتەم:**

ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿**لَقَدْ جَاءكُم رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ**...﴾ تا دوایی ئایەتەکە، شەفەقەت و میهرەبانیی تەواوی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە نەتەوەکەی، دەردەخات. بەڵام ئایەتەکەی دوای ئەو کە دەفەرموێ: ﴿**فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ**...﴾ تا دوایی ئایەتەکە، ئەوە دەفەرموێ کە:

(خەڵکینە! موسڵمانان!

چەندە کارێکی بێویژدانانە و دوور لە ژیری دەکەن کاتێ پشت لە سوننەتەکانی ئەم پێغەمبەرە دڵسۆز و میهرەبانە هەڵدەکەن و، گوێبیستی فەرمانەکانی نابن کە لە لایەنی خواوەندەوە ڕایاندەگەیەنێت، بە ڕادەیەك کە گەیاندووتانەتە ئەوەی دان بە میهرەبانییە ئاشکرا و لە بەرچاوەکەی ئەودا نانێن و میهرەبانییەکەشی تۆمەتبار دەکەن. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هەر تەنها ئەو بوو لە ڕێی میهرەبانییە فراوانەکەی و بە هەموو توانایەکیەوە بەرەو بەرژەوەندییەکانتان ڕێنمایی کردن و، بە مەڵهەمی سارێژکاری سوننەتە پیرۆزەکانی و ئەو فەرمانانەش کە لای خوای گەورەوە بۆی هێنان، زامە بەسۆ و مەعنەوییەکانی بۆ سارێژ و چارەسەر کردن.

تۆیش - ئەی پێغەمبەری خۆشەویست و دڵسۆز و میهرەبان! - ئەگەر ئەوان هێندە گێل بوون بەم میهرەبانییە مەزنەی تۆیان نەزانی و نرخیان بۆ دانەنا و پشتیان تێ کردیت و گوێیان لێ نەگرتیت، هیچ پەرۆش مەبە و گوێیان مەدەرێ و خەم مەخۆ، چونکە خواوەندی خاوەن عەرشی مەزن کە کاروباری ئاسمانەکان و زەویی بە دەستەو، لە عەرشی مەزنی خۆیەوە کە دەورانەوری هەموو شتێکی داوە پەروەردگارییەکەی زاڵ و شکۆدارە، ئەم خواوەندە بۆ تۆ سەروزیادە. ڕۆژێك دێت هەموو ئەو کەسانە لە دەورت کۆ دەکاتەوە کە بە ڕاستی گوێڕایەڵ بن و ئامادەیان دەکات گوێت لێ ڕابگرن و بە فەرمانەکانت ڕازی بن).

بەڵێ، هیچ مەسەلەیەك لە شەریعەت و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ نییە چەندین حیکمەتی زۆری تێدا نەبێت. منی هەژاری دەرگانەی خوا، وێڕای هەموو کۆڵەواری و ناتەواوییەکم، ئەم ئیددیعایە دەکەم و بە تەواوی ئامادەشم بیچەسپێنم. ئەو پەیامانەی نوور کە تا ئێستا نووسیومن و لە حەفتا پەیام زیاتر دەبن، وەك شایەتێکی ڕاست وان

لەسەر تەواویی ئەو دانایی و ڕاستی‌یەی کە لە سوننەت و شەریعەتی پێغەمبەردان ﷺ. خۆ ئەگەر بکرێت و بە تەواوی ئەم باسە بنووسرێت، ئەوا نە حەفتا و نە حەوت هەزار پەیامیش هێشتا بەشی ئەوە ناکەن کە مافی تەواوی ئەو دانایی‌یانە بدەن و بە تەواوی باسیان بکەن.

تەنانەت من خۆم بینیومە و بە چێژی خۆم چەشتوومە، بەڵکو هەزار و یەك تاقیکردنەوەشم بە خۆمەوە دیوە کە: دەستوورەکانی مەسەلە شەرعی‌یەکان و سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ باشترین و سوودمەندترین دەرمانی نەخۆشی‌یە گیانی و ژیری و دڵی‌یەکانی گرۆی مرۆڤن، بە تایبەت کۆمەڵایەتی‌یەکانیان. وا من ئەم بینین و هەست کردنەی خۆم ڕادەگەیەنم و، لە پەیامەکانیشدا وام باس کردوون کە خوێنەریش هەستیان پێ بکات و تێ بگات کە هیچ چارەسەری‌یەکی فەلسەفی و دانایانە هەرگیز ناتوانێت جێی ئەوان بگرێتەوە. ئەو کەسانەی گومانیان لەم دەعوایەمدا هەیە، با بڕۆن پەیامەکانی نوور بخوێننەوە.

کەواتە با نرخ و بەهای شایانی ئەو قازانجە گەورەیە بزانرێت کە دەستی ئەو کەسە دەکەوێت بەپێی توانا هەوڵی شوێنکەوتنی سوننەتەکانی ئەم زاتە پیرۆزە دەدات و، پەی بە مەودای ئەو بەختەوەری‌یەی ژیانی هەمیشەیی و سوودی زۆری ئەو ژیانەش ببرێت کە لە شوێن‌پێ هەڵگرتنی سوننەتەوە دەستی مرۆڤ دەکەوێت.

**❑ سەرنجی نۆهەم:**

شوێنکەوتنی ڕاستەقینە و تەواوەتیی هەموو جۆرەکانی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ مەگەر بۆ ئەوانەی کە مرۆڤە هەرە کامڵ و تایبەتەکانن، دەنا لەوانەیە بۆ هەموو کەسێك مەیسەر نەبێت. بەڵام مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێی نیاز و ویست و حەزکردنەوە لە شوێنکەوتنی هەموو سوننەتەکان، پاداشتی ئەم شوێنکەوتنەی دەست بکەوێت!

شتێکی ئاشکرایە کە دەبێ هەموو بەشەکانی "فەرز" و "واجب" جێ‌بەجێ بکرێن. بەڵام وازلێهێنان و پشتگوێ خستنی ئەو سوننەتانەی کە باشتر وایە لە پەرستشدا ئەنجام بدرێن، هەرچەند مرۆڤی پێ گوناهبار نابێت، بەڵام پاداشتێکی زۆری لە کیس دەدات و، دەستکاری کردنیشیان دووچاری هەڵەیەکی گەلێ گەورەی دەکات.

بەجێهێنانی سوننەتەکانی سەبارەت بە هەڵسوکەوت و مامەڵەی ئاسایی، "عادەت"ەکانی مرۆڤ دەکات بە "عیبادەت"، هەرچەندەش ئەو کەسەی ئەنجامیان

نەدات گلەیی ڕووی تێ ناکات، بەڵام سوودێکی کەم لە ڕووناکیی دابەکانی ژیانی خۆشەویستی خوا ﷺ وەردەگرێت.

"بیدعەت"یش بەو شتە تازە پەیدابووانە دەوترێت کە لە ئەحکامەکانی "پەرستن"دا پەیدا دەکرێن. جا لەبەر ئەوەی ئەم بیدعەتە پێچەوانە و دژی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُم﴾ (المائدة:٣) ئەوا شتێکی وەرنەگیراوە و بە سەر و ڕووی ئەو کەسەدا دەدرێتەوە کە پەیدای کردووە. ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەو بیدعەتانە لە جۆری ئەو ویرد و زیکر و مەشرەبانە بن کە لە تەریقەتە سۆفی‌یەکاندا هەن، مادەم لە بناغەدا لە قورئان و سوننەت وەرگیرابن، ئەوا بە "بیدعەت" ناژمێررێن. چونکە ئەو بناغە و بنچینانەی کە ئەو زیکر و ویردانەیان لێ وەرگیراوە، هەرچەندەش جۆراوجۆر بن، دەبێ ئەو مەرجەیان تێدا بێت کە دژ و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەبن و نەیگۆڕن. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لە زانایان بەشێکی ئەم شتانەشیان هەر بە بیدعەت داناوە و ناوی "البدعة الحسنة"یان لێ ناوە.

بەڵام ئیمامی ڕەببانی دەفەرموێ:

(لە کاتی گەشتی ڕۆحیمدا، دەمبینی ئەو وتانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراون، بە تیشکی سوننەتی خاوێنی ئەو دەدرەوشێنەوە، لە هەمان کاتدا ویردە گەورە و بارودۆخە ڕووناکەکانیش کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت نەکرابوون، ئەو چەشنە گەشانەوە و ڕووناکی‌یەیان پێوە دیار نەبوو. تەنانەت درەخشانترینی ئەم جۆرەیان نەدەگەیشتە کەمترینی ئەوەی کە لە سوننەتدا ڕیوایەت کرابوو.

لەمەوە تێ گەیشتم کە:

تیشکی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەرﷺ ئیکسیرێکی کاریگەرە و، سوننەتی خاوێنی ئەو سەروەرەش سەروزیادی ئەو کەسانەیە کە عەوداڵی ڕووناکین. کەواتە پێویست ناکا مرۆڤ لە دەرەوەی سوننەتدا سۆراخ بکات و بە دوای ڕووناکی‌دا بگەڕێت)!

ئەم فەرمانەی کە ئەم پێشەوا قارەمانەی حەقیقەت و شەریعەت دەری‌دەکات، بۆمان دەردەخات کە سوننەتی ڕووناکی پێغەمبەر ﷺ بەردی بناغەی بەختەوەریی هەردوو دنیا و سەرچاوەی هەموو کامڵی و خێر و چاکەیەکە.

دەسا خوایە گیان!

شوێنکەوتنی سوننەتی ڕووناکی پێغەمبەرمان ﷺ پێ ببەخشە!

﴿رَبَّنا آمَنَّا بِمَا أَنْزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ﴾ (آل عمران:٥٣).

❐ **سەرنجی دەهەم:**

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿**قُلْ إِنْ كنتم تحبّونَ اللهَ فاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ**﴾ (آل عمران:٣١).

ئەم ئایەتە پیرۆزە كورتكردنەوەیەكی ناوازە و دەراسا و "موعجیز"ی تێدایە، چونكە چەندین واتای زۆر لەم سێ ڕستەیەدا كۆ كراونەتەوە.

ئەوەتا ئەم ئایەتە دەفەرموێ:

(ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا ببێت، خۆشیشتان دەوێ.. مادەم خۆشتان دەوێت، ئەوا بەپێی ئەو شتانە ڕەفتار دەكەن كە ئەو پێی‌خۆشە.. ئەمەش تەنها بەوە دەبێت كە چاو لەو كەسە بكەن ئەو خۆشی دەوێت.. چاولێكردنی خۆشەویستەكەی ئەویش بەوە دەبێت كە شوێن‌پێی هەڵبگرن.. كەواتە هەركات شوێنی خۆشەویستەكەی ئەو كەوتن، خواوەندیش ئێوەی خۆش دەوێت، ئاشكراشە كە ئێوە خواتان لەبەر ئەوە خۆش دەوێت تاكو ئەویش ئێوەی خۆش بوێت).

ئەم ڕستانە، هەندێكن لەو واتایانەی كە لەم ئایەتەدا بە پوختی كۆكراونەتەوە. لەبەر ئەوە، دەتوانرێت بوترێ:

گرنگترین و بەرزترین ئامانجی مرۆڤ ئەوەیە كە شایانی خۆشەویستیی خوا بێت. خۆ دەقی ئەم ئایەتەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە ڕێی گەیشتن بەو ئامانجە گرنگ و بەرزە بریتی‌یە لە:

شوێن پێ هەڵگرتنی "خۆشەویستی خوا" و چاولێكردنی سوننەتی پیرۆزی ئەو ﷺ.

جا ئەگەر لەم پلەیەدا سێ خاڵمان چەسپاند، ئەوا ئەم ڕاستی‌یەی پێشوو بە ڕوونی دەردەكەوێت:

❍ خاڵی یەكەم:

مرۆڤ بە سروشتی بەدیهاتنی خۆی بەدیهێنەری گەردوونی خۆش دەوێت، چونكە سروشتی مرۆڤ خۆشەویستی‌یەكی بەتینی بەرامبەر "جوانی" و "چاكە" لە خۆدا هەڵگرتووە. ئەم خۆشەویستی‌یەش بەپێی پلەكانی "جوانی" و "كەماڵ" و "چاكەكاری" پتر لە زیادبووندان، تا دەگاتە ئەوپەڕی پلەكانی شەیدایی و ئەوین.

بەڵێ، لە دڵی بچووكی ئەم مرۆڤە بچووكەدا، ئەوینێكی مەزنی بە ئەندازەی گەردوون جێگیر بووە. چونكە گواستنەوەی ناوەڕۆكی پەرتووكخانەیەك و

کۆکردنەوەیان لە "هێزی پارێزکار"ی دڵدا کە بە ئەندازەی دەنکە نیسکێکە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە "دڵ"ی مرۆڤ دەتوانێت گەردوون لە خۆیدا کۆبکاتەوە و خۆشەویستییەك لە خۆیدا هەڵبگرێت کە بە ئەندازەی گەردوون مەزن بێت.

جا مادەم سروشتی مرۆڤ ئامادەیی‌یەکی ئاوای بۆ خۆشەویستی تێدایە، بەرامبەر بە "چاکە" و "کەماڵ" و "جوانی"..

مادەم بەدیهێنەری گەردوونیش خاوەنی "جوانی"یەکی پاك و پیرۆزی بێ‌کۆتایی ئەوتۆیە کە ئاسەوارە ئاشکراکانی لەناو بوونەوەراندا بە ڕوونی دەیچەسپێنن و.. خاوەنی "کەماڵ"ێکی خاوێن و بێ‌سنووری وەهایە کە نەخشونیگاری سنعەتە ئاشکراکانی ناو بوونەوەران گومانی تێدا ناهێڵن و.. دارای "چاکەکاری"یەکی لە ڕادەبەدەری ئەوتۆشە کە دەتوانرێت لە نێوان نیعمەت و بەخشایشە ئاشکراکانیدا ببینرێت کە بە گشت زیندەوەرانی بەخشیوە..

مادەم وایە.. ئەوا ئەم خواوەندە بەدیهێنەرە داوای خۆشەویستییەکی بێ‌سنوور لەم مرۆڤە دەکات کە لە هەموو خاوەن هەستان زیاتر دارای سیفەتی: "خۆشەویستی"یە و، بۆی موحتاجترە و، بیرکردنەوەی لە پێناویدا لە هەموان گەورەترە و، لە هەموانیش زیاتر لە تاسەی ئەو خۆشەویستییەدایە.

بەڵێ، هەروەك هەموو مرۆڤێك توانایەکی بێ‌سنووری بۆ خۆشویستنی بەدیهێنەری شکۆمەند تێدایە، ئەو بەدیهێنەرەش شایانی ئەوەیە کە خۆشویستراو بێت و لە پێناوی "جوانی" و "کەماڵ" و "چاکەکاری‌یەکانی"دا لە هەموو کەسێك زیاتر بەدیهێنراوانی خۆشیان بوێت. تەنانەت هەموو جۆر و پلەکانی خۆشەویستی کە لە دڵی مرۆڤدا هەن بەرامبەر بەوانەی پەیوەندیی تایبەتیی لەگەڵیاندا هەیە، بە تایبەت ئەو خۆشەویستی‌یەی کە لە دڵیایەتی بەرامبەر ژیان و، مانەوە و، بوون و، دنیاکەی و، خۆی و، هەموو دنیا بە گشتی، ئەمانە لە ڕاستی‌دا چەند نمێکن لە ئامادەیی سروشتی مرۆڤەوە بۆ خۆشەویستیی خوای گەورە داچۆڕاون، تەنانەت هەموو شێوە هەستکردنە قووڵەکانی ناخی مرۆڤ بەرامبەر بە خۆشەویستی، چەند گۆڕانکاری‌یەکی ئەو ئامادەیی‌یەن کە لە مرۆڤدا هەیە، ئەمانەش لە ڕاستی‌دا چەند نمێکی ئەو ئامادەیی‌یەن لەو شکڵ و شێوە و وێنانەدا دەردەکەون.

ئاشکرایە کە مرۆڤ هەروەك لە بەختەوەریی خۆی تام و چێژ وەردەگرێت، بە هەمان جۆر تامی بەختەوەریی ئەو کەسانەش دەچێژێت کە خۆشی دەوێن و پەیوەندیی خۆشەویستیی لەگەڵیاندا هەیە.. هەروەك چۆن ئەو کەسەی خۆش دەوێت کە لە گێروگرفت ڕزگاری دەکات، بە هەمان جۆر ئەو کەسەشی خۆش دەوێت کە خۆشەویستانی لە بەلاّ و موسیبەتەکان ڕزگار دەکات.

ئەگەر مرۆڤێك گیانی لە شوکرانەبژێریی خواوەند پڕ بوو بێت و، بەم چەشنە بیر لە تەنها یەك دانە چاکەی خوای گەورە بکاتەوە لە نێوان هەزاران چاکە و بەخشایشی لەژمارەبەدەردا کە بەم مرۆڤەی ڕەوا بینیوە و دەستی چاودێریی بۆ درێژ کردووە، ئەوا ئەو کاتە بەم جۆرەی خوارەوە بیر دەکاتەوە:

بەدیهێنەرم کە لە تاریکستانی "نەبوون" ڕزگاری کردم و بەخششی "بوون"ی لەبەر کردم و، دنیایەکی جوانی لەم سەرزەوی‌یەدا پێ بەخشیم کە تامی جوانی‌یەکەی دەچێژم.. هەر ئەم بەدیهێنەرە، تا ماوەم لە ژیاندا مابێت، چاودێریم دەکات و هەر بەو جۆرە لە تاریکستانی هەتاهەتایی دەربازم دەکات و، بە چاکە و بەخشایشی خۆی جیهانێکی هەمیشەیی جوان و دڵڕفێنم لەو دنیادا دەداتێ و، لەوێ چەندین هەستی ئەوتۆیشم پێ دەبەخشێت کە تامی ئەو نیعمەتانەیان پێ بچێژم، کاتێ بەناو جۆر و چێژەکانی ئەو جیهانە ڕەنگینە جوانەدا دێم و دەڕۆم..

هەر ئەم خواوەندە بەدیهێنەرە وا لە گشت خزم و خۆشەویستان و هاونەژادم و هەموو ئەو کەسانە دەکات کە پەیوەندیی بەتینم لەگەڵیاندا هەیە، شایانی ئەم هەموو چاکە و بەخشایشە بێ‌سنوورانە بن. ئەم چاکە و ناز و نیعمەتەی کە خوای گەورە بەوانی دەبەخشێت، لە سەرێکی ترەوە بۆ من دەگەڕێتەوە، چونکە بەختەوەریی ئەوان مایەی بەختیاریی منە.

جا مادەم مرۆڤ شەیدای چاکەکاری‌یە، وەك ئەو پەندەی کە دەڵێت: "الإنسان عبد الإحسان" ئەوا دەبێ لە بەردەم چاکەکاریی ئاوا بێ‌سنووردا بڵێت:

گەر دڵێکی فراوانی بە ئەندازەی گەردوونم ببوایە، ئەوا شایانی ئەوە دەبوو، بەڵکو پڕ بە دڵیش حەزم دەکرد کە بە ئەوینی ئەو "چاکەکاری"یەی خواوەند پڕم بکردایە. جا هەرچەندەش من – لە ڕاستی‌دا – لە ئاستی ئەو خۆشەویستی‌یەدا نیم، بەلاّم بەهۆی:

ئیمـان و، ئامـاده‌یی و، نیـاز و، وه‌رگـیراوی و، ڕێزلێنـان و، حـه‌ز و، پابـه‌ندبوون و، ویسته‌وه، خۆم به شایانی ئه‌و خۆشه‌ویستی‌یه ده‌زانم.

ئه‌مه سـه‌باره‌ت بـه **"چاكـه‌كاریی"** خـواوه‌نـد.. ئـه‌وه‌ش كـه پێویسـت بێـت مرۆڤ لـه به‌رامبه‌ر **"جوانی"** و **"كه‌مال"**ی خواوه‌نده‌وه ده‌ری ببڕێت، ده‌بێ به هه‌مان پێوه‌ر بێت كه به كورتی سه‌باره‌ت به **"چاكه‌كاری"**یه‌وه ئاماژه‌مان بۆ كرد.

بـه‌ڵام كـافری بێبڕوا هـه‌رگیز وا نی‌یـه، چونكـه دوژمنایه‌تی‌یـه‌كی بـێ سـنوور لـه ده‌روونی‌دا هه‌ڵده‌گرێت و، گاڵته به بوونه‌وه‌رانی ده‌وروبه‌ری ده‌كات و، نرخی شـیاویان بۆ دانانێت و، دوژمنایه‌تی‌یان له به‌رامبه‌ره‌وه ده‌نوێنێت.

❍ حاڵی دووهه‌م:

خۆشه‌ویستیی خوای گه‌وره داخوازی شوێنكه‌وتنی سوننه‌تی خـاوێنی پێغه‌مبـه‌ره ﷺ. چونكـه خۆشه‌ویسـتیی خـوا بریتی‌یـه لـه ڕه‌فتـاركردن بـه‌و كارانـه‌ی كـه خـواوه‌نـد پێیـان ڕازی‌یه. باشترین شێوه‌ی ئه‌و شتانه‌ش كه مایه‌ی ڕه‌زامه‌ندیی خوای گه‌وره‌ن، لـه خـودی پێغه‌مبـه‌ردا ﷺ ده‌رده‌كـه‌ون. ئنجـا چـاولێكردنی كـرده‌وه و هه‌ڵسـوكه‌وته‌كانی زاتـی پیرۆزی پێغه‌مبه‌ریش ﷺ له دوو ڕووه‌وه ده‌بێت:

یه‌كـه‌میان: ڕووی خۆشویسـتنی خـوای گـه‌وره و، گوێڕایـه‌ڵیی فه‌رمانـه‌كانی و هه‌ڵسوكه‌وت لـه بازنـه‌ی ئـه‌و شـتانه‌دا كـه مایـه‌ی ڕه‌زامـه‌ندیی خـوان. دیـاره ئـه‌م ڕووه داخوازی ئه‌و شوێنكه‌وتنه‌ی پێغه‌مبه‌ره ﷺ، چونكه ته‌واوترین و باشترین پێشه‌وا و پێشڕه‌و له‌م ڕووه‌وه، پێغه‌مبه‌ری ئیسلامه كه حه‌زره‌تی محه‌ممه‌ده ﷺ.

دووهه‌میان: ڕووی "زاتی پـیرۆزی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ خۆیـه‌تی" كـه باشـترین و گـه‌وره‌ترین هـۆی چاكـه‌كاریی لـه سنوور بـه‌ده‌ری خواوه‌نـده به‌رامبـه‌ر بـه مرۆڤایـه‌تی. كه‌واتـه لـه‌م ڕووه‌وه پێغه‌مبه‌ر ﷺ شایانی خۆشه‌ویستی‌یه‌كی بێ سنووره، له پێناوی خواوه‌نددا.

مرۆڤیش به سروشت حه‌ز ده‌كات و پێی خۆشه كه به گوێره‌ی توانای خـۆی چـاو لـه خۆشه‌ویسته‌كه‌ی بكـات. كه‌واتـه ئـه‌و كه‌سـانه‌ی لـه پێنـاوی خۆشه‌ویستیی پێغه‌مبـه‌ری خۆشه‌ویستی خوادا ﷺ تێده‌كۆشن و، هـه‌وڵ ده‌ده‌ن بـه‌پێی توانـا چـاوی لـێ بكـه‌ن، ئـه‌م كاره‌یـان - بێ هیـچ گومـانێك - داخـوازی شوێنپێ هـه‌ڵگرتنی سوننه‌تی پـیرۆزی ئـه‌و ده‌بێت.

❍ خاڵی سێ‌هەم:

هەروەك خواوەند دارای میهرەبانی‌یەكی بێ‌كۆتایی‌یە، بە هەمان جۆر خاوەنی خۆشەویستی‌یەكی لە سنوور بەدەریشە..

هەروەك خواوەند بە چەشنێكی لەڕادەبەدەر و لە ڕێی جوانكردن و ئارایشتدانی بوونەوەرانەوە خۆی لە لای بەدیهێنراوانی خۆشەویست دەكات، هەروەها بەدیهێنراوانیشی خۆش دەوێت، بە تایبەت خاوەن هەستان كە لە بەرامبەر ئەم خۆ خۆشەویست كردنەی خواوەندەوە ئەوانیش خۆشەویستی و ڕێزی بۆ دەردەبڕن.

كەواتە گەورەترین و گرنگترین كارێ كە مرۆڤ لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا ئەنجامی بدات و بۆی تێبكۆشێت، ئەوەیە كە مایە و جێی بۆ ڕوانینی "خۆشەویستیی" خوا بێت. ئەو خوایەی كە بەهەشت و، جوانی و، تام و چێژ و، بەخشایشەكانی تەنها بە ئاوڕلێدانەوەیەكی درەوشانەوەی میهرەبانیی خۆی بەدی‌هێناوە.

جا مادەم، وەك دەقی قورئان دەفەرموێ، كەس ناتوانێت شایانی خۆشەویستیی خوا بێت لە ڕێی شوێن پێ هەڵگرتنی سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێت، ئەوا گرنگترین و مەزنترین ئامانج و ئەركی سەرشانی مرۆڤ لەوەدایە كە: شوێن سوننەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بكەوێت.

❐ **سەرنجی یازدەهەم:**

بریتی‌یە لە سێ مەسەلە:

❖ مەسەلەی یەكەم:

سوننەتی پێغەمبەری مەزن ﷺ سێ سەرچاوەی هەیە: گوفتارەكانی، كردارەكانی، حاڵەتەكانی. ئەمانەش دەكرێن بە سێ بەشەوە: فەرزەكان، سوننەتەكان(النوافل)، دابە ئاسایی‌یەكان(العادات).

سەبارەت بە فەرز و واجبەكان دەبێ مرۆڤ شوێنیان بكەوێت و بەجێیان بهێنێت و، ئیماندار بەپێی ئیمانەكەی جێ‌بەجێ كردنی ئەم فەرز و واجبانەی لە ئەستۆدایە و دەبێ هەموو ئیمانداریێك بە بێ جیاوازی ئەنجامیان بدەن. خۆ ئەگەر نەیانكەن یان پشتگوێیان بخەن، ئەوا لە لایەن خواوەندەوە سزا دەدرێن.

بەشی سوننەتەكانیش بە هەمان جۆر و بەپێی ئەمر و فەرمانی موستەحەب، باشتر وایە ئیمانداران ئەنجامی بدەن. بەڵام بەجێ نەهێنانی ئەم بەشە نابێتە مایەی سزادان، گەر

ئەنجامیشی بـدەن ئـەوا پاداشـتێکی مـەزنیان دەستگیر دەبێـت و، هـەر ئـاڵوگۆڕ و دەست وەردانێکیش تیایاندا بە بیدعەت و گومڕایی و هەڵەی گەورە دادەنرێت.

سەبارەت بە دابە ئاسایی‌یەکان و هەڵسوکەوت و حاڵەتـە بـەرزەکانی پێغەمبەریشـەوە ﷺ ئەوا باشتر وایە و کارێکی گەلـێ پڕ لە بەرژەوەندی و دانایی‌یـە کـە ئیمـاندار چاویـان لـێ بکات و شـوێنیان بکـەوێت، چ لـە ژیـانی خۆیـی و، چ لـە ژیـانی مرۆڤایـەتی و، چ لـە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا. چونکە سوودی گەلـێ زۆر سەبارەت بەم جـۆرە ژیانانـە لـە هـەموو هەڵسوکەوت و جموجووڵێکی ئاسـایی پێغەمبـەردا ﷺ هەیـە. ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە بەردەوامبوون لەسەر ئەم شـوێنکەوتنە وا لـە داب و هەڵسـوکەوتە ئاسـایی‌یەکانی مـرۆڤ دەکات کە لە حوکمی عیبادەتدا بن.

بەڵێ، مادەم بە یەکدەنگیی دۆستان و دوژمنـان: ئـەم پێغەمبـەرە ﷺ خـاوەنی بـەرزترین پلەکانی ڕەوشتجوانی‌یە و، هەڵبژاردەی نێوان گرۆی مرۆڤە و، بـەناوبانگترین کەسێتی‌یە لە نێوانیـاندا و، لـە هـەموانیش کاملـترە، تەنانـەت بـە بۆنـەی ئـەو هـەزاران موعجیزانـەی خۆی و شـایەتیی ئـەو جیـهانی ئیسـلامی‌یەی کـە پێکی‌هێنـا و، بـەهۆی ئـەو کەماڵاتـە کەسی‌یانەی خۆی کـە ڕاستی‌یەکانی ئـەو قورئانـەی ڕایگـەیاند تەسـدیقیان دەکـات: کاملترین ڕابەر و پێشڕەوی گرۆی مرۆڤە..

هەروەها مادەم ملیۆنان مرۆڤی خاوەن کەماڵ، لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ئـەو پێغەمبـەرە خۆشەویسـتەوە ﷺ گەیشـتن بـە پلـەکانی کەمـاڵ و یـەك لـە دوای یـەك بـەو پلانـەدا سـەرکەوتن و بە بەختەوەریی دواڕۆژ شاد و بەهرەمەند بوون..

ئەوا دەبێ سوننەت و هەڵسوکەوتی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ:

باشترین نموونەی چـاولێکردن و.. تـەواوترین ڕابـەری شـوێنکەوتن و.. مەحکـەمترین دەستوور و.. مەزنترین یاسـا بێـت کـە مرۆڤی موسـڵمان بیکـات بـە بناغـەی ڕێکخستنی ژیانی خۆی.

بەختـەوەر ئـەو کەسـەیە کـە بەشێکی زۆری لـەم شـوێنکەوتنە دەسـت بکـەوێت. ئـەو کەسەش شوێنی سـوننەت ناکـەوێت، ئەگـەر لەبـەر تەمبـەڵی بێـت ئـەوا زیـانێکی ئاشکرا دەکات.. ئەگەر لەبـەر بایـەخ پێ‌نـەدانی بێـت، ئـەوا تـاوانێکی گـەورەی کـردووە.. خـۆ ئەگەر ڕەخنەی لـێ‌بگرێت بە چەشنێ بە درۆی بخاتەوە، ئەوا ئەو کەسە لە گومڕایی‌یـەکی زۆر گەورەدایە.

❖ مەسەلەی دووهەم:

خواوەند لە قورئانی پیرۆزدا وەسفی پێغەمبەری ﷺ بەوە کردووە کە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ (القلم:٤). هاوەڵەکانیشی بەو وەسفە ناویان دەهێنا کە حەزرەتی عائیشە - خوای لێ ڕازی بێت - فەرموویەتی: "كَانَ خُلُقُهُ القُرآنُ"(١)!

واتە: حەزرەتی محەممەد ﷺ نموونەی ئەو ڕەوشتە جوانانە بووە کە قورئانی پیرۆز ڕوونی کردوونەتەوە و باشترین کەسێکە ئەو ڕەوشتانەی تێدا بەرجەستە بووبێت، تەنانەت خواوەند سروشتی ئەو زاتە پیرۆزەی لەسەر ئەو ڕەوشتە بەرزانە بەدیهێناوە.

جا لە کاتێکدا کە دەبێ هەموو گوفتار و ڕەفتارێکی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ نموونەی چاولێکراوی سەرجەمی مرۆڤایەتی بێت، دەبێ ئەو ئیماندارانەی نەتەوەکەی خۆی کە لە سوننەتەکانی بێ ئاگان و، گوێی پێ نادەن و، دەیانەوێت گۆڕانکاریی تێدا بکەن، چەندە لە بەدبەختی و چارەڕەشیدا بن!

❖ مەسەلەی سێهەم:

لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە باشترین و ڕاسترین و ڕێکترین بار و تەواوترین شێوەدا بەدیهێنراوە، ئەوا هەموو هەڵسوکەوتەکانی ڕاست و ڕەوان بووە. مێژووی ژیانی پیرۆزیشی بە ڕوونی ئەمە ئاشکرا دەکات و، دەری دەخات کە لە هەموو کردارێکیدا بەم پێیە ڕەفتاری کردووە و، ناوەندە ڕێ و ڕاستەشەقامی لە هەموو شتێکدا هەڵبژاردووە و، خۆی لە زیادەڕەوی و کورتڕەوی(الإفراط والتفريط) پاراستووە..

بەڵێ، مادەم پێغەمبەر ﷺ بە تەواوی ئەو فەرمانەی خوای گەورەی جێبەجێ کردووە کە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ﴾ (هود:١١٢) ئەوا "ڕاسترەوی" لە هەموو کردار و گوفتار و ڕەفتارەکانیدا - بە ئاشکرا - دەرکەوتووە.

بۆ نموونە: هێزەکانی لەمەڕ "ژیریی" ئەو، هەمیشە لە بازنەی "دانایی"دا بوون، کە تەوەرەی گرتنەبەری ڕاستە شەقام و ناوەندە ڕێیە و، هەردەم هەڵسوکەوتەکانی دوور بوون لە شتێك بیانشێوێنێت یان سەرکوتیان بکات، لە زیادەڕەوی یان گوێ پێنەدانی چەشنی: "کەودەنی" و "جەربەزەیی"..

---

(١) جزء من حديث عائشة رضي الله عنها. أخرجه مسلم وأحمد وأبو داود والنسائي والدارمي.

هێزە "تووڕەیی"یەکانیشی هەردەم لە ناوەندی ئەو "ئازایەتی"یە بەرزەدا بوون کە تەوەرەی گرتنەبەری ڕاستە شەقام و ناوەندە ڕێیە و، هەمیشە دوورە پەرێز بووە لە زیادەڕەوی و گوێ پێ نەدانێك کە ئەو ئازایەتی‌یە تێك بدەن، وەك: "ترسان" و "هەڵەشەیی"..

هێزە "شەهوانی"یەکانیشی بە هەمان جۆر، هەمیشە تەوەرەی لانەدان بووە لە ڕاستە شەقام، کە بریتی‌یە لە "داوێن پاکی". ئیتر بەوپەڕی پاکی و خاوێنی لەسەری بەردەوام بووە و، بەم بۆنەیەوە ئەم هێزەی ئەو، لە هەر زیادەڕەوی و گوێ پێ نەدانێك پارێزراو بووە کە بیشێوێنن، وەك: "سەرکوتکراوی" و "داوێن پیسی".

بەم چەشنە، ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لە هەموو سوننەتە پیرۆزەکانی‌دا و لە گشت ڕەفتارە سروشتی‌یەکانی و هەموو ئەحکامەکانی شەرعدا ڕاستە شەقامی هەڵبژاردووە و، بە یەکجاری خۆی لە زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی - کە لە ڕاستی‌دا ستەم و تاریکین - لاداوە. بە ڕادەیەك کە میانەڕەویی کردبوو بە ڕابەری خۆی و بە یەکجارەکی لە گوفتار و خواردن و خواردنەوەی‌دا دوورەپەرێزیی لە زیادەڕەوی کردووە.

لە درێژەپێدانی ئەم ڕاستی‌یانەدا هەزاران بەرگی کتێب دانراون. بەڵام ئێمە لێرەدا بەم دڵۆپە لەو دەریایە واز دەهێنین، چونکە وەك وتراوە: "العارفُ تكفيهِ الإشـــارةُ"! واتە: مرۆڤی زانا و ژیر ئاماژەیەکی سەروزیادە بۆ تێگەیشتن.

اللهمّ صَلِّ على جامع مكارم الأخلاق، ومظهر سرّ: ﴿وإنّك لَعلى خُلُقٍ عَظيـــم﴾. الذي قال: "من تمسك بسنتي عند فساد أمتي فله أجر مئة شهيد".

﴿وَقالُوا الحَمدُ لله الّذي هَدانا لِهذا وَمَا كُنّا لِنَهتَديَ لَولا أنْ هَدانا الله لَقَد جَاءتْ رُسُلُ ربِّنا بالحَقِ﴾.

﴿سُبحانكَ لا علمَ لَنا إلاّ ما علّمتنا إنّكَ أنتَ العليمُ الحكيم﴾.

# بریسکەی دوازدەهەم

**تایبەتە بە دوو سەرنجی قورئانی‌یەوە کە بــە بۆنـەی دوو پرسیاری جوزئیـی کاك "ڕەئفەت"ەوە نووسران.**

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم و على إخوانكم ورحمة الله وبركاته

برای ڕاست و ئازیزم کاك ڕەئفەت[1]!

پرسیارەکانت لەم کاتە سەخت و دژوارەی منی تێدام، سەخڵەتم دەکەن و دەمخەنە دۆخێکی پشێوی و نائارامەوە. چونکە هەرچەند دوو پرسیارەکەی ئـەم جـارەت لـە خۆیاندا بە جوزئی دادەنرێن، بەڵام لەبەر ئەوەی پـەیوەندی‌یان بە دوو سـەرنجی قورئانـەوە هەیە، هەستم کرد کە هەندێ گرنگی‌یان تێدایە. لە لایەکی تریشەوە ئەو پرسیارەی کە لە بـارەی گـۆی زەوی‌یـەوە کـردووتـانە، لـە لایـەن هـەردوو زانسـتی جوگـرافیا و گەردووناسی و لـە بارەی حـەوت چینەکانی زەوی و ئاسمانـەوە، شـوبهە و گومانیـان ئاراستە دەکرێت. لەبەر ئەوە، ئێمـە لـێرەدا بە شێوازێکی زانستی و هەمـەکی و کـورت دوو سـەرنجی قورئـانی پـیرۆز ڕوون دەکەینـەوە، بـێ ئـەوەی ئـاوڕ لـەوە بدەینـەوە کـە پرسیارەکە لە خۆیدا جوزئی و هەندەکی‌یە. ئنجا تۆش لـە لایـەنی خۆتـەوە سـەبارەت بـە دوو پرسیارە جوزئی‌یەکەت بەشی خۆت لەو ڕوونکردنەوەیە وەربگرە.

---

(١) ڕەئفـەت بـارووتچی (١٨٨٦-١٩٧٥ز) ئەفسـەرێکی خانەنشـینە، لـە قوتابی‌یـە پێشـینەکانی مامۆسـتا نوورسی‌یە و لە بەندیخانەی ئەسکی‌شـەهر و دەنیزلی لەگەڵ مامۆستادا بـەند کـراوە. ماوەیـەك لـە ئەستەمبووڵ پێشنوێژیی کردووە و، لە وتنەوەی وانەی قورئاندا گەلـێ شارەزا و کارامە بووە. (وەرگێڕ)

✿ **سەرنجی یەکەم:**

بریتی‌یە لە دوو خاڵ:

◆ خاڵی یەکەم:

خوای گەورە دەفەرمووێ:

**﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ﴾** (العنكبوت:٦٠).

**﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينِ﴾** (الذاريات:٥٨).

بەپێی بەڵگەی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە: "ڕۆزی" تەنها بە دەستی خواوەندی بەتوانای شکۆمەندە و بێ هیچ هۆکارێك ڕاستەوخۆ لە گەنجینەی میهرەبانی‌یەکەی ئەو دەردەچێت و، پەروەردگار خۆی ڕۆزیی هەموو زیندەوەرێکی گرتووەتە ئەستۆ. کەواتە دەبێ هیچ کەسێك لە برساندا نەمرێت. بەڵام وا دیارە گەلێ کەس هەن لە ئەنجامی "برسێتی" یان بەهۆی "لەدەستدانی ڕۆزی"یەوە دەمرن.

شیکردنەوەی ئەم نهێنی‌یە و دەرخستنی ئەم ڕاستی‌یە بریتی‌یە لەوەی کە:

ئەو پەیمانی ڕۆزیدانەی پەروەردگار لە ئەستۆی گرتووە، ڕاستی‌یەکی جێگیر و چەسپاوە. چونکە هیچ کەسێك لە ئەنجامی "نەبوونی ڕۆزی"ماڵئاوایی لە ژیان ناکات، لەبەر ئەوەی بەشێك لەو ڕۆزی‌یەی کە خواوەندی دانای شکۆمەند بۆ جەستەی زیندەوەری دەنێرێت وەك کەرەسەیەکی یەدەك لە شێوەی چەوری و پیوی ناو لەشدا پاشەکەوت دەکرێت، تەنانەت هەندێك لەو ڕۆزی‌یەی کە بۆ ناو گۆشە و کەلەبەرەکانی خانەکانی لەش ڕەوانە کراوە، لەوێدا پاشەکەوت دەکرێت تاکو لە دەمی نەهاتنی ڕۆزی لە دەرەوەی لەشەوە، لە کار و ئەرکەکانی لەشدا بەکار بهێنرێت.

کەواتە ئەو کەسانەی گرفتاری مردن دەبن، لە ڕاستی‌دا پێش تەواوبوونی ئەم ڕۆزی‌یە یەدەکە پاشەکەوت کراوە دەمرن. واتە ئەو مردنە هی نەبوونی ڕۆزی نی‌یە، بەڵکو هی نەخۆشی‌یەکی وەهایە لە ئەنجامی وازهێنانیەوە لە عادەتێك تووشی بووە لەو عادەتانەی کە بە ئیختیاری هەڵەی خۆی هەڵی بژاردوون.

بەڵێ، ئەو ڕۆزی‌یە سروشتی‌یەی کە بە شێوەی چەوری لە جەستەی زیندەوەردا پاشەکەوت کراوە، تێکڕا تا چل ڕۆژی ڕەبەق بەردەوام دەبێت، بەڵکو لەوانەیە لە ئەنجامی نەخۆشی‌یەك یان لە ئیستیغراقێکی ڕۆحانی‌دا دوو هێندەی ئەو ماوەیە بەردەوام

بێت. تەنانەت سیازدە ساڵ پێش ئێستا[1] ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە: پیاوێك لە عیناد و سەرسەختیدا جەفتا ڕۆژ لە بەندیخانەی لەندەن مانی لە خواردن گرت و تامی هیچ شتێکی نەکرد، بێ ئەوەی هیچ کارێکیش بکاتە سەر باری تەندروستیی!

جا مادەم ڕۆزیی سروشتی تا چل ڕۆژ، بگرە تا حەفتا و هەشتا ڕۆژیش دەمێنێت و.. درەوشانەوەی ناوی "الرزاق"یش -بە ئاشکرا- بە سەرانسەری زەوییەوە دەردەکەوێت و.. ڕۆزیش لەو شوێنانەوە کە هەر لە حسابدا نەبوون و لە گوان و مەمکەکانەوە هەڵدەقوڵێت و لەناو توێکڵی بەروبوومەکانەوە دەردەچێت.. ئەوا بێ گومان ناوی جوانی "الرزاق" هەمیشە بە هانا و فریاگوزاریی ئەو زیندەوەرەوە دەچێت و نایەڵێت لە برسێتیدا و پێش تەواوبوونی "ڕۆزیی سروشتیی" گرفتاری مردن ببێت، گەر مرۆڤی ئالوودەی شەڕ، بە کردەوەی هەڵە و خراپ، خۆی تێ هەڵنەقورتێنێت.

لەبەر ئەمە، ئەو کەسانەی کە چل ڕۆژ پڕ ناکەنەوە و دەمرن، لە ڕاستیدا مردنەکەیان بە هۆی "نەبوونی ڕۆزی"یەوە نییە، بەڵکو هی عادەتێکە لە بەکارهێنانی هەڵە و خراپی ئیختیاری مرۆڤەوە سەری هەڵداوە، یان هی نەخۆشییەکە لە ئەنجامی وازهێنانی لە عادەتێکەوە پەیدا بووە. چونکە: "ترك العادات من المهلكات" دەستوورێکی بەردەوامە.

کەواتە دەتوانرێت بوترێ: کەس لە برساندا نامرێت.

بەڵێ، وەك لە بەرچاودایە: ڕۆزی لەگەڵ "ویست و ئیختیار"دا لە ڕێژەیەکی پێچەوانەی یەکتریدان.

بۆ نموونە: منداڵ کاتێ لە ڕەحمی دایکیدایە و هیچ توانا و ئیختیارێکی نییە، ڕۆزییەکەی بە خوڕ بۆ دەچێت، تەنانەت بێ ئەوەش ناچار بێت لێوەکانی بجوڵێنێت!

ئنجا کاتێك چاو بە دنیادا هەڵدەهێنێت و توانا و هەستێکی کەم نەبێ، هیچ توانا و ئیختیارێکی تری تێدا نییە، دەبینیت تەنها پێویستی بەوەندە جوولە هەیە کە دەمی بە مەمکی دایکیەوە بلکێنێت و، بەم ئەندازە جموجوولە کەمە سەرچاوەکانی مەمکی دایکی ڕۆزییەکیان لێ هەڵدەقوڵێت کە بە خاوێنترین و تەواوترین خۆراك دادەنرێت و، لە

(١) واتە ساڵی ١٩٢١ز.

هەمووشیان ئاسانتر بۆی هەرس دەبێت و، لە جوانترین شێوە و سەرسوورهێنەرترین سروشتدا پێی دەبەخشرێت.

پاشان هەتا ویست و ئیختیاری گەشە بکات ئەو ڕۆزی‌یە جوان و ئاسانەی وردە وردە لێ دەگیرێتەوە، تا بە تەواوەتی سەرچاوەکەی دەبڕێت و وشك دەکات و، ئنجا لە چەندین جێی ترەوە ڕۆزی‌یەکەی بۆ دەنێررێت. بەڵام لەبەر ئەوەی کە هێشتا توانا و ئیختیاری نەگەشتووەتە ئەو ڕادەیەی بتوانێت بۆ خۆی بە دوای ڕۆزی‌دا بگەڕێت، ئەوا ڕۆزیدەری بەخشندە "شەفەقەت" و "میهرەبانی"ی دایك و باوکی بۆ کردووە بە یارمەتیدەری ئیختیار و فریاگوزاری توانای ئەم منالە!

پاشان کاتێ توانا و ئیختیاری بە تەواوی پێ دەگات، ڕۆزی‌یەکەی بە دوای‌دا ڕاناکات و شوێنی ناکەوێت و وەك جاران بۆی ناهێنرێت، بەڵکو ڕادەوەستێت و پێی دەڵێت: "وەرە دوام بکەوە و بە شوێنمدا بگەڕێ"!

کەواتە "ڕۆزی" لە ڕێژەیەکی پێچەوانەدایە لەگەڵ "توانا و ئیختیار"ی مرۆڤدا، تەنانەت ئەو ئاژەڵانەی کە خاوەنی توانا و ئیختیار نین گەلێ باشتر دەژین لەوانی تر. وەك لە چەندین پەیامدا ڕوونمان کردووەتەوە.

◆ خاڵی دووهەم:

"ئیمکان" چەند بەش و جۆرێکی هەیە، کە بریتین لە: ئیمکانی عەقلی و، ئیمکانی عورفی و، ئیمکانی عادی.

جا ئەگەر هەر ڕووداوێك لە ناوەندی ئیمکانی عەقلی‌دا نەبێت ئەوا وەرناگیرێت و دەست بە ڕوویەوە دەنرێت. گەر لە ناوەندی ئیمکانی عورفیشدا نەبوو ئەوا دەبێت بە موعجیزە، بەڵام بە ئاسانی نابێت بە کەرامەت. خۆ ئەگەر نە بە عورف و نە بە قاعیدە هاووێنەی نەبوو، ئەوا وەرناگیرێت مەگەر بە بەڵگەیەکی گومانبڕی لە پلەی "شهوود"دا.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، ئەو حاڵەتە دەراسا و لە عادەت‌بەدەرانەی کە لە سەیید ئەحمەدی بەدەوی‌یەوە[1] - قُدس سِرُّهُ - ڕیوایەت دەکرێن و دەڵێن:

---

(١) سەیید ئەحمەدی بەدەوی (٥٩٦-٦٧٥هـ/١٢٠٠-١٢٧٦ز) ناوی ئەحمەدی کوڕی عەلیی کوڕی ئیبراهیمی حسەینی‌یە و، بە "ئەبولعەبباسی بەدەوی" ناوبانگی دەرکردووە. مرۆڤێکی زاهید بووە و لە وڵاتی

چـڵ ڕۆژی ڕەبـەق تـامی خـواردنی نەکـردووە، لـە نـاوەندی بازنـەی ئیمکـانی عـورفیدان و، بە کەرامەتێکی ئەو، بەڵکو بە عادەتێکی دەراسای ئەو دادەنرێن.

بەڵێ، چەند ڕیوایەتێکی موتەواتیر هەن کە دەگێڕنەوە: سەیید ئەحمەدی بەدەوی - قُدس سِرُّهُ - لە دەمی ئیستیغراقی ڕۆحانی‌دا چڵ ڕۆژ جارێك نانی دەخوارد. ئەم ڕووداوە لە ڕاستی‌دا ڕووی داوە، بەڵام هەمیشەیی نەبووە. بەڵکو هەندێ جار و بە وێنەی کەرامەت ڕووی داوە. لەوانەشە حاڵەتە ئیستیغراقی‌یەکەی ئەو پێویستی بە خۆراك نەبووبێت، بۆیە "بێ خۆراکی" سەبارەت بەو وەکو عادەتی لێ هاتووە.

گەلێ ڕووداوی زۆر و باوەڕ پێ کراوی تری وەك ئەم جۆرە کارە دەراسایە لە چەندین ئەولیای زۆری تری هاووێنەی سەیید ئەحمەدی بەدەوی‌یەوە - قُدس سِرُّهُ - ڕیوایەت کراون.

جا مادەم ڕۆزیی پاشەکەوت کراو لە چڵ ڕۆژ زیاتر بەردەوام دەبێت، وەك لە خاڵی یەکەمدا چەسپاندمان و، مادەم وازهێنانیش لە خواردن بە درێژایی ئەو ماوەیە بەپێی عادەت کارێکی مومکینە و، مادەم چەند ڕیوایەتێکی باوەڕپێ کراویش سەبارەت بەو حاڵەتانە لە کەسانێکی بەرزەوە ڕیوایەت کراون، ئەوا دەبێ هەرگیز ئینکاری نەکرێن.

✿ **پرسیاری دووهەم:**

وا بە بۆنەی ئەم پرسیارەوە دوو مەسەلەی گرنگ ڕوون دەکەینەوە.

کاتێ خاوەن زانستەکانی "جوگرافیا" و "گەردوونناسی" بە: یاسا کورت و ناتەواوەکان و دەستوورە بەرتەسك و تەرازووە بچووکەکانی ئەم زانستانە، نەیانتوانی بەرەو ئاسمانەکانی قورئانی پیرۆز بەرز ببنەوە و، هەر حەوت چینی واتای ئەستێرەی ئایەتە مەزنەکانی کەشف بکەن، بە گەوجی و گەلحۆیی‌یەوە دەستیان دایە پەلپ و ڕەخنەگرتن لە ئایەتە پیرۆزەکانی.

---

میسردا گەلێ بەناوبانگە. لە بنەڕەتدا خەڵکی وڵاتی مەغریبە و لە شاری "فاس" لە دایك بووە، پاشان بە وڵاتاندا گەڕاوە و، ماوەیەکیش لە مەککە و مەدینەدا ماوەتەوە و، سەردانی شام و عێراقی کردووە و، لە سەردەمی "ظاهر بیبرس"شای میسردا ڕۆشتووە بۆ میسر و لەوێ پادشا و هێزە سەربازی‌یەکەی ڕۆشتوون بۆ پێشوازیی و لە میوانخانەی تایبەتیی خۆی‌دا دایناوە. لە وڵاتی میسردا خەڵکانێکی زۆر شوێن تەریقەتەکەی کەوتوون، یەکێك لەوانە خودی "ظاهر شا" بووە. پاشان لە شاری تەنتا کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە. بڕوانە: "الأعلام"ی زەرکەلی ١/٧٥. (وەرگێڕ)

❖ یەکەم مەسەلەی گرنگ:

تایبەتە بەوەی کە زەوی وەکو ئاسمانەکان حەوت چینە.

ئەم مەسەلەیە لە پێش‌چاوی فەیلەسووفەکانی سەردەمی نوێدا وا دەردەکەوێت کە دارای هیچ حەقیقەتێك نەبێت و، زانستەکانیشیان لەبارەی زەوی و ئاسمانەکانەوە ئەمەیان پێ قبوولْ ناکرێت. بۆیە ئەم مەسەلەیە دەکەن بە بەهانە و بیانوو بۆ ڕەخنەگرتن لە ڕاستی‌یەکانی قورئان.

وا ئێمەش بە پوختی چەند ئاماژەیەك دەنووسین کە تایبەتن بەم مەسەلەیەوە:

*ئاماژەی یەکەم:*

یەکەم شت: دەبێ بزانرێت کە واتای ئایەت شتێکە و، دانە دانە و تاك تاکەکانی ئەو واتایە و ئەو جوزئییاتانەش کە ئەو واتایانە دەیانگرێتەوە شتێکی تری جیاوازە. جا ئەگەر یەك دانە لە دانە زۆرەکانی ئەو واتا گشتی‌یە لە ئارادا نەبوو ئەوا هەرگیز واتا هەمەکی و گشتی‌یەکە ئینکاری ناکرێت. لە کاتێکدا کە حەوت دانە و حەوت تاکی ئاشکرا و سەلمێنراوی دانە و تاکە زۆرەکانی واتای گشتی و هەمەکیی: "حەوت ئاسمان" و "حەوت زەوی" لە بەردەستدا هەیە.

دووهەم شت: ئەوەیە کە ئایەتی پیرۆزی: ﴿**اللهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَموات وَمِنَ الأَرْضِ مِثْلَهُنَّ**﴾ (الطلاق:١٢) بە ڕاشکاوی باس لەوە ناکات کە زەوی حەوت چینە. بەڵکو واتای ڕواڵەتی و ئاشکرای ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە زەویی دروست کردووە و بە وێنەی حەوت ئاسمانەکان کردوویەتی بە نیشتەجێی بەدیهاتووانی.

واتە ئایەتەکە نافەرموێت: زەویم بە حەوت چین دروست کردووە.

خۆ لەیەکچوون(مثلية)ی زەوی بۆ ئاسمانەکان لەم ئایەتەدا تەنها "تەشبیه" کردنیەتی بە ئاسمانەکان لە ڕووی ئەوەی کە هەردووکیان بەدیهاتووی خواوەندن و بەدیهاتووانی ئەویشیان تێدا نیشتەجێ‌یە.

*ئاماژەی دووهەم:*

"زەوی" هەرچەندەش لە چاو "ئاسمانەکان"دا یەکجار بچووك بێت، بەلام لەو ڕووەوە کە: لە حوکمی پیشانگا و مەلبەند و شوێنی ناودەرکردنی بەدیهاتووانی خوای

گەورەدایە، یەكاویەك و هاوتای ئاسمانە مەزنەكان دەردەچێت. چونكە زەوی وەكو دڵ و مەڵبەندی مەعنەویی ئاسمانەكان وایە، بە وێنەی دڵی مرۆڤ كە لەگەڵ جەستەی‌دا یەكاویەكە و هاوتایەتی..

ئنجا بۆیە لە ئایەتە پیرۆزەكانەوە ئەوەش وەرگیراوە كە: زەوی حەوت چینە. چونكە: هەر لە كۆنەوە زەوی بە تەرازوویەكی بچووك بەسەر حەوت هەرێمدا دابەش بووە..

پاشان زەوی بریتی‌یە لە حەوت كیشوەر كە بە كیشوەری: ئەورووپا و ئەفریقیا و ئۆقیانووسیا(ئوستراليا) و دوو ئاسیا و دوو ئەمریكا، ناسراون..

پاشان زەوی بەم ڕووەی ئێرەی و ڕووەكەی تری جیهانی نوێ، بریتی‌یە لە حەوت پارچە: خۆرهەڵات و، خۆرئاوا و، باكوور و، باشوور، لەگەڵ زەریاكاندا..

پاشان زەوی حەوت چینی جیاجیای پێكەوەلكاوە، هەر لە ناوجەرگە و مەڵبەند و ناوەڕاستەكەیەوە تا دەگاتە توێكڵی دەرەوەی، وەك لە زانستدا چەسپاوە..

پاشان زەوی خاوەنی حەوت توخمی بەناوبانگە كە بە حەوت چینەكان تەعبیر دەكرێن و حەفتا توخمی جوزئی و ساكاریان لەخۆ گرتووە لەوانەی كە بوون بە مایە و خولگەی ژیان..

پاشان حەوت چین و حەوت جیهان هەن كە پێكهاتوون لە: چوار توخمەكانی: (ئاو و هەوا و خاك و ئاگر) و سێ بەرهەمەكانی زەوی: كانزاكان و، ڕووەكەكان و، زیندەوەران..

پاشان بە شایەتیی كەسانێكی زۆری ئەهلی كەشف و خاوەن شهوود، حەوت جیهانەكانی زەوی چەسپاون، كە نیشتەجێی جیننی و عیفریت و شوێنی گەلێ بەدیهاتووی تری خاوەن هەست و ژیانن..

پاشان زەوی حەوت چینە، كە ئەمەش ئاماژەیە بۆ حەوت گۆی تری وەك گۆی زەویمان كە نیشتەجێ و خانە و لانەی چەندین زیندەوەر و خاوەن ژیانن. واتە كاتێ كە دەوترێت: زەوی حەوت چینە، ئاماژەیە بۆ بوونی حەوت گۆی تری زەوی.

بەم جۆرە، ئەم واتایانە لەم ئایەتانەوە وەرگیراون.

كەواتە بوونی: حەوت چینی زەوی لە حەوت جۆر چین و لە حەوت شكڵ و شێوەدا، دەچەسپێت. بەڵام واتای هەشتەم - كە دواهەمینیانە - لە ناوەندی ئەو حەوت واتایانەدا نی‌یە، بەڵكو لە ڕوویەكی ترەوە گرنگیی هەیە.

*ئاماژەی سێهەم:*

مادەم بەدیهێنەری دانا لە هیچ شتێکدا زیادەڕەوی ناکات و بە هەڕەمەکی و بێمەبەستی شتان بەدیناهێنێت و، بوونەوەرانیش لەبەر خاوەن هەستان بەدیهێنراون و کەماڵیان بەندە بەوانەوە، بەڵکو تەنها بە خاوەن هەستان ئاوەدان دەکرێنەوە، تاکو لە بێمەبەستی و هەڕەمەکیتی ڕزگاریان بکەن و..

مادەم خواوەندی بەتوانای شکۆمەند و خاوەن دانستی ڕەها: توخمی "هەوا" و چینەکانی "خاك" و جیهانی "ئاو" - وەك لە بەرچاودایە - بە چەندین زیندەوەری بێسنوور ئاوەدان دەکاتەوە و..

مادەم ئاو و هەوا ڕێ لە هاتوچۆی زیندەوەران ناگرن، هەروەك ماددە چڕەکانی چەشنی گڵ و ئاسنیش نابن بە بەربەست لە بەردەم هاتوچۆی کارەبا و تیشکی ڕۆنتکن(سینی)دا..

ئەوا دەبێ ئەو دانا خاوەن کەماڵ و کردگارە باقی‌یە، نە حەوت چینە گشتی‌یە پێکەوە لکاوەکانی زەوی و، نە ئەشکەوتەکانی و، نە گۆڕەپانە فراوانەکانی و، نە جیهانەکانی، بە چۆڵی و بەتاڵ نەهێڵێتەوە، هەر لە ناوجەرگە و مەڵبەندەکەیەوە، هەتا دەگاتە توێکڵەکەی، کە نیشتەجێ و خانە و لانەی ئێمەیە.

بێ هیچ گومانێك خواوەند ئەو جیهانانەی ئاوەدان کردووەتەوە و، بەدیهاتووی خاوەن هەستی ئەوتۆشی بۆ بەدیهێناون کە لەگەڵیاندا بگونجێن و کردوونی بە سەرنشینیان.

دەشبێ ئەم بەدیهاتووانە لە ڕەگەزی مەلائیکەت و ئەو ڕۆحانی‌یانە بن کە ڕەقترین و چڕترینی چینەکان سەبارەت بەوان وەك دەریا وایە بۆ ماسی و وەك هەوایش وایە بۆ باڵندەکان. تەنانەت داخوازی ئەوەیە کە ڕێژەی ئەو ئاگرە زەبەندە و سامناکەی ناوجەرگە و مەڵبەندی زەوی سەبارەت بەو بەدیهاتووە خاوەن هەستانەوە وەکو ڕێژەی گەرمیی خۆر وابێت سەبارەت بە ئێمەوە. خۆ مادەم ڕۆحانی‌یە خاوەن هەستەکان لە ڕووناکی بەدیهاتوون ئەوا ئاگر بۆ ئەوان وەکو ڕووناکی وایە.

*ئاماژەی چوارەم:*

لە "مەکتووبی هەژدەهەم"دا نموونەیەك هێنراوەتەوە بۆ ئەو شێوەکێشانەی کە لە بازنەی ژێری بەدەرن و ئەهلی کەشف سەبارەت بە لایەنە سەرسووڕهێنەکانی چینەکانی زەوی باسیان کردوون.

ئەمەی خوارەوە پوختەیە کە بۆ ئەو نموونەیەی کە لەوێ باس کراوە:

گۆی زەوی لە جیهانی بینراو(عالم الشهادة)دا تۆوێکە، کەچی لە جیهانی میسال و بەرزەخدا درەختێکی هێندە گەورەیە کە وەکو ئاسمانەکان وایە. جا بینینی ئەو چینەی گۆی زەوی کە لە لایەن ئەهلی کەشفەوە تایبەتە بە عیفریتەکانەوە، چینێکە بە ماوەی هەزار ساڵ مەزەندە کراوە، ئەم بینینەی ئەهلی کەشف هەرگیز لەم تۆوەی زەویدا نەبووە کە تایبەتە بە جیهانی بینراوەوە، بەڵکو بریتییە لە بینین و لێ دەرکەوتنی ئەو چین و لق و پەلانەی درەختی زەوی کە لە جیهانی میسالدا بڵاوبوونەتەوە و پەل و پۆیان هاویشتووە.

جا ئەگەر یەك چینی - بە ڕواڵەت بێ بایەخی - زەوی لە جیهانێکی تردا ئەم گرنگییە مەزنەی بەدەست هێنابێت، ئایا ئیتر بۆچی ناتوانرێت بوترێ: زەویش حەوت چینە بەرامبەر حەوت چینەکانی ئاسمان؟

کەواتە ئایەتە پیرۆزەکان بە ئیجازێکی پڕ لە ئیعجاز ئاماژە بۆ ئەو خاڵە ناوبراوانە دەکەن و مرۆڤیان لێ بە ئاگا دەهێنن، بەوەی کە: ئەم زەوییە تەواو بچووکە بە هاوشانی حەوت چینەکانی ئاسمان پێش‌چاو دەخەن.

❖ دووهەم مەسەلەی گرنگ:

**﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِن﴾** (الاسراء:٤٤) و **﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾** (البقرة:٢٩).

ئەم ئایەتانە و ئایەتە زۆرەکانی تری هاوچەشنیان، دەریدەخەن کە: ئاسمانەکان حەوت دانەن.

پێم باشە لێرەدا ئەو باسە بە پوختی و کورتی بهێنین کە لە تەفسیری "إشارات الإعجاز"دا باسمان کردووە، کە لە ساڵی یەکەمی جەنگی جیهانی و لە بەرەی جەنگدا نووسراوە، چونکە بەهۆی بارودۆخی جەنگەوە زۆر بە کورتی و پوختی نووسراوە:

حیکمەت(فەلسەفە)ی کۆن پێی وا بووە ئاسمانەکان نۆ دانەن و، "عەرش" و "کورسی"شی - کە لە شەرعدا باس کراون - خستووەتە سەر حەوت ئاسمانەکان! دیارە ئەمەش وێنەکێشانێکی سەیر بووە کە بۆ ئاسمانەکان کێشاویانە!

لـە ڕاسـتیدا دەسـتەواژە و زاراوە سـەرنج ڕاکێـش و خـــاوەن زەرق و برقــەکانی فەلسەفەی کۆن بۆ ماوەی چەندین سەردەمی دووروودرێژ بەسەر بیر و بۆچوونـی گـرۆی مرۆڤـدا زاڵ بوون، تەنانـەت گەلـێ کـەس لـە تەفسیر نووسـانیش ناچـاربوون ڕواڵـەتی ئایەتـەکان بـەرەو ڕێڕەوی ئەو فەیلەسووفانە لار بکەنەوە و لەگەڵیدا بیگونجێنـن، کـە ئەمەش تا ڕادەیەك بوو بەهۆی ئەوەی پەردە لەسەر ڕووی ئیعجازی قورئان دابدرێتەوە!

بـەڵام حیکمـەتی تـازە، کـە پێـی دەوترێـت فەلسـەفەی نـوێ، لـە وتەکانیـەوە وا دەردەکەوێت کە ئینکاریی ئاسمانەکان بکات، بەرامبەر بەوەی کـە فەلسـەفەی کـۆن پێـی وابوو ئاسمانەکان کوناودەر کردن و پێکەوە لکانیان لە باردا نییە. واتە ئەوانیش زیاد لـە پێویست لە مەسەلەکەدا ڕۆچووبـوون و، بە هـەردوولایان لـە ڕوونکردنەوەی ڕاستی و تەواوەتیی "حەقیقەت"دا دەستەوسان مان!

بـەڵام حیکمـەتی موقەددەسی قورئـانی پیرۆز خـۆی لـە قـەرەی ئـەو کـورت بینـی و زیادەڕەویەی هیچ کامیان نادات و، میانەڕەوی دەگرێتەبەر و، دەڵێت:

کردگاری شکۆمەند حەوت چینی ئاسمانی بەدیهێناوە و، ئەستێرە گەڕۆکەکانیش لە ئاسمـاندا سـەرگەرمی تەسبیحاتن و، بـە وێنـەی ماسیی نـاو دەریـاش لـەو ئاسمانانـەدا مەلـە دەکەن.

ئنجا لە فەرموودەی پیرۆزیشدا هاتووە کە: "السَّماءُ موجٌ مكفـــوف"[١] واتـە ئاسمـان وەك دەریایەك وایە کە شەپۆلەکانی هێمن بووبێتەوە.

وا زۆر بـە پوختـی لـە نـاوەندی حـەوت دەسـتووردا بـە حـەوت ڕووی واتاکـان، ئـەم ڕاستییە دەچەسپێنین:

*دەستووری یەکەم:*

لە زانست و فەلسەفەدا چەسپاوە کە فەزای فراوان خاڵی و چۆڵ نییە، بەڵکو پڕە لـە ماددەیەك کە پێی دەوترێت: "ئەثیر".

---

(١) جزء من حديث أخرجه الإمام أحمد في مسنده (٢/٣٧٠) والترمذي برقم (٣٢٩٨) وفي تحفة الأحـوذي برقم (٣٣٥٢) وقال: هذا حديث غريب من هذا الوجه. عزاه صاحب التحفة لأحمد وابن أبي حاتم والـبزار، وفي مجمع الزوائد (١٣٢/٨) جزء من حديث رواه الطبراني في الأوسط، وفيه أبو جعفر الرازي، وثقه أبو حاتم وغيره وضعّفه النسائي وغيره، وبقية رجاله ثقات. وانظر فيه (١٢١/٧) وتفسير ابن كثير سـورة الحديـد. (وەرگێڕ)

*دەستووری دووھەم:*

بە زانست و ژیری، بەڵکو بە بینینیش چەسپاوە کە: پەیوەندیدەری یاساکانی لەمەڕ تەن و قەبارە بەرزەکان (وەك: ھێزی کێشکەر و پاڵنەر).. ھەروەھا گوێزەرەوە و بڵاوکەرەوەی ئەو ھێزانەی کە لە ماددەدا ھەن (وەك ڕووناکی و گەرمی و کارەبا) ئەو شتەی کە ھەریەك لەم کارانە ڕادەپەڕێنێت - لە ڕاستیدا - ماددەیەکە لە فەزادا ھەیە و بۆشایی فەزای پڕکردووەتەوە.

*دەستووری سێھەم:*

بە تاقیکردنەوە چەسپاوە کە ماددەی ئەثیر لەگەڵ ئەوەشدا کە ھەر بە "ماددەی ئەثیر" دەمێنێتەوە، کەچی وەکو ماددەکانی تر چەند جۆر و شکڵ و شێوەیەکی جیاجیا لەخۆ دەگرێت. چونکە ھەروەك ھەر سێ شێوەی: "گازی و شلەمەنی و ڕەقی" لە تەنھا یەك ماددە دروست دەبێت، وەك: ھەڵم و سەھۆڵ و ئاو، بە ھەمان جۆر ژیری ھیچ ڕێگرێك نابینێت و ناڕەزاییشی لەوە نییە کە لە ماددەیەکی "ئەثیری" حەوت جۆر و چین ھەبێت.

*دەستووری چوارەم:*

گەر بە وردی سەیری تەن و قەبارە بەرزەکان بکرێت، جیاوازی لە نێوان چینەکانیدا دەبینرێت. چونکە ھەروەك ئەو چینەی ڕێی کاکێشانی تێدایە و وەکو پەڵەی ھەور دیارە، ھەرگیز لە چینی ئەستێرە چەسپیوەکان ناچێت. تەنانەت ئەستێرەکانی چینە نەچەسپیوەکان بە وێنەی میوەی ھاوین کامڵ و پێگەیشتوو دەردەکەون، کەچی گەلێ ئەستێرەی بێ سنووری ڕێی کاکێشان - کە وەك ھەور دەبینرێت - تازەکی پێکدێن و بەرەو پێگەیشتن و کامڵبوون دەڕۆن. ھەروەك بە "حەدس"[1] ێکی ڕاست دەزانرێت کە چینی ئەستێرە نەجووڵەکان لە "کۆمەڵەی خۆر" ناچێت.

بەم جۆرە، لە ڕێی حەدس و ھەستەوە، جیاوازیی نێوان حەوت کۆمەڵ و حەوت چینەکان ھەست پێ دەکرێت.

*دەستووری پێنجەم:*

بە حەدس و ھەست و بەدواداچوون و تاقیکردنەوە چەسپاوە کە: ھەرکات کاری پێکھاتن و ڕێکخستن لە ھەر ماددەیەکدا سەری ھەڵدا، ئەوا گەلێ بەدیھاتووی تری لێوە پەیدا دەبن کە چەند شێوە و چینێکی جیاجیا دەگرنە خۆیان..

---

(١) "حەدس" بریتییە لە: خێرایی زەینی مرۆڤ لە تێگەیشتندا. (وەرگێڕ)

بۆ نموونە:

هەر ئەوەندەی کانزای "ئەڵماس" دەست بە پێکهاتن دەکات و شکڵ و شێوە دەگرێتە خۆ، یەکسەر خۆڵەمێش و خەڵووز و ئەڵماسی لێوە پەیدا دەبێت. هەروەها کە ئاگر دروست دەبێت، پشکۆ و گڕ و دووکەڵی لێ جیا دەبێتەوە. هەروەها کە ئۆکسجین و هایدرۆجین تێکەڵ دەکرێن، بەفر و هەڵم و ئاوی لێ پەیدا دەبێت.

لەمەوە تێدەگەین کە هەرکات هەر ماددەیەك شکڵ و شێوەی گرتەخۆ، دەبێت بە چەند چین و نهۆمێك. لەبەر ئەوە، توانستی بەدیهێنەرانەی خواوەند کە دەستی بە پێکهێنانی ماددەی ئەثیر کرد و شکڵ و شێوەی پێ بەخشی، ئەوا حەوت جۆر ئاسمانی لە حەوت چینی جیاجیادا لێ دروست کرد، وەك لەم ئایەتەدا هاتووە کە دەفەرموێ:

**﴿فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمواتٍ﴾**.

*دەستووری شەشەم:*

ئەم نیشانانەی کە باس کران، بە پێویستی و بەداهەت، بەڵگەن لەسەر بوون و فرەیی ئاسمانەکان.

کەواتە مادەم هەواڵدەری ڕاستگۆ لەسەر زمانی قورئانەوە فەرموویەتی: ئاسمانەکان حەوتن، ئەوا ڕاستە حەوتن.

*دەستووری حەوتەم:*

دەستەواژەکانی: حەوت و، حەفتا و، حەوسەد و، هاچەشنیان، لە شێوازەکانی زمانی عەرەبیدا "زۆری" دەگەیەنن. دەکرێ ئەو حەوت چینە هەمەکییە گەلێ چینی زۆری تر لەخۆ بگرن.

**پوختەی قسە:**

خواوەندی بەتوانای شکۆمەند حەوت ئاسمانی چین چینی لە ماددەی ئەثیر بەدیهێناوە و، بە ڕێسایەکی سەرسووڕهێنی وردیش ڕێکیخستوون و ئەستێرەکانی تێدا ڕواندوون.

جا مادەم قورئانی پیرۆز گوفتارێکی ئەزەلییە و ئاراستەی سەرجەم چینەکانی گرۆی جینی و ئادەمیزاد کراوە، ئەوا هەموو چینێکی مرۆڤ بەشی خۆی لە هەموو ئایەتێکی قورئانی پیرۆز وەردەگرێت، هەروەك هەموو ئایەتێکیش تێگەیشتنی هەموو چینێکی خەڵکی تێر دەکات.

واته هـەموو ئایـەتێك چ بـە نـاوەکی(ضمـــنی) و چ بـە ئامـاژە بۆکـردن گەلـێ واتـای جۆراوجۆری زۆریان لەخۆ گرتووە.

بەڵێ، فراوانیـی گوفتـاری قورئـان و.. شموول و هەمەلایەنیی واتـا و ئاماژەکـانی و.. ڕەچاو کردنی بۆ پلەکانی تێگەیشتن و پەی پێبردن و هەست و نەستی هەموو چینەکان، هەر لە نزمترین عەوامەوە تا دەگاتە تایبەتترین کەسی چینی تایبەتمەند.. دەریدەخـات کـە هـەموو یـەکێك لـە ئایەتـەکانی قورئـان ڕوویـەکی تایبـــەتیی هەیـە دەڕوانێتـە گشـت چینەکانی خەڵکی.

بۆیە حەوت چینی مرۆڤ، لە ناوەندی واتا هەمەکییەکەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿**سـبع سموات**﴾دا بەم جۆرەی خوارەوە لە حەوت چینی واتا جیاجیاکانی تێگەیشتوون:

کەسانی کورت بین و بیر تەسك وا تێدەگەن کە: ئـەو حـەوت ئاسمانە بریتین لـە چینەکانی هەوای نەسیمی..

ئەوانەش کە بە زانستی گەردوونناسی لە خۆیان بایی بوون، وای لـێ تێدەگەن کـە: بریتـی بـن لـەو حـەوت ئەسـتێرانەی کـە لای خـەڵکی بــە هەسـارە گەڕۆکــەکان و خولگەکانیان ناسراون.

کەسانی واش هـەن کـە واتێدەگەن: ئـەم ئاسمانانە بریتـی بن لـە چـەند گۆیـەك لـەناو ئاسماندا بە وێنەی ئەم گۆی زەوییەمان کە مەڵبەندی زیندەوەرانە.

چینێکـی تـری خـەڵکیش وای لـێ تێدەگـات کـە: حـەوت کۆمەڵـەی خـۆر هـەبن یەکەمیان ئەمـەی خۆمـان بێـت و، کۆمەڵــەی خۆریـش بەسـەر حـەوت چینـدا دابـەش بوو بێت.

توێژێکی تری خەڵك وایان لـێ تێدەگـات کـە: پێکـهاتنی شـێوەکانی مـاددەی ئـەثیر بەسەر حەوت چیندا دابەش بوو بێت.

توێژێکی تێگەیشتووتر وا تێدەگات کە: سەرجەمی ئەو ئاسمانانەی بە چاو دەبیـنرێن و بـە ئەسـتێرەکان ڕازاونەتـەوە تەنـها یـەك ئاسمانـە، کـە بریتییـە لـە "ئاسمـانی دنیـا" و شـەش ئاسمانی تری نەبینراوی لە سەرەوەیە.

توێژێکی بەرزی خەڵکی، کە چینی حەوتەمی خاوەن پەی بـردن و تێگەیشـتنی بـەرز و بڵندن، پێیان وایە کە: حەوت ئاسمانەکان تەنها لەم جیهانی بینراو(عالم الشهادة)ەدا نـین،

بەڵکو حەوت ئاسمانن کە بوون بە بنمیچ و دەورەدەر بە جیهانە قیامەتی و غەیبی و دنیایی و میسالییەکاندا.

بەم جۆرە و لە نێوان هەمەکێتیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا، گەلێ واتای جوزئیی زۆری تر هەن کە لەم حەوت چینی واتا ناوبراوانە دەچن و تێگەیشتنی حەوت چین و توێژی خەڵکی ڕەچاو دەکەن. کەواتە هەرکەسە و بە ئەندازەی توانا و لێهاتنی خۆی، لە ڕێژنەی قورئان بەهرەمەند دەبێت و، لەسەر ئەو سفرە ئاسمانییە دەوڵەمەندە ڕۆزیی خۆی هەڵدەگرێت.

جا مادەم ئەم ئایەتە پیرۆزە تا ئەم ڕادەیە واتای تەسدیق کراوی لەخۆ گرتووە، ئەوا ئینکاریی فەیلەسووفە لە ژێری بێ بەشەکانی ئێستا و ملنەدانی گەردوو ناسە مەستەکان بۆ بوونی ئەو ئاسمانانە و، پاشان بەکارهێنانی ئینکاریی ئەوانە - وەك داردەستێك - بۆ بەهانە دۆزینەوە و ڕەخنەگرتن لەم چەشنە ئایەتە پیرۆزانە، لە ڕاستیدا وەك هەوڵی منالی نەفام و لاسار وایە کە بەرد بۆ ئەستێرە بەرزەکان دەهاوێت بەو نیازەی یەکێکیان بخاتە خوارەوە!

چونکە: ئەگەر تەنها یەك واتای نێوان واتا زۆر و زەبەندەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاست بێت، ئەوا واتا هەمەکییەکەشی ڕاست و دروست دەبێت. تەنانەت گەر واتایەك هەبێت لە واقیعدا وجوودی نەبێت بەڵام تەنها لەسەر زمانی خەڵکیدا دارای وجوود بێت، دروستە بچێتە ناو ئەو واتا هەمەکییە، لەبەر چاودێری کردنی بیر و بۆچوونی گشتی. کەچی خۆ ئێمە بەشێکی زۆری دانە دانەکانی ئەو واتا گشتییە، لە حەقیقەتدا بە ڕاستی و دروستی دەبینین.

ئایا نابینیت ئەوانەی کە مەستیی "جوگرافیا" و "گەردوونناسی" وڕی کردوون و ویژدانیان بەکارناهێنن چۆن دەکەونە هەڵەوە و، چاویان لەو واتا هەمەکییە دەنووقێنن کە حەق و ڕاست و ڕەوایە و، دیاردە سەلمێنەرە یەکجار زۆرەکانی ئایەتەکە نابینن و، لەو وەهمەدان کە واتای ئایەتەکە ترنجابێتە یەك واتای ئەندێشەیی سەیرەوە! ئیتر ئەو ئایەتە پیرۆزانەیان دایە بەر بەرد. بەڵام بەردەکان کە گەڕانەوە سەری خۆیانی شکاند و، لە تاوا ژیری و ئیمانی خۆیانیان لە دەست دا!

**پوختەی ئەمانەی باس کران:**

کاتێ کە خاوەن بیروباوەڕە ماددی‌یە ئیلحادی‌یەکان، بە وێنەی شەیتان و جینێی‌یەکان، نەیانتوانی بۆ حەوت چینەکانی ئەو قورئانە پیرۆزە بەرز ببنەوە کە: لەسەر حەوت قیرائەت و بە حەوت ڕوو و حەوت موعجیزە و حەوت حەقیقەت و حەوت پایە نازڵ بووە، ئەوا لە واتاکانی ئایەتەکان تێ نەگەیشتن و، لە ئەنجامدا هەندێ حوکمی هەڵە و درۆیان لەبارەیەوە دەرکرد..

بۆیە بەم لێکۆڵینەوە زانستی‌یە ناوبراوانە، تیرەستێرە(شهاب)یەکی ئامادە لە ناوەندی ئەستێرەکانی ئەو ئایەتانەوە دادەبەزێتە سەریان و دەیانسووتێنێت!

بەڵێ، هەرگیز ناگونجێ بە فەلسەفەی ئەو فەیلەسووفانەی کە بیری شەیتان و هزری چەپەڵیان هەڵگرتووە، مرۆڤ بۆ ئەو ئاسمانە قورئانی‌یانە بفڕێت و بەرز ببێتەوە، بەڵکو تەنها بە میعراجی حیکمەتی ڕاستەقینە دەتوانێت بەرەو ئەستێرەی ئەو ئایەتانە بەرز ببێتەوە و، بە دوو باڵی ئیمان و ئیسلامیش دەتوانێت بۆ لایان بفڕێت.

اللهم صل على شمس سماء الرسالة وقمر فلك النبوة وعلى آله وصحبه نجوم الهدى لمن اهتدى.

﴿سُبحَانَكَ لا عِلمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنكَ أَنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

اللهم يارب السموات والأرضين زيّن قلوب كاتب هذه الرسالة ورفقائه بنجوم حقائق القرآن والإيمان... آمين.

# بریسکەی سیازدەهەم

حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان

تایبەتە بە حیکمەتی: "أعوذ بالله من الشیطان الرجیم"ەوە

**﴿وَقُل رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ❀ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾**

(المؤمنون:٩٧-٩٨)

**(ئەم باسە تایبەتە بە حیکمەتی خۆپەنادان بە خوای گەورە لە شەڕی شەیتان. وا بە کورتی سیازدە ئاماژە لەم بارەیەوە دەنووسرێت. چونکە لە "وتەی بیست و شەشەم" و شوێنە جیاجیاکانی تری پەیامەکاندا هەندێکی تر ڕوون کراونەتەوە)**

**❀ ئاماژەی یەکەم**

**پرسیار:**

ئایا چ نهێنییەك لەوەدا هەیە کە لە هەموو کاتێکدا ئەهلی حەق (واتە ئەهلی ئیمان) لەتاو شەڕی شەیتان پەنا بۆ لای خوای خۆیان دەبەن، لە کاتێکدا شەیتانەکان لەم بوونەوەرەدا هیچ دەستێکیان لە کاروباری بەدیهێنان و دروستکردندا نییە؟

ئایا دانایییەك لەوەدا هەیە کە زۆربەی جار کۆمەڵ و پێڕی شەیتان سەرکەوتوون، لەکاتێکدا کە خوای گەورە بە میهرەبانی و چاودێریی خۆی پشتگیر و یارمەتیدەری ئەهلی حەق و ئیمانە؟ ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو جوانییەی لە "حەق"دایە، شەوق و ورە و هێز بە ڕێڕەوانی دەدات، بە پێچەوانەی گومراییەوە، کە شتێکی نەفرین لێکراوە و هەردەم دوورەپەرێزیی لێ دەکرێت؟

**وەڵام:**

نهێنی و دانایی ئەو دیاردەیە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"گومڕایی" و "شەڕ" زۆربەی جار: "نەبوو" و سەلبی و نارەسەنن. چونکە بریتین لە تێکدان و کاولکاری. بەڵام زۆربەی "هیدایەت" و "خێر" ڕەسەن و ئیجابی و خاوەنی "بوون"ن و، بریتین لە ئاوەدانکردنەوە و بنیاتنان. خۆ شتێکی ئاشکرایشە کە تەنها یەك کەس دەتوانێت کردو کۆششی بیست کەس کە لە بیست ڕۆژدا کردبێتیان، ئەو بە تەنیا خۆی لە تەنها یەك ڕۆژدا بیڕووخێنێت!

هەروەها تاکو ئەندامە سەرەکی‌یەکانی مرۆڤ مەرجەکانی ژیانیان تێدا مابێت، ئەوا ئەو مرۆڤە لە ژیاندا دەمێنێت و ژیانی بەردەوام دەبێت، کە ئەمەش کارێکە تایبەتە بە توانستی خوای گەورەی بەدەستەڵاتەوە. بەڵام گەر کەسێکی ستەمکار ئەندامێکی سەرەکیی ببڕێت، ئەوا مردن - کە لەچاو ژیاندا لەناوچوون و نەبوونە - ڕووبەڕووی ئەو مرۆڤە دەبێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەو وتەیەی کە دەڵێت: "کاولکاری ئاسانە" لەناو خەڵکیدا بڵاو بووەتەوە و لەسەر زمانیانە.

کەواتە نهێنیی سەرکەوتنی گومڕایانی هەرەلاواز بەسەر ئەهلی حەقی هەرە بەهێزدا، ئەمەیە کە باسمان کرد.

بەڵام ئەهلی حەق و ئیمانیش قەڵایەکی مەحکەمی وایان هەیە کە هەرکات پەنای پێ ببەن و خۆیانی تێدا بپارێزن، ئەوا هیچ کام لەو دوژمنە سامناکانە پرکێشی ناکەن لێیان نزیك ببنەوە و، ناتوانن هیچ زیانێکیان پێ بگەیەنن. خۆ ئەگەر بە جۆرێکی کاتیش زام و زیانێکیان لە گومڕایانەوە پێ بگات، ئەوا دەستکەوت و پاداشتی هەمیشەیی ئەم مزگێنی‌یەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الأعراف:١٢٨)[1] هەموو شوێنەوارێکی زام و زیانەکانیان لا دەبات و سارێژیان دەکات.

ئەو قەڵا مەحکەم و قایمەش بریتی‌یە لە: شەریعەتی خوای گەورە و سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ.

### ❀ ئاماژەی دووهەم

ئەم پرسیارە زۆر کەس دەیکات و بە ئەندێشەی زۆر کەسی تریشدا دێت، کە دەڵێت:

---

(١) واتە: ئەنجام و پاشەڕۆژ تەنها هی ئەوانەیە کە لەبەر خوای گەورە خۆیان لە تاوان و گوناه دەپارێزن. (وەرگێڕ)

دروستکردنی شەیتانەکان - کە سەرتاپا شەڕ و خراپەی بێ گومانن - هەروەها زاڵکردنیان بەسەر ئەهلی ئیماندا و، ڕۆشتنی بەشێکی زۆری خەڵکی بەهۆی فڕوفێڵی شەیتانەکانەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.. ئەمە بە ئاشکرا کارێکی ناشیرین و ترسێنەرە. جا ئایا بەزەیی و جوانیی خواوەندی خاوەن جوانی و میهرەبانیی فراوان، چۆن بەم کارە زۆر ناشیرین و موسیبەتە گەورەیە ڕازی دەبێت؟

**وەڵام:**

سەرەڕای ئەو شەڕ و خراپکاری‌یە لاواز و هەندەکی‌یانەی کە لە "بوون"ی شەیتانەکاندا هەن، چەندین ئامانجی خێر و چاکەخوازیش هەن، کە چەند پلەیەك مرۆڤ بە پلەکانی کەماڵاتدا سەردەخەن و بەرزی دەکەنەوە.

بەڵێ، هەروەك لە نێوان "تۆو" و "درەخت"دا چەند پلەیەکی زۆر هەیە، بە هەمان جۆر، ئەو لێهاتن و ئامادەیی‌یە سروشتی‌یانەش کە لە ماهییەتی مرۆڤدان، ئەوەندە پلەیان هەیە کە زۆر لە هی نێوان تۆو و درەختەکە زیاترن، بەڵکو ئەو پلانە دەگەنە ئەندازەی پلەکانی نێوان "گەردیلە" و "خۆر".

جا بۆ ئەوەی ئەو لێهاتن و ئامادەیی‌یانەی مرۆڤ دەربکەون و بڵاو ببنەوە، پێویستیان بە بزواندن و ڕاتەکاندن دەبێت، بزواندن و ڕاتەکاندنی ئەم بەرزبوونەوە و گەشەکردنەش لەو مامەڵەیەدا، بە بێ بوونی شەیتانەکان و شتانی زیانبەخش و موجاهەدە کردنیان، پەیدا نابێت. چونکە گەر ئەو موجاهەدە و بەرەنگاری‌یە نەبوایە پلەی مرۆڤ - وەکو پلەی مەلائیکەت - لە جێی خۆی‌دا قەتیس دەما و، پاشان ئەو نموونە بەرزانەی جۆر و ڕەگەزی مرۆڤ، کە هەریەکەیان لە حوکمی هەزاران دانەی ڕەگەز و جۆرەکانی تری بەدیهاتوواندان، هەرگیز دروست نەدەبوون.

جا لەبەر ئەوەی وازهێنان لە فەڕ و خێرێکی زۆر و هەمەکی لە پێناوی خۆپاراستندا لە شەڕ و خراپەیەکی جوزئی و کەم هەرگیز بە دانایی و دادگەری دانانرێت، ئەوا لادان و هەڵخلیسکانی هەندێ کەس بەهۆی شوێنکەوتنی شەیتانەوە، بایەخ و گرنگی‌یەکی ئەوتۆی نی‌یە، چونکە گرنگی و هەڵسەنگاندن، مەگەر بە دەگمەن، دەنا هەمیشە بەپێی "چۆنێتی" دەبێت نەك "چەندایەتی". تەنانەت کاتی وا هەیە کە هەر ئاوڕ بە لای "چەندایەتی"دا نادرێتەوە!

بۆ نموونە: کەسێك هەزار و دە دەنکە تۆوی لە لا بوو. پاشان هەموویانی لەناو خاکدا چاند و وازی لێ هێنان تا کارلێکە کیمیاییەکان کاری خۆیانی تێدا ئەنجام بدەن. جا ئەگەر تەنها (دە) دانەیان سەوزبوون و بەریان گرت، ئەوا بێ گومان ئەو بەروبوومەی کە لەم دە دانەیەوە دەستی دەکەوێت زۆر زیاتر دەبێت لەو هەزار دانەیەی کە لەناو خاکدا ڕزاون و بەریان نەگرتووە و، ئەم بەرهەمە جێی ئەوانی تری بۆ گرتووەتەوە.

هەر بەم جۆرەش، ئەو پلە و سوود و بایەخ و گرنگییەی کە مرۆڤایەتی لە (دە) کەسی کامڵەوە دەستی کەوتووە، لەوانەی کە لە ئاسمانی مرۆڤایەتیدا وەك ئەستێرە دەدرەوشێنەوە و، ڕێگایان بۆ گرۆی مرۆڤ ڕووناك کردووەتەوە و، بە موجاهەدە کردنیان لەگەڵ نەفس و شەیتاندا، لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکیی ئیمان دەربازیان کردوون.. ئەو پلە و سوود و بایەخ و گرنگییەی کە مرۆڤایەتی لە دە کەسی وەك ئەوانەوە دەستی کەوتووە، سەرجەمی ئەو زیانە زۆرانە دەشواتەوە کە ئەنجامی زۆریی ئەو کەسانەیە ڕۆشتوونەتە ڕیزی گومڕایان و ڕێی کوفر و لە خوا دووریيان گرتووەتە بەر و، لە بێ‌نرخی و نزمیاندا وەك مەگەز و مێروو تەماشا دەکرێن.

لەبەر ئەم ڕاستییە، دادگەری و دانایی و میهرەبانیی خواوەندی پەروەردگار بە "بوون" و "زاڵبوون"ی شەیتانەکان ڕازی بوون و، هێشتوویانە ببن و دەستەڵات پەیدا بکەن.

کەواتە ئەی ئەهلی ئیمان! باشترین زرێ و قەڵغانێك کە لە بەرەنگاری بوونەوەی ئەو دوژمنانەدا بەکاری بهێنن، تەنها ئەو تەقوا و پەرستشەیە کە لە باخچەی قورئانی پیرۆزدا بەری گرتبێت و لەو درەختەوە پێ گەیشتبێت. سەنگەری مەحکەم و قایمیشتان ڕێباز و ڕێڕەوی پێغەمبەرتانە ﷺ، چەکیشتان تەنها خۆپاراستنە بە خوای گەورە لە شەڕی شەیتان و، داوای لێبووردن کردنە لەو خوایە و پەنابردنە تەنها بۆ لای ئەو، تاکو لە شەڕ و خراپەی ئەو دوژمنانە بتانپارێزێت.

❀ **ئاماژەی سێ‌هەم**

**پرسیار:**

ئایا چ نهێنی و داناییەك لە هەڕەشەی ترسێنەری قورئانی پیرۆزدا هەیە کە لەگەڵ گومڕایاندا و لە بەرامبەر کردەوە هەندەکییەکانیانەوە بەکاری دەهێنێت، کە ئەمەش بە ڕواڵەتی عەقڵ لەگەڵ ئەو بەلاغەتەی قورئانی پیرۆزدا ناگونجێ، کە دادگەری و

گوبجاویی یێوە دیارە و خاوەنی شێوازێکی سەرتاپا ئیعجازە. چونکە هەرکات سەیری ئەو هەڕەشانە دەکرێت، مرۆڤ وا هەست دەکات کە قورئان چەندین سوپای گەورە و گرنگ لە بەرامبەر تەنیا کەسێکی بێدەستەلاتی بێبەش لە هەموو موڵکێکی دنیا، ئامادە دەکات و، لە پلەی هاوبەشێك دایدەنێت کە لە سنووری خۆی دەرچووبێت؟

**وەلام:**

نهێنی و دانایی ئەو هەڕەشەیە لەوەدایە کە: شەیتانەکان و شوێنکەوتووانیان دەتوانن تەنها بە جموجوولێکی ئاسایی و کەم و بچووك گەورەترین کرداری ڕووخاندن و کاولکاری ئەنجام بدەن! چونکە لەبەر ئەوەی ڕێی گومڕاییان گرتووەتەبەر، ئەوا بە کردارێکی بچووك چەندین زیانی گەورە بە مافی زۆر کەسانی تر دەگەیەنن.

ئەوان لەم کردارەیاندا وەك ئەو پیاوە وان کە سواری کەشتییەکی پڕ لە سەرنشینی پادشا بوو، ئنجا کونێکی بچووکی کردە کەشتییەکە، یان ئەرکێکی سەرشانی خۆی بەجێ نەهێنا کە دەبوو بەجێی بهێنایە. بەم کردارەش هەوڵ و کۆششی هەموو سەرنشینانی کەشتییەکەی بە فیڕۆ دا و، لە بەرهەمی ڕەنج و تەقالایان بێبەشی کردن و، کرداری هەموو ئەوانەشی بێ ئەنجام هێشتەوە کە پەیوەندییان بەو کەشتییەوە بووبێت.

دیارە پادشای خاوەنی کەشتی، لەبەر ئەوەی کە بەرپرسی هاوولاتیانیەتی، بە ناوی سەرنشینانی کەشتی و زیان لێکەوتووانەوە، هەڕەشەی توندوتیژی لێ دەکات و بە حەتمیش تۆڵەی لێ دەسێنێت. ئەمەش نەك لەبەر ئەو کردارە هەندەکییە، یان لەبەر بەجێنەهێنانی ئەو ئەرك و واجبە کەمە، یان لەبەر دەستدرێژی کردنی بۆ سەر موڵکی پادشا، بەڵکو لەبەر ئەو ئاکام و ئەنجامە زیانبەخشە زۆرانەی کە لەو کردارە بچووکە یان لەو پشتگوێ خستنی ئەرکەوە پەیدا بوون و، لەبەر دەستدرێژی کردنی بۆ سەر مافی گشت هاوولاتیان.

هەر بەم جۆرەش، هاودەم لەگەڵ باوەڕدارانی ناو ئەم کەشتییەی زەویدا چەندین کەسی گومڕا لە پیڕی شەیتان هەن، لەوانەی کە گاڵتە بە ئەنجامی کارمەندییە پڕ لە دانستەکانی ئەم بوونەوەرە جوانانە دەکەن، تەنانەت بە بێئەنجام و بێهوودەشی دەزانن. بەم کردارەشیان لە نرخ و بەهای هەموو ئەو بوونەوەرانە دادەگرن.

ئەم تاوان و سەرپێچی کردنەی ئەوان، کە لە ڕواڵەتدا بە کارێکی هەندەکی و کەم دیارە، لە ڕاستیدا بە دەستدرێژی دادەنرێت بۆ سەر مافی هەموو بوونەوەران.

هەر لەبەر ئەوەشە کە خواوەندی گەورە و پادشای ئەزەل و ئەبەد، ئەو هەموو هەڕەشە سامناکانە ئاراستەی ئەو کردارە کاولکاری‌یانەی گومڕایان دەکات. ئەمەش لە ڕاستیدا کاکڵەی ئەو گونجاوی‌یە تەواوەی شێوازی قورئانی پیرۆز و، دانایی‌یە بەرز و بێ گەردەکەیەتی کە لە ناوەڕۆك و گیانی ڕەوانبێژیدایە و، بریتی‌یە لە: یەکاویەك دەرچوونی گوفتار لەگەڵ داخوازیی حاڵ و مەقامدا. ئەم دانستە بەرزەی قورئانی پیرۆز تابلێیت لەو "موبالەغە"یەوە دوورە کە بریتی‌یە لە زیادەڕەوی لە گوفتاردا.

دەبێ ئەو کەسە چەندە زەرەرمەند بێت، کە بە قەڵایەکی قایمی پۆڵایین خۆی لەدەست ئەو دوژمنانە نەپارێزێت، کە تەنها بە یەك کرداری هەندەکی‌یان ڕووخاندن و کاولکاری‌یەکی گەورە و سامناك بەرپا دەکەن؟

دەسا ئەی ئەهلی ئیمان!

ئێوە ئەو قەڵا مەحکەم و سەنگەرە قایمە ئاسمانی‌یەتان لە بەردەمدایە، کە قورئانی پیرۆزە. دەسا فەرموون ئێوە و ئەو قەڵایە، خۆتانی پێ دەرباز بکەن.

### ❀ ئاماژەی چوارەم

هەموو زانا لێکۆڵەرەکان و ئەهلی کەشف لەوەدا یەکیان گرتووە کە نەبوون(العدم) سەرتاپا شەڕی ڕووت و ئاشکرایە و.. بوونیش(الوجود) خێر و چاکەی بێ گومانە.

بەڵێ، زۆربەی (خێر و چاکە و جوانکاری و کەماڵاتەکان) پشت بە "بوون" دەبەستن و بۆ "بوون" دەگەڕێنەوە. کەواتە بناغەکانیان وجوودی و ئیجابین، واتە: بکەر و ڕەسەنن، با لە ڕواڵەتیشدا سەلبی و نەبوو دەربکەون.

هەروەها بناغەی شەڕ و گومڕایی و گوناه و بەڵا و گیروگرفت و هاوچەشنەکانیان، "نەبوون" و "سەلبی‌یەت"ە و، ئەو خراپی و ناشیرینی‌یەش کە تیایاندایە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونیان، با لە ڕواڵەتیشدا بە ئیجابی و وجودی دەربکەون. چونکە بناغەکەیان لە نەفی و نەبوون پێکهاتووە، واتە: بە بێ هیچ بناغە و کردارێکی ئیجابین.

بەڵێ، "بوون"ی هەر خانوویەك ـ وەك لە بەرچاودایە ـ بە بوونی گشت بەشەکانی دەبێت. بەڵام "نەبوون" و ڕووخانی ئەو خانووە بە نەبوون و ڕووخاندنی تەنها یەکێك لە هەل و مەرج و گۆشە و پایەکانی ڕوو دەدات.

واتە "بوون" پێویستی بە"هۆکار"ێك دەبێت کە بیهێنێتەدی و، دەبێ پاڵ بە هۆیەکی ڕاستەقینەوە بدات. بەڵام "نەبوون" دەتوانێت پشت بە شتێکی نەبوو ببەستێت و ئەو شتە نەبووە ببێت بە هۆکاری نەبوون.

ئێستا لەسەر بناغەی ئەم دوو دەستوورە دەتوانین بڵێین:

شەیتانەکانی جینی و ئادەمیزاد بە ئەندازەی تەنها یەك دانە گەردیلەش لە کاروباری دروستکردن و بەدیهێناندا بەشدار نین و هیچ بەشێکیان لە موڵکی خوادا نی‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین شوێنەواری سامناك و جۆراوجۆری کوفر و گومڕایی و خراپکاری‌یان لێ پەیدا دەبێت و، کاولکاریی گەلێ گەورەیان لەسەر دەست ڕوو دەدات، چونکە ئەو چەشنە کارانەی کە ئەوان ئەنجامی دەدەن، بەهۆی هێز و توانای خۆیانەوە نی‌یە و هیچ هێز و توانایەکی تێدا ناخەنە کار، بەڵکو زۆربەی هەڵسوکەوتەکانیان کردار و هێزی ڕاستەقینەی تێدا نی‌یە، چونکە ئەو کردارانە بە "ئەنجام نەدانی کارێك" یان "پەکخستنی" یان بە "ڕێ گرتن لە کردەوەیەکی چاك" پەیدا دەبن. کەواتە تەنها بەجێ نەهێنانی کرداری خێر و چاکە لە لایەن ئەوانەوە، خۆی لە خۆیدا "شەڕ" بەرهەم دەهێنێت و، بەو جۆرە خراپکاری‌یەکان پەیدا دەبن!

جا لەبەر ئەوەی خراپکاری‌یەکان - لە ڕاستیدا - بریتین لە ڕووخاندن و کاولکاری، ئەوا پێویست ناکات هۆکاری پەیدابوونیان شتێکی بکەر و ئیجابی یان هێزێکی داهێنەر بێت، چونکە دەتوانرێت گەورەترین کاولکاری بە شتێکی "نەبوو" یاخود بە "تێکدانی مەرجێك" ئەنجام بدرێت.

لەبەر ڕوون نەبوونی ئەم نهێنی‌یە لە لای مەجووسەکان، پێیان وابووە کە بەدیهێنەرێك بۆ چاکەکاری هەیە بە ناوی "یەزدان"ەوە و، یەکێکی تریش بۆ خراپکاری هەیە بە ناوی "ئەهریمەن"ەوە. کەچی لە ڕاستیدا ئەم خوا خەیاڵی‌یە جگە لە شەیتان هیچی تر نی‌یە، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی خراپکاری‌یەکان! ئەویش بەهۆی "جوزئی ئیختیاریی ویستی مرۆڤ"ەوە، کە خوای گەورە بەخشیویەتی، هەروەها بەهۆی بەدەستهێنان(الكسب)ەوە، نەك بەدیهێنان(الإيجاد).

دەسا ئەی ئەهلی ئیمان!

بەکارترین چەك کە لە دژی ئەم هەوڵە ڕووخێنەرەی شەیتانەکان بەکاری بهێنن و، گرنگترین هۆ بۆ بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە (لە بەرامبەر کاولکاری‌یەکانی شەیتانەوە)

بریتی‌یە لە: داوای لێبوردن(الإستغفار) و پەنابردن بۆ خوای گەورە، بە وتنی: "أعوذُ بالله..." . ئەوەش بزانن کە ئەو قەڵایەی دەبێتە دالدە و حەشارگەتان، بریتی‌یە لە سوننەت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەرتان ﷺ.

## ❀ ئاماژەی پێنجەم

سەرەڕای زۆریی هۆکارەکانی هیدایەت و ڕێنمایی کە لە بەردەم ئەهلی ئیماندان و، خوای گەورەش لە کتێبە پیرۆز و بەرزەکانی خۆیدا - بە گشتی - پاداشتی نیعمەتی بەهەشت و سزای ئاگری دۆزەخی بۆ باس کردوون و.. لەگەڵ ئەو بێدارکردنەوە و هاندان و ئاگاداری‌یانەشدا کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دووپاتی کردوونەتەوە.. سەرەڕای ئەوە و لەگەڵ ئەمانەشدا، دەبینیت ئەهلی ئیمان لە بەردەم فرو فێڵ و پیلانە لاواز و کەم نرخەکانی شەیتاندا ژێردەست دەبن و شکست دەهێنن!!

ئەم دیاردەیە، بەشێکی زۆری بیرکردنەوەی منی گرتبوو. چونکە ئایا چۆن مرۆڤی ئیماندار بایەخ بەو هەڕەشە ترسێنەرانەی خواوەندی پەروەردگاری جیهانیان نادات؟ ئایا چۆن ئیمانی لە دەست دەرناچێت کاتێ کە شوێن پێی شەیتان هەڵدەگرێت و دەکەوێتە داوی فێڵی لاوازی شەیتانەوە: ﴿إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾؟ (النساء:٧٦)[1]. بەڵکو لەوەش سەیرترم بە چاوی خۆم دی، ئەوەبوو یەکێك لە هاوەڵە نزیکەکانم، دوای ئەوەی سەد دانە وانەی لە بابەت ڕاستی‌یەکانی ئیمان لێ بیستم و بە دڵ باوەڕی پێ کردن و، سەرباری پەیوەندیی بەتین و توندوتۆڵیشی لەگەڵمدا و، باوەڕی باشی پێم، کەچی لە دوای هەموو ئەمانە، ئەو برادەرە نزیکە، بە مەدحێکی کەم نرخی سەر لێ‌شێواوێکی دڵ مردوو، لە خشتە برا و ڕووی کردە ئەو! بەم جۆرە ئەو هاوەڵەم ڕۆشتە ڕیزی دوژمنەکانمەوە. منیش لە دڵی خۆمدا وتم:

(سبحان الله! ئایا دەگونجێ مرۆڤ بکەوێتە پلەی ئاوا نزمەوە؟ ئەم پیاوە لە ناوەڕۆکدا چەندە بێ‌نرخ بووە)؟!

بەم جۆرە، خۆم بە غەیبەتی ئەو هەژارە گوناهبار کرد!

پاشان ڕاستی‌یەکانی ئاماژەکانی پێشووم لێ دەرکەوتن و، گەلێ لایەنی تاریك و تەماوی‌یان بەو نوورانە بۆ ڕووناك کردمەوە و، ئنجا - سوپاس بۆ خوا - لەم ڕێیەوە

---

(١) واتە: بە ڕاستی فێڵی شەیتان لاوازە. (وەرگێڕ)

تێ گەیشتم کە دووپات کردنەوەی هاندان و دروستکردنی شەوق و تامەزرۆیی لە مرۆڤدا لە لایەن قورئانی پیرۆزەوە، کارێکی گەلێ پێویستە و لەگەڵ ئەم حاڵەدا تابڵێیت گونجاوە. هەروەها ئەوەشم زانی کە هەڵخەڵەتانی ئەهلی ئیمان بە فرِوفێڵەکانی شەیتان، لە بێ‌ئیمانی‌یەوە نی‌یە و، ئەو کەسەش کە گوناهی کەبیرەی کردووە پێی کافر نابێت.

کەواتە موعتەزیلەکان و هەندێ لە خەواریجەکان، کە بکەری گوناهی کەبیرەیان بە کافر لە قەڵەم داوە یان پلەیەکیان لە نێوان پلەی کافر و پلەی ئیمانداردا بۆ بڕیار داوە، بە هەڵەدا چوون!

هەروەها ئەوەشم زانی کە ئەو برادەرە هەژارەی لە پێناوی مەدحی کەسێکی بێ‌نرخدا قوربانیی بە وانە ئیمانی‌یەکانی دا، زۆر لای‌نەداوە و بە تەواوی نزم نەبووەتەوە، وەك پێشتر پێم وابوو. ئنجا سوپاسی خوای گەورەم کرد کە لەو گیروگرفتە رِزگاری کردم.

چونکە شەیتان - وەك زووتر باسمان کرد - بە تەنها کردارێکی سەلبی و هەندەکی، مرۆڤ دەخاتە هەڵوێستی ترسناکەوە، ئەو دەروونەش کە لە مرۆڤدایە هەردەم گوێ‌رِایەڵی شەیتانە و، هێزی "توورِەیی" و "شەهوانی"ی دەروونیش وەك مایکرۆفۆن و وایەروان بۆ گەیاندنی فرتوفێڵ و داوەکانی شەیتان بۆ مرۆڤ.

هەر لەبەر ئەوەشە کە خوای گەورە دوو ناوی لە ناوە جوانەکانی خۆی، واتە "الغفور" و "الرحیم"ی بۆ ئەوە تەرخان کردووە کە رِووەو ئەهلی ئیمان دەربکەون و بدرەوشێنەوە..

هەروەها کاتێ کە قورئانی پیرۆز باسی گەورەترین نیعمەت و چاکەکاریی خواوەند بەسەر پێغەمبەرانەوە دەکات، نیعمەتی "لێخۆشبوون"ی لە هەموان بە گەورە و گرنگتر دەرخستووە. هەر لەبەر ئەوەشە کە خوای گەورە داوای کردووە هەمیشە داوای لێبوردنی لێ بکەن!

هەروەها کاتێ خوای گەورە ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ی لە سەرەتای سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزدا دووپات کردووەتەوە و کردوویەتی بە سەرەتایەکی باش، بۆ ئەوەیە کە ئەو میهرەبانی‌یە فراوانەی خوای گەورە - کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە - ببێت بە دالدە و پەنای ئەهلی ئیمان و هۆی رِزگاربوونیان لە فێڵی شەیتان. خوای گەورەش بە "أعوذُ باللهِ مِنَ الشيطان الرجيم" دیوارێکی قایم و بەربەستێکی مەحکەمی لە

نێوان ئەهلی ئیمان و، شەیتان و فرِوفێڵەکانیدا داناوە، چونکە فەرمان دەدات و دەفەرموێ: ﴿فاسْتَعِذْ بالله... ﴾[١].

❀ ئاماژەی شەشەم

یەکێك لە سامناکترین فێڵەکانی شەیتان ئەوەیە کە: سەر لە هەندێ کەسی دڵ ساف و هەست ناسك بەوە دەشێوێنێت کە وا دەباتە وەهمیانەوە گوایا: "خەیاڵکردنی کوفر" وەکو باوەڕکردن وایە بە کوفر. یان وایان پیشان دەدات کە گوایا: "تەسەوورکردنی گومڕایی" بە باوەڕکردن دەژمێردرێت بەو گومڕاییەی کە بە تەسەووردا هاتووە! جگە لەمانەش چەندین خەیاڵ و ختوورەی تری سەبارەت بە کەسانی گەورە و کاروبار و شتە موقەددەس و ڕێز لێگیراوەکان بۆ پەیدا دەکات و، بە ڕێگەی "إيهام"[٢] گومان بەرامبەر هەندێ لە ڕاستییە یەقینییەکانی ئیمان لە دڵیاندا دروست دەکات، بەوەی کە ئیمکانی خۆیی(ذاتي) لە شێوەی ئیمکانی عەقڵیدا دادەنێت و لە پێشچاویدا پیشانی دەدات.

ئنجا ئەم هەست ناسکە هەژارەش پێی وا دەبێت کە دڵنیایی ئیمانیی لەدەست داوە و کەوتووەتە ناو چاڵی کوفر و گومڕاییەوە. بەمەش گرفتاری نائومێدی دەبێت و، بەم نائومێدییەشی وای لێ دێت کە بەر گاڵتەی شەیتان دەکەوێت. ئەو لەعنەتییەش فوو بە نائومێدییەکەیدا دەکات و بە تاوانێکی گەلێ گەورەی پیشان دەدات و، پەنجە چەپەڵەکانی بەسەر ژێ هەستیارەکانیدا دەهێنێت و فوو بەو بابەتانەدا دەکات کە جێی سەرسامیی ئەو مرۆڤەن. ئیتر یان دەمارەکانی ئەو مرۆڤە بە جارێ دەشێوێنێت، یان بەرەو هەڵدێری پەستی گومڕایی پاڵی پێوە دەنێت!

لە هەندێ پەیامدا[٣] ڕادەی بێنرخیی ئەم چەشنە فێڵ و وەسوەسانەی شەیتانمان ڕوون کردووەتەوە و، چەسپاندوومانە کە چەندە بێ بناغە و بێ پاڵپشتن. بەڵام لێرەدا بەم جۆرەی خوارەوە کورتی دەکەینەوە:

---

(١) ﴿فاستعِذْ بالله مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم﴾ (النحل:٩٨). واتە: لە دەست ئەو شەیتانەی کە لە میهرەبانیی خوا دەرکراوە، پەنا تەنها بۆ لای خوا بەرە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: وا دەباتە وەهم و خەیاڵیەوە کە گوایا ئەو شتە وایە، کە لە ڕاستیدا وا نییە! (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست مەقامی دووهەمی وتەی بیست و یەکەمە. (وەرگێڕ)

وه‌ك وێنه‌ی مار له‌ ئاوێنه‌دا به‌ كه‌سه‌وه‌ نادات و.. ده‌ركه‌وتنی ئاگر تیایدا هیچ شتێك ناسووتێنێت و.. سێبه‌ری لاشه‌ی مرداره‌وه‌بوو هیچ شتێك پیس ناكات.. هه‌ر به‌و جۆره‌ش، وێنه‌كانی كوفر و هاوبه‌ش بڕیاردان.. یان سێبه‌ره‌كانی گومڕایی له‌سه‌ر ئاوێنه‌ی خه‌یاڵ.. یان وته‌ی ناڕه‌وا و جنێودان له‌ خه‌یاڵدا.. هیچ كام له‌مانه‌، باوه‌ڕ و یه‌قینی مرۆڤ تێك نادەن و ئیمانی ناگۆڕن و، ئه‌ده‌بی ڕێز و ئیحتیرامی زامدار ناكه‌ن. چونكه‌ ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌ ده‌ستوورێكی بڕیار له‌سه‌ردراوه‌ كه‌: "جنێودان له‌ خه‌یاڵدا هه‌رگیز به‌ جنێو ناژمێررێت و، مرۆڤ به‌خه‌یاڵكردنی كوفر كافر نابێت و، به‌ ته‌سه‌ووركردنی گومڕاییش له‌ گومڕایان دانانرێت".

سه‌باره‌ت به‌ مه‌سه‌له‌ی گومان بوونیش له‌ ئیماندا، ئه‌وا ده‌بێ بزانرێت كه‌ ئه‌و گریمانانه‌ی له‌ "ئیمكانی خۆیی"یه‌وه‌ سه‌رهه‌ڵده‌ده‌ن، هه‌رگیز نابنه‌ لابه‌ری دڵنیایی و ناتوانن یه‌قینی ئیمانیی مرۆڤ تێك بده‌ن. چونكه‌ یه‌كێك له‌ ده‌ستووره‌ سه‌لمێنراوه‌كانی زانستی "أصول الدين" ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ده‌ڵێت: "الإمكان الذاتي لا ينافي اليقين العلمي"[1].

با ئه‌مه‌ به‌ نموونه‌یه‌ك ڕوون بكه‌ینه‌وه‌:

ئێستا ئێمه‌ دڵنیاین له‌وه‌ی كه‌ ده‌ریاچه‌ی "بارلا" له‌ جێگای خۆیدایه‌ و پڕه‌ له‌ ئاو. له‌ هه‌مان كاتدا ده‌شگونجێ – هه‌ر ئێستا – به‌ ناخی زه‌ویدا ڕۆبچێت! ئه‌م گریمانه‌ پێی ده‌وترێت: "ئیمكانی خۆیی" كه‌ ته‌نها گریمانێكه‌ و، یه‌كێكه‌ له‌ شته‌ گونجاوه‌كان. به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م گریمانه‌ له‌ هیچ به‌ڵگه‌ و ده‌لیلێكه‌وه‌ په‌یدا نه‌بووه‌، ئه‌وا به‌ "ئیمكانی زیهنی" دانانرێت تا گومان دروست بكات، چونكه‌ له‌ زانستی "أصول الدين"دا ئه‌و ده‌ستووره‌ چه‌سپاوه‌ كه‌ ده‌ڵێت: "لا عبرة للاحتمال غير الناشيء عن دليل" به‌و واتایه‌ی كه‌: گریمانی خۆیی له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ هیچ به‌ڵگه‌یه‌كه‌وه‌ په‌یدا نه‌بووه‌، به‌ گریمانی زیهنی له‌ قه‌ڵه‌م نادرێت. كه‌واته‌ گرنگی‌یه‌كی ئه‌وتۆی نی‌یه‌ كه‌ بتوانێت گومان دروست بكات.

ئه‌و هه‌ژاره‌ش كه‌ دووچاری ئه‌م جۆره‌ گریمانانه‌ بووه‌، پێی وایه‌ ئه‌و دڵنیایی‌یه‌ی كه‌ زووتر به‌ ڕاستی‌یه‌كانی ئیمان بوویه‌تی، ئێستا نه‌یماوه‌! بۆ نموونه‌: سه‌باره‌ت به‌ مرۆڤێتیی پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ﷺ چه‌ندین خه‌یاڵ و خته‌وره‌ی ئیمكانی زاتیی به‌ خه‌یاڵدا دێت. به‌ڵام ئه‌و شته‌ی له‌ ڕاستی‌دا زیانی ببێت، ته‌نها ئه‌وه‌یه‌ كه‌ وا بزانێت ئه‌و خه‌یاڵانه‌ زیانیان هه‌یه‌!

---

(١) واته‌: ئیمكانی خۆیی پێچه‌وانه‌ی دڵنیایی زانستی نی‌یه‌. (وه‌رگێڕ)

كاتی وایش دەبێت ئەو لایەنە هاندەرەی شەیتان كە لەسەر دڵدایە و پێی‌دەوترێ: "لمـة الشیطان"[١] قسـەیەك فرێ دەدات كـە شیاوی شكۆمەندیی خـوای گـەورە نـەبێـت. ئیـتر خاوەنی ئەو دڵە وا دەزانێت لـە رێ ترازاوە و سەری لـێ شێواوە، بۆیە ئەم وتەیەی بە دڵدا هـاتووە. كـەچی هـەر ئـەو خەفـەت و دڵتـەنگی و تـرس و ڕازی نەبوونـەی هەسـتیان پـێ دەكات، بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە ئەو وتانە لە دڵیەوە دەرنـەچوون، بـەڵكو لـەو لایەنـەی شەیتانەوەن كە لە سەر دڵدایە، یان شەیتان دەیخاتە ناو یاد و ئەندێشەیەوە.

بەم جۆرە، لە نێوان لایەنە نادیار و هەسـتە نـەبینراوەكانی مرۆڤـدا كـە پێیـان دەوتـرێ: (اللطائف الإنسانية) و چـەند دانەیـەكن نـەمتوانی بـە تـەواوی دەستنیشـانیان بكـەم، یـەك دوانێكیان هەن مل بۆ ویست و ئیختیار كـەچ ناكـەن و، هـەرگیز بەرپرسیی هیـچ شـتێك ناگرنە خۆیان. جا ئەمانە هـەندێ جـار گـوێ بـۆ بـانگی حـەق ڕانـاگرن و خۆیـان بەسـەر مرۆڤـدا دەسـەپێنن و دووچـاری چـەند كـارێكی هەڵـەی دەكـەن. شـەیتانیش ئـەم هەڵـە دەقۆزێتـەوە و مرۆڤـە توو شبووەكە وا تێ‌دەگەیـەنێت كـە: (سروشـتی تـۆ شـێواوە و بـە تەواوی تێكچووە و تازە جارێكی تر لـەگەڵ حەق و ئیماندا یەكناگرنەوە، نـابینیت بـە بـێ هیچ ویستێكی خۆت بڕیاری بەدبەختیی لەسەر دەركردوویت)؟ ئەم هـەژارەش بـۆ خـۆی لەناو ئەم نائومێدی‌یە جەرگبڕەدا دەتوێتەوە و لەناودەچێت.

---

(١) لە فەرموودەیەكدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "في القلب لمتان: لمة الْمَلَك، إيعادٌ بالخير وتصديقٌ بالحق فمن وجد ذلك فليعلم أنه من الله سبحانه وليحمد الله. ولمة من العدو، إيعاد بالشر وتكذيب بالحق ونهي عن الخير، فمن وجد ذلك فليستعذ بالله من الشيطان الرجيم. ثم تلا قوله تعالى: ﴿**الشَّيطانُ يَعِدُكُمُ الفَقْرَ ويَأْمُرُكُمْ بالفَحْشاءِ**﴾ (البقرة: ٢٦٨). قال العراقي في تخريج الإحياء (ج٣/ص٢٧ ط دار المعرفة): أخرجه الترمذي وحسّنه والنسائي في الكبرى من حديث ابن مسعود.

واتای فەرموودەكە: دوو ویستی هـاندەر لـەناو دڵـدا دێـن و دەڕۆن، یـەكێكیان لـە مەلائیكەتەوەیـە، بـەوەدا دەناسرێت كە بەڵێنی چاكە دەدات و باوەڕ بە حەق دەكات. جا هەركەس لە دڵی خۆی‌دا هەستی بەمە كرد، با بزانێت كە ئەمە شتێكە لە خوای گەورەوەیە و سوپاسی خوای لەسەر بكات. ئەوی تریان لە "دوژمن"ەوەیە كـە بەوەدا دەناسرێتەوە: بەڵێنی خراپ دەدات و حەق بەدرۆدەخاتەوە و نەهی لە چاكـە دەكـات. جـا هەركـەس لـە دڵی خۆی‌دا هەستی بەمە كرد، با لە دەست شەیتانی نـەفرەت لێكـراو دەربـاز ببێـت و هانـا بـۆ لای خـوا ببـات. پاشان پێغەمبەر ﷺ ئایەتی: ﴿**الشيطانُ يَعِدُكُمُ الفقرَ ويَأْمُرُكُمْ بالفَحْشاءِ**﴾ی خوێندەوە. واتـە: شـەیتان لـەو كردارانەی هانتان دەدات بۆ كردنیان، لە ڕاستی‌دا بەڵێنی هەژاریتان دەداتێ و فـەرمانی خراپكاریتـان بەسـەردا دەردەكات.

دیارە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە هێنانەوەی ئەم ئایەتە، ڕوونكردنەوەی ئەوەیە كـە وشـەی: (العدو – دوژمن) لـە فەرموودەكەی‌دا مەبەستی پێی شەیتانە. (وەرگێڕ)

جا قەڵای مەحکەم و قایمی مرۆڤی باوەڕدار لە دژی ئەو فرِوفێڵانەی شەیتان کە زووتر باس کران، تەنها "ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان" و "ڕاستییەکانی ئیمان"ە کە بە دەستووری زانا لێکۆڵەرەکان و پیاوچاکە هەڵبژاردەکان، سنووریان بۆ دەستنیشان کراوە و پارێزراون.

سەبارەت بەم فێڵانەش کە لە دواییدا ڕوون کرانەوە، ئەوا بە پەنابردن بۆ لای خوای گەورە و گوێ نەدان بەو فرِوفێڵانە - پشت بە خوا - دەڕۆنە دواوە و نامێنن. چونکە سروشتی وەسوەسەکان وایە کە هەتا گرنگی و بایەخیان پێ بدرێت، پتر گەورە دەبن.

جا سوننەتەکانی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ مرۆڤی باوەڕدار مەڵهەمی ساڕێژکار و شیفابەخشی ئەم زامە ڕۆحییانەیە.

### ❀ ئاماژەی حەوتەم

**پرسیار:**

پێشەوایانی موعتەزیلە بەدیهێنانی "شەڕ"یان بە "شەڕ" لە قەڵەم داوە، واتە دروستکردنی کوفر و گومڕاییان بۆ خوا نەگێڕاوەتەوە، وەك بڵێی خوایان لەمە پاك و موقەددەس ڕاگرتووە. ئەوەتا دەڵێن: (مرۆڤ خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی)! بەمەش ڕێگایان لێ تێکچوو..

هەروەها وتوویانە: (ئەو کەسەی گوناهی کەبیرە بکات ئیمانی نامێنێت). گوایا لەبەر ئەوەی باوەڕبوون بە خوا لەگەڵ ئەم چەشنە گوناهانەدا ناگونجێ. چونکە ئەو کەسەی لە ترسی بەندی و سزای بەندیخانەی کاتیی دنیادا خۆی لە سەرپێچیی یاساکانی دنیا دەپارێزێت، گەر ئەم مرۆڤە گوناهی کەبیرەی کرد، بە بێ ئاوڕدانەوە بە لای ڕقی خواوەندی گەورەی بەدیهێنەر و بە لای ئازاری هەمیشەیی دۆزەخدا، دەبێ ئەم کردارەی بەڵگەی بێ ئیمانیی بێت.

**وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکە:** ئەوەیە کە لە وتەی بیست و شەشەمی کتێبی وتەکان(واتە پەیامی قەدەر)دا ڕوونمان کردووەتەوە کە:

بەدیهێنانی شەڕ، شەڕ نییە، بەڵکو بەدەستهێنانی شەڕ، شەڕە و بە شەڕ دەژمێررێت. چونکە لە دروستکردن و بەدیهێنانی شتاندا سەیری بەرهەمە گشتییەکانیان دەکرێت. واتە ئەگەر تەنها یەك "شەڕ" ببێت بە پێشەکیی چەندین بەرهەم و ئاکامی زۆر شتی

"خێر"، ئەوا ئەو شەڕەش لە ڕوانگەی بەرهەمەکانیەوە دەبێ بە "خێر" و لە حوکمی خێردا دەبێت.

بۆ نموونە: "بوونی ئاگر" سەدان سوود و قازانجی هەیە. بەڵام ئەگەر کەسێك بە ویست و ئارەزووی هەڵەی خۆی ئاگری بە شێوەیەکی زیانبەخش بەکارهێنا، مافی ئەوەی نی‌یە بڵێت: "دروستکردنی ئاگر شەڕە"! چونکە ئەو کەسە بە ویست و ئارەزووی هەڵەی خۆی کردوویەتی بە شەڕ و بەڵا بەسەر خۆیەوە.

هەر بەم جۆرەش دروستکردن و بەدیهێنانی شەیتانەکان، چەندین بەرهەمی پڕ لە دانستی تێدایە (وەك بەرزبوونەوە و سەرکەوتنی مرۆڤ بە پلەکانی کەماڵات و پێشکەوتندا). جا ئەو کەسەی کە بە ویستی خۆی و بەهۆی بەدەستهێنانی هەڵەی خۆیەوە شوێنی شەیتان کەوتووە و تەسلیمی بووە، مافی ئەوەی نی‌یە بڵێت: "دروستکردنی شەیتان شەڕە و کردارێکی خراپە". چونکە ئەو کەسە بەهۆی بەدەستهێنانی خۆیەوە کرداری خراپی تووشی خۆی کردووە!

بەڵام بەدەستهێنان، کە بریتی‌یە لە کردارێکی هەندەکی(جُزئـي) بۆ ئەنجامدانی هەر خراپکاری‌یەك، ئەوا بە شەڕ دەژمێررێت، چونکە هۆیە بۆ شەڕێکی تایبەتی.

بەم جۆرە، بۆمان دەرکەوت کە "بەدەستهێنان"ی شەڕ دەبێت بە شەڕ، بەڵام "دروستکردن"ی، بە شەڕ دانانرێت. چونکە دروستکردن پەیوەندیی بەو هەموو ئاکام و بەرهەمانەوە دەبێت کە لە ئەنجامیەوە پەیدا دەبن. کەواتە هەرگیز دروستکردنی شەڕ بە شەڕ لەقەڵەم نادرێت.

بەم جۆرە و، بەهۆی تێنەگەیشتنی موعتەزیلەکان لەم نهێنی‌یە، ڕێی ڕاستیان ون کرد و سەریان لێ شێوا! چونکە وتوویانە: (بەدیهێنانی شەڕ، شەڕە و.. بەدیهێنانی کرداری ناشیرین، ناشیرینە). گوایا بۆ مەبەستی خاوێن ڕاگرتنی خوای گەورە، دروستکردنی شەڕیان بۆ خوای گەورە نەگێڕاوەتەوە و، تەئویلی پایەی ئیمانیی "باوەڕ بە قەدەر"یشیان کردووە، کە بریتی‌یە لە: (باوەڕبوون بەوەی کە خێر و شەڕی قەدەر لە لایەن خواوەیە).

**بەشی دووهەمی پرسیارەکەش کە دەڵێت:** بکەری گوناهی کەبیرە چۆن بە باوەڕدار دادەنرێت؟ وەڵامەکەی بەم جۆرەیە:

یەکەم: ئاماژەکانی پێشوو هەڵەکانی ئەوانی بە شێوەیەکی بێ گومـان ڕوون کـردەوە، کەواتە پێویست بە دووپات کردنەوە ناکات.

دووهـەم: سـروشتی "دەروون"ی مرۆڤ وایە کـە: کێشـی درەمـیـێك چێژ و لـەزەتی پـەلە و ئامادەی ئێستا بەسەر یەك تەن لـەزەت و خۆشیی نادیاری درەنگـدا پێش دەخـات. ئەم دەروونە خۆی لە زلـلەیـەکی ئێستا زیـاتر دەپارێزێت تـا خۆپاراستنی لـە سـالێکی پڕ ئەشکەنجە و ئـازاری ئاینده! خۆ کاتێ کـە هەسـت و شـەهوەت و ئـارەزووی مـرۆڤ دەهەژێن، ئەوا ئەو دەروونە بە هیچ جۆرێك سەر بۆ تـەرازووەکانی عـەقڵ و ژیـری کـەچ ناکات، بەڵکو هەوا و ئارەزووی دەروون خۆیـان زاڵ دەکـەن و، ئـەو مرۆڤـەش وای لـێ دێت کە لەزەتێکی بچووکـی کـاتی ئێستای بەسـەر پاداشتێکی گـەورەی ئـایندەدا پێش بخات و، لـە تەنگانەیـەکی هـەندەکیی ئێستا زیـاتر خـۆی بپـارێزێت تـا سـزایەکی ئـازاری دوارۆژ!

جا لـەبەر ئەوەی هەوا و شەهوەت و وەهـم و ئـارەزوو، کە لـە شتی ئاشکرا بـەولاوە هیچی تر نابینن و هەستی پێ ناکەن، هەرگیز ئاینده نابینن و بیری لـێ ناکەنـەوە، تەنانـەت ئینکاریشی دەکەن.. هەروەها لەبەر ئەوەی "دەروون" یارمەتیی ئـەو هـەوا و شـەهوەت و وەهم و ئارەزووانە دەدات و پتر هانیـان دەدات.. لەبـەر هـەموو ئەمانـە، "دڵ" و "ژیـری" کە جێی ئیمانن، هیچ دەستەلاتێکیان نامێنێت و لە ناچاریدا بێدەنگ دەبن، ئەو کاتـەش کردنی گوناهی کەبیرە نابێتە بەڵگەی بێئیمـانی، بـەڵکو هـۆی ئـەو گوناهـە سـەرکەوتنی هەوا و دەستەلات پەیداکردنی هەست و ئارەزووی ماددییە بەسەر "دڵ" و "ژیری"دا!

لە ئاماژەکانی پێشوودا تێ گەیشتین لەوەی کە:

ڕێگای خراپە و هەوا و ئارەزوو، لەبـەر ئـەوەی بریتـین لـە ڕووخـاندن و کاولکـاری، ئەوا ئەنجامدانیان کارێکی گەلـێ ئاسـانە. هـەر لـەبەر ئەوەشـە کە شـەیتانەکانی جیننـی و ئینس گەلـێ بە ئاسانی مرۆڤی بۆ لا ڕادەکێشن!

لە ڕاستیدا گەلـێ جێی سەرسووڕمانە کە دەبینیت خەڵکانێکی دەروون لاواز شوێن پێی شـەیتان هـەڵدەگرن و، لـەزەتێکی حـازریی بـە ئـەندازەی باڵـە مێشـوولـەیەك لـەم دنیـا فانییەدا بەسەر لەزەتەکانی نیعمەتی ئەو بەهەشتە هەمیشەییەدا پێش دەخەن! لە کاتێکدا کە نوور و ڕووناکییەکی ئەبەدیی ئەودنیا، بـا بـە ئـەندازەی باڵـە مێشـوولـەیەکیش بێـت،

زۆر لەو چێــژ و لـەزەت و نیعمەتانـە زیـاترە کـە مـرۆڤ لـە درێژایـی تەمـەنی لـەم دنیایـەدا دەستی دەکەون، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ چەسپاوە[1].

کەواتە لەبەر ئـەم هـەموو دانسـت و نهێنییانەیـە کـە قورئـانی پیرۆز گەلـێ هـاندان و هەڕەشەی دووپات کردووەتـەوە. تـاکو مرۆڤـی ئیمـاندار پـەندیان لـێ وەربگرێـت و، لـە گوناهکاری بپارێزێت و، هانی بدات بۆ خێر و چاکەکاری.

ڕۆژێکیــان پرســیارێکم بــە زەینــدا هــات ســەبارەت بــەم دووپــات بوونەوانــەی ڕێنماییـەکانی قورئـانی پیرۆز بـۆ ئیمـانداران. پرسیارەکەش ئەمــە بــوو کــە: ئایـا ئــەم بێدارکردنەوە زۆر و بەردەوامانە نابنە هۆی زامدار کردنی هەستی ئیمـانداران سـەبارەت بە لانەدان و، ڕەسەنایەتییانەوە و، دەرخستنیان لە شێوەیەکدا کـە شیاوی ڕێـزی مـرۆڤ نـەبێت؟ چونکـە دووپاتکردنــەوەی تەنــها یــەك فــەرمان لــە لایــەن فەرماندەیەکــەوە بــۆ کارمـەندێکی خـۆی ئـەو کارمـەندە دەخاتـە هەڵوێسـتی گومـان لێکـراو لــە دڵسـۆزی و وەلائیدا بۆ فەرماندەکەی، کەچی قورئانی پیرۆز پەیتا پەیتا و بە جەختەوە فەرمانەکانی بۆ ئیمانداره خاوێن و دڵسۆزەکان دووپات دەکاتەوە.

لەم کاتەدا کە ئەم پرسیارە خەریکی گوشینی زەینم بوو، دووسێ بـرادەری دڵسـۆزم لەگەڵدا بوون، منیش - وەك هەڵێك - پەیتا پەیتا بێـدارم کردنـەوە و ئامۆژگـاریم ئاراستە کـردن تـاکو فێڵـەکانی شـەیتانی ئینس لەخشتەیان نەبەن. پاشـان سـەرنجی کاردانـەوەی ئامۆژگارییەکانم دا لە دڵ و دەروونی ئەواندا، بینیم هیچ کام لەو برادەرانە نیگەرانییان پێـوە دەرنەکـەوت و کەسیشـیان نـەیوت: (وا دیـارە بـاوەڕت بـە دڵسـۆزیمان نیـیـە و تۆمەتبارمان دەکەیت). بەڵام من هێشتا هەر دڵنیا نەبووم و بە خۆمم دەوت: لەوانەیـە بـەم یادخســتنەوە و بێدارکردنــەوە یــەك لــە دوای یەکانــە دڵگــرانم کردبێــتن و وەفــا و بەردەوامییانم زامدار کردبێت.

کاتێ من لەم حاڵەتە دەروونییەدا بووم، یەکسەر ئەو ڕاستییانەی کە لـە ئاماژەکـانی پێشوودا چەسپێنران و ڕوون کرانەوە، لە ڕووی دڵمدا دەرکەوتن، ئنجـا بـە باشـی زانیـم کە شێوازی پڕ لە دانستی قورئـانی پیرۆز لەگـەڵ داخوازیـی حـاڵ و مەقامـدا یـەکانگیر بـووە و ئەم شێوازە گەلـێ پێویسـتە و هـیچ ئیسـراف و موبالـەغـە و زیادەڕەوییـەکی تێـدا

---

(١) لەوانەیە نووسەر ئاماژە بۆ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بکات کە دەفەرموێ: "لو كانت الدنيا تعــدل عند الله جناح بعوضة ما سقى منها كافراً شربة ماء". رواه الترمذي وصححه. واتە: ئەگەر دنیا بـە ئـەندازەی باڵە مێشوولـەیەك لە لای خوا بایەخی ببوایە، یەك قوم ئاوی دەرخواردی هیچ کافرێك نەئەدا. (وەرگێڕ)

نی‌یە و، هەرگیز خوای گەورە کەسانی گوێبیست و قسەبۆکراوی خۆی تۆمەتبار ناکات. بەڵکو ئەو شێوازە سەرتاپا دانایی و بەلاغەتی بێ گومانە.

هەروەها ئەوەشم زانی کە بۆچی برادەرەکانم هیچ دڵگرانی‌یەکیان سەبارەت بە دووپات کردنەوەی ئامۆژگاری‌یەکانمەوە لێ دەرنەکەوت.

**پوختەی ئەو ڕاستی‌یەش بەم جۆرەیە:**

ئەو کردارە هەندەکی و کەمانەی کە لە شەیتانەکانەوە دەردەچن، لەبەر ئەوەی لە ڕاستی‌دا بریتین لە ڕووخاندن و کاولکاری، ئەوا دەبن بەهۆی پەیدابوونی شەڕ و خراپکاری‌یەکی زۆر. کەواتە پێویستە زوو بەزوو ڕێڕەوانی ڕێگای حەق و هیدایەت بپارێزرێن و بێدار بکرێنەوە، تاکو ئاگاداری خۆیان بن و، هەمیشە دەبێ دەستی یارمەتی‌یان بۆ درێژ بکرێت، چونکە گەلێ پێویستیان بە یارمەتی هەیە. هەر لەبەر ئەوەشە کە خوای گەورە لەم دووپات کردنەوانەدا بە ئەندازەی هەزار و یەك دانە لە ناوە جوانەکانی خۆی، یارمەتی‌یان دەدات و پشتگیری‌یان دەکات و بە هەزاران دەستی بەزەیی و میهرەبانی بۆ پشتگیری و یارمەتیدانیان درێژ دەکات. ئەمەش ڕێزی باوەڕدار کەم ناکاتەوە و هەستی زامدار ناکات، بەڵکو دەیپارێزێت.. هەروەها لە نرخی مرۆڤ داناشکێنێت، بەڵکو زەبەندەیی شەڕ و فێڵەکانی شەیتان دەردەخات!

دەسا ئەی ئەهلی حەق و هیدایەت!

ڕێگای ڕزگار بوونتان لە فڕوفێڵەکانی شەیتانی ئینس و جیننی لە بەردەمدایە، فەرموون بیگرنەبەر. لەسەر ڕاستە شەقامی حەق - کە شا ڕێگای ئەهلی سوننەت و جەماعەتە - بەردەوام بن و، بڕۆنە ناو قەڵای مەحکەم و قایمی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجاز و شێوازی ڕەوان و، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بکەن بە پێشەوا و پێشڕەوتان. ئەو کاتە، پشت بە خوا، ڕزگار و سەرفراز دەبن.

### ❀ ئاماژەی هەشتەم

**پرسیار:**

لە ئاماژەکانی پێشوودا ئەوەت چەسپاند کە: ڕێی گومڕایی دەستدرێژی و کاولکاری‌یە و، گرتنەبەری ڕێی وا بۆ زۆر کەس ئاسانە. بەڵام لە هەندێ پەیامی تردا بەڵگەت لەسەر ئەوە هێناوەتەوە کە ڕێی کوفر و گومڕایی هێندە سەختی و ئەشکەنجە و

گیرو گرفتی تێدایە کە شایانی گرتنەبەر نی‌یە و، ڕێی ئیمان و هیدایەتیش هێندە ئاسانە کە دەبێ هەموان بیگرنەبەر؟!

**وەڵام:**

کوفر و گومڕایی دوو بەشن:

*یەکەمیان*: بریتی‌یە لە ئینکاری کردنی حوکمە فەرعی و عەمەلی‌یەکانی ئیمان. گرتنەبەر و قبووڵکردنی ئەم جۆرە ڕێگایە گەلێ ئاسانە، چونکە لە ڕاستیدا "قبووڵ نەکردن"ە. واتە: (قبووڵ نەکردنی ڕاستی‌یە)ە و، "وازلێهێنان" و "نەبوون"ە.. ئەمەیان ئەو بەشەیە کە لە پەیامەکاندا باسی ئاسانیی کراوە.

*بەڵام بەشی دووهەمیان*: بریتی‌یە لە گرتنەبەری ڕێگایەکی دژ و پێچەوانەی ئیمان. واتە حوکمێکی باوەڕی و فیکری‌یە نەك فەرعی و عەمەلی. ئەم بەشەیان بەوەندە ڕانەوەستاوە کە "نەفی"ی ئیمان بکات، بەڵکو لەوەش زیاترە، چونکە قبووڵی ناحەق دەکات و دەیەوێت شتێکی پێچەوانەی ڕاستی بچەسپێنێت!

ئەمەش ئەو ڕێگایەیە کە دژ و پێچەوانەی ئیمانە. کەواتە وەکو یەکەمیان "قبووڵ نەکردن" نی‌یە تاکو ڕێیەکی ئاسان بێت، بەڵکو "قبووڵکردنی نەبوون"ە! جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕێیە بە بێ چەسپاندنی "نەبوون" ناگیرێتەبەر و، لە هەمان کاتدا دەستوورێکی بنچینەییش هەیە دەڵێت: (نەبوون ناچەسپێنرێت)[1] ئەوا گرتنەبەری ڕێیەکی ئاوا هەرگیز بە ئاسان دانانرێت.

بەم جۆرە، هەرچی‌یەك لە پەیامەکانی نووردا سەبارەت بە دژواریی ڕێی گومڕایی باس کراوە لەم بەشەیانە، کە ڕێیەکی سەخت و هەڵەت و پڕ لە گیرو گرفتە و، بڕینیشی کارێکی مەحاڵە، بە جۆرێك ئەو کەسەی کەمێك هەست و ژیریی ببێت نایگرێتەبەر.

---

(١) وەك ئەوەی کەسێك بڵێت: (جۆرە درەختێك هەیە شیر دەگرێت، واتە بەروبوومەکەی شیرە). یەکێکی تریش بڵێت: (درەختی وا نی‌یە). کەسی یەکەمیان تەنها بە پیشاندانی ئەو درەختە، یان بەرەکەی، دەتوانێت دەعواکەی بچەسپێنێت. بەڵام دووهەمیان کە ئیدیعای "نەبوون"ی ئەو درەختە دەکات، ناتوانێت ئیدیعاکەی بچەسپێنێت! چونکە دەبێ سەرانسەری کاتەکان بپشکنێت و سەرجەمی بوونەوەرانیش بگەڕێت و پیشانی خەڵکیشیان بدات کە درەختی وا نی‌یە، ئەو کاتە دەتوانێت "نەفی"یەکەی بچەسپێنێت! دیارە ئەمەش هێندە مەحاڵە کە بۆ هیچ کەسێك ناچەسپێت! (وەرگێڕ لە پەیامەکانی نوورەوە هێناویەتی).

هەروەها لە پەیامەکاندا، بە جۆرێکی بێ گومان چەسپاوە کە ئەم ڕێگایە ئازاری سامناك و تاریکایی خنکێنەری تێدایە، بە ڕادەیەك کە ئەو کەسەی هێندەی گەردیلەیەك خاوەنی هەست و ژیری بێت بە شوێنیدا ناگەڕێت.

**ئەگەر کەسێك بڵێت:**

مادەم ئەم ڕێیە تا ئەم ڕادەیە تاریك و پێچاوپێچ و ئازاربەخش و پڕ لە هەڵەت و گیروگرفتە، ئەدی بۆچی بەشێکی زۆری خەڵکی دەیگرنەبەر؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەوانە تێکەوتوون؛ بە چەشنێك کە نەدەتوانن و نە دەشیانەوێت لێی دەرباز ببن! چونکە هێزە ڕووەکی و ئاژەڵی‌یە(ماددی‌یە)کانی مرۆڤ نە دوارۆژ دەبینن و نە بیریشی لێ دەکەنەوە. جا ئەم هێزانە بەسەر "لایەنە ناسکەکانی مرۆڤدا" (چەشنی عەقڵ و دڵ) سەردەکەون و، ئنجا خۆیان بە چێژ و لەزەتێکی کاتی دڵخۆش دەکەن.

**پرسیار:**

**ئەگەر کەسێك بڵێت:**

مادەم ئەم ئازارە سەخت و پڕ مەترسی‌یانە لە ڕێی کوفردا هەن.. مادەم بابای کافریش - وەك مرۆڤێك - بە تەنگی ژیانی خۆیەوەیە و لە تاسەدایە بۆ چەندین شتی لەژمارەبەدەر، پاشان مردنی خۆی بە نەبوون و جودایی و لێکبڕانێکی هەمیشەیی دادەنێت و، هەردەم بە چاوی خۆی دەبینێت کە بوونەوەران بە گشتی و هەموو خۆشەویستانی بە تایبەتی، بەرەو نەبوون و جوودایی هەمیشەیی هەنگاو دەنێن، واتە بەهۆی گرتنەبەری ڕێی کوفرەوە هەموو شتێك لە بەرچاویدا بەرەو نەمان دەڕوات.. مادەم ئەو مرۆڤە بەهۆی کوفرەوە ئەمانە وا دەبینێت، ئیتر چۆن لە ژێر تەوژمی ئەو ئازارانەدا دڵی پەراش پەراش نابێت؟ بەڵکو چۆن خودی کوفرەکەی ڕێی چەشتنی تام و چێژی ژیانی دنیای دەدات؟!

**وەڵام:**

ئەو مرۆڤە کافرە بەهۆی چەواشە کردن و بەهەڵەبردن و فێڵێکی سەیری شەیتانەوە خۆی دەخەڵەتێنێت و لە مەزەندەی لەزەت و ڕابواردنێکی ڕواڵەتی‌دا دەژی!

ماهییەتی ئەم خۆخەڵەتاندنە بە نموونەیەکی بەناوبانگ ڕوون دەکەینەوە و ئاماژەی بۆ دەکەین:

دەڵێن بە حوشترمل(النعامة)یان وت:

- خۆ تۆ باڵندەیت، ئیتر بۆچی نافڕیت؟

ئەویش باڵەکانی پێچایەوە و وتی:

- من حوشترم نەك باڵندە!

ئەمەی وت و سەری لەناو لمدا شاردەوە، بەڵام جەستە کەتە و زەبەلاحەکەی لە دەرەوە مایەوە و بوو بە نیشانەی تیری ڕاوچییان!

پاشان پێیان وت:

- مادەم تۆ دەڵێیت: "من حوشترم" ئەوا ئەم بارەمان بۆ هەڵبگرە!

کە ئەمەی بیست، یەکسەر باڵەکانی کردەوە و وتی:

- من باڵندەم!

ئەمەش بۆ ئەوەی لە ماندووبوونی بارهەڵگرتن خۆی دەرباز بکات!

بەم جۆرە، خۆی بە تەنیایی و بێ خواردن و پاراستن هێشتەوە، هەتا بوو بە نیشانەیەك بۆ تیری ڕاوچییەکان.

بابای کافریش وایە؛ چونکە پاش ئەوەی لە بەردەم هەڕەشە و ترساندنە ئاسمانییەکانی قورئاندا کوفرە "ڕەها"کەی لەرزەی پێ کەوت و لەق بوو، کەوتە ناوەندی "کوفرێکی گومان لێکراو"ەوە.

جا ئەگەر پاش ئەمە پرسیاری لێ بکرێت کە:

- ئایا تۆ کە ئەم مردن و نەمانەی سەر ڕێت بە لەناوبردن و ئیعدامی هەمیشەیی دەزانییت (واتە باوەڕت بە زیندووبوونەوە نییە) ئیتر چۆن دەتوانیت بژییت؟ ئەو کەسەی بەرەو پەتی قەنارە هەنگاو بنێت، چۆن دەتوانێت خۆشی لە ژیاندا ببینێت؟

لە وەڵامدا دەڵێت:

- (نەخێر، مردن نەبوون نییە. بەڵکو گریمانی ژیانی دوای مردن هەیە)!

ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە بەشی خۆی لە ڕووناکی و میهرەبانیی فراوانی قورئانی پیرۆز - کە بۆ هەموو جیهانیانە - وەرگرتووە و، لەم ڕێگایەوە کەوتووەتە گومانەوە لە کوفرە موتڵەقەکەی خۆی.. یان وەك حوشترمل سەر بەناو لمی بێئاگاییدا دەکات، بۆ ئەوەی ئەجەل و مردن نەیبینن و لەناوچوون و نەمان تیری تێ نەگرن!

**بە کورتی:**

حاڵی کافر وەك حاڵی حوشترمل وایە؛ ئەوەتا کاتێ مردن و نەمان بە "لەناوچوون" و "نەبوون" دەبینێت، هەوڵ دەدات خۆی لەو ئازارانە دەرباز بکات، لە ڕێی خۆ هەڵواسین و دەست گرتنیەوە بە هەواڵدانەکانی قورئانی پیرۆز و کتێبە ئاسمانی یەکانی ترەوە کە سەبارەت "بە ڕۆژی دوایی" ڕایانگەیاندووە، کە ئەمەش گریمانی ژیانی دوارۆژی لە لا پەیدا کردووە.

جا ئەگەر - دوای ئەمە - پێی بوترێت:

مادەم ئێمە بەرەو جیهانی هەمیشەیی ئەولا کۆچ دەکەین، ئیتر بۆچی ئەو ئەرکانە ئەنجام نادەیت کە ئیمان لەسەری داناویت، تاکو لەودنیادا بەختەوەر بیت؟

لە ڕوانگەی کوفرە گومان لێکراوەکەیەوە وەڵام دەداتەوە و، دەڵێت:

(لەوانەیە ڕۆژی دوایی نەبێت، کەواتە بۆچی خۆم ماندوو بکەم)؟

واتە بەهۆی بەڵێنەکانی قورئانی پیرۆزەوە سەبارەت بە بوونی ژیانی هەمیشەیی ئەودنیا، خۆی لە ئازارەکانی ئیعدامی هەمیشەیی - هەر لەم دنیادا - دەپارێزێت. بەڵام کاتێ کە خۆی لە بەردەم ماندووبوونی ئەرکە ئایینی یەکاندا دەبینێتەوە و ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی پێ قورس دەبن، پەشیمان دەبێتەوە و، دەست بە گریمانەکانی کوفرە گومان لێکراوەکەیەوە دەگرێت، تاکو لەو ئەرکانە ڕزگاری ببێت!

واتە لەم ڕوانگەیەوە، بابای کافر لەو گومانەدایە کە لەچاو مرۆڤی ئیماندار زیاتر لە دنیادا بە خۆشی دەژی و لەویش گەلێ بەختەوەرترە، چونکە بەهۆی گریمانە کوفری یەکانیەوە خۆی لە ئەرك و پێویستی یە ئایینی یەکان دەرباز دەکات. لە هەمان کاتیشدا، بەهۆی ئیحتیمالە ئیمانی یەکەیەوە، خۆی تووشی پەژارە و ئازارەکانی "نەبوون" ناکات!

بەڵام ئەمە - لە ڕاستی دا - خۆخەڵەتاندنێکی بێ سوود و کاتی و بێ نرخە و، فێڵێکی شەیتانە!

هەر لێرەشدا لایەنێکی بەزەیی یە گشتی و فراوانەکەی قورئانمان بۆ دەردەکەوێت، کە تەنانەت کافرانیشی گرتووەتەوە، چونکە خستوونیەتە گومانەوە لە کوفرە ڕەهاکەیان و، تا ڕادەیەکیش لەو ژیانە دۆزەخ ئاسایە ڕزگاری کردوون. ئیتر لەم ڕێیەوە و بەبۆنەی جۆرە گومانبوونێك لە کوفرە موتڵەقەکەیان، دەتوانن بژین. دەنا هێندە ئازاری

مەعنەوی‌یان دەچەشت کە وەك ئازاری دۆزەخ سووتێنەر بوونایە، یان بۆخۆکوشتن هانیان بدانایە.

دەسا ئەی ئەهلی ئیمان!

بەوپەڕی یەقین و دڵنیایی‌یەوە پەنا بۆ پاریزگاریی قورئانی پیرۆز بەرن کە لە عەدەم و، نەبوونی ڕەها و، دۆزەخی دنیا و قیامەت، پاراستوونی و دەربازی کردوون. کەواتە بە تەواوی خۆتان تەسلیمی ڕێڕەوی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بکەن و، بەوپەڕی گوێڕایەڵی و ڕێزەوە بڕۆنە ژێر سایەی سوننەتەکانی و، خۆتان لە بەدبەختیی دنیا و ئازاری قیامەت ڕزگار بکەن.

### ❀ ئاماژەی نۆهەم

**پرسیار:**

بۆچی ئەهلی هیدایەت – کە حیزبی خوان – گەلێ جار لە بەردەم گومڕایاندا – کە حیزب و پیڕی شەیتانن – دەڕووخێن و ژێر دەکەون؟ لە کاتێکدا کە ئەهلی هیدایەت چاودێری و میهرەبانیی خواوەندی پەروەردگار دەورەی داون؟ ئەوەتا پێغەمبەران – درودیان لەسەر بێت – پێشیان کەوتوون و، مایەی شانازیی بوونەوەرانیش، کە حەزرەتی محەممەد پێغەمبەرە ﷺ پێشەوای هەموویانە؟

بۆچی هەندێ لە دانیشتووانی "مەدینە" لەسەر دووڕوویی مانەوە و لە گومڕایی‌دا بەردەوام بوون، هەرچەندەش نزیك و دراوسێی ئەو پێغەمبەرە بوون کە پێغەمبەرایەتی‌یەکەی وەك خۆر تیشکی دەدا و، هەمیشە بەهۆی قورئانی خاوەن ئیعجازیشەوە – کە وەك ئیکسیر وەهایە – خوای گەورەی یاد دەخستنەوە و، بە ڕاستی‌یەکانی قورئانیش، کە زۆر لە هێزی کێشی بوونەوەر بەهێزترە، بە یەکترەوە دەیبەستنەوە و ڕێنمایی دەکردن.. بۆچی ئەوان (واتە مونافیقان) لەسەر دووڕوویی مانەوە؟

**وەڵام:**

بۆ وەڵامدانەوەی هەردوو بەشەکەی ئەم پرسیارە سەرسووڕهێنەرە، پێویستە لە پێشدا بناغەیەکی توندوتۆڵ و پتەو ڕوون بکەینەوە:

خواوەندی گەورە و بەدیهێنەری بوونەوەران، لە نێوان ناوە جوانەکانی خۆی‌دا چەند ناوێکی "جەلالی" و چەند ناوێکی "جەمالی"ی هەیە. جا بۆ ئەوەی هەریەکە لەم دوو

جۆرە ناوانە حوکمی خۆیان بە چەند دەرەوشانەوەیەکی جیاواز لەوانی تر دەربخەن، ئەوا بۆ ئەم مەبەستە خوای گەورە شتە دژ بە یەکەکانی وەك: (خێر و شەڕ، سەرما و گەرما)ی ئاوێتەی یەکتری کردووە و لە بەرامبەری یەکترەوە ڕایگرتوون..

ئنجا هەرکام لەو شتە دژ بەیەکانەش، خواوەند سیفەتی: پاڵنان و دەستدرێژی کردنی بۆ سەر ئەوی تر پێ بەخشیوە. بەمەش زۆرانبازی‌یەکی دانایانەی سوودبەخشی بەدیهێناوە لە ڕێی زەقکردن و پیشاندانی ئەو جیاوازی و ئاڵوگۆڕانەی کە ئەنجامی سنوورشکاندن و دەستدرێژی کردنی ئەو دوو دژانەن بۆ سەر یەکتر. ئیتر دانستی خوای گەورە داخوازی ئەوەیە کە بوونەوەران بەپێی دەستووری: (بەرزبوونەوە و گەشەکردن بەرەو کەماڵات) و، بە یاسای: (ئاڵوگۆڕکاری) بەڕێوە بیات..

مرۆڤیش، کە بەروبوومی گشتیی درەختی بەدیهاتووانە، خواوەند وا بەدیی‌هێناوە کە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەرتر شوێن ئەو یاسای زۆرانبازی و پاڵنانە بکەوێت. چونکە دەرگای "موجاهەدە"ی لێ خستووەتە سەرپشت، کە هەرچی بەرزبوونەوە و گەشە کردنی کەماڵاتی مرۆڤ هەن لە خولگەی ئەو موجاهەدەیەدا بەدەست دێن و پەیدا دەبن.

لەبەر ئەمە، خوای گەورە هەندێ هۆکار و ئامێری بە دەستە و پێڕی شەیتان بەخشیوە، تاکو بە هۆیانەوە بتوانن بەرەنگاریی حیزبی خوای پێ بکەن و، لە گۆڕەپانی جەنگدا لە بەرامبەریانەوە ڕابووەستن.

کەواتە ئەمەیە هۆی توانای گومڕایان (کە لەوپەڕی لاوازی و بێ دەستەڵاتیدان) لە بەرگری کردنی ئەهلی حەقدا (کە بەهۆی پێشەوایەتیی پێغەمبەرانەوە بۆیان، تابڵێی بەتوانا و خاوەنی ورە و هێزی مەعنەوین) و، بەهۆی ئەمەوەیە کە ئەوان - بە جۆرێکی کاتی - بەسەر ئیمانداراندا زاڵ دەبن.

نهێنیی حیکمەتیش لەم بەرگری‌یە سەیرەدا ئەوەیە کە ڕێی کوفر و گومڕایی "نەبوون" و "وازهێنان"ی تێدایە. ئنجا لەبەر ئەوەش پێویستی بە بزواندن و پاڵنان نی‌یە، ئەوا تابڵێی ئاسانە.. لەبەر ئەوەش کە جموجوولێکی کەم سەروزیادە بۆ کاولکاری‌یەکی مەزن، ئەوا سووك وئاسانە.. لەبەر ئەوەش کە ئاسانترین و کەمترین کردەوە چەندەها زیان بە کەسانێکی زۆر دەگەیەنێت، ئەوا سنوورشکاندن و دەستدرێژی کردن لەم ڕێگایەدا پەیدا دەبێت!

هەموو ئەمانەش وا لە خەڵکی دەکەن کە پێیان وابێت گومڕایان لەسەر بناغەیەك ڕاوەستابن و، گومڕایانیش وایان لێ دێت کە بە چاوی سووکایەتی بۆ خەڵکی

بڕوانن و، بە ئاشووبگێری و تۆقاندن(الإرهاب) و فیرعەونایەتی خۆیان بەسەر کەسانی تردا زاڵ بکەن!

ئنجا لە لایەکی تریشەوە، هەر لەناو خودی مرۆڤدا چەند هەستێکی ماددی و چەند هێزێکی ڕووەکی و ئاژەڵی هەن، کە نە دواڕۆژ دەبینن و نە بیریشی لێ دەکەنەوە. ئەو هەست و هێزانەی کە شەیدای تام و چێژە کاتی و حازرییەکانن..

جا بەرەڵابوونی ئەم هێزانە لە پەتەکانیان و چەشتنی تام و چێژەکانیان و تێر کردنی چلێسییان، بە ڕادەیەك لایەنە ناسك و نیانەکانی (وەك دڵ و ژیری)ی مرۆڤ دەستەوسان دەکەن کە واز لە کار و ئەرکە بنچینەیی و سەرەکییەکانی خۆیان بهێنن، کە بزواندنی ئەو هەست و نەستە بەرزانەیە هەمیشە لە هەوڵ و کۆششدان بۆ دواڕۆژ.

بەڵام ڕێی هیدایەت، کە پێغەمبەران - درودیان لەسەر بێت - لە پێشەنگی ڕێڕەوانی ئەو ڕێیەن و، خۆشەویستی خواوەندی جیهانیانیش، کە پێغەمبەری بەڕێزمانە ﷺ پێشەوای هەموویانە، ئەم ڕێیە: ڕێی "بوون" و ئیجابییەت و ئاوەدانکردنەوەیە و، بزووتن و ڕانەوەستان و لانەدانە لە سنووری ڕێی ڕاست و، بیرکردنەوەیە لە دواڕۆژ و، بەندایەتیی پاك و دڵسۆزانەیە بۆ خوای گەورە و، شکاندنی فیرعەونایەتیی دەروون و بەستنەوەی ئەو نەفسەیە کە هاندەری خراپکارییە.

لەبەر ئەمە بوو کە دووڕووەکانی ئەو سەردەمەی "مەدینە" لە بەردەم ئەم هەموو بناغە ئیجابی و پتەوانەدا وەك شەمشەمەکوێرەیان لێ هات سەبارەت بەو خۆرە تیشکدار و چرا ڕووناکی بەخشە و، چاویان لە ئاستیدا نووقاند و، کەوتنە باوەشی هێزی هاندەری شەیتان و، لە گومڕاییدا مانەوە و، بە پێشوازیی کێشی قورئانی پیرۆز و ڕاستییە هەمیشەییەکانیەوە نەڕۆیشتن.

**ئەگەر بوترێ:**

مادەم پێغەمبەری خۆشەویستی پەروەردگار ﷺ لەسەر حەقە و لە حەق بەولاوە شتی تری لە لا نییە و حەق گۆیە.. ئنجا خوای گەورەش لە غەزا و جیهادەکانی ئەم پێغەمبەرەدا ﷺ بە مەلائیکەت یارمەتیی داوە و، بە یەك مشت ئاو تینوێتیی سوپاکەی ئەوی شکاندووە و، بە چوار مشت گەنم و گۆشتی چتیرێك هەزار کەسی لە میواندارییی ئەودا تێر کردووە و، بە مشتێك خاك کە بە سەروچاوی کافراندا وەشاندی، شکستی بە کافران هێناوە و بەسەریاندا سەری خستووە.. پێشەوایەکی ئاوا ڕەبیانی وەك ئەم

پێغەمبەرە نازدارە ﷺ چۆن دەبێ لە کۆتایی جەنگی "ئوحود" و سەرەتای جەنگی "حونەین"دا کافران بەسەری‌دا سەربکەون؟

**وەڵام:**

پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خواوەندەوە نێرراوە و کراوە بە پێشەنگێکی نموونە و بەرجەستە و پێشڕەو بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی، بۆ ئەوەی گرۆی مرۆڤ ڕێباز و یاساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و خۆیی لێ وەربگرن و بە چاولێکردنی ئەو فێری ئەو یاسا و ڕێبازانە بن، تاکو لەسەر گوێڕایەڵیی یاساکانی ویستی پڕ لە دانستی خوای گەورە و دەستوورەکانی پەروەردگار، خۆیان ڕابهێنن.

جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کردارێکی خۆیی و کۆمەڵایەتی‌دا پشتی بە موعجیزە و کاری دەراسا(خارق للعادة) ببەستایە، ئەوا نەدەگونجا ببێت بە پێشەنگ و پێشڕەوێکی ئاوا مەزن و کامڵی سەرجەمی مرۆڤایەتی بە گشتی.

هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە کە پێغەمبەر ﷺ جار بە جار و لە کاتی پێویستی‌دا نەبوو بێت (ئەویش بۆ مەبەستی شکاندنی سەرپێچی و ملنەدانی کەسانی سەرسەخت و بۆ تەسدیقی دەعوای پێغەمبەرێتی‌یەکەی) موعجیزەی پیشان نەداوە و، لە کاتەکانی تردا لە هەموو کەسێك زیاتر چاودێریی یاسا بەردەوامەکەی خوای گەورەی لە گەردووندا کردووە و، هەمیشە گوێڕایەڵی یاساکانی خواوەند بووە کە لە سەر بناغەی دانستی پەروەردگاری و ویستی خوایی دامەزراون، کتومت وەك گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی بۆ فەرمانەکانی تری خوای گەورە.

لەبەر ئەم ڕاستی‌یە بووە کە لە جەنگدا زرێی دەپۆشی و، فەرمانی بە جەنگاوەر و سەربازەکانیشی دەدا کە قەڵغان بەکاربهێنن و خۆیان لە دوژمنان بپارێزن و، ئنجا وەك هەموو کەسێکی تر بریندار دەبوو و ئازاری پێ دەگەیشت و ئەرکی گیروگرفت و ئەشکەنجە و ئازارەکانیشی هەڵدەگرت..

هەموو ئەمانەشی بۆ ئەوە دەکرد، تاکو ڕادەی گوێڕایەڵی و چاودێریی تەواوەتیی بۆ یاسا پڕ لە دانستەکانی خوای گەورە و خۆ تەسلیم کردنی تەواوەتیی بۆ شەریعەتی سروشتی گەردوونی و یاساکانی دەربخات و، هەموو ئەمانە بە کردەوە بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە.

❀ **ئاماژەی دەهەم**

فێڵێکی گەورەی شەیتان ئەوەیە کە: شوێنکەوتووانی هان دەدات دان بە بوونیدا نەنێن!

وا ئێمەش بەم جۆرەی خوارەوە لە بارەی ئەم مەسەلە بەدیهییەوە، کە بریتییە لە بوونی شەیتانەکان، شتێك باس دەکەین. چونکە ئەو کەسانەی کە لەم چەرخەی ئێمەدا بە فەلسەفەی ماددی بیروڕایان چەپەڵ بووە، لە باوەڕکردندا بەم مەسەلەیە دووچاری دوودڵی بوون. لەبەر ئەوە، وا بەم جۆرەی خوارەوە باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

*یەکەم:*

هەروەك بە بینینی بێ گومان چەسپاوە کە چەندین گیانی چەپەڵ لەناو چەند جەستەیەکی ئادەمییانە و لە جیهانی مرۆڤدا دەژین و فەرمانبەری و کردارەکانی شەیتان جێبەجێ دەکەن، بە هەمان جۆر و بە بێ هیچ گومانێك ئەوەش چەسپاوە کە چەندین گیانیی چەپەڵی (بێ جەستەی ماددی) لە جیهانی "جیننی"دا هەن، بە جۆرێ کە ئەگەر جەستەی ماددییان بکرێتەبەر، ئەوا کتومت وەك ئەو مرۆڤە خراپکارانە دەردەکەون کە لەناوەندی ڕەگەزی مرۆڤدا دەژین.

هەروەها ئەگەر شەیتانەکانی ناو مرۆڤیش - کە لە شکڵ و شێوەی مرۆڤدان - بتوانن جەستە ماددییەکانیان لەبەر داماڵن، ئەوا دەبنە شەیتانی "جیننی"! هەر لەبەر ئەم پەیوەندییە توندوتۆڵە بووە کە یەکێك لە ڕێڕەوە هەڵەو نارەواکان پێی وابووە: ئەو ڕۆحیانەتە چەپەڵ و خراپکارانەی لەسەر شێوە و شکڵی مرۆڤن، پاش مردنیان دەبن بە شەیتان!

گەلێ ئاشکرایە کە ئەگەر شتی بەنرخ تێکبچێت و بگەنێت، ئەوا زۆر زیانبەخش و بێ کەڵکتر دەبێت لەچاو تێکچوونی شتێکدا کە نرخی کەمتر بێت. وەك ئەوەی کە ئەگەر "ماست" بترشێت یان "شیر" هەڵبزرکێت، دەگونجێ بخورێن. بەڵام ئەگەر "ڕۆن" تێکبچێت و خراپ بێت، ئەوا بۆ خواردن ناشێت و وەکو ژەهری لێ دێت!

هەر بەم جۆرەش: گەر مرۆڤ (کە بەڕێزترینی بەدیهاتووانی خوای گەورەیە و لە لوتکەی ئەو بەدیهێنراوانەدایە) ڕوو لە فەساد و تێکچوون بکات، ئەوا لە ئاژەڵی زیانبەخش گەلێ بێ کەڵکتر دەبێت و، وەکو ئەو مێروانەی لێ دێت کە زیاتر دڵیان بە

بۆگەنی دەکرێتەوە و چێژ و لەزەتیان لە بۆنی پیسدا دەبینن و، بە وێنەی ماریان لێ دێت کە تام و لەزەتی خۆش لە پیوەدانی خەلکیدا دەچێژن! تەنانەت ئەو مرۆڤە شانازی بەوە دەکات کە تام و چێژ و خۆشیی لە زۆنگاوی "گومڕاییی"دا دەست کەوتووە! ئنجا ئەو هەموو زیان و تاوانکارییانەش کە لە تاریکیی ستەمەوە پەیدا بوون، ئەو کەسە بە خۆش و شیرین و سازگاریان دەزانێت! بەم جۆرە، دەبێتە هاوەڵ و کالای بەری ماهییەتی شەیتان!

بەڵێ، بەهێزترین بەلگە لەسەر بوونی شەیتانەکانی "جیننی" بوونی شەیتانەکانی "ئینس"ە!!

*دووهەم:*

سەدان بەلگەی بێگومان کە لە وتەی بیست و نۆهەمدا بۆ چەسپاندنی بوونی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانی باس کراون، بەلگەی چەسپاندنی بوونی شەیتانەکانیشن. لەبەر ئەوە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین.

*سێهەم:*

هەروەك بە یەکگرتنی وتەی هەموو ئایینەکان ئەوە چەسپاوە کە: "مەلائیکەت" هەیە و، لە حوکمی سەرپەرشتیکار و نوێنەری یاسای کاروبارە خێرەکانی ناو بوونەوەراندان.. بە هەمان جۆر، بوونی شەیتان و گیانە چەپەلەکانیش - کە نوێنەری یاسا و کاروبارە خراپەکانن و بکەریانن - بێگومان و چەسپاوە.

ئنجا "ڕاستی" و "دانست"یش داخوازی بوونیانن. تەنانەت کاتی وا دەبێت بوونی هۆکار و پەردەیەکی داپۆشەر کە لە خاوەن هەست و شعوورێك بۆ مەبەستی بەڕێوەبردن و ئەنجامدانی خراپکارییەك، پێکهاتبێت، گەلێ پێویستتر دەبێت لە هەموو شتێکی تر. چونکە هەموو کەسێك توانای ئەوەی نییە جوانیی ڕاستەقینەی هەموو شتێك ببینێت. وەك لە سەرەتای وتەی بیست و دووهەمدا باسمان کردووە.

جا بۆ ئەوەی "نەفس" بە گوێی مرۆڤدا نەچرپێنێت و لەو شتانەدا کە بە گوێرەی ڕوانینی ڕواڵەتی بە شەڕ و ناتەواوی دێنە بەرچاو، ڕەخنە لە خوا نەگرێت..

هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم مرۆڤە میهرەبانیی خوای خۆی تاوانبار نەکات و، ڕەخنە لە دانستەکەی نەگرێت و سکاڵای لەدەست نەکات..

لەبەر هەموو ئەمانە، بەدیهێنەری بەتوانا و دانا، چەند هۆکارێکی ڕواڵەتی و ماددیی کردووە بە پەردە لە بەردەم کردارەکانی قەدەری خۆیدا، تاکو سکاڵا و ڕەخنەکان ئاراستەی ئەوان بکرێن نەك خوای گەورە. ئەوەتا بۆ نموونە دەبینین: نەخۆشی و بەلا و موسیبەتەکانی کردووە بە پەردە لە بەردەم مردندا، تاکو ڕەخنە و بەهانە ڕوو نەکەنە مەلائیکەتی گیان کێشان (حەزرەتی عیزرائیل، دروودی لەسەر بێت). هەروەها حەزرەتی عیزرائیلیشی کردووە بە پەردە لە بەردەم گیان کێشاندا، تاکو هیچ ڕەخنە و سکاڵایەك لەو شتانەدا کە بە ئەندێشەی مرۆڤ پێچەوانەی میهرەبانی و بەزەیین، ڕوو لە خوای گەورە نەکات.

هەر بەم جۆرەش، بەڵکو بە چەشنێکی بێ گومانتریش، دانستی پەروەردگاریتیی خوای گەورە داخوازی بوونی شەیتانەکان بووە، تاکو هەرچی بەهانەیەك هەیە و لە فەساد و زیان و شەڕ و خراپکاریەوە پەیدا بوون، ڕوو لە شەیتانەکان بکەن و ئاراستەی ئەوان بکرێن.

*چوارەم:*

هەروەك مرۆڤ جیهانێکی بچووکە، جیهانیش مرۆڤێکی گەورەیە! جا ئەو نموونە بچووکانەی کە لە مرۆڤدا هەن، دەبێ ئەسڵ و بناغە گەورەکانیشیان - بێ گومان - لە مرۆڤی مەزن(جیهان)دا بین ..

بۆ نموونە:

هێزی پارێزەر(الحافظـــة) کە لە مرۆڤدایە و هەر شتێك دێتەڕێی هەڵیدەگرێت و تۆماری دەکات و دەیپارێزێت، بوونی ئەم هێزە لە مرۆڤدا، بەڵگەیەکی بێ گومانە لەسەر بوونی "لوح المحفوظ" کە هێزێکی مەزنی پارێزەرە لە جیهانی گەورەدا و، هیچ شتێکی لە دەست دەرناچێت، بەڵکو هەرچییەکی دێتەڕێ هەڵیدەگرێت و تۆماری دەکات.

هەر بەم جۆرە، هەموو یەکێك لە ئێمە هەست دەکات کە لە ناخی دەروون و سووچێکی دڵی خۆیدا ئامراز و ئەندامێك هەیە بۆ وروژاندنی وەسوەسە و گومانەکان، ئەویش لایەنە هاندەرەکەی شەیتانە کە پێی دەوترێت: "اللمة الشـــيطانية" و زمانی شەیتانێکە بە فێرکردنی هێزی "واهیمە" لە مرۆڤدا دەدوێت. وەك بڵێی - بەم فەساد و تێکچوونەی - بووە بە شەیتانێکی بچووك، چونکە تەنها لە دژی ویستی مرۆڤ و بە پێچەوانەی ئارەزووە ڕاستەقینەکانیەوە دەدوێت.

جا ئەمەی کە هەموو کەسێك لە خۆیدا هەستی پێ دەکات، بەڵگەیەکی گومان لێ نەکراوی بوونی شەیتانە گەورەکانە لە جیهانی مەزندا.

هەروەها ئەو لایەنەی شەیتان و ئەو هێزی واهیمەیە، ئەوە دەگەیەنن کە دەروونێکی دەرەکیی خراپکار هەیە، فوو بە یەکەمیاندا دەکات و، دووهەمیشیان دەخاتە گوفتار و، بە وێنەی گوێ و زمان بەکاریان دەهێنێت.

❁ **ئاماژەی یازدەهەم**

قورئانی پیرۆز بە شێوازێکی ئیعجازبەخش، ڕق و قین و خەشمی بوونەوەران و هەموو توخمەکانی، لە پێڕی گومڕایان دەردەبڕێت، کاتێ کە وەسفی بەشداری کردنی زەوی و ئاسمان دەکات لەو هێرشەدا بردیان بۆ سەر قەومی "حەزرەتی نووح" -دروودی لەسەر بێت- لە کاتی تۆفاندا و، لەو کاتانەدا کە باسی ئەوە دەکات بای توند و بەتین قەومی "عاد"ی هەپروون هەپروون کرد و، دەنگ و نەعرەتەش لە دژی قەومی "سەموود" کەوتەکار و، لافاوی ئاو بەسەر "فیرعەون"دا ڕۆشت و، ڕقی زەویش لەسەر "قاروون" دەرکەوت و کردی بە ناخی زەویدا، کاتێ پشتیان لە ئیمان هەڵکرد. تەنانەت قورئان دەریدەخات کە لە قیامەتدا دۆزەخیش ئەوەندە قینی لە کافران دەبێتەوە کە لە ڕقدا خەریکە بەسەر دانیشتووانیدا پارچە پارچە ببێت[1].

بەم جۆرە، قورئانی پیرۆز ڕق و قینی بوونەوەران لە کافر و گومڕایان دەردەبڕێت و ڕوونی دەکاتەوە و، بەم شێوازە ناوازە پڕ لە ئیعجازە ئاگاداریان دەکاتەوە و سەرزەنشتیان دەکات.

**پرسیار:**

ئایا بۆچی لەبەر چەند کەسێکی کەم نرخ، کە چەند کارێکی بێ بایەخ و چەند گوناهێکی تایبەتیی خۆیان کردبێت، وا بەم جۆرە ڕقی بوونەوەران هەڵدەگرسێت؟

**وەڵام:**

لە ئاماژەکانی پێشوودا و لەچەند پەیامێکی تریشدا چەسپاندمان کە: کوفر و گومڕایی لە ڕاستیدا دەستدرێژی کردنێکی ناشیرین و تاوانێکی هێندە مەزن و فراوانن کە پەیوەندییان بە سەرجەمی بوونەوەرانەوە هەیە.

---

(١) وەك لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ﴾ (الملك:٨). واتە: دۆزەخ وەختە لە ڕقدا لەتوپەت ببێت. (وەرگێڕ)

چونکە کافران و گومڕایان پشت لەو مەبەست و ئامانجە بەرزە هەڵدەکەن کە لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا هەیە، کە بەرهەمی گرنگی ئەم ئامانجەش بریتییە لە بەندایەتی و گوێڕایەڵیی مرۆڤ بۆ پەروەردگارێتیی خوا. جا ئینکاری و سەرپێچی کردنی کافران بۆ ئەم ئاکامە گەورەیەی بەدیهێنانی بوونەوەران، کە هۆکاری سەرەکی و مایەی مانەوەی بوونەوەرانە، لە ڕاستیدا جۆرە دەستدرێژییەکە بۆ سەر مافی ئەو هەموو بوونەوەرانە.

هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو بوونەوەران ناوە جوانەکانی خوای گەورەیان تێدا دەدرەوشێتەوە، بە چەشنێك کە هەموو بەشێکی ئەم گەردوونە وەك ئاوێنەیەك وایە ئەو ناوە پیرۆزانەی تێدا دەردەکەوێت، ئەوا لەو ڕوانگەیەوە هەریەکە لە بەشەکانی بوونەوەر گرنگی و بایەخ پەیدا دەکەن و پلەیانی پێ بەرز دەبێتەوە. جا ئینکاری و سەرپێچی کردنی کافران بۆ ئەو ناوانە و بۆ پلەی بەرز و گرنگی بوونەوەران، لە ڕاستیدا بریتییە لە سووکایەتی پێ کردنێکی گەلێ توندوتیژ. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئینکاری و سەرسەختییە دەبێتە مایەی ئاڵۆزاندنی ئەو ناوانە و ناشیرین کردنیان.

هەروەها هەموو یەکێك لە بەدیهێنراوانی ناو ئەم گەردوونە، کارمەندییەکی پێ سپێراوە و، هەر بەشێکی فەرمانبەرییەکی بەسەردا دراوە. واتە: هەرچی شتی ناو ئەم بوونەوەرە هەیە ئەرك و واجبی تایبەتیی خۆی لە ئەستۆدایە. کەواتە وەك فەرمانبەر و کار پێ سپێرراوێکی خوایی وایە. جا بابای کافریش بە بۆنەی کوفرەکەیەوە، ئەو فەرمانبەرییە گرنگەی لێ دادەماڵێت و، دەیکات بە بێ گیانێکی دوور لە واتا و لە ناوەڕۆك بەتاڵ و شتێکی فانی و بێمەبەست. بەمەش ئیهانەی دەکات و نرخ و بەهای لێ دادەماڵێت.

بەم جۆرە، دەستدرێژی کردنی "کوفر"مان بۆ ڕوون بووەوە کە دەیکاتە سەر بوونەوەران!

جا مادەم گشت جۆرە جیا جیاکانی گومڕایی - هەر یەکەیان بەپێی پلەی خۆی - ئینکاریی دانستی پەروەردگارێتیی خوا لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا دەکات و، دان بە ئامانجە خواییەکانیش لە مانەوەی جیهاندا نانێت.. ئەوا لەبەر ئەمانە، بوونەوەران و بەدیهێنراوانیش ڕق و خەشمیان لە کوفر و کافران هەڵدەگیرسێت!

دەسا ئەی مرۆڤی هەژاری بێ دەستەڵات!

ئەی ئەو کەسەی کە جەستەیەکی بچووك و، ستەم و گوناهێکی یەکجار گەورەی هەیە!

ئەگەر حەز دەکەیت لە ڕق و قین و شۆڕشی بەدیهێنراوان و بوونەوەران ڕزگارت ببێت، ئەوا بزانە ڕێی سەرفرازی و ڕزگاریت لە بەردەمدایە، ئەو ڕێگایەش بەوە دەگیرێتەبەر کە بڕۆیتە ناو بازنەی ڕێنمایی‌یەکانی قورئانی پیرۆزی دانا و، شوێنی ڕاگەیەنەری دەستپاکی ئەمین ﷺ بکەویت لە ڕێی شوێنکەوتنی سوننەتە پیرۆزەکانیەوە.

دەسا فەرموو بەو ڕێیەدا هەنگاو بنێ و، شوێن‌پێی ئەو پێغەمبەرەشی تێدا ﷺ هەڵبگرە.

❀ ئاماژەی دوازدەهەم

(وەڵامی چوار پرسیارە)

◆ پرسیاری یەکەم:

چ دادگەری‌یەك لە سزای هەمیشەیی دۆزەخدا هەیە، لەسەر چەند گوناهێکی دیاریکراوی ژیانێکی تەسکی سنووردار؟

**وەڵام:**

لە ئاماژەکانی پێشوو، بە تایبەتی لە ئاماژەی یازدەهەمدا، بە ڕوونی تێ‌گەیشتین لەوەی کە تاوانی کوفر و گومڕایی سنووردار نی‌یە، بەڵکو تاوانێکی بێ‌کۆتایی و، دەستدرێژی‌یەکی بێ سنوورە.

◆ پرسیاری دووهەم:

نهێنیی "دانایی" لەو ڕاگەیاندنەی شەرعدا چی‌یە کە دەڵێت: دۆزەخ سزای کردەوەیە، بەڵام بەهەشت فەزڵێکی خوایی‌یە؟

**وەڵام:**

لە ئاماژەکانی پێشوودا بۆمان ڕوون بووەوە کە مرۆڤ بە ویستی هەندەکی و دەستکەوتی هەندەکی، نەك بە دروستکردن و بەدیهێنان..

هەروەها بەوەی کە شتێکی "نەبوو" و ئیعتیباری (نیسبی) یەکدەخات و سیفەتی بوون و مانەوەی پێ دەبەخشێت..

هەروەها بەوەی کە دەروون و ئارەزووی مـرۆڤ هەمیشـە مـەیلیان بـە لای زیـاندان و خراپکاریدایە..

بە هەموو ئەمانە، مرۆڤ دەبێتە هۆی خراپکاری و کاولکاری‌یەکی گەلێ زۆر، هـەر لەبەر ئەمانەشە کە دەبێ بەرپرسی ئەو کردەوە خراپانەی خۆی بێت کـە لـە بەدەستهێنانی هەندەکی و ئاسانەوە پەیدا بوون. چونکە "نەفس" خۆی داواکاری ئەو کردەوانە بووە و، بەدەستهێنانەکەشی هۆکارەکانی بۆ فەراهەم هێناوە.

جـا لـەبـەر ئـەوەی هەریەکـە لـەو خراپکاری‌یانـە شـتێکی نـەبوویی(عـەدەمی)یـە، ئـەوا مرۆڤی خراپکـار خـۆی بکـەری ئـەو کردەوانەیـەتی و، خـوای گـەورەش بـــەدیی‌هێناون، کەواتە مرۆڤی خراپکار شایانی ئەوەیە کە بە سزایەکی بێ سنوور، بەرپرسی ئەو تاوانە بێ سنوورانەی خۆی بێت.

بـەڵام کـرداره خـێر و چاکـەکان، لەبـەر ئـەوەی رەسـەنایەتی‌یان هەیـە و شـتێکی بوویی(وجـودی)ن، ئەوا نـە ویسـتی هـەندەکی و نـە بەدەستهێنانی مـرۆڤ هیچیـان نابنـە هۆکـارێکی بەدیهێنـەر (واتـە عیللـەتێکی موجیـب) و مـرۆڤ بـە بکـەری راسـتەقینەیان ناژمێررێت. ئنجا لەبەر ئەوەش کە دەروونی بەدخواز لە مرۆڤدا حەز و مەیل و ئارەزووی بـەلای چاکـەکاری‌دا نی‌یە، ئـەوا مـرۆڤ بـە بکـەری راسـتەقینەی چاکەکاری‌یـەکانی دانـانرێت، بـەڵکو "چاکـەکاری" شـتێکە میـهرەبانیی خـوای گـەورە داخوازیـەتی و هـەر ئەویش دروستی دەکات و بەدیی‌دەهێنێت.

ئەوەندە هەیە، مرۆڤ دەتوانێت بە ئیمان و حەز و ویست و لـە رێـی نیـازەوە ببێـت بـە خاوەنی ئەو کردەوە چاکانە. کە لەم رێگایەشەوە بوو بە خاوەنیان و ئەو کردەوانـە بـوون بە موڵکی، ئەوا بریتی دەبن لە شوکرانەی ئـەو نیعمـەت و بەخششـە زۆرانـەی کـە زووتـر خـوای گـەورە بـە مرۆڤی بەخشـیون، کـە لـە پێشـەکیی هەموویانەوە نیعمـەتی "بـوون"و "ئیمان"ە. واتە ئەو چاکەکاری‌یانە شوکرانەی عەمەلیی نیعمەتی پێشووترن. کەواتـە ئـەو بەهەشتەی کە خوای گەورە بـەڵێنی بە بەندەکانی داوە پێیـان ببەخشـێت، تەنـها فـەزڵ و میهرەبانیی خۆیەتی.

واتە هەرچـەند بـە رواڵـەت وا دەردەکـەوێت کـە بەهەشـت پاداشتی کـرداری باشـی باوەڕدار بێت، بەڵام لە ڕاستی‌دا بەخششێکی خوایی‌یە.

کەواتە لەبەر ئەوەی دەروونـی مرۆڤ هۆکـاری ئەو خراپکاری‌یانەیـە، ئـەوا شـایانی تۆڵەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی هۆکاری کردەوە چاکەکان لە خوای گەورەوەیـە، ئەوا تەنـها بەهۆی ئیمانەوە مرۆڤ بووە بە خاوەنیان و بۆی نی‌یە داوای پاداشتیان بکات، بەڵام بۆی هەیە چاوەڕوانی چاودێری و میهرەبانیی خوای گەورە بێت.

◆ پرسیاری سێهەم:

مادەم خراپکاری‌یەکان بەهۆی بڵاوبوونـەوە و دەستدرێژی کردنـەوە تەشـەنە و زیـاد دەکـەن – وەك پێشـتر بۆمـان دەرکـەوت – دەبـوو هـەر خراپکاری‌یـەك بـە هـەزار دانـە بنووسرایە و، چاکەکاری‌یەکانیش، لەبـەر ئـەوەی "وجـودی" و "ئیجـابی"ن و لـە لایـەنی ماددیشـەوە زیـاد ناکـەن، چونکـە بەهۆی "بەدیـهێنانی مـرۆڤ" و "حـەزی دەروون"یـەوە ڕوویان نەداوە، دەبوو هەر نەنووسـرانایە، هیـچ نـەبێ بـە "یـەك" چاکـە بژمێررایـە.. ئـەدی بۆچی خراپەیەك بە "یەك" دانە دەژمێررێت و "یەك" چاکەش بە "دە" و لە هەندێ کاتیشدا بە "هەزار"؟

**وەڵام:**

خـوای گـەورە لـەم ڕێگایـەوە کـەماڵ و فراوانیـی "میــهرەبانی"ی خـۆی و، جوانیــی سیفەتی "ڕەحیمی"ی خۆیمان پیشان دەدات!

◆ پرسیاری چوارەم:

ئەو سـەرکەوتنانەی گومڕایـان و خـاوەن هـێزان – کــە ئـەم گومڕایـی و هێزەشـیان دەردەخەن – بەسـەر ئـەهلی ئیمـان و هیدایـەتدا بەدەستی دەهێنـن، ئـەوە دەردەخـات کـە ئەوان خاوەنی هێزبن و پشت بە ڕاستی‌یەك ببەستن. کەواتە یان ئەهلی ئیمـان و هیدایـەت بێ هێزن، یان گومڕایان خاوەنی حەقیقەتێکن؟

**وەڵام:**

نەخێر.. نەخێر.. نە لە ئەهلی ئیماندا "لاوازی" و نە لای گومڕایانیش "ڕاستی" هەیە! بەڵام بە داخەوە هەندێ لەو کورت بینانەی کە گێل و بـێ تـەرازووی عـەقڵین، گرفتـاری دوودڵی دەبن و ورەیان نامێنێت و لـە دەروونـەوە دەشـکێن و ناتـەواوی لـە بیروباوەڕیـاندا پەیدا دەبێت و دەڵێن:

ئەگەر ئەهلی حەق لەسەر ڕێیەکی ڕاست و ڕەوان بوونایە، ئەوا نەدەبوو لە بەردەم گومڕایاندا تا ئەم ڕادەیە شکستیان بهێنایە و زەلیل بکرانایە. چونکە لەبەر ناوەڕۆکی "الحق يعلو ولا يُعلى عليه"[١] حەق لە خۆیدا بەهێزە و هێزیش تەنها لە حەقدایە. جا ئەگەر ئەو گومڕا و ناحەقویستانەی کە ڕێ لە ئەهلی ئیمان دەگرن و بەسەریاندا زاڵ دەبن، لەسەر "حەقیقەت" و بناغەیەکی پتەو نەبوونایە و پشتگیرێکی بەهێزیان نەبوایە، بەم ڕادەیە بەسەر ئەهلی حەقدا سەرنەدەکەوتن!

**لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:**

ناوەڕۆکی ئاماژەکانی پێشوو بە جۆرێکی بێ گومان چەسپاندیان کە هۆی سەرنەکەوتنی ئەهلی حەق بەسەر ئەهلی ناحەق و ناڕەوادا ئەوە نییە کە ئەمان لەسەر حەق نین و لاوازن. سەرکەوتنی گومڕایانیش هی ئەوە نییە کە گوایا بەهێز و خاوەن پشت و پەنا بن. جا ناوەڕۆکی ئاماژەکانی پێشوو وەڵامی ئەم پرسیارەن.

بەڵام لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ فێڵەکانیان و هەندێ لە چەکە بەکارهێنراوەکانیان دەکەین:

خۆم چەندین جار بە چاوی خۆم بینیومە و سەرنجم داوە کە: لە سەدا دەی گومڕایان و ئەهلی فەساد بەسەر لەسەدا نەوەدی چاکەکاران و ئەهلی ئیماندا سەرکەوتوون! منیش گەلێ سەرم لەم کارە سووڕدەما!

پاشان بە بیرکردنەوە و تێڕامان دڵنیا بووم لەوەی کە دەستەڵات پەیداکردن و سەرکەوتنی ناحەقویستان لەبەر ئەوە نییە کە هێزێکی خۆیی و توانایەکی ڕەسەنیان بێت، بەڵکو لەو ڕێگا نزم و فاسید و کەم نرخانەی کە دەیانگرنەبەر و لەو خراپکارییانەوە کە ئەنجامیان دەدەن، سەری هەڵداوە و پەیدا بووە. جگە لەوەی کە ئەوان ناکۆکی و شپرزەیی ئەهلی حەق بە هەل دەزانن و، جیاوازی و ڕقەبەرایەتییان لە نێواندا دەنێنەوە، یان دەرفەت لە لاوازیی ئەهلی حەق دەبینن و ئەوەندەی تر فوو بەو

---

(١) شێخ ئیسماعیلی عەجلوونی لە کتێبی "كشف الخفاء"دا بەم جۆرە ڕیوایەتی ئەم فەرموودەیە دەکات: "الإسلام يعلو ولا يُعلى". پاشان دەڵێت: "رواه الدارقطني والروياني عن عائذ بن عمرو المزني رفعه، والطبراني والبيهقي عن معاذ رفعه، وعلقه البخاري في صحيحه. والمشهور على الألسنة زيادة (عليه) آخراً، بل هي رواية أحمد. والمشهور أيضاً على الألسنة: (الحق يعلو ولا يُعلى عليه)... " أهـ. بڕوانە: "كشف الخفاء"ج١ ص١٢٧ الحديث رقم٣٦٢. (وەرگێڕ).

لاوازی‌یەدا دەکەن و، هەست و غەریزە ئاژەڵی و دەروونی‌یەکان و ئامانجە کەسی‌یەکان لەواندا دەهەژێنن. ئنجا هەرچی توانا و لێهاتنێکی زیانکاریش لە سروشتی مرۆڤدا شك دەبەن، دەیانخەنە کار و، بە ناوی: ناوبانگ و پلە و پایە و دەستەڵاتەوە دەستی ئافەرینیش بەسەر شانی فێرعەونایەتیی "دەروون"دا دەهێنن. جگە لەمانەش، خەڵکی لە ستەم و کردارە ڕووخێنەرەکانیان دەترسن و خۆیانی لێ دەپارێزن..

لەبەر ئەم فڕوفێڵانەی شەیتان و هاوچەشنیانە کە گومڕایان و ناحەقویستان - بە شێوەیەکی کاتی - بەسەر ئەهلی حەق و ئیماندا سەردەکەون.

بەڵام ئەو سەرکەوتنە کاتی‌یەی ئەوان لە بەردەم مزگێنی‌یەکەی خواوەنددا کە دەفەرموێ: ﴿**والعاقبةُ للمتقين**﴾ (الاعراف:١٢٨) و، لە بەردەم فەرموودەی "الحقُ يعلو ولا يُعلى عليه"دا، هیچ نرخ و بایەخێکی نی‌یە. چونکە دەبێتە هۆی ڕۆشتنی ئەوان بۆ دۆزەخ و ئەهلی حەقیش بۆ بەهەشت.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە هەموو لاوازێکی بێ هێز، لەناو گومڕاییدا بە خاوەن هێز دەردەکەوێت و، هەموو مرۆڤێکی نزمی بێ بایەخیش پلە و پایەی لەم ڕێگایەدا دەستگیر دەبێت، ئەوا گشت خۆپەرست و ڕیابازێك و هەموو ئەو کەسانەش کە حەز لە ناوبانگ دەکەن، ڕێی گومڕایی دەگرنەبەر و، لەوێوە دەست بە دەستدرێژی و تۆقاندنی خەڵکی دەکەن، بۆ ئەوەی پلە و پایە و ناوبانگیان دەستگیر ببێت!!

بەم جۆرە، ئەو مرۆڤە دەڕواتە ڕیزی دوژمنانی ڕێڕەوی حەق و ئیمانەوە، بۆ ئەوەی سەرنج و بیری خەڵك بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و، کاتێ خەڵکی باسی کردەوە چەپەڵ و نەفرین لێکراوەکانی دەکەن باسی خۆیشی بکەن! ئەو کردەوانەی کە لە هیچ هێز و دەستەڵاتێکی خۆیی‌یەوە پەیدا نەبوون، بەڵکو تەنها ئەنجامی ئەوەن کە دەستی لە چاکە هەڵگرتووە و وازی لێ هێناوە!

ئەم ڕاستی‌یەش هێندە لەناو خەڵکیدا زانراوە کە دەگێڕنەوە: جارێکیان یەکێك لەو ناوبانگ پەرستانە ڕۆشتووەتە ناو مزگەوتێکی پیرۆز و خاوێنەوە و پیسی کردووە، تەنها بۆ ئەوەی باس بکرێت! لە ڕاستیشدا باس کرا، بەڵام بە لەعنەت!! ئەوەبوو خۆشەویستی‌یە بەتینەکەی بۆ ناوبانگ دەرکردن، ئەو کارە ناڕەوا و ناپەسەندەی لەبەر چاودا ڕازاندەوە!

دەسا ئەی ئەو مرۆڤەی كە بۆ جیهانی هەمیشەیی دروست كراوە و، كەچی گیرۆدەی داوی ئەم دنیا فانیی‌یەیە!

وەرە سەرنج لەم ئایەتە پیرۆزە بدە و گوێی لێ ڕابگرە كە دەفەرموێ:

﴿فما بَكَتْ عليهِمُ السَّماءُ والأَرضُ﴾ (الدخان:٢٩).

سەیر بكە و بزانە چی دەفەرموێ؟

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕاشكاوی ڕایدەگەیەنێت كە:

ئاسمان و زەوی - كە پەیوەندی‌یان لەگەڵ مرۆڤدا هەیە - بۆ مردنی گومڕایان ناگرین! واتە بە مردن و نەمانیان ڕازی و شادمان و كامەرانن!

ناوەرۆكی ئایەتەكەش ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە:

زەوی و ئاسمانەكان بەسەر تەرمی ئەهلی هیدایەتدا دەگرین و خەفەتباری مردنیانن! چونكە ئیمانداران، بەهۆی ئیمانەكەیانەوە، بەدیهێنەری بوونەوەران دەناسن و، لەو ڕێگایەوە بوونەوەرانیان خۆش دەوێت و ڕێزیان لێ دەگرن و، وەك گومڕایان نین هەتا ڕقیان لە بوونەوەران بێت و بە چاوی سووكایەتی سەیریان بكەن.

دەسا ئەی برای مرۆڤم!

سەرنج لە ئایندە و دواڕۆژی خۆت بدە. خۆ چار نی‌یە هەر دەبێ بمریت و كۆچی ماڵئاوایی لەم دنیایە بكەیت. جا ئەگەر لە ڕیزی ئەو كەسانەدا بیت كە ئارەزووەكانی خۆیان كردووە بە شوێنكەوتەی شەیتان، ئەوا هەرچی بەرودراوسێ و تەنانەت خزمانیشت هەن، بە مردنت دڵخۆش دەبن، چونكە لە شەڕ و خراپكاری‌یەكانت ڕزگاریان دەبێت!

بەڵام گەر خۆت لە دەستی شەیتان دەرباز بكەیت و لەو جۆرە كەسانە بیت كە هەمیشە "أعوذ بالله من الشیطان الرجیم" دەڵێن و، بۆ خۆت پەنا بۆ خوای گەورە بەیت و، گوێڕایەڵی فەرمانەكانی قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانیان ﷺ بیت، ئەوا زەوی و هەموو ئاسمانەكان خەم و پەژارە دایاندەگرێت و، لە ناوەرۆكدا - بەپێی پلەی خۆت - بۆ جوداییت دەگرین و، بەم خەمباری‌یە بەرز و ماتەمینی‌یە گشتی‌یەشەوە تا دەرگای گۆڕ ڕەوانەت دەكەن و، بەم كارەشیان ئەو پێشوازی‌یە ڕەنگینە دەردەبڕن كە لە جیهانی نەمری‌دا - بە گوێرەی پلەی خۆت - بۆت ئامادە كراوە!

❀ **ئاماژەی سیازدەهەم** (سێ خاڵی لەخۆ گرتووە):

● خاڵی یەکەم:

گەورەترین فێڵی شەیتان ئەوەیە کە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەکاری دەهێنێت سەبارەت بە ڕاستی‌یە گەورەکانی ئیمان دەروونیان تەسکە و، پێیان دەڵێت:

چۆن باوەڕ بەوە دەکرێت کە دەڵێن: سەرجەمی کاروبارەکانی گەردوون، هەر لە گەردیلەوە تا دەگاتە ئەستێرە و قەبارە گەورەکانی ئاسمان و هەموو شتێکی تریش و لە هەموو کاتێکدا، تەنها یەك کەس بەڕێوەیان دەبات و سەرپەرشتی‌یان دەکات؟ ئایا بیر و هۆش و دڵی مرۆڤ چۆن باوەڕ بەم مەسەلە گەورە و سەرسووڕهێنەرە دەهێنێت؟

بەم چەشنە، لە لایەنی لاوازی و بێ دەستەلاتیی مرۆڤەوە، شەیتانی لەعنەتی جۆرە هەستێکی ئینکاری کردن لەو مرۆڤەدا دەهەژێنێت.

**وەڵام:**

وەڵامی ڕاستەقینەی ئەم پرسیارە و، دەمکوتکەری ئەم فێڵەی شەیتان تەنها لە "اللهُ أكبر"دایە!

بەڵێ، وتنی: "الله أكبر" و دووپات بوونەوەی لە هەموو جۆرەکانی پەرستشدا، تەنها بۆ لەناوبردن و قەلاچۆکردنی ئەم فێڵەی شەیتانە. چونکە لەبەر ئەوەی مرۆڤ هێزی کەمە و دەستەلاتی لاوازە و بیرکردنەوەشی لە سنوورێکی دیاریکراودایە، ئەوا تەنها بە نووری " الله أكبر" ئەو ڕاستی‌یە ئیمانی‌یانە دەبینێت و، بە هێزی "الله أكبر" هەڵیان دەگرێت و، لە چوارچێوەی "الله أكبر"یشدا جێگایان لە ناخی دڵدا دەکاتەوە!

جا دوای ئەوەی کە بەهۆی "الله أكبر"ەوە ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان لە دڵدا جێگیر بوون، ئیتر هەر کاتێ ئەو فێڵانەی شەیتان لە مرۆڤ نزیك ببنەوە، ئەوا بەم جۆرەی خوارەوە وەڵامی دڵی خۆی دەداتەوە و پێی دەڵێت:

بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردنی ئەم گەردوونە سەرانسەر ڕێکوپێك و جوانەی کە هەموو کەس دەیانبینێت، تەنها لە دوو ڕێگاوە لێکدەدرێتەوە:

*ڕێگای یەکەم:*

ئەم ڕێ‌یە هەروەك ژێری ڕێی پێ‌دەبات و پێی ڕاستە و پەسەندی دەکات، لە هەمان کاتدا موعجیزەیەکی دەراسایشە، چونکە ئاسەوارێکی ئاوا پڕ لە موعجیزە، بێ گومان دەبێ لە کردارێکی دەراساوە پەیدا بوو بێت.

ئـەم ڕێیـە بریتی‌یـە لـەوەی کـە: سـەرجەمی بوونـەوەران یـەك خـوای خـاوەنی پەروەردگارێتیی تاك و تەنیا و دارای دەسته‌ڵاتی بێ سنوور، بەدیی‌هێناوە و، سەرانسـەری گەردوونیش - بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی - شایەتی لەسەر "بوون" و "یەکتایی" ئەو دەدەن.

*ڕێگای دووهەم:*

ڕێی باوەڕنـەکردن و کوفر و هـاوەڵ بڕیاردانە، کە ڕێیەکە لـە هـەموو لایەنێکیـەوە مەحاڵە و، ژیریی مرۆڤ هەرگیز نایسەلمێنێت، چونکە گرتنەبەری ئـەم ڕێگایـە داخـوازی ئەوەیە کە لـە هـەموو شتێکی ئـەم گەردوونـەدا، تەنانـەت لـە گشـت گەردیلەیـەکی‌دا، خوایەك ببێت خاوەنی زانستێکی یـەکجار فـراوان و دەسـتەڵاتێکی نـەبڕاوەی بێ سـنوور بێـت، تـاکو بتوانێـت نـەخش و نیگـارە نـاوازە و ڕێـك و ڕەنگینـەکانی بەدیـهێنان (بـەم ڕێکوپێکی و قەشەنگی‌یەی کە لە بەرچاودایە و بەم لێك جیاکردنەوە و تەقدیرە وردانـەی کە هەن) دروست بکات و بهێنێتەدی! خۆ دیارە ئەمەش کارێکی مەحاڵـە و لـە سنووری بیرکردنەوەی ژیریی مرۆڤدا جێی نابێتەوە، وەك لە مەکتووبی "بیستەم" و وتەی "بیسـت و دووهەم" و گەلـێ پەیامی تردا، بە چەندین بەڵگە، مەحاڵیی ئەم ڕێگایەمان چەسپاندووە.

**بە کورتی:**

ئەگەر پەروەردگارێتی‌یەکی ئەوتۆ نەبێت کـە شایسـتە و خـاوەنی مەزنایـەتی و توانـای بێ سنوور بێت، دەبێ ڕێیەکی هەڵەتی تابڵێی دوور لـە ژیری بگیرێتەبەر؛ ڕێیەکی هێندە مەحاڵ کە تەنانەت شەیتانیش زۆر لـە کەس ناکات واز لـەو گەورەیی و دەستەڵاتە حەق و شایستە و ڕەوایە بهێنێت و ڕێی وا بگرێتەبەر!

● خاڵی دووهەم:

فێڵێکـی تـری شـەیتان ئەوەیـە کـە هـانی مـرۆڤ دەدات دان بــە تاوانـەکانی خـۆی‌دا نـەنێت، تـاکو داوای لێبـوردن لـە خـوا نـەکات و لێـی نەپاڕێتـەوە کـە لـە شـەڕی شـەیتان بیپارێزێت!

بەم جۆرە، شەیتان هەستی خۆویستی لـەو مرۆڤـەدا دەبزوێنێـت و، وەکـو پـارێزەرێکی لـێ دەکات کە بۆ داکۆکی کردنی لە دەروونـی خـۆی، هیـچ کـەموکووڕی و تـاوانێکی تێدا نەبینێت!

بەڵێ، دەروونێك گوێڕایەڵی شەیتان بێت، نایەوێت تاوان و کەموکووڕی‌یەکانی خۆی ببینێت. خۆ ئەگەر بیشی‌بینێت، بە سەد جۆر پاساوی دەدات و واتای تری لێ دەداتەوە و، بە چاوی ڕازی بوونەوە سەیری خۆی و کردەوەکانی دەکات. ئیتر وەك شاعیر دەڵێت: "وعينُ الرِضا عنْ كلِ عَيبٍ كَليلةٌ"[1] هیچ ناتەواوی‌یەك لە کردەوەکانی خۆی‌دا نابینێت و، دان بە تاوانەکانی‌دا نانێت، پاشان داوای لێبووردنیش ناکات و لە خوا ناپاڕێتەوە کە لە شەڕی شەیتان بیپارێزێت و، بەم جۆرە دەبێت بە گاڵتەجاڕی شەیتان!

بەڵام چۆن دەبێ مرۆڤ باوەڕ بەو دەروونە بکات و پشتی پێ ببەستێت کە هاندەری خراپکاری‌یە، لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی یەکێك لە پێغەمبەرە گەورەکانەوە (کە حەزرەتی یووسفە - دروودی خوای لەسەر بێت) باسی دەکات و دەفەرموێ:

﴿وما أُبَرِّئُ نفسي إنَّ النفسَ لأمّارَةٌ بالسُّوءِ إلاّ ما رَحِمَ رَبّي﴾ (یوسف:٥٣)؟

جا هەر کەس دەروونی خۆی بە تاوانکار بزانێت، کەموکووڕی‌یەکانیشی دەبینێت. هەر کەسێکیش دانی بە تاوانەکانی خۆی‌دا نا، داوای لێبووردنیش لە خوا دەکات. ئەو کەسەش داوای لێبووردن بکات، خوای گەورە لە شەڕی شەیتان دەیپارێزێت و، لە فێڵەکانیشی ڕزگاری دەکات.

شتێکی ئاشکرایە کە گەورەترین تاوان ئەوەیە مرۆڤ تاوانی خۆی نەبینێت و، گەورەترین کەموکووڕیش ئەوەیە کەموکووڕی‌یەکانی خۆی بەرچاو نەکەوێت. جا هەر کەسێك دانی بە تاوان و عەیبی خۆی‌دا نا، ئەوا عەیبی نەماوە. دیارە ئەو کاتەش شایانی ئەوە دەبێت خوای گەورە بی‌بووڕێت و لێی خۆش ببێت.

● خاڵی سێ‌هەم:

ئەو شتەی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەشێوێنێت، ئەم فێڵەی شەیتانە کە:

---

(١) ئەم شیعره هی ئیمامی شافیعی‌یە، بڕوانە: "ديوان الإمام الشافعي" ص٩١ جمع وتعليق محمد عفيف الزعبي. نشر دار النور، بيروت سنة ١٣٩١هـ – ١٩٧١م. بە تەواویش بەم جۆرەیە:

وعين الرضا عن كل عيب كليلة　　كما أن عين السخط تبدي المساويا

واتە: چاوی ڕازی بوون لە ئاستی هەموو نەنگی‌یەکدا نابینایە، بەڵام چاوی ڕازی نەبوون هەر خراپە دەردەخات. (وەرگێڕ)

(لەبەر تەنها یەك کردەوەی خراپی مرۆڤی باوەڕدار، پەردە بەسەر هەموو کردەوە چاکەکانی‌دا دەکێشێت و هەموویان دەشارێتەوە)!

ئەو بێ ویژدانانەی کە گوێ لەم فێڵەی شەیتان دەگرن، دوژمنایەتی لەگەڵ مرۆڤی باوەڕداردا دەکەن.

بەڵام خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی‌دا بە دادگەریی نەبڕاوەی خۆی کردەوەکانی مرۆڤ هەڵدەسەنگێنێت و، بەپێی یاسای: "زۆریی چاکە یان خراپە لەچاو ئەوی تردا" بڕیار دەدات. ئنجا لەبەر ئەوەش خراپەکاری بە ئاسانی ڕوو دەدات و هۆی پەیدابوونیشی گەلێ زۆرە، ئەوا تەنها یەك کردەوەی چاك زۆر لە کردەوە خراپەکان دەشواتەوە و لە کێشانەدا بەسەر گەلێ کردەوەی خراپدا سەردەکەوێت و قورس دەبێت.

لەبەر ئەوە، پێویستە ئێمەش لەم دنیایەدا بەپێی ئەم تەرازووە پڕ لە دادگەری‌یەی خوای گەورە ڕەفتار بکەین. واتە: ئەگەر مرۆڤێك کردەوە چاکەکانی زۆرتر بوون، چ بە چەندایەتی و چ بە چۆنێتی، دەبێ ڕێزی لێ بگرین. بەڵکو هەندێ جار دەبێ چاو لە زۆر کردەوەی خراپ و گوناهی بپۆشرێت، تەنها لەبەر کردەوەیەکی چاکی تایبەتی.

بەڵام مرۆڤ بەهۆی هاندانی شەیتان و بەهۆی ئەو ستەمکاری‌یەی لە دەروونیدایە، تەنها لەبەر کردەوەیەکی خراپ کە لە برایەکی باوەڕداریەوە ڕووی دابێت، سەدان کردەوەی چاکی ئەو برایەی لەبیردەچێتەوە و پاشان دەست بە دوژمنایەتی کردنی براکەی دەکات و، بەم جۆرە دەکەوێتە ناو تاوانباری و گوناهەوە.

هەروەك دانانی باڵەمێشێك لەسەر چاوی مرۆڤ وەك پەردەیەکی لێ دێت و ڕێ لە بینینی چیایەکی گەورە و بەرز دەگرێت، ڕق و کینەیش بە هەمان جۆرە، چونکە کردەوەیەکی خراپی بچووکی بە ئەندازەی باڵە مێشێك دەکات بە پەردە لە بەردەم چەندین کردەوەی باشی بە ئەندازەی چیایەکی گەورە و بەرزدا، ئیتر ئەو کاتە مرۆڤ چاکەی براکەی لە یاد دەباتەوە و، دەست بە دوژمنایەتیی برای موسڵمانی خۆی دەکات. بەو جۆرە دەبێت بە ئەندامێکی زیانبەخش و ئامێرێکی کاولکار لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیمانداراندا.

* * *

فێڵێكـی تـری شـەیتان هەیـە، وەك ئـەوەی ئێسـتا باسمـان كـرد وایـە، لـەوەدا كـە بیر كردنەوەی ئیماندار تێكـدەدات و لـە ڕێ دەیـترازێنێت و ڕوانینی مرۆڤی بـاوەڕدار بـۆ ڕاستی‌یەكانی ئیمان دەشێوێنێت، ئەویش ئەوەیە كە:

(هەوڵ دەدات سەدان بەڵگەی چەسپێنەر لەسەر ڕاستی‌یەكی ئیمـان پـووچ بكاتـەوە، تەنها لەبەر شوبهە و گومانێك كە ئاماژە بۆ نەسەلماندنی ئەو ڕاستی‌یە بكات).

واتە بە پێچەوانەی ئەو دەستوورەی كە دەڵێت:

"تەنها یەك بەڵگەی چەسپێنەر بەسەر چەندەها بەڵگەی نەسەلمێنەردا، سەردەخرێت".

یان ئەوەی كە دەڵێت:

"حوكمی هەر دەعوایەك كە بەهۆی یەك شایەتی چەسپێنەرەوە درابێت، بەسەر قسەی سەد كەسدا سەردەخرێت كە نەفیی بكەن و نەیسەلمێنن".

با ئەم ڕاستی‌یە لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەدا ڕوون بكەینەوە:

ئەگەر وا دابنێین كۆشكێكی مەزن سەدان دەرگای داخراوی تێدا بێت، ئەوا تەنها بـە كردنەوەی یەكێكیان چوونە ژوورەوەی كۆشكەكە لـە توانـادا دەبێـت و، هـەر كەسـێك بیـەوێت دەتوانێـت بڕواتـە ژوورەوە، ئنجـا كـە ڕۆشـتە ژوورەوە دەرگاكـانی تریـش دەكرێنـەوە. واتـە ئیـتر مانـەوەی هـەندێ لـە دەرگاكـان بـە داخـراوی، ڕێ لـە چوونەژوورەوەی ناو كۆشكەكە ناگرێت.

ڕاستی‌یە مەزنەكانی ئیمانیش، وەكو ئـەم كۆشـكە گەورەیـە وان و، هـەر بەڵگەیـەكی چەسپێنەریش لە بریی كلیلی یەكێكە لەو دەرگایانـە. كەواتـە نابێ تەنـها لەبەر مانەوەی یەكێك لەو دەرگایانـە بە داخـراوی، لـە نێـوان سـەدان دەرگـای كـراوەدا، ئینكـاری لـە ئاستی ئەو ڕاستی‌یە ئیمانی‌یەدا بنوێنرێت و پشتی لـێ هەڵبكرێت.

بەڵام شەیتان بەشێكی زۆری خەڵك ـ لەبەر چەند هۆیەكی وەك نەزانی و بێ‌ئاگایی ـ دەخەڵەتێنێت و ئاماژە بۆ دەرگا داخراوەكان دەكات و پێیان دەڵێت:

"چوونەژوورەوە بۆ ناو ئەو كۆشكە هەرگیز لە توانادا نی‌یە".

بۆ ئەوەی هەموو بەڵگە چەسپێنەرەكان لە كار بخات.

یان بەوە لەخشتەیان دەبات كە پێیان دەڵێت:

"کەس ناتوانێت بڕواتە ناو ئەم کۆشکەوە، هەر تەنها تۆیشی کە بە کۆشکی دەزانیت، دەنا نە کۆشکە و نە هیچیشی تێدایە".

دەسا ئەی ئەو مرۆڤە هەژارەی کە گیرۆدەی داوی فڕوفێڵی شەیتانە!

ئەگەر دەتەوێت لە ژیانی ئایینی و کەسی و کۆمەڵایەتی‌دا بێ وەی و پارێزراو بیت و، بیر و هۆشت لەسەرخۆ بێت و لەڕێ نەترازێت، ئەوا هەموو گوفتار و کردارێکت بە تەرازووی قورئانی پیرۆز و سوننەتە شیرینەکانی پێغەمبەرمان ﷺ بپێوە و ڕەفتاریان پێ بکە. با پێشەوا و ڕابەرت تەنها قورئانی پیرۆز و سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەر بێت ﷺ.

ئنجا بە دڵێکی خاوێن و لالانەوەیەکی بەکوڵەوە دەستی نزا بەرز بکەرەوە و لە دەرگانەی خوای گەورەدا بپاڕێرەوە و، بڵێ:

"أعوذُ باللهِ مِنَ الشيطانِ الرجيم".

ئەمە سیازدە ئاماژەی ئەوتۆ کە بریتین لە سیازدە کلیل بۆ کردنەوەی قەڵا مەحکەم و قایمەکەی دواهەمین سوورەتی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجاز، ئەو سوورەتەی کە گەنجینەی خۆ بەخوا پاراستنە لە شەڕی شەیتان و، ڕوونکردنەوەیەکی درێژی ئەم پەنابردنەیە.

دەسا تۆش بەم کلیلانە ئەو قەڵایە بکەرەوە و بڕۆرە ناویەوە، با سەلامەتی و بێ وەیی و ئاسایش و دڵنیاییت دەستگیر ببێت:

أعوذُ باللهِ مِنَ الشيطانِ الرجيم

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿قُلْ أَعوذُ بِرَبِّ الناسِ ۞ مَلِكِ النّاسِ ۞ إلهِ النّاسِ ۞ مِنْ شَرِّ الوَسْواسِ الْخَنّاسِ ۞ الذي يُوَسْوِسُ في صُدورِ النّاسِ ۞ مِنَ الْجِنَّةِ والنّاسِ﴾.**

**﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ العليمُ الْحكيمُ﴾.**

**﴿وقُلْ رَبِّ أَعوذُ بِكَ مِنْ هَمَزاتِ الشَّياطينِ ۞ وأَعوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرونِ﴾.**

# بریسکەی چواردەهەم

ئەم بریسکەیە لە دوو مەقام پێکهاتووە

## مەقامی یەکەم

وەڵامی دوو پرسیارە

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برای ئازیز و ڕاست و بەوەفام کاك ڕەئفەت!

ئەو پرسیارەی کە لە بارەی گا و نەهەنگ(الثـــور و الحـوت)ەوە کردبـووت، وەڵامەکەی لە هەندێ پەیامدا هەیە. ئنجا لە "لقی سێهەمی وتەی بیست و چوارەم"یشدا دوازدە قاعیدەی گرنگ لە ناوەندی دوازدە دەستووردا سەبارەت بەم جۆرە پرسیارانەوە ڕوون کراونەتەوە و، ئەو دەستوورانە چەند بناغەیەکی گەلێ گرنگن بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر وەهم و گومانێك ئاراستەی فەرموودە پیرۆزەکان بکرێت و، هەریەکەیان پێوەرێکی باشن بۆ دەرخستنی تەئویلە جۆراوجۆرەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

برام! من تەنها سەرقاڵی ئەو بابەتانەم کە "سنووحات"ن و کتوپڕی وەك دەرفەت بۆ "دڵ" دێن و، بە داخەوە - ئێستا - چەند حاڵەتێکی ئەوتۆ هەن بواری ئەوەم نادەن خەریکی باس و بابەتە زانستییەکان بم. بۆیە ناتوانم وەڵامێکی تێروتەسەلی پرسیارەکەتان بدەمەوە. خۆ ئەگەر خوای گەورە تەوفیق بدات و دەرگای "سنووحات" لە دڵ بکاتەوە ئەوا ناچار دەبم پێیانەوە سەرقاڵ بم و، لەوانەیە تەنها وەڵامی ئەو جۆرە پرسیارانە بدرێنەوە کە لەگەڵ ئەو سنووحاتانەدا بگونجێن.

جا تکام وایە لەوە دڵگران نەبن کە ناتوانم وەڵامی تێروتەسەلی هەموو پرسیارەکانتان بدەمەوە. بەڵام با ئەم جارەیان وەڵامێکی کورتی پرسیارەکەت بدەمەوە.

✿ **برام! لە پرسیارەکەتاندا باسی ئەوەتان کردووە کە:**

زانایانی ئایین دەڵێن: زەوی لەسەر "گا و نەهەنگ" ڕاگیر کراوە. کەچی جوگرافیا بە هەسارەیەکی هەڵواسراوی دەبینێت کە وەك هەموو هەسارەکانی تر بە ناو بۆشایی ئاسماندا هاتوچۆ دەکات، نە گا لە گۆڕێدا هەیە و نە نەهەنگ!

**وەڵام:**

ڕیوایەتێك لە زاتێکی وەك"ئیبن عەبباس"ەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە دەڵێت[1]:

پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: زەوی لەسەر چی ڕاوەستاوە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: "علی الثور والحوت".

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: جارێك لە وەڵامدا فەرموویەتی: "علی الثـور" و لە وەڵامێکی تردا فەرموویەتی: "علی الحوت".

بەڵام هەندێ کەس لە "مُحَدِّثـین" ئەم ڕیوایەتانەیان بەسەر چەند چیرۆکێکی ئەفسانەیی و "ئیسرائیلیات"دا شکاندووەتەوە، بە تایبەت ئەو ئەفسانە و حیکایەتانەی کە لە زانا نۆموسڵمانەکانی بەنیئیسرائیلەوە بیستراون لەوانەی کە واتای فەرموودەکەیان گۆڕیوە و بە جۆرێکی گەلێ سەیر و نامۆ لێکیان داوەتەوە و بەسەر چەند داستان و چیرۆکێکدا شکاندوویانەتەوە کە لە کتێبە پێشووەکاندا سەبارەت بە گا و نەهەنگەوە باس کراون.

---

(1) دانەر لە کتێبێکی تریدا بە ناوی (موحاکەمات) سەبارەت بەو ڕیوایەتە، وتوویەتی:
لەبارەی ئەوەی کە زەوی لەسەر (گا و نەهەنگ) بێت حەدیسێك ڕیوایەت کراوە. بەڵام:
یەکەم: نایسەلمێنین کە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێت، چونکە نیشانەی "ئیسرائیلیات"ی پێوەیە!
دووهەم: ئەگەر بیشسەلمێت کە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ، ئەوا حەدیسێکی "ئاحاد"ە و لەبەر لاوازیی پەیوەندیییەکانی نێوان سەنەدەکەی "ظـەن" دەگەیەنێت، نەك "یەقین". کەواتە ناڕواتە بواری بابەتەکانی عەقیدەوە، چونکە ئەو بوارە "یەقین" دەگرێتە بە مەرج.
سێهەم: تەنانەت ئەگەر "موتەواتیر" و "قطعي المتن"یش بێت، "قطعي الدلالة" نییە.
لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵکانی ڕواڵەت بین لەوانەی کە شوێنی خەیاڵ و ئەندێشە کەوتوون ئەم حەدیسەیان لە واتا ڕاستەکەی خۆی ترازاندووە.
ئەم حەدیسە - گەر بسەلمێت فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ - سێ ڕووی ڕاستی هەیە.
(مامۆستا نوورسی لە دەقەکەی سەرەوەدا ڕووە ڕاستەکانی ڕوون کردووەتەوە). (پەراوێزی وەرگێڕ)

وا ئێستا لێرەدا و بۆ مەبەستی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەت، ئێمە بە کورتی ئاماژە بۆ سێ بناغە و سێ ڕووی ئەم مەسەلەیە دەکەین:

❑ **بناغەی یەکەم:**

دوای ئەوەی کە هەندێ لە زانایانی "بەنی ئیسرائیل" موسڵمان بوون، زانستەکانی پێشوویان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووە ناو ئیسلام. واتە بوون بە ماڵ بەسەر ئیسلامەوە و لە لایەن خەڵکەوە بە زانستی ئیسلامی تەماشا کران. لە کاتێکدا کە زانستە پێشووەکانی ئەوان گەلێ هەڵەیان تێدا بووە. کەواتە ئەو هەڵانە هی ئەوانن، نەك هی ئیسلام.

❑ **بناغەی دووهەم:**

هەرکات "تەمثیل" و "تەشبیهەکان" لە دەستی کەسانی تایبەتمەند دەربچن و بکەونە دەستی عەوامەکان، واتە لە دەستی زانستەوە بکەونە ناو دەستی نەزانی، ئەوا بە تێپەڕبوونی کات وەك ڕاستی و "حەقیقەت" دادەنرێن و لەوە دەردەچن کە وەك تەشبیهـ تەماشا بکرێن!

بۆ نموونە:

لە تافی منداڵیمدا جارێکیان مانگ گیرا، لە دایکمم پرسی: چی بەسەر مانگدا هاتووە؟ وتی: مار قووتی داوە! وتم: خۆ هێشتا هەر دەبینرێت؟ وتی: ماری ئاسمان وەك شووشە وایە، ناوەوەیان دیارە!

زۆر جار کە ئەم ڕووداوەم دەهاتەوە یاد، لە خۆمم دەپرسی: خورافەتێك کە تا ئەم ڕادەیە لە ڕاستییەوە دوورە، چۆن کەوتووەتە سەر زاری ئەو دایکە ژیرەی کە لە گوفتارەکانیدا تابلێی جیددییە و هەرگیز توخنی گاڵتەو گەپ ناکەوێت؟!

پاشان کە زانستی گەردوونناسیم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت کە ئەوانەی بە چەشنی دایکم دیاردەی مانگ گیران لێکدەدەنەوە، تەشبیهیان بە وێنەی ڕاستییەکی بەرجەستە وەرگرتووە! چونکە گەردوونناسەکان، لە تەشبیهێکی جواندا، ئەو دوو کەوانەیەی کە لە تێکەڵبوونی بازنەی خۆر - کە ناوچەی بورجەکان و خولگەی پلەکانیانە - و بازنەی مانگ - کە میل و خولگەی مەنزڵەکانی مانگە - پێکهاتووە، بە دوو ماری گەورەیان شوبهاندوون و ناوی هەژدیهایان لێ ناون. ئنجا یەکێك لە دوو خاڵی یەکتربڕینی ئەو دوو بازنەیان ناو ناوە "سەر" و ئەوی تریشیان ناو ناوە "کلك". جا کاتێ کە مانگ دەگاتە ئاستی "سەر" و خۆریش دەگاتە ئاستی "کلك" ئەوا - وەك گەردوونناسەکان

دەڵێن - زەوی دەکەوێتە نێوان هەردووکیانەوە و دیاردەی مانگ گیران ڕوو دەدات. واتە بەپێی ئەو تەشبیهەی پێشوو مانگ دەچێتە گەرووی هەژدیهاکەوە!

بەم جۆرە، ئەم تەشبیهە زانستی‌یە بەرزەی کە بە تێپەڕبوونی کات کەوتە ناو گوفتاری عەوامەکانەوە، کرا بە هەژدیهایەکی بەرجەستەی هێندە گەورە کە مانگ قووت بدات!

بە هەمان جۆر، ئەو دوو مەلائیکەتەش کە "ثـــور" و "حوت"یان پێ دەوترێت، بە تەشبیهێکی بەرز و جوان و بە مەبەستی ئاماژەیەکی پڕ لە واتا ئەو ناوانەیان لێ نراوە. کەچی هەر ئەوەندەی بە تێپەڕبوونی کات ئەم تەشبیهە لە زمانی بەرز و ڕەوانگۆی پێغەمبەرێتی‌یەوە کەوتە ناو زمانی عەوامەکان، بە ڕاستی‌یەکی بەرجەستە تەسەور کرا و، ئەو دوو مەلائیکەتە شێوەی گایەکی زل و نەهەنگێکی زەبەلاحیان بە بەردا برا!

❑ **بناغەی سێ‌هەم:**

هەروەك قورئانی پیرۆز ئایەتی "موتەشابیهات"ی تێدایە و، لە ڕێی تەشبیهـ و تەمسیلەوە ڕێنمایی عەوامەکان بۆ بابەت و باسە ورد و قووڵەکان دەکات.. فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان جۆرە، چەند موتەشابیهێکیان تێدایە و، لە ڕێی تەشبیهەوە – کە عەوامەکان پێی ڕاهاتوون – ڕاستی‌یە فراوانەکان دەردەبڕن. نموونەکانی ئەمەمان لە پەیامەکانی تردا باس کردووە، وەك ئەوەی کە:

جارێکیان لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ دەنگێك هاتە گوێی ئامادەبووان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەردێکە حەفتا ساڵە بۆ ناو دۆزەخ بەردەبێتەوە، وا ئێستا گەیشتە بنکی دۆزەخ.. دوای تێپەڕبوونی چەند خولەکێك، کەسێك هاتە ناو کۆڕەکە و وتی: فلانە مونافیق مرد کە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو! بەم هەواڵەش ئەو حەقیقەتە ڕاستەی ناو تەشبیهە بەلیغەکەی پێغەمبەری ﷺ دەربڕی(١).

سەبارەت بە پرسیارەکەشەوە، ئەوا سێ ڕوو لێرەدا باس دەکەین:

---

(١) روى مسلم في كتاب الزهد، وصفة الجنة، والإيمان، عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: "كنا مع رسول الله ﷺ إذ سمع وجبة (أي سقطة) فقال النبي ﷺ: تدرون ما هذا؟ قلنا: الله ورسوله أعلم، قال: هذا حجر رمي به في النار منذ سبعين خريفاً فهو يهوي في النار الآن حتى انتهى إلى قعرها". زاد في رواية: "فسمعتم وجبتها (٤/٢١٨٤- ٢١٨٥رقم ٢٨٤٤).
وروى أيضاً عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قدم من سفر، فلما كان قرب المدينة هاجت ريح شديدة تكاد أن تدفن الراكب. فزعم أن رسول الله ﷺ قال: بُعثت هذه الريح لموت منافق، فلما قدم المدينة فإذا منافق عظيم من المنافقين قد مات". (٤/٢١٤٥رقم٢٧٨٢). ورواه أحمد بغير هذا اللفظ (٣/٣٤١،٣٤٦). وانظر شرح الشفا لعلي القاري (١/٦٩٧). (وەرگێڕ)

○ ڕووی یەکەم:

خوای گەورە لە "عەرش" و "ئاسمانەکان"دا چوار مەلائیکەتی مەزنی بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری دەستەڵاتداریێتیی خۆی تەرخان کردووە، یەکێکیان ناوی: "نَسر"ە و یەکێکی تریشیان ناوی: "ثَور"ە(١).

بەڵام "زەوی" کە برای بچووکی ئاسمانەکان و هاوڕێی هەسارە گەڕۆکەکانە، دوو مەلائیکەتی سەرپەرشتیکاری بۆ دانراوە کە هەڵی دەگرن و، یەکێکیان پێی دەوترێت: "ثَور" و، بەوی تریشیان دەوترێت: "حوت". نهێنی و حیکمەتی ئەم دوو ناوەش لەوەدایە کە: زەوی دوو بەشە: وشکایی و دەریا. واتە خاك و ئاو. ئەو شتەش کە دەریا و ئاوەکان ئاوەدان دەکاتەوە: نەهەنگ یان ماسی‌یە. ئەوەش کە وشکایی و خاك ئاوەدان دەکاتەوە "گا"یە، چونکە مایەی ژیانی مرۆڤ بریتی‌یە لە کشتوکاڵ کە ئەو ئەرکەش لە ئەستۆی "گا" نراوە.

کەواتە ئەو دوو مەلائیکەتەی کاروباری زەوی‌یان پێ سپێرراوە، بریتین لە دوو پێشەوا و سەرپەرشتیکاری زەوی، بۆیە لە ڕوویەکەوە جۆرە پەیوەندی‌یەکیان بە تیرەی نەهەنگ و ڕەگەزی "گا"کانەوە هەیە. لەوانەشە - والعلم عند الله - لە جیهانی مەلەکووت و میسالدا لەسەر شێوەی گا و نەهەنگ دەربکەون(٢).

---

(١) عن مالك في قوله عز وجل: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّموات والأَرْض﴾ قال: إن الصخرة التي تحت الأرض السابعة، ومنتهى الخلق، على أرجائها أربعة من الملائكة، لكل مَلَكٍ منهم أربعة وجوه: وجه إنسان ووجه أسد، ووجه نسر، ووجه ثور، فهم قيام عليها قد أحاطوا بالأرض والسموات ورؤوسهم تحت الكرسي والكرسي (تحت) العرش. قال: وهو واضع رجليه تبارك وتعالى على الكرسي.
أخرجه عبد الله بن الإمام أحمد في كتاب (السنة) برقم ٥٨٩، ٣٠٣/١ في إسناده مجهول والمدى معروف بالوهم وبقية رجاله ثقات. وعزاه السيوطي في الدر المنثور ٣٢٩/١ لعبد بن حميد وأبو الشيخ في العظمة وأخرجه أيضاً البيهقي في الأسماء والصفات ص/٤٠٣ وقد أخرجه عبد الرزاق وعبد بن حميد وابن المنذر كما في الدر المنثور باختلاف في السياق ٢٦١/٦ من كلام وهب بن منبه وهو ثقة كثير النقل من كتب الإسرائيليات. (انظر الميزان ٣٥٢/٤).

(٢) بەڵێ، گۆی زەوی وەك کەشتی‌یەك وایە کە بەسەر دەریای بۆشایی ئاسماندا دەڕوات. جا ئەو کەسەی کە - بە فەرمانی خوای گەورە - ئەم کەشتی‌یە زەبەلاحە بێ هەست و ژیانە، بەوپەڕی ڕێکوپێکی دەخاتە گەڕ، واتە کەشتیوانی کەشتیی زەوی، ئەو مەلائیکەتەیە کە ناوی "حوت"ی لێ نراوە.. هەروەها زەوی - وەك بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ چەسپاوە - کێڵگەی دوارۆژە. کەواتە ئەو مەلائیکەتەی کە - بە ڕوخسەت و

جا بە مەبەستی ئاماژەکردن بۆ ئەم پەیوەندییە و، وەك هێمایەك بۆ ئەو دوو جۆرە بوونەوەرانەی ناو زەوی، پێغەمبەر ﷺ کە خاوەنی زمانی موعجیزەبەیان و گوفتاری بەپێزی پڕ واتایە، فەرمووی: "الأرض على الثور والحوت". واتە بە یەك ڕستەی کورت حەقیقەتێکی هێندە مەزن و قووڵی دەربڕی کە لەوانەیە نەتوانرێت بە لاپەڕەیەکی تەواو دەرببڕێت!

❍ ڕووی دووهەم:

گەر بوترێ: دەوڵەت لەسەر چی ڕاگیر دەکرێت؟ لە وەڵامدا دەوترێت: "على السيف والقلم". واتە پاڵ بە هێزی ئازایەتیی شمشێری سوپاوە دەدات و، لەسەر وریایی و دادگەری قەڵەمی کارمەندەکان ڕاگیر دەبێت.

جا لەبەر ئەوەی "زەوی" نیشتەجێ و خانە و لانەی زیندەوەرانە و، سەرداری زیندەوەرانیش مرۆڤە و، بەشی هەرە زۆری مرۆڤیش لە کەناری دەریا و ڕووبارەکاندا دەژین و گوزەرانیان لەسەر ڕاوە ماسییە و، بەشەکەی تری مرۆڤیش گوزەرانیان لەسەر کشتوکاڵ بەندە کە ئەرکی ئەویش لە ئەستۆی "گا"دایە و، تەوەرەی بازرگانیشیان لەسەر ماسییە.. ئەوا هەروەك توانرا بوترێ: "تقوم الدولة على السيف والقلم" دەشتوانرێت بوترێ: "تقوم الأرض على الثور والحوت". چونکە هەرکات "گا" لە کارەکەی مان بگرێت و ماسییەکانیش - کە بە یەك جار ملیۆنەها گەرا دادەنێن - واز لە گەرا دانان بهێنن، ئەوا گوزەرانی مرۆڤ هێندە شپرز دەکەن کە ژیان مەیسەر نەبێت و بەدیهێنەری داناش گۆی زەوی کاول دەکات و لەناوی دەبات.

بەم جۆرە، پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە داناییەکی بەرز و ڕەوانبێژییەکی ئیعجاز بەخش و تەنها بە دوو وشەی کورت وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە و، ڕاستییەکی فراوانی ڕوون کردەوە و، مەودای پەیوەندیی ژیانی مرۆڤی بە زیندەوەرانەوە دەرخست و، فەرمووی:

"الأرض على الثور والحوت"(١).

---

فەرمانی خوای گەورە - سەرپەرشتیی ئەو کێڵگەیە دەکات، ناوی "ثور"ی لێ نراوە. خۆ ئاشکراشە کە ئەم ناوە جوانە چەندە لەگەڵ ئەو ئەرکەدا گونجاوە! (دانەر)

(١) روي عن عطاء بن يسار حديث موقوف على كعب فيه ذكر الحوت، قال عنه البوصيري: رواه الحارث ورواته ثقات. بڕوانە: (المطالب العالية) للحافظ ابن حجر العسقلاني. الطبعة المحققة. ٤/٤٦-٤٧. (وەرگێڕ)

○ ڕووی سێهەم:

زانایـانی گەردوونناسـیی کـۆن پێیـان وابـووە کـە "خـۆر" بـە دەوری زەوی‌دا دەسووڕێتەوە و، هەموو سی پلەیەکی خۆریان ناوناوە: "بورج". جا ئەگەر چەند هێڵێکی گریمان‌کراو بـە نێوان ئەستێرەکانی ئـەو بورجانـەدا بـهێنرێت ئـەوا هـەندێ جـار شێوەی شـێرێك و، هـەندێ جـاری تـر شـێوەی تەرازوویـەك، یـان گایـەك، یـان نەهـەنگێك دەردەچێت. بۆیە ئەو ناوانەیان لەو بورجانە ناوە.

بـەڵام زانسـتی گەردوونناسـیی نـوێ پێـی وایـە کـە: "خـۆر" بـە دەوری زەوی‌دا ناسووڕێتەوە، بەڵکو زەوی بە دەوری "خۆر"دا دەسـووڕێتەوە. واتـە ئـەو بورجانـە لـەکار دەخـات. کەواتـە دەبـێ هەریـەك لـەو بورجـە لەکارخراوانـە و ئـەو بازنـە گـەورە و زەبەلاحانە، لە خولگەی ساڵانەی زەوی‌دا چەند بازنەیەکیان - بە پێوەرێکی بچووکتر - هـەبێت. ئـەو کاتـە "زەوی" هـەموو مـانگێك دەچێتـە سایەی یـەکێك لـەو بورجانـە و لـە ناوەندی دەرکەوتنی ئەودا دەبێت. وەك بڵێـی خولـگەی سـاڵانەی زەوی ئاوێنەیـەك بێـت ئەو بورجانەی تێدا دەربکەوێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم ڕووەی مەسەلەکە، وەك پێشتر وتمـان، پێغەمبـەر ﷺ جـارێك لـە وەڵامدا فەرمووی: "علی الثور" و جارێکی تر فەرمووی: "علی الحوت"!

بەڵێ، شـایانی ئـەو زمانـە ئیعجـاز دەرخـەرەی پێغەمبـەری ئـازیزە ﷺ کـە جـارێك بفەرموێ: "علی الثور" و بەمەش ئاماژە بـۆ ڕاستی‌یەك بکـات کـە دوای چـەند سـەدەیەك دەردەکەوێت، چونکە "زەوی" لـە دەمـی ئـەو پرسـیارەدا لـە وێنـە میسـالی‌یەکەی بورجـی "ثور"دا بووە. بەڵام کە دوای مانگێك هەمان پرسیاری ئاراستە کراوەتەوە، فەرموویەتی: "علی الحوت" چونکە "زەوی" لەو دەمەدا لە ژێر سایەی بورجی "حوت"دا بووە!

بەم پێیە و، بە فەرموودەی: "علی الثـــور والحوت"، پێغەمبـەر ﷺ ئامـاژەی بـۆ ئـەم ڕاستی‌یە مەزنە کرد کە لە ئایندەی وەڵامەکەی‌دا پتر ڕوون بووەوە و دەرکـەوت. بەمـەش ئاماژەی بۆ بزووتن و گەشتی زەوی کرد و، بە هێما ئەوەی ڕاگەیاند کە بورجە ئاسمانی‌یـە ڕاستەقینە و کارگوزارەکان لە خولگەی سـاڵانەی زەویـدان و، هـەر گـۆی زەوی‌یـە کـە بەو ئەرکە ڕادەپەڕێت و لـەو بورجانـەدا گەشـت دەکـات. بـەڵام ئـەو بورجانـەی کـە بـە خەیاڵ هی سووڕگەی خۆرن، هیچ تەن و قەبارەیەکی گەڕۆکیان تێدا نی‌یە!

والله أعلم بالصواب.

سەبارەت بەو چیرۆکانەش کە لە بازنەی ژێری بـەدەرن و لـە بـارەی گـا و نەهەنگـەوە دەدوێن و لـە کتێبە ئیسلامی‌یەکاندا باس کراون، ئەوا: یان "ئیسرائیلیات"ن.. یـان چـەند تەشبیهـ و نموونەهێنانەوەیەکن.. یان تـەئویلی هـەندێ کەسـن لـە ڕاویـەکان، بـەڵام ئـەو کەسانەی کـە بـە وردی لـە شـت ناکۆڵنـەوە، بـە هـی خـودی فەرمـوودەکـەیان زانیـوە و داویانەتە پاڵ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

﴿ربنا لا تؤاخذنا إن نسينا أو أخطأنا﴾.

﴿سُبحَانَكَ لا عِلمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنكَ أَنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.

* * *

✿ **پرسیاری دووهەم:** تایبەتە بە: "**أهل العباء**"ەوە[1]

برام!

وا تەنها یەك حیکمەت لـە نێـوان ئـەو حیکمەتـە زۆرانـەدا بـاس دەکـەین کـە وان لـەو پرسیارەی لەبارەی "أهل العباء"ەوە کردتان و تا ئێستا بێ وەڵام مابووەوە.

گەلـێ نهێنی و دانایی لەوەدا هەن کـە پێغەمبـەر ﷺ عـەبا پیرۆزەکـەی بـەاری خـۆی دا بەسەر حەزرەتی عەلی و فاتیمە و حەسەن و حسەیندا ـ خوایان لـێ ڕازی بێـت ـ و پاشان لـەو حاڵەیاندا دوعای بۆ کردن[2] و ئەم ئایەتە پیرۆزەی بەسەردا خوێندن کە دەفەرموێ:

﴿لِيُذهِبَ عَنْكُم الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً﴾ (الأحزاب:٣٣).

---

(١) ئیمامی (بوصيري) دەفەرموێت:

كذا عليٌّ مع ابنـيـه وأمـهما      أهلُ العباء كما قد جاءنا الخبرُ

(٢) حديث صحيح ذكره الأستاذ النورسي بالمعنى مختصراً، وللحديث طرق كثيرة. أنظر المسند ٤٨، ١٠٧، ٢٩٢/٦، ٢٩٦، ٢٩٨، ٣٠٤ والبخاري في التأريخ الكبير ٦٩/٢/١ والحاكم ١٤٧/٣ والترمذي وأحمد في فضائل الصحابة برقم ٩٨٧، ١١٤٩، ١٤٠٤، ١١٧٠، ١٣٩٢ وذكر الهيثمي في المجمع ١٦٦/٩ والسيوطي في الدر المنثور ١٩٨/٥ وله طرق كثيرة مع مخرجيها عن عدد من الصحابة رضي الله عنهم. أخرج الطبراني في الأوسط عن علي أنه دخل على النبيﷺ وقد بسط شمله فجلس عليها هو وعلي وفاطمة والحسن والحسين، ثم أخذ النبي بمجامعه فعقد عليهم ثم قال: "اللهم ارضَ عنهم كما أنا عنهم راضٍ". قـال الهيثمـي (١٦٩/٩): رجاله رجال الصحيح غير عبيد بن طفيل وهو ثقة، كنيته أبو سيدان اهـ. حياة الصحابة ١٠٥/٤. (وەرگێڕ ـ لە "اللمعات"ەوە).

بەڵام ئێمە ناڕۆینە ناو نهێنییەکانی ئەم ڕووداوە، بەڵکو لە نێوان ئەو حیکمەتە زۆرانەی کە پەیوەندییان بە ئەرکی "پێغەمبەرایەتی"ی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە تەنها یەك حیکمەتیان باس دەکەین، کە بریتییە لەوەی:

پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە ڕوانینی "پێغەمبەرایەتی"ی هاوڕازی غەیب و دوارۆژبینی خۆی بینیبووی کە: لە دوای سی چل ساڵ چەند ئاشووبێکی مەزن لە نێوان هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا ڕوو دەدات و، گەلێ خوێنی خاوێنیش لەو ڕووداوانەدا دەڕژێن و، بینیبووی کە: دیارترینی کەسانی ئەو ڕووداوانەش ئەم سیانەن کە لە ژێر عەباکەی خۆی داپۆشیون.

جا لەبەر ئەوەی حەزرەتی عەلی لە بەرچاوی نەتەوەی ئیسلامدا تەبرییە بکات و.. دڵی حەزرەتی حەسەین بداتەوە و.. پیرۆزباییش لە حەزرەتی حەسەن بکات و شەرەفمەندی و پایەبەرزی و سوودی مەزنی بۆ نەتەوەی ئیسلام دەربخات بە کوژاندنەوەی ئاشووبێکی مەزن و ڕازیبوونی بە سوڵح و ڕێکەوتن.. هەروەها بۆ دەرخستنی خاوێنیی وەچەی حەزرەتی فاتیمە و شەرەفمەندییان و شایستەییان بۆ ناونیشان و نازناوی بەرزی "ئالی بەیت"..

لەبەر هەموو ئەمانە، پێغەمبەر ﷺ ئەو چوار کەسەی لەگەڵ خۆیدا بە عەباکەی داپۆشیوە و، ئەو ناونیشانە شەرەفمەندەی پێ بەخشین کە بریتییە لە "آل العباء الخمسة".

بەڵێ، حەزرەتی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت - خەلیفەی ڕاستیی موسڵمانان بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو خوێنە خاوێنانەی کە لە سەردەمی ئەودا ڕژان گەلێ گەورە و بەنرخ بوون، ئەوا بەری بوونی حەزرەتی عەلی لە ڕشتنی ئەو خوێنانە لە بەرچاوی نەتەوەی ئیسلامدا و لە ڕووی ئەنجامدانی ئەرکی پێغەمبەرایەتییەوە، گەلێ گرنگە، لەبەر ئەوە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەو شێوەیە: خاوێنی و بەرائەتی حەزرەتی عەلی ڕادەگەیەنێت و، داوا لە هەموو ئەوانە دەکات کە ڕەخنەی لێ دەگرن و بە هەڵە و گومڕای دادەنێن لە دەستەی خەواریج و لایەنگرانی ئەمەوییەکان، کە سنووریان دەشکاند و لە دژی حەزرەتی عەلی دەدوان، داوایان لێ دەکات کە: سەبارەت بە حەزرەتی عەلی بێدەنگ بن و لە دژی نەدوێن.

بەڵێ، خەواریجەکان و شوێنکەوتووانی ئەمەوی‌یەکان کە مافی حەزرەتی عەلی‌یان لەڕادەبەدەر پێ‌شێل کرد و بە گومڕایان لە قەڵەم دا و.. ئنجا زیادەڕەوی و بیدعەتی شیعەکان و، خۆ تەبەڕڕاکردنیان لە حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر و.. ڕوودانی کارەساتە دڵتەزێنەکەی حەزرەتی حسەین، خوای لێ ڕازی بێت.. هەموو ئەمانە، زیانێکی گەلێ زۆریان بە موسڵمانان گەیاند.

جا پێغەمبەر ﷺ بەم دوعا و عەبایە، حەزرەتی عەلی و حسەین لە بەرپرسیاری و تۆمەتباری دەرباز دەکات و، نەتەوەکەشی ڕزگار دەکات لەوەی کە گومانی خراپیان پێ ببەن، هەروەك لە ڕووی ئەرکی پێغەمبەرایەتیشەوە پیرۆزبایی لە حەزرەتی حەسەن دەکات کە بەو سوڵحەی کردی چاکەیەکی گرنگی بەرامبەر نەتەوەی ئیسلام نواند و، ڕایدەگەیەنێت کە ئەو وەچە پیرۆزەی لە حەزرەتی فاتیمە دەکەونەوە شەرەفمەندی‌یەکی بڵند بەدەست دەهێنن و، حەزرەتی فاتیمەش لە ڕێی نەوەکانیەوە لای خوای گەورە ئافرەتێکی بەڕێز دەبێت، بە وێنەی دایکی حەزرەتی مەریەم کە لە قورئاندا خوای گەورە لەسەر زمانیەوە دەفەرموێ:

﴿وَإِنِّي أُعِيذُها بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ﴾ (آل عمران:٣٦).

اللّهم صلّ على سيدنا محمّد وعلى آله الطيبين الطّاهرين الأبرار وعلى أصحابه المجاهدين المكرّمين الأخيار. آمين.

* * *

# مەقامی دووهەم

**(لە نێوان هەزاران نهێنیی ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾دا، ئەم مەقامە شەشیان باس دەكات)**

**وریاكردنەوەیەك:**

**نوورێكی درەخشان كە لە ئاسۆی: ﴿بسم الله الرحـــــــمن الرحيـــم﴾ هەڵهاتبوو، دووراودوور بۆ عەقڵی خامۆشم دەركەوت. ویستم لە شـێوەی یادخستنەوە و تێبینیدا بـۆ خۆمـی تۆمـار بكـەم و، هـەوڵم دا ئـەو نـوورە درەخشانە وەك نێچیر بگرم و بیخەمە چنگەوە و، بە نهێنییەكانی خۆی، كە نزیكی سی دانــە دەبـن، شــوورایەكی بــە دەوردا بگـێڕم تـاكو بــە ئاســانی دەستنیشان بكرێت و بنووسرێت. بەڵام بە داخەوە ئێستاكە سـەركەوتنم بـە تەواوی لەم كارەدا بەدەست نەهێنا. لەبەر ئەوە، نهێنییەكانی لـێرەدا كـەم بوونەوە و تەنها لە شەش دانەدا مانەوە.**

گوفتاری ئەم مەقامە، بە تایبەتی و ڕاستەوخۆ ئاراستەی دەروونی خۆم كراوە، چونكە كاتێ كە لەم مەقامەدا دەڵێم: "ئەی مرۆڤ"! مەبەستم نەفسی خۆمە.

جا هەرچەند ئەم وانەیە تایبەتە بە خۆمەوە، دەیشیخەمە پێش‌چاوی ڕاستبینی برایانی وردەكارمەوە، تاكو ببێـت بـە "مـەقامی دووهـەمی بریسـكەی چواردەهـەم". ئومێدەوارم سوودبەخش بێت بۆ هەركەسێك كە پـەیوەندیی ڕۆحیـی لەگـەڵمدا هەیـە و دەروونـی لـە هی من وریا و بێدارترە.

جا ئەم دەرسە زیاتر ڕوو لە "دڵ" دەكات تـاكو "ژیـری".. بـۆ چێـژی "ڕۆحـی" زیـاتر دەڕوانێت تاكو بەڵگەی "مەنتیقی".

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿قالَتْ يا أَيّها الْمَلَؤُ إنّي أُلْقِيَ إلَيَّ كتابٌ كريمٌ ۞ إنّه مِنْ سُلَيْمانَ وإنَّهُ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ﴾ (النمل:٢٩-٣٠)

وا لەم مەقامەدا چەند نهێنی‌یەك باس دەكەین:

**❐ نهێنیی یەكەم:**

لە كاتی بیر كردنەوەمدا لە ﴿**بسم الله الرحـــمن الرحيم**﴾ یەكێك لە نوورەكـانیم بەم جۆرەی خوارەوە بینی:

سێ نیشـانەی ڕوون و ئاشكرای پەروەردگاریتیی خـوای گـەورە بـە سەروسـیمای بوونەوەران و، ڕووی زەوی و، ڕوخساری مرۆڤەوە هەن. ئەم نیشانە ئاشكرایانەش هێندە لەناو یەكتردان و تێهەڵكێشی یەكترین، كە هەریەكەیان نموونەیەكی ئەوانی ترە.

*نیشانەی یەكەم*: نیشانەی "ئولووهییەت"ە. ئـەو نیشـانە گـەورە و درەخشـانەی: هاوكاری و، پشتگیری و، بەدەم یەكەوە هـاتن و، دەست لەملانێ‌یەی كە لـە هـەموو بەشێكی گشت گەردووندا هەیە. بە چەشنێ كە: ﴿**بسم الله**﴾ ڕووی تێ‌دەكات.

*نیشانەی دووهـەم*: نیشـانەی "ڕەحـمانی‌یەت"ە. ئـەو نیشـانە مەزنـە ئاشـكرایەی: لەیەكچوون و، پێكەوەگونجان و، ڕێكی و، نەرمونیانی و، میهرەبانی‌یە، كە لـە پـەروەردە كردنی ڕووەك و زیندەوەراندا هەیە. بە چەشنێ كە: ﴿**بسم الله الرحـــــمن**﴾ ڕووی تێ دەكات.

*پاشان نیشانەی سێ‌هەم*: نیشانەی "ڕەحیمییەت"ە. ئەو نیشانە بڵند و ڕوونەی كە لـە: نەرمونیانیی میهرەبانیی خوا و، وردەكـاریی شـەفەقەتی و، تیشـكەكانی بەزەیی‌یەكەیـەوە دەردەكەوێت، كـە بـە سـەروسـیمای چییـەتیی گشـتیی مرۆڤـەوە كێشـراوە و ڕەنگـی داڕێژراوە. بە چەشنێ كە ناوی "الرحيم"ی: ﴿**بسم الله الرحـــــمن الرحيـــم**﴾ ڕووی لـێ‌یەتی و بۆی دەڕوانێت.

واتە ﴿**بسم الله الرحـــمن الرحيـــم**﴾ ناونیشـانێكی بـەرز و خـاوێنی سێ نیشـانەیە لـە نیشانەكانی تەنیایی(الأحدية)ی خوای گەورە، بە ڕادەیەك كە بووە بە دێڕێكی نوورانیـی

ناو کتێبی بوونەوەر و، خەتێکی ڕووناك لەسەر لاپەڕەی جیهاندا دەکێشێت و، دەستاوێزێکی ئەستوور و مەحکەمی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراوانی خوایە. ئەمەش مانای وایە کە مادەم ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ لە عەرشی هەرە مەزنەوە نازڵ بووە، ئەوا سەرێکی پەیوەستە بە مرۆڤەوە کە بەروبوومی بوونەوەران و نوسخەی بچووکی جیهانە. کەواتە زەوی بە عەرشی مەزنەوە دەبەستێت و دەبێت بە ڕێیەکی تەخت و ئاسان بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرەو عەرشی کەمالاتی سەربکەوێت و بەرز ببێتەوە.

❏ **نهێنیی دووهەم:**

قورئانی پیرۆز هەمیشە لە نێوان باسی دەرکەوتنی یەکتایی(واحیدییەت)دا دەرکەوتنی تەنیایی(ئەحەدییەت)یش ڕوون دەکاتەوە، تاکو نەهێڵێت عەقڵان لە ناوەندی ئەو واحیدییەتە ئاشکرایەی ناو بوونەوەرە لەژمارەبەدەرەکاندا، نوقم و سەرگەردان بن.

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

خۆر(الشمس) بە ڕووناکی‌یەکەی خۆی دەورانەوری چەندەها شتی لەژمارەبەدەری داوە. جا بۆ ڕەچاوکردنی "خودی خۆر" لە کۆی گشتیی هەموو ڕووناکی‌یەکانی‌دا پێویست بە تەسەووڕێکی گەلێ فراوان و ڕوانینێکی یەکجار گشتی دەبێت. لەبەر ئەوە، خۆر بەهۆی دەرکەوتن و ڕەنگدانەوەی ڕووناکی‌یەکەیەوە لە هەموو شتێکی بریسکەداردا، خۆی دەردەخات. واتە: هەموو شتێکی بریسکەدار بەپێی توانای خۆی درەوشانەوەی خۆیی خۆر و تایبەتمەندی‌یەکانی وەك: ڕووناکی و، گەرمیی، دەردەخات. ئەمەش بۆ ئەوەی "خودی خۆر" لە بیر نەبرێتەوە.

جا هەروەك هەموو شتێکی بریسکەدار بەپێی توانای خۆی، خۆر و هەموو سیفەتەکانی خۆر دەردەخات، هەموو یەکێکیش لە سیفەتەکانی خۆر، وەك: گەرمی و ڕووناکی و حەوت ڕەنگەکانی، هەموو ئەو شتانە دەگرنەوە کە لە بەرامبەریانەوەن.

جا لەبەر ئەوەی نموونە هێنانەوە قرەوبڕەی تێدا نی‌یە، وا بۆ نموونە - ولله المثلُ الأعلی - دەڵێین:

خواوەندی تەنیا و صەمەد، بە هەموو ناوە جوانەکانی، درەوشانەوەی لە هەموو شتێکدا هەیە و تیای‌دا دەردەکەوێت، بە تایبەت لە زیندەوەراندا و، بە تایبەتتریش لە ئاوێنەی ماهییەتی مرۆڤدا. هەروەها هەموو یەکێك لەو ناوە جوانانەی خواوەند کە

پـەیوەندی‌یان بـە بوونەوەرانـەوە هەیـە، لـە ڕووی "وەحـدەت" و "واحیدییـەت"ەوە دەوراندەوری هەموو بوونەوەرانیان داوە.

بەم چەشنە، قورئانی پیرۆز مۆری "ئەحەدییەت" لە دووتوێی "واحیدییـەت"دا دەخاتـە پێش‌چاوی مـرۆڤ، تـاکو "ژیری‌یـەکان" لـەناو فراوانیـی "واحیدییـەت"دا نوقـم نـەبن و "دڵان"یش سەرسام نەبن و زاتی خاوێن و پیرۆزی خوای گەورەیان لە بیر نەچێتەوە.

جا: ﴿**بسم الله الرحـــمن الرحیـم**﴾ دەبێـت بـە بەڵگـە لەسـەر سێ گـرێ(عُقــدة)ی گرنگی ئەو مۆرە جوداکەرەوەیە و ڕوونی دەکاتەوە.

☐ **نهێنیی سێ‌هەم:**

شتێکی بەڵگەنەویست، بەڵکو بینراوە کە:

تەنها میهرەبانیی خواوەندە بوونەوەرە لە ژمارە و سنوور بەدەرەکانی خسـتە کـەیف و شـادی‌یەوە و.. هـەمان میـهرەبانیش بـوو کـە ئـەم بوونەوەرانـەی ڕوونـاك کـردەوە و لـە تاریکی دەری‌هێنان بەرەو ڕووناکیی بردن و.. هەر هەمان میهرەبانی بـوو ئـەم بوونـەوەرە لـە ڕادەبـەدەر موحتاجانـەی لـە باوەشـی خـۆی‌دا گـۆش و پـەروەردە کـرد.. هـەر ئـەو میهرەبانی‌یەش بوو گشت بوونەوەرانی لە هەموو شـوێنێکەوە ڕێنمـایی کـرد و بـەرەو لای مرۆڤ خسـتنیەڕێ و ژێربـار و ڕامی کـردن بـۆی، تەنانـەت وای لـە بوونـەوەران کـرد بـۆ یارمەتی و هاوکاریی مرۆڤ بـڕۆن و بڕوانـن، بـە وێنـەی ڕوانینـی بەشـەکانی درەخـت بـۆ بەروبوومەکـەی.. هـەروەها میـهرەبانیی خـوای گـەورەشـە کـە ئـەم بۆشـایی‌یە فراوانـەی ئاسمـانی ئـاوەدان کردووەتـەوە و ئـەم جیهانـە بـۆش و بەتاڵـەی ڕازاندووەتـەوە.. هـەمان میهرەبانیشە کە وای لـەم مرۆڤە فانی‌یە کردووە دەستنیشانکراوی مانەوە و نەمری بێـت و، کردوویـەتی بــە شایسـتەی گفتوگـۆی پـەروەردگاری جیـهانیان و، "پایـە"ی بڵنـدی: پشتگیریی خوای گەورەی پێ بەخشیوە.

ئەی مرۆڤ! مادەم "میـهرەبانی" سـیفەتێکی خۆشـەویسـتە و تـا ئـەم ڕادەیـەش هێز و کێش و یارمەتی و فریاگوزاریی هەیە، ئەوا بە وتنی: ﴿**بسم الله الرحـــــمن الرحیـــم**﴾ دەست بەو ڕاستی‌یەوە بگرە و لە سامناکیی بێزاریی ڕەها و ئازاری چەندەها پێداویسـتیی بێ‌کۆتـایی خـۆت ڕزگـار بکـە و، لـە خواوەنـدی خـاوەنی عەرشـی بـەرزی و پادشـای میهرەبان خۆت نزیك بخەرەوە و، بەهۆی ڕووناکی‌یەکان و شەفاعەتی ئەو میهرەبانی‌یـەوە ببە بە کەسێکی ئەمینی شایستەی گفتوگۆی ئەو میهرەبانی‌یە و دۆستی ڕاستی ئەو.

بەڵێ، جەمکردنی بوونەوەران لە دەوری مرۆڤ و لە ناوەند داناییەکی دەستنیشانکراودا و، هاندانی هەریەکە لە بوونەوەران بۆ ئەوەی پێداویستییە هەمیشە زیادبووەکانی مرۆڤ نەهێڵن، دەبێ لە یەکێکی ئەم دوو حاڵەتەوە سەری هەڵدابێت:

یان ئەوەیە هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەران مرۆڤ دەناسێت و پێی دەزانێت و گوێڕایەڵیەتی و بۆ خزمەتکردنی تێدەکۆشێت. واتە: یان ئەوەیە ئەم مرۆڤەی کە بە ئاشکرا لە کۆڵەواری و بێدەستەڵاتییەکی ڕەهادا نوقم بووە، خاوەنی توانا و دەستەڵاتێکی ڕەهایە!! (ئەمەش وەك دیارە، سەرباری ئەو مەحاڵە لەژمارەبەدەرانەی کە تیایدایە، لە بیرکردنەوەی عەقڵیشەوە گەلێ دوورە)..

یان ئەوەیە ئەو بوونەوەرانە مرۆڤ ناناسن، بەڵکو ئەوان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یەکێك هەیە، ئەم مرۆڤە دەناسێت و بەزەیی پێدا دێتەوە و بە حاڵی دەزانێت، ئەو کەسەش بەدیهێنەری میهرەبانە.

دەسا ئەی مرۆڤ! بەرەو هۆش و ژیریی خۆت بگەڕێرەوە! ئایا دەگونجێ ئەم پەروەردگارە میهرەبانە نەتبینێت و ئاگای لێت نەبێت، کە هەر ئەوە گشت بوونەوەرانی بۆ یارمەتی و نەهێشتنی پێداویستییەکانت ناردووە؟

جا مادەم خواوەند بە تۆ دەزانێت و لەم زانینەش ئاگادارت دەکاتەوە، بەوەی کە بەزەیی پێتدا دێتەوە، ئەوا تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە کە تێبکۆشیت بۆ ناسینی و، هەوڵ بدەیت بە ڕێزنان لە فەرمانەکانی، ئەو خواناسینەتی بۆ ئاشکرا بکەیت.

بەوپەڕی دڵنیایی و بێگومانییەوە بزانە کە: تەنها ڕاستیی ئەم میهرەبانییەی خوای گەورەیە - کە میهرەبانییەکە دانایی و، چاودێری و، زانست و، توانستیش دەگرێتەوە - ئەم بوونەوەرانەی بۆ تۆ ڕام کردووە و خستوونیەتە ژێر فەرمانی ویستی تۆی بەدیهێنراوی لاواز و بچووك و دەستەوسان و هەژار و فانی!

میهرەبانییەك تا ئەم ڕادەیە مەزن و بەم ئەندازەیەش فراوان بێت، بێگومان داوای شوکرانەبژێرییەکی گشتی و بێگەرد و ڕێزگوزارییەکی بێخلتە و خاوێنت لێ دەکات. بیشزانە جگە لە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ هیچ شتێکی تر نییە ئەم شوکرانەبژێرییە گشتی و ڕێزگوزارییە بێگەردەت بۆ دەرببڕێت. کەواتە هەردەم دووپاتی بکەرەوە و بیکە بە هۆکارێك بۆ گەیشتنت بەو میهرەبانییە فراوانە و، تکاکارت لە خزمەت بەخشندەی میهرەباندا.

لە ڕاستی‌دا بوون و ئاشکرایی "میهرەبانی" لە بوونەوەردا گەلێ ئاشکراترە لە خۆری ناوجەرگەی ئاسمان. هەروەك نەخشێکی جوان بەوە دروست دەبێت کە تانوپۆی تاڵەکانی لە چەقی نەخشەکەوە بۆ دەوروبەری و لە دەوروبەریشیەوە بۆ ناوچەقی نەخشەکە، هەموویان بە ڕێکی تەنرابن و هۆنرابنەوە، هەر بە هەمان جۆریش یەك بە یەکی تاڵە تیشکەکانی ئەو نوورەی کە لە هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورەوە تیشك دەدەن و دەدرەوشێنەوە و تا دەگەنە ئەم بوونەوەرە زۆر و فراوانانە هاتوون و کشاون و درێژبوونەتەوە، بەوپەڕی جوانی و لە چوارچێوەی میهرەبانی‌یەکی گشتی‌دا، مۆرێکی ڕوونی "ڕەحیمییەت"و، نەخشێکی قەشەنگی "شەفەقەت و میهرەبانی" و، دروشمێکی یەکجار ناوازەی ئەوتۆ پیشانی "ژیران" دەدەن کە گەلێ ئاشکراترە لە ڕوونی و ئاشکرایی خۆر لە پێش "چاوان"دا!

بەڵێ، ئەو کەسەی کە خۆر و مانگ و هەموو توخم و کانزا و ڕووەك و زیندەوەران بە تیشکی هەزار و یەك ناوی خۆی ڕێکدەخات و، بە چەشنی تانوپۆ و تاڵە نوورانی‌یەکانی نەخشونیگارێکی ناوازە لەگەڵ یەکتردا دەیانگونجێنێت و، هەموویان بۆ خزمەتگوزاریی ژیان دەخاتەکار و، بەو شەفەقەتە بەلەزەتە شیرینەش کە لە دایکانی ڕووەك و زیندەوەراندا بۆ بێچووەکانیان دایناوە، شەفەقەت و میهرەبانیی خۆی بەرامبەر هەموو بوونەوەران دەرخستووە..

ئەو کەسەی کە بە ڕامکردن و ژێربارخستنی زیندەوەران بۆ ژیانی مرۆڤ، بریسکەدارترین درەوشانەوەکانی میهرەبانی و جوانترین نەخشونیگاری خۆی ئاشکرا کردووە و، بەمەش پایە و ڕێز و گرنگیی مرۆڤی بە لای خۆیەوە، پیشان داوە..

ئەو کەسەی لەگەڵ بەدیهێنراوانی‌دا ئاوایە، تەنها ئەو خواوەندە بەتوانا و میهرەبانەیە کە ئەم میهرەبانی‌یە فراوانەی خۆی کردووە بە تکاوەرگیراوی دەرگانەی دەوڵەمەندیی ڕەهای خۆی، بە چەشنێ کە زیندەوەران و مرۆڤی یەکجار هەژار تکای پێ‌دەکەن و پێی دەپاڕێنەوە.

ئەی مرۆڤ! ئەگەر بە ڕاستی مرۆڤیت، ئەوا هەمیشە بڵێ: ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾ تاکو ئەو تکاکار و شەفاعەتخوازەت دەست بکەوێت.

شتێکی بەڵگەنەویست، بەڵکو بینراوە کە: تەنها "میهرەبانی"یە هەموو تیرە و جۆرەکانی ڕووەك و زیندەوەران – هەرچەندەش جۆراوجۆر و جیاوازن و لە چوارسەد هەزار تیرە و جۆر زیاترن – بێدەگەیەنێت و پەروەردەیان دەکات.. هەر ئەو "میهرەبانی‌یە"شە کە لە باشترین کات و بە تەواوترین ڕێسا و لەبارترین چاودێری و، بەبێ لێ‌تێکچوون و لەبیرچوونەوە، کاروباری هەموویان ڕێکدەخات، بە ڕادەیەك کە مۆری "ئەحەدییەت"ی بەم پەروەردەکردن و ڕێکخستنەی لە سەروسیما و ڕوخساری ڕووی زەوی داوە.

بەڵێ، بوونی ئەو میهرەبانی‌یە، بە وێنەی بوونی بوونەوەرانی ڕووی زەوی، بێ گومان و چەسپاوە. هەروەك بەڵگەکانی هاتنەدیی ئەو میهرەبانی‌یەش بە ئەندازەی ژمارەی ئەو بوونەوەرانەیە.

هەروەك نیشانەی "ئەحەدییەت" و مۆری "میهرەبانی" بەسەر ڕووی زەوی‌یەوە دەبینین، بە هەمان جۆر مۆری "میهرەبانی"ش بە سەروسیمای ماهییەتی مەعنەویی مرۆڤەوە دەبینین. ڕوونیی ئەم مۆرە هەرگیز لە ڕوونیی ئەوەی کە بەسەر ڕووی زەوی و ڕووی بوونەوەرانەوەیە، کەمتر نی‌یە. تەنانەت نیشانەی ئەم میهرەبانی‌یە ئەوەندە گشتی و فراوانە دەڵێی تیشکۆ(بۆرە)یەکە ڕووناکیی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەی تێدا کۆ دەبێتەوە.

ئەی مرۆڤ! ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە ئەم سیما و ڕوخسارە مەعنەوی‌یەی پێ بەخشیویت و نیشانەی "میهرەبانی" و نووری "ئەحەدییەت"یشی لەو ڕوخسارە مەعنەوی‌یەت داوە، وازت لێ بهێنێت و گوێت نەداتێ و چاودێریی جموجووڵ و کردارەکانت نەکات؟ ئایا دەگونجێ بێ هیچ ئامانج و سوودێك ڕووی بوونەوەران بۆ لای تۆ وەربچەرخێنێت؟ یان درەختی مەزنی بوونەوەران بکات بە درەختێکی زڕی بێ کەڵك و، بەروبوومەکەشی دابڕزێنێت؟ یان هەرگیز ڕێی تێدەچێت "میهرەبانی‌یەکەی"، کە وەك ڕۆژ ئاشکرایە و هیچ دوودڵی و گومانێك هەڵناگرێت و، "دانایی‌یەکەی" کە بە چەشنی نوور ڕووناکە، وا لێ بکات ئینکاری بکرێن؟

نەخێر.. نەخێر. هەرگیز شتی وا ناگونجێ و خواوەند زۆر لەوە گەورەترە.

ئەی مرۆڤ! بزانە میعراج(پلیکانە)یێك هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤی پێدا سەربکەوێت تا دەگاتە عەرشی ئەو میهرەبانی‌یە. ئەو میعراجەش: ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾ە.

خۆ ئەگەر دەتەوێت ڕادەی گرنگی و مەزنی و پایە و پلەی ئەو میعراجە بزانیت، ئـەوا سـەیری سـەرەتای سـەد و چـواردە سوورەتەكانی قورئـانی پیرۆز و، هـەموو كتێبێكـی بەنرخ و، گشت كارێكی باش بكە!

تەنانەت ئەو فەرمایشتەی ئیمامی شافیعی و موجتەهیدانی هاوچەشـنی - خوایـان لـێ ڕازی بێت - كە فەرموویانە: (هەرچەند ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيـــــم﴾ یـەك ئایەتـە لـە قورئاندا، بەڵام سەد و چوارده جار نازڵ بووه) ئەم فەرمایشتە، بەڵگەیـەكی مەزنـە لەسـەر گەورەیی و ڕێز و پایەبلندیی: ﴿بسم الله الرحـــمن الرحيم﴾.

❑ **نهێنیی چوارەم:**

هـەموو كەسێ كـە بلێـت: ﴿إِيَّـــاكَ نعبـــدُ﴾ بـە تـەواوی دەركـی درەوشـانەوەی: "واحیدییەت" لە بەدیهێنراوە لەژمارەبەدەرەكاندا ناكات، لەبەر ئەوەی كە بیری مـرۆڤ لـەو زۆری‌یـەدا ون دەبێـت و سـەری لـێ تێكدەچێـت. چونكـە بـۆ ڕەچـاوكردنی زاتـی تەنیا(ئەحەد)ی خوای گەورە لە ڕێی تێكڕای بوونەوەرانەوە كاتێ بە: ﴿إياكَ نعبدُ وإِياكَ نستعين﴾ گوفتاری لەگەڵ دەكرێت، بۆ ڕەچاو كردنی ئەمـە، پێویسـت بـە دلێكـی هێنـدە مەزن دەبێت كە جێی هەموو زەویی تێدا ببێتەوە، لەبەر ئەمە و لەسەر بناغەی ئـەم نهێنی‌یـە وردە، خـوای گـەورە نیشـانە و مـۆری "ئەحەدییـەت" بـە ئاشـكرا لـە هـەموو "بەشـێك"دا دەردەخات، هەروەك لە نێوان "ڕەحمانی‌یەت"دا لە هەموو "جۆرەكانی"دا پیشانی دا.

ئەمـەش بـۆ ئـەوەی كـە سـەرنج تەنـها بـۆ لای زاتـی خـوای گـەورەی "ئـەحـەد" ڕابكێشرێت و، بۆ ئەوەش كە هەموو كەسێك - لە هەر پلەیەكدا بێت - بتوانێت لە كاتی وتنی: ﴿إِياكَ نعبدُ وإِياكَ نســـتعين﴾دا، بێ هیـچ تەكـەللوف و قورسـی وزەحـمەتێك، ڕاستەوخۆ ڕوو لە زاتی خاوێن و بەرزی خوای گەورە بكات.

لەبـەر ڕوونكردنـەوەی ئـەم نهێنی‌یەیـە كـە دەبینیـت قورئـانی پـیرۆز كاتـێ باسـی نیشـانەكانی خـوای گـەورە لـە ئاسـۆكان و فراوانـترین بازنـەدا دەكـات، یەكسـەر باسـی بچووكترین بازنەی بوونەوەران و بچووكـترین شتی جوزئیشیان دەكـات، تـاكو مـۆری "ئەحەدییەت" بە ئاشكرا لە هەموو شتێكدا دەربخات.

نموونەی ئەمە:

کاتێ قورئانی پیرۆز نیشانەکانی خواوەند لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویدا ڕوون دەکاتەوە، یەکسەر نیشانەکانیشی لە بەدیهێنانی مرۆڤدا و ڕوونکردنەوەی وردەکاریی ئەو نیعمەتانەی لە دەنگیدا و ناوازەیی ئەو داناییانەش لە ڕەنگ و ڕوخساریدا، ڕوون دەکاتەوە. تاکو "بیر"ی مرۆڤ لەناو ئاسۆ فراوان و زۆرەکاندا پەرتەوازە و، "دڵ"یشی نوقمی ناو زۆرییەکی بێ کۆتایی نەبێت و، "گیان"یشی، بێ بوونی هیچ هۆیەك لە نێواندا، ڕاستەوخۆ بە پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی شاد ببێت.

ئەم ئایەتەی خوارەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی ئیعجازبەخش، ئەم ڕاستییەی پێشوو ڕوون دەکاتەوە:

﴿**ومن آياتِهِ خَلقُ السمواتِ وَالأرضِ وَاختلافُ أَلسنتِكُم وألوانِكُم**﴾ (الروم: ٢٢).

پاشان هەرچەندە نیشانە و مۆرەکانی "وەحدانییەت" بە ئەندازەیەکی گەلێ زۆر و بێ کۆتایی لە بەدیهێنراواندا، هەر لە فراوانترین نیشانە و مۆری هەمەکییەوە تا دەگاتە بچووکترین نیشانە و مۆری هەندەکی، لە چەندین بازنەی تێهەڵکێش و چەندین پلە و جۆری جیاجیا و زۆر و زەبەندەدا، دانراون، هەرچەند ئەم نیشانە و مۆرانەی "وەحدانییەت" ئاوا ڕوون و ئاشکران، کەچی هێشتا ڕوونییەکەی لە نێوان چەندین بەدیهێنراوی زۆر و زەبەندەدایە و، کاتێ دەوترێت: ﴿**إيّاكَ نعبدُ**﴾ مافی تەواوی خۆیان نادرێتێ. لەبەر ئەوە، پێویست دەکات مۆری "ئەحەدییەت"یش لە دووتوێی مۆری "وەحدانییەت"دا ببێت بۆ ئەوەی ڕێ بۆ "دڵ" بکاتەوە تاکو بە گەیشتنی بە زاتی بێ چەندوچۆنی پاك و پیرۆزی خوای گەورە، شاد و شەرەفمەند ببێت، بێ ئەوەی زۆریی بوونەوەرانی بیر بخاتەوە.

پاشان بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی چاوان و دڵان بەرەو مۆری "ئەحەدییەت"، نەخشێکی ناوازەی تابلێی سەرنج ڕاکێش و.. نوورێکی درەخشانی لەوپەڕی ڕوونــاکیدا و.. شیرینییەکی بەتام لەوپەڕی چێژ و لەزەتدا و.. جوانییەکی خۆشویستراو لەوپەڕی دڵگیریدا و.. ڕاستییەکی ڕەگداکوتاو لەوپەڕی بەهێزیدا.. لەسەر ئەو نیشانەی "ئەحەدییەت"ە دانراوە، کە ئەویش نیشانەی بەزەیی(الرحمة) و مۆری میهرەبانی(الرحيمية)یە.

بەڵێ، تەنها هێزی ئەو بەزەیی‌یەیە کە سەرنجی خاوەن هەستان بۆ لای خۆی رادەکێشێت و دەستیان دەگرێت و دەیانگەیەنێت بە مۆر و نیشانەی "ئەحەدییەت" و، وایان لێ دەکات زاتی پیرۆزی خوای تەنیا رەچاو بکەن، بە چەشنێ کە مرۆڤ بە گفتوگۆی راستەقینەی: ﴿**إياك نعبدُ وإياك نستعين**﴾ شەرەفمەند و بەهرەوەر دەکات.

بەم جۆرە بۆمان روون بووەوە کە مادەم: ﴿**بسم الله الرحـــــمن الرحيـــم**﴾ پێرستی "فاتیحە" و پوختەیەکی کورتی "قورئانی پیرۆز"ە، ئەوا بووە بە ناونیشان و تەرجومانێك بۆ ئەم نهێنی‌یە مەزنەی کە باس کرا. جا ئەو کەسەی کە دەتوانێت ئەم ناونیشانەی دەست بکەوێت، دەشتوانێت بە ناو چینەکانی بەزەیی و میهرەبانی‌دا بگەرێت و، ئەو کەسەش ئەم تەرجومانە دەخاتە گفت، ئەوا لە نهێنی‌یەکانی میهرەبانیش تێ‌دەگات و دەیانزانێت و، نوورەکانی میهرەبانی و بەزەییش دەبینێت.

❐ **نهێنیی پێنجەم:**

فەرموودەیەکی پیرۆز دەفەرموێ:

"إن الله خلق آدم على صورة الرحمن"(١). أو كما قالﷺ.

هەندێ لە شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفی‌یەکان بە چەشنێکی سەیر ئەم فەرموودە پیرۆزەیان لێك داوەتەوە کە بۆ بیروباوەری ئیمانی ناشێت و لەگەڵی‌دا ناگونجێ. تەنانەت هەندێ لە ئەهلی عیشق گەیاندوویانەتە ئەوەی کە تەماشای سیمای مەعنەویی مرۆڤ بە شێوەیەك بکەن کە وەك شێوەی خوای گەورەی رەحمان وابێت!

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەهلی عیشق لە بارێکی بێ‌ئاگایی‌دان و نوقمی دەریای عیشق و شتانیان لێ دەئاڵۆزێت، ئەوا لەوانەیە لەو شتانەدا کە بە پێچەوانەی حەقیقەتەوە وەری‌دەگرن بەهانەیان وەربگیرێت. بەڵام کەسانی وریا و بەئاگا و بێدار بە تەواوی دەست بە رووی ئەو چەشنە واتایانەوە دەنێن کە پێچەوانەی بناغەکانی ئیمانن و، وەریان‌ناگرن. خۆ گەر هەرکەسێك پێیان رازی بێت، ئەوا هەڵەی کردووە و لە راستی لایداوە.

---

(١) "خلق الله عز وجل آدم على صورته.." حديث صحيح أخرجه البخاري برقم ٦٢٢٧ ومسلم برقم ٢٨٤١ وأحمد ٣١٥/٢ وابن خزيمة في التوحيد ص٢٩. أما حديث "إن الله خلق آدم على صورة الرحمن" فقد عزاه الحافظ في الفتح ١٨٣/٥ لابن أبي عاصم في السنة والطبراني من حديث ابن عمر رضي الله عنهما، وقال الحافظ باسناد رجاله ثقات. (وەرگێر – لە چاپە عەرەبی‌یەکەی "اللمعات"ەوە).

بەڵێ، ئەو کەسەی کاروباری گەردوون ڕێکدەخات و وەك ئەوەی گەردوون خانوویەك یان کۆشکێك بێت ئاوا بە ئاسانی بەسەر کاروباریدا زاڵ و فەرمانڕەوایە..

ئەو کەسەی ئەستێرە و تەن و قەبارەکانی ئاسمان بەوپەڕی دانایی و ئاسانی و بە چەشنی گەردیلەکان دەجوولێنێت..

ئەو کەسەی کە گەردیلەکان فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ دەکەن و ملکەچی دەبن..

بەڵێ، ئەو کەسەی کە هەموو ئەم کارانە ئەنجام دەدات، تەنها خواوەندی مەزنی پاك و پیرۆزە.

جا هەرچەندە زاتی پیرۆز و بێ چەندوچۆنی ئەو خواوەندە گەورەیە: بەرز و بڵند و پاك و پیرۆزە لەوەی کە هاوبەشی بێت، چونکە بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: ﴿**لَيسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ**﴾ (الشورى:١١) نە هاوبەشی هەیە نە هاوتا و نە دژ و نە هاوشێوە و هاوچەشن. بەڵام کاروبارە پڕ لە دانایی و سیفەتە مەزن و ناوە جوانەکانی بە چاویلکەی نهێنییەکانی نموونە هێنانەوە(ضـرب الأمثـال) سەیر دەکرێن کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوون کراوەتەوە: ﴿**ولَهُ المَثَــلُ الأَعْلـى في السـموات والأَرضِ وهوَ العزيزُ الحكيـم**﴾ (الروم:٢٧). واتە نموونەهێنانەوە لە کاتی باسکردنی کاروبارە پڕ لە داناییەکانی خوای گەورەدا بواری پێ دراوە و کارێکە ڕوو دەدات.

* * *

ئەم فەرموودە مەزنە چەندین مەبەستی مەزنی زۆری تێدایە:

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە: مرۆڤ بە شێوەیەکی هێندە ناوازە دروست کراوە کە ناوی جوانی: "الرحمن"ی خوای گەورە بە تەواوی لە خۆیدا دەربخات.

بەڵێ، بەپێی ئەوەی لە نهێنییەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە، ئەوا:

هەروەك ناوی: "الرحمن" لە تیشکەکانی دەرکەوتنی هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورە بەسەر ڕووی گەردوونەوە دەدرەوشێتەوە..

هەروەها وەك ناوی: "الرحمن" بە چەندین درەوشانەوەی لەژمارەبەدەری پەروەردگاریی ڕەهای خوای گەورە، بەسەر ڕوخساری زەوییەوە پیشان دەدرێت..

بە هەمان جۆریش، خوای گەورە درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی "الرحمن" لە شێوە و وێنە(صورة)ی گشتیی مرۆڤدا، بە پێوانەیەکی بچووکتر دەردەخات، بە چەشنی

ئەوەی کە لـە سیمای "زەوی" و "گـەردوون"دا بـە تەرازوویـەکی فراوانتر و گـەورەتر پیشانی دەدات.

هەر لەم فەرموودە پیرۆزەدا ئاماژەیەك هەیە بۆ ئەوەی کە:

مرۆڤ و زیندەوەران ئەوەندە ڕواڵەتیان تێدایە و هەموویشـیان دەبـن بـە بەڵگـە لەسـەر خواوەندی: "الرحمن الرحیم" کە وەك ئاوێنەی تیشك بەخشی درەوشـانەوەکانی خـوای گەورە وان. چونکە هەروەك وێنەی خۆر لـە ئاوێنـەدا دەردەکـەوێت و بەمـەش دەبێـت بـە بەڵگـە لەسـەر بوونـی خـۆر، مرۆڤـیش بـە هـەمان جـۆر، دەبێـت بـە بەڵگەیـەکی ڕوون و بێ گومان لەسەر بوونی خوای گەورە. جا هەروەك دەتوانرێت بەو ئاوێنەیە بوترێ: "ئـەوە خـۆرە" بـۆ ئـەوەی ئامـاژە بـۆ ڕادەی ڕوونـی و بەڵگـەبوونی لەسـەر خـۆر بکرێــت، دەشتوانرێت بوترێ - وەك لە فەرموودەکەدا وترا -: مرۆڤ وێنـەی "الرحمن"ی تێدایـە، تاکو ئاماژە بکرێت بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بە ڕوونـی بەڵگەیـە لەسـەر نـاوی: "الرحــمن" و موناسەبەتێکی تەواوەتی و پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵدا هەیە.

شوێنکەوتە میانەڕەوەکانی ڕێبازی "وحدة الوجود" لەسەر بناغەی ئەم بەڵگەیـە و وەك ناونیشانێك بۆ تەواویی موناسەبەتی نێوان خوا و بەندە، وتوویانە: "لا موجود إلاّ هو".

اللهمَّ یا رحمنُ یا رحیم! بحق: ﴿**بسم الله الرحــمن الرحیم**﴾ ارحمنا کمـــا یلیــق برحمتك، وفهمنا أسرار ﴿**بسم الله الرحــمن الرحیم**﴾ کما یلیق برحیمیتك. آمین.

❑ **نهێنیی شەشەم:**

ئەی ئەو مرۆڤەی کە لە ناوەندی دەستەوسـانییەکی بێ کۆتـایی و هەژارییـەکی بـێ سنووردا دەتلێیتەوە!

ئەگـەر دەتـەوێت تێبگـەیت لـەوەی کــە چـۆن "میــهرەبانی" گـەورەترین هۆکـار و ئومێدبەخشترین شەفاعەتخوازە، ئەوا بزانە:

"میهرەبانی" بەهێزترین هۆیە بۆ گەیشتن و شـادبوون بـە خزمـەت پادشـایەکی مـەزن و شکۆمەندی ئەوتۆ کە ئەستێرە و گەردیلەکان، وەکو یەك، بەوپەڕی تەواوی و ڕێکوپێکی سەربازی گوێڕایەڵی ئەون.. ئـەو پادشـا شـکۆمەندەی کـە پـەروەردگاری جیهانیانـە و هیچ پێویستییەکی بە هیچ کام لە بەدیهێنراوانی نییـە و، بەسـەر هـەموویاندا باڵادەستە و پێویستیی بە هیچ لایەکی بوونەوەران نییە، بەڵکو هەموو شتێك لە بـەردەم مـەزنیی ئـەودا

بچووکیی خۆی دەنوێنێت و سەری بۆ توانستی ئەو دانەواندووە و ملی بۆ عیززەت و سام و شکۆی ئەو کەچ کردووە.

کەواتە ئەی مرۆڤ!

"میهرەبانی" بۆ دیوان و حوزووری ئەو دەوڵەمەندە ڕەهایە تۆ بەرز دەکاتەوە و، دەتکات بە خۆشەویستی ئەو پادشا هەمیشەیی‌یە مەزنە. تەنانەت بۆ پلەی مەزنی گفتوگۆ لەگەڵ کردنی ئەو دەتبات و دەتکات بە خۆشەویست و بەندەیەکی بەڕێزی لای ئەو.

بەڵام هەروەك تۆ ناگەیتە خۆر، چونکە لێی دووریت، تەنانەت هەر ناشتوانیت بە هیچ جۆرێك نزیکی بکەویتەوە و، لە ڕێی ئاوێنەیەکەوە ڕووناکی و درەخشانی و وێنەی خۆیت دەداتێ.. ئێمەش بە وێنەی ئەمە، هەرچەند لە زاتی خاوێنی خوای گەورەوە گەلێ دوورین، بەڵام نووری "میهرەبانی"یەکەی، ئەومان لێ نزیك دەخاتەوە.

ئەی مرۆڤ!

کەسێك ئەم میهرەبانی‌یەی دەست بکەوێت، گەنجینەیەکی مەزنی نەبراوەی پڕ لە نووری دەست کەوتووە. بیشزانە ڕێی گەیشتن بەم گەنجینە مەزنە ئەوەیە کە:

درەخشانترین نموونەی میهرەبانی و، باشترین نوێنەری ئەو میهرەبانی‌یەوە و، ڕەوانبێژترین زمانێك باسی بکات و، بەڕێزترین بانگەوازکار بۆ لای، تەنیا ئەو کەسەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا بە: ﴿رَحْـمةً للعالمين﴾ (الأنبياء:١٠٧) واتە: "میهرەبانیی جیهانیان" ناو براوە، کە پێغەمبەری خۆشەویستمانە ﷺ.. جا باشترین ڕێ بۆ گەیشتن و دەستکەوتنی ئەو گەنجینە هەمیشەیی‌یە: شوێنکەوتنی سوننەتی پیرۆزی ئەوە.

بەڵام ئایا چۆن و لە ڕێی چ هۆکارێکەوە مرۆڤ بەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ شاد بێت؟

ئەو هۆکارە سڵاوات لەسەردانیەتی.

بەڵێ، سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ واتای میهرەبانی دەگەیەنێت، چونکە سڵاوات بریتی‌یە لە دوعای ڕەحمەت و میهرەبانی بۆ ئەو ڕەحمەت و میهرەبانی‌یە بەرجەستە و زیندووە و، هۆکارێکە بۆ گەیشتن و شادبوون بەو "میهرەبانیی جیهانیان"ە.

دەسا ئەی مرۆڤ! سڵاواتدان لە دیداری ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ بکە بەهۆی پێ گەیشتن و پێ شادبوونی. پاشان دەستی پێوە بگرە تاکو بتگەیەنێتە میهرەبانیی خواوەندی "ڕەحمان و ڕەحیم".

خۆ کاتێ کە هەموو نەتەوەی ئیسلام دوعا دەکەن و سڵاوات لەسەر ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ دەدەن، بە ڕوونی مەودای ئەم میهرەبانی‌یە و، ڕادەی گرنگیی و فراوانیی ئەم دیاری‌یە خوایی‌یە، دەچەسپێنن.

**بە کورتی:**

گەنجینەوان و بەڕێزترین بانگەوازکاری دەرگانەی گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند: زاتی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ. هەروەك بەنرخترین کلیلی ئەو گەنجینەیەش: ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾ە و، بناغەی ئەو شتەش کە دەیکاتەوە: سڵاواتدانە لەسەر ئەو پێغەمبەرە ﷺ.

اللّهُمَّ بِحَقِّ: ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾ صَلِّ عَلى مَنْ أَرْسَلْتَهُ رَحْمَةً لِلعالمين كَما يَليقُ بِرَحْمَتِكَ وَبِحُرْمَتِهِ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ، أَجْمَعينَ. وَارْحَمْنا رَحْمَةً تُغنينا بِهَا عَنْ رَحْمَةِ مَنْ سِواكَ مِنْ خَلْقِكَ. آمين.

﴿**سبحانكَ لا علمَ لنا إلاّ ما علّمتنا، إنّك أنت العليم الحكيم**﴾.

* * *

# بریسکەی پازدەهەم

بریتی‌یە لە پێڕستی پەیامەکانی نوور: (وتەکان، مەکتووبات، بریسکەکان - تا بریسکەی چواردەهەم). جا لەبەر ئەوەی هەر کۆمەڵە پەیامەو پێڕستی تایبەتیی خۆی لەگەڵدا بڵاو کراوەتەوە، ئەوا لێرەدا ئەم بریسکەیە دانەنرا.

# بریسکەی شازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ دۆستان و برایانی ئازیزم:

مەلا صەبری، حافظ عەلی، مەسعوود، مستەفاکان، خەسرەو، ڕەئفەت، بەکر بەگ، ڕوشدی، لوتفی‌یەکان، حافظ ئەحمەد، مەلا مستەفا و، ئەوانی تریش!

پڕ بە دڵ هەستم کرد و بە پێویستم زانی چوار مەسەلەتان بە پوختی بۆ باس بکەم کە هەرچەند بە ڕواڵەت بچووکن بەڵام لە ڕاستیدا گرنگ و سەرنج ڕاکێشن و پرسیاریان لەبارەوە دەکرێت، تاکو لێیان ئاگادار بنەوە.

❑ **یەکەم پرسیاری سەرنج ڕاکێش:**

یەکێك لە برایانمان کە "عەبدوڵڵای چاپرازادە"یە و کەسانێکی تریش، هەواڵیان داینێ کە ئەهلی کەشف وتوویانە: شوێنکەوتووانی سوننەت و جەماعەت لەم ڕەمەزانەدا - کە ڕابورد - هەندێ مژدەی خۆش و فتووحات بەدەست دەهێنن و ئەم تەنگانەیان لەسەر لادەچێت. کەچی هیچ شتێکی وەك ئەمانە نەهاتەدی!

جا لێیان پرسیم: چۆن کەسانی ئاوا لە ئەهلی کەشف و ویلایەت هەواڵی شتی پێچەوانەی واقیع ڕادەگەیەنن؟

یەکسەری ئەم وەڵامەی خوارەوەم دانەوە کە لەو سنووحاتانەن بۆ دڵم دێن. وتم:

لە فەرموودەی پیرۆزدا شتێك بەم واتایە هاتووە کە:

"کاتێك بەڵا دەبارێت، سەدەقە ڕووبەڕووی دەبێتەوە و دەیباتە دواوە"(١).

لـەم فـەرمـوودە پـیرۆزەوە دەردەکـەوێت کـە: شتانی تـەقدیرکراو کاتـێ لـە جیـهانی پەنهانەوە بەرەو جیهانی ئاشکرا و بینراو دێـن، بە چەند مەرجێکەوە بەستراونەتەوە. جا لەبەر دواکـەوتنی هـەندێ لـەو مەرجانـە ئـەوانیش دوادەکـەون و نایەنـەدی، ئیـتر ئـەو موقەددەراتـەش، کـە ئـەولیاکانی ئـەهلی کەشـف بینیویانـە، دوا دەکـەون. واتـە ئـەو موقەددەراتانە ڕەها نین بەڵکو پابەندی چەند هەل و مەرجێکن. جـا لـەبەر نەهاتنـەدی ئەو مەرجانە ڕووداوەکەش نایەتـەدی. چـونکە ئەو ڕووداوە بـە وێنـەی "ئـەجـەلی موعەلـلـەق" وایـە؛ لـە "تـابلۆی کوژانـەوە و تیانووسـین"دا نووسـراوە کـە جۆرێکـە لـە تۆمارەکـانی "لەوحی ئەزەلی". خۆ "کەشف"یش بە دەگمەن بۆ لەوحی ئـەزەلی بـەرز دەبێتـەوە. بـەڵکو زۆربەی کەشفەکان ناتوانن تا ئەوێ بڕ بکەن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە:

ئەو هەواڵانەی کە لە مانگی ڕەمەزانی ڕابوردوو و جـەژنی قوربـان و کاتـەکانی تـردا لەسەر بناغەی هەڵێنجان(إستنباط) یاخود بە جۆرێك لە کەشفی پیاوچاکان ڕاگەیەنران، بۆیە لە ڕاستیدا نەهاتنـەدی چونکـە هـەل و مەرجـەکانیان بـۆ نەڕەخسـابوو. کەواتـە ئەو کەسانەی کـە ئـەو چەشـنە هەواڵانـەیان ڕاگـەیاند نابـێ بـەدرۆ بخرێنـەوە، چونکـە ئـەو ڕووداوانەی کـە هـەواڵیان لـە بـارەوە دا لـە ڕاستیدا تـەقدیر کرابوون، بـەڵام تـا هـەل و مەرجـەکانیان پەیدا نـەبن ئـەوانیش ڕوونـادەن، خـۆ مـادەم مەرجـەکان نـەهاتن، ئـەوا ڕووداوەکەش پەیدا نابێت.

بەڵێ، ئەو دوعا و نزا خاوێن و بێ گەردەی کە زۆربەی ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت لـە ڕەمـەزانی پیرۆزدا بـۆ نـەمانی "بیدعـەت" دەیکـەن، هۆکـار و مـەرجێکی گرنگـە بـۆ هاتنەدیی ئەو هەواڵانە. بەڵام بە داخەوە تێکەڵبوونی "بیدعەت" لە ناو مزگەوتەکان و لـەم مـانگە پـیرۆزەدا ڕێـی لـە گـیراکردن و قبـووڵ بوونـی ئەو دوعایانـە گـرت و ئنجـا ئەو گرفـت و تەنگانانـەش لەسـەر موسـڵمانان لا نـەچوون! چونکـە هـەروەك بـە بەڵگـەی

---

(١) أصل الحديث: عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: "لا يغني حذر من قدر، والدعاء ينفع مما نـزل ومما لم ينـزل، وإن البلاء لينـزل، فيتلقاه الدعاء فيعتلجان إلى يوم القيامة". حديث حسن أخرجه الحـاكم. وحديث: "لا يردّ القضاء إلاّ الدعاء" قال الترمذي: حسن غريب. (تمييز الطيب لابن البديع الشيباني). (وەرگێڕ)

فەرمووده پیرۆزەکە: سەدەقە بەلا و گیروگرفت دەباتە دواوە، دوعای بێ گەردی زۆرینەی موسڵمانانیش دەبێت بەهۆی "کێش کردنی" خۆشی و شادیی هەمەلایەنە و گشتی. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هێزە کێشکەر(جاذبـة)ە نەهاتە وجوود، ئەوا ئەو فتووحاتانەش نەبەخشران و ئەو دەروانەش لە موسڵمانان نەکرانەوە.

❑ **دووهەم پرسیاری سەرنج ڕاکێش:**

لە کاتێکدا کە دەبوو لەم دوو مانگەی ڕابوردوودا و لە بەرامبەر باروودۆخێکی وورووژێنەری سیاسی‌یەوە، هەوڵێکم بدایە و دەستم بدایەتە کارێك، چونکە گریمانێکی بەهێز لە کایەدا بوو کە ئەنجامی ئەو هەوڵە دڵی من و زۆربەی برا نزیکەکانمی خۆش بکردایە.. کەچی گوێم بەو باروودۆخە نەدا و، بە پێچەوانەی ئەو بیرەی هەڵم گرتووە ڕەفتارێکم نواند کە لە بەرژەوەندیی ئەهلی دنیا بوو، لەوانەی کە سەختڵەتم دەکەن و ئازارم دەدەن. بۆیە هەندێ کەس لە بارەی منەوە پتر گرفتاری سەرسامی بوون و وتیان: چۆن دەڕوانیتە ئەو سیاسەتەی کە ئەم بیدعەتکارە و کۆمەڵێك لە سەرکردە مونافیقەکان لە دژی تۆ بەکاری دەهێنن، وا هێرشی ناکەیتە سەر؟

**پوختەی وەڵامەکەم ئەوەیە کە:**

مەزنترین مەترسی لەم ڕۆژگارەدا سەبارەت بە موسڵمانان: "تێکچوونی دڵەکان" و "لەق بوونی ئیمان"ە بەهۆی ئەو گومڕایی‌یەی کە لە فەلسەفە و زانستەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. خۆ تاکە چارەسەریش بۆ چاکسازیی دڵان و ڕزگارکردنی ئیمان تەنها لە "نوور" و پیشاندانی ڕووناکیدایە، دەنا گەر بە گورز و کوتەکی سیاسەت کار بکرێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنرێت، ئەوا ئەو "کافرانە" دادەبەزنە خوارەوە و دەچنە ئاستی "مونافیقان"! خۆ مونافیقیش – وەك ئاشکرایە – گەلێ بێ کەڵکترە لە کافران و مەترسی و زیانیشی لەوان زیاترە. کەواتە گورزی سیاسەت لەم ڕۆژگارەدا چاکسازی لە دڵاندا ناکات، چونکە "کوفر" دادەبەزێنێتە ناو قووڵایی دڵ و ئەویش لەوێدا خۆی دەشارێتەوە و دەبێت بە نیفاق!

پاشان کەسێکی دەستەوسان و کۆڵەواری وەك من ناتوانێت لەم کاتەدا "نوور" و "کوتەك" پێکەوە بەکار بهێنێت. بۆیە ناچارم کە بە هەموو هێزێکم دەست بە نوورەوە بگرم[1]. کەواتە دەبێ ئاوڕ لە کوتەکی سیاسەت نەدرێتەوە، لە هەر جۆرێك بێت. خۆ

(١) مەکتووبی سیازدەهەم ئەم بڕگەیە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە. (وەرگێڕ)

ئەو کارمەندی‌یەش کە جیهادی ماددی داخوازی‌یەتی، لەم کاتەدا لە ئەستۆی ئێمە نەنراوە. ڕاستە کوتەك بۆ وەستاندنی "کافر" یان "مورتەد" دانراوە لە سنووری خۆی‌دا، بەڵام خۆ ئێمە تەنها دوو دانە دەست شك دەبەین، تەنانەت گەر سەد دەستیشمان ببێت هێشتا بەشی هەڵگرتنی نوور ناکات. کەواتە ئێمە دەستێکی وەهامان نی‌یە کە کوتەکی سیاسەتی پێ هەڵبگیرێت.

**☐ سێهەم پرسیاری سەرنج ڕاکێش:**

هێرشی بیانی‌یەکان (وەك ئینگلتەرا و ئیتالیا) لەم دوایی‌یەدا بۆ سەر ئەم حکوومەتە، دەبێت بە مایەی ورووژاندنی غیرەت و هەست و نەستی ئیسلامی، کە ئەمەش ستوونێکی ڕاستەقینە و سەرچاوەیەکی هێز بووە بۆ چەندین حکوومەتی پێشتری ئەم نیشتمانە لە دێر زەمانەوە و، تا ڕادەیەك دەشبێت بەهۆی ژیاندنەوەی شەعائیری ئیسلام و دوورخستنەوەی هەندێك لە بیدعەتەکان..

ئایا بۆچی بە توندی لەم جەنگە نارازی بوویت و لە خوا پاڕایتەوە کە بە ئاشتی و ئاسایش کۆتایی بە کێشەکە بهێنێت؟ خۆ تۆ بەم کارەت بوویت بە لایەنگری حکوومەتی بیدعەتکاران، کە ئەمەش چ لە خۆی‌دا و چ لە ئەنجامەکانی‌دا پشتگیری و لایەنگری‌یە بۆ بیدعەتەکان؟!

**وەڵام:**

ئێمە بۆ دەروو کردنەوە لە موسڵمانان و، مژدە و، دڵخۆشی و، سەرکەوتنیان، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە. بەڵام نەك بە شمشێری کافران، خوا شمشێرەکانیان لەناو بەرێت و بیانکات بە مایەی نەهاتی بۆ خۆیان! ئێمە نە پێویستمان بە شمشێری ئەوانە، نە چاوەڕوانی هیچ سوودێکیشین لێیانەوە. چونکە هەر ئەو بیانی‌یە سەرسەختانەن کە مونافیقانیان بەسەر ئەهلی ئیماندا زاڵ کردووە و مولحیدانیشیان لە باوەشی خۆیاندا پێ گەیاندووە!

ئنجا گیروگرفت و بەڵای جەنگیش زیانێکی زۆر لەم خزمەتە قورئانی‌یەمان دەدات، چونکە زۆربەی برا کارگوزار و خۆبەختکارە بەڕێزەکانمان تەمەنیان لە چل و پێنج ساڵ تێ ناپەڕێت، جا ئەگەر جەنگ لە گۆڕێ‌دا هەبێت، ناچار دەبن بڕۆنە جەنگەوە و واز لەم

خزمەتە قورئانی‌یە خاوێنە بهێنن. خۆ ئەگەر من خاوەنی برێك پـارە بوومایـە، هـەموویم بـە ڕەزامـەندیی خـۆم بـۆ ڕزگـارکردنی ئـەو بـرا بەڕێزانـە دەبەخشـی، بـا "دراوە بریـی"(بـدل نقـدی)ی نـەچوونیان بـۆ سـەربازی هـەزار لـیرەش بوایـە! چونکـە چوونـی سـەدان بـرای کارگوزارمان بۆ سەربازی و بەشداری کردنیان لە جیهادی ماددی‌دا زیانێکی گەورەیـە لەم خزمەتـەمان کـە وا هەسـت دەکـەم هێنـدەی سـەد هـەزار لـیرە دەبێـت، بگـرە چوونـی "زەکائی" بۆ سەربازی لە ماوەی دوو ساڵی ڕابوردوودا زیاد لـە هـەزار لـیرەی سـوودی مەعنەویی لەدەست داین.

بـە هـەرحاڵ، خواونـدی بـەتوانای شـکۆمەند کـە لـە مـاوەی یـەك خولـەکدا ڕووی گـرژی ئاسمـان لـە هـەور خـاوێن دەکاتـەوە و خـۆری درەخشـان لـە ڕووی ئاسمـاندا دەردەخات، دەشتوانێت ئەم پەڵە هەورە ڕەش و تـاریك و بێ‌بەزەیی‌یانـەش بڕەوێنێتـەوە و، بەوپەڕی ئاسـانی و بـێ هیـچ زیـانێکیش خـۆری ڕوونـاکی "ڕاسـتی‌یەکانی شـەریعەت" دەربخات.

ئێمە لە میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە داوای ئەمە دەکـەین و، لێیشـی دەپاڕێینـەوە کـە هاتنـەدیی ئەم خواستەمان گـران نـەخات لەسـەرمان و، ژیـری و فـام بـە مێشـکی سەرکردەکان و ئیمانیش بە دڵانیان ببەخشێت. خۆ ئەمـەش سـەروزیادمانە و ئـەو کاتـەش هەموو شتێك لە شوێنی خۆی‌دا ڕاست دەبێتەوە.

❑ **چوارەم پرسیاری سەرنج ڕاکێش:**

**دەڵێن:** مادەم ئەو شتەی بە دەستتانەوەیە "نوور"ە و گورز و کوتەکی سیاسـەت نی‌یـە، نووریش موعارەزە نـاکرێت و کـەس لێـی هەڵنایـەت و ئاشکراکردنیشـی زیـانی بـۆ هیـچ کەسێك لـێ نابێتەوە. ئەدی بۆچی ئامۆژگاریی هاوەڵانتان دەکەن کە وریا و بێدار بـن و، ڕێیـان پـێ نـادەیت گەلـێ پـەیامی ڕووناکی بـەخش لـە پێش‌چاوی هـەموو خـەڵکی‌دا دەربخەن؟!

**ناوەڕۆکی وەڵامی ئەم پرسیارە بە پوختی بریتی‌یە لـەوەی کە:**

کەللەی زۆربەی سەرکردەکان مەستە؛ شت ناخوێننەوە. ئەگەر بیشـی‌خوێننەوە لێـی تێناگەن و واتایەکی هەڵەی لـێ دەدەنەوە و، بەهانە دەدۆزنەوە و هێرش دەبەن..

لەبەر ئەمە و بۆ ڕێ نەدان بەم هێرشە، دەبێ تا ئەوان لەو مەستی‌یە بێدار دەبنەوە و دێنەوە سەر هۆشی خۆیان، نووریان پیشان نەدرێت!

پاشان گەلێ کەسی بێ ویژدان هەن کە ئینکاریی نوور دەکەن، یاخود لەبەر چەند ئامانجێکی کەسیی تایبەت، یان لە ترسدا، یاخود لەبەر تەماع، چاو لە ئاستی ئەو نوورەدا دەنووقێنن.

لەبەر ئەمە، ئامۆژگاریی برایانم دەکەم کە: وریا بن و ئاگایان لە خۆیان بێت و، ڕاستی‌یەکان بە هیچ کەسێك نەدەن کە شایستەیان نەبێت، دەنا بەو کارەیان شك و گومانی ئەهلی دنیا لە خۆیان دەورووژێنن[1].

## کۆتایی

ئەمڕۆ نامەیەکم لە کاك ڕەئفەتەوە بەدەست گەیشت. وا بە بۆنەی پرسیارکردنی سەبارەت بە مووی ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێم:

لە فەرموودەی پیرۆزدا چەسپاوە کە ژمارەی ئەو تاڵە موووانەی لە ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵوەریون، ژمارەیەکی کەمە و لە نێوان سی تا چل دانەدایە، یان لە پەنجا و شەست تاڵ تێپەڕ ناکات. بەڵام بوونی ئەو تاڵە موووانە لە هەزاران شوێندا سەرنجی ڕاکێشام و کاتی خۆی هانی‌دام بیری لێ بکەمەوە. هەر ئەو کاتە ئەمەم بە دڵدا هات کە:

---

(١) ئەمەی خوارەوە ڕووداوێکی ناسکە، دەکرێ ببێت بە هۆ بۆ مەسەلەیەکی جیددی:
پیرێ کاك محەممەدی زاوای یەکێك لە هاوڕێکانم هات بۆ لام و بە دڵی شادمان و مژدەدانەوە وتی: لە "ئیسپارتە" یەکێك لە کتێبەکانی تۆیان چاپ کردووە و خەڵکێکی زۆر دەیخوێننەوە. پێم وت: ئەو چاپە قەدەغە نی‌یە و لەو نوسخانەیە کە لێیان وەرگرتین و دەوڵەت لاریی لێی نی‌یە. لەگەڵ ئەوەشدا پێم وت: ئەم هەواڵە لای دوو هاوڕێ مونافیقەکەت باس نەکەیت، چونکە ئەوان بە دوای ئەم جۆرە شتانەدا دەگەڕێن تاکو بیکەن بە بیانوو بۆ هێرش کردن.
جا برایانم! هەرچەند ئەم کەسە زاوای یەکێکە لە هاوەڵەکانم و لەم ڕووەوە بە یەکێك لە خۆشەویستانم دادەنرێت، بەڵام بە حوکمی پیشەکەی کە سەرتاشی‌یە، هاوڕێی موعەللیمە بێ ویژدان و بەڕێوەبەرە مونافیقەکەیە. ئەم هەواڵەش یەکێك لە برایانی ئیسپارتەمان دابووێ، بێ ئەوەی بزانێت هاوڕێی ئەو دوانەیە. ئەویش کارێکی باشی کرد کە یەکەم جار بە خۆمی وت و منیش ئاگادارم کردەوە کە دەمی خۆی بپارێزێت و، پاشان برایانم تێ گەیاند و، بەمەش دەرگای خراپە داخرا و، بە ئامێری ڕۆنیۆ و لە ژێر ئەو پەردەیەدا هەزاران نوسخە بڵاو کرانەوە. (دانەر)

تاڵە مووە پیرۆزەکـانی پێغەمبـەر ﷺ کـە ئێستا لـە زۆر شوێـندا هـەن، هـەموویان هـی ڕیشی پیرۆزی نین، بەڵکو لەوانەیە هەندێکیان هی سەری موبارەکی بن. چونکـە هاوەڵـە بەڕێزەکان کە هیچ شتێکی پێغەمبەریان ﷺ لە کیـس نـەدەدا، پارێزگـاریی ئـەو تاڵـە مـووە پیرۆز و مونەووەرانەی پێغەمبەریان ﷺ کردووە هەرکاتێ سەری چاك کـردووە. ئـەو تاڵـە موو انەش بە هەمیشەیی دەمێننەوە. خـۆ ژمارەی ئەوانـەش لـە هـەزاران تێپـەڕ دەبێـت. بـەم جۆرە، ژمارەکەیان لەگەڵ ژمارەی ئەو موو انەی کە ئێستا هەن، یەکاویەك دەردەچێت.

هەروەها ئەوەم بە دڵدا هـات کـە: ئایـا ئـەو تاڵـە موو انـەی لـەو مزگەوتانـەدا هەیـە، بـە سەنەدی صەحیح چەسپاوە کە تاڵە مووی پێغەمبەرن ﷺ تاکو زیارەت کردنمـان بۆیـان بـە لای ژێرییەوە کارێکی ڕەوا و پەسەند بێت؟

یەکسەر ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات کە:

زیـارەت کردنی ئـەو تاڵـە موو انـە لـە ڕاستیدا هۆکـار و مایـەی سـڵاواتدانە لەسـەر پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ و هـۆی خۆشویسـتن و ڕێـز لێنانیـەتی. کەواتـە سـەیری خـودی هۆکارەکە ناکرێت، بەڵکو سەیری ئـەو ڕووەی دەکرێـت کـە بـووە بـەو هۆکـارە. لەبەر ئەوە، ئەگەر ئەو تاڵە مووە لە ڕاستیدا هی ئەو نەبێت، ئەوا ئەرکی ئـەو هۆکـارە دەگرێتە ئەستۆ، مادەم بە ڕواڵەت بە هی ئەو دانرابێت و خەڵکی بە تاڵە موویـەکی پێغەمبـەریان ﷺ بیستبێـت. کەواتـە ئـەو تاڵـە مـووە دەبێـت بـە هـۆی خۆشویستن و ڕێزلێنـان و سـڵاوات لەسەردانی پێغەمبەر ﷺ. بۆیە لە دەستنیشان کردنـی خـودی تاڵـە مووەکـەدا پێویسـت بـە سەنەدی بێ گومان ناکات. بەڵکو هێندە سەروزیادە کە دەلیلێکی قەتعی لە دژی نـەبێت، چونکە ئەوەی خەڵکی دەمـاودەم دەیبیستێت و نەتـەوەی ئیسلام قبووڵـی دەکـات و پێـی ڕازی دەبێت، لە حوکمی جۆرە "حوججەت"ێکدا دەبێت.

خۆ ئەگەر هـەندێ کەسـی ئـەهلی تـەقوا چ لـە ڕووی ئیحتیـات کـردن و چ لـە ڕووی کارکردن بە "عەزیمەت"ەوە ڕەخنـە لـەم جۆرە شـتانە بگـرن، ئـەوا مەبەستیان چـەند تاڵـە موویـەکی تایبەتییـە. گـەر بیشـوترێت: ئەوانـە بیدعـەتن، ئـەوا لـە نـاوەندی "بیدعـەی حەسەنە"دان، چونکە هۆکاری سڵاواتدانن لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

کاك ڕەئفەت لە نامەکەیدا دەڵێت:

"ئەم مەسەلەیە بووە بە مایەی وتووێژ و موناقەشە لە نێوان برایاندا".

منیش ئامۆژگـاریم بـۆ برایانم ئەوەیە کـە هـەر شتێك جیـاوازی بنێتـەوە و لێکدابـڕان دروسـت بکـات موناقەشـەی تێدا نەکـەن و، دەبێ وا فـێری لێکۆڵینـەوە و لێکدانـەوەی شتان بین کە مشتومڕ و قڕەی تێدا نەبێت و، تەنها وەك بیروڕا گۆڕینەوە وا بێت.

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بۆ برایانی ئازیزم لە شارۆچکەی "سەنیرکەنت" بەڕێزان: ئیـبراهیم، شـوکری، حـافظ بەکر، حافظ حسەین، حافظ ڕەجەب!

ئەو سێ مەسەلەیەی کە بە حافظ تۆفیقدا ناردبووتان لە مێـژە مولحیـدان ڕەخنـەی لـێ دەگرن:

*یەکەمیان*: واتای ڕواڵەتیی ئایەتی: ﴿حتى إذا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَمْسِ وَجَدَها تَغْـــرُبُ في عَيْنٍ حَمِئَـــةٍ﴾ (الكـهف:٨٦) ئـەوە دەگەیـەنێت کـە: زولقەرنـەین ئـاوابوونی خـۆری لـە کانیاوێکی قوڕاوی و گەرمدا بینی.

*دووهەمیان*: بەربەست(سد)ی زولقەرنەین دەکەوێتە کوێ؟

*سێ هەمیان*: لە بارەی هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسایە - دروودی لەسەر بێـت - و کوشتنی دەجالە لەسەر دەستی ئەو لە ئاخر زەماندا.

وەڵامدانـەوەی ئـەم سێ پرسیارە درێـژە دەکێشێت، بـەڵام ئێمــە لـێرەدا بـە پوختـی ئاماژەیان بۆ دەکەین و دەڵێین:

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەسەر شێوازەکانی زمانی عەرەبی و بە جۆرێك داڕێـژراون کە زۆربەی خەڵکی(عەوام) بە بینینی ڕواڵەتی لێی تێدەگەن. بۆیـە زۆر جـار بـە شێوەی تەشبیهـ و نموونە هێنانەوە مەسەلەکانیان ڕوون دەکەنەوە. بۆ نموونە ئایەتی: ﴿تَغْـــرُبُ في عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە: زولقەرنەین لە کەناری زەریـای خۆرئـاوادا ئـاوابوونی خـۆری لـە شتێکی وەك کانیـاوێکی قوڕاویـی گـەرمدا بینـی، یـان ئـاوابوونی خـۆری لـە چیایەکی گڕکانیی بە بڵێسە و دووکەڵدا بینی.

واتـە زولقەرنـەین بـەپێی ڕوانینـی ڕواڵـەتی لـە کـەنارەکانی زەریـای خۆرئـاوا و لــە بەشێکی ئەو زەریایەدا کە لە دوورەوە لە شێوەی گۆمێك ئاوی فراواندا دەردەکـەوێت و

لـە پشـت ئـەو هەڵـمـە چڕانـەی لـە زەلکاوەکـانی کـەنارەکانی زەریـای خۆرئـاوا لـەبـەر گەرمای بەتینی هاوین بەرز دەبنەوە، ئاوابوونی ڕواڵەتیی خۆری بینی..

یان ونبوونی خۆری – کە "عەین" ی ئاسمانە – لەسەر چاوەیەکی گڕگرتوودا بینی کە تازەکی لەسەر لوتکەی چیایەکی گڕکانیدا تەقیبووەوە و پریشکەکانی بەم لا و ئـەولادا دەهاویشت و گڵ و بەرد و شلە کانزاکانی تێکەڵی‌یەکتری دەکرد.

بـەڵێ، دەستەواژە ڕەوان و ئیعجازبەخشـەکانی قورئـانی پـیرۆز، بـەم تەنـها ڕسـتەیە ڕێنمایی خەڵکی بۆ لای گەلێ مەسەلەی زۆر و زەبەندە دەکات:

ئەوەتا یەکەم شت دەری‌دەخات کە: گەشتەکەی زولقەرنەین بۆ لای خۆرئاوا و.. لە دەمی گەرمی‌دا و.. ڕووە و زەلکاوەکان و.. لە کاتی خۆرئاوابووندا و.. لە دەمـاودەمی تەقینەوەی شـاخێکی گڕکانـاوی‌دا بـووە. هـەموو ئەمانـەش قورئـانی پـیرۆز ئاماژەیـان پـێ دەکات بۆ گەلـێ مەسەلەی پڕ لە پـەند و عیـبرەت، یـەکێك لەوانـە: زاڵبوونـی تـەواوەتیی زولقەرنەینە بەسەر ئەفریقیادا.

ئاشکرایە کە جووڵەی بینراوی خۆر جووڵەیەکی ڕواڵەتی‌یە و، بەڵگەیەکە جووڵــەی پەنـهانی هەسـت پـێ نـەکراوی زەوی دەردەخـات و، هـەرگیز مەبەسـت پێـی حەقیقـەتی "ئاوابوونی خۆر" نی‌یە(١).

پاشـان وشـەی "عـین" لـێرەدا بـۆ تەشبیهە، چونکـە دەریـای مـەزن لـە دوورەوە وەك گۆمێکـی بچـووك دەبیـنرێت. جـا تەشبیهـ کردنـی ئـەو دەریایـەی کـە لـە پشـت هــەڵم و تەمومژی گۆم و زەلکاوە گەرمەکانەوە بینراوە، بە: "عین حمئـة" واتـە کانیـاوێك لـە قـوڕ هەڵقوڵا بێت.. هەروەها بەکارهێنانی وشـەی "عـین" کـە لـە زمـانی عـەرەبی‌دا: کـانی و، خۆر و، چاو، دەگەیەنێت.. لە ڕاستی‌دا، نهێنی‌یەکەی ڕەوانبێژیی ورد و پەیوەندی‌یـەکی توندوتۆڵ دەردەخات(٢).

---

(١) لە تەفسیری بەیضاوی‌دا هاتووە کە: "لەوانەیە گەیشتبێتە کەناری زەریـا و بەو جۆرە بینیبێتی، چونکە لـە مەودای بینینی چاوی‌دا جگە لە ئاو هیچی تر دیار نەبووە، بۆیە فەرمووی: ﴿وَجَدَهَا تَغْـــرُبُ﴾ و نەیفـەرموو: "کانت تغرب"! بڕوانە: تفسیر البیضاوی ج٣/ص٢٧٣. (وەرگێڕ)

(٢) تەعبیر کردن بە وشـەی "عین" لـە ئایـەتی: ﴿عَيْـــنٍ حَمِئَـــةٍ﴾ لـە ڕێی هێماکردنەوە، واتایەکی ناسك و نهێنی‌یەکی وردی ڕەوانبێژی یاد دەخاتەوە، کە بریتی‌یە لەوەی: ڕووی ئاسمـان دوای ئـەوەی بـە "چـاوی خۆر" جوانیی میهرەبانیی خواوەندی لە ڕووی زەوی‌دا بینی و.. ڕووی زەویش دوای ئـەوەی کـە بـە "چـاوی دەریـا"

جـا هــەروەك ئــاوابوونی خــۆر لــە دوورەوە و بــە ڕواڵــەت ئــاوا لای زولقەرنــەین دەرکەوت.. ئەو فەرمایشتەی قورئانیش کە دەریدەخات: خـۆری گوێڕایـەڵ و چـرای میوانخانـەی خواوەنـدی میـهرەبان لـە "کانیـاوێکی" پـەروەردگاریدا - کـە زەریـای خۆرئاوایە - لە پێشچاودا ون بووە و، بە شێوازە خاوەن ئیعجازەکەشی دەریخست کە دەریا کانیاوێکی گەرمە.. ئەم فەرمایشتەی قورئـان، شایان و لەگـەڵگونجاوی بـەرزی و مەزنیی ئـەو گـوفتارە مەزنەیە کـە لە عەرشی ئەعزەمەوە نـازڵ بـووە، کـە ئـەویش بەسـەر قەبارە و تەنە ئاسمانییەکاندا زاڵ و فەرمانڕەوایە.

بەڵێ، چاوە ئاسمانییەکان، دەریایان ئاوا لـێ دەردەکەوێت.

**پوختەی ئەم قسانە:**

گوزارشـت لـە زەریـای خۆرئـاوا بـە: "عـــین حمئـــة"، لــە ڕاسـتیدا سـەبارەت بـە زولقەرنەینە، کە ئەو دەریا مەزنەی لە دوورەوە وەك کانیاو بینیووە. بەڵام ڕوانینی قورئان کە لە هەموو شتێکەوە نزیکە، وەکو ڕوانینی دووراودووری زولقەرنەین بـۆی نـاڕوانێت کە ڕوانینێکە خەڵەتانی چاو(خداع البصر)ی تێکەڵ دەبێت. بەڵکو لەبەر ئەوەی قورئـان لە ئاسمانەوە نازڵ بووە و ئاگای لە ئاسمانەکانە و، لەبەر ئەوەش زەوی وەك مـەیدانێك یـان کۆشکێك یـان هـەندێ جار وەك بێشکە و لانکێـك یـان وەك لاپەڕەیـەك دەبینێـت، ئـەوا تەعبیرکردنی قورئان بە وشەی "عین" کە دەریای مەزنە و مەبەست پێی زەریای ئەتلەسیی خۆرئاوایە و بە تەمومژی هەڵم داپۆشراوە، لـە ڕاستیدا ئـەم "تـەعبیر"ە بـەرزی و مـەزنیی قورئان دەردەخات.

**پرسیاری دووهەمتان:**

بەربەستی زولقەرنەین دەکەوێتە کوێ؟.. یەئجووج و مەئجووج کێن؟

**وەڵام:**

زووتر نامیلکەیـەکم لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە نووسـی و مولحیدەکـانی ئـەو کاتـەم بـە بەڵگەکانی ئەو نامیلکەیە دەمکوت کرد. بەڵام ئێستا ئەو نامیلکەیەم لـە لا نییـە و، جگـە لەوەش یاد و بـیرم وەك جـاران یارمـەتیم نـادات و لـە کار کـەوتووە. وێـڕای ئـەوەش لقی

---

مەزنایەتیی خواوەندی لـە ئاسمـاندا بینی، هـەردوو چاوەکـە لەسـەر یـەکتر نووقـان و لەسـەر ڕووی زەویدا نێکران! جا ئایەتە پیرۆزەکە تەنها بە یـەك وشـە و بـە ئیعجـازێکی جـوان ئـەم واتـا ناسـکە دەگەیـەنێت و ئاماژە دەکات بۆ ئەو شتەی کە ئەرکی چاوەکان کۆتایی پێ دێنێت. (دانەر)

سێهەمی وتەی بیست و چوارەم لەم مەسەلەیە دواوە. بۆیە لێرەدا زۆر بە کورتی ئاماژە بۆ دوو سێ سەرنج سەبارەت بەم مەسەلەیە دەکەین:

لەسەر بناغەی ئەو ئەنجامەی کە زانایانی لێکۆڵەر روونیان کردووەتەوە و، بەپێی دەست پێ کردنی ناوی چەند پادشایەکی یەمەن بە وشەی "ذی" – وەکو: ذي يزن – و بە گوێرەی ئەوەش کە ناونیشانی "ذي القرنـين" ئاماژەی بۆ دەکات، ئەم زولقەرنەینە "ئەسکەندەری ڕۆمیی مەقەدۆنی" نییە، بەڵکو یەکێکە لە پادشاکانی یەمەن کە هاوچەرخی حەزرەتی ئیبراهیم بووە – دروودی لەسەر بێت – و دەرسی لە خزمەتی حەزرەتی خضردا خوێندووە. کەچی ئەسکەندەری ڕۆمی نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش زایین هاتووە و لە لای "ئەرستۆ" خوێندوویەتی.

ئەو مێژووەی کە ئادەمیزاد نووسیویەتی ڕووداوەکانی تا سێ هەزار ساڵ (پێش ئێستا) تۆمار دەکات. لەبەر ئەوە، ڕوانینی کەمو کورتی ئەم مێژووە هەرگیز ناتوانێت حوکمی ڕاست و دروست بەسەر ڕووداوەکانی پێش سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمدا – دروودی لەسەر بێت – دەربکات. خۆ ئەگەر باسیشی بکات ئەوا یان ئەفسانەی تێکەڵ دەکات، یان ئینکاریی دەکات، یان زۆر بە کورتی لێی دەدوێت.

هۆی ناوبانگ دەرکردنی ئەم زولقەرنەینە یەمەنییەش لەناو تەفسیرەکاندا بە: "ئەسکەندەر" دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە:

یەکێك لە ناوەکانی "زولقەرنەین" بریتییە لە: "ئەسکەندەر". کەواتە "ئەسکەندەری گەورە" یان "ئەسکەندەری کۆن" بریتییە لە زولقەرنەین..

یان کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ڕووداوێکی جوزئی دەدوێت لەبەر ئەوەیە کە: ئەو ڕووداوە جوزئییە چەمکێکی چەند ڕووداوێکی کوللییە..

جا بەم پێیە، هەروەك ئەسکەندەری گەورە کە زولقەرنەینە، بە ڕێنمایییە نەبەوییەکانی "سەدد"ی بەناوبانگی چینی لە نێوان نەتەوە زاڵم و مەزڵوومەکاندا دامەزراند، تاکو ستەم لێکراوان لە هێرش و تاڵان و بڕۆی ستەمکاران بپارێزێت..

بە هەمان جۆر، چەند سەرکردەیەکی گەورەی تریش وەك ئەسکەندەری ڕۆمی و چەند پادشایەکی بەهێز لە ڕووی ماددییەوە شوێن پێی زولقەرنەینیان هەڵگرت و.. هەندێکیش لە پێغەمبەران و ئەقتابی ئەولیا، کە پادشای مەعنەویی گرۆی مرۆڤن، لە ڕووی مەعنەوی و ئیرشادەوە بە شوێنپێی زولقەرنەیندا ڕۆشتن و هەنگاویان نا..

جا هەموو ئەوانە گەلێ "بەربەست"یان لە نێوان چیاکاندا[١] بنیات ناوە کە چەند هۆکارێکی گرنگن بۆ ڕزگارکردنی ستەم لێ کراوان لە شەڕ و زیانی ستەمکاران و، پاشان لەسەر لووتکەی چیاکانیشدا قەڵاکانیان دروست کرد. هەموو یەکێك لەوانە، چ بە هێز و توانای ماددی و زاتیی خۆیان و چ بە ڕێنمایی و تەگبیر و ڕا و سەرپەرشتی کردنیان، ئەو بەربەستانەیان بنیات ناوە، تەنانەت شوورایان بە دەوری شارەکاندا گێڕاوە و قەڵاشیان لە ناوەڕاستی شارەکاندا دروست کردووە. تا لە ئەنجامدا گەیشتنە ئەوەی هۆکارێکی تر بەکار بهێنن کە تۆپە قورسە دوور هاوێژەکان و ئەو زرێ پۆشانەیە کە وەك قەڵای گەڕۆك وان!

جا ئەو "سەدد"ەی کە زولقەرنەین دروستی کردووە و بەناوبانگترین بەربەستە لە جیهاندا و چەند ڕۆژە ڕێیەك درێژە، بۆ ئەوە بنیاتی نا تاکو ڕێ لە هێرش و پەلاماری چەند قەومێکی خراپکار بگرێت کە قورئانی پیرۆز ناوی "یەئجووج و مەئجووج"ی لێ ناون و لە مێژووشدا بە هۆزەکانی "مانجۆر و مەغۆل" ناویان هاتووە، لەوانەی کە چەندین جار شارستانێتیی مرۆڤیان ڕووخاندووە و لە پشتی چیاکانی هیمالایاوە سەریان هەڵداوە و خەڵکیان لەناو بردووە و خۆرهەڵات و خۆرئاوای وڵاتانیشیان وێران کردووە. جا ئەو "بەربەست"ەی کە لە نێوان دوو چیای نزیکی زنجیرە چیاکانی هیمالایا بنیات نرا، بوو بە بەربەست لە بەردەم ئەو نەتەوە نەفام و دوور لە شارستانییانە و ڕێگرێك لە بەردەم هێرش و پەلامارە زۆرەکانیان بۆ سەر ستەم لێ کراوانی چین و هیند.

ئنجا هەروەك زولقەرنەین ئەم بەربەستەی بنیات نا، گەلێ بەربەستی تریش بە هیممەت و تێکۆشانی پادشایانی کۆنی ئێران لە چیاکانی قەفقاس و ناوچەی دەربەندا بنیات نراون، تاکو ببن بە بەربەستی ئەو تاڵان و بڕۆ و هێرش و پەلامارانەی کە چەند قەومێکی تەتارەکان دەیانکرد.

جگە لەمانەش گەلێ بەربەستی تری وەك ئەمانە هەن.

جا قورئانی پیرۆز لەبەر ئەوەی ڕووی گوفتاری ئاراستەی هەموو گرۆی مرۆڤ دەکات، ئەوا بە ڕواڵەت یەك ڕووداوی جوزئی باس دەکات، کەچی بەم ڕووداوە

---

(١) چەندین بەربەست(سەدد)ی دەستکرد لە ڕووی زەویدا هەن کە بە درێژایی ڕۆژگار شێوەی چیایان گرتووەتە خۆ، بە ڕادەیەك کە ئێستا نازانرێت ئەوانە لە بنەڕەتدا "سەد" بوون. (دانەر)

جوزئی‌یە چەندەها ڕووداوی وەك ئەوە دەخاتەوە یاد. هەر لەم گۆشەی ڕوانینەوەیە کە سەبارەت بەو "سەدد"ە و "یەئجووج و مەئجووج"ەوە ئیختیلاف لە ڕیوایەتەکان و قسەی تەفسیرنووساندا دروست بووە.

پاشان قورئانی حەکیم هەندێ جار لە ڕووداوێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ باسی ڕووداوێکی دوور لەوەی پێشوو، لەبەر "موناسەبەت و پەیوەندی‌یەکانی گوفتار" لە نێوان هەردووکیاندا. جا ئەو کەسەی کە شارەزای ئەو پەیوەندی‌یانە نی‌یە، لای وایە کاتەکانی هەردوو ڕووداوەکە لەیەکەوە نزیکن! جا لەسەر ئەم بناغەیە، هەواڵدانی قورئان لە بەرپابوونی قیامەت دوابەدوای هەواڵی ڕووخانی ئەو سەددە، لەبەر نزیکیی کاتی ئەو دوو ڕووداوە نی‌یە، بەڵکو لەبەر دوو سەرنجە کە لە ڕووی "موناسەبەتی کەلامی"یەوە ڕەچاو کراون. واتە: هەروەك ئەم سەددە دەڕووخێت، دنیاش بە هەمان جۆر دەڕووخێت و وێران دەبێت!

پاشان هەروەك چیاکان، کە چەند سەدد و بەربەستێکی سروشتیی خوایی و مەحکەم و ڕەگداکوتاون و، مەگەر بە بەرپابوونی قیامەت دەنا دانارمێن، ئەم سەددەش بە هەمان جۆرە وەك چیاکان مەحکەمە و، بە بەرپابوونی قیامەت نەبێ ناڕووخێت، تەنانەت ئەگەر بە درێژایی ڕۆژگار هۆکارەکانی گۆڕانکاری و ڕووخاندنیش کاری تێدا بکەن هێشتا هەر بەشێکی زۆری دەمێنێتەوە و تا قیامەت بەردەوام دەبێت.

بەڵێ، بەربەستی چین کە تاك(فرد)ێکە لە هەمەکێتیی بەربەستی زولقەرنەین، تا ئێستاش و وێڕای تێپەڕبوونی هەزاران ساڵ، هەر ماوەتەوە و لە پێش چاودایە و، بە وێنەی دێڕێکی درێژ و زەق و بەرجەستە و پڕواتای مێژووی کۆن دەخوێنرێتەوە کە بە دەستی مرۆڤ لەسەر لاپەڕەی زەوی‌دا نووسراوە.

**پرسیاری سێ‌هەمتان:**

کە لە بارەی کوشتنی دەجالەوەیە لە لایەن حەزرەتی عیساوە، درووودی لەسەر بێت.

لە مەکتووبی یەکەم و پازدەهەمدا، وەڵامێکی یەکجار کورت بۆ ئەم پرسیارەتان دراوەتەوە.

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ هەردوو برای بەوەفا و ڕاست و فیداکار و ئازیزم: مەلا صەبری و حافظ عەلی!

پرسیارە گرنگەکەتان سەبارەت بە پێنج شتە غەیبی‌یەکانی کۆتایی سوورەتی لوقمانەوە، پێویستی بە وەڵامێکی یەکجار گرنگ هەیە. بەڵام من بە داخەوە ئێستا گیرۆدەی حاڵەتێکی ڕۆحیم و، بە دەست چەند حاڵەتێکی ماددیشەوە گرفتارم کە بواری وەڵامی تێروتەسەلی ئەم پرسیارەتانم نادەن. لەگەڵ ئەوەشدا وا زۆر بە کورتی تەنها ئاماژە بۆ چەند خاڵێك دەکەم کە پەیوەندی‌یان بە پرسیارەکەتانەوە هەیە:

**ناوەرۆکی پرسیارەکەتان بریتی‌یە لەوەی کە:**

مولحیدان ڕەخنە دەگرن لەوەی "کاتی نازڵ بوونی باران" و "جۆری کۆرپەلە لە ڕەحمی دایك"دا لە پێنج شتە غەیبی‌یەکان بن، چونکە دەڵێن: وەختی نازڵ بوونی باران بە ڕوانینگە ئاسمانی‌یەکان دەزانرێت، کەواتە جگە لە خوا کەسانی تریش ئەوە دەزانن. سەبارەت بە ڕەگەزی کۆرپەلەش لە ڕەحمی دایکی‌دا، دەکرێ لە ڕێی تیشکی سینی‌یەوە بزانرێت کە ئایا نێرە یان مێ‌یە. بەو واتایەی کە دەگونجێ پێنج شتە غەیبی‌یەکان بزانرێن!

**وەڵام:**

لەبەر ئەوەی کاتی باران بارین بە یاسا و دەستوورێکی بەردەوامەوە نەبەستراوە، ئەوا ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە "ویست"ی تایبەتی خواوەندەوە هەیە و شوێن "ئیرادە"ی تایبەتی خواوەند دەکەوێت. بۆیە بە بێ هیچ هۆکارێك لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە دەبارێت.

نهێنیی باران بارین ئەمەی خوارەوەیە:

گرنگترین ڕاستی لە گەردووندا و بەنرخترین ماهییەت تیای‌دا بریتی‌یە لە: (وجوود و، ژیان و، نوور و، میهرەبانی) کە هەریەك لەم چوارە ڕاستەوخۆ و بە بێ هیچ چەشنە پەردە و هۆکارێك ڕوویان لە توانست و ویستی تایبەتیی خوای گەورە خۆیەتی. کەچی لە بەدیهاتووەکانی تری خوای گەورەدا، هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان دەبن بە پەردە لە بەردەم دەست تێوەردانی توانستی خواوەندداو، یاسا بەردەوام و دەستوورە

چەسپاوەکان – تا ڕادەیەك – ویستی خواوەند دادەپۆشن. بەڵام لە بەردەم "ژیان و نوور و میهرەبانی"دا هەرگیز ئەو چەشنە پەردانە دانەنراون، چونکە هیچ داناییەك لەوەدا نییە کە ئەو چەشنە پەردانە لە بەردەم ئەماندا بین.

جا مادەم "میهرەبانی و ژیان" گرنگترین دوو ڕاستیی ناو ئەم بوونەوەرەن و، "باران"یش هۆی سەرهەڵدانی ژیان و خولگەی میهرەبانییە، تەنانەت خودی میهرەبانیشە، ئەوا دەبێ هۆکارە ناوەندەکان نەبن بە پەردە لە بەردەمیدا و "دەستوورێکی بەردەوام" بۆ بارینی نەبێت تاکو ویستی تایبەتیی خواوەند دانەپۆشێت و، هەموو کەسێك لە هەموو کاتێك و لە گشت کارێکیدا ناچاری "شوکرانە بژێری" و دەرخستنی "بەندایەتی" و "پاڕانەوە و لاڵانەوە" بێت لە دەرگانەی خواوەنددا. چونکە ئەگەر ئەو کارانە بەپێی دەستوورێکی دیاریکراو بوونایە، ئەو دەرگایە لە مرۆڤ دادەخرا کە ئومێدەواری میهرەبانیی خواوەند بێت و، ئیتر پشت بەو "دەستوورە بەردەوامە" دەبەسترا.

بۆ نموونە:

"هەڵهاتنی خۆر" هەرچەندەش گەلێ سوودی زانراوی تێدایە، کەچی لەبەر ئەوەی پابەندی "دەستوور"ێکی دیاری کراوە، نابینیت هیچ کەسێك بۆ هەڵهاتنی ئەو خۆرە لە خوا بپاڕێتەوە یان شوکرانەی تایبەتیی لەسەر پێشکەش بکات و بە شتێکی غەیبیش دانانرێت، چونکە خەڵکی بەپێی ئەو زانستەی بەدەستیان هێناوە و لە ڕێی ئەو دەستوورە بەردەوامەوە، کاتی هەڵهاتنی خۆری بەیانی دەزانن!

بەڵام باران بارین وا نییە؛ چونکە جوزئییاتی باران بارین بە دەستوورێکی دیاری کراوەوە پەیوەست نییە، بۆیە خەڵکی لە هەموو کاتێکدا ناچارن بە پاڕانەوە و لاڵانەوە لە دەرگانەی میهرەبانی خواوەند بدەن.

جا لەبەر ئەوەی زانستی مرۆڤ ناتوانێت کاتی باران بارین دەستنیشان بکات، ئەوا خەڵکی وەك نیعمەتێکی تایبەتیی دەرچووی گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند بۆیان ڕوانیوە، بۆیە شوکرانەبژێریی ڕاستەقینە لەسەر باران پێشکەش دەکەن.

بەم جۆرە، ئەم ئایەتە پیرۆزە کاتی بارانی لە نێوان پێنج شتە غەیبییەکاندا داناوە.

بەڵام هەست کردن بە سەرەتاکانی کاتی هاتنی باران لە ڕێی ئامێرەکانی ڕوانینگاوە، پاشان دەستنیشان کردنی کاتی باران، هەرگیز بە: "زانینی غەیب"دانانرێت، بەڵکو ئاگاداربوونەوەیە لە هەندێ پێشەکیی بارینی باران کاتێ کە لە جیهانی غەیب

دەردەچێت و لە جیهانی بینراو نزیك دەبێتەوە! هەروەك بە چەشنە هەستێکی پێش ڕوودان(إحساس مسبق) پەنهانترین شتی غەیبی دەزانرێت کاتێ ئەو شتە دێتەدی یان دوای نزیکبوونی لەوەی بێتەدی. خۆ ئەم زانینەش بە "غەیبزانی" دانانرێت، بەڵکو زانینی شتێکی "مەوجوود"ە، یان زانینی شتێکە کە لە وجوودەوە نزیك بووەتەوە.

تەنانەت من خۆم هەندێ جار لە ڕێی هەستێکی ناسکەوە کە لە دەمارەکانمدایە، بیست و چوار سەعات پێش باران بارین هەست بە هاتنی باران دەکەم! بەو واتایەی کە باران چەند پێشەکی و سەرەتایەکی هەیە ئەم پێشەکییانەش لە شێوەی شتێدا خۆیان دەردەخەن کە دەبێت بەهۆی هەست کردن بەو بارانەی لە دوایەوە دێت. جا ئەم حاڵەتە هۆکارێکە بۆ ئەوەی زانستی مرۆڤ بگاتە شتێکی وەك "قاعیدەی بەردەوام" بۆ شتانێك کە لە غەیبەوە دەرچوون و هێشتا نەشهاتوونەتە ناو جیهانی بینراو.

بەڵام زانینی کاتی ئەو بارانەی کە هێشتا هەنگاوی نەناوەتە ناو ئەم جیهانە بینراوە و، لەو میهرەبانییەی خواوەندەوە دەرنەچووە کە تایبەتە بە ویستی خۆیەوە، ئەم زانینە، تەنها تایبەتە بە زانستی خواوەندی "زانای پەنهانەکان"ەوە!

ماوەتەوە مەسەلەی دووهەم کە بریتییە لە:

زانینی ڕەگەزی کۆرپەلە لە ڕەحمی دایکیدا بەهۆی تیشکی سینییەوە. ئەم زانینە هەرگیزاو هەرگیز دژ و پێچەوانەی واتای ئەو زانینە غەیبییە نییە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیگەیەنێت: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ﴾ (لقمان:٣٤).

چونکە مەبەست لەو زانینە ناوبراوەی ئایەتەکە تەنها زانینی نێرینە و مێینەی کۆرپەلەکە نییە، بەڵکو مەبەست زانینی توانا و لێهاتنە ناوازە و تایبەتەکانی ئەو منداڵەیە کە سەرەتای موقەددەراتی ژیانی ئەون و خولگەی ئەو بارودۆخانەن کە لە دواڕۆژدا بەدەستیان دەهێنێت. تەنانەت زانینی مۆر و تەمغەی ڕەنگینی صەمەدییەت بە سەروسیمای ئەو منداڵەوە لەو واتایەدا مەبەستە، بە چەشنێك کە زانینی ئەم جۆرە شتانەی منداڵەکە و لەم ڕووانەوە کە باس کران، تەنها تایبەتە بە زانستی خواوەندی "زانای پەنهانەکان"ەوە.

خۆ ئەگەر سەدان هەزار بیری تیژی مرۆڤ وەکو "تیشکی سینی" یەك بگرن، هێشتا ناتوانن تەنها سەروسیمای ڕاستەقینەی دەموچاوی ئەو منداڵە دەربخەن کە هێندە نیشانەی

تێدایە لە هەموو یەکێکی سەرجەمی گرۆی مرۆڤی جیا دەکەنەوە، چ جای ئەوەی بتوانن سەروسیمای مەعنەویی توانا و لێهاتنەکانی دەربخەن کە سەدان هەزار جار زیاتر لە ڕوخساری دەموچاو کاری دەراسایان تێدایە!

لە پێشەکیدا وتمان:

"وجوود و ژیان و میهرەبانی" لە گرنگترین ڕاستییەکانی گەردوونن و، بەرزترین پلەوپایەیان لە گەردووندا هەیە. بۆیە ڕاستیی ژیانی ئەو منالە، بە هەموو وردەکاری و نەرمونیانییەکەوە، ڕاستەوخۆ ڕووی لە میهرەبانی و ویستی تایبەتی خواوەند خۆیەتی.

یەکێك لەو نهێنییانە بریتییە لەوەی کە: "ژیان" بە هەموو ئامێر و کۆئەندامەکانیەوە هۆی سەرهەلدانی "شوکرانەبژێری" و خولگەی "بەندایەتی" و "خواپەرستی" و "تەسبیحات کردن"ە بۆ خوای گەورە. بۆیە "قاعیدەی بەردەوام"ی بۆ دانەنراوە کە دەبێت بەهۆی ئەوەی بینینی ویستی تایبەتی خواوەند داپۆشێت و، هۆکارە ڕوالەتییەکانیشی وەك پەردە لە بەردەمدا دانەدراونەتەوە تاکو میهرەبانییە تایبەتییەکەی خواوەند دانەپۆشن و نەیشارنەوە.

خوای گەورە دوو دەرکەوتن و درەوشانەوەی لە سەروسیمای ماددی و مەعنەویی کۆرپەلەدا هەیە:

*یەکەمیان:*

دەبێت بە بەڵگە لەسەر تاك و تەنیایی و صەمەدییەتی خوای گەورە. چونکە ئەو کۆرپەلەیە لە ڕێی لەیەکچوونی ئەندامە سەرەکییەکان و کۆئەندامە ئادەمییەکانی لەگەڵ هی گشت مرۆڤەکانی تردا، شایەتی لەسەر: "یەکتایی" بەدیهێنەری خۆی دەدات. چونکە ئەو کۆرپەلەیە بەم زمانە و بە ڕاشکاوی دەنگی لێ هەڵدەبڕێت و دەڵێ: (ئەو کەسەی کە ئەم سیما و ڕوخسارەی بەم ئەندامانەم بەخشیوە هەر ئەوە کە بە هەموو مرۆڤێکی تری بەخشیوە کە لە ئەندامە سەرەکییەکاندا لە من دەچن و هەر ئەوە بەدیهێنەری هەموو زیندەوەرانە).

جا ئەم زمانەی کۆرپەلە، کە دەیکات بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەری شکۆمەند، زمانێکی غەیبی نییە. چونکە لەبەر ئەوەی شوێن "دەستوورێکی بەردەوام" دەکەوێت و بەپێی ڕێسایەکی دیاری کراو هەنگاو دەنێت و پشت بە جۆری کۆرپەلەکە دەبەستێت،

دەتوانرێت بزانرێت و پەیی پێ ببرێت. ئەم زانینەش زمانێکی گۆیا و پەلێکی شۆڕەوەبووی جیهانی غەیبە بەسەر جیهانی بینراودا.

*ڕووی دووهەم:*

ئەوەیە کە کۆرپەلە بە زمانی سیما و ڕوخساری توانا و لێهاتنە تایبەتی‌یەکانی خۆی و ڕوخساری دەموچاوی "کەسی"ی خۆی، دەبێت بە بەڵگە لەسەر: ئیختیار و ویستی ڕەها و تایبەتی و، میهرەبانیی تایبەتیی بەدیهێنەرەکەی.

ئەم زمانە، زمانێکی غەیبی‌یە و لە جیهانی غەیبەوە هاتووە. کەواتە جگە لە زانستی ئەزەلیی خواوەند کەس ناتوانێت ببینێت و زانیاریی لە بارەوە هەبێت پێش ئەوەی بێتە وجوود و، بە هەزار و یەك ئامێری سەیر کردنی کۆرپەلە لە ڕەحمی‌دایکدا، ئەم مرۆڤە نازانرێت و ناناسرێت.

**بە پوختی:**

سیمای توانا و لێهاتنەکانی کۆرپەلە و ڕوخساری دەموچاوی، بەڵگەی: "یەکتایی" و "ئیختیار" و "ویست"ی ئیلاهی‌یە.

خۆ ئەگەر خوای گەورە ئاسانی بکات چەند سەرنجێك سەبارەت پێنج شتە غەیبی‌یەکانەوە دەنووسرێت، چونکە نە کاتی ئێستا و نە بارودۆخ و حاڵەتی خۆم بواری لەمە زیاترم نادەن، بۆیە وا کۆتایی بە قسەکانم دەهێنم.

**الباقي هو الباقي**

**سەعیدی نوورسی**

* * *

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

برای ئازیز و ڕاست و تاسەمەند: ڕەئفەت بەگ!

لە نامەکەتدا لە بارەی "دە دانە لەتیفە"کەوە پرسیارت کردووە. جا لەبەر ئەوەی من خەریکی وتنەوەی وانەی تەریقەتی سۆفی نیم و، لە لایەکی تریشەوە زانایانی تەریقەتی نەقشبەندی چەندین کتێبیان سەبارەت بە "لەتائیفی عەشر" داناوە و، ئەرکی ئەستۆی

ئێمەش لەم کاتەی ئێستادا تەنها دەرهێنانی نهێنییەکانی قورئانە نەك هێنـانی ئـەو بابـەت و مەسەلانەی کە لە ناو کتێبەکاندا باس کراون، ئەوا لەوە بێزار مەبە کـە نـاتوانم بـە درێـژی وەڵامـت بدەمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

ئیمامی ڕەببانی – خوای لـێ ڕازی بێت – ئەو لەتائیفی عەشرەی بـە: "دڵ و، ڕۆح و، سیڕڕ و، خەفی و، ئەخفا" دەربڕیوە و، فەرموویەتی: هەریەك لە چوار توخمـەکانی مـرۆڤ "لەتیفە"یەکی ئینسانیی هەیە کە لە گەڵیدا بگونجێت. هـەروەها بـە پوختـی سـەبارەت بـە سەرکەوتنی هەموو یەکێك لەو لەتائیفانە و بارودۆخیان لە یەك بە یەکی پلەکانی سـەیر و سلووکدا، دواوە.

سەبارەت بە خۆیشم، پێـم وایـە کـە گەلـێ لـەتائیفی زۆر هـەن لـە ماهییـەتی جـامیعی مـرۆڤ و توانـا و لێـهاتنیدا بـۆ ژیـان، بـەڵام تەنـها دە دانــەیان ناوبانگیـان دەرکـردووە. تەنانەت دانایان و زانایانی ظاهـیریش ئـەو دە لەتائیفـەیان لـە شێوەیەکی تـردا کـردووە بـە بناغەی دانستەکەیان، ئەوەتا وتوویانـە: ئـەو پێنـج هەسـتە ئاشـکرایەی مـرۆڤ پەنجـەرە و نموونەن بۆ پێنج هەستی تری نـاوەکی و پەنـهان. تەنانـەت ئـەو (دە) لەتائیفـەی کـە لـە نـاو عـەوام و خـەواصی خـەڵکیدا ناوبـانگی هەیـە لەگـەڵ ئـەو لـەتائیفی عەشـرەی تەریقەتـە سۆفییەکاندا یەك دەگرنەوە.

بۆ نموونــە: ئەگــەر لەتائیفــەکانی: (ویـژدان، ئــەعصاب، ژیـری، ئـارەزوو، هـێزی شەهوانی، هێزی تووڕەیـی) لەگـەڵ: (دڵ و، ڕۆح و، سـیڕڕ)دا یـەك بخرێـن ئـەوا لـەتائیفی عەشر لە شێوەیەکی تردا دەردەکەون.

جگە لەمانەش، گەلـێ لەتائیفی تر هەن وەك سـائیقە (پاڵنـەر) و شـائیقە (شـەوقدەر) و هەستی پێش ڕوودان (الحس قبل الوقوع). خۆ ئەگەر ڕاستیی ئەم مەسـەلەیە بنووسـرێت، گەلـێ درێژە دەکێشێت. بۆیە ناچارم لەبەر کەم وەختی، ئەو درێژە پێدانە بووەستێنم.

سـەبارەت بـە پرسـیاری دووهەمیشـتەوە کـە لـەبارەی واتــای ئیسـمی و واتــای حەرفییەوەیە، ئەوا دەڵێم:

هەروەك سەرەتای کتێبـەکانی "نـەحو" بـە گشتی ئاماژەیـان بـۆ کـردووە، کتێبـەکانی زانستی حەقیقەتیش وەك: "وتەکان" و "مەکتووبات" بە تێر و تەسەلی و نموونەوە ڕوونیـان کردووەتـەوە. خـۆ زیـادە ڕوونکردنـەوەش بـۆ کەسێکی وەك تـۆ کـە خـاوەنی زیرەکـی و تێبینیی وردە، بە ئیسراف دادەنرێت!

ئەگەر سەیری ئاوێنەت کرد، یەکەم جار ماددە شووشەکەی دەبینیت، پاشان وێنەکەی ناوی لە پلەی دووهەمدا دێت، بەڵام ئەگەر مەبەست لە سەیرکردنی ئاوێنەکە: بینینی وێنەکەی ناوی بێت، ئەوا یەکسەر ئەو وێنەیەت بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێت هەتا وات لێ دەکات بڵێیت: "فتبارك الله أحسن الخالقين"! ئیتر بینینی شووشەی ئاوێنەکە دەکەوێتە پلەی دووهەم.

سەیرکردنی یەکەم بە واتای "ئیسمی"یە. واتە شووشەی ئاوێنەکە مەبەستە و، وێنەی ئەو کەسەش کە تیایدا دەردەکەوێت واتایەکی "حەرفی"یە و مەبەست نییە.

بەڵام سەیرکردنی دووهەم ڕاستەوخۆ بینینی کەسەکەی مەبەستە، کەواتە بینینی ئەو "واتای ئیسمی"یە و، هی شووشەکەیش "واتای حەرفی"یە.

بەم پێیە، لە کتێبەکانی "نەحو"دا پێناسەی "ئیسم" بەوە کراوە کە: (واتای سەربەخۆ بۆ خۆی بە دەستەوە دەدات) و، هی "حەرف"یش بەوە کراوە کە: (واتای غەیری خۆی دەگەیەنێت).

سەیرکردنی قورئان بۆ بوونەوەران وایە، کە هەموویان بە "حەرف" تەماشا دەکات کە واتای غەیری خۆیان دەگەیەنن. بەو واتایەی کە: درەوشانەوەی ناوە جوانەکان و سیفەتە مەزنەکانی بەدیهێنەری مەزن بەسەر بوونەوەرانەوە دەردەبڕن.

بەڵام زۆربەی ڕوانینەکانی فەلسەفەی مردووی ماددی بۆ بوونەوەران، سەیرکردنی "ئیسمی"یە". ئیتر بەم بۆچوونە، پێی فەلسەفەی ماددی بۆ ناو زۆنگاوی سروشت دەخلیسکێت.

بە هەر حاڵ، کاتێکی ئەوتۆم بەدەستەوە نییە کە زۆر بدوێم، تەنانەت ناتوانم بەشی گرنگ و دواهەمینی پێڕستەکە بنووسم کە کارێکی سووك و ئاسانە.

سڵاوم بە هاوەڵانت لە دەرسدا بگەیەنە، بە تایبەت: خەسرەو، بەکر، ڕوشدی، لوتفی، مەلا مستەفا، حافظ ئەحمەد، سزائی، محەممەدەکان، زاناکان. بیشزانە کە من تەنانەت دوعا بۆ مناڵە خاوێن و پیرۆزەکانیماڵە پیرۆزەکەشتان دەکەم!

الباقي هو الباقي

براتان

**سەعیدی نوورسی**

# بریسکەی حەڤدەهەم

## حەڤدە یادخەرەوەن لە (زوهرە)وە سەرچاوەیان گرتووە

بسم الله الرحمن الرحیم

## پێشەکی

دوازدە ساڵ پێش ئێستا[1] چاودێریی خواوەندی پەروەردگار ئاوڕی میهرەبانیی لێ دامەوە و، لە کاتی تێڕامانێکی "فیکری" و گەشت و گەڕانێکی "دڵی" و ڕوونبوونێکی "گیانی" و، لە دەمی بڕینی پلە و قۆناغەکانی ناسینی خوای گەورەدا، ئەو مەسەلانەی لەمەڕ "یەکتایی خوای گەورە" لە ڕووم درەوشانەوە، لە شێوەی چەند یادخەرەوەیەك و لە پەیامەکانی: "زوهرە" و "شوعلە" و "حەببە" و " شەممە" و "ذەڕڕە" و "قەطرە" و هاوچەشنیاندا، بە زمانی عەرەبی تۆمارم کردن.

جا لەبەر ئەوەی ئەو یادخەرەوانە لە پێناوی پیشاندانی "سەرەتای" ڕاستی‌یەکی مەزن و فراوان و، بۆ مەبەستی دەرخستنی "یەکێك" لە تیشکەکانی نوورێکی ڕووناك و درەخشان، نووسران.. ئەوا شێوە و ڕوخساری چەند تێبینی و ئاگاداری‌یەکیان لەخۆ گرت. ئنجا تەنها بۆ خۆیشم نووسیبوومن، کە ئەمەش بوو بە مایەی ئەوەی سوودی کەمیان لێ وەربگیرێت، بە تایبەتی بەشی هەرە زۆری برا دڵسۆز و بێ گەردەکانم زمانی عەرەبی‌یان نەخوێندووە. هێندەش ئەو برایانە داوای ڕوونکردنەوەی ئەو یادخەرەوانەیان لێ دووپات کردمەوە هەتا ناچار بووم چەند ڕوونکردنەوەیەك لەسەر هەندێکیان بە زمانی تورکی بنووسم و ئەوانی تریشیان دەقاودەق و بێ دەستکاری وەربگێڕم. لەبەر

---

(١) واتە ساڵی ١٣٤٠ك (١٩٢١ز).

ئەوەش دەستکاریم نەکردن چونکە "سەعیدی نوێ" کاتێ لە سەرچاوەی "زانستی حەقیقەت" دەستی بە هەڵگۆزینی "ڕاستی" کرد، ئەو بێداری و تێبینییانەی لە پلەیەکی وەك پلەی "شهود"دا بینی.. لەبەر ئەوە، هەندێ لەو ڕستانەی کە لە چەند پەیامێکی تردا هەن، لێرەشدا باس کراونەتەوە. هەندێکی تریشیان زۆر بە کورتی هێنراون و بە باشی ڕوون نەکراونەتەوە، نەبادا چێژە ناسکەکانی ئەو ڕستە و دەستەواژانە لە کاتی ڕوونکردنەوەدا لە دەست بچن و وەك خۆیان نەمێنن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## یادخەرەوەی یەکەم

کاتێ خۆی بەم جۆرە لەگەڵ خۆمدا دوابووم:

ئەی سەعیدی بێئاگا!

بزانە! کارێکی گەلێ نەشیاو دەکەیت گەر دڵت بە شتێکەوە ببەستیت کە دوای لەناوچوونی ئەم دنیایە لەگەڵ تۆدا نامێنێتەوە، تەنانەت بە کاولبوونی دنیا ئەویش لێت جیا ببێتەوە. چونکە مرۆڤ کارێکی ژیرانە ناکات گەر دڵی پابەندی شتی لەناوچوو بکات!

چ جای ئەو شتەی کە بە تەواوبوونی ئەو سەردەمەی تیایدا دەژیت، وازت لێ دەهێنێت و پشتت تێ دەکات!

بەڵکو چ جای ئەو شتەی کە لە گەشتی بەرزەخدا هاوڕێت نابێت!

بەڵکو چ جای ئەو شتەی کە هەتا دەرگای گۆڕەکەت لەگەڵتدا دێت!

بەڵکو چ جای شتێ کە دوای ساڵێك یان دوو ساڵ، بە تەواوی و هەمیشەیی بەجێت دەهێڵێت و، تاوانەکەشی دەخاتە ئەستۆی تۆوە!

بەڵکو چ جای شتێ کە هەر لەو دەمەدا دڵت پێی خۆشە، ئەو بەجێت دەهێڵێت و دەستبەردارت دەبێت!

ئەگەر خۆت بە ژیر و وریا دەزانیت، گوێ بەمانە مەدە و خەمیان پێ مەخۆ. واز لە هەموو ئەو شتانە بهێنە کە ناتوانن لە گەشتی هەمیشەییدا هاوڕێت بن، ئەوانەی کە لە

ژێر پاڵەپەستۆی ئاڵوگۆڕەکانی دنیا و ڕووداوەکانی بەرزەخ و تەقینەوەکانی قیامەتدا، تیادەچن و نامێنن.

ئایا نابینیت لایەنێکی ناسك و نیانت هەیە کە بە: "هەمیشە" و "شتی هەمیشەیی" نەبێت هەرگیز بە شتی تر ڕازی نابێت و جگە لەوە بۆ هیچی تر ناڕوانێت و ملی بۆ کەچ ناکات؟ بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەموو دنیای پێ بدرێت، هێشتا هەر ئەو پێویستی‌یە سروشتی‌یەت تێر و دڵنیا نابێت؟ ئەم لایەنەی کە ئاوا داخوازی "هەمیشە" و هۆگری "هەمیشەیی"یە بریتی‌یە لە دەستەڵاتی هەست و لایەنە ناسکەکانت. دەسا تۆش گوێڕایەڵی فەرمان و داخوازی‌یەکانی ئەو لایەنە ناسکانەت بە، ئەوانەی کە بۆ خۆیان گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی بەدیهێنەری دانایانن. بەڵێ، گوێڕایەڵیی ئەو لایەنانەت بکە و، لەم ڕێیەوە خۆت لە هەموو پەژارەیەك ڕزگار بکە.

## یادخەرەوەی دووهەم

لە خەونێکی ڕاستی ئاوێتەی حەقیقەتدا بە خەڵکیم دەوت:

مرۆڤینە! یەکێك لە دەستووره پیرۆز و فەرمانە دامەزراوەکانی قورئان ئەوەیە کە: جگە لە خوا کەس لە خۆت بە مەزنتر مەزانە نەوەك بیگەیەنیتە پلەی "پەرستن".. خۆیشت لە هیچ شتێك بە گەورەتر دامەنێ با دەرگای خۆ بە گەورە زانین(التكبر)ت لێ نەکاتەوە. چونکە هەروەك هەموو بەدیهێنراوان لەوەدا یەکسانن کە هیچیان "پەرستراو" نین، بە هەمان جۆر لەوەشدا یەکسانن کە هەموویان بەدیهاتوو و دروستکراون!

## یادخەرەوەی سێهەم

ئەی سەعیدی بێ ئاگا!

ئەو دنیایەی کە زۆر بە پەلە دێت و دەڕوات و لەناودەچێت، کاتێ بۆی دەڕوانیت، بە ڕواڵەت وەك دنیایەك دێتە بەرچاوت کە هەرگیز تامی مردن نەچێژێت و هەتاهەتایە بۆ خۆی هەمیشەیی بێت. ئەوەتا هەر کاتێ سەیری "ئاسۆکانی" دەوروبەری خۆت دەکەیت، بە شێوەیەکی گشتی و تا ڕادەیەك، لە بەرچاودا نەگۆڕ و دامەزراو دەردەکەون. ئنجا کە ڕووی خۆت لەو ئاسۆیانە وەردەچەرخێنیت و ئاوڕ لە ناوەوەی

خۆت دەدەیتەوە و هەر بەم چاوەش بۆ "دەروون"ی لەناوچووی خۆیشت دەڕوانیت، پێت وا دەبێت کە ئەویش – بە هەمان جۆر – نەجووڵ و نەگۆڕ و دامەزراوە! لەمەوە وات لێ دێت کە وا بزانیت جگە لە سامی بەرپابوونی قیامەت هیچ شتێك ئەم بۆچوونە مەنگەت لێ ناشلەقێنێت، وەك بڵێی تا بەرپابوونی قیامەت بمێنیت!

نەخێر، بۆ خۆت وریا و ژیر بە و، هەرگیز لەو گومانەدا مەبە! چونکە خۆت و دنیا تایبەتی‌یەکەشت هەموو چرکەیەك لەسەر ڕێی گەشتی نەماندا بە خێرایی هەنگاو دەنێن!

تۆ لەم هەستە هەڵەیەتدا وەك ئەو کەسە وایت کە ئاوێنەیەکی بە دەستەوە بێت و، ڕووەو کۆشکێك، یان شارێك، یان باخچەیەك ئاوێنەکەی ڕاگرتبێت و، بەم پێیە وێنەی ئەو کۆشکە یان ئەو شارە یاخود باخچەکە لە ئاوێنەکەی ئەودا دەرکەوتبێت..

جا ئەگەر بە ئاستەم ئاوێنەکەی دەستی بجووڵێنرێت یان بچووکترین گۆڕانکاریی تێدا بکرێت، ئەوا – وەك ئاشکرایە – وێنەکانی ناوی دەلەرێنەوە و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. ئەو کاتەش مانەوە و نەبزوان و بەردەوامیی "خودی" کۆشك و شار و باخچەکە دادی تۆ نادات، چونکە تۆ تەنها ئەوەندەت لەو شار و کۆشك و باخچەیەدا هەیە کە ئاوێنەکەت – بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی – پیشانتی دەدات!

کەواتە باش بزانە: "ژیان" و "تەمەن"ت ئاوێنەن! ئەم ژیانە: پایە و، پشت و پەنا و، مەڵبەند و، ئاوێنەی دنیای تۆیە! لەبەر ئەوە، تەنها لە دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆت و شتانی ناوی بیر بکەرەوە و، بە وردی و خەستی سەرنج لەوە بدە کە هەموو خولەکێك دەگونجێ دنیاکەت بڕووخێت. واتە: "ژیان"ت لە دۆخێکی وەهادایە کە هەموو خولەك و ساتێك لەوەدایە قیامەتی بەرپا ببێت!

مادەم "ڕاستی" وایە، ئەوا تۆیش ژیر بە و، کۆڵێك مەخەرە ئەستۆی ژیان و دنیاکەی خۆتەوە کە پێیان هەڵنەگیرێت!

## یادخەرەوەی چوارەم

بزانە!

یەکێك لە ڕەویە و یاسا و کارە بەردەوامەکانی بەدیهێنەری دانا ئەوەیە کە:

زۆربەی جار "خودی" شتە بەنرخ و بایەخدارەکان – نەك هاووێنەیان – سەرلەنوێ بەدیدەهێنێتەوە. دەبینیت لە کاتی ئاڵوگۆڕی وەرز و چەرخەکاندا شتان بە "هاوچەشنی

خۆیان" دروست دەکاتەوە. بەڵام ئەو شتانەی کە دارای گرنگی و نرخ و بەهای تایبەتین، خودی خۆیان بەدیدەهێنێتەوە، نەك هاوچەشنیان! گەر حەز دەکەیت لەم دەرەنجامە دڵنیا ببیت، ئەوا فەرموو سەیری حەشری ڕۆژانە و ساڵانە و چەرخانە بکە، دەبینیت ئەم دەستوورە لە هەموو شتێکدا جێبەجێیە و بە ڕوونی دیار و بەردەوامە.

جا ئێمەش لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە دامەزراوە، دەڵێین:

هەموو زانستەکان لەوەدا یەکدەنگن کە: مرۆڤ پێگەیشتووترین بەروبوومی درەختی بوونەوەران و، گرنگترین و بەنرخترین بەدیهێنراوە و، هەموو "یەکێك"ی لە حوکمی "جۆر"ی زیندەوەرانی تردایە..

لەبەر ئەوە، بە هەستێکی بێ گومان دەتوانرێت بوترێ کە:

(لە حەشر و زیندووبوونەوەی قیامەتدا، خودی هەموو یەکێکی مرۆڤ، بە خۆی و لەشولار و ناو و شێوەیەوە، زیندوو دەکرێتەوە و سەرلەنوێ وەك یەکەم جاری بەدی دەهێنرێتەوە).

## یادخەرەوەی پێنجەم

کاتێ "سەعیدی نوێ" ڕێی تێڕامان و بیرکردنەوەی گرتەبەر، گشت هونەر و زانستە فەلسەفی‌یەکانی ئەوروپا کە تا ڕادەیەك لە بیری "سەعیدی کۆن"دا جێگیر بووبوون، لەناو دڵی ئەودا چەند نەخۆشی‌یەکیان پێکهێنا و، لەو گەشتەی کە ئەو بە "دڵ" ئەنجامی دا چەندین گیروگرفتی زۆریان لێ پەیدا بوو.

لەبەر ئەوە، "سەعیدی نوێ" بیری خۆی - بە یەکجارەکی - لە چڵك و چەپەڵیی فەلسەفەی بە ڕووکەش ڕازاوە و شارستانێتیی ساختە و نەفام داتەکاند و، خۆی بە ناچار زانی لەغاو لە دەمی ئەو هەستە دەروونی‌یانەی خۆی بنێت کە وان لە گیانی‌دا و لە بەرژەوەندیی ئەوروپا دەدوێن و پشتی دەگرن. جا لەم پێناوەدا، ئەم وتووێژەی خوارەوەی لەگەڵ کەسێتیی مەعنەویی ئەوروپادا ساز کرد. هەرچەندەش ئەم وتووێژە لە ڕوویەکەوە کەم و کورت دیارە، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە بە دوور و درێژ دادەنرێت.

جا بۆ ئەوەی کەس بە هەڵە لێم تێ نەگات، پێویستە خوێنەری بەڕێز لەوە ئاگادار بکەینەوە کە "ئەوروپا" دوو ئەوروپایە:

یەكەمیان: ئەو ئەوروپایەی كە بەهۆی كەڵك وەرگرتنی زۆری لە ئایینی مەسیحیی ڕاستەقینە، گەلێ سوودی بە مرۆڤایەتی گەیاند و چەندین خزمەتیشی بە ژیانی كۆمەڵایەتیی مرۆڤ پێشكەش كرد، لە ڕێی ئەو زانست و پیشەسازی‌یانەی كە لەسەر بناغەی ویژدان و دادگەری دامەزراون و ئەو بەدەستی هێناون.

من لەم وتووێژەمدا لەگەڵ ئەم بەشەی ئەوروپادا نادوێم، بەڵكو لەگەڵ:

بەشی دووهەم: (یاخود ڕووی دووهەمی ئەوروپا) دەدوێم. ئەو بەشەی كە بەهۆی فەلسەفەی سروشتی و ماددی‌یەوە، بە تەواوەتی گەنیوە و، خراپكاریی شارستانیێتی‌یەكەی بە چاكە دادەنێت و، لەم ڕێیەوە مرۆڤایەتیی بەرەو نەفامی و گومڕایی و بەدبەختی داوەتەبەر!

لەم گەشتە گیانی و مەعنەوی‌یەمدا، دوای ئەوەی چاكەكاری‌یەكانی شارستانیێتی و سوودە زانستی‌یەكانیم لێ جیا كردەوە، ڕووی دەمی گوفتارم ئاراستەی ئەو كەسێتی‌یەی ئەوروپا كرد كە فەلسەفەی زیانبەخشی بێ نرخ و شارستانیێتیی نەفام و بێ كەڵكی بەدەستەوە گرتووە. پێم وت:

ئەی ئەوروپای دووهەم!

گەر نەتزانیوە، ئەوا باش بزانە كە تۆ بە دەستی ڕاستت فەلسەفەی ڕێ ونكەری نەخۆش و، بە دەستی چەپیشت شارستانیێتیی زیانبەخش و نەفامت هەڵگرتووە. پاشان لافی ئەوە لێ دەدەیت كە گوایا: "بەختەوەریی مرۆڤ لەو دوانەدایە"!

دەك دەستت بشكێت بۆ ئەو دیاری‌یە بێ كەڵكەی پێشكەشی مرۆڤایەتیی دەكەیت! یاخوا هەر مایەی شوومی و هۆی نەهاتیی خۆت بێت.. هەروەك دەشبێت!

ئەی ئەو گیانە چەپەڵەی كە برەو بە بڵاوكردنەوەی كوفر و ئینكاری دەدات!

گەر مرۆڤێك گیان و ویژدان و دڵ و دەروونی پێكرابن، ئایا دەگونجێ كە تەنها بەوەی سامانێكی زۆر و ئارایشتێكی ڕواڵەتیی لەخشتەبەری دەست كەوتبێت، بەختەوەریی بەدەست هێنابێت؟ ئایا دەكرێ بەم جۆرە كەسانە بوترێت: "مرۆڤی بەختەوەر"؟

نابینیت گەر كەسێك لە كارێكی هەندەكی نائومێد بووبێت و، لە هیوا و ئاواتێكی "وەهمی" دەستی داشۆردبێت و، لە هێنانەدیی كارێكی بێ بایەخیشدا ڕەنجەڕۆ بووبێت، چۆن ئەو ئەندێشە بەتامەی لێ دەبێت بە ژەهری مار و، ئەو بارودۆخە نەرمونیانەی

دەوروبەریشی ئازاری بەسۆی پێ دەچێژن و، ئەم دنیا بەرین و فراوانەی وەك بەندیخانە لێ دێتەوە یەك؟

ئەو کەسەی کە بەهۆی شوومیی تۆوە ناخی دڵ و گیانی پێکرابێت و، شەشدەری هەموو هیوا و ئاواتێکی لێ گیرابێت و، سەرجەم ئازارەکانی هاتبنەوە سۆ، تۆ بۆ مرۆڤی بەدبەختی ئاوا چ بەختەوەرییەك دەتوانیت دەستەبەر بکەیت؟

ئەگەر کەسێك "دڵ" و "گیان"ی لە دۆزەخدا سزا بچێژن و، تەنها جەستەی لەناو بەهەشتێکی درۆینەی لەناوچوودا بێت، ئایا دەکرێ پێی بوترێت: "بەختەوەر"؟

ئەی ئەو گیانە چەپەڵە!

تۆ بە ڕێنماییەکانت وەها سەرت لە مرۆڤایەتی شێواند کە بە جارێ گرفتاری سەرکەشیت کرد، وا ئێستاش تاڵی و ئازاری ئەو دۆزەخە دەچێژێت کە تۆ لەناو ناز و نیعمەتی بەهەشتێکی درۆینەدا دەرخواردت دا.

ئەی دەروونی بەدخوازی مرۆڤایەتی!

سەرنج لەم نموونەیە بدە و ئنجا بزانە گرۆی ئادەمیزاد بەرەو کوێ دەبەیت:

وا دابنێ دوو ڕێگامان لە بەردەمدایە و، یەکێك لەو دوو ڕێگایەمان گرتەبەر. لە هەموو هەنگاوێکی ڕێی یەکەمدا چەندین هەزاری بێدەسەڵات دەبینین کە ستەمکاران هێرشیان بۆ دەبەن و شمەك و سامانیان زەوت دەکەن و کەپر و خانووبەرەیان بەسەردا دەڕووخێنن. تەنانەت هێندە بە قووڵی جەستەیان زامدار دەکەن کە لە تاو سۆی ئازارەکەیان تەنانەت ئاسمانەکانیش بەکوڵ بۆیان دەگرین! چاو بە هەر لایەکدا بگێڕرێت و سەیری هەر شوێنێك بکرێت هەمان هەڵوێست و بارودۆخ دەبینرێت..

بەم جۆرە، ئەم ڕێیە جگە لە: قڕە و غەڵبەی ستەمکاران و، شیوەن و گریانی ستەم لێکراوان هیچی تری تێدا نابیسترێ. دەڵێی ماتەمینگایەکی گشتی لەسەر ئەم ڕێیەدا دانراوە!

خۆ مادەم مرۆڤیش - بەپێی داخوازیی مرۆڤایەتییەکەی - هەردەم بە سزا و ئازاری کەسانی تر خەفەت دەخوات و ئازار دەچێژێت، ئەوا ناتوانێت بەرگەی ئازاری لە سنووربەدەری ئەم ڕێیە بگرێت! چونکە ویژدانی مرۆڤ هەڵگرتنی ئازاری تا ئەم ڕادەیەی لە توانادا نییە. لەبەر ئەوە، هەر کەسێك ئەم ڕێیە دەگرێتەبەر ناچار دەبێت یەکێك لەم دوو چارەسەرییانە هەڵبژێرێت:

یـان خـۆی لـە مـرۆڤێتی دامـاڵێت و، دڵێکـی ڕەقـی بەردئاسـا لـەناو هەنـاوی‌دا هەڵبگرێت و، نوقمی ئەوپەڕی دڕندەیی ببێت و، مادەم خۆی تەندروست و بێ وەی بێت ئیتر گوێ بە تیاچوونی کەسانی تر نەدات و خەمی ئازاری ئەوان نەچێژێت..

یاخود هەر شتێك "دڵ" و "ژیری"ی مرۆڤ داخوازی بن، ئەو وازیـان لـێ بـهێنێت و بە یەکجارەکی دەست لە هەموویان دابشوات!

دەسا ئەی ئەورووپای لادەر لە ئایینی ڕاستەقینەی "مەسیحی" و نوقم بووی ناو لیتـاوی گومڕایی و خراپکاری!

تۆ لە پێشدا بـە: "فێڵبـازیی یـەك چاوەی دەجـاڵ ئاسـا" بـارێکی دژوار و نالـەبارت بـە گیـانی مـرۆڤ بەخشی. پاشان هەستت کـرد کـە ئـەو بـارەی تۆ بـۆت ڕەخسـاند - لـە ڕاستی‌دا - دەردێکی سـەختی بێ دەرمانە، چونکـە لـە چلەپۆپـەی بلندترین بەرزی‌یـەوە مرۆڤ دەهاوێتە پلەیەکی گەلـێ نزمتر لە هی ئاژەڵیش! ئنجا هیـچ چارەسـەری‌یەکیش بـۆ ئەم دەردە کوشندە و زامە ناسۆرە شـك نابـەیت جگـە لـە یـاری و گەمـە و لـەهوە سـەرنج ڕاکێشەکانت (کە هەست و نەستی ئادەمیزاد لەکار دەخەن و بـە جۆرێکـی کـاتی بـەنجی دەکەن) و، جگە لـە فەنتازی‌یـە ڕووکـەش و، ئـارەزووە خەوێنـەرەکانت (کـە پـتر خـەوی بێ‌ئاگایی لە مرۆڤ دەخەن).

ئەمەیە ئەو چارەسەری و دەرمانەی شکی دەبەیت! دەك بەدبەختی و چارەشوومی هەر چارەنووسی خۆت و دەرمانت بێت، ئەو دەرمانەی کە - بە دڵنیایی - لە ئـەنجامدا دەبێتـە مایەی لەناوچوونی خۆیشت!

بەڵێ، ئەو ڕێیەی کە تۆ لە بـەردەم مرۆڤدا کردووتـەوە، کتومـت، وەك ئـەم نموونەیـە وایە.

بەڵام ڕێی دووهەم: ئـەو دیاری‌یـەی قـورئانی پیرۆزە کــە پێشکەشـی مرۆڤایـەتیی کـردووە و، لەوێوە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی کردوون. ئێمە لە هـەموو مـەنزڵگا و شـوێن و شارێکی سـەر ئــەم ڕێیــەدا چـەندین سـەربازی دەستپاك و گوێڕایـەڵی پادشـایەکی دادپەروەر دەبینین کە بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەتەوە و هـەردەم لـە کـار و هـاتوچۆدان. جاربـەجاریش هـەندێ کەسـی کارمـەندی ئـەو پادشـا دادگـەرە دێـن و بـە فــەرمانی فـەرمانڕەوای دادگـەر هـەندێ لـەو سـەربازانە لەسـەر کـار لادەبـەن و چـەك و وڵاخ و

کەرەسەی سەربازیی سەر بە دەوڵەتیان لێ وەردەگرنەوە و، "بلیتی حەوانەوە"یان دەدەنێ. ئەو سەربازانەش، بەم حەوانەوە و لەسەر کار لابردنە - لە ڕاستیدا - گەلێ شاد و دڵخۆشن، چونکە هەرچەند لە ڕواڵەتدا خەم بۆ لەدەستچوونی ئەو کەرەسە و پێداویستییانە دەخۆن کە لێیان سەندراوەتەوە، بەڵام دڵشادی ئەوەن کە کارەکەیان ئەنجام داوە و، وا ئێستا بەرەو خانە و مەڵبەندی پادشایەتی و بۆ مەبەستی شادمانیی ئامادەبوونیان لە خزمەت پادشادا، دەگەڕێنەوە.

هەندێ جار دەبینین ئەو کارمەندانەی پادشا بە سەربازی وا دەگەن کە ئەمان ناناسێت، کاتێ ئەمان پێی دەڵێن: چەکەکانت دابنێ، ئەو یەکسەر دەڵێت: "من سەربازی پادشای مەزنم و چاوەڕوانی فەرمانی ئەوم و لە خزمەتی ئەودا کار دەکەم و لە ئەنجامیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە. ئێوە کێن وا دەتانەوێت ئەوەم لێ بسێنن کە پادشای مەزن پێی بەخشیوم؟ گەر بە فەرمان و ڕەزامەندیی ئەو هاتوون، ئەوا بەسەر چاو، فەرمانە بەرزە پیرۆزەکەیم پیشان بدەن. دەنا لەسەر ڕێم لاچن، خۆ گەر لانەچن ئەوا با من تەنها یەك کەس و ئێوەش هەزاران بن، لەگەڵتاندا دەجەنگێم، چونکە من لەبەر خۆم ناجەنگم و موڵکی خۆم نیم، بەڵکو لە پێناوی پارێزگاری کردنی ئەمانەتی خاوەن و گەورەکەی خۆمدا و بۆ مەبەستی پاراستنی عیززەت و مەزنییەکەی ئەو لەگەڵتان دەکەومە جەنگەوە. کەواتە هەرگیز ملتان بۆ کەچ ناکەم"!

ئەمە نموونەیەکی، یەك لە هەزاری، ئەو نموونانەیە کە لەم ڕێیەدا هەن و سەرچاوەی خۆشی و بەختەوەرین. ئیتر بۆ خۆت دەتوانیت نموونەی تری وەك ئەمە بدۆزیتەوە.

ئێمە بە درێژایی ڕێی دووهەم و ماوەی گەشت و سەفەر، خەڵکی دەبینین کە بەوپەڕی خۆشی و کامەرانی و شادمانی و بە جۆرێکی چڕ و بەردەوام دەکرێن بە سەرباز، مەبەست لەمەشدا ئەوانەن کە پێیان دەوترێت: "لە دایك بوان".. هەروەها لە هەمان کاتدا و بە هەمان خۆشی و لەگەڵ وتنی: "لا إله الا الله" و "الله اکبر"دا هەمیشە تەسریح بوونیش لە سەربازی بەردەوامە، کە بریتییە لەوانەی پێیان دەوترێت: "کۆچکردوان".

ئەمەیە دیاریی قورئانی پیرۆز بۆ مرۆڤایەتی. هەرکەسێ شوێنی بکەوێت لە هەردوو جیهاندا سەرفراز و بەختەوەر دەبێت و، بێ ئەوەی خەم بۆ شتێك بخوات کە لە دەستی چووبێت، یان پەژارەی ڕووداوی ئایندەی ببێت، ئەم بە ئارامی و دڵنیایی ڕێی خۆی دەبڕێت، بە چەشنێ کە واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەی تێدا دێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿لا خَوْفٌ عليهم ولا هُمْ يَحْزَنون﴾[١].

ئەی ئەوروپای دووهەمی بێ کەڵکی خراپکار!

تۆ پشتت بە چەند بناغەیەکی لاوازی کرمۆڵ بەستووە، ئەوەتا گومان وا دەبەیت کە گوایا:

(هەموو زیندەوەرێك، هەر لە مەزنترین مەلائیکەتەوە تا دەگاتە بچووکترین گیانلەبەری وەك ماسی، خۆی خاوەنی خۆیەتی و، تەنها بۆ خۆی و لە پێناوی خۆیدا کاردەکات و تێدەکۆشێت و، هەرچی کەسە تەنها بۆ تام و چێژی خۆی هەوڵ و تەقەلا دەدات و، هەر لەبەر ئەوەش مافی ژیانی هەیە. کەواتە ئەوپەڕی هیممەت و ئامانجی: مسۆگەر کردنی مانەوە و بەردەوامبوونی ژیانی خۆیەتی)!

پاشان ئەو "یاسای هاوکاری"یەی کە بۆ ئەنجامدانی فەرمانی بەدیهێنەری دانا لە نێوان بەدیهاتوواندا هەردەم دەست بەکارە و لە هەموو جێیەکی گەردووندا بە ئاشکرا لە بەرچاودایە، چەشنی: "یارمەتیدانی ڕووەك بۆ ئاژەڵ و، ئاژەڵیش بۆ مرۆڤ"، تۆ ئەم یاسا خوایی و درەوشانەوە خاوەن کەرەم و میهرەبانییەی کە لەو یارمەتی و هاوکارییە گشتییەوە پەیدا بوون، بە چاوی خۆت دەبینیت، کەچی پێت وایە ئەم یاسایە بریتییە لە: "مشتومڕ" و "ململانێ"! وەهایش لەم هەڵەیەدا ڕۆچوویت کە بڕیارێکی شێتانە دەردەکەیت و دەڵێیت:

"ژیان تێکڕا بریتییە لە: مشتومڕ و ململانێ"!

قسەیەکی گەلێ سەیرە! چۆن ئەو فراپاگوزارییەی کە گەردیلەکانی خۆراك دەیکەن و بەوپەڕی تاسەمەندی و خۆشییەوە بەدەم خانەکانی لەشەوە دەڕۆن و خۆراکیان دەرخوارد دەدەن، بە کاری مشتومڕ و ململانێ دادەنرێت؟!

نەخێر. بەهەڵەدا چوویت! ئەو کارە لە ڕاستیدا "یاسای هاوکاری"یە، کە تەنها بە فەرمانی پەروەردگارێکی گەورەی کارساز ئەنجام دەدرێت.

ئەو بناغەیەش کە پشتی پێ دەبەستیت و شتی لەسەر بنیات دەنێیت و لات وایە: "هەموو شتێك خاوەنی خۆیەتی"، بناغەیەکی فشەڵ و هەڵەیەکی گەلێ ئاشکرایە! ڕوونترین بەڵگەش بۆ ئەمە: مرۆڤە؛ ئەوەتا لە نێوان سەرجەمی هۆکارەکاندا مرۆڤ

---

(١) (البقرة:٢٦٢و٢٧٤) ، (المائدة:٦٩). گەلێ شوێنی تری قورئان. (وەرگێڕ)

بەرزترینیانە و خاوەنی فراوانترین ویست و ئیختیارە، کەچی دەبینین لەناو دەستی ویست و ئیختیاری مرۆڤ و بازنەی تواناى‌دا و لەو کردەوانەی‌دا کە بە ویست و ئیختیاری خۆی ئەنجامیان دەدات – وەك خواردن و خواردنەوە و بیرکردنەوە – بەشێکی تەماویی یەك لە سەد نەبێت هیچی تری بە دەستی خۆی نی‌یە! جا کەسێك کە لەم کارە ئاشکرایەدا لە سەدا یەك زیاتری لە تواناداا نەبێت، چۆن بە خاوەنی خۆی دادەنرێت؟!

لە کاتێکدا بەرێزترین "هۆکار" و فراوانترین "ویست و ئیختیار" ئاوا دەستی بەسترابێت و، خاوەنی موڵکداریی ڕاستەقینە و هەڵسوکەوتی سەربەخۆی تەواو نەبێت، دەبێ چی سەبارەت بە ئاژەڵ و بێ گیانەکانەوە بوترێت؟ ئایا کەسێك وتەی ئاوای بە جۆرێکی هەڕەمەکی و بێ پەروا لە زار دەربچێت، لە ئاژەڵ گومڕاتر و لە بیانیی‌یەکانیش بێ هەست و شعوورتر نی‌یە؟!

دەسا ئەی ئەورووپا!

تەنها فێڵبازیی یەك‌چاوەتە – کە زیرەکی‌یە لەڕادەبەدەر شوومەکەتە – تۆی گرفتاری ئەم گێژاوە کردووە. ئەوەتا بەهۆی ئەم زیرەکی‌یە شوومەت، پەروەردگار و بەدیهێنەری هەموو شتێکت لە یاد چووە و، ئاسەوار و جێ‌دەستە ناوازە و بێ وێنەکانی ئەوت داوەتە پاڵ: هۆکارەکان و، سروشتی دەست هەڵبەستی خەیاڵ. ئنجا موڵکی ئەو بەدیهێنەرەشت بەسەر ئەو "بتانەی" کە جگە لە خوای گەورە دەپەرسترێن، دابەش کرد.

لە گۆشە نیگای ئەم زیرەکی‌یە یەك چاوەی تۆوە، هەموو زیندەوەرێك ناچار دەبێت، هەر بە تەنها خۆی، لەگەڵ چەندین دوژمنی لەژمارەبەدەردا بکەوێتە ململانێ و، هەر تەنها خۆیشی پێداویستی‌یە لەسنوور بەدەرەکانی پەیدا بکات. هەموو ئەمانەش تەنها لە ڕێی: تواناکەی خۆیەوە کە بە ئەندازەی گەردیلەیەکە و، بە ویست و ئیختیاریشی کە چەشنی تاڵە موویەکە و، بەو هەست و نەست و شعوورەی کە وەك بریسکەیەك وایە و یەکسەر نامێنێت و، بەو ژیانەی کە لە بڵێسەیەك دەچێت؛ لە پڕ دەکوژێتەوە و، لەو تەمەنەشدا کە دەڵێی یەك خولەك ماوەیەتی و کتوپڕ تەواو دەبێت. لە کاتێکدا هەرچی‌یەکی لە دەستدایە بەشی هێنانەدیی یەکێك لە داواکاری‌یەکانی ناکات، بە ڕادەیەکی وا کە ئەگەر دووچاری گیروگرفتێك ببێت، بە چەند هۆکارێکی کەڕوکاس نەبێت هیوای بە هیچ دەرمانێکی تر نی‌یە و، بە تەواوی ناوەرۆکی ئەم ئایەتەی تێدا دێتەدی کە دەفەرموێ:

﴿وما دُعاءُ الْكافرينَ إلاّ في ضَلال﴾ (الرعد:١٤)!

ئـەم فێڵبـازی و زیرەکی‌یـە ڕەش و تـارەت، ڕۆژگـاری مرۆڤایـەتیی گۆڕیـوە بـە شەوگارێکی تاریکی پڕ لـە ستەمکاری. پاشـان دەتـەوێت بـە چەند چرایـەکی درۆینە و کاتی ئەو تاریکی‌یە سامناکە بڕەوێنیتەوە و دنیا ڕووناك بکەیتەوە!

بەڵام بـاش بزانـە ئەو چرایانـەی کـە تۆ دایانده‌گیرسێنیت هـەرگیز لـە ڕووی مرۆڤدا ڕووناکیی خەندە و دڵنەوایی نانوێنن، بەڵکو بـە چـاوی سـووکایەتی و گاڵتـەجاڕی بۆی دەڕوانن، بە تایبەت لەو کاتانەدا کە مـرۆڤ نوقمـی لیتـاوی چـەندین بـاری ئازاربەخشـی گریان ئامێزە و لەتاوا – شێتانە – قاقا لـێ دەدات!

لـە ڕوانگـەی بینینـی قوتابی‌یـەکانی تـۆوە: هـەموو زیندەوەرێك هـەژارە و دووچـاری چەندین گیروگرفتی ئەوتۆیە کە هـەر هـەموویان ئـەنجامی هێرش و پـەلاماری ستەمکارانە لەسەریان.

دنیـا لـە ڕوانگـەی ئـەودا: ماتەمینگایـەکی گشـتی‌یە و، ئـەو دەنگانـەش کـە لێـی دەبیسترێن: هەواڵی مردن و، ئاخ و ئۆفی ئازار و، ناڵە و گریانی هەتیوانە.

هەر کەسێك ئامۆژگاری لە تۆ وەردەگرێت و ڕەفتار بە ڕێنمایی‌یەکانت دەکـات، لـە ئەنجامدا دەبێت بە "فیرعەونێکی ستەمکار" بـەڵام لـە هـەمان کـاتدا فیرعـەونێکی ڕسـوا و زەلیـل! چونکـە بێ‌نرخـترین شـت دەپەرسـتێت و هـەرچی سـوودی لـێ ببینێـت بـە پەروەردگاری خۆی دایدەنێت!

هەر ئەم قوتابی‌یەت، قوتابی‌یەکی "سەرکەش"ە، بەڵام سەرکەشـێکی هـەژار؛ چونکـە لە پێناوی بەدەستهێنانی لـەزەتێکی بێ بایـەخدا قـاچی شـەیتانیش مـاچ دەکـات و، لەبەر دەستکەوتنی سوودێکی نزمیش بەوپەڕی زەلیلی ڕازی دەبێت!

ئەم قوتابی‌یـەت گەلـێ بـە زەبروزەنگە، بـەڵام خـاوەن زەبرێکـی وەهایـە کـە تـابلێی کۆڵەوارە. چونکە لەناو دڵی خۆیدا هیچ پاڵپشتێك شك نابات پاڵی پێوە بدات.

ئەوپەڕی ئاوات و هیممەتی بەرزی قوتابیی تۆ لەوەدایە کـە: "هـەوا و ئارەزووەکـانی خۆی" تێر و دڵنیا بکات، بە ڕادەیـەکی ئـەوتۆ کـە سـاختە و فێڵیشـی بۆ بـەکاردەهێنێت! چونکە لە ژێر پەردەی لافی میللەتپەروەری و قوربانی و خۆبەختکردندا بە دوای سوود و بەرژەوەندی‌یە تایبەتی‌یـەکانی خـۆیدا دەگـەڕێت! بـەم چەشنە فێڵ و تەڵەکەبازی‌یانـەش هەڵپە و تەماع و غرووری نـاخی خـۆی تێر دەکـات. چونکـە – لـە ڕاستیدا – جگـە لـە

خۆی کەسی تری خۆش ناوێت، تەنانەت لە پێناوی خۆیدا هەموو شتێکی تر بەخت دەکات!

بەڵام قوتابیی دڵسۆز و بێ گەردی قورئانی پیرۆز "بەندە"یە. بەندەیەکی وا کە سەری بەندایەتی بۆ مەزنترین بەدیهێنراویش دانانەوێنێت. کەواتە "بەندەیەکی خاوەن عیززەتە" و، هەرگیز بەوە ڕازی نابێت کە نیعمەتی هەرە مەزنی بەهەشتیش ئامانج و مەبەستی خواپەرستیی بێت..

هەر ئەم قوتابییەی قورئان "لەسەرخۆ و نەرمونیان"ە، بەڵام جگە لە بەدیهێنەری مەزنی خۆی و بۆ غەیری فەرمانەکانی ئەو، لە ڕووی کەسدا زەلیلی نانوێنێت! کەواتە خاوەنی هیممەتێکی بەرز و ویستێکی ڕاستە..

ئنجا ئەم قوتابییە: "هەژار"ە، بەڵام لەبەر ئەو پاداشتە زۆرەی کە خاوەنە میهرەبانەکەی بۆی پاشەکەوت کردووە، پێویستی بە هیچ شتێك نییە و، لە ڕووی کەسدا دەست ناگرێتەوە..

پاشان "لاواز"ە، بەڵام پاڵی بە هێزی خاوەنە گەورەکەی خۆیەوە داوە. کەواتە قوتابیی خاوێن و بێ گەردی قورئانی پیرۆز ڕازی نابێت بەهەشتی هەمیشەیش ئامانجی بێت، چ جای ئەم دنیا فانییە!

بۆ خۆت لەم بەراوردەوە مەودای ئەو جیاوازییە مەزن و فراوانە تێبگە کە لە نێوان هیممەتی ئەو دوو قوتابییەدا هەن!

هەر بە هەمان جۆر، دەتوانن لە ڕووی دەرکەوتنی "ڕادەی خۆبەختکاری"ی هەردووکیانەوە، جیاوازیی نێوان شاگردانی فەلسەفەی نەخۆش و قوتابییانی قورئانی پیرۆز لێکبدەنەوە:

ئەوەتا قوتابیی فەلسەفە لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا، لە براکەی هەڵدێت و دەعوای لەسەر تۆمار دەکات! بەڵام قوتابیی قورئان، سەرجەمی بەندە ڕاست و چاکەکانی خوای گەورە، کە لەناو زەوی و ئاسمانەکاندان، تێکڕا بە برای خۆی دەزانێت و لە ناخی گیانی خۆیدا هەست بە چەندەها پەیوەندی و تاسەمەندی دەکات بەرامبەریان. لەبەر ئەوە، هەمیشە لە قووڵایی دڵی خۆیدا نزای گەرموگوڕی بێ گەردیان بۆ دەکات و، بە بەختیاریی ئەوان هەمیشە بەختەوەر دەبێت. کە دەشڕوانێتە

هەموو شتێك ئیخلاسی تێدایە، تەنانەت خۆشەویستیی بێ گەردی بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە چەندەها تەن خۆشەویستیی ڕواڵەتی باشترە. شاعیرێك ئەم جۆرە خۆشەویستی‌یەی بەم بەیتە شیعرە دەربڕیوە کە دەڵێت:

وما أنا بالباغي على الحُبِ رشوةً ضعيفٌ هــوى يُبغى عليه ثوابُ

واتە: لەسەر ئەم خۆشەویستی‌یەم داوای هیچ بەرتیل و پاداشت و خەڵات و بەخشِشێك ناکەم، چونکە ئەو خۆشەویستی‌یەی داواکاری پاداشت و خەڵات بێت، خۆشەویستی‌یەکی لاوازە و بە زوویی کۆتایی پێ دێت.

خوای گەورە، ئەم خۆشەویستی‌یە بێ گەردەی لە سروشتی مرۆڤدا بە تایبەتیش لە سروشتی تێکڕای دایکاندا، داناوە. شەفەقەتی دایك نموونەیەکی ئاشکرا و بەرجەستەی ئەم خۆشەویستی‌یە بێ گەردەیە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە دایکان هەرگیز داوای بەرتیل و پاداشت و خەڵات ناکەن بەرامبەر خۆشویستنی مناڵەکانیان، ئەوەیە کە: لە پێناوی مناڵەکانیاندا خۆیان بەخت دەکەن، بەڵکو هەندێکیان لەو پێناوەدا دوارِۆژیشیان دادەنێن! تەنانەت بە چاوی خۆت دەبینیت کە "مریشك" پەلاماری "سەگ" دەدات تاکو جوجەڵەکەی لە دەمی ئەو سەگە ڕزگار بکات - وەك خەسرەو بە چاوی خۆی بینیی - ئاشکرایشە کە هەموو سەرمایەکەی بریتی‌یە لە ژیانەکەی، کەچی لەو پێناوەدا بەختی دەکات!

◆ مەسەلەی چوارەم:

ئەو نیعمەتانەی کە لە ڕێی هۆکارێکی تایبەتی‌یەوە بۆ مرۆڤ دێن، نابێت بە حسابی ئەو هۆکارە ڕواڵەتی‌یانە وەربگیرێن، چونکە ئەو هۆکارەی نیعمەتەکەی لە ڕێگاوە دێت یان دارای ئیختیارە، یان بێ‌ئیختیارە. جا ئەگەر چەشنی ئاژەڵ و ڕووەك بێ ئیختیار بوو، ئەوا هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە کە ئەو نیعمەتەت بە حساب و بە ناوی خوای گەورەوە دەداتێ. جا مادەم کاتێ نیعمەتەکەت پێشکەش دەکات بە زمانی حاڵ ناوی خوای گەورە دەهێنێت، واتە ﴿بِسمِ اللهِ﴾ دەکات و ئنجا دەتداتێ، ئەوا تۆیش بە ناوی خوای گەورەوە وەری‌بگرە و بیخۆ.

بەڵام ئەگەر ئەو هۆکارە خاوەنی ئیختیار بوو، ئەوا دەبێ ناوی خوا بهێنێت و بڵێت: ﴿بِسمِ اللهِ﴾. هەتا ئەو ناوی خوای لێ نەهێنێت تۆ هیچی لێ وەرمەگرە. چونکە واتای

ئاماژەیی - سەرباری واتای ڕاشکاوی - ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾ (الأنعام:١٢١) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەر نیعمەتێك ناوی خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی لەسەر نەهێنرابێت، کە خوای گەورەیە و، بە ناوی ئەو خوایەوە بەدەستتان نەدرابێت، ئێوە لێی مەخۆن.

بەم پێیە، دەبێ بەخشەر و وەرگر - هەردوو کیان - ناوی خوا بهێنن. خۆ ئەگەر بەخشەر ناوی خوای نەدەهێنا و تۆیش گەلێ موحتاجی وەرگرتنی ئەو نیعمەتە بوویت، ئەوا تۆ ناوی خوای لێ بهێنە و وەری بگرە. بەڵام لەو کاتەدا کە وەری دەگریت لە سەرووی دەستی بەخشەرەوە دەستی "میهرەبانیی خواوەند" ببینە کە ئەو نیعمەتەی بە تۆ و بەویش بەخشیوە. ئنجا ئەو دەستی میهرەبانی‌یە بە "شوکرانە بژێری" ماچ بکە و نیعمەتەکەی لێ وەربگرە. واتە لە ناوەندی نیعمەت بەخشیندا یادی نیعمەت بەخشی ڕاستەقینە بکەرەوە. لە ڕاستی‌دا "شوکرانەبژێری" بریتی‌یە لەم ڕوانین و یادکردنەوەیە. پاشان - ئەگەر ویستت - ئاوڕێك لە هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکە بدەرەوە و دوعای خێر و ستایشی بۆ بکە، لەبەر ئەوەی کە نیعمەتەکەت لەسەر دەستی ئەودا پێ گەیشتووە.

ئەو شتەی هۆکارپەرستان دەخاتە هەڵەوە و لە خشتەیان دەبات، ئەوەیە کە هەرکات دەبینن دوو شت بە یەکەوە دێن یان پێکەوە پەیدا دەبن، وا گومان دەبەن کە یەکێکیان "هۆکار"ی "بوون"ی ئەوی تریان بێت. کە ئەمەش پێی دەوترێت: "إقتران" واتە: "پێکەوەیی" یان "هاودەمی"..

جا لەبەر ئەوەی کە "نەبوون"ی شتێك دەبێت بەهۆی "نەبوون"ی نیعمەتێك، ئەوا مرۆڤ وا گومان دەبات کە بە هەمان جۆر "بوون"ی ئەو شتەش هۆی "بوون"ی ئەو نیعمەتەیە و، ئنجا سوپاسگوزاری پێشکەش بەو شتە دەکات و بەو پێیە دەکەوێتە هەڵەوە. هەڵەکەشی لەوەدایە کە نازانێت "بوون"ی هەر نیعمەتێك - لە ڕاستی‌دا - ئەنجامی چەندین پێشەکی و هەل و مەرجی زۆر و زەبەندەیە، بەڵام "نەبوون"ی ئەو نیعمەتە تەنها بە نەهاتنەدیی یەك دانە لەو هەل و مەرجانە ڕوو دەدات!

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك جۆگەی ئاوی باخچەکەی نەکاتەوە، دیارە ئەم کارەی دەبێت بەهۆی وشك بوون و مردنی باخچەکەی، پاشان "فەوتان" و "نەمان" و "نەبوون"ی ئەو نیعمەتانەی کە لەو باخچەیەدان. بەڵام "بوون"ی ئەو نیعمەتە زۆرانەی

باخچەکە تەنها پشتیان بە ئاوبەردانەوەی ئەو کەسە نەبەستووە، بەڵکو لەگەڵ ئەو مەرجەشدا پشتیان بە سەدان هەل و مەرجی تر بەستووە کە دەبێ "هەموویان" بێنەدی. تەنانەت هێشتا جگە لە هاتنەدیی هەموو ئەوانەش، بە بێ هۆکاری ڕاستەقینە، کە توانستی پەروەردگاری و ویستی خوایی‌یە، هەرگیز ئەو نیعمەتانە نایەنەدی!

بۆ خۆت لەم نموونەیەوە مەودای ئەو چەوتی و چەواشەیی‌یە بزانە کە لەم هەڵەیەدا هەیە و، ئنجا لە تاوان و سووچی هۆپەرستان تێبگە!

بەڵێ "إقتران" و "هۆ" دوو شتی لەیەکتر جیاوازن. بۆ نموونە: ئەو نیعمەتەی هاودەم لەگەڵ "نیازی چاکەکاری"ی کەسێکدا ڕووت تێ دەکات، "هۆ"کەی: میهرەبانیی خواوەندە. نیازەکەی ئەویش جگە لە "إقتران" هیچی تری لە هێنانی ئەو نیعمەتەدا نەبووە و هەرگیز ئەو نیازە "هۆ"ی "بوون"ی ئەو نیعمەتە نی‌یە.

بەڵێ ڕاستە، ئەگەر ئەو کەسە نیازی ئەو چاکەکاری‌یەی نەبوایە کە لەگەڵ تۆدا بیکات، ئەو نیعمەتە بۆ تۆ نەدەهات. واتە "نەبوون"ی ئەو نیازە دەبوو بەهۆی "نەبوون"ی ئەو نیعمەتە. بەڵام "بوون"ی مەیل و نیازی چاکەکاری‌یەکەی ئەو هەرگیز "هۆ"ی "بوون"ی نیعمەتەکە نی‌یە، لەوانەیە مەرجێك بێت لە نێوان سەدان مەرجی تردا.

هەندێ قوتابیی نوور لەوانەی کە خوای گەورە بەخشایش و نیعمەتی زۆری بەسەردا باراندوون، وەك "خەسرەو" و "ڕەئفەت" کەوتنە ئەم هەڵەیەوە و "إقتران" و "هۆ"یان لێ ئالۆزا. ئەوەبوو لەڕادەبەدەر ڕەزامەندی‌یان لە مامۆستاکەیان دەردەبڕی و سوپاسیان پێشکەش دەکرد. کەچی لە ڕاستی‌دا خوای گەورە نیعمەتی سوودوەرگرتنی ئەوانی لە دەرسەکانی قورئان "هاودەم کردبوو" لەگەڵ ئەو چاکەکاری‌یەی کە بە مامۆستاکەی ئەوانی بەخشیبوو و بریتی‌بوو لە نیعمەتی سوودگەیاندن بەوان. کەواتە مەسەلەکە جگە لە هاودەمی(إقتران) هیچی تر نی‌یە..

ئەوان دەڵێن: ئەگەر مامۆستامان بۆ ئێرە نەهاتایە ئێمە ئەم دەرسە ئیمانی‌یەمان لەکیس دەچوو. کەواتە سوودگەیاندنی ئەو بە ئێمە "هۆ"ی سوودوەرگرتنی ئێمەیە.

منیش دەڵێم: برا خۆشەویستەکانم! خواوەندی حەق ئەو نیعمەتەی کە بە منی بەخشیوە "هاودەم" لەگەڵ ئەو نیعمەتەدا ناردوویەتی کە بە ئێوەشی بەخشیوە. "هۆ"ی هەردوو نیعمەتەکە تەنها "میهرەبانیی خوای گەورەیە".

ڕۆژێکیان هەستم بە منەتباری‌یەکی زۆر دەکرد بەرامبەر چەند قوتابی‌یەك لەوانەی کە خاوەنی قەڵەمی کارامەی وەك ئێوە بوون و لە خزمەتگوزاریی نووردا تێ‌دەکۆشان. منیش بە هەمان جۆر "إقتران"و "هۆ"م لێ ئاڵۆزا و، دەمووت: گەر ئەو قوتابی‌یانە نەبوونایە یەکێکی خەت ناخۆشی وەك من چۆن دەیتوانی ئەرکی خزمەتگوزاریی قورئان ڕابپەڕێنێت؟ بەڵام پاش ئەوە تێ گەیشتم کە خوای گەورە دوای ئەوەی نیعمەتی: "خەت خۆشی"ی بە ئێوە بەخشی، نیعمەتی "تەوفیق"یشی لەم خزمەتگوزاری‌یەی قورئانی پیرۆزدا بە من بەخشی. کەواتە هەردوو کارەکە "پێکەوە" و بە "هاودەمی" هاتنە پێش و هیچ کامیان هۆی هاتنی ئەوی تریان نی‌یە.

لەبەر ئەوە، من سوپاسی خۆم پێشکەشی ئێوە ناکەم، بەڵکو لە بریی ئەوە، مژدەتان دەدەمێ و پیرۆزباییتان لێ دەکەم. دەسا ئێوەش لە بریی ڕەزامەندی و سوپاسگوزاری بەرامبەر بە من، دوعا و نزای سەرکەوتن و بەرەکەتم بۆ بکەن.

ئەم مەسەلەیە تەرازوویەکی وردی سەرنەکەری تێدایە، پلەکانی بێ‌ئاگایی و شیرکی پەنهانی پێ دەزانرێت.

◆ مەسەلەی پێنجەم:

هەروەك ئەگەر موڵکی "کۆمەڵ" بدرێت بە "یەك کەس" بە ستەمێکی مەزن لە قەڵەم دەدرێت و..

گەر کەسێك شتێکی تایبەت بە کۆمەڵەوە زەوت بکات، ئەوا ستەمێکی گەلێ ناشیرین بەرامبەر بە کۆمەڵەکەی دەکات..

بە هەمان جۆر:

ئەو "ئەنجامانە"ش کە هی هەوڵ و کۆششی کۆمەڵن و "پلە مەزنەکان"ی بەرهەمی ڕەوشت جوانیی سەرجەمی کۆمەڵەکەش، گەر بە هی "سەرۆك" یان "مامۆستا" یان "ڕابەر"ی ئەو کۆمەڵە دابنرێن، ئەوا ستەمێکی گەلێ مەزن لە مافی ئەو کۆمەڵە دەکرێت، لە هەمان کاتیشدا – ئەم کارە – ستەمێکی ئاشکرایە لە خودی ئەو سەرۆك و مامۆستایە.

چونکە ئەم چەشنە کارانە ختووکەی "خۆویستی"ی شارراوە و پەنهانی ناوەوەی ئەو مامۆستا و سەرۆکە دەدات و بەرەو "لەخۆبایی بوون"ی دەبات! دەبینیت لەکاتێکدا کە

ئەو مامۆستایە جگە لە پاسەوان و دەرگاوانی کۆمەڵەکەی زیاتر نییە، کەچی لە ئەنجامی ئەو بۆچوونە هەڵەیەدا، لە پۆشاکی پادشادا خۆی دەنوێنێت و بەو شێوەیە خۆی دەخاتە وەهمی خەڵکییەوە. خۆ - وەك ئاشكرایە - بەم کارەی ستەم لە خۆی دەکات، تەنانەت لەوانەیە ئەم وەهمەی ڕێیەکی بەرەو جۆرێکی شیرکی پەنهان لێ بکاتەوە.

بەڵێ، ئەگەر سەربازەکانی تابوورێکی سوپا قەلایەکی سەخت بگرن، سەرکردەکەیان مافی ئەوەی نییە دەستکەوتەکانی جەنگ بۆ خۆی هەڵبگرێت و سەرکەوتنەکەشیان بە هی خۆی لە قەڵەم بدات!

لەبەر ئەوە، نابێ مامۆستا و ڕابەر وەك سەرچاوە سەیر بکرێن. بەڵکو دەبێ وەك ئاوێنەیەکی دەرخەر و تیشکدەرەوە تەماشا بکرێن، چەشنی ئەو ئاوێنەیەی کە گەرمی و ڕووناکیی خۆر دەداتەوە.

چونکە ئەوپەڕی گێلی و گەلحۆیی‌یە گەر ئاوێنەکە بە سەرچاوەی ئەو ڕووناکی و گەرمی‌یە بزانرێت و خودی خۆر لە یاد بکرێت و، پاشان تۆش بایەخ و ڕەزامەندی بەرامبەر بەو ئاوێنەیە دەربېریت لە بریی خۆرەکە خۆی!

بەڵێ ڕاستە، دەبێ پارێزگاریی ئاوێنەکە بکرێت، چونکە دەرخەرێکە سیفەتەکانی خۆر دەداتەوە. کەواتە "ڕۆح" و "دڵ"ی ڕابەر دوو ئاوێنەی دەرخەرن، ئەو ڕێژنە پەروەردگاری‌یانە دەدەنەوە کە لە لایەن خواوەندی حەقەوە بەسەریاندا باریوە.

بەم جۆرە، "ڕابەر" دەبێت بە هۆکاری دانەوەی تیشکی ئەو ڕێژنانە بەرەو موریدەکەی. هەر لەبەر ئەوەشە کە نابێت ئەو ڕابەرە پلەیەکی لە هی خۆی زیاتری بدرێتێ کە پلەی: "هۆکاری دانەوەی ئەو ڕێژنانەیە".

خۆ دەشگونجێ ئەو مامۆستایەی کە وەك سەرچاوەیەك تەماشا دەکرێت، نە سەرچاوە بێت و نە ئاوێنەی تیشکدەرەوەش، بەڵکو ئەو ڕێژنانەی کە موریدەکە لە ڕێیەکی ترەوە بەدەستی هێناون، بەهۆی ئیخلاسە بێ گەردەکەی بەرامبەر مامۆستاکەی و لەبەر ئەوەی کە تەنها چاوی لەوە و بە بۆنەی نزیکیی لێیەوە و پەیوەندیی خەست و خۆڵی پێیەوە، لە ئاوێنەی ڕۆحی شێخەکەی‌دا بیانبینێت و پاشان بە هی ئەویان بزانێت!

ئەم موریدە لەمەدا وەك ئەو کەسە وایە کە بە خەواندنی موگناتیسی خەوی لێ خرابێت؛ چونکە ئەمیش - وەك ئەو - دوای ئەوەی کە بە چڕی ڕوانینی خۆی ئاراستەی

ئاوێنەکە دەکات، دەرگایەك لەسەر جیهانی میسال بۆ ئەندێشەی دەکرێتەوە و، لەوێوە چەندین دیمەنی سەیر و سەرسوورهێنەر دەبینێت. لە ڕاستیشدا ئەو دیمەنانە لەناو ئاوێنەکەدا نین، بەڵکو لەو پەنجەرە ئەندێشەیی‌یەوە دەیانبینێت کە لە پشتی ئەو ئاوێنەیەوەن و، لە ئەنجامی تەماشا کردنی چڕ و خەستی ئاوێنەکەوە ئەو پەنجەرەیە لە ئەندێشەی ئەو کراوەتەوە.

لەبەر ئەوە، دەگونجێ موریدێکی خاوەن ئیخلاسی شێخێکی ناکامڵ، لە شێخەکەی کامڵتر بێت و بۆ ڕابەرایەتی کردنی شێخەکەی لێ ببڕێت و ببێت بە شێخی شێخەکەی!

## یادخەرەوەی چواردەهەم

ئەم یادخەرەوەیە (چوار) هێمای بچووکی تێدایە، تایبەتن بە "تەوحید"ەوە:

✿ هێمای یەکەم:

ئەی مرۆڤی هۆکارپەرستی پشت بەهۆ بەست!

بزانە کە تۆ شوێن کڵاوی بابردوو کەوتوویت! چونکە گەر بە چاوی خۆت کۆشکێك ببینیت کە لە چەندین گەوهەری سەیر و نامۆ بنیات بنرێت و، هەندێ لەو گەوهەرانەش لە کاتی بنیاتنانی کۆشکەکەدا لە وڵاتی چین و هەندێکی تری لە ئەندەلوس و هەندێکی تری لە یەمەن و هەندێکی تری لە سیبیریا نەبێت لە شوێنی تر دەست نەکەون، ئنجا بە چاوی خۆیشت ببینیت کە بە جوانترین شێوە کۆشکەکە بەو گەوهەرانە بنیات بنرێت و لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باکوور و باشوورەوە و بەوپەڕی خێرایی و لە هەمان ڕۆژدا ئەو گەوهەرانەی بۆ ئامادە بکرێت.. ئەگەر بە چاوی خۆت ئەمە ببینیت، ئایا هێشتا هەر گومانت لەوەدا دەبێت کە توانستی وەستای بنیاتنەری ئەو کۆشکە بەسەر هەموو گۆی زەوی‌دا زاڵ و بەدەستەڵاتە؟

بە هەمان جۆر، هەموو بوونەوەرێك، بە تایبەتی "مرۆڤ" خانووبەرە و کۆشکێکی خوایی‌یە، چونکە مرۆڤ جوانترین و سەرسوورهێنەرترینی ئەو گشت کۆشکانەیە. ئەوەتا هەندێ لە بەردە گرانبەهاکانی ئەو کۆشکە هی جیهانی "ڕۆح"ن و، هەندێکی

تریان هی "جیهانی میسال" و، "لەوحی مەحفووز" و، بەشێکی تریان هی جیهانی "هەوا" و، جیهانی "نوور" و، جیهانی "توخمەکان"ن..

ئنجا - جگە لەمەش - پێداویستی‌یەکانی ئەم کۆشکە (واتە مرۆڤ) تاکو "هەتاهەتایی" درێژخایەنن و، ئاواتەکانیشی بە هەموو کەنار و گۆشەیەکی زەوی و ئاسمانەکاندا بڵاوبوونەتەوە و، پەیوەندی‌یەکانیشی لە ناخی گشت چینەکانی دنیا و قیامەتدا ڕیشکیان داکوتاوە.

دەسا ئەی ئەو مرۆڤەی کە خۆی بە مرۆڤ دەزانێت!

تۆ کۆشکێکی گەلێ سەرسوورهێنەر و بینایەکی یەکجار سەیر و نامۆیت. جا مادەم چییەتی(ماهیة)ی تۆ بەم جۆرەیە، ئەوا بەدیهێنەرت تەنها ئەو کەسەیە کە (بە چەشنی ئاسانیی گواستنەوەی نێوان دوو مەنزڵ و دەست تێوەردان لە کاروبارياندا) دنیا بۆ قیامەت دەگوێزێتەوە و کاریان ڕادەپەڕێنێت. هەروەها (بە ئەندازەی ئاسانیی هەڵدانەوەی دوو لاپەڕەش) ئاڵوگۆڕ لە زەوی و ئاسمانەکاندا دەکات و، هێندەش بە ئاسانی دەست لە "ئەزەل" و "ئەبەد" وەردەدات کە دەڵێیت ئەم دوانە - لای ئەو - وەك "دوێنێ" و "سبەینێ" وان!

کەواتە جگە لەو کەسەی کە فەرمانڕەوای زەوی و ئاسمانەکانە و دنیا و قیامەتی بەدەستە، کەسی تر ڕزگارت ناکات و شایانی ئەوە نی‌یە کە تۆ بیپەرستیت و هانای بۆ لا بەیت!

✿ هێمای دووهەم:

هەندێ کەسی نەفام کە "خۆر" نەناسێت گەر وێنەی خۆر لەناو ئاوێنەدا ببینێت، ئەو خۆشەویستی‌یەی کە بۆ خۆر هەیەتی یەکسەر ئاراستەی ئاوێنەکەی دەکات. لەبەر ئەوە، بە هەڵپەیەکی زۆرەوە و لە پێناوی هێشتنەوە و لەدەست نەچوونی خۆرەکەدا پارێزگاریی ئاوێنەکەی دەکات!

بەڵام گەر پەی بەوە بەرێت کە: بە تێکشکان و مردن و نەمانی ئاوێنەکە خۆرەکەی نامرێت و لەناوناچێت، ئەوا ڕاستەوخۆ خۆشەویستی‌یەکەی ئاراستەی ئەو خۆرە دەکات کە لە ئاسماندایە. ئنجا هەست دەکات کە خۆری ناو ئاوێنەکەی شوێنکەوتەی ئاوێنەکە نی‌یە و مانەوەشی بە مانەوەی ئاوێنەکەوە بەند و پەیوەست نەکراوە، بەڵکو - لە

ڕاستی‌دا – مانەوەی ورشە و پرشنگ و بریسکانەوەی ئاوێنەکە پشت بە مانەوە و ڕووبەڕوو بوونەوەی درەوشانەوەکانی خۆرەوە دەبەستێت. کەواتە مانەوەی ئاوێنەکە بە مانەوەی خۆرەوە بەندە، نەك بە پێچەوانەوە.

دەسا ئەی کاکی مرۆڤ!

"دڵ" و "کاکڵە" و "چییەتی"ی تۆ ئاوێنەیە. ئەو خۆشەویستی و حەزکردنەشت لە "مانەوە" کە لە سروشتتدا ڕیشکی داکوتاوە، لە پێناوی درەوشانەوەی ناوی: "الباقي"ی خواوەندی شکۆمەنددایە، کە ناوێکە بە گوێرەی ئەندازەی توانا و لێهاتنی هەر مرۆڤێك لە سروشتی ئەو مرۆڤەدا دەدرەوشێتەوە. بەڵام ئێستا ئەنجامی گێلی و گەلحۆیی مرۆڤە کە ڕووی ئەو خۆشەویستی‌یە بەرەو لایەکی تر ئاراستە کراوە!

جا مادەم وایە، ئەوا هەردەم بڵێ: "یا باقي أنـت البـاقي" چونکە مادەم تۆ – ئەی خواوەندی باقی! – هەیت و دەمێنیتەوە، ئیتر "نەمان" چیمان پێ دەکات با بیکات، هەرچی‌یەکمان بهێنێتە ڕێ ئێمە گوێی نادەینێ!

✿ هێمای سێ‌هەم:

کاکی مرۆڤ! یەکێك لەو شتە سەیرانەی کە بەدیهێنەری دانا لە ماهییەتی تۆدا دایناوە، ئەوەیە کە:

هەندێ کاتی وا هەیە لەم دنیا فراوانەدا جێت نابێتەوە و وەکو بەندکراوێك لە بێزاری‌دا خەریك بێت بخنکێت بێزار دەبیت و دەڵێیت: "ئۆف..ئۆف" بە دوای جێ‌یەکی لە دنیا فراوانتردا دەگەڕێیت! کەچی کاتی واش هەیە لەناو تۆوە خەرتەلەیەك، یان ختوورەیەك کە بە دڵتدا بێت، یان لەناو شتێکی ورددا، جێت دەبێتەوە بە ڕادەیەکی وا کە تیای‌دا ون دەبیت!

هەروەها "دڵ" و "بیر"ت کە لەم دنیا زەبەلاحەدا جێ‌یان نابێتەوە، کاتی وا هەیە لەناو گەردیلەیەکی بچووکدا جێی خۆیان دەکەنەوە، بە وردترین و تیژترینی هەستەکانیشت لەناو ئەو ختوورەیەدا هاتوچۆ دەکەیت!

جا بەدیهێنەری دانا چەندین لەتائیف (واتە: چەندین لایەنی ناسك)ی ورد و مەعنەویی لە ماهییەتی تۆدا داناوە کە هەندێکیان گەر دنیا هەڵبلووشێت هێشتا هەر تێر نابێت. هەندێکی تریشیان جێی گەردیلەیەکیشی تێدا نابێتەوە و گەندەموویەك

هەڵناگرێت، چەشنی "چاو" کە جێی موویەکی تێدا نابێتەوە و، "سەر" کە چەندین کۆڵی قورس هەڵدەگرێت. جا ئەو لایەنە نەرم و ناسکە، جێی سەنگی تاڵە موویەکیشی تێدا نابێتەوە. واتە بارودۆخێکی زۆر کەمیش هەڵناگرێت کە لە گومڕایی و بێئاگاییەوە پەیدا بووبێت، بەڵکو پێی دەمرێت و تروسکایی لێ دەبڕێت..

کەواتە ئاگادار بە و بە ئەسپایی هەنگاو بنێ.. وریابە نوقم نەبیت.. نەکەی لە: پاروویەك، یان وشەیەك، یان بریسکانەوەیەك، یان ئاماژەیەك، یان بەرەڕووەکێك، یان ماچێکدا بخنکێیت و ناسکترین لەتائیفیشت لەگەڵتدا بخنکێن، لەوانەی کە دنیا قووت دەدەن!

چونکە چەندین شتی تابلێی وردی ئەوتۆ هەن کە لە ڕوویەکەوە دەتوانن مەزنترین شت لە خۆیاندا جێ بکەنەوە. گەر حەز دەکەیت لەمە دڵنیا بیت، فەرموو سەیری ئاوێنەیەکی بچووك بکە و بزانە چۆن ئاسمان بە هەموو ئەستێرەکانیەوە لە ناویدا نوقم دەبێت. یان سەرنجی "حافیظە"ی خۆت بدە کە ئەوەندەی تۆوە خەرتەلەیەکە، با بزانیت چۆن خواوەندی حەق زۆربەی ئەو شتانەی لە لاپەڕەی کردەوەکانی خۆت و تەمەنتدا هەن، لەودا تۆماری کردوون.

دەسا پاکی و بەرزی و بێگەردی بۆ ئەو بەدیهێنەرەی کە هێندە بەتوانایە و، ڕاگیرکەری هەموو شتێکی ناو گەردوونە!

✿ **هێمای چوارەم:**

**ئەی مرۆڤی دنیاپەرست!**

**ئەم دنیایەت کە پێت وایە فراوانە، لە ڕاستیدا وەك گۆڕێکی تەنگ وایە. بەڵام لەبەر ئەوەی دیوارەکانی لە ئاوێنە دروست کراون و وێنەکانی یەکتری‌یان تێدا دەردەکەوێت، ئەوا هەتا چاوت بڕ دەکات بە فراوانی دەزانیت!**

**هۆی ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە: دیواری لای ڕاست و دیواری لای چەپی ئەم دنیایە کە بریتین لە "ڕابوردوو" و " داهاتوو" هەرچەند هەردووکیان "نەبوو"ن، کەچی وەك ئاوێنە وان؛ وێنەی یەکتریان تێدا دەردەکەوێت و، دوو باڵی کاتی تەسك و کەم و کورتی "ئێستا" لەو دوو ئاوێنەدا فراوان دەردەکەون. ئا لێرەوە "ڕاستی" تێکەڵی "ئەندێشە" دەبێت و، دنیا "نەبوو"وەکەی لە بەرچاودا دەبێت بە "بوو"..**

هەروەك ئەگەر هێڵێکی ڕاست - کە تابڵێی باریکە - بە خێرایی بجووڵێنرێت، وەك تەختاییەکی فراوان لە بەرچاودا دەردەکەوێت، دنیاکەی تۆش وەهایە، لە ڕاستیدا گەلێ تەنگ و تەسکە. بەڵام بەهۆی گومانی ئەندێشەت و بە بۆنەی بێئاگاییتەوە دیوارەکانی لە یەکتر دوور کەوتوونەتەوە و مەوداکەشی فراوان بووە. بە ڕادەیەك کە ئەگەر گیروگرفتێك بێتە ڕێت و لەتاوا سەر بجوولێنیت، سەرت بەر ئەو دیوارە دەکەوێت کە تۆ پێت وابوو گەلێ دووره لێتەوە! ئنجا ئەندێشەکەت دەفڕێت و خەوەکەشت لێدەزڕێت و دەبینیت دنیا فراوانەکەت گەلێ لە گۆڕ تەنگ و تەسکترە و، دەشزانیت کات و تەمەنت لە هەورە بروسکە زۆر خێراترە و ژیانیشت لە ڕووباری ئاو گەلێ بەخوڕترە!

جا مادەم ژیانی دنیا و گوزەرانی ماددی و ژینی ئاژەڵی ئا بەم جۆرەیە، ئەوا خۆت لە ئاژەڵێتی داماڵە و دەست لە ماددیگەری دابشۆ و، بە پلەکانی ژیانی "دڵ"دا سەربکەوە.. ئەو کاتە ژیانێکی گەلێ فراوانتر و جیهانێکی یەکجار بەرینتر دەبینیت لەچاو ئەوەی کە پێشتر لە جیهانە فراوانەکەتدا گومانت دەبرد.

کلیلی ئەو جیهانە یەکجار فراوانەش بریتییە لە: ناسینی خوا و "زمان" خستنەگۆ و "دڵ" بزواندن و "ڕۆح" خستنەکار بەو واتا و نهێنییانەی کە لە وشەی پیرۆزی "لا إلــــه إلاّ الله"دا هەن.

## یادخەرەوەی پازدەهەم

بریتییە لە سێ مەسەلە.

❐ مەسەلەی یەکەم[1]:

ئەی ئەو کەسەی دەیەوێت بەڵگەیەك لەسەر ڕاستیی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە ببینێت کە ئاماژە بۆ درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی جوانی: "الحفیظ"ی خوای گەورە دەکەن:

---

(١) بەڵام مەسەلەی دووهەم و سێهەم و یادخەرەوەکانی تر، دانەر لەم نامیلکەیەدا داینەناون. بەڵکو هەریەکەیانی کردووە بە پەیامێکی سەربەخۆ، وەك پەیامەکانی: "ئیخلاس و، پۆشتەیی(حیجاب) و، سروشت و، سێ ئاماژەکان...هتد". (وەرگێڕ)

﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ ۞ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ (الزلزلة:٧-٨)!

درەوشانەوەی هەرە تەواوی ناوی "الحفیـــظ"ی خوای گەورە و، هاووێنەی ئەو ڕاستی‌یەی کە لەم دوو ئایەتەدا هەن، لە هەموو شوێنێکدا پەرش و بڵاون. دەتوانیت بۆ خۆت لە ڕێی بیرکردنەوە و سەرنجدانی لاپەڕەکانی کتێبی بوونەوەرانەوە هەستی پێ بکەیت. ئەو کتێبەی کە بە کێش و سەنگ و ڕاستە و پێوانەی "کیتابی موبین" نووسراوەتەوە.

فەرموو - بۆ نموونە - پڕی مشتێك تۆوی جۆراوجۆری گوڵ و درەختە هەمەچەشنەکان هەڵبگرە، کە تێکەڵ و پێکەڵن و لە ناوەڕۆکدا لە یەك جیاوازن و بەڵام لە قەبارە و شێوەدا لە یەك دەچن. پاشان ئەو تۆوانە لە تاریکستانی گڵێکی ساکاری بێ گیاندا بنێژە، ئنجا بەو ئاوەی کە توانای هەڵسەنگاندنی نی‌یە و شتان لێك جیا ناکاتەوە و بەرەو هەر لایەك ئاراستەی بکەیت دەڕژێت و دەڕوات، ئاودێریی بکە.. پاشان لە وەرزی بەهاردا - کە گۆڕەپانی حەشر و زیندوو بوونەوەی ساڵانەیە - سەری لێ بدە و بە سەرنجەوە سەیری بکە و بزانە کە چۆن مەلائیکەتی هەورە بروسکە - وەکو ئیسرافیل - بۆ بانگێشت کردنی باران فوو بە شەیپوورەکەی‌دا دەکات و مژدەی زیندووبوونەوەی پاش مردن بە تۆوە نێژراوەکانی ژێر گڵی زەوی دەدات!

ئەوەتا بە چاوی خۆت دەبینیت ئەو تۆوانە، کە لەوپەڕی تێکەڵی و لەیەکچووندان، لەبەر تیشکی ڕوونـاکیی درەوشانەوەی ناوی "الحفیـــظ"دا گوێڕایەڵیی بێ هەڵە و تەواوی ئەو فەرمانە تەکوینی‌یانە دەکەن کە لە لایەن بەدیهێنەری دانایانەوە بۆیان دێت، ئیتر هەموو کارو هەڵسوکەوتێکیان لەگەڵ ئەو فەرمانانەدا دەگونجێنن و ڕێکیان دەخەن، بە چەشنێ کە بریسکانەوەی کەماڵی: دانایی و، زانین و، ویست و، مەبەست و، هەست و نەستیان تێدا هەست پێ دەکرێت.

ئایا نابینیت ئەو تۆوە تێکەڵ و لەیەکچووانە چۆن ئێستا لە یەکتری جیا دەبنەوە و هەریەکەیان شێوەیەکی جیاواز لەوانی تر وەردەگرێت؟ ئەوەتا ئەم تۆوەیان بووە بە درەختێکی هەنجیری ئەوتۆ نیعمەتەکانی بەدیهێنەری دانای خۆی بەسەر لق و پەلەکانی‌دا پەخش کردووەتەوە و بە دەستی پەلەکانی پێشکەشمانی دەکات..

یان سەیری ئەو دوو تۆوە لەیەکچووانە بکە کە یەکێکیان بووە بە گوڵەبەڕۆژە و ئەوی تریان بە گوڵەوەنەوش، ئەمانە و هاووێنە زۆرەکانی تریان لەو گوڵە قەشەنگ و ناسك و خەملاوانەی کە خۆیان بۆ ئێمە ئارایشت داوە و بە ڕوویەکی گەشەوە بۆمان دەڕوانن و خۆیانمان لە لا خۆشەویست دەکەن..

هەروەها چەندین وردیلە تۆوی تر دەبینیت کە ئێستا بوون بە چەندەها میوەی تام خۆش و بەلەزەتی ئەوتۆ کە ئێمەی مرۆڤ حەزمان لێیانە..

یان بوون بە چەند گوڵە دانەوێڵەیەکی پڕ و چەند نەمامە درەختێکی تازە پێگەیشتوو کە بە: تام وچێژە بەلەزەتەکانیان و بۆن و بەرامەی عەترینیان و ڕوخسار و لەشولارە ناوازەکانیان خولکمان دەکەن و بەرهەمەکانیانمان پێ دەبەخشن، تاکو لە پلەی ژیانی ڕووەکی‌یەوە پلەیەك زیاتر بەرز ببنەوە و سەربکەون و پلەی ژیانی زیندەیی بەدەست بهێنن.

ئەم تۆوانە بە ڕادەیەکی وا فراوان گەشەیان کردووە و پەرەیان سەندووە کە ئەو لەوێچە تۆوە بە فەرمانی بەدیهێنەریان چەندین گوڵی جۆراوجۆر و درەختی هەمە چەشنیان بەرهەم هێناوە و باخچەیەکی بەگوڵ خەملاوی ڕەنگین و بەهەشتێکی ڕازاوەی بەرینیان سازداوە. سەرنج بدە و بزانە ئایا هیچ هەڵە و ناتەواوی‌یەك دەبینیت:

﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾ (الملك:٣)؟

هەریەك لەو تۆوانە، بە بۆنەی لێ درەوشانەوە و چاکەکاریی ناوی جوانی "الحفیظ"ی خوای گەورەوە، هەموو ئەو شتانەی دەرخستووە کە لە بنەچە و باپیرانیەوە بە میرات بۆی بەجێ ماوە، بێ ئەوەی گرفتاری هیچ جۆرە ناتەواوی و هەڵە و لێ تێکچوونێك ببێت..

جا ئەم خواوەندە پارێزکارەی کە ئەو پارێزگاری کردنە خاوەن ئیعجازە بە ڕوونی ئەنجام دەدات، بەم کارەی ئاماژە بۆ درەوشانەوەی هەرە مەزنی "پارێزکاری"ی ڕۆژی حەشر و قیامەتی هەرە مەزن دەکات.

بەڵێ، دەرخستن و پیشاندانی کەماڵی "پاراستن" و "چاودێری"ی خواوەند لەم شتە کەم نرخ و فانی و لەناوچووانەدا، بێ هیچ ناتەواوی‌یەك، بەڵگەیەکی گەلێ گرنگ و

بەهێزە لەسەر ئەوەی کە ئەو خواوەندە شتانی زۆر لەوە گەورەتر و گرنگتر و کاریگەرتر دەپارێزێت و لێیان دەپرسێتەوە، چەشنی ڕەفتاری جێنشینانی گۆی زەوی و گوفتاری هەڵگرانی ئەمانەت و، چاکە و خراپەی بەندەکانی خوای گەورەی تاك و تەنیا.

﴿أَيَحْسَبُ الإِنْسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدَى﴾ (القيامة:٣٦)؟

ئایا مرۆڤ وا گومان دەبات پشتگوێ دەخرێت و لێپرسینەوەی نایەتەڕێ؟ نەخێر. مرۆڤ بۆ ژیانی هەمیشەیی زیندوو دەکرێتەوە و، دەستنیشان کراوی: بەختەوەریی هەمیشەیی یان بەدبەختیی هەتاهەتایییە و، لەسەر کەم و زۆر و گەورە و بچووکی ڕەفتار و گوفتارەکانی بەرپرسیارە. ئیتر لە ئەنجامدا: یان پاداشتی کردەوەی چاك وەردەگرێت، یان سزا و تۆڵەی ڕەفتارە چەواشەکانی دەچێژێت.

بەم جۆرەی کە بینیمان، چەندەها بەڵگە و نیشانە و شایەتیی لەسنووربەدەر هەن لەسەر درەوشانەوەی ناوی "الحفيظ"ی خوای گەورە.

ئەم نموونەیەی کە دەتوانیت نموونەی تری لەسەر بدۆزیتەوە، مشتێکە لە خەروارێك و.. لەوێچێکە لە دەریایەك و.. دەنکە لمێکە لە بیابانێك و.. خاڵێکە لەسەر گۆنای تەپۆڵکەکانی ناو دەشتاییەك و.. دڵۆپێکە لە بارانی بە لیزمە و زوڵاڵی ئاسمانی بەهارێك!

کەواتە، بەرزی و جوانی و خاوێنی بۆ ئەو خوایەی کە پارێزەر و چاودێر و ئاگادارە و، لە هەموو شتێك دەپرسێتەوە!

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

* * *

# بریسکەی هەژدەهەم

به پشتیوانیی خوای گەورە لە ناوەندی کۆمەڵە پەیامێکی تردا دادەنرێت

# بریسکەی نۆزدەهەم

پەیامی دەست پێوەگرتن (الإقتصاد)

(ئەم پەیامە گرۆی مرۆڤ بۆ دەست پێوەگرتن و قەناعەت هان دەدات و، لە ئەنجام و زیانەکانی ئیسراف و هەڵەخەرجیش بێداریان دەکاتەوە)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا﴾ (الأعراف:٣١)

**(ئەم ئایەتە پیرۆزە دەرسێکی گەلێ گرنگ دەڵێتەوە و، بە ڕەوانی و دانایی و لە شێوازی ئەمر و فەرماندا ڕێنمایی ئادەمیزاد بۆ لای دەست پێوەگرتن دەکات و، نەهی‌یەکی ڕاستەوخۆشی سەبارەت بە ئیسرافەوە تێدایە. ئەم مەسەلەیەش حەوت سەرنجی وردی لەخۆ گرتووە).**

❑ **سەرنجی یەکەم:**

بەدیهێنەری میهرەبان بەرامبەر بەو بەخشش و نیعمەتە زۆرانەی کە بە گرۆی مرۆڤی بەخشیون، داوای شوکر و سوپاسگوزاری‌یان لێ دەکات. کەچی "هەڵەخەرجی"ی مرۆڤ پێچەوانەی شوکرانەبژێریی خواوەندە و، جۆرە گاڵتەکردنێکی بەدئەنجامی زیانبەخشە بەرامبەر بە نیعمەتەکانی. بەڵام "دەست پێوەگرتن" هەروەك ڕێزنانە لەو نیعمەتانە، بە هەمان جۆر ئەنجامەکانیشی بۆ مرۆڤ بەپیت و سوودبەخشن.

بەڵێ، "دەست پێوەگرتن" هەروەك شوکرێکی مەعنەوی‌یە، لە هەمان کاتدا ڕێزنانیشە لەو میهرەبانی‌یەی خوای گەورە کە لە دووتوێی نیعمەت و بەخششەکانی‌دان. هەروەها هۆیەکی بێ‌گومانی بەرەکەتە و، چەشنی پارێز مایەی لەشساغی‌یە و، ڕێی گەیشتنە بە

عیززەت و سەربەرزی بە بۆنەی خۆ دوورگرتن لە ڕسوایی و زەلیلیی سوالّی مەعنەوی و، هۆکارێکی بەهێزە بۆ هەست پێ کردنی ئەو تام و چێژانەی کە لە ناوەندی نیعمەتەکاندان و، هۆیەکی گەلێ توندوتۆڵ و پتەویشە بۆ چەشتنی لەزەتی حەشاردراوی نێوان ئەو چەشنە نیعمەتانەی کە بە ڕواڵەت بێتام و بێ لەزەت دیارن!

جا لەبەر ئەوەی "ئیسراف" پێچەوانەی ئەو دانستە ناوبراوانەیە، ئەوا ئاکامی گەلێ زیانبەخشی لێ دەبێتەوە.

❑ **سەرنجی دووهەم:**

بەدیهێنەری دانا جەستەی مرۆڤی لە شێوەی کۆشکێکی تەواو کامڵ و بە چەشنی شارێکی یەکجار ڕێکوپێك بەدی هێناوە. ئنجا "هەستی چەشتن"ی ناودەمی ئەوی وەك دەرگاوان و پاسەوان داناوە و، لوولە و دەمارەکانی لەشی ئەویشی بە وێنەی تەلی تەلەفۆن و تەلگراف دروست کردووە (چونکە هەواڵ بەیەکدانی نێوان "هێزی چەشتن"ی ناو زمان و "گەدە" - کە لە مەڵبەندی قەوارەی مرۆڤدایە - لە ڕێی ئەوانەوە ئەنجام دەدرێت). ئەوەتا هەر شتێك دەچێتە ناو دەمەوە یەکسەر هەستیاری "چەشتن" بە گەدەی ڕادەگەیەنێت و، ڕێ لەو شتانەش دەگرێت کە زیانیان تێدایە و، جەستەی مرۆڤ پێویستی پێیان نییە. ئیتر ڕێ بەو شتانە نادات بڕۆنە ناو گەدە و لەشەوە و دەریان دەکات و پێیان دەڵێت: "چوونە ژوورەوە قەدەغەیە"! تەنانەت هێندەی پێ ناچێت بە پاڵ پێوەنان و بێز لێ کردنەوە تف لە ڕووی هەموو ئەو شتانە دەکات کە سوودیان بۆ لەش تێدا نییە، چ جای ئەوانەی کە تاڵ و زیانبەخشن!

جا مادەم "هەستی چەشتن"ی ناو دەم ئەرکی پاسەوانێتی لە ئەستۆدایە و، لە ڕووی بەڕێوەبردنی جەستەشەوە "گەدە" بە فەرمانڕەوا و سەرگەورەی لەش دادەنرێت، ئەوا ئەو دیارییەی کە پێشکەش بە فەرمانڕەوای کۆشکێك دەکرێت گەر نرخەکەی سەد پلە بێت تەنها پێنجیان ڕەوایە بەو پاسەوانە بدرێت. تاکو لە خۆی بایی نەبێت و، کاری ئەستۆی لە یاد نەچێت و، دەرگا نەخاتە سەرپشت بۆ هەر گێرەشێوێنێك کە قورشێکی زیاتر بەرتیلی بداتێ!

ئێستا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە، وا گریمان دەکەین کە دوو پاروومان لەبەر دەستدایە، پارووبەکیان لە ماددەیەکی بەپێزی سوودبەخشە بۆ لەش - وەك هێلکە و

پەنیر – و نرخی یەك قورشە، بەڵام پارووەکەی تریان شیرینییەکە لە جۆرێکی نایاب کە بایی دە قورشە. لە ڕاستیدا ئەم دوو پارووە پێش ئەوەی بڕۆنە ناو دەمەوە یەکسانن و جیاوازییان نییە، هەروەها لە دوای ئەوەش کە ڕۆشتنە ناودەم و لە ڕێی قوڕگەوە بۆ ناو گەدە دابەزین لە ڕووی گەشەپێدان و خۆراك بەخشینیان بە جەستە هەردووکیان یەکسانن، تەنانەت پارووە پەنیرەکەی کە نرخی یەك قورشە لە چاو پارووەکەی تردا گەلێ باشتر خۆراك بە لەش دەبەخشێت و گەشەی پێ دەدات. کەواتە جیاوازیی ئەو دوانە تەنها لە: مەودای چاودێری و ڕازی کردنی "هێزی چەشتن"ی ناو زماندایە کە نیو خولەکیش ناخایەنێت!

دەبا ئیتر لەم نموونەیەوە پەی بە ڕادەی زیانی "ئیسراف" ببرێت و، مەودای ئەو بێنرخییەش لێکبدرێتەوە کە لە پێناوی بەدەستهێنانی لەزەتێکی نیو دەقیقەییدا دە قورش لە بریی یەك قورش خەرج بکرێت!

گەر بەم پێیە نۆ هێندەی ئەو دیارییانەی کە دەبێ بە فەرمانڕەوای کۆشکەکە ببەخشرێن، بە پاسەوانی دەرگاکە بدرێن، بێ هیچ گومانێك دووچاری لەخۆبایی بوون و چاوبرسێتیی دەکات و، لە ئەنجامدا هانیدەدات کە بڵێت:

"تەنها هەر خۆم فەرمانڕەوام"!

ئیتر هەر کەسێك بەخششێکی زۆرتر و لەزەتێکی زیاتری بداتێ، بەرەو ناوەوە بەڕێی دەکات! بەم ڕەفتارەی ئێرەشی ڕێسای ئەوێ تێك دەدات و، ئاگرێکی بە کڵپە و بڵێسەی تێدا هەڵدەگیرسێنێت و، خاوەنەکەی ناچار دەبێت کە هاوار بکات و بڵێت: "خێرا فریام بکەون.. بە زوویی بمگەیەننە لای پزیشك، تاکو بڵێسەی سەختی ئەم تایەم بۆ بکوژێنێتەوە".

کەواتە "دەست پێوەگرتن" و "قەناعەت" بە تەواوەتی لەگەڵ دانستی خوای گەورەدا تەبا و گونجاون، چونکە بە وێنەی پاسەوانێك دەڕواننە "هێزی چەشتن" و بەو ڕوانینە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و، لەم ڕێیەشەوە ئەو دەرگاوانە لە سنووری خۆی ڕادەگرن و، بە ئەندازەی ئەرکی ئەستۆی خۆی پاداشتی خەڵات دەکەن. بەڵام "ئیسراف" لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی ئەو دانستەوە ڕەفتار دەنوێنێت، ئەوا مرۆڤی هەڵەخەرج هەر بە زوویی زللەی بەئازاری ئەو هەڵەیەی دەچێژێت، چونکە لە ئەنجامی ئیسرافی ئەو

کەسەوە خۆراکە جۆراوجۆرەکان لەناو گەدەدا بە جۆرێکی ئازاربەخش تێکەڵ بە یەکتری دەبن و ئەم ئازارانەش ئیشتیهای ڕاستەقینەی خواردن لادەبەن و، ئەو کاتەش بە ئیشتیهایەکی درۆینەی دەستکرد خۆراکە جۆراوجۆرەکان دەخوات. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بە قورسی و سەختی ئەو خواردەمەنییانەی بۆ هەرس بکرێت!

❑ **سەرنجی سێهەم:**

نەختێك پێش ئێستا لە سەرنجی دووهەمدا وتمان: "هێزی چەشتن ئەرکی پاسەوانێتیی دراوەتێ". ئەمە گەلێ ڕاستە سەبارەت بەو بێئاگایانەی کە هێشتا لە ڕووی "گیان"ەوە پلەیان بەرز نەبووەتەوە و بە پلیکانەی شوکرانەدا سەرنەکەوتوون و بەرەوپێش نەڕۆیشتوون. بەڵێ، نابێ پەنا بۆ "ئیسراف" ببرێت و لە پێناوی لەزەت بەخشین بە "هێزی چەشتن"ی ناو زماندا دە هێندەی نرخی پێویست، بۆ خواردن خەرج بکرێت.

بەڵام "هێزی چەشتن" بەلای شوکرانەبژێرانی ڕاستەقینە و ئەهلی دڵ و حەقیقەت و کەسانی خاوەن بینایی ڕوونەوە، بە وێنەی چاودێر و پشکنەرێکی چێشتخانەکانی میهرەبانیی خوای گەورە وایە (وەك لە بەراوردەکەی وتەی شەشەمدا ڕوون کراوەتەوە). چونکە سەبارەت بەوان، ئەو کارەی کە "هێزی چەشتن" ئەنجامی دەدات و لە ڕێی تەرازووە ورد و هەستیارەکانی - کە بە ژمارەی خواردەمەنییەکانن - نرخ و بەهای نیعمەتەکانی خواوەند هەڵدەسەنگێنێت و ئاشنای سەرجەم جۆرە جیاجیاکانی دەبێت، تەنها لە پێناوی ئەوەدایە: گەدە و لەش بە چەشنێك لەو نیعمەتانە ئاگادار بکرێنەوە کە شوکرانەیەکی مەعنەوی بگەیەنێت و پێشکەشی خواوەندی بەخشندەی بکەن.

ئەرکی ئەستۆی "هێزی چەشتن" تەنها بە چاودێریی ماددیی لەشەوە بەند نییە، بەڵکو حوکمی ئەو کارەی لە سەرشانی ئەودایە گەلێ لە هی گەدە بەرزترە و پلە و پایەشی بڵند و باڵاترە، چونکە چاودێری و سەرپەرشتیی "دڵ و گیان و ژیری"شی لە ئەستۆدایە.

جگە لەمەش ئەو "هێزی چەشتن"ە، بە مەرجی ئیسراف نەکردن و بە نیازی ئاشنایی و ناسینی جۆرەکانی نیعمەتی خوای گەورە و بۆ مەبەستی "ئەنجامدانی ئەرکی شوکرانەبژێری"، دەتوانێت لە بەدەستهێنانی تام و لەزەتەکانیدا بەردەوام بێت، بە مەرجێ ئەو نیعمەتانە حەڵاڵ و ڕەوا بن و، هۆیەك نەبن بۆ سواڵ و زەلیلی و ڕسوایی.

واتە: دەتوانین بۆ نرخ شناسیی نیعمەتەکان و بۆ مەبەستی "شوکرانەبژێری" زمان و هێزی چەشتنمان بیخەینەکار.

وا ئەم ڕووداوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستی‌یە دەکات و، بە یەکێك لە کەرامەتەکانی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - دادەنرێت:

پیرەژنێکی هەست ناسکی دڵنەرمی میهرەبان کوڕێکی تاقانەی هەبوو، لەسەر دەستی شێخی گەیلانی‌دا - قُدِّسَ سِرُّهُ - خەریکی پەروەردە و پێگەیشتن بوو.

ڕۆژێکیان پیرەژنەکە ڕۆشت بۆ سەردانی کوڕەکەی. بینیی خەریکی خواردنی لەتە نانێکی ڕەشەوەبووی وشکە و، هێندەش سەرگەرمی ئەنجامدانی وەرزشی ڕۆحی‌یە کە بە جارێ جەستەی لاواز بووە! ئەم دیمەنە شەفەقەتی دایکی میهرەبانی بزواند و، گەلێ بەزەیی بە حاڵی‌دا هاتەوە و، ڕۆشت بۆ لای شێخی گەیلانی تاکو سکاڵای حاڵی کوڕەکەی لە لا بکات. کە گەیشتە ئەوێ بینیی شێخ خەریکی خواردنی مریشکێکی برژاوە!

هێندەش هەست نەرم و دڵ ناسك و زمان شیرین بوو کە خۆی پێ ڕانەگیرا و وتی: "ئەی شێخی بەڕێز! کوڕەکەم وەختە لە برساندا بمرێت، کەچی تۆش وا خەریکیت مریشك دەخۆیت"؟!

شێخیش لە بەرچاوی پیرەژنەکەدا ڕووی لە مریشکە برژاوەکە کرد و پێی وت: "قومي بإذن الله". یەکسەر خوای گەورە مریشکەکەی سەرلەنوێ زیندوو کردەوە و هاتە دەرەوەی سینی‌یەکەی بەردەستی شێخ.

ئەم هەواڵە لە لایەن گەلێ زانای باوەڕ پێ کراوەوە بە تەواتوری مەعنەوی پێمان گەیشتووە[1] و، یەکێك لە کەرامەتەکانی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - دەردەخات کە لە سەرجەمی جیهاندا کەرامەتەکانی ناوبانگیان هەیە.

یەکێك لەو قسانەی کە شێخی گەیلانی بەو پیرەژنەی وت ئەوە بوو کە: هەرکات کوڕەکەت گەیشتە ئەم پلەیە، با ئەویش مریشك بخوات.

---

(١) قال اليافعي رضي الله عنه: صحَّ بالسند المتصل إلى الشيخ القطب عبدالقادر الجيلاني رحمه الله: أن أم شاب عنده دخلت عليه وهو يأكل في دجاجة، فأنكرت أكله الدجاجة وإطعام ابنها أرذل الطعام، فقال لها: إذا صار ابنك بحيث يقول لمثل هذه الدجاجة: قومي بإذن الله، فقامت ولها أجنحة وطارت بها حق له أن يأكل الدجاج. (الفتاوى الحديثية لابن حجر ص ٨٠). (وەرگێر لە کتێبی: "اللمعات"ەوە ص ٢١٤ هیناویەتی)

ناوەرۆکی ئەم فەرمانەی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِرُّهُ - بریتییە لەوەی کە: هەر کاتێك "گیان"ی کورەکەت بوو بە فەرمانڕەوای "جەستە"ی و، "دڵ"یشی جڵەوی "دەروون"ی بەدەستەوە گرت و، "ژیری"شی بەسەر "گەدە"یدا زاڵ بوو؛ لەبەر "شوکرانەبژێری"ی خوای گەورە بە دوای "لەزەت"دا دەگەڕا.. ئەو کاتە، هەر خواردنێکی حەڵاڵی بەتام ولەزەت دەخوات با بیخوات، نۆشی گیانی بێت!

❑ سەرنجی چوارەم:

مرۆڤی دەستپێوەگر دووچاری هەژاری و دەستکورتیی گوزەران نابێت، وەك لە فەرموودەی پیرۆزی: "لا یعول من اقتصد"ەوە[1] دەردەکەوێت. بەڵێ، بەڵگەی گومانبڕی زۆر و زەبەندە هەن لەسەر ئەوەی کە: دەست پێوەگرتن هۆکارێکی بێ گومانی نازڵبوونی بەرەکەتە و بناغەیەکی پتەویشە بۆ ژیان و گوزەرانی باشتر. لەسەر ئەمەش نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە کە لە خۆمدا دیومە و هەموو ئەو کەسانەش شایەتن لەسەری کە لەم خزمەتگوزارییەدا هاوکارییان کردووم و بە ئیخلاس و بێ گەردی هاوڕێم بوون:

هەمیشە بەهۆی دەست پێوەگرتنەوە، چ من و چ هاوڕێکانم دە قات بەرەکەتمان دەست دەکەوت. تەنانەت چەند کەسێك لەو سەرۆك هۆزانەی کە نۆ ساڵ پێش ئێستا[2] لەگەڵ مندا بۆ شاری "بوردوور" ڕەهەندە کرابوون، گەلێ هەوڵیان دا و جەختیان لێ کردم کە زەکاتەکانیان لێ وەربگرم، تاکو لەبەر کەمیی پارەکەم گرفتاری "نەبوونی" نەبم و زەلیلیم بەسەردا نەیەت. منیش بەو سەرۆك هۆزە دەوڵەمەندانەم وت: "هەرچەند پارەکانم کەمن، بەڵام من دارای قەناعەت و دەست پێوەگرتنم و لە ئێوە گەلێ دەوڵەمەندترم"! بەم جۆرە، داخوازییە دووپاتبووەکانیانم گێڕایە دواوە.

شایانی باسە کە هەندێك لەو کەسانەی ویستیان زەکاتیان لێ وەربگرم، لەبەر ئەوەی پابەندی "دەست پێوەگرتن" نەبوون، پاش دوو ساڵ "قەرزاری" یەخەی پێ گرتن! بەڵام ئەو پارە کەمەی من - سوپاس بۆ خوا - بەهۆی بەرەکەتی دەست پێوەگرتنەوە تاکو حەوت ساڵی دوای ئەوەش بەشی کردم و، ئاوی ڕووم دانەتکایە خوار و ناچاری ئەوەی

---

(١) "ما عال من اقتصد". رواه أحمد عن ابن مسعود. بڕوانە: (کشف الخفاء ٢/١٨٩، ١/١٥٨).

(٢) واتە: ساڵی ١٩٢٦ز. (وەرگێڕ)

نەکردم پێویستی و نەبوونیم لای خەڵکی بدرکێنم و، دەستووری ژیانیشمی لێ نەشێواندم، کە بریتی‌یە لە "پێویست نەبوونم بە خەڵکی".

بەڵێ، هەر کەسێك دەست پێوە نەگرێت، گەلێ نزیکە بەرەو هەڵدێری زەلیلی بکەوێتە خوارەوە و، وەختە پێیشی بۆ سواڵ و ڕسوایی مەعنەوی بخلیسکێت!

ئەو سامانەی کە لەم سەردەمەی خۆماندا لە زیادەڕەوی و ئیسرافدا خەرج دەکرێت، سەروەت و سامانێکی گەلێ زۆر و زیادە و، هەندێ جار شەرەف و کەرامەتیشی لە پێناودا دەدرێت بە بەرتیل! تەنانەت کاتی وا هەیە موقەددەساتی ئایینی زەوت دەکرێت و لە بەرامبەریەوە چەند پارچە دراوێکی بەدی شووم دەبەخشرێت. واتە: ئەو کەسە لەسەر حسابی سەدان لیرەی دراوی مەعنەوی، تەنها چەند قورشێکی ماددی وەردەگرێت!

بەڵام مرۆڤ گەر تەنها بایەخی بە پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکانی ژیانی بدایە و، ئەم پێداویستی‌یانەشی کەم بکردنایەتەوە و، گشت خەم و بیرێکی بە چڕی و خەستی لەو گۆشەیەدا جەم ببوونایە، ئەوا ڕۆزی‌یەکی وەهای دەستگیر دەبوو کە - بێ ئەوەی لە حسابیشیدا بووبێت - ژیانی بۆ مسۆگەر بکات، بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُوالقُوَّةِ الْمَتِينِ﴾ (الذاریات:٥٨). هەروەها ڕاشکاویی ئەم ئایەتە پیرۆزەش کە دەفەرموێ: ﴿وَما مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللهِ رِزْقُهَا﴾ (هود:٦) پەیمان و بەڵێنێکی بێ گومانی لەسەر ئەو ڕۆزی لەئەستۆ گرتنە، ڕاگەیاندووە.

بەڵێ، ڕۆزی دوو بەشە:

*بەشی یەکەم:* ڕۆزیی ڕاستەقینەیە، کە ژیانی مرۆڤی لەسەر بەندە و، بە حوکمی ئەم ئایەتە، پەروەردگار خستوویەتیە ژێر چاودێری و پەیمان و بەڵێنی خۆیەوە. بارودۆخ هەرچۆنێك بێت و بێ ئەوەش کە مرۆڤ ناچار ببێت ئایین و شەرەف و عیززەتی لە پێناودا بدۆڕێنێت، دەتوانێت ئەم بەشەی دەست بکەوێت، بە مەرجێ ویست و ئیختیاری هەڵە و سەرەڕۆی مرۆڤە کە لەو ڕۆزی‌یەدا خۆی هەڵنەقورتێنێت.

*بەشی دووهەم:* ڕۆزیی مەجازی‌یە. هەر کەسێك بە شێوەیەکی هەڵە و خراپ ئەم بەشە بەکار بهێنێت، ناتوانێت دەست لەو پێداویستی‌یانە هەڵبگرێت کە سەبارەت بەو ناچارەکی نین، بەڵام لە ئەنجامی گرفتاربوونی بە لاسایی کردنی خەڵکی‌یەوە، بۆ ئەو وەکو پێویستیی ناچارەکی‌یان لێ هاتووە. جا لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ڕۆزی‌یە بەڵێنەکەی

پەروەردگار – بۆ خستنە ئەستۆی ڕۆزی – نایگرێتەوە، ئەوا لەم سەردەمەدا بە نرخێکی گەلێ گران دەستگیر دەبێت، چونکە دەبێ ئەو کەسە بە زەلیلی ڕازی ببێت و لە پێشدا عیززەتی خۆی لەپێناودا بەخت بکات. بەڵکو هەندێ جار دەیگەیەنێتە ڕادەی کەوتنە خوارەوە لە هەڵدێری سوالی مەعنەوی و دابەزین بۆ ئاستی ماچکردنی قاچی کەسانێکی نزمی بێ نرخ. تەنانەت جاری وا هەیە تاکو موقەددەساتی ئایینیی خۆیشی – کە نووری ژیانی هەمیشەیی‌یەتی – بەخت نەکات، ئەو سەروەت و سامانە بێ بەرەکەت و شوومەی دەستگیر نابێت.

پاشان ئەو ئازارەش کە لە ڕووی هەست و سۆزی مرۆڤێتی‌یەوە کەسانی خاوەن ویژدان دەیچێژن، کاتێ بێ نەوا و هەژاران دەبینن بەدەم ئازارەوە دەتلێنەوە، لەم سەردەمەدا کە هەژاری و نەبوونی باڵی بەسەر خەڵکی‌دا کێشاوە، ئەم ئازارە بێ هیچ گومانێك، ئاوێتەی ئەو چێژ و لەزەتەیان دەبێت کە بە پارە و سامانی نارەوا پەیدای دەکەن، بگرە لەزەتەکەیان پتر لێ تاڵ دەبێت، گەر خاوەنی ویژدانی زیندوو بن.

لەم ڕۆژگار و سەردەمە سەیرەدا، تەنها لە سنووری ناچاریتی‌دا دروستە دەست بۆ سامانە گومان لێکراوەکان ببرێت، چونکە بەپێی قاعیدەی: "الضرورةُ تُقدَّرُ بقدرهــــا" دەکرێت هەتا سنووری "زەروورەت" – نەك زیاتر – بە ناچاری لە ماڵی حەرام هەڵبگیرێت و، مرۆڤی "ناچار" بۆی نی‌یە هەتا تێر دەبێت لە گۆشتی مردارەوەبوو بخوات، بەڵکو تەنها هێندەی بۆ دروستە لێی بخوات کە لە مردن بیپارێزێت. هەروەها نابێ لە بەردەم سەد کەسی برسی‌دا بە هەڵپەوە پەلاماری خواردن بدات!

لێرەدا ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەگێڕمەوە کە بەڵگەی ئەوەیە: "دەست پێوەگرتن" هۆی عیززەت و مایەی کەماڵە:

"حاتەمی تەی" کە بە سەخاوەت و بەخشندەیی بەناوبانگە، ڕۆژێکیان میوانداری‌یەکی گەورە ساز دەکات و، گەلێ دیاریی بەنرخیش بە میوانەکانی دەبەخشێت و، پاشان بەرەو دەشت و دەر دەڕوات. هەتا لەو بیابانەدا دەبینێت پیاوێکی پیری هەژار کۆڵێکی قورسی دار و گژوگیا و دڕك و داڵی لە کۆڵ ناوە و هەندێ شوێنی جەستەشی خوێنی لێ دەتکێت..

حاتەم پێی وت:

– مامە پیرە! ئەمڕۆ حاتەمی تەی میوانداری‌یەکی شکۆداری سازداوە و دیاریی بەنرخیش دەبەخشێتەوە. زوو بڕۆ فریای بکەوە، بەشکو چەندین ئەوەندەی کۆڵە قورسەکەت سەروەت و سامانت دەست بکەوێت!

مامە پیرەی ژیر و دەستپێوەگریش پێی وت:

– من بە عیززەتی دڵ و دەروونی خۆم و ڕەنج و ئارەقی ناو چاوانم دەژیم و، ئەم کۆڵە هەڵدەگرم و، ڕازی نابم ژێرباری منەتی حاتەمی تەی بکەوم!

جا ڕۆژێك لە حاتەمیان پرسی:

– کێت دیوە لە خۆت مەرد و بەڕێزتر بێت؟

وتی:

– ئەو مەردە پیرە دەستپێوەگرەی کە ڕۆژێك لە بیاباندا تووشی بووم. بە ڕاستی لە من گەلێ مەرد و بەڕێزتر بوو[1]!

### ❐ سەرنجی پێنجەم:

یەکێك لە خواستەکانی کەماڵی بەخشندەیی و کەرەمی خواوەند ئەوەیە کە: لەزەتی نیعمەتەکانی خۆی بە هەژارترین کەس دەچێژێت، کتومت وەك ئەوەی کە بە دەوڵەمەندترین کەسی دەچێژێت. ئەوەتا هەژاریش بە وێنەی پادشا تامیان دەکات!

بەڵێ، ئەو لەزەتەی کە بەهۆی برسێتی و دەست پێوەگرتنەوە کەسێکی هەژار لە خواردنی لەتە نانێکی وشکی سووتاو دەیچێژێت، زۆر لەو تام و لەزەتە زیاترە کە پادشا یاخود مرۆڤی دەوڵەمەند لە خواردنی شیرینی‌یەکی نایاب وەری دەگرێت کاتێ بە بێزاری و ئیشتیها لێ نەبوونی ئەنجامی "ئیسراف"ەوە دەیخوات!

بە ڕاستی گەلێ جێی سەرسووڕمانە کە هەندێ لە هەڵەخەرجان کەسانی "دەستپێوەگر" بە نزمی(الخسة) تاوانبار دەکەن! نەخێر، هەرگیز وا نی‌یە، بەڵکو دەست پێوەگرتن عیززەت و کەرەمی ڕاستەقینە و تەواوەتی‌یە و، نزمی و زەلیلیش لە ناوەڕۆك و دووتوێی ئەو سەخاوەتە ڕواڵەتی‌یەدان کە هەڵەخەرجان دەینوێنن.

ساڵی دانانی ئەم پەیامە، لە ژوورەکەی خۆم لە شاری "ئیسپارتە"دا، بەسەرهاتێك ڕووی دا، پشتی ئەم ڕاستی‌یە دەگرێت:

---

(١) ئەم بەسەرهاتە لە گولستانی شێخی سەعدی‌دا هاتووە. بڕوانە: (کلیات سعدی، به اهتمام محمد علی فروغی، ص ١٠٥ انتشارات امیر کبیر. تهران ١٣٦٩ هـ. ش. (وەرگێڕ)

یەکێ لە قوتابی‌یەکانم گەلێ ڕووی لێنام کە دەستووری ژیانم[1] بۆ ئەو بشکێنم و جەختی لێ کردم دیاری‌یەکەی وەربگرم کە بڕی دوو هۆقە و نیو هەنگوین بوو[2]. هەرچەند هەولّم دا بۆی ڕوون بکەمەوە کە دەبێ دەست لەو یاسایەی ژیانم هەڵنەگرم، بێ سوود بوو، قەناعەتی نەکرد. منیش بە ناچاری و بەو نیازەی سێ کەسی تێدا بەشدار بکەم کە لەو ژوورە لەگەڵمدا بوون، لێم وەرگرت، تاکو بۆ ماوەی چل ڕۆژی شەعبان و ڕەمەزان بە دەست پێوەگرتنەوە لێی بخۆن و خاوەنە بەخشەرەکەشی پاداشتی دەست بکەوێت و، ئەمانیش لەو ماوەیەدا بێ شیرینی نەمێننەوە. لەبەر ئەوە، وەسیّتم بۆ کردن وەری‌بگرن. ئنجا من بۆخۆیشم یەك هۆقە هەنگوینم هەبوو..

جا هەرچەند ئەو سێ هاوڕێیەم لەسەر "ئیستیقامەت" بوون و بە ڕاستی ڕێزی دەست پێوەگرتنیان دەزانی، بەلاّم - بە هەر حاڵ - لە ئەنجامی ڕێزنان لە یەکتری و چاودێری کردنی هەست و نەستی یەکتر و "إیثـلو"ی نێوانیان و چەند ڕەوشتێکی تری باش، ئەو ڕاستی‌یە ناوبراوەیان لە یاد چووەوە و، لە ماوەی تەنها سێ شەودا هەموو هەنگوینەکەیان تەواو کردا! منیش بە زەردەخەنەوە، پێم وتن:

من نیازم وابوو سی ڕۆژ یان زیاتر ئێوە تامی هەنگوین بچێژن، بەلاّم وا لە تەنها سێ ڕۆژدا تەواوتان کرد.. نۆشی گیانتان بێت!

کەچی هەنگوینەکەی خۆم بە دەست پێوەگرتنەوە بەشی هەردوو مانگی شەعبان و ڕەمەزانی کردم و، جگە لەوەش - سوپاس بۆ خوا - بوو بە مایەی دەستکەوتنی پاداشتێکی زۆر بۆم، چونکە هەریەك لەو برایانە لە دەمی بەربانگدا کەوچکێکم دەدانێ[3].

جا لەوانەیە کەسانێك کە ئەو حاڵەی منیان بینیبێت بە "نزمی" لە قەڵەمیان دابێت و، حاڵەتی سێ شەوەکەی ئەو برایانەش بە عیززەت و کەرەم دابنێت! بەلاّم ئێمە لە ڕووی حەقیقەتەوە بینیمان کە: لە ژێر پەردەی ئەو نزمی‌یە ڕواڵەتی‌یەدا عیززەتێکی بەرز و بەرەکەتێکی فراوان و پاداشتێکی زۆر حەشار دراون و، لە ژێر ئەو کەرەم و

---

(١) مەبەست لەو دەستوورەی ژیانی ئەوەیە کە: بە خۆڕایی هیچ دیاری و شتێکی لە کەس وەرنەگرتووە. (وەرگێڕ)

(٢) هەریەك لەو هۆقانە یەکسانە بە ٣٨٠ر١ گرام. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست کەوچکە چای گەورەیە (هی کووب). (دانەر)

ئیسرافەشەوە – گەر وازی لێ نەهێنرابێت – سوالکردن و چاو تێبڕین و تەماع بۆ شتی ناو دەستی خەڵکی و، حاڵەتەکانی تری هاوچەشنیان کە گەلێ لەو "نزمی"یە نزمترن، شارراونەتەوە!

❑ **سەرنجی شەشەم:**

مەودا و جیاوازی‌یەکی گەورە و فراوان لە نێوان "دەست پێوەگرتن" و "نزمی"دا هەیە. چونکە:

هەروەك "تەوازوع" کە ڕەفتارێکی باش و شیرینە، گەلێ جیایە لە "زەلیلی" کە ڕەفتارێکی هەڵە و خراپە، هەرچەندەش بە شێوە لە یەك دەچن..

هەروەها وەك: "ویقار" کە ڕەوشتێکی پەسەند و چاکە، لە واتا و کاکڵەی‌دا جیاوازە لە "تەکەببور" کە ڕەوشت و خوویەکی گەلێ بێ‌کەڵکە، هەرچەند لە ڕواڵەتیشدا وەکو یەك دەردەکەون..

هەروەك ئەمانە بەو جۆرەن، "ئیقتیصاد"یش کە یەکێکە لە خولق و خووە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو یەکێکە لە تەوەرەکانی هەڵسووڕانی ڕێسای دانستی زاڵ و فەرمانڕەوای خوای گەورە لە گەردووندا، بە هەمان جۆرە و، هەرگیز پەیوەندیی بە "نزمی"یەوە نی‌یە کە ئاوێتەیەکە لە: سووکی و زەلیلی و چاوچنۆکی و هەڵپەکاری. تەنانەت هەر هیچ پەیوەندی‌یەکیان لە نێواندا نی‌یە.

وا ئەم ڕووداوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە پشتی ئەو ڕاستی‌یە دەگرێت:

"عەبدوڵلا"ی کوڕی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب – خوایان لێ ڕازی بێت – کە کوڕە گەورەی فارووقی ئەعزەمی جێنشینی پێغەمبەرە ﷺ و، یەکێکە لە حەوت "عەبدوڵلا" ناوەکان و زانایەکی بەناوبانگ و مەزنی نێوان هاوەڵە بەڕێزەکانە، ڕۆژێکیان لەناو بازاڕدا و بۆ مەبەستی پارێزگاری کردنی "دەست پێوەگرتن" و "قەناعەت" و "ئیستیقامەت" کە تەوەرەی کەسابەت و بازرگانین، لە مامەڵەی شتێکدا کە قورشێکی نەدەهێنا، کەوتە مشتومڕێکی سەختەوە.

لەم کاتەدا هاوەڵێکی تر ئەمەی لێ بینی، وا گومانی برد کە ئەم ڕەفتارە "نزمی" بێت و، بە هەڵەیەکی گەورەی "عەبدوڵلا"ی ژمارد. چونکە کوڕی میری موسڵمانان و خەلیفەی سەرزەوی چۆن دەبێ ڕەفتاری بەو جۆرەی لێ بووەشێتەوە؟

پاشان دوور و نزیك شوێن "عەبدوڵلا" کەوت کە بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە، تاکو شتێك لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی تێبگات. سەرنجی دا لە بەردەرگا لەگەڵ هەژارێکدا ماوەیەك ڕاوەستا و بە نەرمونیانی و سۆز و خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا دوا. پاشان لە دەرگای دووهەم هاتە دەرەوە و بە هەمان شێوە لەگەڵ هەژارێکی تردا کەوتە گفتوگۆ!

ئەم کارە، سەرنجی تاسەی ئەو هاوەڵەی بزواند تاکو بزانێت "عەبدوڵلا" چیی لەگەڵ ئەوانەدا کردووە. لەبەر ئەوە، بە پەلە خۆی گەیاندە هەژارەکان و لێی پرسین:

– ئایا پێم نالێن "عەبدوڵلا" کە ڕاوەستا چیی لەگەڵ کردن؟

هەریەکەیان وتیان:

– پارچەیەك زێڕی پێبەخشیم!

هاوەڵە بەڕێزەکە لە سەرسووڕماندا وتی: "سبحان الله.. ئەم کارە چەندە سەیرە! لەو لاوە لەسەر یەك قورش لە بازاڕدا دەکەوێتە مشتومڕەوە و، کەچی لەم لاشەوە لە ماڵی خۆیدا و بە ڕەزامەندیی خۆی و بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت، سەدان ئەوەندە بەم هەژارانە دەبەخشێت"!

پاشان ڕۆشت بۆ لای "عەبدوڵلا"ی کوڕی حەزرەتی عومەر و لێی پرسی:

– ئەی ئیمام! ئەم گیروگرفتەم بۆ شی بکەرەوە: تۆ لە بازاڕدا بەو جۆرە ڕەفتارت کرد و، لە ماڵیشەوە ئاوا و ئاوا؟!

وەڵامی دایەوە و وتی:

– ئەوەی لە بازاڕ ڕووی دا ئەنجامی دەست پێوەگرتن و ژیری(حصافـــة) بوو، بۆیە لەوێدا وا ڕەفتارم کرد تاکو پارێزگاریی ئەمانەت و ڕاستگۆیی بکەم کە بناغە و گیانی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن و بازرگانین، ئەم کارە هەرگیز بە نزمی و ڕەزیلی دانانرێت. ئنجا ئەو ڕەفتارەش کە لە ماڵەوە بینیت لە سەرچاوەی دڵنەرمی و پلەی بەرز و کاملیی ڕۆحەوە هەڵقوڵاوە. کەواتە نە ئەو نزمییە و، نە ئەمیش ئیسرافە!

ئیمامی ئەعزەمیش – ئەبوو حەنیفەی نوعمان – خوای لێ ڕازی بێت، ئاماژەی بۆ ئەم نهێنییە کردووە کاتێ فەرموویەتی: "لا إسرافَ في الخير، كما لا خيرَ في الإسراف"! واتە: هەروەك کردەوەی خێر و چاکەکاری هەتا زیاتر بێت کارێکی باشە و بە ئیسراف

دانانرێت، بە هەمان جۆر ئیسرافیش هەرگیز بە کارێکی باش دانانرێت و هیچ خێرێکی تێدا نییە.

**❑ سەرنجی حەوتەم:**

"ئیسراف" هەڵپەکاری بەرهەم دەهێنێت و، هەڵپەش سێ ئەنجامی لێ دەبێتەوە:

*یەکەمیان*: قەناعەت نەکردنە.

جا لەبەر ئەوەی نەبوونی قەناعەت، مرۆڤی هەڵپەکار فێری "سکاڵا" دەکات لە بریی "شوکرانە"، ئەوا شەوقی مرۆڤ لە کار و کۆشش دوور دەخاتەوە و دەیهاوێتە باوەشی تەمبەڵییەوە و هانی دەدات کە واز لە ماڵ و سامانی هەرزان و دەستکەوتی حەلاڵ بهێنێت[1] و بۆ ئەو ماڵ و سامانە ناڕەوایانە بگەڕێت کە ئەرك و ماندووبوونی تێدا شك نابات. بەم جۆرە و لەم پێناوەدا عیززەت و ڕێزی خۆی دەدۆڕێنێت.

*ئەنجامی دووهەمی هەڵپەکردن*: نائومێدی و زەرەرمەندییە!

چونکە بە هەڵپەکردن ئامانجی مرۆڤە هەڵپەکارەکە لە کیس دەچێت و ڕەزای لای خەڵکی قورس دەبێت و لە یارمەتی و هاوکاریی کەسانی تریش بێبەش دەبێت. تا وای لێ دێت کە ناوەرۆکی ئەم وتە بەناوبانگەی تێدا بەرجەستە ببێت کە دەڵێت: "الحريصُ خائبٌ خاسر"!

کاریگەری و ئەنجامی "هەڵپە" و "قەناعەت" بەپێی دەستوورێکی گشتی و هەمەلایەنگر و بەردەوام لە جیهانی زیندەوەراندا دەست بەکارە.

بۆ نموونە:

"ڕووەکەکان" کە موحتاج و ناچاری ڕۆزین و بە دوایشیدا ناگەڕێن، بە هۆی ئەو قەناعەتە سروشتییەی کە هەیانە، ڕۆزییەکانیان دێن بۆ لایان! بەڵام "گیاندارە ئاژەڵەکان" کە بە هەڵپەوە بە دوای ڕۆزییەکەیاندا دەگەڕێن، زۆر بە زەحمەت و کەمێ دەستگیریان دەبێت! ئەم دوو دیاردەیەش ڕادەی زیانی گەورەی "هەڵپە" و، مەودای سوودی مەزنی "قەناعەت"مان بۆ دەردەخەن..

---

(١) چونکە بەهۆی دووری لە "دەست پێوەگرتن"ەوە گرۆی بەکاربەران(المستهلكون) زۆر دەبن و بەرهەم هێنەرانیش کەم دەبنەوە و، هەمووان چاو دەبڕنە دەرگای حکوومەت! ئەو کاتەش یەك بە یەکی کەناڵەکانی: پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ، کە تەوەرەی ژیانی کۆمەلایەتین، کەمی و نوشستی دەهێنن و، کۆمەڵیش لە ئەنجامدا نزم دەبێتەوە و هەرەس دەهێنێت و، سەری لە نەبوونی و هەژارییەوە دەردەچێت! (دانەر)

هەروەها منالّە لاواز و ساواکان، بە گشتی و بێ ئەوەی خۆیان هیچ حسابێکیان بۆ ڕۆزی کردبێت و بزانن لە کوێوە دێت، لە ئەنجامی ئەو قەناعەتەی کە زمانی حالّیان دەری دەبڕێت خۆراکێکی پوخت و نیانی - وەك شیر - لە دەمیاندا ڕۆ دەکرێت. کەچی ئاژەڵە گەورەکان بە هەلّپە و چاوچنۆکی‌یەوە هەلّمەت بۆ ڕۆزی‌یە کەم و چەپەلّەکەیان دەبەن! هەموو ئەمانەش ئەو دەعوایەمان دەچەسپێنن..

هەروەها حالّی ماسی‌یە دەبەنگ و قەلّەوەکان کە دارای قەناعەتێکی ئەوتۆن ڕۆزی‌یەکانیان بە دەست بگەیەنێت و، دەستەوسانیی ئاژەڵە زیرەکەکانی وەك ڕێوی و مەیموونیش لە بەدەستهێنانی تەواوەتیی ڕۆزی‌یەکەیان و مانەوەیان بە لاوازی، هەرچەندەش گەلێ هەلّپە و هەناسەبڕکێی بە دوادا دەکەن.. هەموو ئەمانە، ڕادەی ئەو ماندوویی و سەختی‌یە ئاشکرا دەکەن کە "هەلّپەکاری" بەرهەمی دەهێنێت و، مەودای ئەو حەوانەوە و خۆشگوزەرانی‌یەش دەردەخەن کە ئەنجامی "قەناعەتکاری"ن..

هەروەها کە جوولەکەکان بەهۆی هەلّپەکاری و مامەڵەکردنیان بە "سوو" و، بەکارهێنانی ساختە و فرتوفێڵ، هەمیشە ئەو ڕۆزی‌یە کەمەی مایەی بژێویان بێت لە ڕێگا نامەشرووعەکانەوە و هاودەم لەگەڵ زەلیلی و سووکی‌دا بەدەست دەهێنن. بەلاّم ئەو گوندنشینانەی کە خاوەنی قەناعەتن، هەمیشە ڕۆزیی مایەی بژێویان و ژیانی سەربەرزی و مەردانەیان بە ئاسانی دەست دەکەوێت. ئەمەش وەك نموونەکانی تر پشتی ئەم دەعوایەمان دەگرێت!

هەروەها دەبینین ئەو هەلّپەیەی کە زانایان[1] و ئەدیبان[2] لە ڕێی زیرەکی و بلیمەتی‌یەوە بەکاری دەهێنن گرفتاری هەژاری‌یان دەکات و تەنها گوزەرانی مایەی

(١) نەوشیروانی پادشای دادپەروەری ئێران لە بوزەرجەمهەری زانای پرسی: بۆچی زانایان لە دەرگای میرەکاندا دەبینرێن، بەلاّم میران لە دەرگای زانایاندا نابینرێن، لە کاتێکدا کە زانست لە ئەمیری بەرزترە؟!
وەلاّمی دایەوە: ئەوە نیشانەی زانایی زانایان و نەزانیی میرەکانە!
واتە: میران نرخی زانست نازانن، بۆیە ناڕۆنە دەرگای زانایان بۆ دەسخستنی زانست، بەلاّم زانایان بەهای دەزانن بۆیە لە دەرگای میرەکاندا داوای نرخەکەی دەکەن!
دیارە ئەم وەلاّمە وردە تەئویلێکی ژیرانەیە بۆ پاساودانی هەلّپەی زانایان کە هی زیرەکی‌یانە و، لە ئەنجامیشدا دەیانگەیەنێتە زەلیلی و هەژاری. (خەسرەو).
(٢) ئەو دیاردەیەی کە پشتی ئەم فەرمانە دەگرێت، ئەوەیە کە ئەدیبان لە فەرەنسادا بڕوانامەی "سوالکەری"یان دەدرێتێ، چونکە بە باشی تیای‌دا شارەزان! (سلێمان ڕوشدی).

بژێویان بۆ فەراهەم دەهێنێت، کەچی لەو لاشەوە دەوڵەمەندیی زۆربەی کەسانی دەبەنگ و دەستەوسان دەبینین کە بەهۆی حاڵەتی سروشتیی قەناعەت بەخشیانەوە دەستیان کەوتووە!

هەموو ئەم نموونانەی باسمان کردن، بە تەواوی و بێ گومانی دەیچەسپێنن کە:

ڕۆزیی "حەڵاڵ" بە ئەندازەی هەژاری و ڕادەی دەستەوسانی بە مرۆڤ دەبەخشرێن، نەك بەپێی توانا و ئیختیار!

تەنانەت هاتنی ڕۆزی هەمیشە پێچەوانەی توانا و ئیختیارە، نابینیت منالان هەتا ویست و توانا و ئیختیاریان زیاد بکات، ڕۆزییەکانیان کەم دەبنەوە و بە زەحمەت دەستیان دەکەوێت؟!

بەڵێ، "قەناعەت" گەنجینەیەکە بۆ خۆشگوزەرانی و، مایەی حەوانەوەی ژیانە. بەڵام "هەڵپەکردن" کانگای نزمی و زەرەرمەندییە، وەك لەم فەرموودە پیرۆزەدا دەردەکەوێت: "القناعةُ كنزٌ لايفنى"[1].

*ئەنجامی سێهەم:* هەڵپەکردن ئیخلاس دەفەوتێنێت و کاری دواڕۆژ دەشێوێنێت.

چونکە ئەگەر ئیمانداری خاوەن تەقوا گرفتاری "هەڵپەکاری" بێت، ئەوا لە دەروونەوە حەز دەکات خەڵکی ڕووی تێبکەن. خۆ دیارە هەر کەسێك ئەم ئارەزووەی تێدا سەر هەڵبدات و چاوەڕوانی بێت، هەرگیز بە پلەی ئیخلاسی تەواوەتی ناگات و ناتوانێت بەدەستی بهێنێت. ئەم ئەنجامە گەلێ گرنگە و شایانی تێبینی و سەرنجدانە.

**پوختەی ئەمانەی پێشوو:**

"ئیسراف" هەمیشە بێقەناعەتی (واتە: تەماع) بەرهەم دەهێنێت، تەماعیش چوست و چالاکیی شەوقی کارکردن کز دەکات و، مرۆڤ دەهاوێتە ئامێزی تەمبەڵی و کەمتەرخەمییەوە و، دەرگای سکاڵا و پەژارەی لە ژیاندا لێ دەخاتە سەرپشت، تا دەیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی کە هەمیشە لە ژێر ئازاری سکاڵا و بێزاریدا[2] بناڵێنێت.

---

(١) حديث: "القناعة مال لاينفد وكنــز لايفنى" رواه الطبراني في الأوسط والعسكري عن جابر. والمشــهور: "القناعة كنــز لا يفنى ".

(٢) بەڵێ، ئەگەر کەسێکی هەڵەخەرج بدوێنیت، بێهیچ گومانێك سکاڵای زۆر و زەبەندەی لێ دەبیستیت، دەبینیت هەرچەندەش دەوڵەمەند بێت، زمانی هەر سکاڵا دەردەبڕێت. بەڵام گەر هەژارێکی قەناعەتکار بدوێنیت، جگە لە شوکر و سوپاسگوزاریی خوای گەورە هیچی تری لێ نابیستیت. (دانەر)

هەروەك ئیخلاسەکەشی تێکدەدات و دەرگایەکی بۆ ڕیاکاری لێ دەخاتە سەر پشت و، لەم ڕێیەوە عیززەتەکەی دەشکێنێت و ڕێی سوالٌ و سووکایەتی و ڕسوایی پیشان دەدات.

بەڵام "دەست پێوەگرتن" هەمیشە بەری قەناعەت دەگرێت و، قەناعەتیش عیززەت بەرهەم دەهێنێت، بەپێی فەرمایشتی: "عزَّ من قنع ذلَّ من طمع". هەروەك لە ڕێی کار و کۆششەوە شەوقی مرۆڤیش تیژ دەکاتەوە و بەرەو هەوڵ و تێکۆشان لە کار و کۆششدا دەیداتە بەر، چونکە مرۆڤ گەر یەك ڕۆژ کاری کرد و ئێوارەکەی کرێی خۆی وەرگرت، ڕۆژی دووهەمیش هەوڵی کارکردن دەداتەوە. بەڵام مرۆڤی هەڵەخەرجی ئیسرافکار، لەبەر نەبوونی قەناعەت، ڕۆژی دووهەم ئەو هەوڵە نادات، خۆ ئەگەر هەوڵیش بدات ئەوا بێ هیچ شەوق و حەزێك دەیدات.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە ئەو قەناعەتەی ئاکامی دەست پێوەگرتنە، دەرگای شوکرانەبژێری لە مرۆڤ دەخاتە سەرپشت و هی سکاڵایشی لێ دادەخات و، لە سەرانسەری ژیانیدا دەیخاتە شوکرانەی بەردەوامەوە. ئنجا بەهۆی قەناعەتیشەوە ئاوڕ لەوە ناداتەوە کە خەڵکی بۆی بڕوانن و پلە و پایەی بۆ دابنێن، چونکە هەست دەکات پێویستی پێیان نییە و دەوڵەمەندە بەرامبەریان. بەوەش دەرگای ئیخلاسی لێ دەکرێتەوە و هی ڕیاکاریشی لێ دادەخرێت.

بە چاوی خۆم ئەو زیانە گەورانەم بە فراوانی و بەرجەستەیی بینی کە دەرەنجامی ئیسراف و گوێ نەدانن بە "دەست پێوەگرتن". وا لە خوارەوە بۆتان باس دەکەم:

نۆ ساڵ پێش ئێستا هاتم بۆ شارێکی بەپیت و بەرەکەت و، وەرزیش زستان بوو، نەمتوانی سەرچاوەی سەروەت و لایەنەکانی بەروبوومی ئەو شارە ببینم. مفتیی شار - خوا لێی خۆش بێت - پێی وتم: "خەڵکی شارەکەمان دەستکورت و هەژارن". چەند جارێکیش قسەکەی دووپات کردەوە. ئەم هەواڵە گەلێ کاری تێ کردم و سۆزی بزواندم و، تاکو نزیکەی شەش ساڵ خەم و ئازارم بۆ دەچەشتن و دوعای میهرەبانیم بۆ دەکردن. کە پاش هەشت ساڵ لە وەرزی هاویندا سەرم لەو شارە دایەوە و سەیری باخ و بێستانەکانیم کرد، قسەکەی مفتیی خوا لێخۆشبووم هاتەوە یاد. بە سەرسووڕمانەوە وتم:

سبحـان الله! خـۆ داهـات و بـەروبوومی بـاخ و بێستانەکانی ئـەم شـارە زۆر لـە پێداویستییەکانی هەموو خەڵکی شار زیاترن، دەبوو دانیشتووانی ئێرە گەلێ دەوڵەمەند بوونایە!! ماوەیەك لـەم سەرسووڕمانەدا بـووم. پاشـان لـە ڕێـی "ڕاسـتی"یەکـەوە (کـە ڕوالـەت نـەیتوانی بمخەڵـەتێنێت و ئـەو ڕاستییەم لـێ بشـارێتەوە، چونکـە حەقیقەتێکـە هەمیشە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان دەیکەم بە ڕابەر و ڕێنمای خۆم) تێ گەیشـتم کـە: لـە ئەنجامی ئیسـراف و دەسـت پێوەنەگرتنەوە بەرەکـەت لـەم شـارە هەڵـگیراوە! بۆیە مفتی - خوا لێی خۆش بێت - وتی: "خـەڵکی شـارەکەمان دەستکورت و هەژارن". سـەرباری ئەم هەموو سەرچاوە زۆرەی سەروەت و گەنجینەی داهاتیش کە لە شارەکەیاندا هەیە.

بەڵێ، بە تاقیکردنەوە و لێکدانەوەی چەندین ڕووداوی لە ژمارەبەدەر چەسپاوە کـە: زەکات دان و بایـەخدان بـە هۆکارەکـانی دەسـت پێوەگرتـن، هـۆی پیـت و بەرەکـەت و زیاد بوونی ڕۆزین. بەڵام ئیسراف و زەکات نەدان، بەرەکەت هەڵدەگرن.

"ئیـبن سینا" کـە ئـەفلاتوونی فەیلەسـووفە موسـڵمانەکان و، ڕابـەری پزیشـکان و، مامۆستای فەیلەسووفەکانە، لـە گۆشـەنیگای پزیشـکییەوە تەفسیری ئایـەتی پـیرۆزی: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا﴾ی بەم دێڕە شیعرانەی خوارەوە کردووە کە دەڵێت:

جمعتُ الطبَّ في بيتين جمـعاً  وحُسنِ القول في قِصَر الكلام
فقلّلْ إنْ أكلتَ، وبعـد أكلٍ  تجنَّبْ، والشِّفاءُ في الانـهضام
وليس على النفوس أشدُّ حالاً  من ادخال الطعام على الطعام

واتە: زانستی پزیشکیم لە دوو دێڕی شیعردا کۆکردووتەوە، دیارە جوانـترین وتـەیش ئەو گوفتارەیە کە بە کورتی و پوختی واتا بە دەستەوە بدات:

کە خۆراکت خوارد کەم بخۆ. پاشـان خـۆت لـە زیـادەخۆری بپارێزە. چونکـە شیفا لـەوەدایە خۆراك هەرس(هضم) بکرێت..

هیچ شتێك بۆ گەدە لەوە سەخت و قورستر نییـە کـە خواردنـی بەسـەر خواردنـدا بـۆ ڕەوانە بکرێت[1].

﴿سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنكَ أنتَ العليمُ الحكيم﴾.

(١) واتە: زیانبەخشـترین کـار بۆ لـەش ئەوەیە کە مۆڵـەتی چوار پێنج سـەعاتی بـە ژەمـەکانی خـواردن پێ نەدرێت و، بە خواردنی یەك لە دوای یەك گەدە پڕ بکرێت. (دانەر)

**تێبینی:**

وا ئەم تەوافوق(یەك کەوتن)ە سەرسوورِهێنەر و عییزەتبەخشەتان بۆ باس دەکەم:

پێنج شەش کەسی جیا جیا - کە سیانیان بە تەواوی نووسین نازانن - پەیامی ئیقتیصادیان نووسییەوە و، سەرنجمان دا: (هەموو پەنجا و یەك) ئەلفەکانی هەر یەك لەو نوسخانەی کە دوعایان تێدا نەنووسرابوو، هەروەها هەموو (پەنجا و سێ) ئەلفێکی ئەو نوسخانەش کە دوعایان تێدا نووسرابوو، وەکو یەك دەرچووبوون. هەرچەندەش جێگای ئەو نووسەرانە یەك جێگا نەبوون و، جۆری دەستخەتیشیان وەکو یەك نەبوون و، هەرگیز بیریشیان لەو ئەلفانە نەکردبووەوە!

جا یەککەوتن و وەکو یەك دەرچوونی ژمارەی ئەو پیتی ئەلفانە لەگەڵ مێژووی دانانی "پەیامی ئیقتیصاد" و پاکنووس کردن و لەبەر نووسینەوەی‌دا، کە بە مێژووی رۆمی پەنجا و یەك(١٣٥١)ە و، بە هی کۆچیش پەنجا و سێ(١٣٥٣)یە، بێ هیچ گومانێك ناکرێت بخرێتە ئەستۆی رِێکەوتەوە. بەڵکو ئەم تەوافوقە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە بەرەکەتی "دەست پێوەگرتن" تا پلەی کەرامەت بەرز بووەتەوە. بە رِاستی شایانی خۆیەتی کە ئەم ساڵە ناوی: "ساڵی دەست پێوەگرتن"ی لێ بنرێت!

بەڵێ، هەر لە رِاستی‌دا رِۆژگار بە کردەوە ئەم بەرەکەتی دەست پێوەگرتنەی چەسپاند، کاتێك گرۆی مرۆڤ، دوای دوو ساڵ، جەنگی جیهانیی دووهەمی بە خۆیەوە بینی. ئەو جەنگەی کە برسێتی و وێرانی و هەموو جۆرە قێزەونەکانی ئیسرافی لە گشت لایەکی جیهاندا بڵاو کردەوە و، مرۆڤایەتیی ناچار کرد کە لە دەوری "دەست پێوەگرتن" کۆ بنەوە و دەست لە داوێنی بەرنەدەن.

# بریسکەی بیستەم

## تایبەتە بە ئیخلاسەوە

**"ئـەم بریسـکەیە لـە سـەرەتادا خـاڵی یەکـەمی مەسـەلەی دووهـەمی یادخەرەوەی حەڤدەهەم بوو لە پەیامی "چەند یادخەرەوەیـەك لـە خواناسـیدا" (بریسکەی حەڤدەهەم). بەڵام لەبەر گرنگیەکەی جیا کرایەوە و کرا بە بریسکەیەکی سەربەخۆ لە کتێبی: "بریسکەکان"دا[1].**

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللهَ مُخْلِصاً لَهُ الدِّينَ ۞ أَلا للهِ الدِّينُ الْخالِصُ﴾**

(الزمر: ٢-٣)

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

"هلك الناس إلاّ العالمون، وهلك العـالمون إلاّ العـاملون، وهلـك العـاملون إلاّ المخلصون، والمخلصون على خطر عظيم"[2]. أو كما قال.

ئەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانە، ڕادەی گرنگیی ئیخلاسمان لە ئایینی ئیسلامدا بۆ دەستنیشان دەکەن، هەروەها بۆمان دەردەخەن کە "ئیخلاس" بناغەیەکی تا چ ڕادەیەك گەورە و توندوتۆڵە لە کاروباری ئاییندا.

جا لە نێوان ئەو مەسەلە و سەرنجە ورد و لە ژمارەبەدەرانەی کە لە باسی ئیخلاسدا هەن، ئێمە تەنها پێنج خاڵیان باس دەکەین:

---

(١) بێدارییەك: یەکێك لەو شتانەی کە شوکرانەکردن لەسەر ئەم شاری "ئیسپارتە"یە پێویست دەکات ئەوەیە کە: خوای گەورە بەختێکی باشی داوەتێ، چونکە لە نێوان ئەو هەموو خاوەن تەقوا و پیاوچاك و زانایان و تەریقەتدارانەی کە لەم شارەدا هەن، هیچ ئیختیلافێکی ئەوتۆ لە ئارادا نییە کە حەسوودیی تێکەڵ بووبێت. خۆ ئەگەر بیشبێت ئەوا لە چاو ناوچەکانی تردا زۆر سووك و کەمترە، هەرچەندەش خۆشەویستیی ڕاستەقینە و یەکێتیی تەواوەتی و پێویست لە نێواندا نییە، ئەو ئیختیلاف و حەسوودییە زیانبەخشەش لە چاو ناوچەکانی تردا نییە. (دانەر)

(٢) بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٢٦٥). (وەرگێڕ)

● خاڵی یەکەم:

**پرسیارێکی گرنگ و سەرسوورهێنەر:**

بۆچی ئایینداران و زانایان و ڕێڕەوانی تەریقەتە سۆفی‌یەکان، کە لـە ڕاستی‌دا ئـەهلی حـەق و یـەکێتین، وا بـەو چەشنە جیـاوازی و دووبـەرەکی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە، بـەڵام ئەهلی دنیـا و لـە خـوا بێ ئاگایـان، تەنانـەت گومـڕا و مونافیقـانیش، بێ ئـەوەی جێ بـە یەکتری لێژ بکەن و حەسوودی بـە یـەکتری ببـەن، یـەکدەگرن. لـە کـاتێکدا کـە یـەکێتی شتێکە هاوشانی ئەهلی یەکێتی و خۆشەویستی‌یە و، جیـاوازیش هاوتـای ئـەهلی نیفـاق و دووبەرەکی‌یـە؟ ئایـا چۆن حـەق و ناحـەق بـەو جـۆرە جێ‌گۆڕکێ‌یـان کـردووە و حــەق کەوتووەتە لای ئەوان و ناحەقیش لای ئەمان؟!

**وەڵام:**

لـە نێوان ئەو هۆکـارە جۆراوجۆرانـەی کـە ئـەم حاڵەتـە دڵتەزێنـەیان پـەیدا کـردووە و خەویان لـە غیرەتمەندان زڕاندووە، حەوت هۆکار باس دەکەین:

**○ هۆکاری یەکەم:**

یەکنەگرتنی شوێنکەوتووانی ڕێبازی حەق لە نەبوونی "حەقیقەت"ەوە نی‌یە، هـەروەك یەکێتیی و یەکگرتنی کەسانی لە خوا بێ‌ئاگایش هی ئەوە نی‌یە کـە پاڵیان بە حــەقیقەتەوە دابێــت. بــەڵکو فەرمانبــەریی ئــەهلی دنیــا و سیاســەت و کارمــەندیی ڕۆشــنبیران و هاوچەشنیان لە چینەکانی کۆمەڵ، دیاری کراوە و لە هـی کەسـانی تـر جیـا کراوەتـەوە. چونکە هەموو کەس و دەستە و کۆمەڵێکی ئـەوان ئـەرکێکی تایبـەتی‌یان هەیـە کـە پێیـەوە سـەرقاڵن. ئـەو پاداشـتە ماددی‌یـەش کـە لـە بەرامبـەر خزمەتگوزاری‌یـەکانیان و بــۆ بـەڕێوەبردنی ژیانیـان وەری دەگرن، ئەویش دیـاری کـراوە و جیـا کراوەتـەوە. تەنانـەت پاداشتە مەعنەوی‌یەکانیشیان - وەك حەز کردن لە پلەوپایە و بەدەستهێنانی ناوبـانگ - بـە هەمان جۆر دەستنیشـان کـراوە[1]. کـەواتە هیـچ هۆکـارێکی ئەوتۆ لـە ئارادا نی‌یـە کـە

---

(١) بێدارکردنەوەیەك: ڕووکردنی خەڵکی لە باوەڕدار کارێکە لەوانەیە بە مرۆڤی باوەڕدار ببەخشـرێت، بـەڵام نابێت لە لایەن باوەڕدارەوە داوا بکرێت. خۆ ئەگەر ئەم ڕووتێکردنە هاتەدی و پێی بەخشـرا، ئـەوا نـابێت دڵـی پێی خۆش بێت، خۆ ئەگەر پێـی خـۆش بوو ئـەوا ئیخلاسـەکەی لـە دەسـت داوە و دووچـاری ڕیاکـاری بـووە! حەزکردنیش لە ناوبانگ دەرکردن - کـە ئـەم ڕووتێکردنەی تێدایـە - هـەرگیز بـە پاداشـت دانـانرێت، بـەڵکو گلەیی و سزایەکە لە نەبوونی ئیخلاسەوە پەیدا دەبێت. بەڵێ، نابێت باوەڕدار بە شوێن ڕووتێکردنی خـەڵکی‌دا بگەڕێت، چونکە ئەو لەزەتە کەم و جوزئی‌یەی کە لەم ڕووتێکردنەدا هەیە زیانێکی تابڵێی گەورە لە "ئیخلاس" دەدات، کە ئیخلاسیش بریتی‌یـە لـە گیـان و کاکڵـەی هـەموو کـردەوە چاکـەکان. ئنجـا ئـەوەش هەیـە کـە ئـەم ڕووتێکردنە تا دەرگای گۆڕ بەردەوام دەبێت. کەواتە نابێت حەزی پێ بکات و بـە شـوێنی‌دا بگـەڕێت، بـەڵکو

مونافەسە و حەسوودی لە نێوانیاندا بنێتەوە و هیچ شتێك لە گۆڕێدا نی‌یە کە موناقەشەی لەسەر دروست ببێت. لەبەر ئەوەیە کە ئەوان دەتوانن یەکێتی بەدەست بهێنن، هەرچەندە ڕێگا جیاجیاکانی "فەساد"یش بگرنەبەر!

بەڵام فەرمانبەریی ئەهلی دین و زانایان و شوێنکەوتووانی تەریقەتە سۆفی‌یەکان، وا نی‌یە؛ چونکە ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی هەرکامێکیانەوە ڕوو لە هەموو ئەوانی تر دەکات و هەموان لێی بەرپرسیارن. پاداشتە دنیایی‌یەکەشیان دەستنیشان نەکراوە و لە یەکتر جیا نەکراوەتەوە. هەروەها پلەی کۆمەڵایەتیشیان و ڕووکردنی خەڵکی لەوان و، ڕازی بوونیان لێیان، بە هەمان جۆر، دیاری نەکراوە. چونکە چەندین کەس هەن کە بۆ تەنها یەك پلە دەپاڵێورێن و، لەوانەشە چەندین دەست بۆ پاداشتێك - چ ماددی بێت چ مەعنەوی - درێژ بکرێن. لە ئەنجامی ئەمەشدا پێشبڕکێ و غیرەت و مونافەسە و حەسوودی پەیدا دەبێت و، یەکێتی و "ویفاق"یش دەبێت بە "نیفاق" و جیاوازی و شپرزەیی و دووبەرەکی!

هیچ دەرمانێکیش نی‌یە چارەسەریی ئەم نەخۆشی‌یە سەختە بکات، مەڵهەمی "ئیخلاس" نەبێت! واتە بەوە چارەسەر دەکرێت کە مرۆڤی باوەڕدار هەمیشە حەق و هیدایەت بەسەر دەروون و ئارەزووەکانی خۆیدا سەربخات. هەر تەنها بەم سەرخستن و پێشخستنەی "حەق" بەسەر خۆپەرستیی دەروونیدا مرۆڤ دەتوانێت بگاتە شەرەفمەندیی بەجێهێنانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللهِ﴾ [1] و، بە نەویستنی ئەو پاداشتە ماددی و مەعنەوی‌یانەش کە لە خەڵکی‌یەوە بۆی دێن[2] بەجێهێنانی ئەم ئایەتە پیرۆزەی

---

دەبێت لێی بترسێت و لە دەستی هەڵبێت! جا با ناوبانگ پەرستان و ئەوانەی کە بە دوای ڕەزامەندیی خەڵکیدا دەگەڕێن، گوێیان لەمە بێت! (دانەر)

(١) (یونس:٧٢). واتە: پاداشتی من تەنها لای خوایە. (وەرگێڕ)

(٢) پێویستە ڕەوشتی "ئیثار" (واتە پێشخستنی کەسانی تر بەسەر خۆدا) کە ڕەوشتی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە و، لەسەر ئەم ڕەوشتەش قورئانی پیرۆز ستایشی کردوون، پێویستە ئەم ڕەوشتە لەبەر چاودا دابنرێت و بکرێت بە ڕابەر. بە واتای ئەوەی کە لە کاتی هاتنی هەر دیاری و بەخششێکدا خەڵکی پێش خۆی بخات و تا کەسانی تر هەبن ئەم وەری نەگرێت و دەستی بۆ نەبات و، لە بەرامبەر ئەو خزمەتگوزاری‌یانەی کە بۆ ئایین پێشکەشیان دەکات هیچ شتێك وەرنەگرێت، تەنانەت بە دڵیش داوای نەکات. خۆ ئەگەر هەر شتێك لەم بارەیەوە ڕووی دا، دەبێ تەنها بە چاکە و بەخششێکی خوای گەورەی بزانێت، بێ ئەوەی لە ژێر منەتی خەڵکیدا بمێنێتەوە. چونکە (بۆ ئەوەی ئیخلاس لەدەست دەرنەچێت) نابێ لە بەرامبەر ئەو خزمەتگوزاری‌یانەی کە بۆ ئایین دەکرێن لە دنیادا هیچ شتێك داوا بکرێت. هەرچەندە دەبێ نەتەوە(میللەت) ژیانی ئەو کەسانە دابین بکات و، هەرچەند ئەوانیش زەکاتیان پێ دەشێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارگوزارانە داوا لە کەس ناکەن، بەڵکو پێیان دەبەخشرێت. خۆ ئەگەر پێیان بەخشرا ئەوا نابێ بەو نیاز و

دەستگیر دەبێت کە دەفەرموێ: ﴿**وما على الرَّسُولِ إلاّ البلاغُ المُبين**﴾[1]. ئیتر لەم ڕێیەوە ئیخلاسی دەست دەکەوێت. چونکە ئەو مرۆڤە بە دڵنیاییەوە بۆی دەرکەوتووە کە جوانبوونی وتەکانی لە بەرچاوی خەڵکیدا و کاریگەریی باش لە دڵانیاندا و دەستکەوتنی ڕووتێکردنیان، کارێکە خوای گەورە بە فەزڵ و چاکە و بەخشایشی خۆی دەیکات و دەیبەخشێت و، هەرگیز ئەم دەرەنجامە بەشێك نییە لەو ئەرك و فەرمانبەرییەی خراوەتە ئەستۆیەوە، کە تەنها گەیاندنی بانگەوازی خوای گەورەیە.

جا هەرکەس خوای گەورە پشتی بگرێت و یارمەتیی بدات بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی باسمان کرد، ئەوا چێژ و لەزەتی ئیخلاس دەچێژێت. دەنا خێر و چاکەیەکی یەکجار زۆری لەدەست دەچێت.

○ **هۆکاری دووهەم:**

یەکگرتنی گومڕایان هی زەلیلییانە، بەڵام جیاوازیی نێوان ئەهلی هیدایەت هی سەربەرزییانە!

چونکە ئەهلی دنیا و گومڕایان و لە خوا بێ ئاگایان هیچ ڕاستی و حەقیقەتێك پاڵپشتیان نییە، کەواتە زەلیل و لاوازن. بۆیە هەست بە پێویستییەکی زۆر دەکەن بۆ بەدەستهێنانی "هێز" و زۆر بە توندی دەست بە یارمەتیدانی یەکترییەوە دەگرن و لەگەڵ یەکتردا یەك دەکەون و، هەتا بیشڵێی لەسەر ئەم یەکگرتنەی نێوانیان سوورن، با ڕێبازی گومڕاییشیان گرتبێتەبەر.

وەك بڵێی ئەوان لە پێناوی پشتگیریی یەکتردا لەسەر "ناحەق" کارێکی "حەق" ئەنجام دەدەن و، لە "گومڕاییەکەیان"دا "ئیخلاس"یان هەیە و لە "ئیلحاد"ەکەیاندا سوور و "بەردەوام"ن و لە "نیفاق"دا "ئیتتیفاق"یان کردووە!

لەبەر ئەمانەیە کە لە کاروبارياندا بە باشی سەردەکەون.

چونکە:

---

ناوەوەری بگرن کە خزمەتی ئایینیان کردووە.. کەواتە باشتر وایە بۆ مرۆڤ ئەو کەسانە بەسەر نەفسی خۆیدا پێش بخات کە شایانی ئەو بەخششەن (واتە ڕەوشتی "إيثار" بەجێ بهێنێت) و، بەو ڕۆزییەی کە خوای گەورە داویەتی قەناعەت بکات و پێی ڕازی بێت تاکو بەر ئەو مەدحەی قورئانی پیرۆز بکەوێت کە دەفەرموێ: ﴿**ويُؤثِرُونَ على أنفُسِهِم ولَوْ كانَ بِهِم خَصَاصة**﴾ (الحشر:٩). کە ئەمەشی کرد، ئەو کاتە ئیخلاسی دەستگیر دەبێت و لە شەڕ و شۆڕی ئەو مەترسییە سامناکە ڕزگاری دەبێت. (دانەر)

(١) (النور:٥٤). واتە: پێغەمبەری خوا – دروودی لەسەر بێت – تەنها ڕاگەیاندنی لەسەرە. (وەرگێڕ)

(ئیخلاسی تەواوەتی، با لە کاری شەڕیشدا بێت، بێهوودە ناڕوات و بێ بەرهەم نابێت. هەر کەسێکیش بە ئیخلاسەوە داوای هەر شتێك بکات، خوای گەورە بۆی دەڕەخسێنێت)[1].

بەڵام ئەهلی هیدایەت و ئایین و تەریقەت و زانایان، لەبەر ئەوەی پاڵیان بە حەق و حەقیقەتەوە داوە و، هەر کام لەوانیش لە کاتی برینی ڕێگادا بۆ لای حەق تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورەی مەبەستە و دڵنیایی خۆی تەنها لەو ڕازیبوونەی خوای گەورەدا دەدۆزێتەوە و، لەبەر ئەوەش کە سەربەرزیی مەعنەوی لە ڕێبازەکەی خۆیدا دەبینێت، چونکە هەر کات هەست بە لاوازییەك بکات یەکسەر بۆ لای خوای خۆی دەگەڕێتەوە نەك بۆ لای خەڵکی و، هێز و توانا هەر لەو وەردەگرێت و تەنها لەوی داوا دەکات..

سەرەڕای ئەمانەش، کاتێ کە ئەم حاڵەتە لە خۆیدا دەبینێت و هەستی پێ دەکات، جیاوازی و ناکۆکیی نێوان مەشرەبەکانی تریش بە چاو دەبینێت..

ئەوا لەبەر هەموو ئەمانە، هەست بە پێویستیی هاوکاری ناکات لەگەڵ ئەوانی تردا. تەنانەت ناتوانێت سوودی "یەکگرتن" ببینێت لەگەڵ ئەوانەدا کە بە ڕواڵەت ڕەفتاریان پێچەوانەی ئەمە. خۆ ئەگەر لەخۆ بایی بوون و خۆویستی لە دەروونیدا ببێت، ئەوا لە بری یەکێتی و خۆشەویستی، مونافەسە و ناکۆکی تێکەڵی نێوانیان دەبێت. ئیتر مرۆڤیش لەو چەشنە حاڵەدا پێی وا دەبێت کە هەر تەنها خۆی لەسەر حەقە و ئەوانی تریش لەسەر ناحەقن! دیارە ئەو کاتەش "ئیخلاس"ی لەدەست دەچێت و، لە ئەنجامی ئەمەدا کردەوە چاکەکانی لەناو دەبات و دەیانسڕێتەوە.

تاقانە چارەسەریی ئەم حاڵەتە و هەوڵدان بۆ نەهاتنەدیی بەرهەمە زیانبەخشەکەی، لەم (نۆ) خاڵەدایە کە لە خوارەوە باسیان دەکەین:

١- کاری ئیجابی و بنیاتنەر. کە بریتییە لەوەی مرۆڤ کارەکانی تەنها بەپێی داخوازیی خۆشەویستیی ڕێبازەکەی بێت و، ئەوەی بە خەیاڵدا نەیەت کە دوژمنایەتیی کەسانی تر بکات، یان بە چاوی سووکایەتی بۆیان بڕوانێت، یاخود ئەم جۆرە شتانە تێکەڵ بە کارەکەی ببێت. واتە: هەر بیریشی بەوانەوە خەریك نەبێت.

٢- بەڵکو دەبێ بە دوای ئەو پەیوەندییە زۆرانەدا بگەڕێت کە هەموو مەشرەبەکان - هەر جۆرێك بن - لە گۆڕەپانی ئیسلامدا بە یەکەوە گرێ دەدەن. ئەو پەیوەندییانەی

(١) دەستووری: "مَنْ طَلَبَ وَجَدَّ، وَجَدَ" کە یەکێکە لە دەستوورەکانی حەقیقەت، زۆر فراوانە و ڕێبازی ئێمەش دەگرێتەوە. (دانەر)

کە بێ گومان دەبنە سەرچاوەی خۆشەویستی و هۆی یەکێتی لە نێوانیاندا.

٣- دەبێ دەستووری ئینساف بکرێت بە ڕابەر. ئەو دەستوورەش بریتی‌یە لەوەی کە شوێنکەوتەی هەر ڕێبازێکی حەق دەتوانێت بڵێت: "ڕێبازەکەم ڕێبازێکی حەقە" یان: "بەلامەوە جوانتر و بەرزترە". بە بێ ئەوەی دەست بخاتە ناو ڕێبازی کەسانی ترەوە. بەڵام بۆی نی‌یە بڵێت: "حەق تەنها ڕێبازەکەی منە" یان بڵێت: "جوانی تەنها لە ڕێبازەکەی مندایە". کە ئەمەش وا دەگەیەنێت ڕێبازەکانی تر پووچ و بەتاڵ بن.

٤- دەبێ بزانرێت کە یەکگرتن لەگەڵ ڕێڕەوانی ڕێی حەقدا یەکێکە لە هۆکارەکانی یارمەتی بەخشین لە لایەن خوای گەورەوە و، سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی سەربەرزیی ئیسلام.

٥- پارێزگاری کردنی حەق و دادگەری، بە دروستکردنی کەسێتی‌یەکی مەعنەوی. کە ئەمەش بەوە دەبێت مرۆڤ لەگەڵ شوێنکەوتووانی حەقدا یەك بگرێت بۆ بەرەنگاریی گومڕایان و ناحەق ویستان، ئەوانەی کە بە فڕوفێڵی کەسێتی‌یەکی مەعنەویی بەهێزەوە هێرش بۆ سەر ئەهلی حەق دەبەن، بەهۆی ئەو یەکێتی و یەکگرتنەی کە لە نێوانیاندایە. پاشان بەوە دەبێت کە بزانرێت هەر بەرەنگاری‌یەکی تاکی - با زۆر بەهێزیش بێت - لە بەردەم ئەو کەسێتی‌یە مەعنەوی‌یەی گومڕایاندا، ژێر دەکەوێت و شکست دەهێنێت.

٦- ئەو هەوڵەی کە دەدرێت دەبێ لە پێناوی دەربازکردنی حەقدا بێت لە چنگی زەبر و زۆری ناحەق.

٧- وازهێنان لە غرووری دەروون و حەز و بەش و ئارەزووەکانی.

٨- وازهێنان لەو شتانەی کە - بە هەڵە - بە سەربەرزی و کەرامەت لە قەڵەم دەدرێن.

٩- وازهێنان لەو هۆکارانەی کە حەسوودی و مونافەسە و هەستە نزمەکانی "دەروون" دەورووژێنن.

مرۆڤ تەنها بەم (نۆ) خاڵە دەتوانێت "ئیخلاس" بە دەست بهێنێت و، ئەرکی ئەستۆی بە تەواوی جێبەجێ بکات[1].

---

(١) لە فەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە کە گاورە بەدینەکانی ئاخرزەمان لەگەڵ ئەهلی قورئاندا یەکدەگرن، بۆ ئەوەی بەرامبەر "بێ بڕوایی" کە دوژمنی هاوبەشە، ڕابووەستن. کەواتە ئەهلی حەقیقەت و ئیمانی ئەم سەردەمە نەك هەر تەنها لە نێوان خۆیاندا، بەڵکو دەبێ لەگەڵ گاورە ڕاستەقینەکانیشدا یەکبگرن و، بە

○ **هۆکاری سێهەم:**

شپرزەیی و یەکنەگرتنی ئەهلی حەق لە بێ نرخی و بێ هیممەتی‌یەوە پەیدا نەبووە و، یەکگرتنی گومڕاپانیش لە هیممەت بەرزی‌یەوە سەری هەڵنەداوە. بەڵکو جیاوازیی نێوان ئەهلی هیدایەت ئاکامی بەکارهێنانی هەڵە و زیادەڕەوی‌یانە لە "هیممەت بەرزی"دا و، یەکگرتنی گومڕایانیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کۆڵەواری و لاوازی‌یەی کە لە بێ هیممەتی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئەو هاندەرەش کە پاڵ بە ئەهلی هیدایەتەوە دەنێت "هیممەت بەرزی" بە شێوەیەکی هەڵە و ناڕەوا بەکار بهێنن و پاشان جیاوازی و حەسوودیی لێ بیێتەوە، سووربوونی لە ڕادەبەدەریانە لەسەر دەستخستنی پاداشتی دواڕۆژ، کە خۆی لە خۆیدا ڕەوشتێکی چاکە، بەڵام گەر مرۆڤ قەناعەتی نەبێت و هەردەم بیەوێت ئەم پاداشتە "بۆ خۆی" زیاد بکات، ئەم کارە مرۆڤ لەخشتە دەبات و بەرە بەرە ڕایدەکێشێت تا دەیکات بە نەیار و ڕقەبەری برا ڕاستەقینەکەی خۆی، کە پێویستی‌یەکی زۆری بە برایەتی و خۆشەویستی و هاوکاریی ئەم هەیە. وەك ئەوەی بڵێت:

با "من" ئەم پاداشتەم دەست بکەوێت.. با "من" ڕێنمایی ئەو خەڵکە بکەم.. با تەنیا لە "من" قسە ببیستن.. هەروەها وتەکانی‌تری جگە لەمانەش کە دەری دەخەن ئەو مرۆڤە بە دوای پاداشتی زیاتردا "بۆ خۆی" دەگەڕێت.

یان وەك ئەوەی بڵێت:

بۆچی قوتابی‌یەکانم دەچن بۆ لای "ئەو"؟ بۆچی ژمارەی قوتابی‌یەکانم بە ئەندازەی ژمارەی قوتابی‌یەکانی "ئەو" نین؟ یان زیاتر نابن؟!

بەم وتووێژە دەروونی‌یانە و هاوچەشنیان دەرفەت بە خۆپەسەندیی ناو دەروونی دەدات کە خۆی دەربخات و، ئنجا وردە وردە و لە ئاکامی ئەمەوە ڕەوشتێکی ناپەسەندی تێدا پەیدا دەبێت، کە سەربەرزکردنەوەیە بۆ مەنسەب ویستی(حب الجاه)! ئەو کاتەش دەرگای ئیخلاسی لێ دادەخرێت و، هی ڕیاکاریی لێ دەخرێتە سەرپشت!

چارەسەریی ئەم هەڵە گەورە و برینە ناسۆر و نەخۆشی‌یە ڕۆحی‌یە دژوارە، تەنها بەوە دەبێت کە:

---

شێوەیەکی کاتی واز لەو شتانە بهێنن کە دووبەرەکی و موناقەشەکردنیان لە نێواندا بزوێنێت، بۆ ئەوەی پاڵ بە دوژمنی هاوبەشیانەوە بنێن کە دەستدرێژیی کردووەتە سەریان. (دانەر)

بزانرێت: ڕازی بوونی خوای گەورە تەنها بە "ئیخلاس" دەست دەکەوێت. کەواتە بەدەستهێنانی ئەو ڕەزامەندی‌یە بە زۆریی شوێنکەوتووان و، سەرکەوتن لە کاروباردا، نی‌یە. چونکە زۆربوونی شوێنکەوتووان و سەرکەوتن لە کاروباردا، چاکە و بەخششێکە خواوەند خۆی دەیبەخشێت. کەواتە نابێت مرۆڤ داوای بکات و بە دوای‌دا بگەڕێت، بەڵکو خوای گەورە دەیبەخشێت بەوەی کە خۆی بیەوێت.

بەڵێ، لەوانەیە وتنی تەنها یەك وشە، ببێت بە هۆی ڕەزامەندیی خوای گەورە و ڕزگار بوون لە سزای ئەو.. لەوانەیە ڕێنمایی کردنی تەنیا یەك کەس بە ئە..ازەی ڕێنمایی کردنی هەزار کەس لای خوای گەورە کارێکی باش بێت و پێی ڕازی بێت. کەواتە نابێت لەم کارەدا "چەندایەتی" بەو ڕادەیە ڕەچاو بکرێت.

پاشان "ئیخلاس" و "حەق ویستن" لە کاروباردا، بەوەدا دەناسرێت کە مرۆڤ لە دڵ و دەروونی خۆی‌دا حەز بکات سوود بە هەموو موسڵمانان بگات، ئیتر ئەم سوودگەیاندنە لە هەر سەرچاوە و هەر کەسێکەوە بێت. دەنا ئەگەر چاو ببڕمە ئەوەی کە هەر دەبێ دەرس و ڕێنمایی تەنها لە "من" وەربگیرێت، بۆ ئەوەی تەنها "من" پاداشتی دواڕۆژم دەست بکەوێت. ئەمە - لە ڕاستی‌دا - فێڵی "نەفس"ە و، حیلەی "خۆپەسەندی"یە ئەم کارە بە مرۆڤ دەکات!

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە زۆر بە تەماعەوە هەوڵی پاداشتی زیاتر دەدات و، بەو کارانەی کە بۆ پاداشتی دواڕۆژ کردوونی قەناعەت ناکات!

بزانە کە خوای گەورە چەندین پێغەمبەری بەڕێزی بۆ ڕێنمایی خەڵکی ڕەوانە کردووە، کەچی بەشێکی کەمی خەڵك نەبێت، کەسی تر شوێنیان نەکەوتن و باوەڕیان پێ نەهێنان، لەگەڵ ئەوەشدا پاداشتی تەواوی پێغەمبەرێتی‌یان - بە بێ کەموکووڕی - دەستگیر بوو! کەواتە هونەر و ئازایەتی لە زۆریی شوێنکەوتووی ئیمانداردا نی‌یە، بەڵکو هونەر لە دەستکەوتنی شەرەفمەندیی ڕازی بوونی خوادایە.

ئەی مرۆڤی هەڵپەکار! تۆ چییت وا دەتەوێت هەموو خەڵکی گوێ لە تۆ ڕابگرن و، لە ئەرکی سەرشانت هەڵدێیت و خۆتی لێ گێل دەکەیت و، دەتەوێت دەست بخەیتە ناو کاروباری قەدەر و کارسازیی خوای گەورەوە؟!

ئەوەش بزانە کە:

باوەڕ کردنی خەڵکی بە قسەکانت و پێشوازی کردنیان لە بانگەوازەکەت و کۆبوونەوەیان لە دەورت، چەند بەخششێکی خواییین و تەنها بەو کەسانەی دەبەخشێت کە خۆی ویستی لەسەری بێت.

کەواتە هەر شتێك تایبەت بێت بە ویست و قەدەری خوای گەورەوە هەرگیز توخنی مەکەوە و خۆتی پێوە سەرقاڵ مەکە. بەڵکو هەموو هەوڵ و کۆششێکت تەنها بۆ ئەو ئەرکە بخەرە کار کە پێت سپێرراوە.

پاشان ئەوەش هەیە کە گوێ ڕاگرتن بۆ حەق و ڕاستی و، دەستکەوتنی پاداشت بۆ ئەو کەسەی قسەیان پێ دەکات تەنیا بە ڕەگەزی مرۆڤەوە بەند نی‌یە، بەڵکو خواوەند چەندین بەندەی خاوەن هەست و شعوور و ڕۆحانی و مەلائیکەتی هەیە، کە هەموو جێگا و سووچێکی گەردوونیان ئاوەدان کردووەتەوە.

جا ئەگەر تۆش دەتەوێت پاداشتی زیاتر بۆ دوارۆژت پاشەکەوت بکەیت، ئەوا بە توندی دەست بە ئیخلاسەوە بگرە و بیکە بە بناغەی کارەکانت و، با ئامانج و مەبەستت تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت. تاکو بە "ئیخلاس" و نیازی خاوێن سەرجەمی ئەو وشانەی لە زارت دەردەچن ژیانیان بە بەردا بکرێت و لەناو ئاسماندا بڵاو ببنەوە و، بگەنە بەر گوێی ئەو بەدیهێنراوە خاوەن هەست و شعوورانەی کە لە ژمارەنایەن. ئیتر جیهانی ئەوانیش ڕووناك دەکاتەوە و، تۆش پاداشتەکەی بە چەندین قات وەردەگریت.

چونکە هەر کاتێك وتت: "الحمد لله"، یەکسەر لەگەڵ وتنەکەی تۆدا و بە فەرمانی خوای گەورە، ملیۆنەها ملیۆن "الحمد لله" بە گەورەیی و بچووکی لە بۆشایی ئاسماندا دەنووسرێن. خوای گەورەش چەندین گوێی لە ژمارەبەدەری دروست کردووە کە گوێ بۆ ئەو وشە خاوێنە لە ژمارەبەدەرانە ڕادەگرن، چونکە هیچ ئیسراف و زیادەڕەوی‌یەك لە کاری خوای گەورەدا نی‌یە.

جا ئەگەر "ئیخلاس" و "نییەتی ڕاست" ژیان بەو وشانە ببەخشن کە لە هەموو گەردیلەیەکی هەوادا بڵاو بوونەتەوە، ئەوا بە چەشنی تامی خۆشی میوەکان تامیان لە گوێی ئەو بەندە ڕۆحانی‌یانەی خوادا خۆش دەبێت. بەڵام ئەگەر "ئیخلاس" و "مەبەستی ڕەزامەندیی خوا" ژیان بەو وشانە نەبەخشن، ئەوا دەبن بە چەند وشەیەکی نامۆ و ناساز و، گوێکانیش نایانەوێت بیانبیستن و، پاداشتی شتی وەهایش هەر تەنها لەوەدا دەمێنێتەوە کە ئەو کەسە بە دەم وتوویەتی.

جا با ئەو قورئان خوێنانە گوێ بۆ ئەمە ڕابگرن کە دڵتەنگی ئەوەن دەنگیان خۆش نی‌یە و، لەدەست کەمیی گوێ بیستانیان سکاڵا دەکەن!

○ **هۆکاری چوارەم:**

هۆی شپرزەیی ئەهلی هیدایەت ئەوە نی‌یە کە بیر لە پاشەڕۆژ ناکەنەوە، یان کورت بینن. هەروەها یەکگرتنی گومڕایانیش هی ئەوە نی‌یە کە ئەوان بۆ دواڕۆژیان پەرۆش بن و بە وردی بیری لێ بکەنەوە و بۆ دوور بڕوانن. نەخێر، بەڵکو دەستەوسانیی ئەهلی هیدایەت لە بەردەوامبوونیان لەسەر ڕێی هیدایەت و، کەمتەرخەمی‌یان لە "ئیخلاس"دا لەمەڕ ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دەدەن، بووە بە هۆی ئەوەی لە تایبەتکاری و ئاقارەکانی ئەو ئاستە بەرزە بێ بەش بن و ئنجا بکەونە هەڵدێری ئیختیلافەوە، هەرچەندەش بە ڕێنمایی "ژیری" و "دڵ" - کە پاشەڕۆژی پێ دەبینن - کار دەکەن و، سوود لە حەق و ڕاستی وەردەگرن و، بۆ ئارەزووی دەروون مل نادەن.

بەڵام گومڕایان، بەهۆی هاندان و ئارەزووەکانی دەروون و بەپێی خواستی هەستە شەهوانی و نەفسی‌یەکان، کە ئەمانەش پاشەڕۆژ نابینن و "درەمێك"ی ئێستا بە چەندین "باتمان"ی پاشەڕۆژ ناگۆڕنەوە، لە نێوان خۆیاندا بە ڕێکوپێکی یەکدەگرن و لە دەوری پەیدا کردنی لەزەت و بەرژەوەندی‌یەکی حازریدا کۆدەبنەوە.

بەڵێ، ئەو بێ نرخ و دڵ مردووە دنیایی‌یانەی کە بە دوای چەند ئارەزوویەکی نزمدا دەگەڕێن، لە نێوان خۆیاندا لەسەر چەند بەرژەوەندی‌یەکی حازریی دنیا یەکدەگرن.

کەچی - لە ڕاستی‌دا - چەندین هۆکاری زۆر لە بەردەم ئەهلی هیدایەتدا هەن کە دەیانگەیەننە یەکگرتنێکی ڕاستەقینە و، یەکێتی‌یەکی تەواوەتی و، خۆبەخت‌کردنێکی بەردەوام و، بەردەوامبوونێکی توندوتۆڵ لەسەر ڕێگای حەق لە نێوان خۆیاندا. چونکە ئەوان لەبەر تیشك و ڕووناکیی دڵ و ژیری‌دا چاوەڕوانی دەستکەوتنی چەند پاداشتێکی هەمیشەیی دواڕۆژن. بەڵام لەبەر ئەوەی بە تەواوی خۆیان لە غروور و، خۆ بەگەورە زانین و، زیادەڕەوی و کەمڕەوی (الإفراط والتفريط) دانەماڵیوە، ئەوا سەرچاوەیەکی بەپیت و گرنگیان لەدەست دەچێت کە هەمیشە هێزیان پێ دەبەخشێت، کە بریتی‌یە لە "یەکگرتن". ئنجا "ئیخلاس"یان نامێنێت و، ئەو کردارانەش کە بۆ دواڕۆژی دەکەن لە جێی خۆی دەلەقێت و بێ ئاکام دەمێنێتەوە و، پاشان گەیشتنیش بە ڕەزامەندیی خوای گەورە دەبێت بە کارێکی دژوار و بە ئاسانی دەستگیر نابێت.

دەرمان و چارەسەریی ئەم نەخۆشی‌یە سامناکە، ئەوەیە کە:

مرۆڤ بە هاوڕێیەتیی ئەوانەی لە ڕێبازی حەقدا هاوڕێیەتیی دەکەن شانازی بکات و، بۆ بەجێهێنانی فەرموودەی پیرۆزی: "الحب في الله"[1] پەیوەندیی خۆشەویستانەیان لەگەڵ ببەستێت و، هەمیشە لە پشت سەریانەوە بڕوات و، شەرەفمەندیی ئیمامەتیان بۆ بەجێ بهێڵێت و واز لە خۆپەسەندیی نەفس و لەخۆبایی بوون بهێنێت و، گریمانی ئەوە دابنێت کە ئەو کەسەی ڕێی حەق دەگرێتەبەر - هەر کەسێك بێت - لەوانەیە لە خۆی باشتر بێت..

هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەی بە ئاسانی "ئیخلاس"ی دەست بکەوێت..

پاشان بەوە دەبێت کە بزانرێت کەمێك کردەوەی چاك و پاك و بێ گەرد بۆ خوا، لە هەموو شتێك باشترە و، بەسەر چەندین کردەوەی تێکەڵ و خلتاویدا کە ئیخلاسی تێدا نەبێت، پێش دەخرێت. ئنجا بە حەزکردن و هەوڵدان دەبێت بۆ ئەوەی هەر لە ئاستی شوێنکەوتوودا بمێنێتەوە و، بۆ وەرگرتنی بەرپرسیاری و ئیمامەت نەڕوانێت. چونکە بە دەگمەن ڕێ دەکەوێت بێ مەترسی بێت!

بەمانەی باس کران چارەسەریی ئەم نەخۆشی‌یە سامناکە دەکرێت و، مرۆڤ شیفای پێ دەبەخشرێت و، "ئیخلاس"ی دەستگیر دەبێت. ئیتر ئەو کاتە مرۆڤی ئیماندار کاروبارەکانی سەر بە دواڕۆژی بە تەواوی و ڕاستی جێبەجێ دەکات.

**○ هۆکاری پێنجەم:**

هەروەك یەك نەکەوتنی ئەهلی هیدایەت هی ئەوە نی‌یە کە لاواز بن، یەکگرتنی توندوتۆڵی گومڕایانیش هی ئەوە نی‌یە کە بەهێز بن! بەڵکو نەبوونی یەکێتی لە نێوان ئەهلی هیدایەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەست ناکەن پێویستیان بە هێز هەیە تاکو پەیدای بکەن، بەهۆی ئەو پاڵپشتە بەهێزەی کە ئیمان دەیانداتێ.

بەڵام یەکێتیی دەستە و پیڕی گومڕایان لە لاوازی و کۆڵەواری‌یەوە پەیدا بووە، چونکە لە دەروونی خۆیاندا هیچ پاڵپشتێك شك نابەن پاڵی پێوە بدەن!

جا لەبەر ئەوەی "لاوازان" پێویستی‌یەکی زۆریان بە یەکگرتن هەیە، دەبینیت بە جۆرێکی توندوتۆڵ لەناو خۆیاندا یەکدەگرن. بەڵام "بەهێزان" لەبەر ئەوەی بە جۆرێکی لاواز نەبێ هەست بە یەکێتی ناکەن، دەبینیت یەکێتیی نێوانیان لاواز دەردەچێت! ئەمان

---

(١) ئەمەی دانەر ئاماژەی بۆ دەکات ناوەرۆکی چەندین فەرموودەی زۆرە کە ئەم پێشەوایانەی زانستی فەرموودە بە چەند دەقێك ڕیوایەتیان کردووە: ئیمامی بوخاری، موسلیم، تیرمیذی، ئەبوو داوود، بەیهەقی، ئەحمەد، بەززار و، جگە لەمانیش. (وەرگێڕ)

لەمەدا وەك شێر و ڕێوی‌یەکان وان کە هەست بە پێویستیی یەکێتی و یەکگرتن ناکەن، بۆیە هەمیشە تاك تاك دەگەڕێن. بەڵام بزن و مەڕە کێوی‌یەکان لە ترسی گەلە گورگ بە شێوەی ڕان ڕان و بە کۆمەڵ کۆمەڵ هاتوچۆ دەکەن. واتە کۆمەڵی لاوازان و ئەو کەسە مەعنەوی‌یەش نوێنەریانە، کۆمەڵ و کەسێکی بەهێزن. بەڵام کۆمەڵی بەهێزان و ئەو کەسە مەعنەوی‌یەی نوێنەریانە، کۆمەڵ و کەسێکی لاوازن(١).

لە سەرنجێکی ورد و جوانی قورئاندا ئاماژە بۆ ئەم نهێنی‌یە کراوە. ئەوەتا فیعلی: "قالَ" بە "مُذَکَّر"ی دراوەتە پاڵ ئافرەت، هەرچەندەش "مُؤَنَّث" و "جماعـــة"ن! وەك ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿**وقالَ نسوةٌ في المدينة**﴾(یوسف:٣٠).. بەڵام فیعلی: "قالت" کە بۆ "مُؤَنَّث"ە لە ئایەتی: ﴿**قالت الأَعْرابُ آمنَّا**﴾دا (الحجرات:١٤) بۆ جەماعەتی "مُذَکَّـــر" بەکارهێنراوە!

ئەمەش ئاماژەیەکی وردە بۆ ئەوەی ئافرەتان - کە ناسك و لاوازن - کاتێ دەبن بە جەماعەت، زبری پەیدا دەکەن و بەهێز دەبن و جۆرە پیاوەتی‌یەك بەدەست دەهێنن. لەبەر ئەوە، "حاڵ و مەقام" داخوازی ئەوە بوو کە فیعلی صیغەی "مُذَکَّـــر"یان بۆ بەکاربهێنرێت. کەواتە فیعلی: "قال" لە جێگای خۆیدایە و تابلێی جوانە..

بەڵام پیاوە بەهێزەکان لەبەر ئەوەی پشت بە هێزی خۆیان دەبەستن، بە تایبەت دەشتەکی‌یەکان، ئەوا کۆمەڵیان لاواز دەبێت. وەك بڵێی هەندێك لە تایبەتکاری‌یەکانی مێ‌ینە، وەك حەزەر و نەرم وناسکی و خۆپاراستن، پەیدا دەکەن! لەبەر ئەوە، بەکارهێنانی صیغەی "مؤنث" بۆ فیعلێك کە بۆ ئەوان بگەڕێتەوە، لە ئایەتی: ﴿**قـالت الأَعْرابُ آمنَّا**﴾دا، کارێکی یەکجار گونجاوە!

بەڵێ، حەق ویستان لەبەر ئەوەی ئیمانێکی وەهایان لە دڵی خۆیاندا هەڵگرتووە کە پاڵپشتێکی بەهێزیان دەداتێ و تەوەککول و تەسلیم بوونیان تێدا دروست دەکات، ئەوا لایەنی پێویستی لە مەسەلەی یارمەتیدانی یەکتردا نابینن. خۆ ئەگەر پێویستیشیان بە یارمەتیی غەیری خۆیان ببێت، ئەوا بە گەرمی و توندی‌یەوە دەستی پێوە ناگرن.

---

(١) ئەو شتەی پشتی ئەم دەعوایەمان دەگرێت، ئەوەیە کە بەهێزترینی ڕێکخراوەکانی ئەورووپا و ئەوانەیان کە - لە ڕوویەکەوە - لە هەموان بەهێزترن و لە کۆمەڵدا کاریگەری‌یان زیاترە، ڕێکخراوی ئافرەتانە، کە ڕەگەزی نیان و لاوازن. بە تایبەت ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لە ئەمەریکادا کە داوای ماف و سەربەستیی ئافرەتان دەکەن. هەروەها ڕێکخراوەکانی ئەرمەنیش کە لە نێوان نەتەوەکانی تردا لاواز و کەمایەتین، دەبینیت خۆبەخت کردن و ئازایەتی‌یەکی ناوازە پیشان دەدەن. (دانەر)

بەڵام ئەوانەی كە هەموو خەم و پەژارەیەكیان تەنها ژیانی دنیایە، لەبەر ئەوەی لە هێزی پاڵپشت و پشتگیری ڕاستەقینەیان بێئاگان، ئەوا لە بەجێهێنانی كاروباری دنیایاندا هەست بە لاوازی و كۆڵەواری لە خۆیاندا دەكەن و پێویستییەكی زۆریان بەو كەسە هەیە كە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بكات، ئیتر بە جۆرێكی وا توندوتۆڵ لەگەڵیاندا ڕێكدەكەون كە لەوانیە خۆیشیان لەو پێناوەدا بەخت بكەن!

بەم جۆرە، بۆمان دەركەوت كە ڕێڕەوانی حەق، لەبەر ئەوەی ڕێزی ڕاستەقینەی ئەو هێزەی حەق ناگرن كە لە "یەكگرتن"دا هەیە و گوێی نادەنێ، ئەوا دەگەنە ئەنجامێكی ترسناك كە بریتییە لە "پارچە پارچەیی" و "شپرزەیی".

بەڵام گومڕایان و ناحەق ویستان، لەبەر هەست كردنیان بە كۆڵەواری و لاوازیی خۆیان، هەست بەو هێزە گەورەیە دەكەن كە لە یەكگرتندا هەیە و، بەو جۆرە گرنگترین هۆكاریان بۆ مەبەستی "یەكگرتن" دەستگیر دەبێت.

ڕێگای ڕزگاربوون لەم دیاردە ئازاربەخش و ناڕەوایە و دەربازبوون لەم نەخۆشییە كوشندەیە (واتە نەخۆشیی جیاجیایی كە ئەهلی حەق تووشی بووە) لەوەدایە كە ئەو نەهییەی خوای گەورە لەم ئایەتەدا ڕایگەیاندووە:

**﴿ولا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾** [1].

هەروەها ئەم فەرمانە پەروەردگارییەش كە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە:

**﴿وتَعَاوَنُوا عَلى الْبِرِّ وَالتَّقْوى﴾** [2]..

بكرێن بە دوو دەستوور لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا..

هەروەها لەوەدایە كە مەودای ئەو زیانە زۆرە ڕەچاو بكرێت بەهۆی جیاجیاییەوە لە ئیسلام و موسڵمانان دەكەوێت و، ڕادەی ئەو دەرفەتدانەش بزانرێت كە - لەم ڕێیەوە - بە گومڕایان دەدرێت، تا دەستی خۆیان بەسەر ئەهلی حەقدا زاڵ بكەن..

پاشان بەوە دەبێت كە مرۆڤ بە قوربانیدان و هەستكردنێكی زۆرەوە بە "لاوازی" و "كۆڵەواری"ی خۆی، هەوڵ بدات خۆی بگەیەنێتە كاروانی حەقخوازانی ئیمان، لەگەڵ خۆ ڕزگاركردن لە ڕیا و، بەدەستهێنانی خۆنەویستی و خۆ لەبیربردنەوەدا..

---

(١) (الأنفال:٤٦). واتە: لەناو خۆتاندا ناكۆك مەبن، با ئەو توانا و دەسەڵاتەی هەتانە لە دەستتان نەچێت. (وەرگێڕ)

(٢) (المائدة:٢) واتە: لە بواری چاكەكاری و خۆپاراستن لە خراپەكاری یارمەتیی یەكتر بدەن. (وەرگێڕ)

دەبێ هەموو ئەمانە ئەنجام بدات لە پێناوی گەیشتن بە شەرەفمەندیی پایەی بەرزی "ئیخلاس".

○ **هۆکاری شەشەم:**

هەروەك یەك نەگرتنی ئەهلی حەق لە نەمان و کەمبوونەوەی غیرەت و ئازایەتییەوە نییە، بە هەمان جۆر یەکگرتنی لەخوا بێئاگایان و گومڕایانیش، کە لە هەموو کارێکیاندا تەنها دنیایان مەبەستە، لە ئازایەتی و پیاوەتی و جۆشی غیرەت و هیممەت بەرزییەوە نییە!

بەڵکو ئەهلی حەق ڕوانینی خۆیان ئاراستەی پاداشتی دوارۆژ کردووە، ئیتر هەرچی جۆشی غیرەت و هیممەت و جوامێرییان هەیە لەو مەسەلە گرنگ و زۆرانەی دوارۆژدا خستوویانەتەکار و بڵاویان کردووەتەوە. ئنجا لەبەر ئەوەی زۆربەی کاتەکانیان - کە لە ڕاستیدا سەرمایەی تەمەنیانە - لە تەنها مەسەلەیەکی دیاری کراودا بەسەر نابەن، ئەوا یەکگرتنیان لەگەڵ ڕێڕەوانی ڕێبازی حەقدا یەکگرتنێکی بەهێز دەرناچێت، چونکە مەسەلەی زۆر هەیە و مەیدانیش گەلێ بەرین و فراوانە.

بەڵام کەسانی دنیایی و بێ ئاگا لە خوا، لەبەر ئەوەی هەرچی تێڕوانین و بیرکردنەوەیان هەیە ئاراستەی ئەم دنیایەی دەکەن کە هەموو پەرۆشی و زانستێکیان لە پێناوی دەستخستنیدایە، ئەوا پەیوەندییەکی یەکجار بەهێزی لەگەڵدا دەبەستن و، سەرجەمی ژیری و بیر و هەست و نەستیشیانی بۆ ئاراستە دەکەن. کەواتە هەر کەسێك دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات، ئەوان پێشوازیی لێ دەکەن و بە هەموو توانایەکیانەوە دەستی پێوە دەگرن. هەروەك کاتە بەنرخەکانی تەمەنیشیان لە چەند مەسەلە و کێشەیەکی دنیاییدا بەسەر دەبەن کە بەلای ئەهلی حەق و ڕاستییەوە هیچ بایەخێکی نییە!

ئەوان لەم ڕەفتارەیاندا وەك ئەو جوولەکە نەفامە وان کە چەند وردە شووشەیەکی بێ نرخی بە پارەوپوولێکی زۆر کڕی، چونکە لای وابوو لە جۆری "بەردە گرانبەهاکان"ن!

جا شت کڕین بە نرخ و بەهای گران و سەرفکردنی هەست و شعوور لە پێناوی ئەو شتەدا، بە حەتمی لە ئەنجامدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، با لە ڕێگای ناحەقیشدا بێت، چونکە "ئیخلاسی ڕاستەقینە و تەواو"ی تێدا بەکارهێنراوە.

ئا لێرەوەیە کە دام و دەستەی ناحەق بەسەر شوێنکەوتووانی حەقدا سەردەکەون و، ئەهلی حەقیش ئیخلاسیان لەدەست دەچێت و، دەکەونە زەلیلی و ڕیاکارییەوە و، ناچار دەبن کە مەرایی ئەو دنیاپەرستانە بکەن کە هەرچی پیاوەتی و شەهامەت و هیممەت و غیرەت بێت نییانە!

دەسا ئەی ئەهلی حەق!

ئەی ئەهلی حەقیقەت و شەریعەت و تەریقەت!

ئەی ئەوانەی تەنها لەبەر حەق عەودالّی حەقن!

هەولّ بدەن ئەم نەخۆشی‌یە سامناکە (کە نەخۆشیی ئیختیلافە) لەناو بەرن، بەوەی کە بەم داب و ڕەویە قورئانی‌یە بەرز و گەورەیە ڕەفتار بکەن کە دەفەرموێ:

﴿وَإِذا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِراماً﴾[1]..

چاوپۆشی لە هەڵەی برایانتان بکەن و، لە کەموکووڕی‌یان خۆش ببن و، چاو لە ئاستی نەنگیی یەکتردا بنووقێنن و، موناقەشەی ناوخۆیی‌تان ئێستا بخەنە لاوە. چونکە دوژمنە دەرەکی‌یەکانتان وا خەریکن لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکەنە سەرتان..

هەروەها ڕزگارکردنی ئەهلی حەق لە ژێرکەوتن و زەلیلی، بە گرنگترین ئەرکی سەرشان و لێپرسراویی دوارۆژتان بزانن..

ئەو سەدان ئایەت و فەرموودانە لە خۆتاندا جێبەجێ بکەن کە داوای برایەتی و خۆشەویستی و یارمەتیتان لێ دەکەن..

بە هەموو هەست و شعوورێکتانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە ڕێگای ئایین و حەقی ڕوون و ئاشکرادا براتانن، دەست بە یەکگرتن و یەکێتی‌یەوە بگرن، بە جۆرێ کە زۆر لە دەستگرتنی ئەهلی دنیاوە بە دنیاکەیان، پتەوتر و بەهێزتر بێت..

هەمیشە خۆتان لە تەڵە و داوی ئیختیلاف بپارێزن..

هەرگیز کەستان نەڵێت: "من کاتە بەنرخەکەی خۆم لە بیرکردنەوە و خوێندنی زیکر و ویردەکاندا بەسەر دەبەم و خۆم بە شتە جوزئی‌یەکانەوە خەریك ناکەم". ئیتر بەم جۆرە خۆی لە مەیدان بکێشێتە دواوە و ببێت بەهۆی لاوازکردنی یەکگرتن و یەکێتیی موسڵمانان. چونکە ئەو بابەتانەی کە بە جوزئی و ئاسایی‌یان دەزانن، لە ڕاستی‌دا جیهادێکی مەعنەویی تایبەتیی گەورە و گرنگن.

با ئەمەش بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

هەروەك ئێشکگرتنی سەربازێك لە هەر سنوورێکی ئیسلامدا بۆ ماوەی سەعاتێك، بەپێی مەرجە تایبەتی‌یە گرنگەکانی خۆی، لەوانەیە ببێت بە هۆی ئەوەی کە بە ئەندازەی ساڵێکی خواپەرستی پاداشتی بۆ بنووسرێت.. بە هەمان جۆر، ئەم ڕۆژە بەنرخەی تەمەنیشت کە لە یەك مەسەلەی جوزئیی جیهادی مەعنەوی‌دا بەسەری بەریت، بە تایبەت

---

(١) (الفرقان: ٧٢) واتە: یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکانی بەندە ڕاستەقینەکانی خوای میهرەبان ئەوەیە کە: هێندە مەرد و سەربەرزن ئاوڕ لە کردار و گوفتاری ناشیرین و بێ کەڵك نادەنەوە. (وەرگێڕ)

لەم ڕۆژە پڕ لە تەنگانەیەدا کە ئەهلی حەق تیای‌دا ژێر کەوتوون، لەوانەیە لە حوکمی ئێشککگرتنە یەك سەعاتی‌یەکەی ئەو سەربازەدا بێت. واتە پاداشتەکەی گەلێ گەورە دەبێت. بەڵکو لەوانەیە لای خوای گەورە ئەو ڕۆژەت وەك هەزار ڕۆژ بۆ بنووسرێت.

چونکە مادەم کردار لە پێناوی خوا و لە ڕێی ئەودا بێت، ئەوا سەیری گەورە و بچووکی، بەرزی ونزمیی ناکرێت. کردارێکی بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە پێناوی ڕازی کردنی خوای گەورەدا، کە ئیخلاسی لەگەڵدا بێت، دەبێت بە ئەستێرەکی گەشی پرشنگدار.

کەواتە بایەخ بە ماهییەتی هۆکار و وەسیلەکان نادرێت، بەڵکو بایەخ و گرنگی لە بەرهەم و ئەنجامەکاندایە. جا مادەم بەرهەمی ئەم مەسەلانە ڕازی کردنی خوای گەورەیە و، بناغەی کارەکەش لەسەر "ئیخلاس" بنیات دەنرێت، ئەوا ئەم مەسەلانە بە بچووك دانانرێن، بەڵکو تابلێی گەورە و گرنگن.

**○ هۆکاری حەوتەم:**

هەروەك ئیختیلاف و مونافەسەی نێوان ئەهلی حەق هی ئەوە نی‌یە کە غیرەتیان بەرامبەر یەکتر بجۆشێت و هەڵپە بۆ شتومەکی بێ نرخی دنیای فانی بکەن، بە هەمان جۆر یەکگرتنی کەسانی دنیایی لەخوا بێ ئاگایش هی کەرامەت و جوامێری‌یان نی‌یە. بەڵکو ئەهلی حەق نەیانتوانی پارێزگاریی ئەو ڕێز و ئاکار و ڕەوشتە بەرزانە بکەن کە لە ئەنجامی پابەند بوونیان بە حەقیقەتەوە دەستیان کەوتبوو..

هەروەها بە هۆی ئەوەی چەند کەسێکی کەمتەرخەم و پێ‌نەگەیشتوو دزەیان کردبووە ناو ئەم مەیدانە، ئەوا نەیانتوانی لە پێناوی حەقدا لە بازنەی مونافەسەیەکی خاوێندا بمێننەوە و خۆیان ڕابگرن. لە ئەنجامی ئەمەشدا ئەو ڕەوشتە بەرزانەیان ـ تا ڕادەیەك - بە شێوەیەکی هەڵە بەکارهێنا و، لە هەڵدێری ناکۆکی و جیاجیایی‌دا بەربوونەوە. بەمەش زیانێکی زۆریان بە خۆیان و کۆمەڵی موسڵمانان گەیاند.

بەڵام گومڕایانی بێ ئاگا لە خوا، لەبەر نامەردی و بێ عیززەتی و زەلیلی‌یان، دەستی یارمەتی‌یان دەخستە ناو دەستی هەموو کەسێکەوە و لەگەڵ هەر کەسێکدا بگونجایە، تەنانەت لەگەڵ کەسانی کەم نرخ و نزمیشدا، یەکیان دەگرت، بۆ ئەوەی ئەو بەرژەوەندی‌یانەیان دەستگیر ببێت کە بە هەناسەبڕکێ هەڵپەی بۆ دەکەن! هەر لەم پێناوەدا هەتا ڕادەی پەرستن گوێڕایەڵیی گەورە و سەرکردەکانیان دەکەن و دڵیان ناڕەنجێنن. ئەوان بەو جۆرە لەگەڵ هاوبەشانی خۆیاندا بە توندوتۆڵی و چوستوچالاکی

یەکیان گرت و، لە دەوری ئەو بەرژەوەندییەی مەبەستیان بوو بە هەموو شێوەیەك کۆبوونەوە. ئنجا لە ئەنجامی ئەم لێبڕانە گەرموگوڕ و ڕاستەدا گەیشتن بەو هیوا و ئاواتانەی کە مەبەستیان بوو.

دەسا ئەی ئەهلی حەق و حەقیقەت!

ئەی ئەو کەسانەی تووشی بەڵا و داوی ئیختیلاف بوون!

ئێوە لەم بارودۆخە دژوار و پڕ لە تەنگانەیەدا پشتتان لە ئیخلاس هەڵکردووە و، لە هەوڵ و کۆششتاندا ڕەزامەندیی خواتان مەبەست نەبووە و، بەم کارەشتان ڕێگاتان بۆ ئەوە خۆش کردووە کە ئەهلی حەق لە دەست و پێ بکەون و تالآوی زەلیلی و ڕسوایییان دەرخوارد بدەن.

پێویستە بزانن کە لە کاروباری ئاخیرەتدا هەرگیز نابێ موونافەسە و حەسوودی و غیرەت – بە هیچ جۆرێك – بێتە ئاراوە. چونکە لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە، کاروباری سەر بە ڕۆژی دوایی هیچ کام لەوانەی تێدا نییە. خۆ حەسوودی و موونافەسە کاتێ پەیدا دەبن کە چەندین دەستی زۆر بۆ تەنها یەك شت درێژ بکرێن. کە ئەمەش ئەنجامی موناقەشە و پێشبڕکێ و پاڵنان دەکات بە غیبەتە و حەسوودی. پاشان لەبەر ئەوەی دنیا نشینگەیەکی کاتی و تەنگەڵانە؛ هەموو ویست و ئارەزووەکانی مرۆڤ ناهێنێتەدی و لەبەر ئەوەش کە زۆر کەس هەن لەسەر یەك دانە شت بە گژی یەکتردا دەڕۆن و هەڵپەی بۆ دەکەن، ئەوا لە ئەنجامدا ئەو جۆرە کەسانە دەکەونە ناو موونافەسە و حەسوودییەوە.

بەڵام لە قیامەتی گەورە و فراواندا هەموو ئیماندارێك بەهەشتێکی فراوان و بەرینی بە ئەندازەی زەوی و ئاسمانەکان تا دەگاتە ماوەی پێنج سەد ساڵ[1] ڕێ دەست

(١) پرسیارێکی گرنگ کە لە لایەنێکی گرنگەوە سەری هەڵداوە: ئایا ژیرییە کورتبینە دنیاییەکانی ئێمە چۆن جێی ئەو ڕیوایەتەی تێدا دەبێتەوە کە دەڵێت: (باوەڕدار لەودنیادا بەهەشتێکی فراوانی بە ئەندازەی پێنج سەد ساڵ ڕێی پێ دەبەخشرێت)؟

وەڵام: هەروەك هەموو کەسێك لەم دنیایەدا دنیایەکی کاتی و تایبەتیی هەیە کە بریتییە لە ژیانە تایبەتییەکەی خۆی و، ئەو کەسە لەو ژیانەیدا لەزەت لە هەموو هەستە دیار و نادیارەکانی خۆی وەردەگرێت، بە جۆرێك کە دەتوانێت بڵێت: خۆر و ئەستێرەکان چرا و موڵکی منن. ئیتر بوونی بوونەوەران و زیندەوەرانی تر ڕێ لەم موڵکایەتییەی ئەو ناگرن. بەڵکو دنیا تایبەتییەکەی پتر بۆ ئاوەدان دەکەنەوە..

لە بەهەشتیشدا – هەرچەند جیاوازیی زۆر لە نێوان ئەوێ و نموونەکەدا هەیە – بە هەمان جۆرە، چونکە هەموو ئیماندارێك سەرەڕای باخچە تایبەتییەکەی خۆی کە هەزاران کۆشك و حۆریی تێدایە، بەهەشتێکی تایبەتیشی لە ناوەندی بەهەشتە گشتییەکەدا هەیە کە پانتاییەکەی پێنج سەد ساڵ ڕێ دەبێت. هەروەها بە

دەکەوێت و، هەریەکەشیان حەفتا هەزار کۆشك و حۆریی پێ دەبەخشرێت. کەواتە لەودنیادا هیچ هۆکارێکی ئەوتۆ نی‌یە کە حەسوودی و مونافەسە لە نێواندا دروست بکات. ئەمەش ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە نابێت ئەو کردەوانەی مرۆڤ بە بەختەوەریی دوارۆژ دەگەیەنن، حەسوودی‌یان تێدا بێت.

جا ئەگەر کەسێك لەمەشدا هەر حەسوودیی بەکارهێنا، ئەوا ئەو کەسە - بێ هیچ گومانێك - یان ڕیاکارە.. یان لە ژێر پەردەی ئایین و کردەوەی چاکدا بە شوێن بەرژەوەندیی دنیادا دەگەڕێت.. یاخود لە ڕاستی‌دا مرۆڤێکی نەزانە؛ نازانێت ڕووکاری کردەوەی چاك دەبێ ڕووەو کوێ بێت و، هێشتا لەوە تێ‌نەگەیشتووە کە بناغە و کاکڵەی هەموو کردەوەیەکی چاك تەنها هەر "ئیخلاس"ە. بۆیە وا میهرەبانی‌یە فراوانەکەی خوای گەورە تاوانبار دەکات و بە فراوانی نازانێت، وەك بڵێی جێی ئەوی تێدا نەبێتەوە! ئیتر دەست بە حەسوودی و مونافەسە دەکات و جۆرە دوژمنایەتی‌یەك لە ئەولیا و بەندە ڕاست و چاکەکانی خوای گەورە هەڵدەگرێت!

لێرەدا ڕووداوێك دەگێڕمەوە کە پشتی ئەم ڕاستی‌یە دەگرێت:

یەکێك لە برادەرانی دێرینمان لە دڵی خۆی‌دا ڕق و دوژمنایەتیی لە یەکێکی تر هەڵگرتبوو. جا کاتێ کە لە بەرچاوی ئەمدا مەدحی ئەو کرا و، وترا: "فلان کەس

---

جۆرێك کە شیاوی بەهەشت و هەمیشەیی‌یەکەی بێت و بە گوێرەی خستنەکار و دەرکەوتن و پشکووتنی هەستەکانی، لەزەت لەم بەهەشتەی خۆی دەچێژێت. کە ئەمەش بەپێی پلەی ئیمانی ئیماندارەکە خۆیەتی. جا ئیتر بوونی خەڵکی تر لە بەهەشتدا هیچ شتێك لە بەهەشتە تایبەتی‌یەکەی ئەم کەم ناکەنەوە، بەڵکو بەهەشتە تایبەتی و بەهەشتە فراوانەکەی ئەم پتر فراوان و ئاوەدان دەکاتەوە.

هەروەك مرۆڤ ئەگەر ماوەی سەعاتێك لە باخچەیەك یان سەفەرێکدا، یاخود مانگێك یان ساڵێك لە گەشتێکی دەرەوەی وڵاتدا بەسەر بەرێت، لەزەت لە دەم و گوێ و چاو و چەشتن و سەرجەمی هەستەکانی تری وەردەگرێت، لە بەهەشتیشدا بە هەمان جۆر هەستەکانی "چەشتن" و "بۆنکردن" بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لەزەتی خۆیان وەردەگرن، بە وێنەی ئەوەی لە دنیادا بۆ ماوەی سەعاتێك لە باخچەیەکی ڕازاوەی وەردەگرن و کاتی تێدا دەبەنەسەر. هەستەکانی: "بینین" و "بیستن"یش لەو بەهەشتە ڕازاوە هەمیشەیی‌یەدا لەزەت لە گەشتێکی ئەوتۆ دەبینن کە سەرانسەری بەهەشت بگرێتەوە و لە ماوەی پێنج سەد ساڵدا بەسەری بەرێت، بە جۆرێك کە لەگەڵ هەمیشەیی بەهەشتدا بگونجێت، لە بریی ئەو ساڵەی کە مرۆڤ لە گەشتێکی ئەم دنیادا دەیباتە سەر.

کەواتە هەموو باوەڕدارێك، بەپێی پلەی ئیمانەکەی و ئەو کردەوانەی کە لە دنیادا ئەنجامی داون و بە گوێرەی جۆری ئەو کردەوە چاکانەی کە لە ژیانی دنیای‌دا کردوونی، سەرجەمی هەست و نەستەکانی لە بەهەشتدا وەك خونچە دەکرێنەوە و دەپشکوون. ئەمیش بۆ خۆی لەزەتیان لێ وەردەگرێت. (دانەر)

یـاوێکی باشـە و یەکێکـە لـە ئەولیاکانی خـوای گـەورە" سـەرنجمان دا ئـەم قسـەیە هیـچ کـارێکی سـەلبیی تێ نـەکرد و پێـی نـاخۆش نـەبوو. کـەچی هـەر هێنـدەی یـەکێك لـە کۆڕەکەدا وتی: "دوژمنەکەت بە ڕاستی ئازا و بەغیرەتە" یەکسەر دەمـاری حەسـوودی و غیرەتی تێدا بەرز بووەوە!

ئێمـەش پێمـان وت: "بـرادەر! خـۆ پلـەی ویلایـەت لـە پلـە هـەرە بـەرز و گـەورەکانی قیامەتە، کەواتـە هیـچ شتێك نی‌یـە بـەم پلەوپایەیـە بگـات و لەگـەڵیدا بـەراورد بکرێـت. سەرنجمان دا باسکردنی ئەم پلەیـە هیـچ کـارێکی سـەلبیی تێ نـەکردیت، بـەڵام هـەر کـە باسـی هێـزی بـازوو کـرا - کـە هێزێکـە تەنانـەت "گـا"یـش هەیـەتی - یەکسـەر دەمـاری حەسوودیی ورووژاندیت"؟!

ئەویش لە وەڵامدا وتی:

(من و ئەو یەك ئامانج و ئاواتمان دانابوو پێی بگەین. ئەو هۆکارانـەش کـە مـرۆڤ بـەو ئاواتانە دەگەیەنن بریتین لە هێز و ئازایەتی و هاوچەشنیان. بەڵام پلەوپایەکانی دوارۆژ بێ سـنوورن، لەوانەیـە ئـەو کەسـەی کـە لێـرە دوژمنتـە لـەوێ ببێـت بـە ئـازیزترین و خۆشەویستترین هاوڕێت)!

دەسا ئەی ئەهلی حەقیقەت و تەریقەت!

خزمەتکردنی "حەقیقەت" کارێکی ئاسان نی‌یە، بـەڵکو وەك هـەڵگرتن و پارێزگـاری کردنـی گەنجینەیـەکی گـەورە وایـە. جـا ئـەو کەسانەی کـە ئەو گەنجینەیە لەسـەر شـان هەڵدەگرن، بەو دەست و بازووە بەهێزانـە دڵخـۆش دەبـن کـە دێـن و یارمـەتی‌یان دەدەن. کەواتە دەبێ سەیری یارمەتیدان و هێز و کاریگەری‌یان زیاتر بکرێـت تـا خـودی خۆیـان. دەبێ بە شانازی‌یەکەوە شیاویان بێت پێشوازی بکرێن و وەربگیرێن. چونکە ئەوانە بـرای ڕاستەقینە و یارمەتیدەری خۆبەختکارن.

جا ئەگەر ئەمە شتێکی پێویسـت بێت، ئیتر بۆ دەبێت ئێوە بە چاوی حەسـوودی‌یەوە - چ جـای غـیرەت و مونافەسـە - سـەیر بکرێـن؟ کـە ئەمـەش کارێکـە "ئیخـلاس" لـەناو دەبـات و تێکی‌دەشـکێنێت و، لەمـەوە ئـەرك و کردەوەکانیشـتان دەبنـە جێـی ئـەوەی گومڕایـان تۆمـەتبارتان بکـەن و لـە ئاستی خۆتـان و ڕێبازەکـەتان پلەیـەکی کـەمترتان بـۆ دابنێن. تەنانەت لەگەڵ ئەوانەدا بە یەك چاو سەیرتان بکەن کە دنیا بە دینەوە دەخۆن و لـە ژێر پەردەی زانستی حەقیقەتدا ژیانی دنیایان دابین دەکەن. ئنجـا بتانخەنـە ڕیـزی ئەوانـەی

کە هەردەم لە هەڵپە و تەماعدان بۆ دنیای فانی و پێشبڕکێی لەسەر دەکەن. بۆچی خۆتان گرفتاری ئەمانە و تۆمەتە زۆر و پڕ لە ستەمەکانی تری جگە لەمانەش دەکەن کە بۆتان هەڵدەبەستن؟!

چارەسەریی ئەم نەخۆشییە، تەنها بەوە دەبێت کە: مرۆڤ پێش هەموو شتێك خۆی تاوانبار بکات و، پشتی ئەو کەسە بگرێت کە لە ڕێبازی حەقدا هاوڕێیەتی. هەروەها چارەسەرییەکی تری بە لانەدان دەبێت لە دەستووری ویژدان و حەقویستی کە زانایانی زانستی وتوویژکاری (آداب البحث والمناظرة) پێی ڕازی بوون و، بریتییە لەوەی کە:

(هەر کات مرۆڤ لە وتوویژیدا لەگەڵ یەکێکی تر پڕ بە دڵ حەزی دەکرد "حەق" لەسەر زمانی خۆی دەربکەوێت و بەرامبەرەکەشی لەسەر "ناحەق" بێت، ئەوا ئەو کەسە مرۆڤێکی ستەمکاری بێ ویژدانە)!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە ئەنجامی ئەم حەزکردنەدا زیانی بە خۆی گەیاندووە، چونکە مادەم حەزی کردووە تەنها لەسەر زمانی خۆی حەق دەربکەوێت، ئەوا شتێکی نوێ فێر نەبووە و، لەوانەشە ئەم کارەی بەرەو لەخۆبایی بوونی ببات! بەڵام گەر حەق لەسەر زمانی بەرامبەرەکەیدا دەربکەوێت، ئەم نە هیچ زیانێك دەکات و نە گرفتاری لەخۆباییبوونیش دەبێت! بەڵکو بەهۆی فێربوونی شتێکی تازەوە، سوودێکی نوێی دەست دەکەوێت.

واتە مرۆڤی حەقویستی ڕاستەقینە و بەویژدان دەروونی خۆی لە پێناوی حەقدا پێشێل دەکات و، ئەگەر لە لایەن بەرامبەرەکەشیەوە حەق دەرکەوت، پێی دڵخۆش و ڕازی دەبێت.

جا ئەگەر زانایان و ئەهلی دین و حەقیقەت و تەریقەت، لە ژیان و کاروباریاندا ئەم دەستوورە بکەن بە ڕابەری خۆیان، ئەوا - پشت بەخوا - "ئیخلاس"یان دەستگیر دەبێت و، لە کردەوەکانی خۆیشیاندا - کە بۆ دواڕۆژی دەکەن - سەردەکەون و، بە فەزڵ و میهرەبانیی خوای گەورەش لەم موسیبەتە گەورەیەی کە لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێ کردوون، ڕزگار و سەرفراز دەبن.

﴿سُبحانَكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّك أنْتَ الْعَليمُ الْحَكيمُ﴾.

# بریسکەی بیست و یەکەم

تایبەتە بە (ئیخلاس)ەوە

(ئەم بریسکەیە لە سەرەتادا مەسەلەی چوارەمی یادخەرەوەی حەڤدەهەم بوو لە پەیامی "چەند یادخەرەوەیەك لە خواناسیدا". بەڵام لە دواییدا بوو بە خاڵی دووهەمی "بریسکەی بیستەم". ئنجا بەهۆی بابەتەکەی کە "ئیخلاس"ە و بەبۆنەی ئەو نوورانیێتییەش کە تیایدایە، کرا بە "بریسکەی بیست و یەکەم" لە کتێبی بریسکەکان).

(بە لای کەمەوە پازدە ڕۆژ جارێك ئەم "بریسکەیە" بخوێنرێتەوە)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُم﴾ (الأنفال:٤٦)

﴿وَقُومُوا للهِ قَانِتِينَ﴾ (البقرة:٢٣٨)

﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾ (الشمس:٩-١٠)

﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾ (البقرة:٤١)

ئەی برایانی ئاخیرەتم!

ئەی هاوڕێیانم لە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆزدا!

باش بزانن - هەروەك دەشزانن - کە گرنگترین بناغە، بە تایبەت بۆ کاروباری ئاخیرەت، هەروەها گەورەترین هێز و، پەسەندترین تکاکار و، پتەوترین پاڵپشت و، کورتترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە حەقیقەت و، گیراترین نزای مەعنەوی و، بەرێزترین هۆکاری بەدەستهێنانی ئامانجەکان و، باڵاترین ڕەوشت و، پاکترین بەندایەتی.. تەنها هەر "ئیخلاس"ە!

جا مادەم (ئیخلاس) ئـەم هـەموو نـووره درەخشـان و هـێزه مەحکـەم و توندوتۆڵانـەی تێدایه..

مادەم خواوەندیش، به چاکەکاری و بەخشندەیی خۆی، ئەرکێکی خـاوێن و پیرۆز و گـەوره و خزمەتگوزاری‌یەکی گشـتی و بـەرزی خسـتووەته ئەسـتۆمان کـه بریتی‌یـه لـه کارمـەندیی ئیمان و خزمەتگوزاریی قورئان، له کاتێکدا که ئێمـه تـابلێی لاواز و کـەم و هەژارین و، چەندین دوژمنی زۆر و تەنگانەی سـەخت ڕوومـان تێ‌دەکـەن و، بیدعـەت و گومڕایی زۆر و زەبەندەش - که لەم سەردەمەدا به سەربەستی دێن و دەڕۆن - ئابلۆقەیان داوین..

مادەم ئەمه حاڵی ئێمەیه و خوای گەورەش ئەو ئەرکه مەزنـەی خسـتووەته ئەسـتۆمان، ئەوا چار نی‌یه دەبێ هەرچی هێز و وزه و توانامان هەیه هەموویان له پێناوی بەدەستهێنانی "ئیخلاس"دا بخەینه کار.

بەڵێ، چار نی‌یه جگه لـەوەی کـه "ئیخـلاس" بەدەسـت بـهێنین، بـەڵکو بەدەسـتهێنانی ئیخـلاس کارێکـه خراوەتـه ئەسـتۆمانەوه و پێمـان سـپێرراوه. تەنانـەت پێویسـتی‌یەکی یەکجار زۆرمان به جێگیرکردنی نهێنیی ئیخلاسه له ناخی خۆماندا.

چونکه ئەگـەر ئیخـلاس بەدەسـت نـەهێنین ئـەوا هـەندێك لـەو خزمەتگوزاری‌یـه پیرۆزانـەی کـه تـا ئێسـتا بـەجێمان هێنـاون، لـه دەسـتمان دەردەچـن و، خزمەتەکـەشمان بـەردەوام نـابێت و، پاشـان لەسـەر ئەو کارەشمـان لێپرسـینەوەی توندوتیژمـان لەگـەڵدا دەکرێت. چونکه ئەو کاته بەهۆی پەیدابوونی کەلێن له ئیخلاسەکەماندا دەڕۆینـه ڕیزی ئەو کەسانەی که بەر ئەم نەهی و هەڕەشەیەی قورئان دەکەون که دەفەرموێ:

﴿وَلا تَشْتَرُوا بِآيَاتِـي ثَمَناً قَلِيلاً﴾[1].

دیاره بەم کاره و له پێناوی چەند دەستکەوتێکی دنیایی بێ نرخ و زیانبەخش و لێڵدا، کـه هیـچ سـوودێکیان تێـدا نی‌یـه و، لەبـەر هێنانـەدیی چـەند بەرژەوەندی‌یەکی کەسـی و هـەندەکی و بـێ بایـەخی وەك: ڕیـا و خۆپەسـەندی، بەختـەوەریی هەمیشـەیی خۆمـان لەدەست دەدەین..

---

(١) (البقرة: ٤١). واته: ئایەتەکانم به نرخ و پاداشتی کەم مەگۆڕنەوه. (وەرگێڕ)

هەروەها بەم کارەمان دەستدرێژی دەکەینە سەر مافی هەموو ئەو کەسانەی کە لەم خزمەتگوزاری‌یەدا برامانن..

هەروەها وەك ئەوانەمان لێ دێت کە دەستدرێژی دەکەنە سەر رێبازی خزمەتگوزاریی قورئان..

هەروەها بەم کارەمان دەچینە ڕیزی ئەوانەی کە - وەك پێویست - رێزی راستی‌یەکانی ئیمانیان نەگرتووە و بێ ئەدەبی‌یان لە بەرامبەرەوە نواندووە.

ئەی برایانم!

ئەو کاروبارە گرنگانەی کە ڕێگای گەیشتنی مرۆڤن بە خێر و چاکەکاری، چەندین ڕێگر و تەگەرەی زیانبەخشی زۆریان دێتە ڕێ، چونکە شەیتانەکان خۆیان لەگەڵ خزمەتگوزارانی ئەم بانگەوازە پیرۆزەدا ماندوو دەکەن و ڕێیان لێ دەگرن.

جا لە پێناوی ڕێ بەستن لەو شەیتانانە، دەبێ مرۆڤی ئیماندار هەمیشە پشت بە "ئیخلاس" ببەستێت و لەو ڕێیەوە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەروون بەدەست بهێنێت.

دەسا ئێوەش - ئەی برایانم! - هەروەك لە مار و دووپشك خۆتان دەپارێزن هەر بەو جۆرەش خۆتان لەو هۆکارانە بپارێزن کە "ئیخلاس"تان زامدار دەکەن. چونکە دەروونی بەدخواز جێی متمانە و پشت پێ‌بەستن نی‌یە، وەك قورئانی پیرۆز لەم بارەوە لەسەر زمانی حەزرەتی یووسفەوە - دروودی لەسەر بێت - فەرموویەتی:

﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّي﴾[1].

کەواتە وریا بن! هەرگیز "لەخۆبایی بوون" و "خۆپەسەندی" و "دەروونی بەدخواز" هیچ کامیان نەتانخەڵەتێنن!

جا لە پێناوی دەستخستنی "ئیخلاس" و پاراستنی‌دا و، بۆ مەبەستی دوورخستنەوە و نەهێشتنی ئەو شتانەی کە ڕێ لە هێنانەدیی "ئیخلاس" دەگرن، ئەم دەستوورانەی خوارەوە بکەن بە ڕابەرتان:

◆ **دەستووری یەکەمتان:**

(با لە هەموو کردەوەیەکدا ئامانجتان تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت)!

---

(١) (یوسف:٥٣). واتە: نەفس(دەروون) فەرماندەر و هاندەری خراپکاری‌یە، مەگەر نەفسێك خوا ڕەحمی پێ بکات. (وەرگێڕ)

چونکە ئەگەر خوا لەو کردەوەیە ڕازی بێت، ئەوا ڕازی نەبوونی سەرجەمی دنیا و پشت هەڵکردنیان هیچ نرخ و بایەخێکی نییە و، ئەگەر خوای گەورە ئەو کارە پەسەند بکات و وەری بگرێت، ئەوا وەرنەگرتنی هەموو خەڵکی - بە گشتی - هیچ کاریگەرییەکی نییە. خۆ دوای ئەوەی کە خوای گەورە کارەکەی لێ وەرگرتیت و پێی ڕازی بوو، ئەگەر بیەوێت و دانستی خواستی لەسەری بێت خەڵکیش وا لێ دەکات کە وەری بگرن و پێی ڕازی بن، با خۆیشتان ئەو ئەنجامەتان نەویستبێ! کەواتە دەبێ ئامانجی سەرەکیتان لەم خزمەتە پیرۆزەدا، کە خزمەتکردنی ئیمان و قورئانە، تەنها ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت.

◆ **دەستووری دووهەمتان**: بریتییە لەوەی:

(ڕەخنە لەو برایانەتان نەگرن کە لەم خزمەتگوزارییەی قورئاندا کاردەکەن) و. بریتییە لەوەی کە: (هەرگیز بە هۆی "خۆبەگەورە گرتن" و "شانازی کردنەوە بەسەر یەکتری"دا ئەو جۆرە هاندەرانە نەورووژێنن کە غیبتە و حەسوودی لە نێواندا دروست بکات).

چونکە هەروەك حەسوودی لە نێوان دوو "دەست"ی مرۆڤدا نییە و، "چاوەکان"یشی ڕەخنە لە یەکتری ناگرن و، "زمان" ڕەخنە لە کاری "گوێ" ناگرێت و، "دڵ"یش عەیبە و نەنگیی "گیان" نابینێت، بەڵکو هەریەك لەمانە عەیبە و ناتەواویی ئەوانی تر دەپۆشێت و، هەموویان یارمەتیی یەکتر دەدەن، دەنا ڕووناکیی ژیان لەو جەستەیەدا دەکوژێتەوە و، گیانی لێ دەردەچێت و، پاشان پارچە پارچە دەبێت..

هەروەها وەك چەرخ و جەڕوپێچەکانی هەر کارگەیەك حەسوودییان لە نێواندا نییە و، هیچیان دەست ناخاتە ناو کاروباری ئەوانی ترەوە و پێشی ناکەوێت و، بە ڕەخنە و توانج و عەیب دۆزینەوە لە یەکتردا یەکی کاری یەکتر ناخەن. بەڵکو هەریەکەیان بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە یارمەتیی ئەوانی تر دەدات و، پاڵ بە چەرخەکانی ترەوە دەنێت کە بەرەو ئامانجی دیاری کراوی خۆی بڕوات. بەم چەشنە هەموو ئەو چەرخانە بە یەکگرتن و پشتگیریی تەواوەتیی یەکترەوە بەرەو هەمان ئامانج و مەبەستیان دەڕۆن کە لە پێناویدا دروست کراون، بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەر شتێکی نامۆ بڕواتە ناو کارەکانیانەوە - با بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت - ئەو کارگەیە لەکار دەکەوێت و، ئنجا خاوەنەکەشی ناچار دەبێت لە بناغەوە هەڵی بووەشێنێتەوە.

دەسا ئەی قوتابییانی پەیامەکانی نوور و ئەی خزمەتگوزارانی قورئانی پیرۆز!

هەروەك هەموو ئەمانەی پێشوو بەو جۆرەن کە باسمان کردن، ئێمەش بـە هـەمان جـۆر چەند بەش و ئـەندامێکین لـە کەسێتی‌یەکی مەعنـەویی ئـەوتۆدا کـە شیاوی ئەوەیـە نـاوی "مرۆڤی کامڵ"ی لـێ بنرێت!

ئێمە وەك چەرخـەکانی کارگەیـەك وایـن کـە "بەختـەوەریی هەمیشـەیی" بـۆ ژیـانێکی هەتاهـەتایی بەرهـەم دەهێنێـت. کەواتـە ئێمـە چـەند خزمـەتگوزارێکین لــە کەشـتی‌یەکی پەروەردگاریی وەهادا کـار دەکـەین کـە نەتـەوەی پێغەمبـەری ئیسـلام ﷺ بـەرەو لێـواری ئارامی و ئاسایش - کە خانەی بەهەشتە - دەپەڕێنێتەوە.

کەواتە ئێمە پێویستی‌یەکی گەلـێ زۆر و ناچارێمان بە یەکێتی و پشتگیریی تەواوەتی و بەدەستهێنانی نهێنیی "ئیخلاس" هەیە، کە هێزێکی مەعنەویی بە ئەندازەی هەزار و سـەد و یازدە(١١١١)مان تەنها لە چوار دانە ژمارەی "یەك"دا بۆ ئامادە دەکات.

بەڵێ، ئەگەر سێ پیتی "ئەلف" جیاجیا بن و یەك نەگرن، هەر تەنها نرخی سێ دانەیان دەبێت، بەڵام گەر بە نهێنیی ژمارەیی ڕیز ببەستن و پشتی یەکتری بگـرن، نرخیـان دەگاتـە سەد و یازدە: (١١١).

بە هەمان جۆر، ئەگەر چوار دانە ژمارە "٤" لە یەکتر دابڕێن و بە جیاجیـا بنووسـرێن، دەکەنە شازدە. بەڵام ئەگەر ئەم ژمارانە بەهۆی نهێنیی برایەتی و یەك ئامانجی لە یەك دێڕدا یەکیانگرت، ئەوا نرخ و هێزی چوار هەزار و چوارسەد و چل و چـوار: (٤٤٤٤) پـەیدا دەکەن!

بـەڵێ، چـەندین شـایەت و ڕووداوی مێژوویـی زۆر هـەن کـە چەسپاندوویانە: هـێزی مەعنەوی و بایەخی ڕاسـتەقینەی "شـازدە کـەس" لەوانـەی کـە بـەهۆی نـهێنیی ئیخلاسـی تەواوەتی‌یەوە هەتا ڕادەی "خۆبەختکاری" یـەکیان گرتـووە، لـە هـی چـوار هـەزار کـەس زیاترە!

حیکمەتی ئەم نهێنی‌یەش لەوەدایە کە:

هەریەکە لەو "دە" کەسەی کە بە ڕاستی یەکیان گرتووە، دەتوانێـت جگـە لـە چـاوی خۆی، بـە چـاوی براکانیشـی ببینێـت و بە گوێـی ئـەوانیش ببیسـتێت. واتـە هەریەکـەیان ئەوەندە هێزی مەعنەویی هەیە، وەك بڵێی بە "بیست" چـاو دەبینێـت و، بـە "دە" عـەقڵ بـیر دەکاتەوە و، بە "بیست" گوێ دەبیستێت و، بە "بیست" دەست کار دەکات[1].

---

(١) بەڵێ، هـەروەك پشتگیری و یـەکگرتنی ڕاستەقینە و تـەواوەتی کـە لـە ئیخلاسـەوە سـەری هـەڵدابێت جەمسـەرێکی وایە کە سوود و قازانجی لەژمارەبەدەری لـێ کۆدەبێتـەوە، بە هەمان جۆر قەڵغانێکی گەورە و

◆ **دەستووری سێهەمتان:**

ئەم دەستوورە بریتی‌یە لەوەی کە بزانن: (هەرچی هێزتان هەیە تەنها لە "حەق و ئیخلاس"دایە)!

بەڵێ، هێزی ڕاستەقینە هەر تەنها لە حەق و ئیخلاسدایە، تەنانەت ناحەقڕەوانیش، بەهۆی بەردەوامی و ئیخلاسیان لە ناحەقی‌یەکەیاندا هێز بەدەست دەهێنن!

ئەم خزمەتگوزاری‌یەمان لە ڕێگای ئیمان و قورئاندا، خۆی لە خۆیدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "هێز" تەنها لە حەق و ئیخلاسدایە. هەر تەنها بەجێهێنانی ئیخلاسێکی کەم لەم خزمەتەدا ئەم دەعوایەمان دەچەسپێنێت. چونکە ئەوەی لە شارەکەی خۆم[1] و لە ئەستەمبووڵ لە پێناوی خزمەتکردنی ئایین و زانستە شەرعی‌یەکاندا لە ماوەی بیست ساڵدا ڕامانپەڕاند، لێرەدا[2] و لە ماوەی هەشت ساڵدا سەد هێندەی ئەوەمان ئەنجام دا. لە کاتێکدا کە ئەو کەسانەی لەوێ یارمەتی‌یان دەدام سەد هێندە، بەڵکو هەزار ئەوەندەی یارمەتیدەرانی ئێرەم دەبوون.

خزمەتگوزاریی ئەم هەشت ساڵەی ئێرەمان، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەنیا و ئاوارە و نیمچە خوێندەوارم[3] و، لە ژێر چاودێری و تەنگ پێ هەڵچنینی چەند فەرمانبەرێکی بێ ویژداندام، بە فەزڵی خوای گەورە، هێزێکی مەعنەویی ئەوتۆی پێ بەخشیین کە سەد هێندەی ئەوەی پێشووترمان سەرکەوتن و تەوفیقی خوایی بۆ دەرخستین. لەبەر ئەوە،

---

پاڵپشتێکی گەورەشە لە بەردەم هەموو جۆرە ترس و سامناکی‌یەك کە دێتە ڕێی مرۆڤ، تەنانەت لە بەردەم مردنیشدا! چونکە مردن تەنها یەك دانە "گیان" لەگەڵ خۆی دەبات. خۆ ئەو کەسەی کە بەهۆی نهێنیی برایەتیی پاك و ڕاستەقینەوە، لە کاروباری دواڕۆژ و لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا، پەیوەندیی لەگەڵ براکانیدا بەستووە، بە ژمارەی ئەو برایانەی "گیان"ی هەیە. کەواتە بە زەردەخەنەوە پێشوازی لە "مردن" دەکات و دەڵێت: "یاخوا گیانەکانی ترم هەر بژین و لە هەموو دەرد و بەڵایەك دوور بن، چونکە مادەم ئەوان پاداشتی کردەوەی چاکم دەست دەخەن، ئەوا ژیانێکی مەعنەویم بۆ دابین دەکەن. کەواتە من نەمردووم"! ئیتر بەو جۆرە گیانی خۆی بە شادمانی‌یەوە دەبەخشێت و بە زمانی حاڵیش دەڵێت: "من تەنها لە ئاستی گوناه و کردەوەی خراپدا مردووم، دەنا لە ئاستی پاداشتی کردەوەی چاکدا بەو گیانانەی ترم دەژیم و لەوانەوە هەردەم پاداشتم دەست دەکەوێت! (دانەر)

(١) مەبەست شاری "وان"ە لە کوردستانی باکوور. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست شارۆچکەی "بارلا"یە کە دەکەوێتە باشووری خۆرئاوای تورکیا و هەشت ساڵ و نیو مامۆستا نووڕسی لەوێ دەست بەسەر بووە. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست ناخۆشیی خەتەکەیەتی، چونکە دانەر خەتی ناخۆش بووە! (وەرگێڕ)

گەیشتوومەتە قەناعەتێكی تەواوەتی بەوەی كە هەرچی تەوفیقی خواییمان لێرەدا دەست كەوتووە تەنها بەهۆی ئیخلاسی ڕاستەقینەی ئێوەوە بووە..

من دان بەوەدا دەنێم كە ئێوە بەهۆی ئیخلاسی تەواوەتیتانەوە، تا ڕادەیەك منتان لە ریاكاری ڕزگار كرد، كە دەردێكی كوشندەیە و، لە ژێر پەردەی "ناوبانگ"دا ختووكەی دەروون دەدات و مرۆڤ لە خشتە دەبات.

لە خوای گەورە داواكارم كە هەمووتان بە "ئیخلاسی تەواوەتی" بەهرەمەند و بەختەوەر بكات و، منیش لەگەڵ خۆتان لەو ئیخلاسەدا بەشدار بكەن.

دەزانن ئیمامی عەلی و شێخی گەیلانی - خوایان لێ ڕازی بێت - لە كەرامەتەكانیاندا ئاوڕیان لێ داونەتەوە و بە چاوی بایەخ پێدان و دڵدانەوە و سۆزەوە بۆیان ڕوانیون، وەك بڵێی بەشێوەیەكی مەعنەوی پیرۆزبایی خزمەتگوزارییەكانتان لێ دەكەن. دەسا با ئێوەش هیچ گومانێكتان لەوەدا نەبێت كە ئەو بایەخ پێدان و ئاوڕ لێدانەوە و دڵدانەوەیەی ئەوان، تەنها لەبەر ئەو ئیخلاسەیە كە بەدەستتان هێناوە. جا ئەگەر خوانەخواستە ئەم ئیخلاسە بە ئەنقەست لەدەست بدەن، ئەوا شایانی زللە لێدانیان دەبن.. یادی "زللەكانی میهرەبانی"ی بریسكەی دەهەم بكەنەوە!

جا ئەگەر دەتانەوێت ئەم دوو مرۆڤە بەڕێزە هەر بەو چەشنە مامۆستا و ڕابەر و پشتگیری مەعنەویتان بن، ئەوا لە ڕێی جێبەجێ كردنی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە كە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلى أَنْفُسِهِمْ﴾ (الحشر:٩) ئیخلاسی ڕاستەقینە و تەواوەتی بەدەست بهێنن.

واتە دەبێ لە پلە و پایە و ڕێزدا، تەنانەت لە سوودە ماددییەكانیشدا كە دەروونی مرۆڤ حەزیان لێ دەكات، برایانتان پێش خۆتان بخەن. بەڵكو لە سوودە پاك و بێ گەردەكانیشدا (وەك فێركردن و ڕاگەیاندنی حەقیقەتەكانی ئیمان بە خەڵكی) هەتا دەتوانن بۆ ئەوە مەڕوانن كە ئەو كارە لەسەر دەستی خۆتاندا بێتەدی! بەڵكو بەوە ڕازی و دڵنیا بن كە لەسەر دەستی كەسانی تر ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی دەردی "خۆپەسەندی" لە دڵ ودەروونی ئێوەدا جێی خۆی نەكاتەوە!

لەوانەیە یەكێكتان حەز بكات تەنیا "خۆی" پاداشتی دەست بكەوێت و، بیەوێت تەنیا "خۆی" كارێكی گرنگی ئیمان ڕوون بكاتەوە! خۆ هەرچەندە ئەم كارە هیچ گوناهێكی تێدا نییە، بەڵام ڕوونیی ئیخلاسی نێوانتان لێڵ دەكات!

◆ **دەستووری چوارەمتان:**

دەستووری چوارەم بریتی‌یە لەوەی کە: (بە سوپاسەوە شانازی بە بەهرە و ڕەوشتە جوانەکانی برایانتانەوە بکەن و، ئەو ڕەوشتانە بە هی خۆتان لە قەڵەم بدەن).

لە نێوان سۆفی‌یانی تەریقەتدا چەند زاراوەیەك هەیە، وەك: "الفناء في الشيخ" و "الفناء في الرسول". خۆ منیش صۆفی و خاوەن تەریقەت نیم هەتا یەکێك لەو زاراوانەتان بۆ دەستنیشان بکەم. بەڵام دەستووری: "الفناء في الإخوان" دەستوورێکە بە تەواوی لەگەڵ ڕێبازی ئێمەدا دەگونجێ. واتە برا لە براکەی‌دا بتوێتەوە. بەو واتایەی کە هەریەکە هەستە دەروونی‌یەکانی خۆی لەبیر بباتەوە و بە بیری خۆی لەگەڵ ڕەوشتە بەرزەکانی براکانی‌دا بژی. چونکە ڕێبازمان تەنها "برایەتی"یە لە پێناوی خوادا و، ئەو پەیوەندی‌یانەش کە بە یەکەوە دەمانبەستێت، تەنها برایەتیی ڕاستەقینەیە؛ نە پەیوەندیی باوکە لەگەڵ کوڕدا و نە هی شێخیشە لەگەڵ موریددا.

هەروەها مادەم ڕێبازمان هاوەڵێتی(الخليلية)یە، ئەوا مەشرەبمان "خوللەتە". خوللەتیش داخوازی هاوەڵێکی ڕاست و هاوڕێیەکی خۆبەختکار و برایەکی بە غیرەتە. بناغەی ئەم خوللەتەش تەنها "ئیخلاسی تەواوەتی و ڕاستەقینە"یە. جا هەرکامتان کەمتەرخەمی لەم ئیخلاسەدا بکات، ئەوا لە چڵەپۆپەی خوللەتەوە دەکەوێتە خوارەوە، دوور نی‌یە بکەوێتە ناو شیوێکی قووڵەوە، چونکە هیچ ناوەندە جێیەك لەو نێوانەدا نی‌یە هەتا خۆی تێدا ڕاگیر بکات.

بەڵێ، تەنها دوو ڕێگا هەیە:

هەرکەس لە ڕێبازی ئیخلاسی تەواوەتی‌دا، کە ڕاستە شەقامی قورئانە، لێمان جیا ببێتەوە، دوور نی‌یە، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، بچێتە ڕیزی ئەوانەی کە خزمەتی ئیلحاد دەکەن و لە دژی قورئان ڕادەوەستن!

پشت بەخوا ئەوانەی کە لە ڕێگای پەیامەکانی نوورەوە ڕۆشتوونەتە ناو گۆڕەپانی خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزەوە، ناکەونە ئەو چاڵ و شیوە قووڵانەوە، بەڵکو چەندەیان لە توانادایە هێز و تەوژمی زیاتر بە "نوور" و "ئیخلاس" و "ئیمان"ەکەیان دەدەن.

ئەی برایانم لە خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزدا! بزانن کە:

❑ گرنگترین هۆکار بۆ دەستکەوتنی "ئیخلاس" و پاشان بۆ پارێزگاری لێکردنی، بریتی‌یە لە: **یادکردنەوەی مردن!**

هەروەك "هیوادرێژی" کەلێن لە ئیخلاسدا دروست دەکات و مرۆڤ بۆ ریاکاری و خۆشەویستیی دنیا رادەکێشێت، "یادکردنەوەی مردن"یش بە پێچەوانەیەتی، چونکە وا لە مرۆڤ دەکات کە بێز لە ریاکاری بکاتەوە و، لە فرۆفێڵی دەروونی بەدخواز رزگاری دەکات و دەیگەیەنێتە پایەی "ئیخلاس" بە بۆنەی بیرکردنەوەی لە مردن و لەناوچوونی دنیا.

سۆفییەکان و ئەوانەش کە لەسەر رێبازی راستیی زانستی دەڕۆن، بە بۆنەی ئەو دەرسەی کە لەم دوو ئایەتەوە وەریانگرتووە: **﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾**[١] و **﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾**[٢] یادکردنەوەی مردنیان بە بناغەیەکی گرنگی رێبازەکانی خۆیان داناوە و، بەم یادکردنەوەیەش ئەندێشەی هەمیشەیی و مانەوەیان لە بیر و مێشکی خۆیاندا دەرکردووە، کە ئەندێشەیەکە "هیوادرێژی"ی بۆ دروست دەکردن. چونکە لەم یادکردنەوەیەدا وایان داناوە کە وا ئێستا مردوون.. ئێستا دەشۆررێن.. ئێستا دەخرێنە ناو گۆڕەکەیانەوە... هتد.

مرۆڤیش هەتا بەم جۆرە بیر بکاتەوە، دەروونی بەدخواز(نەفسی ئەممارە)ی وردە وردە واز لە هیوادرێژییەکانی دەهێنێت.

ئەم یادکردنەوەیەی "مردن" گەلێ سوودی زۆری تێدایە. بۆ زانینی رادەی گرنگیی یادکردنەوەی مردن ئەوەندە بەسە کە بزانین پێغەمبەر ﷺ ئێمەی بۆ ئەم یادکردنەوەیە رێنمایی کردووە و، فەرموویەتی: "أكْثِروا ذِكرَ هاذِمِ اللذات: الموت"[٣].

جا لەبەر ئەوەی رێبازی ئێمە راستییەکی زانستییە، تا ئەوەی تەریقەتێکی سۆفییانە بێت، ئەوا خۆمان بە ناچار نازانین وەك ئەوان بە "ئەندێشە" و "گریمان" یادی مردن بکەینەوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە لەگەڵ رێبازی حەقیقەتدا ناگونجێ، چونکە بیرکردنەوە لە دوارۆژ بەوە نابێت کە بە ئەندێشە "داهاتوو" بۆ "ئێستا" بهێنرێت، بەڵکو بەوە دەبێت کە مرۆڤ بە بیری خۆیەوە لە "ئێستا"یەوە بڕوات بۆ "داهاتوو"ی. واتە لە روانگەی "ئێستا"وە بۆ "داهاتوو" بڕوانێت، هەروەك حەقیقەت وایە!

---

(١) (آل عمران: ١٨٥). واتە: هەرچی گیانلەبەرە مردن دەچێژێت. (وەرگێر)

(٢) (الزمر: ٣٠). واتە: تۆیش و ئەوانیش دەمرن. (وەرگێر)

(٣) رواه أحمد والترمذي وحسنه. والنسائي وابن ماجه والبيهقي والطبراني في الأوسط. وصححه ابن حبان والحاكم. ومعنى هاذم: قاطع. واتە: زۆر یادی مردن بکەنەوە. (وەرگێر)

کەواتە پێویست بە "ئەندێشە" و "دانانی گریمان" ناکات، ئەوەتا مرۆڤ دەتوانێت هەر ئێستا سەیری تەرمەکەی خۆی بکات کە بەری درەختی تەمەنە کورتەکەی خۆیەتی. خۆ ئەگەر نەختێ چاو بگێڕێت نەك تەنها مردنی خۆی، بەڵکو مردنی کات و سەردەمەکەشی دەبینێت، خۆ ئەگەر زیاتریش چاو بگێڕێت ئەوا تەنانەت مردن و کاولبوونی سەرانسەری دنیای بەرچاو دەکەوێت. دیارە بە بینینی ئەمەش ڕێیەکی بەرەو "ئیخلاسی تەواوەتی" لێ دەکرێتەوە.

□ هۆکاری دووهەم بۆ دەستخستنی "ئیخلاس" بریتی‌یە لەوەی کە:

دڵی مرۆڤ حوزوور و دڵنیایی بەدەست بهێنێت بەهۆی ئیمانی تەحقیقی و، لە ڕێی ئەو بریسکانەش کە لەبارەی تێڕامانی ئیمانی‌یەوە لە بەدیهێنراوانی خوای گەورە دەدوێن[1].

ئەم چەشنە تێڕامانە وا لە خاوەنەکەی دەکات خوای گەورە بناسێت. خۆ هەر هێندەی خوای ناسی، بە جارێ ئارامی و هێمنی دەڕژێتە ناو دڵ و دەروونیەوە.

بەڵێ، ئەمە شتێکی زۆر حەق و ڕاستە، چونکە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئەم چەشنە بیرکردنەوە و تێڕامانە لە بیری مرۆڤدا وای لێ دەکات کە هەمیشە بیر لە ئامادەیی و چاو لێ بوونی خوا بکاتەوە. واتە: بیر لەوە بکاتەوە کە خوای گەورە ئامادەیە و چاوی لێیەتی. خۆ هەرکاتێك مرۆڤ گەیشتە ئەم پلەیە، ئیتر ئاوڕ بە لای غەیری خوادا ناداتەوە و، هێز و تواناش لە کەسی تر وەرناگرێت. چونکە لاکردنەوە بەلای هەر شتێکی تری جگە لە خوای گەورە، ئەدەبی حوزوور و ئارامیی دڵ کەم دەکاتەوە.

بەم جۆرە مرۆڤ لە ڕیاکاری ڕزگاری دەبێت و پشت بەخوا "ئیخلاس"ی دەستگیر دەبێت.

بەڵێ، چەندین پلەی زۆر لەم جۆرە تێڕامانەدا هەیە. هەرکەسیش بەپێی دەستکەوت و توانا و هێزی خۆی، سوودیان لێ وەردەگرێت.

لێرەدا بەم ئەندازەیە واز لەم باسە دەهێنین و، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی "پەیامەکانی نوور" دەکەین. چونکە ئەو پەیامانە چەندین ڕاستیی زۆریان سەبارەت بە ڕزگاربوون لە ڕیاکاری و دەستکەوتنی "ئیخلاس" باس کردووە.

---

(١) ئەوانەش لە بریسکەی بیست و نۆهەمی ئەم کتێبەدا دانراون. (وەرگێڕ)

وا ئێستاش چەند هۆكارێك ڕوون دەكەینەوە لەوانەی كە ڕێ لە هاتنەدیی "ئیخلاس" دەگرن و، دەرگای ڕیاكاری دەخەنە سەرپشت:

❖ **ڕێگری یەكەم لە هاتنەدیی "ئیخلاس":**

بریتی‌یە لەو "حەسوودی"یەی كە لە بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەكانەوە پەیدا بووە!

ئەم حەسوودی‌یە وردە وردە ئیخلاس تێكدەدات. بەڵكو بەرهەمی كردەوەكانیش دەشێوێنێت. تەنانەت بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەكانیش لەدەست دەردەكات!

بەڵێ، ئەم نەتەوەیە هەردەم ڕێزی ئەو كەسانەی گرتووە كە بە ڕاستی بۆ حەقیقەت و ڕۆژی دوایی تێكۆشاون و، بۆ مەبەستی بەشداری كردنیان لەو كردەوە ڕاستانەدا، كە تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجامیان داون، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ كردوون.

نەتەوەی ئیسلام لەم ڕووەوە هەمیشە دەستگرۆیی ئەو خزمەتگوزارانەی كردووە و دیاری‌یان پێ بەخشیون، تاكو پێویستی‌یە ماددی‌یەكانی ئەوان نەهێڵن و لە كاروباری سەرەكیی خۆیان دوانەكەون. ئەو كەسانەش كە ئەركی ئەم یارمەتیدانەیان لە ئەستۆ گرتووە، ئەویەڕی ڕێزیان بۆ كارگوزارانی ڕێگای خواوەند پیشان داوە.

بەڵام هەرگیز نابێت كارگوزارانی ئەم ڕێیە خۆیان داوای ئەو یارمەتی‌یانە بكەن، بەڵكو پێشكەشیان دەكرێت. تەنانەت نابێت هیچ كام لەوان بە زمانی حاڵیش - وەك ئەوەی بە دڵ چاوەڕوان بێت - داوای ئەو چەشنە یارمەتی‌یانە بكات! بەڵكو بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت و داوای بكات پێی دەبەخشرێت و خوای گەورە بۆی دەنێرێت، دەنا كەلێن لە "ئیخلاس"ەكەی‌دا دروست دەبێت و نزیكی دەخاتەوە لەوەی بەر ئەو نەهی‌یەی خواوەندی بكات كە دەفەرموێ:

﴿وَلا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾..

ئەو كاتەش هەندێك لە كردەوەكانی بێ سوود و پاداشت دەردەچن.

حەزكردن لەم جۆرە بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یانە و چاوەڕوان كردنی بە هۆكاری هاندانی دەروونی بەدخواز و سووربوونی مرۆڤ لەسەر دەستخستنی ئەو سوودانە بۆ خودی خۆی، دەماری حەسوودی لە ئیمانداردا بەرامبەر برای ئیمانداری خۆی و هاوڵێی ڕاستەقینەی لە خزمەتی ئیماندا دەورووژێنێت. بەمەش ئیخلاسەكەی نامێنێت و

خاوێنیی بانگەوازەکەی، کە بۆ خوای گەورەیە، دەفەوتێت و، لە لایەن ئەهلی حەقیقەتیشەوە نەفرینی لێ دەکرێت و، لە ئەنجامدا سوود و بەرژەوەندییە ماددییەکانیشی لە دەست دەچێت!

بە هەر حاڵ، باسکردنی ئەم مەسەلەیە درێژە دەکێشێت و زۆر دەخایەنێت.

ئێستاش لە نێوان دوو نموونەدا، باسی ئەو شتانە دەکەم کە نهێنیی "ئیخلاس" زیاد دەکەن و درێژە بە یەکڕیزی و تەبایی ڕاستەقینەی نێوان برا ڕاستەکانم دەدەن:

○ *نموونەی یەکەم بۆ بەردەوامبوونی ئیخلاس:*

"بەشداریکردن لە ساماندا" دەستوورێکە ئەهلی دنیا بۆ بەدەستهێنانی سامانی زۆر و هێزی گەورە و توندوتۆڵ کردوویانە بە دەستوور و ڕێڕەوی خۆیان. تەنانەت هەندێ لەو کەسانەش کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا کاریگەرییان هەیە - وەك هەندێ کەسایەتی و کۆمەڵ و هەندێ لە سیاسییەکان - بە ڕێنمایی ئەم دەستوورە ڕەفتار دەکەن و هەنگاو دەنێن. لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ئەم دەستوورەشدا هێزێکی زۆریان دەست کەوتووە، هەرچەندەش هەندێ زیان و بواری بەکارهێنانی خراپیشی تێدایە.

بەپێی ئەم دەستوورە، هەریەکە لە بەشداران، بە بۆنەی بەشداریکردن و سەرپەرشتیی هەموو ماڵ و سامانەکەوە خۆی بە خاوەنی هەمووی دەزانێت، هەرچەندەش ناتوانێت سوود لە هەمووی ببینێت.

بەهەرحاڵ، ئەگەر بێت و ئەم دەستوورە لەو کارانەدا پیادە و جێبەجێ بکرێت کە سەر بە دوارۆژن و پاداشتیان لەو دنیادایە، ئەوا سوودێکی گەلێ زۆری دەبێت و هیچ زیانێکیشی لێ نابێتەوە، چونکە ئەو سامانە قیامەتییانە نهێنییەکی ئەوتۆیان تێدایە کە هەموو یەکێك لە بەشداران دەتوانێت ببێت بە خاوەنی سەرجەمی سامانەکە، بە بێ ئەوەی ئەو سامانە کەم ببێتەوە یان بەش بەش و لەت لەت ببێت!

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە تاکو لێی تێبگەین:

پێنج کەس لە داگیرساندنی چرایەکی نەوتدا بەشدارییان کرد و، هەریەکەیان کارێکی خرایە ئەستۆ: یەکێکیان هێنانی نەوت و، یەکێکی تر پلیتە و، سێهەم شووشەی چرا و، چوارەم هێنانی خودی چراکە و، پێنجەمیش شقارتە..

ئنجا کە چراکەیان داگیرساند، هەریەکەیان بوو بە خاوەنی چرایەکی تەواو (واتە: ڕووناکیی چراکە بۆ هەموویان یەکسانە) بە جۆرێك کە ئەگەر هەریەکەیان ئاوێنەیەکی

گەورەیان ببوایە و لە دیوارەکاندا هەڵبواسرایە، ئەوا هەرکەس لە ئاوێنەکەی خۆیدا چرایەکی تەواوی بەدی دەکرد، بە بێ هیچ کەم بوونەوە و لەت لەت بوونێك.

بەشداری کردنیش لەو کارانەی کە بۆ دوارۆژ دەکرێن، بەهۆی ئیخلاسەوە و، پشتگیری کردنی یەکتر بەهۆی برایەتی‌یەوە و، کار دابەشکردن بەهۆی یەکێتی‌یەوە، وەك ئەم نموونەیە وایە؛ چونکە کۆی کرداری بەشداران و ئەو نوورەی لێیەوە پەیدا بووە، بە بێ هیچ کەموکووڕی‌یەك، دەچێتە ناو دەفتەری کردەوەی هەموویانەوە. ئەمەش شتێکی واقیع و بینراوە لەناو ئەهلی حەقیقەتدا و، میهرەبانیی فراوان و بەخشایشی ڕەهای خوای گەورەش داخوازیەتی.

جا ئەی برایانم!

ئومێدەوارم کە بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەکان - پشت بەخوا - ئێوە بەرەو حەسوودی نەبەن. بەڵام لەوانەیە وەك هەندێ کەس لەناو تەریقەتە سۆفی‌یەکاندا خەڵەتان، ئێوەش وەك ئەوان بە بیانووی: دەستخستنی سوودی زیاتر بۆ دوارۆژ، بخەڵەتێن.

جا بۆ ئەوەی ئەمە ڕوو نەدات، ئەوا هەمیشە بیر لەوە بکەنەوە کە: پاداشتی تاکە کەسی و جوزئی لە کوێ و، ئەم پاداشتە گەورەیەش لە کوێ کە لە ئاسۆی بەشداری کردنی کردەوەکانەوە - وەك لە نموونەکەدا ڕوون کرایەوە - هەڵدێت و پەیدا دەبێت؟.. ئەو نوور و ڕووناکی‌یە کەمە لە کوێ و، ئەم نوور و ڕووناکی‌یە گەورەیەش لە کوێ؟!

○ *نموونەی دووهەم بۆ بەردەوامبوونی ئیخلاس:*

پیشەسازان بە هۆی پەیڕەوی کردنی دەستووری: "بەشداری کردن لە پیشە و کارامەیی‌دا" سامانێکی زۆر بەدەست دەهێنن. وەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

"دە" کەس لەوانەی کە خەریکی دروستکردنی دەرزیی دروومان بوون، بەرهەمی ڕۆژانەی کاری هەریەکەیان "سێ" دانە دەرزی بوو. پاشان ئەم دە کەسە بەپێی دەستووری: (یەکخستنی هەوڵ و دابەشکردنی کار) یەکیان گرت. یەکێکیان ئاگر و، یەکێکی تریان ئاسنی هێنا، سێ‌هەمیشیان دەستی دایە کونکردنی دەرزی‌یەکان و، یەکێکی تریان دەیخستنە ناو ئاگرەکەوە و، یەکێکی تریش تیژی دەکردنەوە و...هتد. بەو جۆرە کاتی کەسیان بە خۆڕایی نەڕۆشت و هەریەکەیان کاری خۆی گرتە ئەستۆ. لەبەر

ئەوەش کارەکەی ئاسان و کەم و، کارامەییشی تێدا پەیدا کردبوو، بە زوویی و خێرایی تەواوی دەکرد.

کاتێکیش لە کار بوونەوە و بەرهەمەکەیان دابەش کرد، هەریەکەیان لە بریی "سێ" دانە دەرزی "سێ سەد" دەرزیی بەرکەوت!

ئەم ڕووداوەش بوو بە سروودێك لەسەر زاری پیشەسازان و، کردیان بە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە هەوڵەکانیان یەك بخەن و کارەکانیش لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن.

برایانم!

مادەم لە بەرهەمی یەکێتی و یەکگرتن لە کاروباری دنیادا - کە چەند کاروبارێکی چڕ و ئەستوورن - سوودی ئاوا زۆر بێت، دەبێ لە هی کاروباری سەر بە دواڕۆژدا - کە چەند کاروبارێکی نوورانین - چۆن بێت؟ دەبێ ڕەنگدانەوەی پاداشتی ئەو کردەوانە لە ئاوێنەی هەریەکەیاندا، بە فەزڵی خوا، چەندە بێت؟ ئەو کردارانەی کە هەرگیز پێویستیان بە لەتکردن و دابەشبوون نییە؟

دەسا فەرموون بۆ خۆتان ئەمە لێکبدەنەوە.

دیارە نابێ هیچ کەسێك بە "حەسوودی" و "نەبوونی ئیخلاس" ئەم سوود و قازانجە زۆرانە لە دەستی خۆی دەربکات!

❖ **ڕێگری دووهەم لە ئیخلاس:**

ئەم ڕێگرە بریتییە لەوەی کە "خۆپەرستی"ی دەروونی بەدخواز چیی دەوێت و چاوەڕوانی چ پلە و پایەیەك دەکات، بیدرێتێ، تاکو خەڵکی بۆی بڕوانن! هەروەها بریتییە لە حەزکردن لەوەی خەڵکی ڕووی تێبکەن، بەهۆی حەزکردنەوە لە "ناوبانگ دەرکردن" کە ئەویش لە حەزکردنەوە لە "پلە و پایە" پەیدا دەبێت.

جا ئەم کارە، هەروەك دەردێکی ڕۆحیی دژوار و گرانە، دەرگایەکیشە لە ڕووی شیرکی پەنهان (واتە: ڕیاکاری و خۆپەسەندی) خراوەتە سەرپشت. کە ئەمانەش ئیخلاس لەناو دەبەن.

برایانم!

لەبەر ئەوەی ڕێبازی ئێمە لە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆزدا لەسەر بناغەی "ڕاستی" و "برایەتی" دامەزراوە..

مادەم نهێنیی برایەتیش لەوەدایە کە هەریەکە و کەسێتیی خۆی لە کەسێتیی براکەیدا بتوێنێتەوە و[1] ئەوان بەسەر نەفسی خۆیدا پێش بخات..

ئەوا نابێ ئەم جۆرە حەسوودییانە کارمان تێبکەن کە ئەنجامی حەزی مرۆڤن لە پلەوپایە و، بە تەواوەتی پێچەوانەی ڕێبازی ئێمەن. چونکە مادەم ڕێز و پایەی هەر برایەك دەگەڕێتەوە بۆ سەرجەمی برایانی، ئەوا نابێ لە پێناوی ناوبانگێکی جوزئی و سەربلندییەکی کەسیدا، کە لە حەسوودی و خۆپەرستییەوە سەرچاوەی گرتبێت، قوربانی بە پایەی بەرز و ڕێز و ئابڕووی مەعنەویی کۆمەڵ بدرێت. من لەو هیوا و باوەڕەدام کە ئەو ڕەفتارە تابڵێی لە قوتابییانی نوورەوە دوورە.

بەڵێ، "دڵ" و "ژیری" و "گیان"ی قوتابییانی نوور دانابەزنە ئاستی ئەم کاروبارە نزمانە. بەڵام دەبێ بزانین کە هەرچی کەسە "دەروونێکی بەدخواز"ی هەیە! کاتی وا دەبێت چەند هاندەرێکی دەروونی بەدخواز بەناو ڕەگ و دەمارەکانیدا دەڕۆن و خۆیانی پێدا هەڵدەواسن و، هەندێ لە بڕیارەکانی خۆیانی تێدا دەسەپێنن، هەرچەندە (دڵ و ژیری و گیان)یش ئامادە بن و لەکار نەکەوتبن!

جا لەبەر ئەوەی پەیامەکانی نوور کاریگەریی ئەوتۆ لە ئێوەدا بەجێ دەهێڵن کە دڵ و ژیری و گیانتان پاك دەکەنەوە، ئەوا (دڵ و ژیری و گیان)ی ئێوە تاوانبار ناکەم. بەڵام (نەفس و هەوا و ئارەزوو) هەردەم مرۆڤ لە خشتە دەبەن! هەر لەبەر ئەوەشە کە هەندێ جار بە توندی بێدار دەکرێنەوە. ئەو توندوتیژییەش تەنها ئاراستەی (نەفس و وەهم و هەوا و ئارەزوو) دەکرێت. جا ئێوەش هەمیشە ئاگاداری خۆتان بن.

بەڵێ، ئەگەر ڕێبازمان تەریقەتێکی تایبەتی یان شێخایەتی بوایە، ئەوا "یەك پلە" یان "چەند پلەیەك" لەئارادا دەبوو، ئەو کاتەش چەندین کەس بۆ تەنها یەك پلە دەپاڵێوران و، ڕێگای ئەوەش دەبوو کە حەسوودی و خۆپەرستیی نەفس پەیدا ببوایە. بەڵام ئێمە ڕێبازمان هەر تەنها برایەتییە. کەواتە برا خۆی بە باوکی برا لە قەڵەم نادات و لە ئاستی براکەیدا کاڵای مورشیدانە لەبەر ناکات و خۆی بە ڕابەری دانانێت. ئەمەش دەری دەخات کە "پلەی برایەتی" پلەیەکی گەلێ فراوانە و جێی غیبتە و حەسوودیی

---

(١) بەڵێ، بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لەبەر برایانی واز لە خۆی بهێنێت و، خۆپەرستییەکەی - کە وەك قاڵبە سەهۆڵێك وایە - لەو حەوزە گەورە و بەلەزەتەدا بتوێنێتەوە کە لە کەوسەری قورئانی پیرۆزەوە پڕ بووە، بۆ ئەوەی لە ئاوی حەوزی کەوسەری دەست بکەوێت! (دانەر)

تێدا نابێتەوە. تەنها ئەوەندە نەبێ کە هەریەکە پشتگیر و یارمەتیدەر و تەواوکەری براکانی تریەتی.

یەکێك لەو بەڵگانەی کە دەری دەخەن ئەو ڕێبازانەی باوکێتی و ڕابەرایەتی و مامۆستاییی‌یان تێدایە، بەرهەمی ترسناك و لەناودەریان دەبێت، بە بۆنەی ئەو مونافەسە و حەسوویی‌یەی کە لە هەوڵدانەوە بۆ پاداشت و لە هیممەتبەرزی‌یەوە دروست دەبێت..

یەکێك لەو بەڵگانە، ئەو دووبەرەکی و ئیختیلافانەیە کە لە نێوان سوودە زۆر و گەورەکانی خاوەن تەریقەتەکاندا هەن. کە ئەم دووبەرەکی و ئیختیلافانەش بەرەو چەندین ئەنجامی ناهەمواری بردوون و هەرچی هێزی بەرز و گەورەیان هەیە بە چەشنێك لاواز بووە کە لە بەردەم گەردەلوولی "بیدعەت"دا خۆی بۆ ڕاگیر ناکرێت!

❖ **ڕێگری سێهەم لە ئیخلاس:**

ئەم ڕێگرە بریتی‌یە لە "ترس و تەماع".

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێگرە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی پەیامی "شەش هێرشەکان"[1] دەکەین. چونکە لەوێ ئەو ڕێگرە و چەند ڕێگرێکی ترمان ڕوون کردووەتەوە.

لە خواوەندی بەخشندە و میهرەبان دەپاڕێینەوە و سەرجەمی ناوە جوانەکانی خۆیشی دەکەین بە تکاکار و شەفاعەتخوازی نزاکەمان کە یارمەتیمان بدات بۆ بەدەستهێنانی "ئیخلاسی تەواوەتی".

"اللهم بحق سورة الإخلاص اجعلنا من عبادك الْمُخلِصين الْمُخلَصين". آمین.

**﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.**

* * *

---

(١) "شەش هێرشەکان" بەشی شەشەمی مەکتووبی بیست و نۆهەمە و پەیامێکی گەلێ بەنرخە و تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات کە دەفەرموێ: **﴿وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾**(هود:١١٣). ئەمەش لە شەش فرتوفێڵی شەیتاندا دەردەخات کە ئەمانەن:

١- حەزی ناوبانگ دەرکردن. ٢- ترس. ٣- تەماع. ٤- وورووژاندنی دەمارگیری. ٥- بە زانیاری نازین. ٦- وەرگرتنی پلەوپایە و خۆ نوقم کردن لە کاروبارەکانی‌دا. (وەرگێڕ)

## نامەیەکی تایبەت بۆ هەندێ لە برایانم

وا لێرەدا سەرنجێکی وردی دوو فەرموودەی پیرۆز بۆ ئەو برایانە باس دەکەین کە لە نووسینەوەی پەیامەکانی نوور بێزار دەبن و، بۆ ئەوانەش کە لەم سێ مانگەی خواپەرستی‌دا فەزڵی خوێندنی ویردەکانیان بەسەر نووسینەوەی پەیامەکانی نووردا دەدەن، کە خۆی لە خۆی‌دا و لە پێنج ڕووەوە بە عیبادەت دەژمێررێت[1]:

فەرموودەی یەکەم: "يوزَنُ مدادُ العلماء بدم الشهداء"[2] أو كما قال.

واتە: ئەو مەرەکەبەی کە زانایانی زانستی حەقیقەت بەکاری دەهێنن، لە قیامەتدا لەگەڵ خوێنی شەهیداندا پێکەوە کێشانە دەکرێن و هاوسەنگی یەکتر دەبن.

فەرموودەی دووهەم: "مَنْ تَمَسَّكَ بسنتي عند فساد أمتي فله أجرُ مِئَةِ شـــــهيد"[3] أو كما قال.

واتە: هەر کەسێك لە کاتی پەرەسەندنی بیدعەتەکان و زاڵبوونی گومڕایی‌دا دەست بە سوننەتی پیرۆز و ڕاستی‌یەکانی قورئانەوە بگرێت، پاداشتی سەد "شەهید"ی بۆ دەنووسرێت.

---

(١) لە بارەی ئەم پێنج جۆرە پەرستشەی کە لەم نامە بەنرخەدا ئاماژەی بۆ کردووە پرسیارمان لە مامۆستا کرد. وا لە خوارەوەدا ڕوونکردنەوەکەی خۆی دەنووسین:

١ - نووسینەوەی پەیامەکان جیهادی هەرەگرنگی مەعنەوین لە بەرامبەر گومڕایانەوە.

٢ - ئەو کەسەی کە دەیاننووسێتەوە، خزمەتی مامۆستاکەی دەکات و لە بڵاوکردنەوەی "حەقیقەت"یشدا یارمەتیی دەدات.

٣ - لە ڕووی ئیمانەوە خزمەتێکە بۆ هەموو موسڵمانان.

٤ - بەدەستهێنانی زانستە لە ڕێی نووسینەوەیانەوە.

٥ - عیبادەتێکی فیکریی ئەوتۆیە کە لەوانەیە ماوەی یەك سەعاتی وەك یەك ساڵ پەرستش پاداشتی بۆ بنووسرێت. (ڕوشدی، خەسرەو، ڕەئفەت)

(٢) نص الحديث: (يوزن يوم القيامة مداد العلماء ودم الشهداء، فيرجح مداد العلماء على دم الشهداء). رواه الشيرازي في كتاب الألقاب عن أنس والموهبي في فضل العلم عن عمران بن حصين وابن الجوزي في كتـــاب العلل عن النعمان بن بشير . قال المناوي في فيض القدير (٦/٤٦٦) أسانيده ضعيفة لكن يقوي بعضها بعضاً وذكره العجلوني في كشف الخفاء (٢/٥٦١) وأورده الغزالي في الإحياء في كتاب العلم. قال العراقي: ســنده ضعيف. وانظر السيوطي في الجامع الصغير (١٠٠٢٦) وتمييز الطيب ص٢٠١ وضعيف الجامع الصغير برقـــم ٦٤٦٤.

(٣) تەخریجەکەی لە لاپەڕە (١٠٠)دا ڕابورد. (وەرگێڕ)

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە – لەبەر نواندنی تەمبەڵی – لە نووسینەوە بێزار دەبێت و، ئەی ئەو برایانەش کە ڕووکاری تەسەووف دەگرنەبەر!

پوختەی واتاکانی هەردوو فەرموودە پیرۆزەکە ئەوەیە کە:

کێشی درهەمێك لەو ڕووناکی‌یە ڕەش و ئاوی ژیانەی لە قەڵەمە خاوێن و پیرۆزەکانی ئەو کەسانەوە دێتەدەرەوە کە لەم چەشنە بارودۆخەدا خزمەتی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و نهێنی‌یەکانی شەریعەت و سوننەتی پیرۆز دەکەن، دەگونجێ لە ڕۆژی حەشردا بەوێنەی کێشی سەد درهەم لە خوێنی شەهیدان سوودی بۆ خاوەنەکەی تێدا بێت.

دەسا برایانم! هەوڵ بدەن ئەم پاداشتە گەورەیەتان دەست بکەوێت.

**ئەگەر دەڵێن:**

ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە "زانا"یە. کەچی بەشێکی ئێمە تەنها چەند کەسێکی نووسەرەوەیە و زیاتر نی‌یە؟

**وەڵام:**

ئەو کەسەی بۆ ماوەی ساڵێك ئەم پەیام و دەرسانە دەخوێنێتەوە و لێیان تێدەگات و قبووڵیان دەکات، دەگونجێ لەم ڕۆژگارەدا ببێت بە زانایەکی گرنگی خاوەن حەقیقەت. خۆ ئەگەر بیانخوێنێتەوە و لێیان تێنەگات ئەوا خۆ قوتابییانی نوور – کە دارای کەسایەتی‌یەکی مەعنەوین – بێ هیچ گومانێك یەکێکە لە زانایانی ئەم زەمان و ڕۆژگارە. لەبەر ئەوە، قەڵەمەکانی ئێوەش پەنجەکانی ئەو کەسایەتی‌یە مەعنەوی‌یەی حەقیقەتن.

وا دابنێ ئێوە پەیوەندیتان بەم هەژارەوە کردووە و بە خۆش باوەڕی و گومانی باشتان پلەی زانا و مامۆستاتان پێ ڕەوا بینیوە، هەرچەندەش من شایانی ئەو پلەیە نیم، بەڵام لەبەر ئەوەی نەخوێندەوارم[1] و بە تەواوی ناتوانم بنووسم، ئەوا قەڵەمەکانی ئێوە بە قەڵەمی من دادەنرێن و، ئیتر ئەو پاداشتەتان دەدرێتەوە کە لە فەرموودە پیرۆزەکەدا ڕوون کراوەتەوە.

**سەعیدی نوورسی**

(١) مەبەستی دانەر ناخۆشیی خەتەکەیەتی. (وەرگێڕ)

# بریسکەی بیست و دووهەم

باسمه سبحانه

**ئەم پەیامە بچووکەی کە بیست و دوو ساڵ پێش ئێستا لە ناحیەی "بارلا"ی سەر بە پارێزگای "ئیسپارتە"دا نووسیومە، نامیلکەیەکی تایبەتە بە دڵسۆزترین و تایبەتترین برا خۆشەویستەکانمەوە و، بەوپەڕی نهێنی و پەنامەکی نووسراوە. بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندیی بە خەڵکی ئیسپارتە و بەرپرسانیەوە هەیە، ئەوا پێشکەشی پارێزگارە دادگەرەکەی و بەرپرسانی فەرمانگەکانی "داد" و "ئاسایش"ی دەکەم. خۆ ئەگەر ڕا هاتە سەر ئەوەش کە شایانی چاپکردن بێت، با بە ئامێری چاپی دەستی چەند دانەیەکی بە پیتی کۆن یان نوێ لێ چاپ بکرێت، هەتا ئەو چاودێر و نهێنگرانەی کە ماوەی بیست و پێنج ساڵە بە دوای نهێنییەکانمدا دەگەڕێن بزانن کە ئێمە هیچ شتێکی نهێنی و پەنامەکیمان نییە و، شارراوەترینی نهێنییەکانمان ئەم پەیامەیە!**

**سەعیدی نوورسی**

## سێ ئاماژەکان

ئەم پەیامە لە بنەڕەتدا مەسەلەی سێهەمی یادخەرەوەی حەڤدەهەمی بریسکەی حەڤدەهەم بوو. بەڵام هێز و شموولییەتی پرسیارەکانی و، ڕوونی و ڕاستیی وەڵامەکانی کردنیان بە بریسکەی بیست و دووهەمی مەکتووبی سی و یەکەم و، بەم پێیە ڕۆشتە ناو کۆمەڵە پەیامی "بریسکەکان"ەوە و ئاوێتەی بوو. دەبێ "بریسکەکان"یش جێی بۆ بکاتەوە، چونکە نامیلکەیەکی نهێنییە و، بۆ تایبەتمەندترین و دڵسۆزترین و ڕاستترین برا ئازیزەکانمان نووسیومانە.

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

﴿وَمَن يَتوكّل على الله فهو حَسْبُه إنّ الله بالغُ أمْره قَدْ جَعَلَ اللهُ لكلّ شيءٍ قدْراً﴾

(الطلاق:٣)

**ئەم مەسەلەیە بریتی‌یە لە سێ ئاماژە**

**❑ ئاماژەی یەکەم:**

پرسیارێکی گرنگە کە تایبەتە بە خۆم و پەیامەکانی نوورەوە و، زۆر کەس دەیکات:

ئایا بۆچی ئەهلی دنیا هەرکات دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت خۆیان لە کاروباری قیامەتیی تۆدا هەڵدەقورتێنن، لە کاتێکدا کە تۆ دەست لە ئیشوکاری دنیای ئەوان وەرنادەیت؟ خۆ یاسای هیچ حکوومەتێك دەست ناخاتە ناو کاری ئەو کەسانەی کە وازیان لە دنیا و لە خەڵکی هێناوە و بە گۆشەگیری دەژین؟!

**وەڵام:**

وەڵامی "سەعیدی نوێ" بۆ ئەم پرسیارە: بێدەنگی‌یە. چونکە دەڵێت: با "قەدەری خوای گەورە" لە بریی من وەڵام بداتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە عەقڵی "سەعیدی کۆن" - کە ناچار بوو بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بیخوازێت - دەڵێت: حکوومەت و خەڵکی پارێزگای "ئیسپارتە" وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەنەوە، چونکە خەڵکی ئەم شارە و بەرپرسانی لە من زیاتر پەیوەندی‌یان بە ناوەرۆکی ئەم پرسیارەوە هەیە.

جا مادەم حکوومەتێك کە بەرپرسەکانی لە هەزاران تێپەڕ دەبن و دانیشتووانیشی لە سەدان هەزار کەس زیاترن، ناچارن بیر لەم وەڵامە بکەنەوە و لە بریی من بەرگریم لێ بکەن، ئیتر بۆچی من بە خۆڕایی و بێسوود لەگەڵ ئەو موددەعی‌یانە بدوێم و بەرگری لە خۆم بکەم؟

ئەوەتا وا نۆ ساڵە من لەم پارێزگایەدام و، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پشت لە دنیای ئەوان هەڵدەکەم و، هیچ حاڵ و بار و دۆخێکم نی‌یە لەوان پەنهان و شارراوە بێت، تەنانەت تایبەت‌ترین و نهێنی‌ترینی پەیامەکانم لە بەردەستی بەرپرسانی دەوڵەت و چەندین ئەندامی پەرلەماندایە. خۆ ئەگەر هەر دەست تێوەردانێك یان هەر هەوڵێکم بۆ لێڵ کردن و

تێکدانی دنیای ئەوان بدایە، تەنانەت هەر بیریشم لــێ بکردایەتەوە، ئەوا بەرپرسانی ئەم پارێزگــا و قەزایــە لێــم بــێدەنگ نــەدەبوون. چونکــە وا مــاوەی نــۆ ســاڵە چــاودێر و جاسووسیان بەسەرمەوە دانـاوە و ئاگـاداری هـەموو هەڵسوکەوتێکمن. ئەمە سـەرەڕای ئەوەی کە من بێ هیــچ دوودڵیـیەك گشـت نهێنییـەکانی خـۆم لای هـەموو ئـەو کەسانە دەدرکێنم کە دێن بۆ لام و سەردانم دەکەن!

جـا ئەگـەر مـن لـەم ماوەیـەدا کـارێکم ئـەنجام دابێـت زیـان بـە بەختــەوەریی نەتــەوە و ئاسایش و دوارۆژی نیشتمان بگەیـەنێت، ئـەوا یەکـەم بـەرپرس لـەو کردەوەیـەم هــەموو یەکێکی کاربەدەستانی ماوەی ئەم نۆ ساڵەی حکوومەتە، هەر لە پارێزگــارەوە تـا دەگاتـە بچووکترین کارمەندی پاسگای گوندەکە.

کەواتە لە ڕاسـتیدا ئەرکی بەرگـری کردن لـە من لـە ئەستۆی هـەموو ئەوانەدایـە و، دەبێ ئەو شتەی کە لەسەر من بە گەورە لە قەڵەم دراوە، ئەوان دەری بخەن کـە بـەو جـۆرە نییە، تاکو خۆیان لە ئەنجامی "بەرپرسیاری" دەرباز بکەن. لەبـەر ئـەوە، مـن وەڵامـی ئـەم پرسیارە بەوان دەسپێرم.

سەبارەت بەوەش کە چی وا لە هاووڵاتییان و دانیشتووانی ئەم پارێزگایە دەکـات لـە خۆم زیاتر بەرگری لە من بکەن، ئەوەیە کە:

وا نۆ ساڵە ئەو سـەدان پەیامانـەی کـە بـۆ بڵاوکردنـەوەیان تێدەکۆشـین، کاریگـەریی خۆیـان لـەم گەلـە دۆسـت و پیرۆز و خاوێنـەدا چەسپاندووە و، جــێ دەسـتی مـاددی و بـەرچاویان لـە ژیـانی هەتاهـەتایی ئـەوان و پشتگیریی هێزی ئیمانەکـەیان و بەختــەوەریی هەمیشەییباندا دەرخستووە، بێ ئەوەی کەسێك گرفتاری هیــچ جۆرە خراپەیـەك بکـەن، یان هیچ پشێوی و ئاڵۆزییەك بنێنەوە. چونکە هیچ جۆرە شتێکی ئەوتۆیان لــێ نـەبینراوە کە ئاماژە بۆ هیــچ چەشـنە ئامـانجێکی سیاسـی، یـان بەرژەوەندییەکی دنیـایی بکـەن. بـە ڕادەیەك کە سوپاس بۆ خوا ئەم پارێزگـای ئیسپارتەیە، بـەهۆی پەیامـەکانی نـوورەوە، لـە ڕووی هـێزی ئیمـان و توندوتۆڵـی و دامـەزراویی ئایینــەوە لــە جــۆری ئـەو بەرەکەتـەی بەدەسـت هێنـاوە کـە وڵاتـی خـاوێنی "شـام" لـە ڕابـوردوودا بەدەسـتی هێنـا و، مزگـەوتی "ئەزهەر"یش - کە قوتابخانەی سەرانسەری جیهانی ئیسلامییە - پێی بەهرەمەند بووە.

کەواتە ئەم پارێزگایە فەزڵ و تایبەتکارییەکی بەسەر پارێزگاکانی تردا هەیە، چونکـە لـە پەیامەکانی نـوورەوە فێری دەستگرتن بـوو بـە داوێنـی ئایینـەوە. بۆیـە لـەم پارێزگایـەدا هێزی ئیمان لە بەرامبەر پشـتگوێ خسـتنی ئایینـەوە پـەرەی سـەندووە و حـەزکردنیش لـە

خواپەرستی بەسەر هەرزەیی و نەفامیدا زاڵ بووە. لەبەر هەمووی ئەمانە، سەرجەمی خەڵکی ئەم پارێزگایە - تەنانەت ئەگەر کەسانی مولحیدیشیان تێدا بێت - ناچارن بەرگری لە من و پەیامەکانی نوور بکەن.

بەم چەشنە، ئەو مافە جوزئی‌یەی کە من هەمە لە بواری بەرگری کردندا لە خۆم، کە لە نێوان چەندین مافی بەرگری کردنی گرنگ و بایەخداری تا ئەم ڕادەیەدایە، هەرگیز وام لێ ناکات کە خۆم بەرگری لە خۆم بکەم. بە تایبەت کە ئێستا من - سوپاس بۆ خوا - ئەرکی سەرشانم تەواو کردووە و، لە بریی منی هەزاری دەستەوسان هەزاران قوتابی لە پێناوی ئەم ئەرکەدا تێدەکۆشن. جا هەرکەسێك - بەم جۆرە - هەزاران وەکیل و پارێزەری لە کێشەیەکدا بێت، هەرگیز خۆی بەرگری لە خۆی ناکات.

❑ **ئاماژەی دووهەم:**

وەڵامی پرسیارێکی ڕەخنە ئامێزە!

لە لایەن ئەهلی دنیاوە دەوترێت:

بۆچی لێمان بێزار بوویت و بێدەنگ دانیشتوویت و تەنانەت یەك جاریش سەرمان لێ نادەیت، پاشان سکاڵایەکی توندیشمان لەدەست دەکەیت و دەڵێیت: "ئێوە ستەمم لێ دەکەن"؟!

خۆ ئێمە خاوەنی مەبدەئین و یاسا و دەستووری تایبەتیی خۆمان هەیە کە لە ڕووناکیی ئەو دەستوورانەدا و بەپێی داخوازی‌یەکانی چەرخ و سەردەم هەنگاو دەنێین. بەڵام تۆ ئەم دەستوورانە لە خۆتدا جێبەجێ ناکەیت و پشتگوێیان دەخەیت. ئاشکرایشە ئەو کەسەی کە یاسا جێبەجێ بکات ستەمکار نی‌یە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو کەسەی کە پشتگوێی دەخات و جێبەجێی ناکات بە یاخی لە قەڵەم دەدرێت!

لەم سەردەمەی ئێمەدا کە چەرخی سەربەستی‌یە و، لە سەردەمی ئەم ڕژێمە کۆماری‌یانەدا کە ئێمەش تازەکی دەستمان داوەتێ، دەستووری خۆسەپاندنی زۆرەملێ بەسەر خەڵکدا بەلاوە نراوە، چونکە "یەکسانی" یاسایەکی بنەڕەتی‌یە بەلامانەوە. کەچی تۆ دەچیت جارێك بە پۆشینی پۆشاکی زانست و جارێکی تر بە خۆپیشاندانت وەك "زاهید"ێك سەرنج و ڕووتێکردنی خەڵکی بۆ لای خۆت ڕادەکێشیت و، دەتەوێت لە دەرەوەی بازنەی دەستەڵاتی دەوڵەتدا هێزێك بەدەست بهێنیت و پلە و پایەیەك بۆ خۆت دەستەبەر بکەیت..

بەڵێ، ڕواڵەتی گوزەرانت و بەسەرهاتی ژیانی پێشووت وا لە مرۆڤ دەگەیەنن.

لەوانەیە ئەم حاڵەی تۆ لە چوارچێوەی خۆسەپاندنی بۆرژووازی‌یەکاندا بـە کـارێکی باش لە قەڵەم بدرێت، بەڵام بێداربوونەوە و سەرکەوتنی چینـی عـەوام لای ئێمـە کـارێکی کردووە کە یاسا و دەستوورەکانی سۆسیالیستی و بەلشەفیك زاڵ ببێـت، کـە لـە هـەموو شتێکی تر بۆ ئێمە گونجاوترە. لەبەر ئەوە، ئێمە کە دەستوورەکانی سۆسیالیزممان پەسـەند کردووە، بێز لە باری ژیانی تـۆ دەکەینـەوە کـە پێچەوانـەی مەبدەئـەکانی ئێمـەن. کەواتـە مافی ئەوەت نی‌یە لێمان بێزار ببیت و سکاڵامان لەدەست بکەیت!

**وەڵام:**

هـەر کەسـێك لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی‌دا ڕێگایـەك لـێ بـدات و بزووتنەوەیـەك دابمـەزرێنێت، ئەگـەر ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتەکانی لەگـەڵ ئـەو یاسـا سروشـتی‌یانەدا یەکاویـەك نـەبن کـە حوکمـی گـەردوون دەکـەن، هـەرگیز لـە کاروبـاری "خـێر"دا سەرکەوتن بەدەسـت نـاهێنێت و هـەوڵ و کۆششەکانیشی هیـچ بەرهـەمێکیان نـابێت، بەڵکو ئەنجامی هەموو کارەکانی لە خزمەتی کاولکاری و "شەڕ" و خراپەدا دەبێت!!

جا مادەم یەکاویەکبوون و خۆگونجاندن لەگەڵ یاسای سروشتی گەردووندا شـتێکی پێویستە، ئـەوا جێبەجێ کردنی یاسای: "یەکسـانیی ڕەهـا" هـەرگیز لـە توانـادا نی‌یـە، مەگەر بە گۆڕینی سروشـتی مرۆڤ و لابردنـی حیکمـەتی بنـەڕەتیی بەدیـهێنانی ڕەگـەزی مرۆڤایەتی!

بەڵێ، من بە ڕەچەڵەك و لە ڕووی جۆری گوزەرانەوە لە چینـی عـەوامم و، لـە ڕووی بیر و مەشرەبیشمەوە بـە یەکسـانیی مافـەکان ڕازیـم و، هـەر لـە مێژە هـەوڵی ڕەفزکردنـی خۆسەپاندنی چینی تایبەتمەندانم داوە کە پێیان دەوترێت بۆرژووازی‌یەکان. ئەمـەش بـەپێی داخوازیی ئەو میهرەبانی و دادگەری‌یەی کە لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە.

لەبـەر ئـەوە، مـن بـە هـەموو هێزێکمـەوە لەگـەڵ "دادگـەریی تـەواوەتی"دام و دژی خۆسەپاندنی ستەمکاریم..

بـەڵام سروشـت و حیکمـەتی بەدیـهێنانی مـرۆڤ پێچەوانـەی یاسـای: "یەکسـانیی ڕەها"ن! چونکە ئەو بەدیهێنەرە دانایەی کە لە شـتێکی کـەم گەلـێ داهـاتی زۆر بەرهـەم دەهێنێت و، لەناو تەنها یەك لاپەڕەدا چەندین کتێبی زۆر دەنووسێت و، چـەندین ئـەرکی زۆریش لە کۆڵی تەنها یەك شت دەنێت و چـەندەها کـاری پێ جێبـەجێ دەکـات.. ئەو بەدیهێنەرە دانایە، کاروباری هەزاران "جۆر" و ڕەگەزی شتانی تری لـە ئەستۆی گـرۆی مرۆڤ ناوە و بە "ڕەگەز"ی مرۆڤ جێبەجێیان دەکات. ئەمەش بۆ مەبەستی دەرخستنی توانستی کامڵ و دانستی تەواوەتیی خۆی.

جا لەبەر ئەو دانستە مەزنە، خواوەند مرۆڤی لەسەر سروشتێکی گشتی و هەمەکیی ئەوتۆ بەدی هێناوە کە دەتوانێت گوڵەگەنمی هەزاران "جۆر"ی بەدیهاتووی تر بەرهەم بهێنێت و، بە ئەندازەی ژمارەی ڕەگەز و "جۆر"ەکانی تریش بەروبووم ببەخشێت. چونکە خواوەند هێز و هەست و نەستەکانی مرۆڤی - وەك هی ئاژەڵ - لە سنوورێکدا ڕانەگرتووە، بەڵکو بە ڕەهایی و کراوەیی دەرگای لێ خستوونەتە سەرپشت و توانا و لێهاتنێکی داوەتێ کە بتوانێت گەشت و گەڕان بەناو چەندین پلە و مەقامی لەژمارەبەدەردا بکات. کەواتە مرۆڤ هەرچەند لە ڕووی "جۆر"ەوە بە یەك "جۆر" و ڕەگەز دادەنرێت، کەچی لە حوکمی هەزاران "جۆر"دایە.

ئالێرەوەیە کە مرۆڤ وەك: جێنشینی زەوی و.. ئاکام و پوختەی گەردوون و.. پادشای زیندەوەران، دانراوە و حسابی بۆ کراوە.

بەم جۆرە، گرنگترین هەڵسووڕێنەر و مەزنترین هەوێنی جۆراوجۆریی ڕەگەزی مرۆڤ بریتییە لە: پێشبڕکێ کردنی بۆ بەدەستهێنانی ئەو فەزیلەت و چاکەیەی کە بە هەوێنی ئیمانی ڕاستەقینە شێلراوە. کەواتە مەگەر بە گۆڕینی "ماهییەتی مرۆڤ" و کوژاندنەوەی چرای "ژیری" و کوشتنی "دڵ" و لەناوبردنی "گیان"، دەنا هەرگیز ناتوانرێت فەزیلەت و چاکەکاری لەناو گرۆی مرۆڤدا هەڵبگیرێت و لەناو ببرێت!

(بە ستەم و زۆرداری ناتوانیت "سەربەستی" بسڕیتەوە..
گەر دەتوانیت "هەست و پەی بردن" لە مرۆڤایەتی بسێنەرەوە)!

ئەم وتە بەهێز و توندوتۆڵە، بە هەڵە، لە ڕووی پیاوێکی خاوەن پایەدا وترا کە ئەم چەشنە زللەیە شایانی ئەو نەبوو. بەڵکو ئەم وتەیە شایستەی ئەوەیە کە بە وێنەی زللەیەك لە سەروگوێلاکی ڕووی غەدداری ئەم چەرخە بدرێت کە لە ژێر پەردەی "سەربەستی"دا ستەمێکی سامناکی لە خۆیدا هەڵگرتووە!

جا من، لە بریی ئەم وتەیە، دەڵێم:

(بە ستەم و زۆرداری ناتوانیت "حەقیقەت" بسڕیتەوە..
گەر دەتوانیت "دڵ" لە مرۆڤایەتی بسێنەرەوە)!

یان:

(بە ستەم و زۆرداری "فەزیلەت" ناسڕرێتەوە..
گەر دەتوانیت "ویژدان" لە مرۆڤایەتی بسێنەرەوە)!

بەڵێ، ئەو چاکە و فەزیلەتەی کە ئاوێتەی ئیمانە، هەروەك نابێتە هۆی زۆرەملێ کردن، بە هەمان جۆر ناشبێتە هۆکارێك بۆ ستەمکاری. چونکە زۆرەملێ و زۆرداری و

خۆسەپاندن، وەك ئاشکرایە، خراپە و ڕەزیلەتن! تەنانەت گرنگترین مەشرەب بە لای ڕێرەوانی ڕێی فەزیلەتەوە بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ بە "دەستەوسانی" و "هەژاری" و "خۆنەویستی"یەوە لە ناو کۆمەڵدا بژی و بتوێتەوە. خۆ من - سوپاس بۆ خوا - ژیانی پێشین و ئێستاشم بەپێی ئەم مەشرەبە بەسەر بردووە. کەواتە من هەرگیز لە ڕووی شانازی کردنەوە ناڵێم: خاوەنی چاکە و فەزیلەتم. بەڵکو لە ڕووی باسکردنی نیعمەتی خواوەند و شوکرانەبژێری‌یەوە دەڵێم:

خوای گەورە بە فەزڵ و بەخشایشی خۆی چاکەی لەگەڵدا کردووم و لە کارکردندا بۆ زانستەکانی ئیمان و قورئان و لە تێگەیشتنیشیاندا یارمەتیی داوم. منیش - سوپاس بۆ خوا - بە درێژایی ژیانم ئەم چاکەیەی خواوەندم - بە پشتیوانیی خۆی - لە بەرژەوەندی و لە پێناوی بەختەوەریی ئەم نەتەوە موسڵمانەدا بەکارهێناوە و، هیچ کاتێك نەمکردووە بە هۆکارێکی زۆرەملێ کردن لە خەڵکی و خۆسەپاندن بە سەریاندا. هەروەك من - لەسەر بناغەی نهێنی‌یەکی گرنگ - بە نەفرەتەوە لە ڕووتێکردنی خەڵکی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و نیازباشی‌یان هەڵدێم، کە بە لای بێ‌ئاگایانەوە کارێکی باشە و حەزیان لێ‌یەتی، چونکە ئەم جۆرە شتانە بیست ساڵیان لە تەمەنی پێشووی من بە زایە داوە! بۆیە سەبارەت بە خۆمەوە بە چەند شتێکی زیانبەخشیان دادەنێم. بەڵام سەبارەت بە "پەیامەکانی نوور"ەوە، بە دوو نیشانەی ڕووتێکردنی خەڵکی‌یان دەزانم لەو پەیامانە. بۆیە لەو ڕووەوە دڵیان ناڕەنجێنم.

**کەواتە ئەی ئەهلی دنیا!**

لە کاتێکدا کە من هەرگیزاو هەرگیز خۆم لە کاروباری دنیای ئێوەدا هەڵناقورتێنم و لە هیچ ڕوویەکەوە پەیوەندیم بە بیر و ڕا و مەبدەئەکانی ئێوەوە نی‌یە و، هەر نیازیشم نی‌یە جارێکی تر تێکەڵی دنیا ببمەوە، تەنانەت هەر حەزیشم لێی نی‌یە، وەك ژیانی ئەم نۆ ساڵی دیلی و ڕەهەندەیی‌یەم شایەتیم بۆ دەدا. ئیتر بۆچی بە وێنەی ستەمکارێکی دێرینی ئەوتۆ بۆم دەڕوانن کە نیازی خۆسەپاندنی لە خۆدا حەشاردابێت و بە دوای هەل و دەرفەتدا بگەڕێت؟! بە چ یاسایەك و لەبەر چ بەرژەوەندی‌یەك تا ئەم ڕادەیە چاودێرم لەسەر دادەنێن و ئازارم دەدەن و گیروگرفتم دەهێننە ڕێ؟! خۆ لە هەموو جیهاندا حکوومەتێك نی‌یە کە لە سەرووی یاساوە کار بکات و بوار بەم ڕەفتار و مامەڵە سەختە بدات کە لەگەڵ مندا دەکرێت، هەروەك هیچ کەسێکیش پێی ڕازی نابێت!

ئەم مامەڵە و ڕەفتارە خراپەی کە ئێوە لەگەڵ مندا دەیکەن، نەك هەر ڕق و بێزاری لە مندا دروست دەکات، بەڵکو ڕقی بوونەوەرانیش دەورووژێنێت!

**❑ ئاماژەی سێههم:**

پرسیارێكه لـه ڕووی گـهوجی و نهفامی‌یـهوه دهكرێـت و، خـهڵكیی پـێ بـه هەڵـهدا دەبرێت:

هەندێ كەس لە كارمەندانی دەوڵەت و كەسانی حوكمڕان، دەڵێن:

مادەم تۆ لەم وڵاتەدا دەژییت، دەبێ مل بۆ یاساكانی كۆماری كەچ بكـەیت، كـە لـەم وڵاتـەدا دەردەچـن. كەواتـە بۆچـی لـە ژێـر پـەردەی گۆشـەگیریدا خـۆت لـە جێبـەجێ كردنی ئەو یاسایانە قوتار دەكەیت؟

بۆ نموونە: ئەو كەسـەی لـە دەرەوەی كارمـەندیی دەوڵـەتدا فـەرمان بەسـەر خـەڵكیدا دەدات و، فەزیلـەت و تایبەتكاریـیەك بـۆ خـۆی ڕەوا دەبینێـت، كـارێكی پێچەوانـەی یاسای حكوومەتی ئێستا و دەستووری كۆماری دەكات كـە لەسـەر بناغـەی "یەكسـانی" دامەزراوە. كەواتە بۆچی تۆ سیفەتێك دەگریتـە خـۆ كـە هـی كەسێكە بیـەوێت سـەرنجی لـێڕازیبوونی خەڵكی بۆ لای خۆی ڕابكێشێت، وەك بڵێی بیەوێت خـەڵكی ملكـەچ و گوێڕایەڵی بن و، كارێك دەكەیت ئەوان دەستت ماچ بكـەن، لـە كـاتێكدا كـە تـۆ هیـچ كارمەندی‌یەكی دەوڵەتت لە ئەستۆدا نی‌یە؟!

**وەڵام:**

جێبەجێكەرانی "یاسا" دەبێ پێش هەموو كەسێك بەسەر خۆیاندا جێبەجێی بكەن، ئنجا بۆیان هەیە بەسەر كەسانی تردا بیسەپێنن! چونكە جێبەجێ كردنی یاسا و دەستوور بەسەر كەسانی تردا، بێ ئەوەی لە خۆتـاندا جێبـەجێی بكـەن، لـە ڕاستیدا كارێكـە كـە هەر خۆتان – پێش كەسانی تر – لە دژی یاسا و دەستوورەكەتان ئـەنجامی دەدەن! ئـەوەتا دەتانەوێت ئەم یاسای "یەكسانیی ڕەها"یە بە زۆرەملـێ بەسەر منـدا بسـەپێنن لـە كـاتێكدا كە ئێوە لەناو خۆتاندا جێبەجێی ناكەن!

بۆیە منیش دەڵێم: هەركات سەربازێكی ئاسایی بۆ پلەی كۆمەڵایەتیی موشیرێك بەرز بووەوە و لە بواری ڕێز و ئیحتیرامی خەڵكیدا لەگەڵ ئەودا یەكسان بوو.. یان هـەركات "موشیر" بوو بە سەربازێكی ئاسایی و حاڵە خامۆشەكەی ئەوی وەرگـرت و لـە دەرەوەی بازنەی كارەكەیدا هیچ بایەخ و گرنگی‌یەكی نەما.. یان هەركات سـەرۆك ئەركانێكی سوپا كە سوپای بە سەركەوتن گەیاندبێت، لە ڕووی ڕێز و خۆشەویستی و ڕووتێكردنـی خەڵكیـیەوە، لەگـەڵ سـەربازێكی دەبـەنگدا یەكسـان كـران.. ئـەو كاتـە دەتوانـن بـەپێی یاسـاكەتان – یاسـای یەكسـانی – بـە منیـش بڵێـن: خـۆت نـاو مـەنێ "زانـا".. دەسـت بـە

ڕووی ڕێزلێنـانی خەڵکییـەوە بنـێ.. ئینکـاریی فەزیلـەتی خـۆت بکـە.. خزمـەتی خزمەتکارەکەت بکە.. هاوەڵی سواڵکەران بە!

**ئەگەر دەڵێن:**

ئەو ڕێز و ڕووتێکردن و پلـە و پایەیەی کـە خـەڵکی بـە مرۆڤـی دەبەخشـن، تایبەتـە بـە کارمەندانی دەوڵەتەوە لە دەمی ئەنجامدانی کارەکانیاندا. بەڵام تۆ هیـچ کارمەندییەکی دەوڵەتت لە ئەستۆدا نییە تا بە وێنەی کارمەندەکان ڕێزی نەتەوە قبووڵ بکەیت!

**وەڵام:**

ئەگەر مرۆڤ تەنها جەستە بێت و، لەم دنیایەشدا بـە هەمیشـەیی بمێنێتـەوە و دەرگـای گۆڕ بـە تـەواوی دابخرێـت و مردنیـش لـەناو بـبرێت و، کارمەندییـەکانیش تەنـها لـە چوارچێوەی سـەربازی و کارمـەندیی ئیداریدا بمێنێتـەوە، ئـەوا ئـەو کاتـە قسـەکانتان واتایـەکی دەبێـت! بـەڵام خـۆ مـرۆڤ تەنـها جەسـتە نییـە و، هــەرگیز "دڵ" و "زمـان" و "ژیری"ی لـێ داناماڵرێت تا بکرێنە خۆراکی لەش و ئەو ئەندامانەی لـەناو ببرێن، بـەڵکو هەموویان داوای چاودێری و خۆراکی تایبەتیی خۆیان دەکەن.

جـا مـادەم دەرگـای گـۆڕ دانـاخرێت، ئـەوا گرنگـترین کێشـە و مـەزنترین مەسـەلە، سەبارەت بە هەموو کەسێك، مەترسی و نیگەرانییەتی بۆ قۆناغی ئەودیوی گۆڕەکەی.

لەبەر ئەوە، هەرگیز ئەو کارمەندییانەی کە لە ڕێی ڕێز و گوێڕایـەڵیی خەڵکییـەوە ڕایی دەکرێن، تەنـها بـە چـەند فەرمانبەرییـەکی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و سـەربازییەوە بەند نین کە تایبەتن بە ژیانی دنیایی نەتـەوەوە. چونکـە هـەروەك ئامـادە کردنی پاسپۆرتی سەفەر بۆ ئەوانـەی سـەفەریان لـە ڕێیـە، بـە کارمـەندی دادەنرێـت، بەخشـینی پاسـپۆرتی سەفەریش بەوانەی کە لەسەر ڕێی سەفەردان بۆ خانەی هەمیشەیی و، پڕچەك کردنیان بـە نوورێك کە تاریکایی چروپری ڕێگایان بۆ بڕەوێنێتەوە، کارمەندییـەکی گەلـێ مـەزن و گرنگە، بە ڕادەیەك کە هیچ فەرمانبەرییەکی تـر ناگاتـە ڕادەی بایـەخ و گرنگییەکەی. جـا ئینکاری کـردنی کارمەندییەکی مـەزنی وەك ئـەمە، مەگـەر بـە ئینکـاری کردنـی "مـردن" و بـە درۆخستنەوەی سـی هـەزار تـەرم بکرێـت کـە هـەرچی ڕۆژە تەسـدیقی دەعوای: "إن الموتَ حقٌّ" دەکەن!

جا مادەم چەندین کارمەندیی مەعنەویی ئەوتۆ هەن کـە پاڵیـان بـە چـەندەها پێویستیی مەعنەوییـەوە داوە و، گرنگـترینی ئـەو کارمەندییانـەش: ئیمـان و، بــەهێز کردنی و، ڕێنمـایی کردنی خەڵکە بۆ لای، چونکـە پاسـپۆرتی سـەفەری ڕێـی هەتاهـەتایی و چـرای

ڕووناکی دڵی مرۆڤە لە تاریکستانی بەرزەخدا و کلیلی خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی‌یە.. ئەوا بێ هیچ گومانێك، ئەو کەسەی کە ئەهلی مەعریفەت و زانینە و ئەو کار و ئەرکە ئەنجام دەدات، هەرگیزاو هەرگیز ناشکوریی ئەو نیعمەتە ناکات و لە نرخ و بەهای داناگرێت و لە شان و شکۆی ئەو فەزیلەتەی ئیمانیش – کە خوا پێی بەخشیوە – ناشکێنێت و، دانابەزێتە ئاستی هەرزە و فاسقان و، خۆی بە هەرزەیی و بیدعەتی کەسانی نزم چەپەڵ ناکات!

جا ئەو گۆشەگیری‌یەی من کە پێتان باش نی‌یە و بە پێچەوانەی یاسای دەزانن، لەبەر ئەمەیە!

لەگەڵ ئەم ڕاستی‌یەشدا، من گوفتاری خۆم ئاراستەی کەسانی وەك ئێوە ناکەم کە ئازارم دەرخوارد دەدەن و هێندە لە خۆبایی و خۆ بە گەورەزانن کە لە دژایەتی کردنی ئەم یاسای یەکسانی‌یەدا گەیشتوونەتە پلەی فیرعەونایەتی. نەخێر لەگەڵ ئێوە نادوێم، چونکە دەبێ لە بەردەم کەسانی خۆبەگەورەزاندا تەوازوع و لەخۆبوردەیی نەنوێنرێت، نەوەکو بە زەلیلی لە قەڵەم بدرێت! بەڵکو ڕووی گوفتارم ئاراستەی کەسانی لەخۆبوردە و دادگەر و خاوەن ویژدانی ناو حوکمڕانەکان دەکەم و، پێیان دەڵێم:

سوپاس بۆ خوا من ئاگاداری هەڵە و ناتەواوی‌یەکانی خۆمم و، هەرگیز خۆم لە سەرووی خەڵکەوە نابینم و، داوای هیچ فەزڵێك بەسەر کەسدا ناکەم، چ جای بەسەر موسڵماناندا! بەڵکو بە فەزڵی خوای گەورە ناتەواوی و قسوورە لە سنووربەدەرەکانی خۆم دەبینم و بە دڵنیایی‌یەوە دەزانم کە من خاوەنی هیچ شتێکی ئەوتۆ نیم شایانی باس بێت و، دڵنەوایی و دڵدانەوەی خۆم تەنها لە ئیستیغفار و ئومێدی دوعای خەڵکدا دەبینم، نەك لەوەدا کە بە دوای ڕێز و ئیحتیرامیاندا بگەڕێم. لەو باوەڕەشدام کە ئەم ڕەفتارەم لای هەموو هاوڕێیانم ئاشکرایە.

بەڵام ئەوەندە هەیە کە من – بە جۆرێکی کاتی – ئەرك و بارودۆخێکی ئەوتۆم لە ئەستۆدایە کە پلە و پایە و ویقاری زانست داخوازی ئەوەن لە دەمی ئەنجامدانی خزمەتی قورئان و وتنەوەی وانەی حەقیقەتەکانی ئیماندا ویقار و عیززەتی زانست ڕابگرم. ئەم ڕەفتارەشم بە جۆرێکی کاتی و لە پێناوی ئەو حەقیقەتانە و لەبەر شەرەفمەندیی پایەی قورئانە و بۆ ئەوەیە سەر بۆ گومڕایان دانەنەوێنم.

لەو باوەڕەشدام کە هیچ یاسایەکی دنیا ناتوانێت ڕێ لەم خاڵانە بگرێت!

## جۆرە مامەڵەیەك كە مرۆڤ سەرسام دەكات

وەك ئاشكرا و زانراوە، زانایان لە هەموو جێگایەكدا بە تەرازووی زانست شتان دەپێون و، شارەزایی و ئاگاداری لە هەر شتێكدا ببینن و لای هەر كەسێك زانستێك شك ببەن، ڕێزی لێ دەگرن و لە ڕووی ڕێبازی زانستەوە پەیوەندیی هاوڕێیەتیی لەگەڵدا دەبەستن. تەنانەت گەر پرۆفیسۆرێك لە وڵاتێكی دوژمنەوە بێت بۆ وڵاتەكەمان ئەوا پسپۆڕ و شارەزایان و ئەهلی زانست سەردانی دەكەن و لەبەر زانیاری و شارەزایییەكەی ڕێزی لێ دەگرن.

لە كاتێكدا كە ئەمە وایە.. كەچی دەبینین:

لەو دەمەی كە بەرزترین "كۆڕی زانیاریی كەنیسەی ئینگلتەرا" داوای لە مەشیەخەتی ئیسلامی كرد بە شەش سەد وشە وەڵامی شەش پرسیاری بداتەوە، یەكێك لە زانایان - كە لە لایەن خەڵكی ئەم وڵاتەوە بێ ئیحتیرامیی لە ڕوودا كرا - بە شەش وشە وەڵامی ئەو پرسیارانەی دانەوە! بە ڕادەیەكی وا كە ڕێز و سەرسووڕمانی خەڵكیی بەدەست هێنا..

هەر ئەو زانایە، بە زانستی ڕاستەقینە و شارەزایی و زانستی ڕاست و ڕەوا، بەرەنگاریی گرنگترین یاسا و دەستووری بیانییەكان و بەهێزترین بناغەكانی دانا و فەیلەسووفانی ئەوانی كرد و، بەسەریشیاندا سەركەوت..

هەر ئەو زانایە، بەو هێزی زانست و شارەزایییەی كە لە قورئانی پیرۆزەوە بەدەستی هێنا، تەحەددای فەیلەسووفەكانی ئەورووپای كرد و بۆیان ڕۆشتە مەیدانی زۆرانبازییەوە..

هەر ئەو زانایە، شەش مانگ پێش ڕاگەیاندنی "سەربەستی"، زانایان و ئەهلی قوتابخانە نوێیەكانی لە ئەستەمبووڵ بۆ گفتوگۆ و وتووێژ و وەڵامدانەوەی پرسیارەكانیان - بێ ئەوەی خۆی هیچ پرسیارێك لەوان بكات - بانگ كرد و، لە ئەنجامیشدا وەڵامی ڕاست و شیفابەخشی سەرجەم پرسیارەكانی دانەوە[1]..

---

(١) "سەعیدی نوێ" دەڵێت: من بەشداریی "سەعیدی كۆن" ناكەم لەم گوفتارانەی كە لەم مەقامەدا بۆ مەبەستی شانازی كردن دەیانڵێت. بەڵام ناشتوانم بێدەنگی بكەم، چونكە لەم پەیامەدا مافی قسەم داوەتێ و لایەنی بێدەنگیم گرتووە، تاكو هەندێ شانازیی خۆی لە بەردەم كەسانی خۆبەگەورەزاندا دەربڕێت!

(دانەر)

هەر ئەو زانایە ژیانی خۆی بۆ بەختەوەرکردنی ئەم نەتەوەیە تەرخان کرد و سەدان نامیلکەی بە زمانی ئەم نەتەوە - کە زمانی تورکی‌یە - بلاو کردەوە و بەو پەیامانە ڕووناکی کردنەوە..

جا ئەو کەسەی کە ئەم کارانەی ئەنجام دا و، کوڕی ئەم نیشتمانە و، هاوڕێی خەڵکەکەی و برای ئایینی‌یانە، لە لایەن هەندێ لەو کەسانەی کە بە ئەهلی زانست لە قەڵەم دەدرێن و چەند کەسێکیش لە زانایانی "ڕەسمی"ی ئایین، بە: چەوساندنەوە و دوژمنایەتی کردن، تەنانەت هەندێ جار سووکایەتی پێکردنیش مامەڵە و ڕەفتاری لەگەڵدا کرا!

دەسا وەرە سەرنج لەم حاڵە بدە و، بزانە چ ناوێکی لێ دەنێیت؟

ئایا شارستانێتی؟ یان خۆشویستنی زانست؟ یان نیشتمانپەروەری؟ یان نەتەوایەتی؟ یان بانگەشەی دەستگرتن بە ڕژێمی کۆماری؟!

کام لەمانەیە؟

نەخێر.. هەرگیز هیچ کام لەمانە نی‌یە!

بەڵکو "قەدەر"ێکی دادگەرانەی خوای گەورەیە، کە لە لایەن زانایانەوە دوژمنایەتیی بەرامبەر بەو کەسە ورووژاند لە کاتێکدا کە چاوەڕوانیی هاوڕێیەتیی لێ دەکردن، تاکو بەهۆی چاوەڕوانیی ڕێزلێنانی ئەوانەوە "ڕیاکردن" تێکەڵی زانستەکەی نەبێت و، "ئیخلاس" بەدەست بهێنێت!

## کۆتایی

### دەستدرێژی‌یەك کە گرفتاری سەرسامیی کردووم و شوکرانەبژێریم لەسەر پێویست دەکات

ئەو دنیاویستانەی کە خۆیان بە گەورە دەزانن و لەڕادەبەدەر لە خۆیان بایی بوون، حەساسی‌یەتێکی توندیان بۆ ناسینی "خۆپەرستی" و "لەخۆبایی بوون" تێدایە! بە ڕادەیەك کە ئەگەر ئەو مامەڵەیەیان بە هەست و شعووری خۆیان بکردایە، بە "کەرامەت" یان "زیرەکی‌یەکی مەزن" لە قەڵەم دەدرا بۆیان! ئەویش بەم جۆرەیە:

گەر هەر کاتێك لەخۆبایی بوونێکی جوزئی و ئاوێتەی ڕیام تێدا هەبێت و خۆیشم هەستی پێ نەکەم، ئەوان - وەك بڵێی - بە تەرازووی هەستیاری لەخۆبایی بوون و تەکەبوری خۆیان هەستی پێ دەکەن و بەرەنگاری ئەو لەخۆبایی بوونەم دەبنەوە کە خۆم هەستم پێ نەکردووە!

لە مـاوەی ئەم نۆ ساڵەدا نزیکەی نۆ تاقیکردنەوەی لەم جۆرەم بە خۆمەوە دیوە. تەنانەت دوای ئەو مامەڵە ستەمکارانەیەی کە لەگەڵمدا دەیانکرد، بیرم لە قەدەری خوای گەورە دەکردەوە و دەموت: بۆچی قەدەری خوای گەورە ئەوانی بەسەر مندا زاڵ کردووە؟ واتە بەم پرسیارە بە دوای فێڵەکانی نەفسی خۆمدا دەگەڕام.

هەموو جارێك لە ئەنجامدا بۆم دەردەکەوت کە "نەفس"م یان بە بێ ئەوەی هیچ هەستێك بە خۆی بکات بە لای غروورردا ڕۆشتووە، یان بە پێزانین و هەست و شعووری خۆی دووچاری غروور بووە! ئیتر کە ئەمەم بۆ دەردەکەوت، یەکسەر دەموت: دیارە قەدەری خوای گەورە – لە ناوەندی ستەمی ئەواندا – دادگەریی لەگەڵدا بەکارهێناوم.

یەکێك لەو ڕووداوانە، ئەوەیە کە:

ئەم هاوینە هاوڕێیەکم سواری ئەسپێکی جوانی کردم و منیش بە سواری ئەو ئەسپەوە ڕۆشتم بۆ سەیرانگەیەك. هەر هێندەی – بە بێ هەست و نەستی خۆم – ئارەزوویەك بۆ چەند تام و چێژێکی تێکەڵ بە غرووری دنیا لە دەروونمدا جووڵا، یەکسەر ئەهلی دنیا بە توندی ڕێیان لەو ئارەزووە گرت و، کۆتاییان بەو حەزە و چەندین حەز و ئارەزووی تری دەروون هێنا!

ئەم جارەشیان، دوای مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و لە کەش و باروودۆخێکی پڕ لە ئیخلاس و تەقوای برا بەڕێزەکانمدا و لە نێوان ڕێز و گومان باشیی ئەوانەی کە بە سەردان هاتبوون و، دوای ئاوڕلێدانەوەی ئیمامێکی مەزن و بەرزی پێشین کە بە کەرامەتێکی غەیبی ئاوڕی لێ داینەوە، دەروونم – بە بێ هەستی خۆم – ویستی حاڵەتێکی غروری ئاوێتەی ڕیاکاری بگرێتەخۆ. ئەوەبوو ئەو ئارەزووەی بە شانازییەوە لە ژێر پەردەی شوکرانەدا دەربڕی! یەکسەر لەوکاتەدا ئەهلی دنیا – بە حەساسیەتێکی توند – دەستیان هێنایە ڕێم! وەك بڵێی هێندە هەستیارن کە تەنانەت هەست بە گەردیلەکانی "ڕیا"ش دەکەن!

بۆیە هانا هەر تەنها بۆ لای خواوەندی بەتوانا دەبەم و، شوکرانەی نیعمەتەکانی دەکەم. چونکە "ستەم"ی ئەوانی بۆ کردم بەهۆی بەدەستهێنانی "ئیخلاس"!

**﴿وقُل ربِّ أعوذُ بكَ من هَمزاتِ الشياطين ۞ وأعوذُ بك ربِّ أن يحضُرون﴾.**

اللّهم يا حافظ ياحفيظ يا خير الحافظين، احفظني واحفظ رفقائي من شر النفس والشيطان ومن شر الجن والانسان ومن شر أهل الضلالة وأهل الطغيان. آميــن.. آميــن.. آميــن.

**﴿سُبحانَكَ لا عِلمَ لنا إلا ما عَلمتنا إنكَ أنتَ العَليمُ الحَكيمُ﴾.**

# بریسکەی بیست و سێهەم

## پەیامی سروشت

**ئەم پەیامە لە بنەڕەتدا یادخەرەوەی شازدەهەم بوو لە پەیامی یادخەرەوەکان (واتە بریسکەی حەڤدەهەم) بەڵام لەبەر ئەو گرنگییە بەرزەی کە تیایدایە، جیا کرایەوە و کرا بە (بریسکەی بیست و سێهەم) چونکە ئەم پەیامە ئەو جۆرە کوفرە قەڵاچۆ دەکات کە لە چەمکی "سروشت"ەوە پەیدا بووە. بە چەشنێکی وا کە ئیتر نەتوانێت لەسەر پێ ڕابووەستێ و، بەردی بناغەشی ڕیشەکەن دەکات.**

**بێدارکردنەوەیەك:**

ئەم پەیامە چییەتی(ماهیـــة)ی ئەو ڕێڕەوەی ڕوون کردووەتەوە کە سروشت پەرستە سەرکەشەکان دەیگرنەبەر و، مەودای دووریی ئەو ڕێڕەوەی لە تەرازووەکانی ژیریـیەوە و ڕادەی خورافییەتیشی خستووەتە پێش چاو. ئەمەش لە ڕێی باسکردنی "نۆ" دانە مەحاڵ(نەگونجاو) کە لە بنەڕەتدا بە لای کەمەوە پوختە و کورتەی "نەوەد" دانە مەحاڵن کە لەم کێشەیەدا هەن.

جا لەبەر ئەوەی هەندێك لەو مەحاڵانە لە چەند پەیامێکی تردا ڕوون کراونەتەوە، ئەوا پوختەکەیان لە ناوەندی ئەم مەحاڵ و نەگونجاوانەی ئێرەشدا هێنراون، یان زۆر بە کورتی لێرەدا باس کراونەتەوە.

**لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش و بە دڵدا دێت کە:**

مادەم ئەو ڕێڕەوەی سروشت پەرستان گرتوویانەتەبەر تا ئەم ڕادەیە گێروگرفت و خورافەتی تێدایە، ئیتر چۆن چەندین فەیلەسووف و زانای بەناوبانگ و گەورە گرتوویانەتەبەر و جڵەوی ژیریی خۆیان داوەتە دەست؟

**وەڵام:**

ئەو فەیلەسووف و زانایانە "ڕاستی" و "ناوەرۆك"ی ئەو ڕێباز و ڕێڕەوەیان بۆ دەرنەکەوتووە[1]. لەبەر ئەوە، بەو مەحاڵ و گیروگرفت و دەرەنجامە دوور لە ژیرییانەشیان نەزانیوە کە ئەو ڕێگایە داخوازیەتی و، لە سەرەتای هەموو مەحاڵێکی ئەم پەیامەدا باس کراون.

وا ئێستا من ئامادەم بۆ ئەوەی چەندین بەڵگەی ڕوون و بەهێز و توندوتۆڵ بۆ هەموو ئەو کەسانە بهێنمەوە کە تا ئێستاش گومانیان لەم مەسەلەیەدا هەیە و، لەم پەیامەدا ئەمەیان بە درێژی بۆ ڕوون دەکەمەوە.

بسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

﴿قالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللهِ شَكٌّ فاطِرِ السَّموات والأَرضِ﴾ (إبراهيم: ١٠)

ئەم ئایەتە پیرۆزە، بە بۆنەی ئەو پرسیارەی کە تیایدایە و بۆ مەبەستی ئینکاری کردنی هەڵوێستی بەرامبەر هێنراوەتەوە، بەڵگەیەکی بەهێزی ڕوون و گومان لێ نەکراوی "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەیە.

بەڵام پێش ئەوەی ئەم نهێنییە بە ڕوونی ئاشکرا بکەین، دەمانەوێ بۆ ئاگادار کردنەوەی خوێنەری بەڕێز ئەمەی خوارەوەی پێش چاو بخەین:

---

(١) ئەو هۆیەی کە بە تەواوی بۆ دانانی ئەم پەیامە هانی دام، ئەوە بوو کە هەستم کرد هێرشێکی توندوتیژ لەسەر قورئانی پیرۆز و ڕاستییەکانی ئیمان لە ئارادایە لە ڕێی ناشیرین کردن و ئاڵۆزاندنی ئەو ڕاستییانە و، بەستنەوەی ئیلحاد بە سروشتەوە لە ڕێگای بڕیاردانی چەند پەیوەندییەکی وەهمییەوە، هەروەها بڕینی ناوی خورافەت بەسەر ئەو شتانەی کە ژیرییە کورتبین و بۆگەنەکانی ئەوانەی ئەم کارە ئەنجام دەدەن، هەستی پێ ناکەن!

جا ئەو هێرشەی ئەوان تووڕەبوونێکی بەتینی لە دەروونمدا هەژاند و گڕکانێکی گەورەی بەردینی لە دڵمدا تەقاندەوە کە لە دڵەوە پەرەی سەند و شێوازی پەیامەکەشی گرتەوە. ئەوەتا ئەم پەیامە سەروگوێلاکی ئەو موڵحید و ناحەقڕەوانەی - کە پشت لە حەق هەڵدەکەن - بەو بەردە گڕکانییانە داگرتووەتەوە. دەنا داب و شێوازی "پەیامەکانی نوور" لە بنەڕەتدا بریتییە لە نەرمی و لەسەرخۆیی لە باسکردنی ئەو بابەتانەی کە لێیان دەدوێت. (دانەر)

لە ساڵی (١٣٣٨)دا [1] بانگهێشتیان کردم بۆ ئەنقەرە. کە ڕۆشتم، لەوێ دڵخۆشی و شادمانیی ئیماندارانم بینی بە بۆنەی سەرکەوتنی سوپای ئیسلامەوە بەسەر یۆنانییەکاندا. بەڵام لە هەمان کاتدا جموجووڵی سامناکی بێبڕوایی و ئیلحادیشم بینی کە لە ڕێی بەکارهێنانی فرتوفێڵ و لەخشتەبردنی خەڵکییەوە خەریکی جێ کردنەوەی چەمکەکان(المفاهیم)ی خۆی بوو لەناو دڵ و دەروون و بیروباوەڕی دامەزراوی ئیمانداراندا، بۆ ئەوەی لەخشتەیان ببات و بیروباوەڕیان ژەهراوی بکات.

منیش کە ئەمەم بینی و هەستم پێ کرد، لە ناخی دڵمەوە داخ و خەفەت دایگرتم و، لە دەست ئەو دێوە سامناکەی کە دەیەوێت پەلاماری پایە و بنچینەکانی ئیمان بدات، هاوار و هانام بردە لای خوای گەورەی بەدەسەڵات و پەنام بەم ئایەتە پیرۆزە برد و دەستم پێوە گرت.

ئەوەبوو نامیلکەیەکی بچووکم بە زمانی عەرەبی دانا و، لە چاپخانەی: (ڕۆژی نوێ **Yeni Gün**)ی ئەنقەرە لە چاپم دا و بڵاوم کردەوە، کە بەدیهییەتی: "بوون" و "یەکتایی" خوای گەورەم تێدا چەسپاندبوو. بەهۆی ئەو بەڵگە بەهێز و پتەوانەی کە لە نووری قورئانی پیرۆز وەرم گرتبوون و سەری هەژدیهای بێ بڕواییم پێ کوتابوونەوە و لەو نامیلکەدا باسم کردبوون..

بەڵام جێدەست و شوێنەواری ئەو بەڵگە بەهێزانە لە بەرەنگاری کردنی بێ بڕوایی و ئیلحاددا دەرنەکەوت، چونکە ئەو نامیلکەیەی کە چاپم کردبوو تابڵێی پوخت و کورت بوو، جگە لە کەمیی ئەوانەش کە بایەخیان بە زمانی عەرەبی دەدا. لەبەر ئەمانە، وەهم و خەیاڵەکانی ئەو ئیلحادە – بە داخەوە – پتر لە گەشە و بڵاوبوونەوەدا بوون. ئەمەش ناچاری کردم کە جارێکی تر ئەو بەڵگانە بە زمانی تورکی و بە جۆرێکی درێژتر و ڕوونتر سەرلەنوێ بنووسمەوە. کە نووسیشمەوە ئەم پەیامەی بەردەستی خوێنەری بەڕێز دەرچوو.

جا لەبەر ئەوەی هەندێك لەم بەڵگانە لە هەندێ پەیامی تردا ڕوون کراونەتەوە، ئەوا لێرەدا بە کورتی باس دەکرێن. هەندێکی تریش لەو بەڵگانەی کە لە پەیامەکانی تردا بڵاو کراونەتەوە، لێرەشدا دەرکەوتوونەتەوە. وەك بڵێی هەرکام لەو بەڵگانە بەشێکی ئەم پەیامە بن.

---

(١) بە مێژووی ڕۆمی، کە دەکاتە: (١٩٢٢ز) و (١٣٤٠ك). (وەرگێڕ)

# پێشەکی

برای مرۆڤم!

بزانە و ئاگاداری ئەوە بە کە چەند وشەیەکی سامناك هەن لە زاری خەڵکییەوە دەردەچن و بۆگەنی کوفریان لێوە دێت و، بەسەر زاری ئەهلی ئیمانیشدا تێدەپەڕن، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، یاخود هەست بە بۆگەنی و مەترسیی ئەو وشانە بکەن. وا ئێمەش تەنها سیانی گرنگیان لێ باس دەکەین:

**یەکەمیان** ئەوەیە کە دەڵێن: (هۆکارەکان دروستیان کردووە). واتە هۆکارەکان شت دروست دەکەن.

**دووهەمیان،** دەڵێن: (ئەو شتە لە خۆیەوە دروست بووە). واتە هەرچی شت هەیە خۆی خۆی دروست کردووە و، لە خۆیەوە پەیدا بووە و، ئەو شکڵ و شێوەیەی گرتووەتە خۆ.

**سێهەمیان،** دەڵێن: (ئەو شتە سروشت داخوازی بووە). واتە شتێکی سروشتییە و سروشت بەدیی هێناوە و ویستوویەتی.

بەڵێ، مادەم بوونەوەران هەن و لە بەرچاودان، بە چەشنێ کە هەرگیز ڕێی سەرپێچی کردن لە بوونیاندا نییە.. هەروەها مادەم هەموو ئەو شتانەی کە لە بوونەوەردا هەن بەوپەڕی ڕێکوپێکی و داناییەوە دێنە جیهانی "بوون" و، هیچ کامیشیان ئەزەلی نین، بەڵکو هەموو تازە و دروستکراون ..

مادەم ئەمە حاڵی بوونەوەرانە، ئیتر تۆش – ئەی بابای مولحید!– تەنها چوار ڕێگات بۆ ئەم مەسەلەیە لە بەردەمدایە:

یان ئەوەیە دەڵێیت: هەر شتێك لە بوون(وجود)دا هەیە – با بڵێین زیندەوەرێك بێت – هۆکارەکانی ناو ئەم جیهانە دروستی دەکەن. واتە لە ئەنجامی کۆبوونەوەی هۆکارە ماددییەکانەوە بوونی دەست دەکەوێت..

یان دەڵێیت: خۆی لە خۆیەوە پێکهاتووە..

یان دەڵێیت: لەسەر داخوازی و بە کاریگەریی سروشت دێتە ناو جیهانی بوونەوە.

یان ئەوەیە باوەڕت بە هیچ کام لەمانە نییە. ئەو کاتە دەبێ بڵێیت:

(توانستی خواوەندی بەدیهێنەری بەتوانای شکۆمەند دروستی دەکات و بوونی پێ دەبەخشێت).

چونکە بەپێی تەرازووەکانی ژیری، جگە لەم چوار ڕێگایە هیچ ڕێگایەکی تر لە گۆڕێدا نی‌یە بۆ لێکدانەوەی دروستبوونی بوونەوەران.

جا ئەگەر بە شێوەیەکی بێ‌گومان ئەوە چەسپا کە سێ ڕێگاکانی پێشوو بەتاڵ و مەحاڵ و نەگونجاون، ئەوا بەپێی زەرورەت و بەداهەت ڕێی چوارەم دەچەسپێت، کە بریتی‌یە لە ڕێی بێ گومان و دڵنیایی‌بەخشی "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەری میهرەبان!

## ڕێگای یەکەم

ڕێی یەکەم ئەو ڕێگایەیە کە دەڵێت: (کۆبوونەوەی هۆکارەکانی جیهان دەبنە هۆی دروستبوونی بوونەوەران و پێکهاتنی شتان)!

ئێمەش لە نێوان ئەو مەحاڵە زۆرانەی کە لەم ڕێگایەدا هەن، تەنها سیانیان باس دەکەین:

**❑ مەحاڵی یەکەم:**

سەرنج لە هەر دەرمانخانەیەك بدەیت، سەدان شووشەی پڕ لە ماددەی کیمیایی جۆراوجۆری تێدا دەبینیت..

گریمان پێویستی‌یەك هاتە ئاراوە بۆ پێکهێنانی زیندە هەویرێك لەو ماددە و دەرمانانە. هەروەها پێویست بوو زیندە ماددەیەکی نائاسایی و دژ بە ژەهرەکانیان لێ پێك بهێنرێت و، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆشتینە ناو دەرمانخانەیەك. کە چاومان بەناو دەرمانخانەکەدا گێڕا چەندین جۆرمان لەو زیندە هەویر و زیندە ماددەیەی کە دژ بە ژەهرەکانە لەو دەرمانخانەیەدا دەستکەوت.

پاشان کە دەستمان بە شیتەڵکردنی ئەو هەویرانە کرد، بۆمان دەرکەوت: هەریەکەیان، بەوپەڕی وردی، لە چەند ماددەیەکی جیاجیای ناو ئەو شووشانەو، بەپێی تەرازوویەکی دیاری کراو پێکهاتووە و پوختە کراوە؛ گرامێك لەم دەرمان و سیان لەو دەرمان و دە گرام لەوی تر. بەم جۆرە و لە هەرکام لەو دەرمانانە ئەندازەیەکی تایبەتی‌یان لێ وەرگیراوە، بە جۆرێك کە ئەگەر بهاتایە و بە ئەندازەی بەشێك لە یەك گرام زیاتر یان کەمتر بوایە ئەو تایبەتمەندی‌یە زیندەکاری‌یانەی تێدا نەدەما.

پاشان ئەو زیندە ماددەیەمان هێنا کە دژ بە ژەهرەکانە و لێی ورد بووینەوە. بۆمان دەرکەوت کە ئەویش بە چەند ئەندازەیەکی دیاری کراو و بەپێی چەند تەرازوویەکی

هەستیار پێکهێنراوە. تەنانەت ئەگەر بهاتایە و بە ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك زیاد یان کەم بوایە، ئەوا تایبەتکارییەکانی خۆی لەدەست دەدا. واتە ئەو مادده جۆراوجۆرانەی ناو دەرمانخانەکە بە چەند ئەندازەیەکی جیاجیا و بە چەند تەرازوویەکی هەستیار و ورد ئامادە کراون.

جا ئایا دەچێتە عەقڵی هیچ مرۆڤێکی ژیرەوە کە ئەو هەویرەی ئاوا بەم جۆرە هەموو بەشێکی بە وردی حساب کراوە و لێك دراوەتەوە، بەهۆی ڕێکەوتێکی سەیرەوە پەیدا بوو بێت؟ یان لە ئەنجامی هەڵکردنی ڕەشەبایەك بەسەر ئەو دەرمانخانەیەدا شووشەکان بەسەر یەکدا کەوتبن و ئەو ئەندازە دیاریکراوانەی ئاوێتەی یەکتری کردبێت و بەم جۆرە ئەو زیندە هەویرەی پێکهێنابێت؟!

ئایا مەحاڵی لەمە سەیرتر و، گەوجایەتی و خورافەت و ئەفسانەی لەمە خراپتر و، ناحەقیی لەمە ناڕەواتر هەیە؟ تەنانەت گەر بێت و نەفامی و بێ عەقڵیی "گوێدرێژ" چەندین ئەوەندەی تر زیاد بکات و، ئنجا وەك مرۆڤ توانای گوفتاری ببێت، ئەوا هەتا لە توانایدایە لە دەست ئەم کەرێتییە هەڵدێت و ڕەفزی ئەم جۆرە بیرکردنەوە سەرشۆڕکەرانەیە دەکات و، دەڵێت: دەبێ ئەو کەسە چەندە کەر و گەوج بێت کە قسەی وای لە زار دەردەچێت!!

جا لەبەر ڕووناکیی ئەم نموونەیەدا دەڵێین:

هەموو یەکێك لە زیندەوەران، بریتییە لە پێکهاتەیەکی زیندە و هەویرێکی خاوەن ژیان. هەموو ڕووەکێکیش وەك دەرمانێکی زیندووی دژ بە ژەهرەکان وایە. چونکە لە چەند بەش و ماددەیەکی جیاجیا و بەپێی چەند تەرازوویەکی گەلێ ورد و هەستیار پێکهێنراوە. هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە گێڕانەوەی دروستبوونی ئەم زیندەوەرە جوان و پڕ لە وردەکارییە بۆ توخمەکان و هۆکارە ماددییەکان و، باوەڕکردن بەوەی کە: "هۆکارەکان دروستیان بکات" شتێکی هێندە بەتاڵ و مەحاڵ و نەگونجاوە کە لە هەموو تەرازوویەکی ژیرییەوە تابڵێی دوورە، بە چەشنی مەحاڵیی پێکهاتنی ئەو زیندە هەویرە لە ڕێی تێکەڵبوونی ئەو ماددانەی ناو شووشەکان لە خۆیانەوە!

**پوختەی ئەم قسانەی پێشوو:**

ئەو زیندە ماددانەی کە بە تەرازووی قەزا و قەدەری خواوەندی زانای دانا لەم جیهانە مەزنەدا - کە وەك دەرمانخانەیەکی گەورە و ناوازە وایە - ئامادە کراون، تەنها بە

دانستێکی بێ کۆتایی و زانستێکی بێ سنوور و ویستێکی گەورەی خاوەن دەسەڵات نەبێ هەرگیز دروست نابن.

دەنا ئەو کەسەی کە بە وەهمی خۆی گومانی وایە: (ئەم بوونەوەرانە بەرهەمی توخمە گشتییەکانی گەردوونن) کە چەند توخمێکی کەڕ و کوێری بە خوڕەم و لافاوئاسان.. یان لەو گومانەدایە کە: (بۆ خۆیان لە سروشتی شتەکاندا هەن).. یاخود: (بەرهەم و کاری هۆکارە ماددییەکانن)! ئەو کەسەی قسەی وای لە زار دەردەچێت، دەبێ لەوپەڕی بەدبەختی و گەلحۆیی و سەر لێ شێواوی و نەفامیدا بێت و، گەلێ لەو سەرخۆشە گەوج و نەفامتر بێت کە بە دەم وڕێنەی مەستییەوە دەڵێت: (ئەو دەرمان و هەویرە ناوازە و سەرسووڕهێنەرە لە ئەنجامی بەر یەك کەوتن و تێکەڵبوونی هەڕەمەکیی ماددەکانی ناو دەرمانخانەکەوە دروست بوون)!

بەڵێ، ئەو کوفرەی کە لەم قسانەدا هەیە، کتومت وەك وڕێنەی مرۆڤێکی گەوج و، شێتیی کەسێکی مەستی سەرخۆش وایە!!

**❑ مەحاڵی دووهەم:**

ئەگەر بەدیهێنانی هەموو شتێك بە کاری خوای تاك و تەنیای شکۆمەند و بەتوانا دانەنرێت و، بدرێتە پاڵ هۆکارە ماددییەکان، دەبێ ئەو کاتە زۆربەی توخمەکانی جیهان و هۆکارەکانی لە هەموو زیندەوەرێکدا دەست تێوەردان و کاریگەرییان هەبێت. کەچی کۆکردنەوەی هەموو هۆکارە دژ بە یەك و جیاجیاکان، بە ڕێکوپێکییەکی تەواوەتی و بە تەرازوویەکی وردی تایبەتی و، بە یەکگرتنێکی تەواو، لە جەستەی دروستکراوێکی وەك مێشدا، کارێکی هێندە مەحاڵە کە هەر کەسێك بە ئەندازەی باڵە مێشێك دارای ژیری بێت بە ئاشکرا ڕەفزی دەکات و پڕ بەدەم دەڵێت: ئەمە شتێکی مەحاڵە.. بەتاڵە.. هەرگیز ناگونجێ!

چونکە جەستەی بچووکی مێش پەیوەندیی لەگەڵ زۆربەی توخمەکانی بوونەوەر و ڕواڵەت و هۆکارە ماددییەکانیدا هەیە، بگرە لە ڕاستیدا کورتە و پوختەیەکی ئەو توخمانەیە. جا ئەگەر بەدیهێنان و دروستکردنی مێش بە کاری توانستی ڕەهای خوای گەورە دانەنرێت، ئەوا دەبێ هەموو هۆکارە ماددییەکان لە کاتی دروستکردنی ئەو مێشەدا یەکسەر بە کۆمەڵی و لە تەنیشتیدا ئامادە بن، تەنانەت دەبێ بچنە ناو جەستە لاوازەکەشیەوە، بەڵکو لەوەش زیاتر؛ چونکە دەبێ بیشرۆنە ناو هەموو خانە و یەکەیەکی پێکهاتن لە جەستەی ئەو مێشەدا، با بڵێین لە "چاو"ی‌دا کە پوختە نموونەیەکی جەستەی زیندەوەرە! چونکە هۆکارەکان ئەگەر ماددی بن، ئەوا دەبێ لە نزیك و لەناو شتە

کارتێکراوەکەیاندا ئامادە بن. خۆ ئەمەش داخوازی ئەوەیە کە سەرجەمی توخمە دژ بە یەکەکانی هەموو لایەکی ئەم جیهانە، بە ڕۆشتنێکی "ماددی" بڕۆنە ناو ئەو خانەیەی کە تابلێی ورد و بچووکە و، بە کارامەیی و وردەکاری لەو خانە هەرە بچووکەدا کارەکانیان ڕاپەڕێنن!

ئایا گەوج و گێلترین کەسیش لە پێڕی سۆفستائی‌یەکان [1] شەرم لە قسەی ئاوا ناکات؟!

**❑ مەحاڵی سێهەم:**

ئەگەر بوونەوەران (لە بارەی ڕێکوپێکی و، پێکەوە گونجان و شکڵ و شێوەیان)ەوە لەسەر "یەك" ڕەوت بوون، ئەوا دەبێ کاری "یەك" کاریگەر بن و "یەك" دەست دروستی کردبێتن، بەپێی ئەو دەستوورە ئاشکرایەی کە دەڵێت: "یەك، تەنها لە یەکەوە دەردەچێت".

جا ئەگەر ئەو بوونەوەرە لەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردەکاریدا بێت و، بە تەرازوویەکی ورد بەدی هێنرابێت و، خاوەنی ژیانێکی گشتی بێت، بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کە چەند دەستێکی جیاجیا کاریان تێدا نەکردووە - کە مایەی ناکۆکی و جیاوازیی نێوانیانە - بەڵکو داخوازی ئەوەیە کە دەستکردی تەنها یەك کەسی بەتوانا و دانا بێت.

کەواتە گێڕانەوەی بەدیهێنانی ئەو بوونەوەرە ڕێکوپێك و بە تەرازووە، بۆ دەستی هۆکارە سروشتی‌یە کەڕ و کوێر و بێ گیانەکان (ئەو هۆکارانەی کە هیچ هەست و هۆشێکیان تێدا نی‌یە و، ناکۆکی و تێکەڵی و جیاوازیی نێوانیشیان پتر پەرە بە کەڕی و کوێریان دەسێنێت)..

---

(١) سۆفستائی‌یەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بوون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نی‌یە. "گۆرگیاس" و "برۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائی‌یەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـ، "كشاف إصطلاحات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهند عام ١٨٦٢م، "الموسوعة الفلسفية الميسرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان - بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

ئیددیعا کردنی ئەوەی کە ئەو هۆکارانەن ئەم بوونەوەرە ڕێکوپێکە بەدی دەهێنن و لە نێوان چەندین شیمانە و گریمانی لەژمارەبەدەردا هەڵی دەبژێرن، واتە گێڕانەوەی دروستبوونی ئەم بوونەوەرە بۆ ئەو هۆکارانە، لە ڕاستیدا، وەك ئەوە وایە کە: سەد مەحاڵ قبووڵ بکرێت، چونکە ئیددیعایەکە لە هەموو تەرازوویەکی ژیرییەوە تابلێی دوورە و هەرگیز عەقڵ و فامی مرۆڤی ژیر وەری ناگرێت.

وەرە با بە جۆرێکی کاتی واز لەم مەحاڵە بهێنین و سەیرێکی کاریگەریی "هۆکارە ماددییەکان" بکەین کە بە لێککەوتن(التَّماس) ڕوو دەدات. ئەوەتا ئەو لێککەوتنە تەنها لێککەوتنێکە لە ڕواڵەت و ڕووی دەرەوەی ئەو زیندەوەرەدا. بەڵام دیوی ناوەوەی ئەو زیندەوەرە، کە هەرگیز دەستی هۆکارە ماددییەکانی پێ ناگات، گەلێ زیاتر لە چاو دیوی دەرەوەی ڕێکوپێکتر و گونجاوتر و ئاڵۆزترە و گەلێ ناسك و تەواوتریشە. تەنانەت ئەو زیندەوەرە بچووك و وردانەی کە هەرگیز جێی هۆکارە ماددییەکانیان تێدا نابێتەوە و دەستی هۆکارەکانی ئەوانیان پێ ناگات، زۆر سەیرتر و ناوازەتر و ڕێکوپێکترن لەچاو بوونەوەرە یەکجار گەورە و هەرە مەزنەکان.

کەواتە گێڕانەوەی دروستکردنیان بۆ لای هۆکارە کەڕ و لاڵ و ڕەق و تەق و ئەستوور و نەزان و دوور لە یەکتری و دژ بە یەکەکان، ئەوپەڕی کەڕوکوێری نەبێت هیچی تر نییە!

# ڕێگای دووهەم

مەسەلەی دووهەمیش کە بریتییە لە ڕستەی: (خۆی لە خۆیەوە پێکهاتووە) ئەویش، بە هەمان جۆر، چەندین مەحاڵی زۆری تێدایە و لە چەند لایەنێکی زۆرەوە دەردەکەوێ کە شتێکی بەتاڵ و نەگونجاوە.

بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها سێ دانە لەو مەحاڵانە بۆ نموونە باس دەکەین:

❖ **مەحاڵی یەکەم:**

ئەی مرۆڤی ملنەدەری سەرسەخت!

ئەم سەرکەشی و لەخۆبایی بوونەت تۆی هاویشتووەتە ناو باوەشی گەوجی و گەنۆییەکی یەکجار زۆرەوە. ئەوەتا وای لێ کردوویت کە باوەڕ بە سەد و یەك مەحاڵ بکەیت!

ئەی نەسەلمێنەری سەرسەخت!

تۆ بێ هیچ گومانێك دەزانیت کە خۆت هەیت و خاوەنی "بوون"یت. هەروەها گومانت لەوەشدا نییە کە ماددەیەکی ساکاری وشك و ڕەق نییت تاکو ئاڵوگۆڕت بەسەردا نەیەت. بەڵکو کارگەیەکی گەورەی ڕێکوپێکی ئەوتۆیت کە ئامێرەکانت هەردەم لە تازەبوونەوەدان و، وەك کۆشکێکی گەورەش وەهایت کە هەمیشە لایەنەکانی لە جموجووڵ و گۆڕانکاریدان، چونکە خانەکانی جەستەت، بێ هیچ وەستانێك، هەمیشە لە کار و کۆششدان و، بە چەندین پەیوەندیی جۆراوجۆر پەیوەستی "ڕواڵەتەکانی بوون"ن لەناو گەردوونی دەوروبەرتدا. کەواتە ئەو خانانەی جەستەت هەمیشە لە بەخشین و وەرگرتندان لەگەڵ بوونەوەراندا، بە تایبەتی لە لایەنەکانی: ڕۆزی و، مەسەلەی مانەوەی جۆر(نوع)ی مرۆڤەوە..

ئەوەتا ملیۆنەها خانەی کارگوزاری ناو جەستەت لە کار و ئەرکی ئەستۆیان ڕاناوەستن و، سەرگەرمی پارێزگاریی بەردەوامبوونی کارلێکەکانی نێوان خۆیان و ئەو وردەکارییانەن کە لە نێوانیاندا هەیە و، لە هەوڵی ئەوەدان کە هەرگیز پەیوەندییەکانی نێوان خۆیان و بوونەوەرانی دەوروبەریان نەبچڕێن. واتە زۆر بە لەسەرخۆیی و مەترسییەوە ئەم کارانە ئەنجام دەدەن و هەڵوێستێکی ئەوتۆ وەردەگرن کە لەگەڵ پەیوەندییەکانی نێوانیاندا لەبار و گونجاو بێت. وەك بڵێی ئەم خانانەی جەستەت بۆ هەموو بوونەوەران دەڕوانن تاکو جێگای تۆی تێدا ببینن و، بە جۆرێك ڕەفتار دەکەن کە سوودی تۆی تێدا بێت. ئیتر تۆیش لە جێی خۆتدا و بەپێی ئەو بارودۆخە نائاسایی و سەرسووڕهێنانەی خانەکانی جەستەت، سوود لەو بارەی ئەوان وەردەگریت و بە سەرجەمی هەستە دیار و نادیارەکانت لەزەت لە هەموو چێژەکانی ژیانت دەبەیت.

جا ئەگەر باوەڕت وا نەبێت کە: ئەو خانانەی لەشت بریتین لە چەند کارمەندێکی بچووك لە لایەن خواوەندی بەدەستەڵاتی ئەزەلی و چەند کار پێسپێرراوێکی گوێڕایەڵ بۆ یاساکانی خوای گەورە.. یان چەند سەربازێك لە سوپای ڕێکوپێکی خوادا.. یان نووکەکانی قەڵەمی توانستی خوای گەورە.. یاخود چەند نوختەیەك کە قەڵەمی توانستی خواوەند دەیانکێشێ و دەیاننووسێت..

ئەگەر باوەڕت وا نەبێت، دەبێ لەو باوەڕەدا بیت کە هەرچی خانەی کارگوزار (بۆ نموونە لە چاوتدا) هەن، هەریەکەیان چاوێکی فراوانی بینەری ئەوتۆی هەبێت کە هەموو بەش و لایەنەکانی جەستەت ببینێت و چاوی لە سەرجەمی ئەو بوونەوەرانە بێت کە

پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەیە و، ئاگاداری هەموو ڕووداوەکانی ژیانی ڕابوردوو و ئێستا و ئایندەی تۆ بێت و، باوك و باپیر و بنەچەت لەگەڵ منداڵ و بەرە و وەچەکانت بناسێت و، ئنجا سەرچاوەی ئەو توخمانەش کە لەشی تۆیان لێ پێکهاتووە و ئەو گەنجینانەش کە ڕۆزیی تۆیان لێوە دێت، هەموویان بزانێت و شارەزایان بێت. کەواتە بەم پێیە، دەبێ هەرچی خانەی کارگوزار لەناو جەستەتدا هەن، هەموو یەکێکیان خاوەنی ژیرییەکی گەلێ مەزن و ناوازە بن!!

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە ژیریی خۆی لەکارخستووە و باوەڕی بە بیر و بۆچوونی ئاوا هەیە!

ئایا نیسبەتدانی ئەم هەموو عەقڵ و شعوور و هەست و ژیرییەی کە ملیۆنێك ئەفلاتوون نییانە، لە تەنها یەك گەردیلەی ناو ژیرییەك، کە کەسانی وەك تۆ لێی بێ بەشن، ئەفسانە و گەوجایەتییەکی لەڕادەبەدەر نییە؟

❖ **مەحاڵی دووهەم:**

ئەم جەستەیەی تۆی مرۆڤ، وەك کۆشکێکی گەورەی ئاوەدان وایە کە هەزار و یەك گومەزی تێدا بێت و، هەریەك لەو گومەزانەش بە مەحکەمی و بێ هیچ ستوونێك یەکیان گرتبێت و چەندین بەردیان پێدا هەڵواسرابێت. تەنانەت جەستەی تۆ - گەر سەرنجی بدەیت - هەزاران ئەوەندەی ئەم کۆشکە سەرسووڕهێنەرترە. چونکە کۆشکی جەستەت هەمیشە ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و بەرەو جوانتر دەڕوات و زۆر بە ڕێکوپێکیش لە تازەبوونەوەدایە.

خۆ ئەگەر هیچ سەرنجێك لە "گیان" و "دڵ" و هەستە ناسکە مەعنەوییەکانی تر نەدەین کە لە تۆدا دانراون، کە هەریەکەیان موعجیزەیەکی سەربەخۆن بۆ خۆیان، بەڵکو تەنها یەك ئەندام لە نێوان ئەندامە ئاشکراکانی جەستەتدا بە نموونە بهێنینەوە، ئەوا دەبینین ئەو ئەندامە وەك خانوویەك وایە کە چەند گومەزێکی تێدا بێت، چونکە ئەو خانانەی کە لەو ئەندامەدان وەك بەردی گومەز بەوپەڕی ڕێکی و جوانی و وردەکارییەوە یەکیان گرتووە و تەلارێکی گەلێ ناوازە و جوانیان پێکهێناوە و، بەمەش یەکێك لە موعجیزەکانی توانستی خواوەندیان - وەك "چاو" یان "زمان" - دەرخستووە.

جا ئەگەر ئەم خانانەی لەشت لە لایەن خوای گەورەوە کاریان پێ نەسپێررابێت و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەندی بەدیهێنەر نەبن، دەبێ هەریەك لەو گەردیلانە فەرماندەی ئەوانی تر بێت و لە هەمان کاتدا لە ژێر فەرمانیشیاندا بێت! واتە لە ڕوانگەی

دەستەڵات و فەرمانده‌یی‌یەوە لەوانی تر بچێت و لە هەمان کاتدا دژیشیان بێت! هەروەها دەبێ زۆربەی ئەو سیفەتانەی کە تەنها شایستەی خوای گەورەن، لەو گەردیلەیەدا بن و، هەموو یەکێك لەو گەردیلانە سەربەست و دەست بەستراویش بن لە یەك کاتدا!

جا هەر کەس خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك هەست و شعوور بێت، دەزانێت کە هەرگیز ناگونجێت بەدیهێنانی ئەو بەدیهێنراوە ڕێکوپێکەی کە بەهۆی نەهێنیی "یەکتایی"یەوە یەکێکە لە شوێنەوارەکانی تاك و تەنیایی بەدیهێنەر، بدرێتە پاڵ چەندین خانەی زۆر و لەژمارەبەدەر. تەنانەت کە بیر لەمە دەکاتەوە سەد مەحالی تێدا دەبینێت.

❖ **مەحاڵی سێهەم:**

ئەگەر جەستەی تۆ بە قەڵەمی خواوەندی تاك و تەنیا و خاوەن توانستی ئەزەلی نەنووسرابێت، بەڵکو لە چاپخانەکانی سروشت و هۆکارەکاندا لە چاپ درابێت، دەبێ – لەو حاڵەتەدا – بە ئەندازەی ژمارەی پێکهاتە ڕێکوپێکەکانی جەستەت، هەر لە بچووکترین خانەی کارگوزارەوە تا دەگاتە گەورەترین و فراوانترین ئامێری کارگێڕ لەو جەستەیەدا، قاڵبی سروشتی ببن بۆ دروستکردن و بەدیهێنانیان!

با ئەم کتێبەی بەردەستمان بە نموونە بهێنینەوە، تاکو لەم مەحاڵە تێبگەین:

ئەگەر لەو باوەڕەدا بیت کە ئەم کتێبە بە دەست نووسراوەتەوە، ئەوا دەزانین نووسەرەکەی تەنیا یەك قەڵەمی بەسە بیگرێت بە دەستیەوە و ئەوەی مەبەستیەتی بە زانیاریی خۆی پێی بنووسێتەوە..

بەڵام ئەگەر وا نەزانرێت کە بە قەڵەم و دەستی یەك نووسەر نووسراوەتەوە و، وا دابنرێت کە: "خۆی لە خۆیەوە پێکهاتووە" یان ئەو نووسینە بە "کردەی سروشت" دابنرێت، ئەوا دەبێ هەر پیتێکی ئەو کتێبە قەڵەمێکی کانزایی تایبەتیی خۆی ببێت. واتە وەك ئەو پیتە کانزایی‌یانەی کە لە چاپخانەکاندا هەن و بە ئەندازەی ژمارەی پیتەکان و بە گوێرەی شکڵ و شێوەیان، دەبێ وەك ئەمە، بە ئەندازەی پیتەکانی ئەم کتێبە و بەپێی شکڵ و شێوەیان، قەڵەم بۆ ئەم مەبەستە ببن. بە واتایەکی تر: لە بریی یەك دانە قەڵەم بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە، دەبێ بە ئەندازەی پیتەکانی خۆی قەڵەم ببێت.

کاتی وەهایش دەبێ کە هەندێ لەو پیتانە گەلێ گەورەن و بە ئەندازەی لاپەڕەیەکی تەواو زانیاری‌یان بە خەتێکی ورد و باریك تێدا نووسراوەتەوە. جا لە حاڵەتی وادا دەبێ بۆ نووسینی ئەم چەشنە پیتە گەورانە، هەزاران قەڵەمی بچووك ببن تاکو ئەو پیتە وردانە لەناو ئەو پیتە گەورانەدا بنووسن!

ئێستا چی دەڵێیت گەر ئەو پیتانە بە چەشنێکی ڕێکوپێك یەکیان گرتبێت و چووبن بەناو یەکتری‌دا و شێوە و شکڵی جەستەی تۆیان وەرگرتبێت؟ خۆ ئەگەر ئەم پیتە پێکهێنەرانەی جەستەت بە چاپی سروشت و کردەی هۆکارەکان دابنێیت، ئەوا دەبێ لە هەموو بەشێك لە بەشەکانی جەستەتدا و لە گشت فەرمانگەکانی‌دا، بە ئەندازەی ئەو پێکهاتووانەی کە لە ژمارە نایەن، قاڵب هەبن تاکو ئەو پیتانە پێکبهێنن!

وا دابنێ لەم حاڵەتەشدا، کە مەحاڵێکە و سەد مەحاڵی تری لێ دەبێتەوە، تۆ دێیت و دەڵێیت: دەگونجێ ڕوو بدات. بەڵام ئایا هێشتا لەم کاتەشدا، واتە ئەگەر نووسینی کتێبەکە هی یەك قەڵەم نەبێت، خودی ئەو قەڵەم و پیتە کانزاییی‌یانەش بە ئەندازەی ژمارەی خۆیان پێویستیان بە چەند قەڵەم و قاڵب و پیتێك نابێت تاکو دروستیان بکەن؟! چونکە ئاشکرایە هەموویان دروست کراون و پێویستیان بە بەدیهێنەر و دروستکەرێك هەیە تاکو بەدی‌یان بهێنێت و دروستیان بکات!

ئیتر بەم چەشنە هەتا درێژەی پێ بدەیت و لێی بکۆڵیتەوە و پتر لێی قووڵ ببیتەوە، پێویست بە قاڵبی زیاتر دەکات و ئەنجامدانی کارەکە پتر درێژە دەکێشێت و، زنجیرە لە دوای زنجیرەی تری لێ دەبێتەوە!

دەسا تۆیش، لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە، لە ڕادەی لاوازی و هەڵەیی و نەخۆشیی ئەم بیروڕایە تێبگە کە بە ئەندازەی خانەکانی جەستەت خورافەت و مەحاڵی تێدا جەم بووە!

دەسا ئەی ئەو کەسە سەرسەختەی کە ژیریی خۆی لەکار خستووە!

بۆ لای ژیریی خۆت بگەڕێرەوە و، واز لەم گومڕاییی‌یە ئابڕووبەرە بهێنە و، دەستی لێ هەڵبگرە!

# ڕێگای سێهەم

وشەی سێهەمیش کە سەبارەت بە هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا دەڵێت: (سروشت داخوازی بووە). واتە لەسەر داخوازی سروشت هاتووەتە دی. ئەم بڕیارەش چەندەها مەحاڵی زۆر و زەبەندەی تێدایە. بەڵام تەنها سیانیان بۆ نموونە باس دەکەین:

✿ **مەحاڵی یەکەم:**

ئەگەر بێت و ئەو ڕێکوپێکی و بەدیهێنانەی کە لەناو بوونەوەران بە تایبەتی زیندەوەراندا بە ئاشکرا دەبینرێن و، نیشانەی دانایی و بەسیرەتیان بە جوانی تێدا بەدی دەکرێت، ئەگەر ئەمانە بە کاری نووسینی قەڵەمی قەدەر و توانستی ڕەها و بێ سنووری

خوای گەورە دانەنرێن و، بدرێنە پاڵ "سروشت"ی گێژ و گەلحۆ و کەڕ و لاڵ، یان "هێز"ی ئەو سروشتە بێ هەستە، ئەوا دەبێ سروشت بۆ بەدیهێنانی ئەمانە لە هەموو شتێکدا چەندین کارگە و چاپخانەی لەژمارەبەدەر دروست بکات، یان لە هەموو شتێکدا توانا و دەستەڵاتێکی ئەوتۆ دابنێت کە بتوانێت سەرجەمی گەردوون بەدی بهێنێت و، داناییەکی کارگێڕی کارامەش بە هەموو شتێك ببەخشێت کە هەموو کاروبارەکانی گەردوون بەڕێوە ببات!

بۆ نموونە:

درەوشانەوە و شکانەوەی تیشکی خۆر کە بە سەر هەموو دڵۆپە ئاوە ورشەدارەکان و وردە شووشە پەرش و بڵاوەکانی ڕووی زەوی‌دا دەردەکەون و دەبریسکێنەوە، وەکو چەند وردە خۆرێکی بچووك لە بەرچاودا خۆیان دەنوێنن..

جا ئەگەر ئەم درەوشانەوە و بریسکانەوە زۆرانە بە هی ئەو خۆرە ڕاستەقینە و تیشکدارەی ئاسمان و بە بریسکانەوەی ئەو دانەنرێن، ئەوا دەبێ باوەڕ بەوە بکرێت کە لە هەموو دڵۆپە ئاوێك و پارچە شووشەیەکدا - کە جێی هیچ شتێکیان تێدا نابێتەوە - خۆرێکی ڕاستەقینە و سروشتی هەبێت کە هەموو سیفەت و ئەدگارەکانی خۆری ڕاستەقینەی ناوجەرگەی ئاسمانی تێدا بێت. واتە: دەبێ باوەڕ بەوە بکرێت کە بە ئەندازەی گەردیلەکانی ئەو پارچە شووشانە، خۆری ڕاستەقینە لەو شووشانەدا بێت!

ئێمەش لەبەر ڕووناکیی ئەم نموونەیەدا دەڵێین:

ئەگەر بەدیهێنانی بوونەوەران و زیندەوەران ڕاستەوخۆ نەدرێتە پاڵ درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی نووری ئەزەلیی زەوی و ئاسمانەکان کە خوای گەورەی بەدەستەڵاتە، دەبێ باوەڕ بە "سروشت" و "هێز"ێکی ئەوتۆ بکرێت کە لە هەموو بوونەوەرێکدا (بە تایبەتی لە زیندەوەراندا) توانست و ویست و زانست و دانستێکی ڕەهایان بێت. واتە دەبێ باوەڕ بە بوونی خوایەتی و پەروەردگارێتی لە هەموو بەشێکی بوونەوەردا بکرێت!

خۆ دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوە چەوت و نەزۆکانە، لە هەموو مەحاڵێك بەتاڵتر و خورافەت و ئەفسانەی گەلێ زیاتری تێدا کۆبووەتەوە! چونکە بێ گومان ئەو کەسەی کە ئەم هەموو سنعەت و وردەکارییە ناوازە و قەشەنگانەی داهێنانی خوای گەورە - کە لە بچووکترین شتیشدا بە ئاشکرا دەبینرێن - بۆ سروشتێکی وەهمی و بێ بایەخ و بێ هەست و نەست دەگێڕێتەوە، ئەوا بیر و بۆچوونی خۆی دابەزاندووەتە ئاست و پلەیەکی گەلێ نزمتر لە هی ئاژەڵە نەزان و نەفامەکان!

✿ **مەحاڵی دووهەم:**

ئەگەر ئەم بوونەوەرانەی کە لەوپەڕی "ڕێکوپێکی" و "جوانی"دان و دارای وردەکاری و دانستی تەواون و بە تەرازووی هەستیاری سەرنەکەر بەدی هێنراون، بە کاری یەکێکی بەتوانای خاوەن توانست و دانستی ڕەها دانەنرێن و، لە بریی ئەو، بە کردەی "سروشت" بزانرێن، ئەوا دەبێ ئەم سروشتە لە هەموو مشتێك "خاك"دا - کە کارگە و شەتڵگای گوڵ و بەروبوومەکانە - بە ئەندازەی ژمارەی کارگە و چاپخانەکانی ئەورووپا کارگە و چاپخانە ئامادە بکات، تاکو ئەو مشتە خاکە بۆی بڕەخسێت کە بەم چەشنە ببێت بە کارگەی ئەو گوڵە جوان و بەروبوومە ناسکانە!

چونکە ئەو مشتە خاکەی کە وەك شەتڵگایەکی بچووك وایە، توانا و لێهاتنێکی ڕاستەقینەی ئەوتۆی تێدایە کە ئەگەر هەرچی تۆوی گوڵ و بەروبوومە جیاواز و جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگەکانی دنیا هەن، بە نۆرە و بە جیاجیا لەو مشتە خاکەدا بچێنرێن، دەتوانێت هەموویان سەوز بکات.

جا ئەگەر ئەم توانا و لێهاتنە بۆ توانستی بەدیهێنەرانەی ئەو خواوەندە مەزنە نەگێڕێتەوە کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوا دەبێ بۆ هەموو یەکێك لەو گوڵانەی کە لە دنیادا هەن، مەکینەیەکی تایبەتی و مەعنەویی سروشتی لەو مشتە خاکەدا ببێت! دەنا هەرگیز ئەو هەموو گوڵ و بەروبوومە جۆراوجۆرانەی دەیانبینین، پەیدا نابن و نایەنە جیهانی بوونەوە. چونکە تۆوەکان - وەك ئاوی مەنی و هێلکەکان - ماددەکانیان لە یەك دەچن، کە بریتین لە ئۆکسجین و هایدرۆجین و کاربۆن و ئازۆت و، بێ هیچ شێوە و شکڵێکی دیاری کراو تێکەڵی یەکتری بوون و هەموویان پێکەوە هەڵشێلراون.

ئنجا دەبێ ئەوەش بزانین کە هەرکام لە: (هەوا و گەرما و تیشك و ئاو) چەند شتێکی ساکارن و، هیچیان خاوەنی هەست و شعوور و ژیری نین و، وەك لافاو بە ناو شتاندا دێن و دەڕۆن..

جا یەکگرتن و پێکهاتنی ئەو گوڵە لەژمارەبەدەرانە (لە ڕوانگەی سروشتەوە) بەو وێنە و شکڵ و شێوە و چۆنێتییە جوان و دڵگیرانە و بەو ڕێکوپێکی و وردەکارییەی کە لە بەرچاودایە، بە ئاشکرا و پێویستی و بەداهەت داخوازی ئەوە دەبێت کە لەو مشتە خاکەدا هێندە کارگە و چاپخانەی بچووك بچووك هەبن کە زۆر لە ژمارەی کارگە و

چاپخانەکانی ئەوروپا زیاتر بن، تاکو "سروشت" چنینی ئەو کالاّ زیندووانەی لە توانادا بێت و بەو تانوپۆیەی کە لە بەرچاودایە، ئەو نەخش و نیگارە ڕەنگین و جوانانە برازێنێتەوە و بیاننەخشێنێت!!

بڕوانە بیر و بۆچوونە ئیلحادیەکەی سروشت پەرستان، چەندە لە ڕاستە شەقامی ژیریی ساغی مرۆڤەوە دوورە! ئەمە بە باشی بزانە و، ئنجا ئاستی بیرکردنەوەی ئەو کەسانەی پێ هەڵبسەنگێنە کە لافی ژیری و زانست لێ دەدەن، کەچی لە هەمان کاتدا "سروشت"یش بە بەدیهێنەر دەزانن! با بۆت دەربکەوێت کە چەندە لە هەموو تەرازوویەکی ژیرییەوە دوورن و، بزانیت ئەوانەی کە ئەفسانە و خورافەتێکی هەرگیز نەگونجاوی ئاوەها مەحاڵیان کردووە بە ڕێباز بۆ خۆیان، چەندە شایستەی سووکایەتی و گاڵتە پێ کردنن! ئیتر بۆ خۆت گاڵتەیان پێ بکە و، بەو ڕوانینە سووکەی شایانیانە، بۆیان بڕوانە!

**ئەگەر کەسێك پرسیار بکات و بڵێت:**

بەڵێ ڕاستە، ئەگەر بەدیهێنانی بوونەوەران بدرێتە پاڵ "سروشت" ئەوا گەلێ گیروگرفت و مەحاڵی زۆرمان دێنە ڕێ.. بەڵام کاتێ کە بەدیهێنان بە گشتی دەدرێتە پاڵ خواوەندی تاك و تەنیا و بێ هاوەڵ و هاوبەش، ئایا چۆن ئەو هەموو گیروگرفتانە چارەسەر دەکرێن و لەسەر ڕێدا نامێنن و تا ڕادەی: ئاسانی و پێویست، "بەدیهێنان" دەبێت بە کارێکی سووك و ئاسان بە لای توانستی ئەو خواوەندەوە؟

**وەڵام:**

هەروەك لە مەحاڵی یەکەمدا بۆمان ڕوون بووەوە، بریسکانەوە و درەوشانەوەی تیشکی خۆر، بەوپەڕی ئاسانی و بێ هیچ گیروگرفتێك، خۆی لە هەموو ماددەیەکدا دەرخست، هەر لە بچووکترین شتی بێ گیانی وەك شووشە وردەکانەوە تا دەگاتە فراوانترین تەختایی وەك زەریا و ئۆقیانووسەکان. ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین کە: ئەم "خۆر"ە ڕووناکی و کاریگەری و شوێنەواری خۆی - بەوپەڕی ئاسانی - لەو شتانەدا دەرخست، وەك بڵێی هەریەکە لەو بریسکانەوانە خۆرێکی میسالی بن..

جا ئەگەر ئەو پەیوەندی و نیسبەتەی نێوان خۆر و ئەوانەی باسمان کردن، بپچڕێت، ئەوا دەبێ باوەڕ بەوە بکرێت کە: هەریەکە لەو گەردیلانە، خۆرێکی سروشتیی تێدایە و هەریەك لەو خۆرانەش خاوەنی بوونێکی خۆیی و دەرەکی‌یە! دیارە ئەمەش دەرەنجامێکی هێندە مەحاڵ و نەگونجاوە کە هیچ عەقڵێك وەری ناگرێت و پێی ڕازی نابێت.

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، بەدیهێنان و دروستکردنی هەموو شتێکیش بە هەمان جۆرە، چونکە ئەگەر ڕاستەوخۆ بدرێتە پاڵ خواوەندی تاك و تەنیا و صەمەد و بێ هاوبەش، ئەوا تا ڕادە و پلەی "وجوب" بەدیهێنان کارێکی ئاسان دەبێت، چونکە ئەو کاتە هەر بوونەوەرێك پێویستی بە هەر شتێك بێت، دەتوانرێ بەوپەڕی ئاسانی ئەو پێداویستییەی بەدەست بگەیەنرێت، ئەویش لە ڕێگای: "لێ دەروشانەوە" و "پەیوەندی بوون"ەوە.

بەڵام گەر ئەو نیسبەت و پەیوەندییە ببچڕێنرێ و گوێڕایەڵی و بەکارهێنان و فەرمان پێ سپاردن لە گۆڕێدا نەمێنێت و، لە جێگایاندا سەرپێچی کردن و خۆدزینەوە لە فەرمانەکان دابنرێت و، هەموو شتێکی ناو ئەم بوونەوەرەش بە سەربەستی و بەرەڵایی وازی لێ بهێنرێت.. یان ئەم کارە بە "سروشت" بسپێررێت.. ئەوا بە سەدان هەزار گیروگرفت، کە دەگەنە ڕادە و پلەی نەگونجان(الإمتناع) سەر هەڵدەدەن و پەیدا دەبن، بە ڕادەیەك کە تەنها بۆ دروستکردنی تەنها یەك دانە "مێش"ی بچووك پێویست دەکات ئەو سروشتە کتوکوێرەی کە لەو مێشەدایە، خاوەنی دەستەلاتێکی ئەوتۆ بێت بتوانێت هەموو گەردوونی پێ دروست بکات و، دارای دانستێکی وەهایش بێت کە بتوانێت ئەم بوونەوەرە گەورەیەی پێ بەڕێوە ببات! چونکە مێش هەرچەندە لە قەبارەدا بچووکە، بەڵام گەلێ بە جوانی و ڕێکوپێکی خولقێنراوە و، زۆربەی ماددە پێکهێنەرەکانی بوونەوەرانی تێدا جەم بووە، وەك بلێی پێرستێکی پوختەکراوی ئەو بوونەوەرانە بێت. خۆ ئەمەش تەنها یەك دانە مەحاڵ نییە هەتا کۆتایی پێ بێت و ببڕێتەوە، بەڵکو هەزار و یەك مەحاڵی تێدایە کە لەو یەکەم مەحاڵەوە سەر هەڵدەدەن و پەیدا دەبن!

**بە کورتی و پوختی:**

هەروەك بوونی هاوتا و هاوبەش لە "خوایەتی"ی خوای گەورەدا شتێکی مەحاڵ و نەگونجاوە، دەست وەردانیش لە "پەروەردگاریتی"ی خوای گەورەدا و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری بەدیهێنانی ئەو شتانەی کە ئەو بەدییان دەهێنێ، بە هەمان جۆر، مەحاڵ و نەگونجاوە!

سەبارەت بەو گیروگرفتانەش کە لە مەحاڵی دووهەمدا باس کران و لە بەشێکی زۆری پەیامەکاندا چەسپاندوومانن، لەوەدایە کە وتمان:

"هەر کاتێك بەدیهێنانی هەموو شتێك بدرێتە پاڵ خوای تاك و تەنیا، وەك دروستکردنی تەنها یەك دانە شت کارەکە ئاسان دەبێت، بەڵام ئەگەر بدرێتە پاڵ

سروشت و هۆکارەکان، ئەوا بەدیهێنانی یەك دانە شت بە ئەندازەی دروستکردنی هەموان سەخت و پڕ لە کێشە و گیروگرفت دەبێت".

جا لەبەر ئەوەی ئەم دەرەنجامەمان بە چەندین بەڵگەی توندوتۆڵ و سەلمێنەر لە چەندین پەیامدا چەسپاندووە، ئەوا لێرەدا پوختەی یەکێك لەو بەڵگانە باس دەکەین:

ئەگەر کەسێك – چ بە سەربازی و چ بە فەرمانبەری و کارمەندیی دەوڵەت – پەیوەندیی لەگەڵ پادشایەکدا بەست و پاڵی بە دەستەڵاتی ئەو پادشایەوە دا، ئەوا دەتوانێت سەد هەزار هێندەی ئەو کارانە جێبەجێ بکات کە بە تەنها توانستی خۆی دەتوانێت ئەنجامیان بدات. دیارە ئەمەش بەهۆی پاڵدانەوەیەوە بە هێزی ئەو پەیوەندی و نیسبەتەی کە لەگەڵ پادشادا هەیەتی.

بۆ نموونە: ئەم سەربازە، هەرچەندە یەك کەسی تاك و تەنیایە، کەچی هەندێ جار دەتوانێت بە ناوی پادشاوە فەرماندەیەکی گەورەی سوپای دوژمن دیل بکات، چونکە هەموو ئەو ئامێر و کەرەسە و تەقەمەنییانەی کە بۆ ئەم چەشنە کارانە پێویستی پێیان دەبێت، ئەم خۆی هەڵیان ناگرێت و ناچاریش نییە کە خۆی هەڵیان بگرێت، بەڵکو گەنجینەی پادشا ئەم شتانەی بۆ دابین دەکات و، ئەو کەرتانەی سوپاکەشی کە ئەم کارەیان خراوەتە ئەستۆ بۆی دەهێنن و هەڵی دەگرن. هەموو ئەمانەش لە سایەی ئەو پەیوەندی و پاڵ پێوەدان و نیسبەت پەیدا کردنەیەتی لەگەڵ پادشادا. ئەوەتا چەند کردارێکی وەهای لەسەر دەست ڕوودەدات کە وەك کرداری پادشایەکی مەزن وان و، چەند جێ دەست و ئاسەوارێکیش دەخاتە ڕوو کە وەك هی سوپایەکی گەورە دەنوێنن..

کەواتە ئەم سەربازە سەر بە پادشایە، وەك ئەو مێروولەیە وایە کە بەو کارمەندی و پاڵ پێوەدان و نیسبەت پەیدا کردنەی، دەتوانێت کۆشکی فیرعەونێکی ستەمکار بڕووخێنێت و.. وەك مێشوولەیەك دەردەکەوێت کە لە سایەی ئەو نیسبەت و پەیوەندییەوە دەتوانێت نەمروودێکی سەرکەش لەناو بەرێت و.. چەشنی "تۆو"ی درەختی "سنەوبەر"ی لێ دێت، کە هێندە بچووکە وەك دەنکە گەنمێك وایە، بەڵام لە ڕێی ئەو پەیوەندی و نیسبەتەوە، سەرجەمی ئامێرەکانی ئەو درەختە زەبەلاحەی سنەوبەر پێ دەگەیەنێت و گشت پێکهاتەکانیشی گەشە پێ دەسێنێت[1].

---

(١) بەڵێ، ئەگەر پەیوەندی و نیسبەت لە نێواندا هەبوو، ئەوا ئەو تۆوە فەرمان لە قەدەری خوا وەردەگرێت و شەرەفی ئەنجامدانی ئەو کردارەی دەدرێتێ.. بەڵام ئەگەر ئەو پەیوەندی و نیسبەتە بپچڕێت، ئەوا تەنها دروستکردنی خودی ئەو تۆوە داخوازی هێندە توانست و مەهارەت و ئامێری جۆراوجۆری ئەوتۆ دەبێت کە

خۆ ئەگەر ئەو پەیوەندی و نیسبەتە لە نێوان پادشا و ئەو سەربازەدا ببچڕێت و فەرمانبەریی‌یەکەشی لێ بسێنرێتەوە، ئەوا دەبێ سەرجەمی ئەو کردارانەی کە ئەنجامیان دەدات هەر تەنها بۆ خۆی بیانگرێتە ئەستۆی و لەسەر شان و بە دەست و بازووی خۆی پێویستی‌یەکانی هەڵبگرێت و بە کەرەسە و ئامێرەکانیش سەرشانی خۆی قورس و ماندوو بکات! دیارە ئەو کاتەش تەنها بە گوێرەی هێزی دەست و بازووی لاوازی خۆی دەتوانێت ئەو کردارانە ڕاپەڕێنێت و، تەنها هێندەی لە توانادا دەبێت کە لەگەڵ بڕ و ئەندازەی ئەو کەرەسانەی هەڵی گرتوون بگونجێت، بە چەشنێك کە ئەگەر داوای ئەنجامدانی ئەو کردارانەی لێ بکرێت کە لە حاڵەتی یەکەمدا بەوپەڕی ئاسانی ئەنجامی دەدان، ئەوا دەستەوسانی و بێ‌توانایی خۆی بە ئاشکرا دەردەبڕێت. مەگەر (کە ئەمەش بە ئاشکرا شتێکی مەحاڵە) بتوانێت هێزی سوپایەکی تەواو لە دەست و بازووی خۆی‌دا کۆبکاتەوە و گشت کارگەی کەرەسە و ئامێرەکانی سوپایش تەنها خۆی بە کۆڵ هەڵیان بگرێت!!

خاوەنی ئەو ئەندێشەیەی کە لە بۆشایی وەهم و وڕێنەی وادا مەڵە دەکات، کە بەم ڕوونکردنەوەیە ڕادەی وەهم و وڕێنەکانی خۆی بۆ دەردەکەوێت، لە تەریقی و شەرم و شوورەیی ئەم ئەندێشەیەی‌دا، ڕووی خۆی دەشارێتەوە و لە بەرچاودا خۆی ون دەکات!

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

تەسلیم کردن و گێڕانەوەی هەموو کاروبارێکی بوونەوەران بۆ خواوەندی "واجب الوجود" تا پلەی (پێویستی) کارێکی ئاسانە.. بەڵام گێڕانەوەی بەدیهێنان بۆ "سروشت" تا ڕادەی (نەگونجاوی) مەحاڵ و پڕ لە کێشە و گیروگرفتە و، بیرێکە لە دەرەوەی بازنەی ژیریدایە.

---

گەلێ لە پێویستی‌یەکانی دروستکردنی درەختی زەبەلاحی سنەوبەر زیاتر بن! چونکە دەبێ هەموو ئەندامەکانی ئەو درەختە سنەوبەرە ـ کە یەکێکە لە ئاسەوارە دیار و ئاشکراکانی توانستی خواوەند و لەناو چیا و شاخەکاندان و ئەوەندەی تر جوانی‌یان بەو چیا و شاخانە بەخشیوە ـ لە دوو توێی ئەو تۆوەدا بن (کە لە ڕاستی‌دا ئەویش درەختێکی مەعنەوی‌یە و یەکێکە لە جێ‌دەستەکانی قەدەری خواوەند) چونکە کارگەی ئەو درەختە باڵابەرزە لەناو ئەو تۆوەدایە. جا ئەو درەختە مەعنەوی‌یەی کە قەدەری خوا لەو تۆوەدا دروستی کردووە، لە پاشاندا، بە توانستی ئەو خوایە، شکڵ و شێوەی درەختێکی بەرجەستەی سنەوبەر وەردەگرێت.
(دانەر)

**✿ مەحاڵی سێهەم:**

ئەم مەحاڵە، لە هەندێ پەیامدا، بە دوو نموونە ڕوون کراوەتەوە:

*نموونەی یەکەم:*

جارێکیان مرۆڤێکی تەواو نەزان کە لەوەو پێش هیچ لایەنێکی شارستانێتیی نە بە چاو بینیبوو نە بە تەسەووریشی‌دا هاتبوو، لە بیابانێکی تاریك و چۆڵدا کۆشکێکی هێندە گەورە و جوان دەبینێت کە بەوپەڕی جوانکاری و ئارایشت ڕازابووەوە و، تازەترین ئامێر و پێداویستیی شارستانێتیی ڕۆژگاری تێدا ئامادە کرابوو و، لە تاریکایی ئەو بیابانە چۆڵ و سامناکەدا تریفەی گڵۆپەکانی و ورشەی تیشکەکانی ئەو ناوەیان ڕووناك کردبووەوە.

ئەم مرۆڤە نەشارەزایە ڕۆشتە ناو کۆشکەکە و، هەتا توانیی بە ناوی‌دا گەڕا و، بە وردی سەرنجی هەموو نهۆم و بەشەکانی دا. لە ئەنجامدا کارامەیی و ناوازەیی بنیاتنانی کۆشکەکە و نەخشونیگاری دیوارەکان و وردیی جوانکاری‌یەکانی، گرفتاری سەرسامی و حەپەسانیان کرد! ئنجا نەزانی و گێلی و ساویلکەیی لەڕادەبەدەریشی وایان بردە وەهم و ئەندێشەیەوە کە ئەو کۆشکە ـ لە خۆی‌دا ـ خاوەنی ژیان بێت و، توانای بنیاتنانی خۆی و سەرجەم ژوور و هۆڵەکانی ببێت و، هەر خۆیشی وێنەی نەخشونیگارە ڕەنگین و سەرنج ڕاکێشەکانی کێشابن! ئەم گومانەش تەنها ئەنجامی ئەوە بوو کە تەسەووری نەدەکرد لە دەرەوەی کۆشك و لەو بیابانە چۆڵەدا کەسێك ببێت بنیاتنانی ئەو کۆشکە ناوازەیەی لە تواناد‌ا بێت!

لەبەر ئەوە و بۆ مەبەستی دۆزینەوەی "بنیاتنەر"ی ئەم کۆشکە ناوازەیە، دەستی بە گەڕان و پشکنین کرد لە نێوان شتانی ناو کۆشکەکەدا و، بە وردی چاوی بە ناویاندا دەگێڕا تاکو شتێك بدۆزێتەوە دروستکردن و ڕازاندنەوەی کۆشك و دابینکردن و دانانی کەرەسەکانی ناوی لە توانادا بێت. بەڵام هەرچەندە مرۆڤێکی دنیا نەدیو بوو، کەچی هەر شتێکی دەبینی عەقڵی پەسەندی نەدەکرد کە بەدیهێنەری ئەو کۆشکە ڕەنگین و ناوازەیە بێت.

پاش ماوەیەکی گەڕان و پشکنین، کتوپڕ لە گۆشەیەکی کۆشکەکەدا دەفتەرێکی دۆزی‌یەوە کە پلان و نەخشەی بنیاتنان و، پێڕستی ناوەڕۆك و، یاساکانی بەکارهێنان و پرۆگرامی بەڕێوەبردنی شتانی ناو ئەو کۆشکەی تێدا نووسرابووەوە.

خۆ هەرچەندەش ئەو دەفتەرە - لە ڕاستیدا - چەشنی هەموو ئەو شتانەی کە تیایدا نووسراون، بنیاتنان و ڕازاندنەوەی ئەو کۆشکەی لەباردا نییە، چونکە نە دەستی هەیە کاری پێ بکات و نە چاویشی هەیە تا پێی ببینێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم کەسە نەشارەزایە ئەو دەفتەرەی پەسەند کرد و پێی وابوو لەچاو هەموو شتەکانی ناو کۆشکدا پتر بۆ ئەو مەبەستە دەست دەدات، چونکە سەرنجی دا نەخشەی بینا و کەرەسە و ناوەرۆکی کۆشکەکەی تێدایە و ئەو پلان و نەخشانەش کە لەو دەفتەرەدا تۆمار کراون لەگەڵ ڕەوتی کارەکانی ناو کۆشکەکەدا یەکاویەك دەردەچن. (چونکە ئەو دەفتەرە - وەك دوایی بۆمان دەردەکەوێت - ناونیشانی یاسا زانستییەکانی خواوەندە). لەبەر ئەوە، خۆی بە ناچار زانی کە بڵێت:

- (تەنها ئەم دەفتەرەیە کە ئەم کۆشکەی بنیات ناوە و، ڕێکی خستووە و، ڕازاندوویەتیەوە و، شتانی ناویشی بەدی هێناوە و، بەم شێوازە ڕێکوپێکیی پێ بەخشیون)!!

ئیتر بەم جۆرە وتە و وڕێنە بێ نرخانە، ڕادەی نەفامی و گەوجایەتیی خۆی دەربڕی.

کتومت و بە چەشنی ئەم نموونەیە:

گەوجێکی نەفام لەوانەی کە باوەڕیان بە "سروشت" هەیە و سەرپێچی لە مەزنایەتیی خوای گەورە دەکەن، کاتێ دێتە ناو ئەم کۆشکە گەورەیەی گەردوونەوە، کە بێ گومان گەلێ لەو کۆشکەی نموونەکەی پێشوو ڕێکوپێکتر و جوانترە و دارای وردەکاریی یەکجار ناوازە و قەشەنگترە، بە ڕادەیەکی وا کە هەرگیز بەراوردکردن لە نێوانیاندا نییە. چونکە هەموو گۆشە و لایەنێکی کۆشکی مەزنی گەردوون چەندین موعجیزەی بێ هاوتا و پڕ لە دانستی بەرزیان تێدایە کە چەشنی تیشکی خۆر پرشنگ دەدەن..

ئەم گەلحۆیە دێتە ناو کۆشکی ئەم گەردوونە و، پێشەکی لە زەینی خۆیدا بڕیار دەدات: پشت لە هەموو ئاسەوارە زۆرەکانی سنعەتی کردگار هەڵبکات کە لە بەردەمیدان و، ئاسەواری ئەو کردگارەن کە سەرجەمی بەدیهێنراوان و مومکینات هەرگیز بە پلەی ئەو ناگەن و، بەسەر هەموویاندا بەرز و بڵندە. ئەم مرۆڤە، دێت و لەناو ئەم بوونەوەر و بەدیهێنراوانەدا بە دوای هۆی بەدیهێنەریاندا دەگەڕێت و دەست بە وردبوونەوە و پشکنین دەکات و، لە ئەنجامی گەڕانەکەیدا پەی بە کۆمەڵی یاسا

خوایی‌یەکان و پیرستی سنعەتی کردگار دەبات کە بە هەڵە - هەڵەیەکی گەورەش - ناوی "سروشت"ی لێ نراوە. ئەو سروشتەی کە وەك لاپەرەیەکی دەفتەری "ئاڵ و گۆڕی" یاساکانی کاروباری توانستی خوای گەورە وایە و، لە بریی ئەو تابلۆیەی قەدەری خوایە کە شتانی تێدا دەنووسرێن و پاشان دەکوژێنرێنەوە، واتە لە بازنەی "بەدیهێنراوەکان"دا ئەوەی بیەوێت دەینووسێت و تیایدا دەیهێڵێتەوە، ئەوەش بیەوێت لای ببات، لایدەبات و دەیکوژێنێتەوە..

جا ئەم گەوج و گەلحۆیەش کە لە نێوان بەدیهێنراوانی بەرچاویدا بە دوای بەدیهێنەریاندا دەگەرێت، دەڵێت:

(مادەم دەبێ هۆکارێك ببێت ئەم شتانەی بەدی هێنابێت و، هیچ شتێکیش وەك ئەم دەفتەرە لە ئارادا نی‌یە کە بەو رادەیە پەیوەندیی بە شتانی ناو کۆشکی گەردوونەوە ببێت.. مادەم لە لایەکی تریشەوە باوەرم بە خوای بەدیهێنەر نی‌یە، ئەوا دەبێ هەر ئەم دەفتەرە بێت کە ئەو شتانەی بەدی هێنابێت)!!

بەڵێ، وا بریاری دا. هەرچەندەش "ژیری" بە تەواوەتی و بەپێی مەنتیق و پێوەرەکانی خۆی، دەست بە رووی ئەو گریمانەوە دەنێت کە ئەم دەفتەرە کەر و کوێر و کۆڵەوارە، ئەو کردارانەی ئەنجام دابێت کە تایبەتکاریی پەروەردگاریتی‌یەکی رەهان، کە ئەویش داخوازی دەستەڵاتێکی رەها و فراوانە.

ئێمەش پێی دەڵێین:

ئەی تێنەگەیشتووی سەرسوورماو!

ئەی ئەو گەوجەی کە لە "هەبەننەقە"[1] گەوج تری!

سەر لەناو زەلکاوی سروشت دەربهێنە و سەیری دەوروبەری خۆت بکە..

ئەوەتا هەموو بوونەوەر و بەدیهێنراوان، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان، هەموویان بە چەندین زمانی جۆراوجۆر شایەتی لەسەر بەدیهێنەری گەورەی بەدەستەڵات دەدەن و بەڵگەی تاك و تەنیایی ئەون. سەرت هەڵبرە و خواوەندی بەدیهێنەری میهرەبان ببینە.

---

(١) نازناوی (یەزیدی کوری سەروانی قەیسی)یە، کە لە زمانی عەرەبیدا بە نموونەی گەوجی و گێلی دەیهێننەوە. (وەرگێر)

چونکە هەریەك لەو بوونەوەرانە، بە زمانی تایبەتی و بەڵگەی تایبەتیی خۆیان، شایەتی لەسەر ئەو خوایە دەدەن.

سەیر بکە؛ با درەوشانەوەی ئەو خوایە لە جیهاندا ببینیت کە ئەم کۆشکەی بنیات ناوە و، ئنجا پرۆگرام و پلان و یاساکانی ئەو کۆشکەشی لەو دەفتەرەدا نووسیوەتەوە.

ئەمە ببینە و، خۆت لە تاوان و لیتە و قوڕاوی ئەم وڕێنە و وتە بێ نرخانە ڕزگار بکە!

*نموونەی دووهەم:*

جارێکیان مرۆڤێکی نەشارەزای جیهانی شارستانێتی و نەزان و دنیا نەدیو، دەڕواتە ناو سوپایەکی سامناکەوە و، لە بەردەم ئەو مەشق و ڕاهێنانە گشتییەی کە سەربازەکانی سوپا پێکەوە دەیانکرد، دەحەپەسێت کە دەبینێت ئەوپەڕی ڕێکی و خشتی و گوێڕایەڵی پیشان دەدەن. پاشان سەرنج لەو جموجوولە ڕێکخراوەیان دەدات کە دەبینێت سەرجەمی سوپا، چ تیپ و چ لیوا و چ هێز، تێکڕا بە بزووتنەوەی یەك دانە کەس دەبزوونەوە و، بە بێدەنگ بوونیشی بێدەنگ دەبن و، هەرکاتیش ئەم یەك کەسە فەرمانی تەقە کردنی بۆ دەرکردن ئەوا هەموویان یەکسەر دەست بە تەقە و دەستڕێژ دەکەن..

بەڵێ، ئەم مرۆڤە سەرنجی لە هەموو ئەمانە دا. بەڵام تێنەگەیشتن و کەودەنییەکەی وایان لێ کرد کە هیچ شتێك لە بارەی فەرمانەکانی پێشەوایەتیی سوپا تێنەگات و پەیی پێ نەبات، لەوانەی کە لە یاساکانی دەوڵەت و پادشادا دیاری کراون. لەبەر ئەم تێنەگەیشتنەی ئینکاریی سەرکردایەتیی سەرکردەی مەزنی کرد و، بە ئەندێشەی خۆی پێی وابوو ئەم سەربازانە بەهۆی چەند پەتێکی ماددی بە یەکەوە بەستراونەتەوە! پاشان بیری لەو پەتە ئەندێشەییە دەکردەوە کە ئایا دەبێ چەندە سەیر و سەرسووڕهێنەر بێت؟ بەڵام لە ڕاستیدا خۆی گرفتاری سەرسامی و سەرسووڕمانی زیاتر کرد و بەو حاڵەوە سەربازگەی بەجێ هێشت و کەوتەڕێ!

هەر ئەم مرۆڤە، لە ڕۆژی جومعەدا ڕێی دەکەوێتە مزگەوتی گەورەی "ئەیا سۆفیا". دەبینێت کۆمەڵی موسڵمانان لە هەستان و دانیشتن و ڕکووع و سوژدەی نوێژدا گوێڕایەڵی دەنگی یەکێکیانن! جا لەبەر ئەوەی ئەم مرۆڤە لە واتا و ناوەڕۆکی "شەریعەتەکانی خواوەند" - کە یاسا مەعنەوی و ئاسمانییەکانە - تێنەدەگەیشت و، هەستی بەو دەستوور و یاسا مەعنەوییانە نەدەکرد کە لە فەرمانەکانی خاوەنی شەریعەتدان، ئەوا لای وابوو کە ئەو جەماعەتە، بە چەند پەتێکی ماددی بە یەکەوە بەستراونەتەوە! گوایە ئەو پەتە سەیرانە کۆمەڵی مزگەوتی پەیوەستی یەکتری کردووە و،

هەموو جموجووڵ و وەستانێکیشیان لە ڕێی ئەو پەتانەوەیە! بەم جۆرە، ڕۆشت و کەوتەڕێ و، ئەم چەشنە بیر کردنەوە بێ نرخ و نەزۆکانەشی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت، کە هێندە بێ بایەخە تەنانەت ئەو جروجانەوەرە دڕندانەش کە لە شێوە و شکڵی مرۆڤدان، گاڵتەی پێ دەکەن و بە مایەی شەرمەزاریی دەزانن!

جا لە ڕوانگەی ئەم دوو نموونەیەوە دەڵێین:

مولحیدێك لەوانەی کە چەمکی سەرسەخت و تەواو نەزانانەی "سروشت"یان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، کاتێ دێتە ناو ئەم جیهانەی کە سەربازگەیەکی بەسام و شکۆ و جوانی سوپای پادشای مەزنە و، مزگەوتێکی گەورە و ڕێك و قەشەنگی ئەوتۆیە کە تەقدیسی پەرستراوی ئەزەلیی تێدا دەکرێت.. کاتێ دێت و پەی بەو "یاسا مەعنەوی‌یانە" دەبات کە ئاسەوارەکانیان لە پەیوەست کردنی ڕێساکانی ئەم گەردوونە ناوازەیەدا دەبینرێن و، لە سەرچاوەی "دانست"ی ڕەها و بێ سنووری بەدیهێنەری مەزنەوە هەڵقوڵاون.. ئەم مرۆڤە، سەرجەمی ئەو یاسایانە بە چەند یاسایەکی ماددی دادەنێت و، وەك چەند ماددەیەکی ڕەق و تەق دەیانبینێت و لەو ڕوانگەیەشەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

هەروەها بە ئەندێشەی خۆی پێی وایە کە فەرمانەکانی یاساکانی پەروەردگاریتیی زاڵ و دەستەڵاتدار و گشتیی خواوەند، کە چەند یاسایەکی گوێرەیی و ئیعتیبارین و.. دەستوورەکانی شەریعەتی گەردوونیی خواوەندی پەرستراوی ئەزەلیش، کە چەند دەستوورێکی مەعنەوین و تەنها لە زانستی خوادا هەن و بوونیان هەیە، ئەم مرۆڤە، پێی وا دەبێ کە هەرکام لەو یاسا و دەستوورانە بوونی دەرەکی‌یان هەیە و چەند یاسایەکی ماددین. ئیتر دێت و ئەو یاسایانەی کە لە "زانست"ی خوا و "گوفتار"ی پەروەردگارەوە دەرچوون و تەنها "بوونی زانستی"یان هەیە (واتە: تەنها لە زانستی خوادا هەن) ئەم دێت و لە بریی توانستی خوا دایاندەنێت و کاروباری بەدیهێنان و دروستکردنیان پێ دەبەخشێت و، پاشان ناوی "سروشت"یان بەسەردا دەبڕێت. ئنجا ئەو "هێز"ەش کە لەناو ئەو یاسایانەدایە و بریتی‌یە لە درەوشانەوەیەکی "توانست"ی پەروەردگار، ئەم مرۆڤە مولحیدە بە "هێزێکی بەتوانای کاریگەر"ی دادەنێت و وەك "خاوەن توانستێکی سەربەخۆ" بۆی دەڕوانێت!

جا ئایا کەودەنی و نەفامیی لەمە زیاتر هەیە؟ ئایا نەفامی و گەوجیی ئەم کەسە بە چەندین جاریش لە هی ناو نموونەکە زیاتر نی‌یە؟

**بە کورتی و پوختی:**

ئەو شتە وەهمی‌یەی کە سروشت پەرستان ناوی "سروشت"ی لێ دەنێن و دارای هیچ حەقیقەتێکیش نی‌یە، ئەگەر بێت و وا دابنرێت بوونی ڕاستەقینەی دەرەکیشی ببێت، ئەوا:

تەنها سنعەتێکە، نەك سنعەتکار.. نەخشونیگارێکە، نەك نیگارکێش.. چەند فەرمانێکە، نەك فەرماندەر.. یاسا و شەریعەتێکی بەدیهاتووە، نەك یاسادانەر.. پەردەیەکی ڕووکەشی بەدیهێنراوە کە بەسەر ڕووی عیززەتی بەدیهێنەرێتیی خوای گەورەدا دادراوەتەوە، نەك بەدیهێنەر.. بەدیهێنراوێکی کارتێکراوە، نەك بەدیهێنەر و کردگار.. کۆمەڵە یاسایەکە، نەك توانست و خاوەن توانست.. ئامێرێکی پێوانەیە بۆ ئەوەی شتانی پێ بپێورێت، نەك سەرچاوەی شتان.

**پوختەی ئەم قسانە:** (کە لە ڕوونکردنەوەی مەحاڵەکانی ئەم سێ ڕێگایەدا باس کران) ئەوەیە کە:

مادەم بوونەوەران - لە ڕاستیدا - هەن.. مادەم عەقڵیش لە بۆچوونیدا بۆ دۆزینەوەی بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرانە، لە چوار ڕێگا زیاتری لە بەردەمدا نی‌یە - وەك لە پێشەکیدا باس کرا - ئنجا بە تەواوی و یەکجاریش نەگونجاوی و بەتاڵیی سیان لەو چوار ڕێگایەمان بۆ چەسپا، بەهۆی ڕوونکردنەوەی سێ دانە مەحاڵی ڕوون و ئاشکرا بۆ هەرکام لەو سێ ڕێگایە..

ئەوا بە "ڕوونی" و "بەداهەت" و "پێویست" ڕێگای چوارەم دەچەسپێت، کە ڕێگای: "بوونی بەدیهێنەرێکی تاکی تەنیا"یە. چەسپاندنی ئەو ڕێیەش لە دڵنیایی‌یەکی ئەوتۆوە سەرچاوەی گرتووە کە هیچ گومان و دوودڵی‌یەکی ئاوێتە نابێت و ڕێگایەکە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووناکی دەکاتەوە کە دەفەرموێ:

﴿أفي الله شَكٌّ فاطِرِ السَّموات والأرْضِ﴾؟

ئەم ئایەتە، بە ڕوونی و بەداهەت، بەڵگەیە لەسەر بوون و خوایەتیی خواوەندی "واجب الوجود" و، لەسەر ئەوەش کە خوایەتیی ئەم خوایە سەبارەت بە هەموو شتێکە و، هەموو شتان لە دەستی توانستی ئەو بەدیهێنەرەوە پەیدا بوون و، جڵەوی گشت کاروبارێکی ئاسمانەکان و زەویش هەر لە ژێر دەستی توانای ئەودان.

دەسا ئەی مرۆڤی هۆپەرست!

ئەی ئەو کەسەی کە تا ڕادەی پەرستن شەیدای "سروشت" بووە!

مادەم "سروشت"ی هەر شتێك وەك خودی ئەو شتە بەدیهێنراوە و دروست کراوە، چونکە بە تازەیی و بە جۆرێکی پڕ لە وردەکاریی‌یەوە پێکدێت و، مادەم هۆکارە ئاشکراکەشی، وەك هەر هۆکارێکی تر، ئەویش دروستکراو و بەدیهێنراوە..

ئنجا مادەم بوونی هەر شتێك پێویستی بە چەند هۆکار و پێداویستی و ئامێرێکی گەلێ زۆر هەیە، ئەوا دەبێ:

یەکێکی خاوەن توانستی ڕەها بێت کە ئەو سروشت و هۆکارە بەدی بهێنێت و دروستیان بکات و، دەبێ ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەش لە توانستی خۆیدا هێندە بێ باك و دەوڵەمەند بێت کە پێویستی بە هیچ شتێك نەبێت و، هەرگیز هۆکارە بێ دەستەڵات و دەستەوسان و کۆڵەوارەکان لە کاروباری پەروەردگارێتیی خۆی و بەدیهێنانی‌دا بۆ شتان، بەشدار نەکات.

خۆ جگە لە خوای گەورە هیچ کەسێکی تر نی‌یە کە بەم چەشنە خاوەنی توانستێکی ئاوا دەوڵەمەند و گەورە و بەرز بێت.

هەر ئەو خواوەندەیە کە چ هۆکارەکان(الأسباب) و چ بەهۆکراوەکان (المُسَـــبَّبات) ڕاستەوخۆ بەدی دەهێنێت و هۆکاری‌یەکی ئاشکرا و ڕواڵەتی‌یان لە نێواندا ساز دەکات و، بە ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوانیان پابەندی یەکتریان دەکات و، "سروشت" و "هۆکارەکان"یش دەکات بە چەند پەردەیەك لە بەردەم توانست و مەزنایەتیی خۆیدا. ئنجا بۆ ئەوەش کە عیززەت و گەورەیی‌یەکەی خۆی تەقدیس بکات و بە پاکی ڕایبگرێت، ئەوا هۆکارەکانی کردووە بە سەرچاوەی ئەو چەشنە کاروبارانەی کە بە چاوی ڕواڵەتبینی بە ناتەواوی و ستەم دەردەکەون لە شتاندا، تاکو هیچ ناتەواوی و کەموکووڕی‌یەك ڕوو نەکاتە ئەو عیززەتەی کە بۆ پەروەردگارێتیی خۆی بڕیاری داوە.

ئێستاش داوات لێ دەکەین کە ژیریی خۆت بکەیت بە سەرپشك و وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە:

کام لەم دوانە تێگەیشتنیان بە لای زەینەوە ئاسانترە و لە ژیری‌یەوە نزیکترە؟:

ئایا سه‌عاتچی‌یه‌ك بۆ خۆی ئامێر و كه‌ره‌سه‌كانی سه‌عات دروست بكات و، به‌ گوێره‌ی ڕێكخستن و ڕێسا و پێكه‌وه‌ گونجانیان سازیان بدات و بیانخاته‌كار.. یان له‌و ئامێرانه‌دا مه‌كینه‌یه‌كی نائاسایی دابنێت و ئه‌م دروستكردنه‌ به‌ ده‌سته‌ ڕه‌ق و ته‌ق و بێ گیانه‌كانی مه‌كینه‌كه‌ی ناو ئه‌و ئامێرانه‌ بسپێرێت؟

پێم بڵێ: ئایا ئه‌م بیروڕایه‌ شتێكی نه‌گونجاوی مه‌حاڵ و گوفتارێكی پڕوپووچ و به‌ده‌ر له‌ بازنه‌ی ژیری نی‌یه‌؟

یان كام له‌م دوانه‌ ده‌چێته‌ عه‌قڵه‌وه‌؟:

نووسه‌رێك پێداویستی‌یه‌كانی نووسین (له‌ مه‌ره‌كه‌ب و كاغه‌ز و قه‌ڵه‌م) ئاماده‌ بكات و خۆی بۆ خۆی كتێبێك بنووسێت.. یان ئه‌و نووسه‌ره‌ له‌ناو كاغه‌ز و قه‌ڵه‌م و مه‌ره‌كه‌به‌كه‌دا چاپخانه‌یه‌كی تایبه‌تی بۆ ئه‌و كتێبه‌ دروست بكات - كه‌ دیاره‌ ئه‌م چاپخانه‌یه‌ش گه‌لێ له‌ كتێبه‌كه‌ ئاڵۆزتره‌ - پاشان نووسینی كتێبه‌كه‌ بدات به‌سه‌ر چاپخانه‌كه‌دا و خۆی هیچ ده‌ستێك نه‌خاته‌ ناو كاره‌كه‌ و به‌ چاپخانه‌كه‌ بڵێت: "فه‌رموو تۆ كتێبه‌كه‌ دابنێ و بینووسه‌"!

كام له‌م دوانه‌ ده‌چێته‌ عه‌قڵه‌وه‌؟

ئایا سپاردنی دانانی كتێبه‌كه‌ به‌و چاپخانه‌یه‌ سه‌رتاپا گیروگرفت و كارێكی ته‌واو دژوار ده‌رناچێت؟ ئایا سه‌د هێنده‌ی نووسینی نووسه‌ره‌كه‌ كێشه‌ی زیاتری نایه‌ته‌ ڕێ؟ ئایا هیچ مرۆڤێكی ژیر و هۆشمه‌ند و خاوه‌ن هه‌ست و شعووری ته‌واو ئه‌م كاره‌ په‌سه‌ند ده‌كات؟ یان به‌ ڕه‌وای ده‌زانێت؟

خۆ ئه‌گه‌ر بڵێیت:

به‌ڵێ ڕاسته‌، دروستكردنی چاپخانه‌كه‌ بۆ چاپكردنی ئه‌و كتێبه‌ له‌ دانانی كتێبه‌كه‌ قورستر و ئاڵۆزتره‌، به‌ڵام مه‌كینه‌ی چاپ گه‌لێ ئاسانتر نووسینی كتێبه‌كه‌ ده‌خاته‌ ئه‌ستۆی و ڕایده‌په‌ڕێنێت، چونكه‌ ده‌توانێت چه‌نده‌ها نوسخه‌ی زۆر و زه‌به‌نده‌ی لێ ده‌ربكات..

ئه‌وا له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین:

خواوه‌ندی وێنه‌ به‌خش و نیگاركێشی ئه‌زه‌لی، به‌ توانستی ڕه‌های خۆی و بۆ مه‌به‌ستی نوێ كردنه‌وه‌ی دره‌وشانه‌وه‌ی ناوه‌ جوانه‌ ڕه‌هاكانی خۆی له‌ هه‌موو كاتێكدا و پیشاندانیان به‌ چه‌ند شێوه‌یه‌كی جیاجیا و جۆراوجۆر، هه‌رده‌م خودی به‌دیهێنراوه‌كان و

سەرجەم ئەدگار و تایبەتکاریيەکانیشیان بە چەند شکڵ و شێوەیەکی جیاجیا دروست دەکات، بە چەشنێك کە هیچ بەدیهێنراوێك - کە نووسراوێکی خواوەندی صەمەد و پەروەردگارە - بە تەواوی لە هیچ بەدیهێنراوێکی تر ناچێت.

بەڵێ، بۆ ئەوەی هەموو بەدیهاتوویەك گشت واتا و ناوەرۆکە جیاجیاکان و سەرجەم ئامانج و مەبەستە جۆراوجۆرەکانی خۆی ڕابگەیەنێت، دەبێ ڕوخسار و شکڵێکی ئەوتۆی ببێت کە لەوانی تر جیای بکاتەوە.

بە وردی سەیری سەروسیمای مرۆڤ بکە؛ دەبینیت چەند نیشانەیەکی جوداکەرەوە لەو دەموچاوەدا کۆبوونەتەوە کە خاوەنەکەی لە هەموو مرۆڤ و لە گشت دەموچاوێکی تر، هەر لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی خوای لەسەر بێت - تا ئێستا و تا دنیاش دنیایە، جیا دەکاتەوە، هەرچەندەش لە ئەندامەکانیان و لە مرۆڤێتی و ماهییەتیاندا هەموویان لە یەکتر دەچن. ئەمەش ڕاستییەکی هێندە ئاشکرایە کەس گومانی تێدا نییە.

کەواتە سەروسیمای تایبەت بە هەر دەموچاوێك، کتێبێکی سەربەخۆی ئەو دەموچاوەیە!

جا بۆ ئەوەی ئەم کتێبە تایبەت و سەربەخۆیە بە ڕێکوپێکی و وردەکاری دەربهێنرێت، دەبێ کۆمەڵە پیتێکی بە قەوارە و شێوە گونجاوی تایبەت بە خۆی ببێت و، ئنجا بە ڕێکخستنێکی تایبەتی و لە شوێنی دیاری کراوی خۆیاندا ڕێك بخرێن، تاکو بە نووسین و دانانێکی تایبەتی و جیاواز لەوانی تر بنووسرێت و دابنرێت. تەنانەت دەبێ ماددە تایبەتییەکانی خۆی بهێنرێن و لەو جێگا دەستنیشان کراوانەیدا نیشتەجێ بکرێن و، پاشان لەگەڵ کەرەسە و پێداویستییەکانی "بوون" و "دەرهێنان"ی ئەو کتێبە (ئەو دەموچاوە)دا ڕێك بخرێن. دیارە هەموو ئەمانەش پێویستیان بە کارگەیەکی سەربەخۆی تایبەتی هەیە.

واتە: هەموو شتێك و هەموو دەموچاوێك پێویستی بە چاپخانەیەکی تایبەتی هەیە!!

پاشان ئەگەر بێت و "گریمانی مەحاڵ"یش بکەین و وا دابنێین کە "سروشت" وەك چاپخانەیەك وابێت، ئایا ئەم چاپخانەیەش بۆ خۆی پێویستی بە ڕێکخستن و ڕیز کردنێکی تایبەتی و دیاری کراو نییە؟ ئایا خودی چاپخانەکە - چ جای ڕیز کردنی پیتەکانی - پێویستی بە ڕێکخستن نابێت؟!

خۆ ئەوماددانەی کە لە جەستەی هەر زیندەوەرێکدا هەن، بە بێ هیچ گومانێك، لە ماددەکانی چاپخانە و ڕیز کردن و ڕێکخستنیان گەلێ ئاڵۆزترن. چونکە کۆکردنەوە و دەرهێنانیان لە هەموو سووچ و گۆشە و قوژبنێکی جیهانەوە و، بەدیهێنانیان بە حساب و تەرازوویەکی وردی تایبەتی و، ڕێکخستنیان بەپێی داخوازی و ڕێسایەکی دیاریکراو، پاشان سپاردنیان بە چاپخانەکە.. گشت ئەم کارانە، پێش هەموو شتێك پێویستیان بە بەدیهێنەری چاپخانەکە دەبێت کە ئەنجامیان بدات و، هەرگیز هیچیان بە بێ ویستی ئەو نایەنەدی، کە ئەویش بریتییە لە "ویست" و "توانست"ی بەدیهێنەرانەی خواوەندی بەدیهێنەری بەتوانا.

کەواتە گریمانی ئەوەی کە "سروشت" وەك چاپخانەیەك وابێت، شیمانەیەکی پڕوپووچە و، لە ڕاستیدا گەوجایەتی و ئەفسانەیەکی ئاشکرا و ڕوونە!

بەم چەشنە و، لە ڕوانگەی ئەم دوو نموونەیەی "سەعات و کتێبەکە"وە، بۆمان دەردەکەوێت کە: چ (هۆکارەکان) و چ (بەهۆکراوەکان) هەموویان خواوەندی "بەدیهێنەری شکۆمەند" - کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە - بەدیی هێناون و، هەر تەنها ئەو خواوەندەشە کە بە "دانایی" خۆی پەیوەستی یەکتریی کردوون و، هەر تەنها ئەویشە کە بە "ویست"ی خۆی سروشتی شتەکانیشی دەستنیشان کردووە و کردوونی بە چەند ئاوێنەیەك بۆ تیشکدانەوە و تیادەرکەوتنی یاسا و شەریعەتە گەردوونییە مەزنەکەی خۆی کە بریتییە لەو یاسا کارگێڕانەی خواوەند کە تایبەتن بە ڕێکخستنی کاروبارەکانی گەردوونەوە. هەر ئەو خواوەندەشە کە بە "ویست"ی خۆی "ڕوخسار و سەروسیما"ی "سروشت"ی بەدی هێناوە کە بوونی دەرەکیی ئەم جیهانە بەرچاو و بینراوەی لەسەر بەندە و، گشت بەدیهێنراوەکانیشی لەسەر ئەو سروشتە داناوە و بە کەماڵی "دانایی" خۆی تێکەڵی یەکتریی کردوون.

* * *

ئێستاش ژیریی سەرگەردانی خۆت لەم کێشەیەدا دەکەین بە سەرپشك. با بە چاوی ویژدان بڕوانێت. تاکو بزانین کامیان وەردەگرێت و بە ئاسانی باوەڕی پێ دەکات؟

ئایا باوەڕ بەم ڕاستییە پەسەندکراوەی "ژیری" دەکات کە لە چەندین بەڵگەی بەهێزی لە ژمارەبەدەرەوە پەیدا بووە و، دڵنیایی بە مرۆڤ دەبەخشێت و تا ڕادەی "وجووب" بە پێویستی دەزانێت..

یـان لـەو باوەڕەدایــە کـە "بــوون"ی هــەر شــتێك هــاودەم لەگــەڵ ئــامێر و ئەندامــە لەژمارەبەدەرە پێویستەکانی و چەند کردارێکی ئەوتۆش کە ڕوخسار و شـەقڵی دانـایی و بەسیرەتیان پێوە دیـارە، هـەموو ئەمانـە بدرێنـە پـاڵ "سروشـت" تـاکو ئـەنجامیان بـدات؟! یاخود بدرێنە پاڵ ئەو مادده ڕەق و تەقە بێ گیان و بێ هەسـت و بەدیـهێنراوە سـاکارانەی کە ناوی "سروشت" و "هۆکارەکان"یان لـێ دەنێن؟!

ئایـا ئـەم بۆچوونـە، گەوجایـەتی و خورافـەتێکی تـەواو مـەحاڵ و بەتاڵ و، بــەدەر لــە بازنەی گریمانی عەقڵی نی‌یە؟!

بابای سروشت پەرستی سەرسەخت، لە وەڵامدا دەڵێت:

– (مادەم داوای بەکارهێنانی ویژدانت لـێ کردم، ئەوا دان بەوەدا دەنێم کە ئەو ڕێگـا سەر لـێ شێوێنەی تـا ئێستا گرتبوومانەبەر، هـەروەك دەیـان مـەحاڵی تێدایـە، تایبشـڵێی زیانبەخشـە و لەوپـەڕی ناشیرینی و بێ کەڵکیشــدایە. هەرکەسـێك خـاوەنی تۆزقـاڵێك هەست و فام و ژیری بێت، لەو لێکۆڵینـەوە زانستی‌یانەی ئێوە باستان کـردن، کـە هـەر هـەموویان پاڵیـان بـە چـەندین بەڵگـەی توندوتۆڵـی چەسـپێنەرەوە داوە، تێ‌دەگـات کـە گێڕانـەوەی دروستکردن و بەدیـهێنانی شتان بـۆ "سروشــت" و "هۆکارەکـان" بـە لای ژیری‌یەوە بە یەکجارەکی مەحاڵ و نەگونجاوە، تەنانەت ژیریی ساغی مرۆڤ بـە پێویستی دەزانێت کە بەدیهێنانی هـەرچی شـت هەیـە ڕاستەوخۆ بدرێتـە پـاڵ خـواوەنـدی "واجـب الوجود". کەواتە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێی ئیمانی پاك و بێ گـەردی پیشـان دام و، بەم ئیمانە شاد و بەختەوەری کردم!

بەڵام تەنها یەك گومانم لە دڵدا ماوە، کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

من باوەڕم هەیە کە خوای گەورە پەروەردگار و بەدیهێنەری هەموو شتێکە. بەڵام ئایـا چ زیانێك لە مەزنی و دەستەڵاتداریی ئـەو خواوەنـدە دەکـەوێت ئەگـەر مـەدح و ستایش ئاراستەی چەند هۆکارێکی هەندەکی بکرێت لەسەر بەدیهێنانیان بـۆ چـەند شتێکی کەم نرخ؟ ئایا ئەم کارە هیچ شتێك لە دەستەڵاتی بەتواناى خوای گەورە کەم دەکاتەوە؟

**وەڵام:**

هەروەك لە هەندێ پەیامدا چەسپاندوومانە:

سیفەتی (فەرمانڕەوایەتی) بە چەشنێکە هەرگیز ڕێ بە هیچ کەس و هیچ شتێك نادات دەست بخاتە ناو کاروبارەکانیەوە و خـۆی تێـدا هـەڵبقورتێنێت. کـە ئەمـەش پێـی دەڵێـن: یاسای "رد المداخلة". واتە: "بوارنەدانی دەست تێوەردان".

ئەوەتا لەناو مرۆڤیشدا بچووکترین کاربەدەست، یان هەر کارمەند و فەرمانبەرێکی ئاسایی، لە چوارچێوە و سنووری فەرمانبەرێتی و فەرمانڕەوایەتیی خۆیدا، دەرفەت بە کوڕ و جگەرگۆشەی خۆیشی نادات دەست بخاتە ناو کاروبارەکانیەوە. تەنانەت هەندێ لەو پادشایانەی کە بە وەهم و گومان پێیان وابووە کوڕەکانیان دەست دەخەنە ناو کاروباریان، یەکسەر ئەو جگەرگۆشە بێ تاوانانەی خۆیان کوشتووە، هەرچەندەش ئەو پادشایانە تا ڕادەیەك خاوەن تەقوا و پەرستش و فەرمانڕەوای موسڵمانانیش بوون!

ئەمەش ڕادەی ڕەسەنایەتیی یاسای "رد المداخلة"مان لە بواری فەرمانڕەوایەتیدا بۆ ڕوون دەکاتەوە. کە یاسایەکە هەر لە دوو کەسەوە، کە لەسەر بەڕێوەبردنی ناوچەیەکی بچووکەوە دەبێتە هەرایان، تا دەگاتە دوو پادشا کە قڕەیان لەسەر فەرمانڕەوایەتیی وڵاتێك بێت و هەریەکەیان بیەوێت خۆی تاکە فەرمانڕەوای وڵات بێت، دەگرێتەوە.

هەروەها یاسای: (ڕێ نەدان بە هاوبەش) کە یاسایەکی ترە و "یەکتابوون لە دەسەڵات"دا داخوازیەتی، ئەم یاسایەش لە درێژایی مێژووی مرۆڤدا، بە کوشتن و بڕین و ناکۆکی و خوێن ڕشتن، هێز و دەستەڵاتی خۆی سەپاندووە و سەقامگیری کردووە.

ئنجا تۆش دوای ئەوەی کە ئەم یاسایانەت زانی، وەرە سەرنجی ئەم مرۆڤە بدەکە لە ڕاستیدا بەڕێوەبردنی خۆیشی لە توانادا نییە و، پێویستی بە یارمەتیی خەڵکی هەیە و، تەنها سێبەرێکی لاوازی فەرمانڕەوایی و کاربەدەستی نەبێ هیچی تر شك نابات، کەچی تا ئەو ڕادەیە دەرفەت بە کەس نادات دەست بخاتە ناو کاروبارەکانیەوە و بەشداریی فەرمانڕەوایەتیی بکات و، هەتا دەتوانێت هەوڵی سەربەخۆیی خۆی دەدات..

بەڵێ، سەرنجی ئەمە بدە و، ئنجا بیر لە "فەرمانڕەوای موتڵەق" بکەرەوە کە خوای فەرمانڕەوای شکۆمەندە و لەسەر عەرشی پەروەردگارێتیی گەردووندا فەرمانڕەوایە و هەر خۆی خاوەنی دەستەڵات و فەرمانە و، هەر تەنها ئەو سەربەخۆی تاك و تەنیایە و، دەستەڵاتێکی ڕەهای وایشی هەیە کە هەرگیز پێویستی بە هیچ شتێك نییە..

وەرە بیرێك لەمە بکەرەوە و ئنجا بزانە کە دەبێ سەبارەت بەم پەروەردگار و خواوەندە شکۆمەندەوە چەندە ڕاستییەکی حەتمی بێت کە هەرگیز ڕێ بە "هاوبەش" نەدات و، نەیەڵێت هیچ کەسێك دەست بخاتە ناو کاروبارەکانی و لە فەرمانڕەوایەتییە ڕەواکەیدا بەشداریی بکات! ئایا ئەم هاوبەش نەبوونە چەندە خواستێکی ڕەوا و حەتمیی ئەو پەروەردگارێتییەی ئەوە؟!

فـەرمووبـۆ خـۆت ئـەم دوو فەرمانڕەوایەتی‌یـە لەگـەڵ یـەکدا بـەراورد بکـە: فەرمانڕەوایەتیی مرۆڤ کە لاواز و کەم و کورت و موحتاجی یارمەتیی غـەیری خۆیـەتی، لەگەڵ فەرمانڕەوایەتیی ڕەها و دەوڵەمەند و دەستەڵاتدار و زاڵ و هەمەلایـەنگری خـوای گەورەی بەتوانادا!

سەبارەت بە کەرتی دووهەمی گومانەکەشتەوە کە دەڵێت: ئەگەر هـەندێ شـتی بچووك و هـەندەکی بڕێـك پەرستش بـۆ هۆکارەکـان بکـەن، واتـە: ئەگـەر هـەندێ "پەرستش" ئاراستەی هەندێك لە "هۆکارەکان" بکرێن، چ زیان و کەموکووڕی‌یەك بەو پەرستشە زۆر و زەبەندانەی گشت بوونەوەران دەگەیەنێت، کە هـەر لـە گەردیلەکانـەوە تـا دەگاتە ئەستێرە و قەبارەکانی ئاسمـان و گـەلـەستێرەکان، لـە بەرامبـەر خـواوەندی گەورە و پەرستراوی ڕاستەقینەوە، ئەنجامیان دەدەن؟

**وەڵام:**

بەدیهێنەری زانای دانا ئەم گەردوونەی لە شێوەی درەختێکدا بەدی هێناوە و، خاوەن هەست و شعوورەکانیشی کردووە بە میوە و بەروبوومی ئەو درەختـەی گـەردوون. ئنجا لەبەر ئەوەی کـە مرۆڤ سـەرجەمترین بـەروبوومی نێـوان خـاوەن هەسـت و نەستەکانە، ئەوا ڕێزێکی گەلـێ زۆری لـێ ناوە و، شـوکرانە و پەرستشـی ئـەم مرۆڤەشـی کـردووە بـە گرنگترین و بـەرزترین میـوە و بـەروبوومێك کـە ژیـانی مـرۆڤ دەیگرێـت و بەرهـەمی دەهێنێـت. تـەنانـەت ئەم دوانە (واتە شـوکـرانە و پەرسـتش) بەرهـەمـی ژیـانی مـرۆڤ و ئەنجام و ئامانجی بەدیهاتنی ئەون.

جا ئایا بـەلای ژیریـی مرۆڤـەوە دەگونجێ کـە ئـەم خواوەنـدە "فـەرمانڕەوا" و "تـاك" و "تەنیا"یە کاروباری ئەو مرۆڤەی کە کردوویەتی بـە بـەروبوومی سـەرجەمی بوونـەوەران، بداتە دەستی غەیری خۆی، بۆ نموونە بیداتە دەستی هۆکارەکـان؟ یـان بـەروبوومی ژیـانی مرۆڤ (کە شوکرانە و پەرستشە) بە کەسانی تری جگە لە خۆی بسپێرێت؟ دوای ئەوەی کە سەرانسەری گەردوونی بۆ ئەوە بەدی هێناوە کە خوایـەتیی خـۆی بـەوان بناسـێنێت و پەروەردگاریتی خۆی لە بەرچاوی ئەواندا خۆشەویست و شیرین بکـات؟ ئایـا دەگونجـێ ئاکامی بەدیهێنان و بەروبوومی بوونەوەران واز لـێ بهێنێت و بە دەستی "بێ‌مەبەستی"یان بسپێرێت؟ نەخێر، وا نی‌یە و، خواوەند گەلـێ خاوێن و باڵایە و هـەرگیز بـە هاوبەشـایەتی ڕازی نابێت.

پاشان، ئایا دەگونجێ خواوەند ڕەفتاری پێچەوانەی دانست و پەروەردگارێتیی ڕەهای خۆی لێ بووەشێتەوە و، بوار بدات کە هەندێ "هۆکار" ببن بە پەرستراوی بەدیهاتووانی؟ لە کاتێکدا کە ئەم خواوەندە گەورەیە لە ڕێگای کردارەکانی و بەخششە نەرم و نیانەکانیەوە خۆیمان پێ دەناسێنێت و لە لامان خۆشەویستی دەکات؟

ئایا چۆن ئەو خواوەندە مەزنە - دوای هەموو ئەمانە - بوار بە دروستکراوەکانی خۆی دەدات کە خوای خۆیان لە یاد بکەن، دوای ئەوەی کە ئامانجە بەرزەکانی بەدیهێنانی گەردوونی پیشان دان کە بریتییە لە: پێناسینی خوا و، پاشان پەرستنی؟ بەوەی کە دەرفەت بە غەیری خۆی بدات تا لە لای کامڵترین و بەرزترین بەدیهێنراوانی ئەم خوایە خۆیان خۆشەویست بکەن؟ نەخێر، هەرگیز شتی وا ڕوو نادات!

* * *

ئێستاش ئەی ئەو برادەرەی کە ڕوونکردنەوەکانی پێشووت بیست! هەرچی دەڵێیت، فەرموو بیڵێ و باسی بکە.

ئەو برادەرەش لە وەڵامدا دەڵێت:

- سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە گیروگرفتەکانی ئەم دوو گومانەی وا بە ئاسانی بۆ چارەسەر کردم و، بە تەواوی دڵنیا بووم لەوەی کە جگە لە زاتی خوای گەورە هیچ شت و کەسێکی تر شایانی تاك و تەنیایی و پەرستش نییە. بە ڕاستی دوو بەڵگەی هێندە بەهێزت لەسەر ئەم ڕاستییە بۆ هێنامەوە کە هەرگیز ئینکاری ناکرێن، مەگەر لە لایەن کەسێکەوە کە ئەوەندە سەرسەخت بێت نکوولی لە ڕۆژی ڕۆشنا و خۆری ناوجەرگەی ئاسمان بکات!

## کۆتایی

ئەو مرۆڤەی کە وازی لە بیروباوەڕ و بۆچوونی مولحیدانەی "سروشت" هێنا و، بە بیرێکی نوێوە هاتە ناو بازنەی ڕێڕەوی ئیمانەوە، دەڵێت:

سوپاس بۆ خوا کە هیچ کام لە گومانەکانم لە دڵدا نەمان. بەڵام چەند پرسیارێکم هەن سەرم تیایاندا سووڕماوە و سەرنجم ڕادەکێشن:

○ **پرسیاری یەکەم:**

زۆربەی ئەو کەسانەی سەبارەت بە ئەنجامدانی پەرستشەکانیانەوە تەمبەڵ و کەمتەرخەمن و، بە تایبەتی وازیان لە نوێژ کردن هێناوە، لێیان دەبیستین کە دەڵێن:

خواوەندی پەروەردگاری دەوڵەمەندی بەدەستەڵات چ پێویستی‌یەکی بە پەرستشی ئێمە هەیە؟ ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا بەوپەڕی توندوتیژی هەڕەشەمان لێ دەکات و بە سزای پڕ لە ئێش و ئازاری وەك دۆزەخ دەمان ترسێنێت. ئایا ئەو شێوازە ڕێك و ڕەوان و لەسەرخۆ و ئیعجازبەخشەی کە لە شوێنەکانی تری قورئاندا بەرچاو دەکەوێت، چۆن لەگەڵ ئەم شێوازەدا یەك دەگرێتەوە کە سەرتاپا هەڕەشەی توندوتیژە لە بەرامبەر تاوانێکی بچووك و هەندەکی و کەم‌نرخەوە؟

**وەڵام:**

ڕاستە هەرگیز خوای گەورە، کە هەر لە زاتی خۆی‌دا دەوڵەمەند و بەدەستەڵاتە، نەك هەر تەنها پێویستی بە پەرستشی تۆی مرۆڤ نی‌یە، تەنانەت پێویستی بە هیچ شتێك نی‌یە. بەڵکو هەر تەنها تۆی مرۆڤی هەژاریت کە پێویستت بە پەرستنی ئەوە! چونکە تۆ دووچاری نەخۆشی‌یەکی مەعنەوی بوویت و، پەرستشی ئەو خواوەندەش مەڵهەمێکی سارێژکاری نەخۆشی‌یەکانی "گیان" و ئازارەکانی "زات"ی مرۆڤانەی تۆیە.

ئەمەشمان لە گەلێ پەیامدا چەسپاندووە و، بەم شێوەیەی خوارەوە نموونەمان لەسەر هێناوەتەوە:

ئەگەر پزیشکێکی میهرەبان بە دڵسۆزی و جەختەوە داوای خواردنی دەرمانێکی تایبەتی لە نەخۆشێکی خۆی بکات و، پێی بڵێت: ئەم دەرمانە شیفابەخشە بخۆ کە تایبەتە بە نەخۆشی‌یەکەتەوە، کەچی نەخۆشەکە لە وەڵامدا پێی بڵێت: تۆ چ پێویستی‌یەکت بەم دەرمانەیە وا بە گەرمی داوای خواردنی دەرمانی وام لێ دەکەیت؟ تۆ کارت بەسەرمەوە چی‌یە؟

ئایا لەم وەڵامەوە مەودای گەوجی و ڕادەی بێ‌نرخیی قسەی بابای نەخۆشت بۆ دەرناکەوێ؟

سەبارەت بە قورئانی پیرۆزیشەوە کە بە سزای ئازاربەخش هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە وازیان لە پەرستش هێناوە، ئەوا بە نموونەیەك ڕوونی دەکەینەوە:

ئەگەر کەسێك تاوانێکی وای ئەنجام دابێت کە مافی خەڵکیی تێدا پێشێل کردبێت، ئەوا پادشای وڵات لە پێناوی پاراستنی ژیان و مافی هاووڵاتیانی و ئەوانەی لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایەتیی خۆیدان، تۆڵەی توندوتیژ لەو کەسە دەسێنێتەوە..

جا هەروەك ئەو پادشایە ئەم هەڕەشەیە دەکات و ئەو تۆڵەیە دەسێنێتەوە، خواوەندی گەورەش کە پادشای ئەزەل و ئەبەدە، بە هەمان جۆر سزای توندوتیژی ئەوانە دەدات کە وازیان لە نوێژ و پەرستش هێناوە، لەبەر ئەوەی بەم وازهێنانەیان دەستدرێژی و ستەم لە بوونەوەران دەکەن و مافیان پێشێل دەکەن.

چونکە کەماڵاتی ئەو بوونەوەرانەی لە ژێر حوکمداری و فەرمانڕەوایەتیی ئەو خوایەدان، لە شێوەی تەسبیحات و پەرستشدا دەردەکەوێت، کە بەو دیوەیان ڕووی لە خوای بەدیهێنەر و دانایە، ئەو تەسبیحات و پەرستشانە ئەنجام دەدەن..

خۆ ئەو کەسەش کە وازی لە پەرستشی خوا هێناوە، نە پەرستشی ئەو بوونەوەر و بەدیهێنراوانەی دیوە، نە دەشتوانێت بیانبینێت، تەنانەت ئینکاریشی دەکات. بۆیە لە نرخ و بەهای ئەم بوونەوەرانەی (کە لە ڕووی پەرستش و تەسبیحاتەوە) هەریەکەیان نووسراوێکی خوایی و ئاوێنەیەکی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی پەروەردگارن، کەم دەکاتەوە و بایەخیان ناداتێ و، لە پلەوپایەی بڵندی خۆیانەوە دایان دەگرێت و، جگە لە بێ مەبەستییەکی بەتاڵ لە واتا و ناوەرۆك هیچی تریان تێدا نابینێت و، کاڵای فەرمانبەری و کارمەندییان لەبەر دادەماڵێت و، بە وشك و ڕەق و تەق و بێ بایەخیان دادەنێت. دیارە بەم کارەش ئەو مرۆڤە دوور لە پەرستشە، گاڵتە بە بوونەوەران و ئینکاریی کەماڵاتیان دەکات و دەستدرێژی دەکاتە سەر مافەکانیان و "ڕاستیی بوون"یان لە گەردووندا.

بەڵێ، هەر کەسێك دەڕوانێتە ئەم گەردوونە، بە دووربین و تەرازووی تایبەتیی خۆی و لە ڕوانگەی تیا دەرکەوتنی ئاوێنە تایبەتییەکەی خۆیەوە بۆی دەڕوانێت. چونکە خواوەندی بەدیهێنەر مرۆڤی لەسەر شێوەی تەرازوویەك بەدی هێناوە کە ئەم گەردوونەی پێ لێك بداتەوە، تاکو مرۆڤ بە هۆی ئەو تەرازووەی کە لە خۆیدا هەستی پێ دەکات بتوانێت هەموو کاروبارێکی ناو گەردوون هەڵبسەنگێنێت..

ئەوەتا خواوەندی گەورە جیهانێکی تایبەتیی بە هەموو مرۆڤێك لە ناوەندی ئەم جیهانە گەورە و گشتییەدا بەخشیوە. جیهانی تایبەتیی هەر کەسێکیش بە گوێرەی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕە تایبەتییەکەی دڵ و دەروونی خۆیەتی. دەبینین ئەو کەسەی

نائومێد و خەفەتبارە، بوونەوەرانیش لە بەرچاوی‌دا لە گریان و خەفەتباریدان، بەڵام مرۆڤی بەختەوەر و دڵخۆش و شادمان، بوونەوەرانی بە دڵخۆش و شادمان و خەندە لێو دێنە بەرچاو!

هەر بەم چەشنە، ئەو کەسەش کە بە تێفکرین و گەرموگوڕی و هەست و نەستی تەواوەتی و سەرنج و لێبڕانەوە پەرستشەکانی خۆی جێ‌بەجێ دەکات، شتێکی لە پەرستشە بێ‌گومان و ڕاست و چەسپاوەکەی گەردوون بۆ دەردەکەوێت. بەڵام ئەوەی وازی لە پەرستش هێناوە و لێی بێ ئاگایە، یاخود ئینکاریی دەکات، ئەوا وەهمێکی هەڵەی لە مێشکی خۆی‌دا بۆ بوونەوەران بڕیار داوە، کە بە تەواوەتی پێچەوانەی ڕاستیی کەماڵات و حەقیقەتی ئەو بوونەوەرانەیە. ئەمەش دەستدرێژی‌یەکی مەعنەوی‌یە بۆ سەر مافی ئەو بوونەوەرانە.

مرۆڤی نوێژنەکەر لەم ستەمانەش زیاتری لێ دەوەشێتەوە؛ ئەوەتا ستەم لە "زات"ی خۆیشی دەکات کاتێ کە واز لە نوێژکردن دەهێنێت، چونکە لە ڕاستی‌دا خۆی خاوەنی "زاتی خۆی" نی‌یە تا بە سەربەستی و ڕەفتاری سەربەخۆ لەگەڵ خۆی‌دا بجووڵێتەوە. بەڵکو بەندەیەکی خاوەندارە لە خزمەت خاوەنەکەی خۆی‌دا. خۆ دیارە ئەم بەندەیەش ئەرکی بەندایەتیی بەجێ نەهێناوە. لەبەر ئەوە، خاوەنەکەی هەڕەشەی توندوتیژی ئاراستە دەکات، تاکو مافی بەندەکەی خۆی لە "دەروونی بەدخواز"ی ئەو بەندەیە بسێنێتەوە!

وێڕای ئەمانەش، ئەو بەندەیە بە وازهێنانی‌لە پەرستش (کە ئاکام و پوختەی ئامانجی بەدیهێنانی بوونەوەرانە) لە سنوور دەرچوونی خۆی و دەستدرێژی کردنی بۆ سەر "دانست"ی خواوەند و "ویست"ی پەروەردگار، ڕادەگەیەنێت. کەواتە لەسەر هەموو ئەمانە، دەبێ ئەو بەندەیە سزای توندوتیژ بدرێت.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

ئەو کەسەی واز لە پەرستش دەهێنێت، هەروەك ستەم لە خۆی دەکات، لە کاتێکدا کە خۆی بەندەی خواوەندە، لە هەمان کاتیشدا دەستدرێژی دەکاتە سەر مافی کەماڵاتی بوونەوەران و ستەمیان لێ دەکات.

بەڵێ، هەروەك "کافرێتی" بریتی‌یە لە: بێ‌نرخ زانینی بوونەوەران و گاڵتە پێ‌کردنیان، "وازهێنانیش لە پەرستش" بریتی‌یە لە: ئینکاری کردنی کەماڵاتی بوونەوەران و دەستدرێژی‌یە بۆ سەر دانایی پەروەردگار. هەر لەبەر ئەوەشە کە شایستەی ئەوە دەبێت هەڕەشەی توندوتیژی لێ بکرێت و سزای بەئازاریش بدرێت.

لەمەوە دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز شێوازی هەڕەشە و گوڕەشەی بۆیە گرتووەتە بەر تاکو ئەم "شایستەیی"یە و ئەو "ڕاستی‌یە ناوبراوە" دەربېڕێت. کەواتە ئەم شێوازە ڕەوان و ئیعجازبەخشەی قورئان، لەگەڵ داخوازیی حاڵ و مەقامدا، کە ناوەرۆکی ڕاستەقینەی ڕەوانبێژی‌یە، تەواو یەکاویەك و گونجاوە.

○ **پرسیاری دووهەم:**

ئەم هاوڕێ‌یەمان کە وازی لە "سروشت" هێنا و بە تەواوی دەستی لێ داتەکاند و، ئێستا بە بەختەوەریی "ئیمان" شاد بووە، دەڵێت:

گوێڕایەڵیی هەموو بوونەوەرێکی ناو ئەم گەردوونە، لە گشت کاروبارەکانی و سەرجەمی ئەو ئیشانەی ئەنجامیان دەدات، بە شێوەیەکی ڕەها و تەواوەتی بۆ: "ویستی خوایی" و "توانستی پەروەردگاری" ڕاستی‌یەکی هێندە مەزن و گەورەیە کە لە زەینی کول و کورت بینی ئێمەدا جێی نابێتەوە. لەکاتێکدا کە بە چاوی خۆمان "زۆری"یەکی لەڕادەبەدەر لە بەدیهێنراوان و، "ئاسانی"یەکی ڕەها لە دروستبوونی شتاندا دەبینین. ئنجا لە ڕێی ئەو بەڵگە بەهێز و چەسپێنەرانەی ئێوەشەوە بۆمان ساغ بووەوە کە ئەم ئاسانی‌یەی لە بەدیهێناندا هەیە، هی ئەوەیە کە ئەو بوونەوەرانە تەنها "یەك بەدیهێنەر"یان هەیە، بۆیە وا ئەو ئاسانی‌یەیان لە دروستبووندا بۆ ڕەخساوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتی‌دا زۆر بە ڕاشکاوی ئەم ڕاستی‌یەی بڕیار داوە. وەك ئەم ئایەتانەی کە دەفەرموون:

﴿ما خَلْقُكُمْ ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨).

﴿وما أمْرُ السَّاعَةِ إلاّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أوْ هُوَ أقْرَب﴾ (النحل:٧٧).

هەموو ئەمانە، وا لەو ڕاستی‌یە دەکەن (واتە ڕاستیی ئاسانیی بەدیهێنان) کە ژیریی مرۆڤ پەسەندی بکات و وەری بگرێت. بەڵام ئایا چ "نهێنی" و "دانایی"یەك لەم ئاسانی‌یەدا هەیە؟!

**وەڵام:**

ئەم "نهێنی"یە لە وشەی دەهەمی "مەکتووبی بیستەم" بە تایبەتی لە پاشکۆکەی‌دا کە شەرحی "وهو علی كُلِّ شيء قدیـــــر" دەکات، زۆر بە ڕێکوپێکی و بێ گومانی و بە چەشنێکی دڵنیایی‌دەر ڕوون بووەتەوە و بە جوانی چەسپێنراوە کە:

هەرکات بەدیهێنانی سەرجەمی بوونەوەران بە توانستی بەدیهێنەری تاك و تەنیا بسپێررێت، ئەوا بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەکێکیان کارەکە ئاسان دەبێت. بەڵام

هەرکات بەدیهێنان نەدرێتە پاڵ بەدیهێنەری تاك و تەنیا و بدرێت بە چەند دەستێکی زۆر، ئەوا بەدیهێنانی تاکە یەك شت بە ئەندازەی بەدیهێنانی هەموو بوونەوەران بە لای ئەو دەستە زۆرانەوە گران و قورس دەبێت. واتە ئەو کاتە بەدیهێنانی "تۆو"ێك بە ئەندازەی بەدیهێنانی "درەخت"ێك قورس و دژوار دەبێت.

بەڵام لە کاتی گێڕانەوەی "دروستکردن"دا بۆ بەدیهێنەری ڕاستەقینەی تاك و تەنیا، کارەکە هێندە ئاسان دەبێت کە بەدیهێنانی هەموو "بوونەوەران" وەك بەدیهێنانی یەك درەخت و، "درەخت"یش وەك یەك دانە "تۆو" و، "بەهەشت"یش وەك وەرزی بەهار و، بەهاریش وەك تاقە "گوڵ"ێکی لێ دێت و بە لایەوە ئاسان دەبێت.

وا ئێستاش لە نێوان سەدان بەڵگەدا، کە لە پەیامەکانی تردا بە درێژی ڕوونمان کردوونەتەوە، ئاماژە بۆ یەك دوو دانە لەو بەڵگانە دەکەین کە "نهێنی"ی زۆریی بوونەوەرە لەژمارە بەدەرەکانی بەرچاومان و، زۆریی تاکەکانی ئەو جۆرانە و، دروست بوونیان بەوپەڕی ئاسانی و لەوپەڕی وردەکاری و ڕێکوپێکی‌دا، ڕوون دەکەنەوە:

بۆ نموونە:

بەڕێوەبردنی (سەد) سەرباز لە ژێر فەرمان و چاودێریی (یەك) ئەفسەردا، سەد ئەوەندەی ئەوە ئاسانە کە بەڕێوەبردنی (یەك) سەرباز بە (سەد) ئەفسەر بسپێررێت!!

هەروەها، هەرکات دابین‌کردنی پێداویستی‌یە سەربازی‌یەکانی سوپایەکی تەواو لە یەك کارگە و مەڵبەندا بێت و بە یەك یاسا و یەك فەرمان بەڕێوە بڕوات کە یەك سەرکردە دەری بکات، ئەم کارە لە ڕووی زۆری و چەندایەتی‌یەوە، بە ئەندازەی دابین‌کردنی پێداویستیی یەك دانە سەرباز ئاسان دەبێت. بەڵام دابین‌کردنی پێداویستیی یەك دانە سەرباز، لە چەند کارگە و مەڵبەندێکی جیاجیا و بە فەرمانی چەند سەرکردەیەك، هەر لە ڕوانگەی چەندایەتی‌یەوە، بە ئەندازەی دابین‌کردنی پێداویستیی سوپایەکی سەربەخۆ و تەواو، گران و قورس دەبێت، چونکە ئەو کاتە دابین‌کردنی پێداویستی‌یە سەربازی‌یەکانی یەك دانە سەرباز، بە ئەندازەی پێویستیی سەرجەمی سوپا، داخوازی کارگەی جۆراوجۆر دەبێت!

هەروەها بە چاو دەبینرێت:

هەزاران دانە میوە و بەروبووم کە تەنها یەك درەخت دەیانگرێت، تەنها لە یەك ڕەگ و یەك مەڵبەند و بەپێی یەك یاسا، ماددە پێویستەکانی خۆیان وەردەگرن. ئەمەش

ئەوەندە بە سووك و ئاسانی تەواو دەبێت، کە دەڵێی ئەو درەختە تەنها یەك دانە بەری گرتووە. ئەمەش بەهۆی "نهێنی"ی یەکبوون(الوحدة)ەوەیە.

بەڵام ئەگەر بێت و ئەم "یەکبوون"ە لاببرێت و زۆری(الکثرة) لە جێگەیدا دابنرێت، واتە ئەگەر هەموو یەکێك لەو میوە و بەروبوومانە ماددە پێویستەکانی خۆیان لە چەند مەڵبەندێکی جیاجیا وەربگرن، ئەوا بەدیهێنانی یەك دانە بەر بە ئەندازەی بەدیهێنانی درەختێك گران و پڕ لە گیروگرفت دەبێت. تەنانەت بەدیهێنانی "تۆو" - کە نموونە و پێرستی درەختێکە - بە ئەندازەی خودی درەختەکە قورس و گران دەبێت. چونکە ئەو ماددانەی کە بۆ ژیانی درەختەکە پێویستن، هەر هەمان ماددەشن کە بۆ ژیانی تۆوەکە پێویستە بن.

سەدان نموونەی تری هاوچەشنی ئەم نموونانە هەن، هەر هەمووشیان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە: پەیدابوون و دروستبوونی هەزاران بەدیهێنراو لە ڕێگای "یەکبوون"ەوە گەلێ ئاسانترە لەوەی کە تەنها یەك بەدیهێنراو لە ڕێگای "زۆری" و "بوونی هاوبەش"ەوە بێتە ناو جیهانی "بوون" و بەدی بهێنرێت.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستییەمان لە چەندین پەیامی تردا بە دڵنیاییەکی گومان لێ نەکراو چەسپاندووە، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو پەیامانە دەکەین. بەڵام لێرەدا تەنها یەك "نهێنی"ی گەورە باس دەکەین کە پەیوەندیی بەم ئاسانییەوە هەیە و، لە ڕوانگەی "زانست" و "قەدەر"ی خوا و "توانست"ی پەروەردگارەوە دەڕوانێتە مەسەلەکە:

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە تۆ وەك مرۆڤێك هەیت و، یەکێکیت لەو بوونەوەرانەی کە خاوەنی "بوون"ن..

جا ئەگەر خۆت تەسلیمی خواوەندی خاوەن "توانستی ڕەها" بکەیت، ئەوا لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا لە هیچ و "نەبوون"ەوە و بە فەرمانێکی ئەو خوایە و بە دەستی توانستی ئەو، دروست دەبیت و "بوون"ت پێ دەبەخشرێت. بەڵام ئەگەر خۆت تەسلیمی ئەو نەکەیت و بەدیهێنانی خۆت بە "هۆکارە ماددییەکان" بسپێریت و خۆت تەسلیمی سروشت بکەیت، ئەوا بۆ بەدیهێنانی تۆ (کە تەنها یەك دانە کەسیت) دەبێ هەموو ماددە پێویستەکانی دروستبوونت لە هەموو جیهان و گشت گەردووندا کۆ بکرێنەوە و، لە چەندین پاڵێوگەدا بپاڵێورێن و بە چەندین تاقیکردنەوەی جۆراوجۆردا تێپەڕ ببن و بە چەندین تەرازووی وردی سەرنەکەر و هەستیار بکێشرێن. چونکە تۆ

پوختەیەکی ڕێکوپێك و پێڕستێکی بچووك و بەروبوومێکی پێگەیشتووی سەرجەمی ئەم گەردوونەیت و، هەگبەیەکیت کە گشت ماددە سەرەکیەکانی گەردوونت تێدا جەم کراون.

بەڵێ، ئەم گەڕان و پشکنین و کۆکردنەوەیە - ئەو کاتە - شتێکی پێویست دەبێت، چونکە هۆکارە ماددیەکان جگە لە (کۆکردنەوە و پێکهێنان) هیچ شتێکی تریان لە توانادا نیە. ئەوەتا لای هەموو ژیران و خاوەن هەستان چەسپاوە کە هۆکارە ماددیەکان ناتوانن هیچ ماددەیەك لە "نەبوون"ەوە دروست بکەن و "بوون"ی پێ ببەخشن. جا لەبەر ئەوەی هۆکارە ماددیەکان ناتوانن لە "نەبوون"ەوە هیچ شتێك بەدی بهێنن، ئەوا بۆ دروستکردنی جەستەی هەر زیندەوەرێك (گەر وا دابنرێت جەستەی زیندەوەر هۆکارە ماددیەکان دروستی بکەن) دەبێ گشت ماددە پێویستەکانی دروستبوونی لە هەموو گۆشە و جێگایەکی جیهاندا کۆ بکرێنەوە!

بۆ خۆت لەم نموونەیەوە ڕادەی ئەو ئاسانیەیە بزانە کە لە ڕێی "یەکبوون" و "یەکتایی"دا هەیە و، لە ئەندازەی گرانی و گیروگرفتەکانی بەدیهێنانیش تێبگە کە لە ڕێگای "بوونی هاوبەش"و "گومڕایی"دا دێنە کایەوە.

*دووهەمیان:*

لە ڕوانگەی "زانستی خوایی"شەوە ئاسانیەکی ڕەها لە بەدیهێناندا هەیە. ئەویش بە درێژی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

"قەدەری خوا" جۆرێکە لە "زانستی خوا". جا ئەم قەدەرە، ئەندازەی هەموو شتێك لەو زانیاریەدا دیاری دەکات. وەك بڵێی قاڵبێکی مەعنەوی و تایبەتیی ئەو شتە بێت. کەواتە ئەو ئەندازەیەی کە لە قەدەری خوادایە، وەك نموونە و نەخشەی ئەو شتە وایە کە لە "زانست"ی خوادا دیاری کراوە و لە پاشاندا بەدی دەهێنرێت. جا هەرکات "توانست"ی خوای گەورە ئەو شتە بەدی دەهێنێت ئەوا بەوپەڕی ئاسانی لەسەر ئەو ئەندازە و نەخشەیە بەدیی دەهێنێت کە زووتر "قەدەری خوا" نەخشەکەی بۆ کێشابوو.

جا ئەگەر بەدیهێنانی ئەو شتە لە نەبوونەوە، نەدرێتە پاڵ ئەو خوایەی کە خاوەنی زانستێکی ڕەها و ئەزەلی و گەورەیە و، بەتوانا و شکۆمەندە، ئەوا نەك هەر تەنها هەزاران گیروگرفت پەیدا دەبن، بەڵکو سەدان مەحاڵیش دێنە پێش! چونکە ئەگەر چەشنی حاڵەتی یەکەم ئەو ئەندازەیەی کە لە "قەدەر" و "زانست"ی خوای گەورەدا دیاری

کراوە لە کایەدا نەبێت، ئەوا دەبێ هەزاران قاڵبی ماددی و خاوەن "بوونـی دەرەکی" لـە جەستەی بچووکی ئەو زیندەوەرەدا بەکار بهێنرێن!

دەسا تۆیش لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەوە بۆ خۆت لەو ئاسـانیـیە ڕەهایە تێبگـە کـە لـە بەدیهێنان و دروستکردندا هەیە کاتێ ڕێی "یـەکتایی" لـەم مەسـەلەیەدا ڕەچـاو دەکرێـت. هەروەها پەی بەو گیروگرفتانەش ببە کە لە ڕێگای هاوبەش بڕیاردان و گومڕایـیدا هـەن. پاشان ئەو حەقیقەتە ڕاست و بەرز و بڵندەش بزانە کە ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە دەری دەبڕێـت و ڕایدەگەیەنێت کە دەفەرموێ:

﴿وما أمْرُ السَّاعَةِ إلاّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ أوْ هُوَ أقْرَب﴾ (النحل:٧٧).

❍ **پرسیاری سێهەم:**

ئەم مرۆڤەی کە لە پێشدا دوژمنایەتیی لەگەڵ ئیمـاندا دەکـرد و ئێـستا پێـی بەهرەمـەند بووە، دەڵێت:

بۆچی فەیلەسووفە توندڕەوەکانی سەردەم دەڵێن: (هیچ شـتێك لـە "بـوون"ەوە بـەرەو "نەبوون" ناڕوات و لەناو ناچێت و، لە "نەبوون"یشەوە هیچ شـتێك دروسـت نـاکرێت). کە ئەمەش بە دەستەواژەی "المادةُ لا تُفني ولا تُستحدث" دەردەبڕن؟ هـەروەها پێیـان وایـە کە ئەو شتەی گەردوون بەڕێوە دەبات تەنها بریتییە لە پێکهێنان و شیتەڵکردنی ماددە؟!

**وەڵام:**

ئـەو فەیلەسووفانەی کـە لـە ڕوانگـەی نـووری قورئـانی پـیرۆزەوە نـەیان ڕوانیوەتـە گەردوون و، لە کلاوڕۆژنەی "سروشت" و "هۆکارەکان"ەوە سـەیریان کـردووە، بۆیـان دەرکـەوتووە کـە: هاتنـەدی و یـەکگرتنی ئـەم بوونەوەرانـە لـە ڕێـی "سروشـت" و "هۆکارەکـان"ەوە گریمـانێکی بـە تـەواوەتی بەتاڵـە و هێنـدە گـیروگرفتی تێدایـە کـە بەدیهاتنیان لەو ڕێگایەوە دەکات بە کارێکی ئەستەم و مـەحاڵ، وەك ئـەوەی کـە ئێمـە لـە گریمان و مەحاڵەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە. لەبەر ئەوە، ئەم فەیلەسووفانە سەبارەت بەم گیروگرفتەوە بوون بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکـەمیان: بـوون بـە "سۆفستائی" و بـە تـەواوی دەسـتیان لـە ژیریـی خۆیـان داشۆرد، ئەو ژیرییە هەستیارەی کە مرۆڤی لە ئاژەڵ پێ جیا کراوەتەوە. ئەم بەشەیان کە ئـەم ڕێگـەیان گرتەبـەر، کەوتنـە نـاوەندی پلەیـەکی زۆر نزمـتر لـە هـی ئـاژەڵان. چونکـە سەیریان کرد ئینکاری کردنـی بوونـی بونـەوەران و بوونـی خۆیشیان، بـەلای ژیرییـەوە

گەلێ ئاسانترە لەوەی کاروباری بەدیهێنان بەدەست "سروشت" و "هۆکارەکان"ەوە بێت! بەم چەشنە، ئەم بەشەیان لەسەر لووتکەی کەماڵی ژیری‌یەوە بەرەو کەندەڵان و لیتاوی نەفامیی ڕەها پێیان هەڵخلیسکا و شۆڕ بوونەوە.

بەشی دووهەمیشیان: سەرنجیان داوە کە ئەگەر "سروشت" و "هۆکارەکان" بەدیهێنەری بوونەوەران بن، وەك گومڕایان لەو باوەڕەدان، ئەوا بەدیهێنانی شتێکی تەواو بچووکی تەنانەت وەك "مێشوولە" یان "تۆو" چەندەها گیروگرفتی لەژمارەبەدەری دێتە ڕێ و پێویستی بە توانستێکی هێندە مەزن دەبێت کە ژیریی مرۆڤ پەیی پێ نەبات. لەبەر ئەوە، خۆیان بە ناچار زانیوە کە ئینکاریی خودی بەدیهێنان بکەن و بڵێن: (هیچ شتێك لە نەبوونەوە بەدی‌ناهێنرێت)! پاشان سەرنجیان داوە کە: لەناوبردن و نەهێشتنی هەر شتێکیش کارێکی مەحاڵە، ئیتر بۆ خۆیان بڕیاریان داوە کە: (هیچ شتێکی خاوەن "بوون" لە بوونەوەردا لەناوناچێت) و، بە خەیاڵی خۆیان "بوون"ی بوونەوەرانیان بە چەند باروودۆخێکی ئیعتیباری(گوێرەیی)ی وەك "شیتەڵکردن و پێکهاتن" لێکداوەتەوە، کە لە ئەنجامی بزووتنی گەردیلەکانی بوونەوەر و تەوژم و شەپۆلەکانی "ڕێکەوت"ەوە پەیدا دەبن!

دەسا فەرموو سەرنجێکی ئەوانە بدە کە خۆیان لە پێشەنگی عاقڵ و تێگەیشتووان و لوتکەی کەماڵی "ژیری"دا داناوە، با بزانیت کە لە کام شیو و دۆڵی گەوجی و نەزانی‌دا دەخولێنەوە!

لەمەشەوە بۆ خۆت بزانە کە چۆن ڕێبازەکانی "گومڕایی" ئەم مرۆڤە ڕێز لێگیراوە دەخەنە هەڵوێستێکەوە کە مایەی گاڵتەجاڕی و سووکایەتی بێت، کاتێ ڕۆڵی ئیمانەکەی لەکار دەخات!

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە لێیان دەپرسین کە:

ئایا چ شتێك لە توانستی ئەو کەسەوە بە دوور دەزانرێت کە هەموو ساڵێك لەسەر ڕووی زەوی‌دا چوارسەد هەزار جۆری زیندەوەر بەدی دەهێنێت؟ ئەو کەسەی کە هەموو ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کردووە و، لە هەموو بەهارێکیشدا گەردوونێکی زیندووی نوێ - کە لە سەرجەمی گەردوون وردەکاری و دانایی زیاتری پێوە دیارە - لە ماوەی شەش حەفتەدا دروست دەکات؟

ئەو خواوەندە بەدیهێنەر و بەتوانایەی کە بە "توانست"ی خۆی پلان و ئەندازەی هەموو ئەو بوونەوەرانەی لە "زانست"ی خۆی‌دا دیاری کردووە و نەخشەی بۆ

کێشاون، چۆن بەدیهێنانی ئـەو بوونەوەرانـەی لـەتوانادا نـابێت لـەکاتێکدا کـە بەوپـەڕی ئاسانی بەدییان دەهێنێت و دەیانخاتە ڕوو، بـە وێنـەی ئاسـانیی دەرخسـتنی "نووسـراوێکی نەبینراو" تەنها بە هێنانی ماددەیەکی کیمیایی تایبەت بەسەر ئەو نووسینەدا؟

جـا ئیـتر بـە دوور زانینی بەخشـینی "بوونـی دەرەکـی" بـەو بوونەوەرانـەی کـە لـە "زانست"ی خوای گەورەدا هەن و نەخشەیان بۆ کێشـراوە و بـە ڕوالـەت دیـار نـین و بـە "عەدەم" ناو دەبرێـن، بـە دوور زانینی ئەم کـارە لـە توانستی ئـەزەلیی خـوای گـەورەوە، پاشان ئینکاری کردنی خودی بەدیهێنان، لە ڕاستیدا گەوجایەتییەکی گەلـێ زیـاترە لـە هی نەفامی و گەوجایەتیی سۆفستائییەکان!

دەروونی ئـەو سـەر لـێ شـێواوانە، کـە تـابلێی کۆلـەوار و دەستەوسـانن و، بەشـێکی جوزئی و یەکجار کەمی ویست و ئیختیار نەبێ هیچی تر شك نابەن، لە سنووری خۆیان لایـان داوە و لافـی فیرعەونایـەتی لـێ دەدەن. جـا کـە ئەوانـە سـەرنج لـە خۆیـان دەدەن و دەبینن: "لەناوبردن" و "بەدیهێنان"ی هیچ شتێکیان لەتوانادا نییە، چ گەردیلەیەك بێت و چ هەر ماددەیەك کە لە "نەبوو" و هیچەوە دروستی بکەن..

ئنجا کە دەبینن ئەو "سروشت"و هۆکارە ماددییانەش پاڵیان پێـوە داوە و شـانازی بـە پەرستنیانەوە دەکـەن، ئـەوانیش سـەرتاپا کۆلـەوار و دەستەوسـانن و توانایـان نییـە لـە نەبوونەوە هیچ شتێك بەدی بهێنن، کاتێك ئەمانە لێك دەدەنـەوە، گەوجایـەتییان دەگاتـە ئەو ڕادەیەی کە بڕیارێکی گشتی دەربکەن و بڵێن: "المادة لا تُفنَى ولا تُستحدَث". واتـە ماددە نە لـەناو دەبرێـت و نـە بـەدی دەهێـنرێت. دەشیانەوێت "توانسـت"ی بێ سنوور و ڕەهای خواوەند بخەنە ژێر ڕکێفی ئەو دەستوورە هەڵە و ناڕەوا و ساکارەیانەوە[1].

بەڵێ، خوای گەورەی خاوەن توانستی ڕەهـا و شکۆمەند، بـە دوو جـۆر شـتان بـەدی دەهێنێت:

---

(١) زانستی ئەمڕۆ لایەنە چەوتەکانی ئەم وتەیەیان ڕاسـت کردووەتـەوە. بـە تایبـەت تیـۆری "تەقینـەوە مەزنەکە BIG BANG" کە زۆرینەی زانایـانی ئـەم سـەردەمە پشـتی دەگرن. بۆ زیـادە شـارەزایی لـەم ڕووەوە، بـە وردی بڕوانە کتێبی "نهێنیی ئەستێرەکان" وەرگێڕاوی مامۆستا "موحسین عەلی ئەحمەد" و، کتێبی "الإنفجار الكبير" کە لێکۆلینەوەیەکی زانسـتییە و ئـەو تیـۆرە ڕوون دەکاتـەوە. شـایانی باسـە کـە پێگـە زانسـتییەکانی ئـەمڕۆی تۆڕی ئینتـەرنێت، ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ، بەڵگـەی بـەهێز و نـوێ بـۆ پشـتگیریی ئـەو تیـۆرە و ڕاسـتیی "بەدیـهێنان" پێشکەش دەکەن. خۆ ئەگەر دژە بۆچوونەکانی ئەم ڕاستییە بە کۆلەکەی دەرەوەی بازنەی زانسـت و بـە زۆرە ملـێ ڕاگیر نەکرانایە، ئەوا هەر لەمێژ بـوو ئـاڵای سپییان بـە ئاشـکرا هـەڵدەکرد، وەك ئـەوەی بـە زمـانی حـاڵ هەڵیان کردووە! (وەرگێڕ)

*یەکەمیان* : بەدیهێنان و دروستکردن. واتە لە "نەبوون" و هیچەوە "بوون" دەبەخشێت بەو شتەی کە دروستی دەکات و، ئنجا هەر شتێکیش ئەو بەدیهێنراوە پێویستی پێی ببێت، هەر ئەو خوایە، لە نەبوونەوە بۆی بەدی دەهێنێت و پێشکەشی دەکات.

*دووهەمیان* : بە بنیاتنان و سنعەت و وردەکاری. واتە بۆ مەبەستی دەرخستنی کەماڵی دانستی خۆی و، بۆ ئاشکرا کردنی درەوشانەوەی زۆربەی ناوە جوانەکانی و، دانستە ورد و زۆرەکانی تری جگە لەمانەش، هەر لە توخمەکانی بوونەوەر، بەشێك لە بوونەوەران بەدی دەهێنێت و بنیاتیان دەنێت و، بەپێی یاساکانی "ڕۆزیدان" هەندێك لەو مادده و گەردیلانەی کە هەموویان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەون، بۆ ئەو بوونەوەرە دەنێرێت تاکو بنیاتنانی "بوون"ی ئەویان پێ تەواو بکات.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە: خواوەندی خاوەن توانستی ڕەها، بە دوو جۆر و دوو شێواز بوونەوەران بەدی دەهێنێت: "بەدیهێنان" و "بنیاتنان". کەواتە لەناوبردنی شتێکی "بوو" و بەدیهێنانی شتێکی "نەبوو"ی گەلێ بەلاوە ئاسانە. تەنانەت ئەمە یاسای کارگێڕی خواوەندە لە گەردووندا.

جا ئیتر دوای ئەمانە، گەر کەسێك لەناوبردنی ئەو بوونەوەرانەی کە لە بەهاراندا خوای گەورە بەدییان دەهێنێت، لەو توانستە بە دوور بزانێت کە هەموو بەهارێك پتر لە سێ‌سەد هەزار جۆری بوونەوەران و زیندەوەران دروست دەکات و، شکڵ و شێوە و سیفەت و چۆنێتی و حاڵەت و تەنانەت گەردیلەکانیشیان لە نەبوونەوە بەدی دەهێنێت.. ئەو کەسەی "بەدیهێنان" و "لەناوبردن" لەم توانستەوە بە دوور بزانێت و بڵێت: "ئەو توانستە ناتوانێت هیچ شتێك لە نەبوونەوە بهێنێتە بوون" دەبێ خۆی لەناوبچێت و نوقمی تاریکستانی "نەبوون" ببێت!

ئەم مرۆڤەی کە وازی لە "سروشت" هێنا و ڕێگای "حەقیقەت"ی گرتەبەر، دەڵێت:

(بە ئەندازەی هەموو گەردیلەکان سوپاس بۆ خوای گەورە، کە یارمەتیی دام ئیمانی تەواوەتیم دەستگیر ببێت و لە وەهم و گومڕاییەکانیش دەربازی کردم و، سەرجەمی دوودڵی و گومانەکانیشم نەمان و لەناوچوون)!

الحمدُ لله على دين الإسلام وكمال الإيمان.

﴿سبحانكَ لا علمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنت العليمُ الحكيم﴾.

# بریسکەی بیست و چوارەم

## پەیامی پۆشتەیی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ﴾

تا کۆتایی ئایەتەکە لە سوورەتی: (الأحزاب:٥٩)

ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان بە شەرمکردن و پۆشتەیی دەدات. بەڵام ڕای شارستانێتیی ساختە پێچەوانەی ئەم فەرمانە پەروەردگاریەیە؛ شەرمکردن و پۆشتەیی بۆ ئافرەت بە کارێکی سروشتی نازانێت، بەڵکو بە کۆت و دیلیی دادەنێت بۆیان[١].

وا ئێمەش لە نێوان چەندەها دانایی(حیکمەت) زۆر و زەبەندەدا لەوانەی کە بەڵگەی ئەوەن ئەم فەرمانە پیرۆزەی قورئان سروشتی ئافرەتان داخوازیەتی و، پێچەوانەی ئەم فەرمانەش دژی سروشتیانە، تەنها چوار دانایی باس دەکەین:

◆ **دانایی یەکەم:**

شەرمنی و پۆشتەیی کارێکی سروشتییە بۆ ئافرەتان و سروشتیان داخوازیەتی، چونکە ئافرەت نەرمی و لاوازی تێکەڵی بەدیهاتنیان بووە و، لە دەروونی خۆیاندا هەست

---

(١) ئەمە بڕگەیەکە لەو "لائیحە"یەی پێشکەش بە دادگای "تەمیز" کرا و، لە بەردەمی دادگادا خوێندرایەوە و دادگای بێ دەنگ کرد و، بوو بە پەراوێزی ئەم مەقامە:

(منیش بە دادگای بەڕێزی وەزارەتی دادگەری دەڵێم:

تاوانبارکردنی کەسێك کە بەرز و پیرۆزترین دەستووری خوایی تەفسیر دەکات، ئەو دەستوورەی کە حەقی ڕاستەقینەیە و لە هەموو سەردەمێکدا و لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا سێ سەد و پەنجا ملیۆن موسڵمان لە کاروباری ژیانی کۆمەڵایەتییاندا پرس و ڕایان پێیەتی و ڕەفتاری پێ دەکەن.. ئەو کەسەی کە لە تەفسیرەکەیدا پشت بەو شتانە دەبەستێت کە سێ سەد و پەنجا تەفسیرنووس تیایاندا یەکیان گرتووە و سەلماندوویانە و، شوێن ئەو بیروباوەڕە کەوتووە کە باپیرانی پێشوومان لە ماوەی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵدا باوەڕیان پێی بووە.. تاوانبارکردنی ئەم تەفسیرنووسە، بڕیارێکی ستەمکارانەیە و، بێ هیچ گومانێك دادگەری - ئەگەر لە ڕووی زەویدا هەبێت - ڕەفزی دەکات و دەست بە ڕووی ئەو بڕیارەوە دەنێت و هەڵی دەوەشێنێتەوە). (دانەر)

دەکەن کە پێویستیان بە پیاوێك هەیە پارێزگاریی خۆیان و منالەکانیان بکات، کە لە خۆیان بەلایانەوە ئازیزترن. کەواتە ئافرەتان بە سروشت وا دروست کراون کە لای کەسانی تر خۆیان خۆشەویست بکەن و کارێ نەکەن دوورەپەرێزی و نەفرەتیان لێ بکرێت یان ڕەزایان لای ئەوان قورس بێت.

پاشان، نزیکەی حەوت لە دەی ئافرەتان: یان بەساڵاچوون یان ناشیرینن و حەزناکەن پیری و ناشیرینییان دەربخەن، یان دارای غیرەتێکی توندوتیژن و مەترسیی ئەوەیان هەیە کە خەڵکی جوانەکان زیاتر پەسەند بکەن تا ئەوان، یاخود لەو مەترسییەدان کە دەستدرێژی بکرێتە سەریان و تۆمەتیان بۆ ڕێك بخرێت..

ئەو ئافرەتانە - بە سروشت - حەزیان لە پۆشتەیی و خۆپاراستنە، نەوەك دەستدرێژییان بکرێتە سەر و، تاکو لای مێردەکانیشیان جێی تۆمەت نەبن، تەنانەت بەتەمەنەکانیان پتر سوورن لەسەر خۆداپۆشین.

لەوانەیە تەنها دوو یان سێ لە دەی ئافرەتان جوان و لاو بن و، لە دەرخستنی جوانیی خۆیان وەڕس و بێزار نەبن! ئاشکرایشە مرۆڤ لە ڕوانینی ئەوانەی خۆشی ناوێن بێزار دەبێت. خۆ ئەگەر وا دابنێین ئافرەتێکی جوان حەز بکات دووسێ کەسی نامەحرەم بیبینن، هەر ئەو ئافرەتە - بە بێ گومانی - لە سەیرکردنی حەوت هەشتێکی تری نامەحرەم وەڕس و بێزار دەبێت، بەڵکو نەفرەتیشیان لێ دەکات.

کەواتە ئافرەت، بە مەرجێك ڕەوشتی تێك نەچووبێت، بە بێ گومانی لەدەست ئەو بۆڕوانینە چەپەڵانە هەڵدێت کە وەك تاقی کراوەتەوە کاریگەریی ماددیی چەشنی ژەهریان هەیە. بە ڕادەیەك کە دەبیستین زۆربەی ئافرەتانی ئەورووپاش - کە مەڵبەندی ڕووتی و خۆدەرخستنی ئافرەتە - لەتاو ڕوانینی خەڵکی بۆیان سکاڵا بۆ لای پۆلیس دەبەن و دەڵێن: ئەو بێ نرخانە لە بەندیخانەی ڕوانینیاندا بەندمان دەکەن!

لەمەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

ئەم کارەی شارستانێتیی هەرزەیی کردوویەتی و پۆشتەیی لەناودا لابردووە و ڕێی بۆ ڕووتیی ئافرەت والا کردووە، کارێکە دژ و پێچەوانەی سروشتی مرۆڤە و، فەرمانەکەی قورئانی پیرۆزیش کە داوای شەرمنی و پۆشتەیی دەکات، سەرەڕای ئەوەی سروشتی ئافرەت داخوازیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا ئافرەت لە سووکایەتی و بەدڕەفتاری و زەلیلی و دیلیی مەعنەوی و نزمی دەپارێزێت، ئەو ئافرەتانەی کە سەرچاوەی میهرەبانی و شەفەقەتن و، هاوسەر و هاوڕێیەکی ئەمینی مێردەکانیانن لە دواڕۆژدا.

ئنجا سەرەڕای ئەمانەش، سروشتی ئافرەت مەترسیی لە پیاوانی بیانی تێدایە. جا ئەم مەترسی‌یە داخوازی پاراستن و خۆدەرنەخستنە، چونکە لەوانەیە لەزەتێکی ناڕەوای نۆ دەقیقەیی، ئازاری هەڵگرتنی سکێکی نۆ مانگی و پاشان بەخێوکردنی منداڵێکی بێ کەسی بۆ ماوەی نۆ ساڵی لێ بیێتەوە کە ئەو لەزەتە بشێوێنێت.

لەبەر ڕوودانی زۆری ئەم چەشنە گریمانە، ئافرەتان بەپێی سروشتیان ترسێکی ڕاستەقینەیان لە پیاوانی نامەحرەم هەیە و، دووره‌پەرێزی‌یان لێ دەکەن. کەواتە بەدیهاتنی لاوازی ئەوان، بە ڕاستی و تەواوی، بۆ خۆپاراستن بێداریان دەکاتەوە و، بۆ پۆشتەیی هانیان دەدات، تاکو ئارەزووی نامەحرەم نەبزوێت و ئەم پۆشتەیی‌یەش نەیەڵێت دەستدرێژی بکرێتە سەریان و، سروشتیان ڕێنمایی‌یان دەکات بۆ ئەوەی کە قەڵای مەحکەم و سەنگەری ئەمین و بێ وەی بۆ ئەوان تەنها "پۆشتەیی"یە.

بیستمان کە: ژنی پیاوێکی پلەوپایە بەرزی دنیایی، شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی جەستەی بە دەرەوە بووە و، بۆیاخچی‌یەکی پێڵاویش بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕۆشنا و لە ناوجەرگەی ئەنقەرەی پایتەختدا پەلاماری داوە! جا ئایا ئەم ڕووداوە "ناڕەوایە" زللەیەکی توندوتیژ نی‌یە لەسەر ڕووی دوژمنانی داوێن پاکی و پۆشتەیی، لەوانەی کە هیچ ئاگایەکیان لە واتا و ناوەرۆکی شەرم و حەیا نی‌یە؟!

**◆ دانایی دووهەم:**

پەیوەندیی بەهێز و، خۆشەویستیی قووڵی نێوان ژن و مێرد تەنها لە پێداویستی‌یە سروشتی‌یەکانی ژیانی دنیایانەوە پەیدا نەبووە، چونکە ئافرەت تەنها لە ژیانی دنیادا هاوەڵی مێردەکەی نی‌یە، بەڵکو لە ژیانی هەمیشەیی و نەمریشدا هاوڕێ و هاوسەریەتی.

جا مادەم ئافرەت هاوڕێی ژیانی هەمیشەیی مێردەکەیەتی، ئەوا نابێت سەرنجی غەیری هاوڕێ هەمیشەیی‌یەکەی بۆ لای جوانیی خۆی ڕابکێشێت و، نابێت بەم کارە مێردەکەی بێزار و دووچاری غیرەت و تووڕەیی بکات.

ئنجا لەبەر ئەوەش کە مێردە ئیمانداره‌کەی - بە بۆنەی ئیمانەکەیەوە - تەنها بۆ ئەم دنیایە ئەوی خۆش ناوێت و خۆشەویستی‌یەکەشی ئاژەڵانە و بۆ تەنها کاتی جوانیی ئەو نی‌یە، بەڵکو خۆشەویستی و ڕێزی هاوسەرەکەی بێ گەردن و، تا کاتی پیری و نەمانی جوانی، تەنانەت هەتا ژیانی هەمیشەیی و نەمریش هەر بەردەوامن، ئەوا دەبێت بەرامبەر بەمە ئەو ئافرەتەش جوانیی خۆی تەنها بۆ مێردەکەی دەربخات و، هەر ئەوی خۆش بوێت، چونکە مرۆڤێتیی مرۆڤ داخوازی ئەمەیە. دەنا زۆری لەکیس‌دەچێت و کەمی دەست دەکەوێت.

پاشان یەکێك لە داخوازی‌یەکانی شەرع: هاوکوفیی مێردە بۆ ژنەکەی. واتە دەبێ وەك یەك و بۆ یەکتر گونجاو بن. گرنگترین لایەنەکانی هاوکوفییش - وەك زانراوە - هاوکوفی‌یە لە ئاییندارىدا.

ئەو مێردە چەندە بەختەوەرە کە ئاییندارىی ژنەکەی دەبینێت و چاوی لێ دەکات و، وەك ئەو دەبێت بە خاوەن ئایین و، ئیتر لە ژیانی هەمیشەیی و نەمریدا هاوەڵە بەوەفاکەی لەدەست دەرناچێت.

ئەو ژنەش چەندە بەختەوەرە کە ئاییندارىی مێردەکەی دەبینێت و، دەترسێت لە ژیانی نەمریدا هاوەڵە ئەمینەکەی خۆی لەدەست دەربچێت. لەبەر ئەوە، دەست بە ئیمان و تەقواوە دەگرێت.

"وەیل" و جارێکی تریش "وەیل" بۆ ئەو مێردەی نوقمی نەفامی و هەرزەیی‌یەکی ئەوتۆ دەبێت کە هاوسەرە باش و خواناسەکەی لەدەست دەردەکات.

بەدبەختیش بۆ ئەو ئافرەتەی کە چاو لە مێردە خاوەن تەقوا و خواناسەکەی ناکات و، لە ئەنجامدا هاوەڵە بەڕێز و بەختەوەرە هەمیشەیی‌یەکەی خۆی لەدەست دەدات.

وەیل و ڕسواییش بۆ ئەو ژن و مێردە بەدبەختانەی کە لە گوناهباری و کرداری ناڕەوادا چاو لە یەکتر دەکەن و، لە پاڵپێوەنانی یەکتریدا بەرەو ئاگری دۆزەخ پێشبڕکێ دەکەن!

◆ **دانایی سێهەم:**

بەختەوەریی ژیانی خێزان و بەردەوامیی ئەو بەختەوەری‌یە، بە بەردەوامیی متمانە و باوەڕی چوون یەکی نێوان ژن و مێرد و، بەردەوامیی ڕێزی شایان و خۆشەویستیی ڕاستەقینەی نێوانیان دەبێت. بەڵام ڕووت بوونی ئافرەت، ئەو متمانە و ڕێز و خۆشەویستی‌یە چونیەکە تێك دەدات و نایهێڵێت.

لە دەوروبەرێکی ڕووتی وەك ئەمەدا، نۆ لە دەی ئافرەتە ڕووتەکان پیاوی جوانتر لە مێردەکانی خۆیان دەبینن، بەڵام مەگەر تەنها یەکێکیان هیچ کەسێك نەبینێت لە مێردەکەی خۆی جوانتر بێت. پیاوانیش بە هەمان جۆرن؛ مەگەر لە بیست کەسدا یەکێکیان ئافرەتێك ببینێت نەگاتە جوانیی ژنەکەی خۆی، بەڵام ئەوانی تر هەردەم لە ژنانی خۆیان جوانتر دەبینن.

ئەم دەوروبەرە تێکەڵ و ڕووتە لەوانەیە هەستێکی نزم و بێ‌نرخ و چەپەڵ لە دەروونـدا بزوێنێت، جگە لەوەش کە دەبێت بەهۆی ئەوەی ئەو خۆشەویستی‌یە بێ گەرد و ڕێزە

خاوێنەی باسمان کرد نەمێنێت. چونکە ناگونجێ مرۆڤ - بە سروشت - هەستێکی نزمی ئاژەڵانەی بەرامبەر ئەو ئافرەتە مەحرەمانە تێدابێت کە وەك خوشکی خۆی سەیریان دەکات، چونکە "ڕوخسار"ی کەسانی مەحرەم هەستی بەزەیی و میهرەبانیی سیلەی ڕەحمی کەسوکار دەبزوێنێت. جا ئەم هەستە بەرزە، مەیل و ئارەزووە شەهوانییەکانی دەروون کەم دەکاتەوە.

بەڵام دەرخستنی شتێك کە دروست نییە دەربخرێت و پیشان بدرێت - وەك قاچ - لەوانەیە لەبەر نەمانی هەست بە مەحرەمیی نێوانیان، هەستێکی نزم لای دەروونە نزمەکان بورووژێنێت، چونکە تەنها "ڕوخسار"ی مەحرەمەکانە کە هەست بە خزمایەتی کردن و مەحرەمێتیی پێوە دیارە و لەبەر چاودا جیایە لە کەسانی تر، بەڵام دەرخستنی شوێنەکانی تری جەستەی ئافرەت بۆ مەحرەم و نامەحرەم یەکسانە، چونکە هیچ کام لەو نیشانە جوداکەرەوانەی مەحرەمایەتی لەو شوێنانەدا هەستی پێ ناکرێت کە داخوازی سەیر نەکردنی حەرام بێت و، لەوانەیە ئارەزووی ڕوانینی ئاژەڵانە لای هەندێ مەحرەمی بەدخووی ڕەوشت نزم ببزوێنێت! خۆ ئەم چەشنە ڕوانینەش کەوتنێکی ئەوەندە سامناکە بۆ مرۆڤایەتی کە مرۆڤ لەتاوا تەزوو بە جەستەیدا دێت!

◆ **دانایی چوارەم:**

ئاشکرایە کە "زۆریی وەچە" هەمیشە کارێکی باشە و، هیچ نەتەوە و دەوڵەتێك نییە داوای زۆر کردنی وەچە نەکات. پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: "تناكحوا تكثروا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة"(١). نەهێشتنی پۆشتەیی و بواردان بە دەرکەوتن و ڕووتیی ئافرەت ڕێژەی ژن هێنان کەم دەکاتەوە و، بەو پێیە وەچە خستنەوەش گەلێ کەم دەبێتەوە. چونکە لاو هەرچەندە و بە هەر ئەندازەیەکیش لە ڕێ لادەر و بەدڕەفتار بێت، هێشتا هەر حەز دەکات هاوسەری ژیانی داوێن پاك و پارێزراو بێت و، نایەوێت ڕووت و - وەك خۆی - نزم و سووك بێت. لەبەر ئەوەیە دەبینیت گەر ئەو ئافرەتەی

---

(١) تناكحوا تناسلوا فإني أباهي بكم الأمم يوم القيامة رواه عبدالرزاق والبيهقي عن سعيد بن أبي هلال مرسلاً بلفظ: (تناكحوا تكثروا فإني أُباهي بكم الأمم يوم القيامة) قال في المقاصد: جاء معناه عن جماعة من الصحابة، فأخرج أبو داود والنسائي والبيهقي وغيرهم عن معقل بن يسار مرفوعاً: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأُمم يوم القيامة، ولأحمد وسعيد بن منصور والطبراني في الأوسط والبيهقي وآخرين عن أنس قال: كان رسول الله ﷺ يأمر بالباءة وينهى عن التبتل نهياً شديداً ويقول: تزوجوا الولود الودود فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة، وصححه ابن حبان والحاكم.. الخ ( باختصار عن كشف الخفاء للعجلوني ١٠٢١) والسيوطي في الجامع الصغير (٣٣٦٦). (وەرگێڕ - لە چاپی عەرەبیی "اللمعات"ەوە).

دەست نەکەوێت کە دەیەوێت مارەی بکات، ئەوا ژن نەهێنانی پێ باشتر دەبێت و، لەوانەشە لەمەوە سەربکاتە خراپکاری و لە ڕێ بترازێت. بەڵام ئافرەت لەمەدا وەك پیاو نی‌یە و ناتوانێت مێرد هەڵبژێرێت.

ئافرەت لەبەر ئەوەی ڕێکخەری کاروباری ناو ماڵە و پارێزگاریی ماڵ و منداڵ و هەموو شتێکی مێردەکەی خراوەتە ئەستۆ، ئەوا گرنگترین سیفەتی تێدایە کە: ئەمانەت و متمانە پێبوونە. بەڵام دەرکەوتن و ڕووت بوونی، ئەو ئەمانەتە تێکدەدات و متمانەکەش لە جێی خۆی دەلەقێنێت و، بەم کارە مێردەکەی دووچاری ئازاری مەعنەوی و دەروونی دەکات، بە ڕادەیەك "ئازایەتی" و "سەخاوەت" کە دوو ڕەوشتی باشی پیاون، گەر لە ئافرەتدا بین، بە ڕەوشتی باش لە قەڵەم نادرێن. چونکە گەر ئافرەت ئەو سیفەتانەی تێدا بێت، ئەوا ئەمانەت و متمانەکەی تێکدەچێت بەوەی کە ئەنجامەکەی: "بێ‌شەرمی" و "ئیسراف" دەبێت.

جا مادەم ئەرکی سەرشانی پیاو تەنها پارێزگاریی ماڵ و سامانی خێزانەکەی نی‌یە، بەڵکو جگە لەوەش پارێزگاری کردنی ژنەکەی و بەزەیی پێدا هاتنەوە و ڕێزلێنانیشیەتی، ئەوا ئەو شتەی لەسەر ژن پێویستە لەسەر پیاو پێویست نی‌یە و، ڕێ لە پیاو ناگیرێت کە بە ویستی خۆی چ ژنێك دەهێنێت دەتوانێت بیهێنێت و، جگە لەو ژنەی هی تریش مارە بکات.

وڵاتانی ئێمە وەك وڵاتانی ئەوروپا نین و بە یەك چاو تەماشا ناکرێن، چونکە لەوێ تا ڕادەیەك چەندین هۆی توندوتیژی وەك شیربازی(المبارزة) هەن کە لە ناوەندێکی ئاوا ڕووتدا پارێزگاریی شەرەف و داوێن پاکی دەکەن و، هەر کەسێك بە نیازی چەپەڵ بۆ هاوسەری هەر مرۆڤێکی "بەشەرەف" بڕوانێت، دەبێ لە پێشدا کفنەکەی خۆی بە دەستی خۆی ئامادە بکات. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە سروشتی ئەوروپایی‌یەکان چەشنی کەشیان ساردوسڕە.

بەڵام جیهانی ئیسلامیی ئێمە لە چاو ئەوروپادا، بە وڵاتە گەرمەکان دادەنرێت. خۆ کاریگەریی ژینگەش لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی مرۆڤدا لای هەموان ئاشکرا و زانراوە. ڕووتیی ئافرەتیش، کە هەست و ئارەزووی شەهوانیی ئاژەڵانە دەبزوێنێت، لەوانەیە لەو وڵات و خەڵکە ساردوسڕەدا دەستدرێژیی زۆر و خراپکاریی مەزنی لێ نەوەشێتەوە، وەك ئەو ئیسراف و زیادەڕەوی‌یەی کە ئەم ڕووتی‌یە لە وڵاتە گەرمەکان و لەو کەسانەدا بە خێرایی و زوویی دەورووژێن، پەیدای دەکات.

جا خۆدەرخستن و پۆشتە نەبوونی ئافرەتیش کە ئـارەزووی دەروون دەورووژێنێـت و پـەتی هەسـتە شـەهوانی‌یەکان دەپچڕێنێـت، لـەم چەشـنە ناوچانـەدا، بـە بێ گومـانی زیـادەڕەوی و ئیسـراف و، سـنوور شـکاندن و، لاوازیـی وەچـە و، ڕووخـانی هـەموو هێزێك، بەرهەم دەهێنێت. چونکە پیاو، کـە دەتوانێـت لـە یـەك مـانگ یـان بیسـت ڕۆژدا پێویستیی سروشتیی خـۆی نـەهێڵێت، لـەم چەشـنە شـوێن و دەوروبەرانـەدا پێـی وایـە کـە ناچارە هەموو چەند ڕۆژێك جارێ ئەم پێویستی‌یە نەهێڵێت. جا لەبـەر ئـەوەش کـە چـەند ڕێگرێکی شەرعیی چەشنی "بێ‌نوێژی" کە لەوانەیە پازدە ڕۆژ بخایەنێت، نایەڵن ئەو پیـاوە توخنی خێزانەکەی بکەوێت، ئەوا ئەو پیاوە گەر بەسەر هەستەکانی خـۆیدا زاڵ نـەبێت دووچاری داوێن پیسی دەبێت.

پاشان دەبێ دانیشتووانی شار لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا چاو لە گوندنشـینان نەکـەن و، پۆشتەیی نێوانیان لانەدەن. چونکە خەڵکی لادێ خـەمی گـوزەران سـەرقاڵی کـردوون و ناچارن توانا و هێزی جەستەیان بـۆ بەدەستهێنانی گوزەرانیـان بەکاربـهێنن و، زۆر جـار ئافرەتان بەشداریی چەندین کار و ئەرکی قورس دەکەن. لەبەر ئەوە، ئەگەر لایەکی لەشە زبرەکانیان لە کاتی کاردا دەربکـەوێت، ئـارەزووی ئاژەڵانـەی کەسـانی تـر نـابزوێنێت. جگـە لـەوەش کـە بـە ئـەندازەی شـار هـەرزە و بێ کـار لــە لادێکـاندا نی‌یــە. ئیــتر خراپکاری‌یەکانی لادێ ناگەنە یەك لە دەی خراپکاریی شار. لەبـەر ئەوەیـە نابێ شـار بـە چاوی لادێ سەیر بکرێت.

* * *

# مەسەلەیەکی گرنگ کتوپڕ بە دڵدا هات

**بێدارکردنەوەیەك:**

**شێواز و ڕەویەی پەیامەکانی نورر بەزەیی و شەفەقەت و میهرەبانی‌یە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو ئافرەتانەی خاوەنی شەفەقەت و میهرەبانین، پەیوەندی‌یان بەم پەیامانەوە هەیە. بەڵام ئەم باسە ئاراستەی ئەو ئافرەتانە کراوە کە بە چەشنێکی کوێرانە لاسایی ئافرەتانی بیانی دەکەنەوە. لەبەر ئەوە، هەندێ توندوتیژیی تێدا بەدی دەکرێت، ئەوەش تەنها بۆ بێدارکردنەوەی بێ ئاگایانە. تکام وایە لەو خوشکانەی کە ڕابەری شەفەقەت و میهرەبانین دڵیان لە توندوتیژیی ئەم باسە گەرد نەگرێت. (دانەر)**

لە ڕیوایەتی فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەردەکەوێت کە ئافرەتان و فیتنە و ئاشووبیان لە ئاخر زەماندا، سامناکترین و مەترسی‌ترین ڕۆڵ دەبینن.

بەڵێ، هەروەك کتێبەکانی مێژوو بۆمان دەگێڕنەوە و دەڵێن: لە سەدەکانی پێشوودا کۆمەڵێك ئافرەت بە ئازایەتی و چەك هەڵگرتن ناوبانگیان دەرکردووە و، بە "ئافرەتانی ئەمازۆن" ناسراون و، تیپێکی سەربازی‌یان لێ پێکهێنراوە و لە چەندین جەنگی سەختدا بەشداری‌یان کردووە..

جا هەروەك کتێبەکانی مێژوو ئەممان بۆ دەگێڕنەوە..

بە هەمان جۆر لەم سەردەمەی خۆشماندا کە گومڕایی بێ باوەڕی بەرەنگاری ئیسلام بووەتەوە و لەگەڵی‌دا دەجەنگێت، سامناکترین تیپی هێرشبەری ئەوان بۆ سەر ئیسلام کە بەپێی نەخشەکانی دەروونی بەدخواز کاردەکات و پێشەوایەتی‌یەکەی بە دەستی شەیتان سپێرراوە: تاقمێك ئافرەتی "پۆشتە و ڕووت"ن کە قاچ و قولیان دەردەخەن و دەیانکەن بە چەکێکی توندوتیژی بریندارکەر و دژی ئیمانداران بەکاریان دەهێنن. بەم کارەشیان دەرگای خێزانداری و مارەبڕین دادەخەن و هی داوێن پیسیش دەخەنە سەرپشت،

چونکە هانیان دەدەن دووچاری تاوانی گەورەیان بکەن و بە چەشنێکی کتوپڕی دەروونی چەندەها کەس بۆ خۆیان دیل دەکەن و چەندین زام و برینی بە سوێ و قووڵ لە گیان و دڵیاندا دروست دەکەن، تەنانەت لەوانەیە هەندێ لەو دڵانە وەها بپێکن کە بە جارێ بیانکوژن و لەناویان ببەن!

کەواتە سزایەکی گەلێ دادگەرانەیە کە ئەو قاچ و قولانەی چەکی بریندارکەری فیتنەیان لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە، ببن بە سووتەمەنیی دۆزەخ و یەکەم شت دۆزەخ ئەوان بسووتێنێت. چونکە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم و لە بەردەم کەسانێکدا کە لێیان حەرام بوون، ڕووتیان کردوون و دەریانخستوون.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە (هەر لە دنیادا) مێردی گونجاویان لەکیس دەچێت، بەڵکو هەر دەستیشیان ناکەوێت، کە لە ڕاستیدا و بە حوکمی سروشتیان گەلێ پێویستیان پێیەتی. بەهۆی ئەوەی وەفا و باوەڕیان لە دنیادا لە دەست چووە، بەڵکو لە ئەنجامی گوێ نەدان بە شوو کردن و بایەخ نەدان بە مافەکانی، وایان لێ دێت کە پشتگوێ بخرێن و بایەخ و چاودێرییان لە کیس بچێت، بە چەشنێ کە لە ئەنجامدا چل ئافرەت تەنها یەك پیاو سەرپەرشتیکار و بەخێوکەریان دەبێت، وەك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە[1].

جا مادەم "ڕاستی" بەم چەشنەیە..

مادەم هەموو جوانێك جوانیی خۆی خۆشدەوێت و بەپێی توانا پارێزگاریی دەکات و نایەوێت بە نیازی خراپ دەستی بۆ ببرێت..

مادەم "جوانی" نیعمەتێکی بەخشراوە و، نیعمەتیش ئەگەر شوکرانەی لەسەر بکرێت، زیاد دەکات و.. گەر ئینکاریش بکرێت، نامێنێت و دەگۆڕێت..

ئەوا بێ هیچ گومانێك ئەو ئافرەتەی خاوەنی ژیری بێت، بە هەموو توانایەکیەوە هەڵدێت لەوەی جوانییەکەی بکات بەهۆی تاوانباری و گوناهکاری و خەڵکی تریشی پێ بە تەڵەی گوناهبارییەوە بکات و، لەو جوانییەش هەڵدێت کە ببێت بە مایەی ناشیرینی و جوانییەکی ژەهراویی شووم و، ئەو نیعمەتەش کە پێی بەخشراوە ئینکاریی بکات و، ئەمەشی بۆ ببێت بە مایەی ئەشکەنجە و ئازار.

---

(١) عن أنس قال: لأحدثنكم حديثاً لا يحدثكم أحدٌ بعدي، سمعت رسول الله ﷺ يقول: "من أشراط الساعة أن يقل العلم ويظهر الزنا وتكثر النساء ويقل الرجال حتى يكون لخمسين امرأةً القيّمُ الواحدُ". رواه البخاري، كتاب العلم، باب رفع العلم وظهور الجهل. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەی "اللمعات"ەوە).

کەواتە دەبێ ئافرەتی جوان، جوانی‌یەکەی بە شێوەی ڕەوا بەکاربهێنێت، تاکو جوانی‌یە کاتی و لەناوچووەکەی بۆ ببێت بە جوانی‌یەکی هەمیشەیی و بەردەوام لە بریی جوانی‌یەك کە زیاتر لە چەند ساڵێك ناخایەنێت. ئەو کاتەش، بەم کارە، شوکرانەی ئەو نیعمەتەی بەجێ هێناوە. دەنا لە سەردەمی پیری‌دا ئەشکەنجە و ئازار دەچێژێت و لەتاو ئەوەی کە ڕەزای لای خەڵکی قورس دەبێت و پشتگوێی دەخەن، تا دەتوانێت دەگری و هەمیشە بەدبەختیی خۆی دەلاوێنێتەوە.

بەڵام گەر ئەو جوانی‌یە بە ئارایشتی ئەدەب و ڕەویەی قورئان بڕازێنێتەوە و لە چوارچێوەی پەروەردەی ئیسلامدا چاودێریی شایانی خۆی بکرێت، ئەوا ئەو جوانی‌یە لەناوچووە - لە ڕاستی و حەقیقەتدا - دەبێت بە جوانی‌یەکی هەمیشەیی و لە بەهەشتدا جوانی‌یەکی گەلێ جوانتر و قەشەنگتر لە هی "حور العین" بەو ئافرەتە دەبەخشرێت. وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ چەسپاوە[1]. جا ئەگەر ئەو ئافرەتە تۆزقاڵێك ژیریی هەبێت، بە هیچ جۆرێك واز لەم ئەنجامە ڕوون و هەمیشەیی‌یە ناهێنێت و بەزایەی نادات.

* * *

(١) لەم بارەیەوە فەرموودە زۆرە، ئەمەی خوارەوە یەکێکیانە: "عن أم سلمة زوج النبي ﷺ قالت (في حديث طويل): قلت يا رسول الله! أنساء الدنيا أفضل أم الحور العين؟ قال: نساء الدنيا أفضل من الحور العين كفضل الظهارة على البطانة قلت: يا رسول الله! وبم ذاك؟ قال: بصلاتهن وصيامهن وعبادتهن لله عز وجل، ألبس الله عز وجل وجوههن النور وأجسادهن الحرير، بيض الألوان، خضر الثياب، صفر الحلي..." الخ الحديث. رواه الطبراني في الكبير والأوسط، وهذا لفظه. بڕوانە: "الترغيب والترهيب" ٥٣٧/٤. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەی "اللمعات"ەوە).

# گفتوگۆیەك لەگەڵ خوشكانی دوارۆژمدا

باسمه سبحانه

لە چەند "پارێزگەیەك"دا دەمبینی ئافرەتان بایەخێكی گەلێ گەرموگوڕ و خاوێن بە "پەیامەكانی نوور" دەدەن. كاتێكیش بۆ جاری سێهەم هاتم بۆ ئەم قوتابخانەی زەهرای مەعنەوی‌یە، كە شاری پیرۆزی "ئیسپارتە"یە، بیستم ئەو ئافرەتە پاك و پیرۆزانەی خوشكانی دوارۆژم چاوەڕوانی ئەوەن دەرسێكیان پێ بڵێم بە چەشنی ئەو دەرسانەی لە مزگەوتەكاندا بۆ پەند و ئامۆژگاری دەوترێنەوە. چونكە بۆم دەركەوت ئەو خوشكانە گەلێ پشت بەو دەرسانەم دەبەستن كە تایبەتن بە نوورەوە بە ڕادەیەك كە لە سەرووی وزە و توانای منەوەیە.

بەڵام من دوو چاری چەندین نەخۆشیم و لەوپەڕی لاوازی و ماندوویی‌دام، تەنانەت توانای قسە و بیركردنەوەشم نەماوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەم شەو "ختوورە"یەكی بەهێزم بە دڵدا هات، كە ئەمەی خوارەوەیە:

(تۆ، پازدە ساڵ پێش ئێستا، لەسەر داخوازیی لاوان پەیامی "ڕابەری لاوان"ت نووسی و، كەسانێكی زۆریش سوودیان لەو پەیامە وەرگرت. كەچی ئافرەتان پێویستیی زیاتریان بەو چەشنە "ڕابەرە" هەیە لەم سەردەمەدا).

جا هەرچەندە من گیرۆدەی كۆڵەواری و لاوازیم، بەڵام لەبەر ئەم "ختوورە"یە، بەوپەڕی پوختی و لە نێوان "سێ سەرنج"دا هەندێ مەسەلەم بۆ ئەو خوشكە پیرۆز و كیژە لاوانەی خۆم نووسی لەو مەسەلانەی كە پێویستیان پێیان دەبێت.

❑ **سەرنجی یەكەم:**

لەبەر ئەوەی گرنگترین بناغەی پەیامەكانی نوور "شەفەقەت"ە و، ئافرەتانیش ڕابەران و پێشەوایانی شەفەقەت و پاڵەوانانی میهرەبانین، ئەوا بەپێی سروشتی خۆیان لە هەموو كەسێك زیاتر پەیوەستەی پەیامەكانی نوورن. سوپاس بۆ خوای گەورە، لە زۆر شوێندا هەست بەم پەیوەندی‌یە سروشتی‌یە دەكرێت.

"خۆبەخت کردن"یش کە لە شەفەقەت و میهرەبانیدایە، گرنگییەکی گەلێ مەزنی لەم سەردەمەی خۆماندا هەیە، چونکە ئیخلاسی ڕاستەقینە و فیداکاریی بێ بەرامبەر دەگەیەنێت.

بەڵێ، کە دایك بۆ ڕزگارکردنی جگەرگۆشەکەی و، بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشتێك بکات و بەپێی فەرمانبەریی سروشتیی خۆی و بە ئیخلاسێکی ڕاستەقینە، خۆی و گیانی بۆ منداڵەکانی بەخت دەکات، ئەم کارە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاڵەوانێتییەکی بەرز و بڵند و بێ وێنە لە ئافرەتاندا هەیە، بە چەشنێ کە دەتوانن بە دۆزینەوە و دەرخستنی ئەم پاڵەوانێتییەی دەروونیان ژیانی دنیا و قیامەتیان ڕزگار بکەن.

بەڵام چەند تەوژمێکی خراپکار هەن نایەڵن ئەم ڕەوشتە بەنرخ و بەرزەی ئافرەتان دەربکەوێت، یان لە غەیری شوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا دەیخەنەکار و، بەم پێیە لە ڕێ و شوێنی خۆی لایدەدەن و بە شێوەیەکی نابەجێ بەکاری دەهێنن.

وا لە نێوان سەدان نموونەی ئەمەدا، تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە:

دایکی میهرەبان هەردەم ئامادەیە بۆ هەموو فیداکاری و خۆبەختکردنێك، تاکو بەڵا و گیروگرفت و تیاچوون لە منداڵەکەی دوور بخاتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی لە دنیادا سوودی پێ بگات. ئیتر منداڵەکەی لەسەر ئەم بناغەیە پەروەردە دەکات و، هەموو سامانێکیشی لە پێناوی ئەوەدا خەرج دەکات کە کوڕەکەی ببێت بە مرۆڤێکی مەزن و فەرماندەیەکی گەورە. دەبینیت لەم پێناوەدا لە قوتابخانەی زانستە ئایینییەکان دەری دەهێنێت و بۆ ئەورووپای دەنێرێت، بێ ئەوەی بیرێك لەوە بکاتەوە کە بەم کارەی ژیانی هەمیشەیی ئەو کوڕەی خستووەتە مەترسییەوە!

ئەم دایکە لە کاتێکدا هەوڵ دەدات کوڕەکەی لە بەندیخانەی دنیا ڕزگار بکات، گوێ نادات بەوەی بیخاتە بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخەوە. کەواتە هەڵسوکەوتێك دەکات ئەوپەڕی پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی. ئەوەتا لە بریی ئەوەی کوڕەکەی بە جۆرێك پێ بگەیەنێت کە لە دوارۆژدا شەفاعەتی بۆ بکات، کەچی وا پێیدەگەیەنێت کە لەودنیادا سکاڵای لەدەست بکات، چونکە کوڕێك کە بەو چەشنە پەروەردە کرابێت، لەودنیادا سکاڵا لەدەست دایکی دەکات و پێی دەڵێت:

*(بۆچی لە دنیادا ئیمانت بەهێز نەکردم تاکو بوویت بەهۆی ئەم تیاچوونەی ئێرەم)؟!*

ئنجا لەبەر ئەوەش بە تەواوی و بەپێی پەروەردەی ئاینی ئیسلام پەروەردە نەکراوە، ئەوا – هەر لەم دنیایەدا – گوێ بە شەفەقەتە بێ وێنە و ناوازەکەی دایکی نادات، بەڵکو لەوانەیە قسوور و کەمتەرخەمیی زۆریشی لە ڕوودا بنوێنێت!

بەڵام ئەگەر ئەو دایکە هەوڵ بدات ئەو شەفەقەتەی کە پێی بەخشراوە بە باشی و لە جێی خۆی‌دا بەکاربهێنێت و، لە ڕێی شەفەقەتەوە کوڕە لاوازەکەی خۆی لە بەندیخانەی هەمیشەیی – کە دۆزەخە – و لە ئیعدامی هەتاهەتایی – کە مردنە لە گومڕایی‌دا – ڕزگار بکات، ئەوا دوای وەفاتی خۆی ئەو کوڕەی هەمیشە نوور و ڕووناکی بۆ گیانی دایکی میهرەبانی دەنێرێت. چونکە بە ئەندازە و چەشنی ئەو کردەوە چاکانەی کە ئەو کوڕەی لە دنیادا ئەنجامیان دەدات، کردەوەی چاك لە لاپەڕەی کردەوەکانی ئەو دایکەشدا تۆمار دەکرێن. هەروەك بۆی دەبێت بە کوڕێکی پاك و دڵسۆز و، پێکەوە ژیانێکی هەمیشەیی بەسەر دەبەن و، لای خوای گەورەش شەفاعەتی بۆ دەکات و، سکاڵاشی لەدەست دەرنابڕێت.

بەڵێ، یەکەم مامۆستای مرۆڤ، کە لە هەموو کەسێك زیاتر کاریگەریی تێدا هەیە، دایکیەتی!

وا بەم بۆنەیەوە ئەم واتایە ڕوون دەکەمەوە کە بە تەواوی و بێ گومانی لە خۆمدا هەستی پێ دەکەم:

سوێند بە خوای گەورە، قووڵترین و دامەزراوترین دەرسێك وەرم گرتووە و هەمیشە لە دەروونمدا نوێ دەبێتەوە: ئامۆژگاری و وانە مەعنەوی‌یەکانی دایکمن – خوا لێی خۆش بێت – بە چەشنێ کە لە ناخی سروشتمدا ئەو دەرسانەی ئەو جێگیر بوون و، لە جەستەشمدا وەك "تۆو"یان لێ هات لە درێژایی ماوەی تەمەنمدا کە خۆی لە هەشتا ساڵ دەدات، هەرچەندەش دەرسم لە هەشتا هەزار کەس وەرگرتووە. تەنانەت لەو دڵنیایی‌یەشدام کە دەرسەکانی تر لەسەر بناغەی ئەو تۆوانە سەوز بوون و بنیات نراون.

واتە: ئامۆژگاری و دەرسەکانی دایکم کە لە ساڵانی یەکەمی تەمەنمدا ئاراستەی سروشت و گیانی منی کردن، من بە چەند تۆوێکی بنەڕەتی‌یان دەزانم لە نێوان ئەو ڕاستی‌یە مەزنانەی کە ئێستا لە تەمەنی هەشتا ساڵیمدا دەیانبینم.

نموونەی ئەمە:

"شەفەقەت" کە گرنگترینی چوار بناغەکانی ڕێبازی ژیانمە، هەروەها "میهرەبانی و بەزەیی" کە ڕاستی‌یەکی مەزنی پەیامەکانی نوورە، بەوپەڕی دڵنیایی دەبینم کە

بەڵێ، ئەو سۆز و بەزەیی‌یەی دەوراندەوری "نەخۆش"یان داوە، ئازاری نەخۆشی دەتوێنێتەوە و لە بیری دەباتەوە و دەیگۆڕێت بە تامێکی خۆش و شیرین.

گیرابوونی نزا و پاڕانەوەی نەخۆش مەسەلەیەکی گرنگ و شایستەی بایەخ پێدانە.

سی چل ساڵ لە خوا دەپاڕامەوە بۆ چاکبوونەوەم لە ئازارێك کە لە پشتمدا بوو. پاشان تێ گەیشتم کە خوای گەورە لەبەر دوعاکردن "نەخۆشی" بە مرۆڤ دەبەخشێت! جا لەبەر ئەوەی دوعا ناتوانێت خۆی لاببات ئەوا بەرهەمەکەی لە ڕۆژی دواییدایە[1].

ئنجا دوعا خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە جۆرەکانی "پەرستش"، ئەوەتا نەخۆش کاتێ هەست بە دەستەوسانیی خۆی دەکات، پەنا دەباتە بەر دەرگانەی خوای گەورە و لێی دەپاڕێتەوە.

لەبەر ئەوە، گیرانەبوونی ڕواڵەتیی پاڕانەوەکانم لە ماوەی ئەو سی ساڵەدا بۆ چاکبوونەوەم لەو نەخۆشی‌یە، وای لێ نەکردم بیر لە وازهێنان بکەمەوە لە پاڕانەوەکانم، چونکە نەخۆشی کاتی دوعا و پاڕانەوەیە. چاکبوونەوەش بەرهەمی دوعا نی‌یە، بەڵکو خوای دانا و میهرەبان گەر بیەوێت شیفا ببەخشێت، ئەوا تەنها لە گەنجینەی گەورەیی و چاکەی خۆیەوە دەیبەخشێت. خۆ گیرانەبوونی پاڕانەوەشمان بەو شێوەیەی کە خۆمان دەمانەوێت ئەوە ناگەیەنێت کە دوعاکانمان گیرا نەبوون، چونکە پەروەردگاری دانا لە ئێمە باشتر دەزانێت و، ئێمە لە چاو زانیاریی ئەودا نەزانین، خوای گەورەش ئەوشتەی باش و بەکەڵکە بۆمانی دەنێرێت و، هەندێ جاریش دوعا و نزاکانمان کە بۆ ژیانی دنیامان دەیان کەین لە گەنجینەی میهرەبانیی خۆیدا هەڵیاندەگرێت و پاشەکەوتیان دەکات بۆ ئەوەی لە ژیانی دواڕۆژماندا بە کەڵکمان بێت و سوودی لێ وەربگرین. بەم جۆرە، دوعا و نزاکانمان لە ئەنجامدا هەر گیرا دەبن.

هەرچۆنێك بێت، ئەو دوعایەی کە بەوپەڕی خاوێنی و دڵسۆزی‌یەوە بکرێت و لە سەرچاوەی نەخۆشی‌یەوە هەڵقوڵابێت و لە ڕێی هەست کردنەوە بە "لاوازی" و "دەستەوسانی" و "هەژاری"یەوە هاتبێت، گەلێ نزیکە لە گیرابوونەوە.

(نەخۆشی)ش بناغە و خولگەی ئەم جۆرە نزا و پاڕانەوە خاوێنانەیە. جا پێویستە نەخۆش و ئەو ئیماندارانەی چاودێریی دەکەن سوود لەم جۆرە دوعا و نزایانە وەربگرن.

---

(١) هەرچەندە هەندێ نەخۆشی هۆیە بۆ دوعاکردن، کەچی گەر دوعا ببێت بە هۆیەك بۆ نەخۆش نەبوون ئەوا وەکو ئەوە وایە کە دوعا ببێت بە هۆکاری نەبوونی خۆی! خۆ دیارە ئەمەش ناگونجێ! (دانەر)

## دەرمانی هەژدەهەم

ئەی ئەو نەخۆشەی وازی لە شوکرانەبژێری هێناوە و دووچاری داوی سکاڵا بووە! دەربڕینی سکاڵا ئەوە دەگەیەنێت کە مافێکت هەبووبێت و پێشێل کرابێت. کەچی تۆ هیچ مافێکت نەفەوتاوە هەتا سکاڵا بکەیت، بەڵکو هێشتا مافی زۆرت بەسەرەوەیە و شوکرانەشت لەسەر پێشکەش نەکردوون! ئەوەتا هێشتا مافی خوای گەورەت بەجێ نەهێناوە کەچی بە ناڕەوا سکاڵا دەکەیت، وەك ئەوەی خۆت بە خاوەن حەق بزانیت!

لە ڕاستیدا مافی ئەوەت نییە سەیری ئەو لەش ساغانە بکەیت کە پلەیان لە تۆ بەرزترە و ئنجا سکاڵا دەربڕیت، بەڵکو - لە گۆشەی تەندروستییەوە - دەبێ سەیری ئەو نەخۆشە دەستەوسان و داماوانە بکەیت کە پلەیان لە تۆ نزمترە و هەمیشە بەدەست ئێش و ئازارەوە دەتلێنەوە. کەواتە شوکرانەیەکی زۆرت لە ئەستۆدایە.

جا ئەگەر دەستێکت شکاوە ئاوڕێك بەلای ئەو کەسانەدا بدەرەوە کە هەردوو دەستیان براوەتەوە.. ئەگەر چاوێکت بینایی نەماوە، بۆ ئەوانە بڕوانە کە هەردوو چاویان لەدەست داوە! تاکو شوکرانە بژێری پێشکەشی خوای گەورە بکەیت.

بەڵێ، لە گۆشەی نیعمەتەوە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە لە خۆی بەرەوژوورتر بڕوانێت، چونکە بەم کارە ئاگری سووتێنەری سکاڵا کردنی پتر گڕ دەگرێت. بەڵام لەکاتی بەلا و موسیبەتدا پێویستە لە خۆی بەرەوژوورتر بڕوانێت و سەیرێکی ئەوانە بکات کە گیروگرفت و بەڵایان لەو زیاترە، تاکو شوکری خوا بکات و بەو حاڵەی خۆی ڕازی بێت.

ئەم نهێنییەش لە هەندێ پەیامدا بە نموونەیەك ڕوون کراوەتەوە، کە ئەمەی خوارەوە ناوەرۆکەکەیەتی:

(کەسێك دەستی هەژارێك دەگرێت و بە پلیکانەی منارەیەکدا سەری دەخات و لە هەموو پلەیەکدا دیارییەکی پێ دەبەخشێت و، لە لوتکە و کۆتایی منارەکەشدا گەورەترین دیاریی دەداتێ و، بەمەش دیارییەکانی کۆتایی پێ دەهێنێت..

جا لەکاتێکدا کە دەبوو ئەم هەژارە سوپاسی بەخشەری ئەم هەموو دیارییە بەنرخانەی بکردایە، کەچی هەموویان لە بیری خۆی دەباتەوە، یان بە چاوێکی کەم سەیریان دەکات و سوپاسیان لەسەر پێشکەش ناکات و، بۆ بەرەوژوورتر دەڕوانێت و، بەدەم سکاڵاوە دەڵێت: خۆزگا ئەم منارەیە بەرزتر دەبوو تاکو بگەیشتمایەتە پلەی

کەسانی تر! یان دەڵێ: بۆچی ئـەم منارەیـە بـە ئـەندازەی ئـەو چیـا سـەختە یـان منارەکـەی تەنیشتی بەرزتر نەبوو)؟!

چ پێنەزانینێکـە بـۆ ئـەو نیعمەتانـە و، چـەندە تـاوان و ستەمێکی گەورەیـە لـە حـەق و ڕاستی، گەر ئەو هەژارە سکاڵای ئاوای لە زار دەربچێت؟!

حاڵی مرۆڤیش بە هەمان جۆرە، ئـەوەتا کاتێ لـە نەبوونـەوە پـەیدا بـووە، بـە "بـەرد" و "دار" و "ئـاژەڵ" دروسـت نـەبووە، بـەڵکو بـە مرۆڤێکـی موسـڵمان دروسـت کـراوە و، ماوەیـەکی زۆریشـی بـە تەندروسـتی بەسـەر بـردووە و پلەیـەکی بـەرزی نیعمـەتی خـوای گەورەشـی بەدەسـت هێنـاوە. لەگـەڵ ئەمەشـدا دەبینیـت ئـەم مرۆڤـە سـکاڵا لـە نـەبوونی تەندروستی دەکات کە بەهۆی هەندێ شتی کەم خایەنـەوە تەندروستیی لـەکیس چـووە، یـان لەبـەر لێـك جیـا نەکردنـەوەی چاك و خـراپ هـەندێ نیعمـەتی لەدەسـت داوە، یـان ناتوانێت بگاتە ئاستی ئەو نیعمەتانە. پاشان دەشڵێت: (بەدبەخت خۆم! من چیم کـردووە تا بەم جۆرەم لـێ بێت)؟ بەم شێوەیە، بێ ئارامیی خۆی دەردەبڕێت. وەك بڵێـی ڕەخنـە لـە خوایەتی خوای گەورە بگرێت!

ئـەم جـۆرە حاڵانـە نەخۆشـیەکی مەعنەویـیە و، بـەڵا و گـیرو گرفتێکی گەلـێ لـە نەخۆشـی و موسـیبەتە ماددیەکـەی خـۆی گـەورەترە. چونکـە ئـەم سـکاڵایە نەخۆشیەکەی زیاتر دەکات و پەرەی پێ دەسێنێت و، وەکو ئەوە وایە کەسێکی دەست شکاو زۆرانبازی بکات! بەڵام مرۆڤی ژیر دەڵێت:

﴿الَّذِينَ إِذا أَصابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ راجِعُونَ﴾.

ئیـتر بـۆ خـۆی ئـارام دەگرێـت و کارەکـانی دەداتـە دەسـتی خـوای گـەورە، هـەتا نەخۆشیەکەی کاری خۆی تەواو دەکات و بە ڕێی خۆیەوە دەڕوات!

## دەرمانی نۆزدەهەم

خـوای گـەورە کـە نـاوی: "الأسمـاء الحسنـى"ی بـۆ نـاوە جـوان و بـەرزەکانی خـۆی هەڵبژاردووە، ڕایگەیاندووە کە ئەو ناوانە هەموویان جوانن.

لە لایەکی تریشەوە ژیان جوانترین ئاوێنەی خواییە. خـۆ ئاوێنەیـەکیش خاوەنەکـەی جوان بێت دیارە خۆیشی جوانە. هەر ئاوێنەیەکش لایەنە جوانەکانی خواوەندی خاوەنی "جوانی" دەربخات و هەرشتێك لە لایەن ئەو خواوەندە جوانـەوە بەسـەر ئاوێنەکـەدا بێـت ئەویش جوان دەبێت. کەواتـە هەرشـتێك بێتـە ڕێـی ئـەو ژیانـە، ئـەویش - لـە ڕاسـتیدا -

هەرجوانە و بە جوان دادەنرێت، چونکە نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەردەخات!

جا ئەگەر ژیان لەسەر یەك ڕەوت و هەر تەنها بە تەندروستی و خۆشی بڕواتە سەر، دەبێت بە ئاوێنەیەکی کەم نرخ و بێ سوود. تەنانەت لەوانەیە هەندێ جار مرۆڤ بەهۆی ئەو جۆرە ژیانەوە هەست بە نەبوون و بێهوودەیی بکات و ئازار و دڵتەنگی بچێژێت. ئنجا لەو کاتەدا نرخی ژیانیش دێتە خوارەوە و، لەزەت وخۆشیی تەمەنیش دەبێت بە ئازار و خەفەتێکی زۆر لە گەرووی مرۆڤدا. ئیتر یان ئەوەیە ئەو مرۆڤە خۆی دەخاتە ناو چڵکاوی هەرزەیی و کردەوەی ناپەسەندەوە، یان پەنا دەباتە بەر مەڵبەندەکانی خراپەکاری و بەدڕەوشتی، گوایا بۆ ئەوەی ژیان و کاتی خۆی بە زوویی بباتەسەر، کتومت وەکو ئەو بەندکراوەی دوژمنایەتیی تەمەنی بەنرخی خۆی دەکات و بەخێرایی دەیکوژێت لە پێناوی تەواوکردنی ماوەی زیندانییەکەیدا!

بەڵام ئەو ژیانەی کە جموجووڵی تێدایە و بە ئاڵوگۆڕ دەچێتە سەر و چەند قۆناغێکی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت، مرۆڤ هەست دەکات نرخێکی هەیە و، بەرهەمێکی باش بە تەمەن دەدات و، تامێکی خۆش لە دەروونی مرۆڤدا دەداتەوە. تەنانەت وا لە مرۆڤ دەکات کە وێڕای ئەو ئێش و ئازار و دەردیسەرییە جۆراوجۆرانەی دێنە ڕێی، نەیەوێت ژیانی بە فیڕۆ بڕوات و، ئاواتە خوازی ئەوە دەبێت کاتەکانی بەشی کارەکانی بکەن و، هیچ ئاخ و ناڵەیەکی نامێنێت و، هەرگیز ناڵێت: "کوا خۆر ئاوا بووایە"؟ یان: "دەبێت کەی ڕۆژ ببێتەوە"؟

بەڵێ، پرسیار لە دەوڵەمەندێکی دەست بەتاڵ بکە لەوانەی کە هەموو کارێکیان بەگوێرەی دڵ بۆ دەڕەخسێت، لێی بپرسە و بڵێ چۆنیت؟ چی دەکەیت؟ بێ‌هیچ گومانێك لە وەڵامدا جۆرە گوفتارێکی پڕ لە خەفەت و ئازاری لێ دەبیستیت، وەك: (ئاخ بە دەست کاتەوە کە بەسەر ناچێت! ئایا نایەیت بەشێك لە کاتەکەمان بەرینەسەر؟ با ماوەیەك پێکەوە تاوڵە بکەین)! یاخود جۆرە سکاڵایەکی وای لێ دەبیستیت کە هەموویان لە ئومێدی ژیانێکی درێژخایەنەوە سەرچاوە دەگرن، وەك: (فلان کارم ناتەواوە.. خۆزگە ئاوا و ئاوام بکردایە)!

بەڵام ئەگەر پرسیار لە هەژارێکی گیرۆدەی موسیبەت یان کرێکارێکی چەوساوە بکەیت و، بڵێیت: حاڵت چۆنە؟ ئەوا - گەر ژیر بێت - لە وەڵامدا دەڵێت: (سوپاس بۆ خوا من باشم.. هەمیشە لە کاردام و ڕاناوەستم.. خۆزگا زوو خۆر ئاوا نەدەبوو تا

کارەکانم تەواو دەکرد.. خۆ "کات" بە لەسەرخۆیی کۆتایی پێ دێت و تەمەنیش لەگەڵیدا دەڕوات و وەستانی نییە. هەرچەند من - لە ڕاستیدا - ماندووم، بەڵام ئەم ماندووبوونەش هەر دەڕوات و هەموو شتێك بەم چەشنە لە ڕۆشتندایە).

دەبینیت بەم وتانەی نرخ و گرنگیی تەمەن دەردەخات لە ناوەندی ئەو داخ و خەفەتەیدا کە بۆ ڕۆشتن و لە دەستچوونی تەمەنی دەری دەبڕێت. کەواتە بە باشی تێدەگات لەوەی کە نرخی ژیان بە ماندووبوون و هەڵگرتنی ئەرکی قورسەوەیە، بەڵام حەسانەوە و تەندروستی و لەشساغی تامی تەمەن تاڵ دەکەن و شێوە جوانەکەشی لەبەر چاوی خاوەنەکەیدا بە ڕادەیەك دەگۆڕن کە ئاواتەخوازی ئەوە بێت بە زووترین کات لەو تەمەنە ڕزگاری بێت!

دەسا ئەی برای نەخۆشم!

بزانە کە سەرچاوەی هەموو شەڕ و گیروگرفت و تەنانەت بناغەی هەموو گوناهێکیش: نەبوون(العدم)ە، وەك لە پەیامەکانی تردا بە چەندەها بەڵگەی پتەو چەسپاندمان. خۆ "نەبوون"یش شەڕ و خراپەیەکی تەواوەتی و تاریکایییەکی تابڵێی نووتەك و لێڵە.

جا ئەو حاڵەتانەی کە لە دۆخی وەستاندان، واتە ئەو کاتانەی کە ژیان لەسەر یەك شێوە و بە بێ هیچ گۆڕان و جووڵانێك بەسەر دەچێت، ئەو کاتانە، گەلێ نزیکترن لە "نەبوون" و "بێهوودەیی"ەوە. ئەم نزیك بوونەشیەتی وا لە مرۆڤ دەکات کە هەست بە تاریکیی "نەبوون" بکات و دووچاری دڵتەنگی و بێزاری بێت. بەڵام جموجووڵ و ئاڵوگۆڕ "بوون"یان هەیە و کارێك دەکەن مرۆڤ هەست بە "بوون" بکات. خۆ دیارە "بوون"یش خێر و فەڕێکی ئاشکرا و لەبەرچاوە.

جا مادەم حەقیقەت بەم جۆرەیە، ئەوا بزانە نەخۆشییەکەت میوانێکە و بۆ لای تۆ ڕەوانە کراوە، تاکو ئەو کار و ئەرکە زۆرانەی کە پێی سپێرراوە جێبەجێیان بکات. چونکە "نەخۆشی" ژیانە بەنرخەکەت پاڵفتە دەکات و هێز و پێزی دەداتێ و بە پلەکاندا سەری دەخات و بەرزی دەکاتەوە و، سەرجەمی ئەندام و ئامێرە مرۆییەکانت بۆ یارمەتیدانی ئەو ئەندامە بیمار و بەئازارەت دەخاتەگەڕ و، نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری دانا دەخاتە ڕوو. پشت بەخوا بەم نزیکانە ئەرکەکانی سەرشانی کۆتایی پێ دەهێنێت و بە ڕێی خۆیەوە دەڕوات و، بانگ لە "تەندروستی" دەکات و پێی دەڵێت:

(ئێستا وەرەوە لە جێی مندا بەردەوام بمێنەرەوە و، سەرلەنوێ ئەرك و فەرمانبەری یەکانت ئەنجام بدە، چونکە ئەمە جێی تۆیە و، بۆ خۆت بە خۆشی و شادمانی تیای دا بژی)!

## دەرمانی بیستەم

ئەی ئەو نەخۆشەی بە دوای دەرماندا دەگەڕێت!

دەبێ بزانیت کە نەخۆشی دوو بەشە:

بەشێکیان نەخۆشیی ڕاستەقینەیە و، ئەوی تریان وەهم و ئەندێشەیە.

سەبارەت بە جۆرە ڕاستەقینەکەیانەوە، خوای گەورە و دانا و شیفابەخش دەرمانی بۆ هەموو دەردێك داناوە و لە گەنجینەی دەرمانخانە گەورەکەی‌دا - کە گۆی زەوی‌یە - پاشەکەوتی کردوون. جا ئەو دەرمانانە داخوازی بوونی نەخۆشی‌یەکانن. بەکارهێنانیشیان بۆ ئەم مەبەستە هەر لە بناغەدا کارێکی ڕەوایە و ئایینی ئیسلام فەرمانی پێ داوە. بەڵام دەبێ شیفا و کاریگەریی ئەو دەرمانانە تەنها لە خوای گەورەوە بزانین، چونکە خوای گەورە هەروەك نەخۆشی و دەردی بەخشیوە هەر ئەویش شیفا و چاکبوونەوە دەبەخشێت. دەبێ "نەخۆش"ی موسڵمانیش گوێ ڕایەڵی پزیشکە موسڵمان و لێهاتووەکان بێت و لە ڕێنمایی و ئامۆژگاری‌یان دەرنەچێت. چونکە زۆربەی نەخۆشی‌یەکان لە نەزانینی بەکارهێنانی دەرمان و، گوێ نەدان بە ئامۆژگاریی پزیشك و، ئیسراف و، گوناه و، پارێز نەکردنەوە پەیدا دەبن.

خۆ گومانی تێدا نی‌یە کە پزیشکی دڵسۆز و ئایینداز لە چوار چێوەیەکی مەشرووع و ڕەوادا ئامۆژگاریی نەخۆشەکانی دەکات و، بەدئەنجامیی ئیسراف و خراپیی بەکارهێنانی دەرمانەکان دەخاتە پێش‌چاوی نەخۆش و، دڵی دەداتەوە و هیوا و ئومێد بە دڵ و دەروونی دەبەخشێت.

مرۆڤی "نەخۆش"یش لە لایەنی خۆیەوە پشت بەم دڵدانەوە و ئامۆژگاری‌یانە دەبەستێ و بەرە بەرە نەخۆشی‌یەکەی بەرەو لاوازی دەڕوات و، لە بریی سکاڵا کردن و بێ ئارامی و وەڕسی، دڵی دەگەشێتەوە.

باشترین چارەسەریش بۆ جۆری نەخۆشی وەهمی: ئەوەیە کە گوێی پێ نەدرێت! چونکە نەخۆشیی وەهمی بە گوێ پێدانی گەورە دەبێت، کەچی بە پێچەوانەشەوە گەر گوێی پێ نەدرێت، بچووك دەبێتەوە و نامێنێت.

هەروەك ئەگەر کەسێك هێلانە زەردەواڵە بورووژێنێت، ئەوا زەردەواڵەکان بەردەبنە گیانی و گەر بایەخیشیان پێ نەدات نزیکی نابنەوە..

هەروەها گەر کەسێك لە تاریکیی شەودا و لە ئاستی پەتێکی شۆڕەوەبوو لە ئەندێشەیدا بە خەستی ڕۆچووبێت، لەوانەیە ئەو پەتە لە بەرچاویدا گەورە ببێت و بە وێنەی شێت لێی هەڵبێت! بەڵام ئەگەر گوێی پێ نەدات، ئەوا بۆی دەردەکەوێت کە ئەو شتەی شۆڕ بووەتەوە پەتە و مار نییە. ئیتر گاڵتە بە وەهم و شڵەژانی زەینی خۆی دەکات!

ئەم نەخۆشییە وەهمییەش هەر بەم جۆرەیە، ئەگەر درێژە بکێشێت دەبێت بە نەخۆشیی ڕاستەقینە.

وەهم و گومان لای کەسانی هەست ناسك دەبن بە نەخۆشییەکی سەخت و، بە دەردێکی گەورەی دەزانن و، شتی بچووك گەورە دەکەن و، وەرەیان دەڕووخێت. بە تایبەت ئەگەر تووشی نیمچە پزیشکی دڵ ڕەق و دوور لە بەزەیی و بێ ویژدان ببن لەوانەی کە وەهمەکانی نەخۆش دەورووژێنن و لە پێش چاویدا گەورەی دەکەن، تاکو گیرفانی ئەو نەخۆشە - گەر دەوڵەمەند بێت - دابتەکێنن، یان ژیریشی پێ دەدۆڕێنن و بە تەواوی تەندروستیی لەدەست دەردەکەن!

## دەرمانی بیست و یەکەم

ئەی برای نەخۆشم!

ڕاستە نەخۆشییەکەت ئازارێکی ماددیی هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا و بەهۆی ئەم نەخۆشییەتەوە چێژ و لەزەتێکی مەعنەویی هێندە گرنگ دەورەی داویت کە هەموو ئاسەواری ئازارە ماددییەکەت دەشواتەوە و لەناوی دەبات. چونکە هەرگیز ئازارەکەت ناگاتە ئاستی ئەو سۆز و بەزەییەی کە لە منالییەوە لە بیرت چووەتەوە و ئێستا سەرلەنوێ کانییەکەی لە دڵ و دەروونی دایك و باوك و کەسانتدا تەقیوەتەوە، ئەگەر دایك و باوك و کەسانت مابن. ئەوەتا لەم کاتەدا ئەو هەست و سۆزی خۆشەویستی و بەزەییە شیرینەی دایك و باوکت دەکەوێتەوە یاد کە لە دەمی منالیتدا ئاراستەت دەکران و ئێستا سەرلەنوێ تازە بوونەتەوە و، خزمانت جارێکی تر هەمان بەزەیی و خۆشەویستیی جارانت بۆ دەردەبڕن و کێشی نەخۆشییەکەت سۆزی خۆشەویستیی ناو دڵ و دەروونی ئەوانی ڕاکێشاوە و بە دەور و پشتتدا دێن و خەمی تۆیانە!

ئیتر دەبێ ئەو ئازارە ماددی‌یەی کە پێوەی دەتلێیتەوە لە بەرامبەر ئەو خزمەتگوزاری‌یە ئاوێتەی سۆز و بەزەیی‌یەوە چ نرخێکی هەبێ! ئەو کەسانەی کە تۆ پێشتر بە شانازی‌یەوە تێ‌دەکۆشایت بۆ خزمەت کردنیان، وا ئێستا بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوە بەوپەڕی بەزەیی و میهرەبانی‌یەوە خزمەتت دەکەن و، تۆ لەم کاتەدا وەك گەورە و فەرماندەیەکی ئەوانت لێ هاتووە و لە فەرمانت دەرناچن! هەر بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوەیە کە چەندین خۆشەویستی یاریدەدەر و هاوڕێی بەسۆز و بەشەفەقەتی نوێت پەیدا کردووە کە لەبەر ئەو سۆز و میهرەبانی‌یەی خوای گەورە لە مرۆڤدا دایناوە لە خۆتیان نزیك دەخەیتەوە.

وێڕای ئەمەش، تۆ بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوە پشوویەکی باشت دەست کەوتووە و ئێستا لە کاروبار و ئازاری فەرمانبەرێتیی ژیان و گیروگرفتەکانی دوور کەوتوویتەوە.

جا دوای ئەوەی کە هەستت بەم هەموو لەزەتە مەعنەوی‌یانە کرد، کە لەم نەخۆشی‌یەوە بەدەستت هێناون، ئەوا نابێت ئازارە جوزئی و بچووکەکەت سکاڵا لەسەر زارت دەربکات، بەڵکو دەبێ شوکرانەی ئەم چێژ و لەزەتە مەعنەوی‌یانە پێشکەش بکەیت.

## دەرمانی بیست و دووهەم

ئەی ئەو نەخۆشەی کە گیرۆدەی نەخۆشی‌یەکی سەختی وەك "شەلەل" بووە!

لە سەرەتاوە من مژدەت دەدەمێ کە "شەلەل" بە یەکێك لە نەخۆشی‌یە پیرۆزەکان دادەنرێت بۆ مرۆڤی باوەڕدار!

ماوەیەك دەبێ ئەمەم لە ئەولیا و پیاوچاکان بیستووە، بەڵام نهێنی‌یەکەیم نەدەزانی. وا ئێستا یەکێ لە نهێنی‌یەکانی ئەمەم بە دڵدا هات، کە بریتی‌یە لەوەی: "ئەولیاکان" بە ویستی خۆیان و بە مەبەستی گەیشتن و شادبوونیان بە خوای گەورە و ڕزگاربوونیان لە مەترسی‌یە مەعنەوی‌یەکانی دنیا و دەستەبەرکردنی بەختەوەریی هەمیشەیی دواڕۆژیان، شوێن دوو بناغەی بنەڕەتی کەوتوون.

ئەو دوو بناغەیەش:

یەکەمیان: "یاد و بیری مردن"ە. واتە لە پێناوی بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەتاهەتایی دواڕۆژیاندا بیریان لە نەمان و تیاچوونی دنیا کردووەتەوە و، سەرنجیان داوە کە لە دنیادا میوانێکی ڕێبوارن و ئەو ماوەیە لە چەند کار و ئەرکێکی کاتی‌دا دەخرێنەکار.

دووهەمیان: مراندنی دەروونی هاندەری خراپکاریە(النفس الأمارة بالسوء). ئەمەش لە ڕێی موجاهەدە و وەرزشی ڕۆحیەوە، تاکو لە شووم و مەترسیەکانی دەروون و ئەو هەست و نەستانەش کە پاشەڕۆژ نابینن، ڕزگاریان ببێت.

دەسا ئەی ئەو برایەی کە نیوەی تەندروستیی خۆی لەدەست داوە!

خوای گەورە - بە بێ ویستی خۆت - ئەو دوو بناغە کورت و ئاسانەی لە تۆدا داناوە کە ڕێگای ئەوەت بۆ تەخت و ئاسان دەکەن بە بەختەوەریی هەتاهەتایی شاد ببیت و، هەمیشە تەواوبوونی دنیا و لەناوچوونی ئادەمیزادت دەخەنەوە یاد. ئیتر، دوای ئەمە، "دنیا" ناتوانێت تەنگەنەفەست بکات و بتخنکێنێت و، بێئاگاییش پرکێشیی ئەوە ناکات کە پەردە بەسەر چاوەکانتدا بهێنێت. چونکە "دەروونی بەدخواز" ناتوانێت بەهۆی ئارەزووە نزمەکانیەوە کەسێکی نیوە ئادەمیزاد بخەڵەتێنێت.

ئیتر ئەو مرۆڤە بە زوویی لە شەڕ و فڕوفێڵەکانی ئەو دەروونە ڕزگاری دەبێت. ئیمانداریش - بەهۆی نهێنیی ئیمان و تەوەککول و ملکەچ بوونی بۆ فەرمانی خوای گەورە - بە ماوەیەکی کورت و لە ئازارێکی سەختی وەك "شەلەل"دا هێندە سوودی دەست دەکەوێت کە بە ئەندازەی ئەو سوودە ببێت دەست تێکۆشەرانی ئەهلی ویلایەت و وەرزشکارانی ڕۆح لەناو خەڵوەتگاکاندا دەکەوێت. دیارە ئەو کاتەش، لەبەر ئەو سوودانە، ئازارەکەی خۆی لەبەر چاودا کەم دەبێتەوە.

## دەرمانی بیست و سێهەم

ئەی نەخۆشی نامۆ و تەنیا و دەستەوسان!

ئەگەر، سەرباری نەخۆشیەکەت، نامۆییت و نەبوونی چاودێر و سەرپەرشتیکار لەم نەخۆشیەتدا، سەرنجی دڵە ڕەقەکانی جووڵاندبێت و میهرەبانی و بەزەیی ئەوانی بۆ لای تۆ ڕاکێشابێت، دەبێ ڕوانینی سۆز و بەزەیی پەروەردگاری میهرەبانت چۆن بێت کە لە سەرەتای سوورەتەکانی قورئاندا بە سیفەتی مەزنی: "الرحمن الرحيم" خۆیت پێ دەناسێنێت و، تەنها بە بریسکانەوەیەکی بەزەیی و میهرەبانیی دەراسای خۆی سەرجەمی دایکان دەخاتەکار لە خزمەتگوزاری و پەروەردەی ساوایاندا؟

ئەو خوایەی کە تەنها بە درەوشانەوە و پیشاندانی چمکێکی میهرەبانیی خۆی لە هەموو وەرزێکی بەهاردا سەرانسەری ڕووی زەوی دەڕازێنێتەوە و لە هەموو جۆرە زۆر و زەبەندە و ڕەنگینەکانی چاکە و نیعمەت و بەخششی خۆی پڕی دەکات و، تەنها

بـە درەوشـــانەوەیەکی میهرەبانی‌یەکەشـــی بەهەشـــتی بـــەرین - بـــە هـــەموو جوانـــی و ڕازاوەیی‌یەکی - بەرجەستە دەبێت..

جا تۆ بەهۆی ئیمانەکەتەوە پەیوەندیت بەو خوایـەوە کـردووە و ناسیوتە و، بـە زمـانی حـاڵی دەستەوسـانیت - کـە لـە نەخۆشی‌یەکەتەوە سـەرچاوەی گرتـووە - پـەنای بـۆ لا دەبەیـت و لێـی دەلاڵێیتـەوە و هـانـای بـۆ لا دەبەیت. خۆ هەمـوو ئەمـــانەش نـامۆیی و نەخۆشی و تەنیایی‌یەکەت دەکەن بەهۆی ئاوڕلێدانەوەی سۆز و میهرەبانیی ئەو خوایە و، کارێك دەکەن کە خواوەند بە چاوی میهر و بەزەیی‌یـەوە بـۆت بڕوانێـت، ئـەو ڕوانینـەی کە هەموو شتێك دەهێنێت!

خۆ مادەم خواوەند هەیە و بە چاوی سۆز و میهرەبانی‌یەوە بۆت دەڕوانێت، ئەوا هیــچ خەمێکت نـەبێت و، دڵنیابـە کـە هـەموو شتێکت هەیـە! تـەنیا و نـامۆی ڕاستەقینەش ئـەو کەسـەیە کـە پـەیوەندیی ئیمـان و ملکـەچیی بـەو خوایـەوە نـەبێت، یـان هـــەر گـوێ بـەو پەیوەندی‌یە نەدات!

## دەرمانی بیست و چوارەم

ئەی ئـەو کەسـانەی چـاودێریی منـاڵانی بێ‌گونـاهی نـەخۆش و ئـەو پیر و پەککەوتانـە دەکەن کە لـە ڕووی دەستەوسانی و لاوازی‌یەوە وەکو مناڵیان لـێ هاتووە!

دڵنیا بن کە بازرگانی‌یەکی بەپیت و گرنگی سەر بە ڕۆژی دوایی‌تان لە بەردەستدایە. دەسا فریای بکـەون و سـوودی لـێ وەربگـرن و بـە شـەوق و کۆششـێکی زۆرەوە هـەوڵ بدەن لە دەستان دەرنەچێت!

نەخۆشی‌یەکانی مناڵە بێ‌گوناهەکان لە ڕاستی‌دا بریتین لە دەرزی لێدانی پەروەردەی خـوایی بـۆ ئـەو مناڵانـە کـە دەمـارە نەرمـونیانەکانی ئـەوانی پـێ تونـدوتۆڵ دەکـات بـۆ ڕاهێنـان و بەرگـەگرتنی گیروگرفتـە سـەختەکانی دواڕۆژی ژیـان. لـە هـەمان کـاتدا ئـەو نەخۆشی‌یانە چەند دانست و سوودێکیان بۆ ژیانی دنیایان و ژیانی ڕۆحی‌یان تێدایە. واتە هـەروەك نەخۆشی ژیـانی مرۆڤـە گـەورەکان خـاوێن دەکاتـەوە و دەبێـــت بـــە کـەفارەتی گوناهەکانیان، بە هەمان جۆر ژیانی ئەو مناڵانەش پاڵفتەیەکی مەعنەوی دەکات.

ئـەم دەرزی‌لێدانـە مەعنەوی‌یانە بـۆ منـاڵان بناغـە و خولگـەی بەرزبوونـەوەی پلـەی مەعنەویی پاشەڕۆژی ئەم دنیای ئەو ساوایانەیە، تەنانەت هی دواڕۆژی قیامەتیشیان.

پاداشتی چـاودێری‌کردنی نەخۆشیی ئـەم منـاڵ و سـاوایانەش لـــە لاپـەڕەی کـردەوە چاکـەکانی دایـك و بـاوکدا دەنووسرێت، یـاخود هـەر لـە لاپـەڕەی کـردەوەی دایکـدا،

چونکە وەك لای ئـەهلی حەقیقـەت چەسـپاوە: دایـك - بـەهۆی نـهێنیی شـەفەقەت و میهرەبانی‌یەوە - تەندروستیی منالەکەی گەلـێ پێ باشترە لە هی خۆی!

سەبارەت بە چاودێری و خزمەتکردنی پیر و پەککەوتەکانیشەوە، ئـەوا لـە چـەند ڕیوایەتێکی صەحیح و چەند ڕووداوێکی مێژوویی‌یەوە دەرکەوتووە کە: چـاودێری‌یان - بـە تایبـەتی دایـك و بـاوك - و دڵخۆشـکردن و خزمـەتکردنیان بەوپـەڕی وەفـا و دڵسۆزی‌یەوە، سەرباری ئـەوەی کـە هـەموو ئەمانـە مایـەی دەستکەوتنی پاداشتی زۆر و دەستخستنی دوعـا و نزایانـە، بـە تایبـەت دوعـای دایـك و بـاوك، جگـە لەمـەش مـرۆڤ دەگەیەننە بەختەوەریی هەردوو دنیا.

ئەو منـاڵ و نـەوە گـوێ ڕایەڵـەی کـە لـەم چەشنە حاڵانـەدا خزمـەتی دایـك و بـاوکی پەککەوتەی دەکات و ڕەزامەندیی دڵیان بەدەست دەهێنێـت، خۆیشـی لـە کـاتی پیری‌دا هـەمان گـوێ ڕایـەڵی لـە مناڵ و نەوەکانیـەوە دەبینێـت و فریـای دەکـەوێت. بـەڵام ئـەو منالـەی دڵـی دایـك و بـاوکی تـەنگ دەکـات و ئەشـکەنجەیان دەدات، وێـڕای سـزای دواڕۆژی ئەودنیا، هەر لەم دنیاشدا دووچاری گەلـێ گیروگرفتی زۆر دەبێت.

بەڵێ، مەرج نی‌یە چاودێری کردنی ئەو پیر و پەککەوتە و مناڵ و ساوایانە تەنها لەبـەر ئەوە بێت کە خزم و کەسـوکاری ئـەو کەسـە بن خزمـەتیان دەکـات، بـەڵکو یـەکێك لـە داخوازی‌یە گرنگەکانی ئایینی ئیسلام ئەوەیـە کـە: هـەر کـاتێ مرۆڤـی بـاوەڕدار تووشـی پیرێکی نەخۆشـی موحتـاج و شـایانی ڕێـز بـوو، دەبێ بەوپـەڕی لێـبڕان و دڵسـۆزی‌یەوە خزمەتی بکات و دڵی بداتەوە، مادەم برایەتیی ڕاستەقینەی موسڵمانانە لە ئارادا بێت!

## دەرمانی بیست و پێنجەم

ئەی برایانی نەخۆش!

ئەگەر هەست دەکەن بەوەی کە پێویستتان بـە چارەسـەرێکی خـاوێن و بەسـوود و بـە دەرمـانێك هەیـە کـە لـەزەتی ڕاستەقینەی تێـدا بێـت و بـۆ چـارە کردنـی هـەموو دەردێـك دەست بدات، ئەوا تا دەتوانن ئیمانەکەتان بەهێز وخاوێن و درەخشان بکەن! واتە بەهۆی تەوبـە و لـە خـوا پاڕانـەوە و نوێـژ و پەرستشـەوە هێزوپێز بـە ئیمانەکـەتان بـدەن و، ئـەو چارەسەرە خاوێن و قودسی‌یە بەکاربهێنن.

ئەو کەسانەی کە بەهۆی خۆشەویستیی دنیا و دەسـتگرتنیان بە داوێنیـەوە دووچـاری بێ‌ئاگایی بوون، دەڵێی جەستەیەکی مەعنـەویی بیمـاری بـە ئـەندازەی دنیایـان لـەخۆیاندا هەڵگرتووە! لەم کاتەدا ئیمان دێـت بـە هانایانـەوە و دەرمـان و چارەسـەری شیفابەخشـی

خۆی پێشکەش بەو جەستەیە دەکات کە بە مشتەکۆڵە ئازاربەخشەکانی جودایی و نەمان زامدار بووە و، لەو برین و زامانە ڕزگاری دەکات.

لە چەندین پەیامدا چەسپاندوومانە کە: "ئیمـان" شیفای ڕاستەقینە دەبەخشێت. جا لەبەر ئەوەی درێژە بە باسەکە نەدەین، ئەوا بە پوختی و کورتی دەڵێم:

کاریگـەریی چارەسـەرییەکانی ئیمـان کـاتێك دەردەکـەوێت کـە بـەپێی توانـا "فـەرزەکان" بەجـێ بـهێنرێن و چـاودێری بکرێـن. بـە پێچەوانەشـەوە: (بـێ ئاگـایی و هـەرزەیی و شـوێنکەوتنی ئـارەزووی دەروون و گاڵتەوگـەپی نـاڕەوا) کاریگـەریی ئـەو چارەسەرییانە لا دەبەن.

خۆ مادەم نەخۆشی پەردەی بێئاگایی لا دەبات و ئیشـتیهای دەروون نـاهێڵێت و ڕێ لـە چوونـە ژوورەوەی لەزەتـە ناڕەواکـان دەگرێـت، ئـەوا ئێـوەش ئەمـە بـە هـەل بزانـن و سوودی لـێ وەربگـرن و، بـە: تۆبـە و داوای لێبـوردن و پاڕانـەوە و ئومێـد پـەیداکردن بـە "میـهرەبانیی خـوا" چارەسەرییەکانی ئیمـانی ڕاستەقینە و ڕووناکیـیـە قودسـییەکانی بەکاربهێنن.

لــە خــوای گــەورەی میــهرەبان دەپاڕێمــەوە کــە شــیفاتان پــێ ببەخشــێت و نەخۆشییەکانتان بکات بە کەفارەتی گوناهەکانتان.

ئامین.. ئامین.. ئامین.

﴿وقالوا الْحَمْدُ للهِ الَّذِي هَدانا لِهذا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدانا اللهُ لَقَــدْ جــاءَتْ رُسُلُ رَبِّنا بِالْحَقِّ﴾.

﴿سُبحانَكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللّهم صل على سيدنا محمد طب القلوب ودوائها، وعافية الأبدان وشفائها، ونــور الأبصار وضيائها، وعلى آله وصحبه وسلم.

* * *

## پاشکۆی بریسکەی بیست و پێنجەم

بریتییە لە "مەکتووبی حەڤدەهەم" کە لە کۆمەڵە پەیامی (مەکتووبات)دا بڵاو کراوەتەوە

# بریسکەی بیست و شەشەم

## پەیامی پیران

### ئەم بریسکەیە بریتی‌یە لە بیست و شەش ئومێد[1]

**بێدارکردنەوەیەك:**

ئەو هۆیەی هانی دام ئازارە دەروونی‌یەکانم لە سەرەتای ئومێدەکانی ئەم پەیامەدا بە شێوازێکی هێندە کاریگەر تۆمار بکەم کە تەنانەت زامی ئێوەش بکولێنێتەوە، تەنها نیازی روونکردنەوەی مەودای هێز و کاریگەریی لە رادەبەدەری چارەسەری‌یەکانی قورئانی پیرۆز بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم بریسکەیە - کە تایبەتە بە پیرانەوە - لە رووی دارشتنەوە هەتا سەر پارێزگاریی رەوتی جوان و شێوازی رێك و رەوانی خۆی نەکردووە. لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەمیان:

ئەم پەیامە تایبەتە بە رووداوەکانی ژیانی خۆمەوە. دیارە گەرانەوەی ئەندێشەم بۆ ئەو کات و سەردەمانەی رابوردوو، هەروەها ژیان بەسەر بردن لەگەڵ رووداوەکانی‌دا و

---

(١) نووسەر لە نوسخەیەکدا کە بە دەستخەتی خۆی هەڵەگیریی لەسەر کردووە، ئەم پەراوێزەی خوارەوەی لێرەدا نووسیوە:
لەبەر رووداني موسیبەتەکە (بەندیخانەی ئەسکی شەهر) پاشماوەی ئومێدەکانی تر (واتە: لە ئومێدی حەڤدەهەمەوە تا بیست و شەشەم) نەنووسران. ئنجا لەبەر ئەوەش کاتەکەی بەسەرچووبوو ئەوا ئەم پەیامە بە ناتەواوی مایەوە.

پاشان نووسینەوەیان لە حاڵێکی وادا، بوو بە هۆیەکی نارێکیی لایەنی ڕەوانی و دەربڕینەکان لەم پەیامەدا.

دووهەمیان:

ڕوونکردنەوەکە هەندێ ئاڵۆزیی تێکەڵ بوو، چونکە نووسینی ئەم پەیامە لە پاش نوێژی بەیانی بوو، کە هەستم بە ماندووبوونێکی زۆر دەکرد. جگە لەوەی کە ناچاریش بووین پەلە لە نووسینیدا بکەین.

سێ‌هەمیان:

کاتێکی فراوانمان بۆ ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەیەکی سەرتاسەریی پەیامەکە بەدەستەوە نەبوو، چونکە تەنها یەك نووسەرەوەم لە لابوو کە ئەویش گەلێ کاروباری "پەیامەکانی نوور"ی بەسەردا کەوتبوو. تەنانەت هەندێ جار پۆزشی دەهێنایەوە و نەیدەتوانی ئامادە بێت. ئەمەش بوو بەهۆی لەدەستدانی ڕێکوپێکیی پێویست لەم پەیامەدا.

چوارەمیان:

مەگەر ڕاستکردنەوە و پێداچوونەوەیەکی سەرپێیی، دەنا بە قووڵی لە واتاکانی ورد نەبووینەوە. چونکە دوای دانانی بە تەواوی هەستمان بە ماندووبوون دەکرد. دیارە ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە هاودەم لەگەڵ نووسینی بابەتەکەدا، هەندێ ناتەواوی لە دەربڕینەکانی‌دا سەر هەڵبدات.

لەبەر هەموو ئەمانە، تکا لە پیرە بەڕێزەکان دەکەم بە چاوی لێبووردنەوە بڕواننە کەموکووڕی‌یەکانم و، منیش بەشداری دوعاکانیان بکەن کاتێ لە دەرگانەی ئەو خواوەندە میهرەبان و خاوەن سۆز و بەزەیی‌یەدا دەستەکانیان بەرز دەکەنەوە کە نزا و پاڕانەوەی ئەو پیرە بەڕێزانە ناگێڕێتەوە دواوە.

بسم الله الرَّحـــمنِ الرَّحيمِ

﴿كهيعص * ذِكْرُ رَحْـمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا * إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيّاً * قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً﴾ (مريم:١-٤)

### ❐ ئومێدی یەکەم:

ئەی ئەو کەسانەی گەشتوونەتە تەمەنی کاملی! ئەی خوشك و برا ئازیز و بەڕێزە پیرەکانم!

منیش وەکو ئێوە پیرێکی بەساڵاچووم! وا دەمەوێت هەندێ لەو حاڵەتانەی کە بەسەرمدا هاتوون و ئەو دەرگایانەی هیوا و ئومێدیش کە لە پیری‌دا لێـم کراونەتەوە، بۆ ئێوەی بەڕێزیان بنووسم. تاکو ئێوەش لەگەڵ خۆمدا لەو دڵدانەوە نوورانی‌یانە بەشدار بکەم کە لەو هیوا و ئومێدانەوە تیشك دەدەن و دەبریسکێنەوە.

گومانی تێدا نی‌یە کە ئەو ڕووناکی‌یانەی من بینیمن و، ئەو دەرگا نوورانی‌یانەش کە لە من کرانەوە، بە گوێرەی توانا و لێهاتنی پەرێشان و ناتەواوی خۆم بوون، پشت بەخوا ئامادەیی پاك و بێ گەردی ئێوەی بەڕێز ئەو ڕووناکی‌یەتان جوانتر و درەخشانتر پیشان دەدات و، ئومێد و هیواکانیشتان توندوتۆڵ و بەهێزتر دەخاتە بەردەم.

بێ گومان سەرچاوەی ئەو ڕووناکی‌یانە و، گەنجینەی ئەو هیوا و ئومێدانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین، تەنها هەر "ئیمان"ە.

### ❐ ئومێدی دووهەم:

لە سەرەتای پیریمدا و لە ڕۆژێکی پایز و دەمی عەسردا لەسەر لوتکەی چیایەکەوە دەمڕوانی‌یە دنیا. لە پڕ لە ناخی دەروونمدا هەستم بە حاڵەتێکی یەکجار ناسك و خەماوی و تاریك کرد! چونکە بینیم: وا من بەساڵدا چووم و، ئەمڕۆش پیر بووە و، ساڵیش لە کاملیدایە و بەرەو پیری دەڕوات. تەنانەت دنیا خۆیشی پیر بووە! لە ڕاستی‌دا ئەم پیری‌یەی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە بە تەواوی ڕایتەکاندم و تەزووی بە هەموو جەستەمدا هێنا. چونکە تێ گەیشتم کە وادەی جودایی دنیا و دووریی یارانی خۆشەویستم لێ نزیك بووەتەوە!

لەم کاتەدا کە من بەم پەژارە و نائومێدی‌یەوە دەتلامەوە، "میهرەبانیی خواوەند"م لە ناکاودا لێ دەرکەوت و، ئەو خەم و خەفەتە زۆر و جودایی‌یە ئازاربەخشانەی بۆ گۆڕیم بە دڵخۆشی و شادمانی و نوورێکی درەخشانی ئەوتۆ کە هەموو سووچ و قوژبنێکی دەروونمی ڕووناك کردەوە.

بەڵێ هاوتەمەنە پیرەکانم!

ئەو خواوەندە گەورە و باڵادەستەی کە لە سەد شوێن زیاتر لە قورئانی پیرۆزدا بە سیفەتی: "الرحمن الرحیم" خۆیمان پێ دەناسێنێت.. ئەو خوایەی کە هەمیشە بەو نیعمەتانەی دەیانڕێژێتە سەر زەوی، میهرەبانی‌یەکەی خۆی دەردەخات و دەینێرێت بە هانا و یارمەتیی هەر زیندەوەرێك کە پەنای پێ بردبێت و پێویستی بە سۆز و بەزەیی ئەو بێت.. ئەو میهرەبانەی کە لە وەرزی بەهاری هەموو ساڵێکدا و لە جیهانی پەنهانی "غەیب"ەوە دیاریی نیعمەتە زۆر و لە ژمارە بەدەرەکانی خۆی بۆ ئێمەی دەست کورت و موحتاجی ڕۆزی و بە گوێرەی پلەکانی لاوازی و دەستەوسانیمان دەنێرێت و، بەمەش میهرەبانی‌یە گشتی‌یەکەی خۆیمان بە ڕوونی و درەخشانی بۆ دەردەخات..

جا سۆز و بەزەیی ئەم بەدیهێنەرە میهرەبانەمان، مەزنترین ئومێد و گەورەترین هیوا و ڕووناکترین نووری سەردەمی پیریمانە!

هەست پێ کردن و دەستکەوتنی ئەو میهر و سۆز و بەزەی‌یەش تەنها بە پەیوەندی بوون دەبێت لەگەڵ ئەو "میهرەبان"ەدا بەهۆی: "ئیمان" و "گوێ ڕایەڵی" و "بەجێهێنانی فەرزەکان"ەوە.

## ❐ ئومێدی سێ‌هەم:

کاتێ لە بەرەبەیانی پیری‌دا لە خەوی شەوگاری لاوی بێدار بوومەوە، سەرنجم لە خودی خۆم دا، بینیم وا بە خێرایی لە لوتکەی بەرزایی‌یەکەوە بەرەو دەرگای گۆڕەکەم بەردەبمەوە، وەك "نیازیی میسری"[1] لە وەسفی ئەم چەشنە حاڵەتەدا دەڵێت:

---

(١) نیازیی میسری (١٦١٨-١٦٩٤ز) شاعیرێکی سۆفی‌یە، لە گوندێکی سەر بە پارێزگەی "مەلاتییە"ی تورکیا لە دایك بووە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە: "میسری". کە لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبوولدا، هەر لەوێش تەریقەتی "خەڵوەتی"ی دامەزراندووە کە پێشی دەوترێت: "تەریقەتی نیازی" و "تەریقەتی میسری". جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"، "عوائد الاحسان"، "هدایة الاخوان". (وەرگێڕ)

لە گەرمەی خەوی غەفڵەتی "گیان"م
ڕووخا بەرد بەردی کۆشکی "ژیان"م!

بەڵێ، ئەو جەستەیەی کە خانە و لانەی گیانمە، بە درێژایی ڕۆژگار یەك لە دوای یەکی بەردەکانی داکەوتن.. ئەو هیوا و ئاواتانەش کە بە توندی منیان بە دنیاوە بەستبوو، هەموویان پچڕان و لەت لەت بوون! لەمەوە هەستم بە نزیکبوونەوەی وادەی جودایی و لێکدابڕانم کرد لەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی کە لەژمارەنایەن.

لەبەر ئەوە، کەوتمە گەڕان بە دوای تیماری ئەم برینە مەعنەوی‌یە قووڵەی کە وا دیارە دەرمانی نی‌یە. بەڵام هیچ چارەسەری‌یەکم دەستگیر نەبوو. لە ناچاری‌دا منیش وەك "نیازی" وتم:

"دانست" خوازیاری فەنای جەستەمە
"ئەبەد" ئاواتی دڵی خەستەمە
دەروونم کەیلی پەژارە و دەردە
لوقمان سەرسامە و تیمار ئەستەمە

لەم کاتەدا کە من بەم حاڵەوە دەتلامەوە، لە ناکاودا نووری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ﷺ کە ئەمیندار و نموونە و بانگەوازکار و زمانی میهرەبانیی خوای گەورەیە، هاودەم لەگەڵ شەفاعەت و ئەو دیاری‌یەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە و بریتی‌یە لە ڕێنمایی کردنی مرۆڤایەتی، بوون بە مەڵهەم و دەرمانێکی سارێژکاری دەردە بێ دەرمانەکەم و، ئەو نائومێدی‌یە ڕەشەیان بۆ گۆڕیم بە ئومێدێکی ڕووناکی درەخشان!

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیرم و ئەی ئەوانەی کە وەك من هەست بە پیری دەکەن!

ئێمە کۆچ دەکەین و هیچ ڕێگا چارەیەکی ترمان نی‌یە و، هەرگیز ڕێی مانەوەمان نادرێت. کەواتە هیچ سوودێك لە خۆفریودان و چاونووقاندن وەرناگرین و، دەبێ بەرەو چارەنووسی دیاری‌کراوی خۆمان بڕۆین. بەڵام دەبێ بزانین کە هەرگیز جیهانی بەرزەخ وەکو ئەو گومانە تاریکە نی‌یە کە "بێ‌ئاگایی" پیشانمان دەدات و "گومڕایان" دەیدەن بە گوێماندا. جیهانی بەرزەخ جیهانی جودایی و شەوەزەنگ نی‌یە. نەخێر، بەڵکو جێی کۆبوونەوەی خۆشەویستان و جیهانی بەدیدار شادبوونەوەی یاران و خۆشەویستانە، کە لە پێشەنگیانەوە پێغەمبەری خۆشەویستی خوا و شەفاعەتکاری ڕۆژی دواییمانە، هەزاران دروودی خوای لەسەر بێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بە درێژایی هەزار و سێسەد و پەنجا ساڵ لە هەموو چەرخێکدا سەرداری سێسەد و پەنجا ملیۆن کەسە و، پەروەردەکاری گیان و ڕابەری ژیری و خۆشەویستی دڵیانە.. ئەو کەسەی کە بەپێی ناوەڕۆکی: "السبب كالفاعل" هەموو ڕۆژێك بە ئەندازەی کردەوەی چاکی ڕۆژانەی نەتەوەکەی "چاکە" دەخرێتە سەر لاپەڕەی کردەوەکانی.. ئەو کەسەی کە خولگەی مەبەستە پەروەردگارییەکان و تەوەرەی ئامانجە گەورە و بەرزەکانی خواوەندە لە گەردووندا.. ئەو کەسەی کە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی بوونەوەرە، کە پێغەمبەری سەرداری ئیسلامە ﷺ.. هەروەك لە سەرەتای شەرەفدار بوونی جیهاندا بە پێغەمبەرایەتی‌یەکەی دەیفەرموو: "أمتي.. أمـــتي"، وەك لە هەندێ "ڕیوایەتی صەحیح" و لە چەندین "کەشفی" ڕاستی پیاوچاکانەوە دەرکەوتووە، هەر ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لە حەشریشدا و لەو کاتەی کە هەرکەسەو لە هەوڵی خۆیدایە و دەڵێت: "نفسي.. نفسي" ئەو بۆ شەفاعەتی نەتەوەکەی لێ دەبڕێت و دەفەرموێ: "أمتي.. أمـــتي" و، بە گەورەترین و بەرزترین و خاوێنترین بەزەیی و لێبڕانەوە دەکەوێتە هەوڵ و کۆشش بۆ فریاکەوتنی نەتەوەکەی[1].

کەواتە ئێمە - ئەی برایانی پیرم! - بەرەو جیهانێك دەڕۆین کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ کۆچی بۆ کردووە.. ڕووەو ئەو جیهانە دەگوێزینەوە کە بە نووری ئەو چرا ڕووناکە ﷺ و ڕۆشنایی ئەستێرەکانی دەوروبەری، لە ئەولیا و پیاوچاکە لە ژمارە بەدەرەکان، ڕووناك بووەتەوە.

بەڵێ، هەر تەنها پەیڕەوی کردنی "سوننەت"ە خاوێن و پیرۆزەکانی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەیە ﷺ کە مرۆڤ دەخاتە ژێر ئاڵای شەفاعەتەکەی و، لەو نوورەی ئەوی بەش دەدات و، لە تاریکیی بەرزەخیش ڕزگاری دەکات.

## □ ئومێدی چوارەم:

کاتێ کە یەکەم هەنگاوم نایە ناو دەرگای پیرییەوە، تەندروستیی جەستەشم - کە درێژە بە خەوی "بێئاگایی" دەدات - تێکچوو بوو.

بەم جۆرە، "پیری" و "نەخۆشی" یەکیان گرت و پێکەوە هێرشیان کردە سەرم و، تا ئێستایش بە دوو قۆڵی لێم ڕاست بوونەتەوە و زللەی یەك لە دوای یەك لە سەر و گوێلاکم دەسرەوێنن. تا بە تەواوی خەوی "بێ ئاگایی"یان لێ زڕاندم.

(١) ئیمامی "بوخاری" و "موسلیم" لە ئەبووهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە. (وەرگێر)

ئنجا هیچ شتێكی وەك ماڵ و مناڵیشم نەبوو تا بە دنیاوە بـمبەستنەوە. لەبەر ئەوە، كە سەیری ئەنجامی سەرمایەی تەمەنی خۆمم كرد - كە بەهۆی بێئاگایی سەردەمی لاویم لـە دەستم دەرچوو - بینیم هەر تەنها تاوان و گوناهبارییە! لەم كاتەدا منیش وەكـو "نیـازیی میسری" هاوارم لـێ هەڵسا و، وتم:

بە دەسـتی خـاڵی ڕێـگام گـرتـەبەر
بـە بـێ ئاگایـی و ڕەنجـی بێ سـەمەر
لـە كاروان جێمـاو، نـامـۆ و ئـاوارە
سـەرمایەی ژینـم ڕۆیشـت بە هەدەر

* * *

تـەنهـا لافـاوی فـرمێسـكـی چـاوم
قرچەی سـووتاویی تاسـەی هەناوم
هـاودەمی گەشـتی تەنیایی مـن بوون
سەرباری "ژیری"ی سەر لـێشێواوم

لـەو دەمەشـدا لـە نامۆیی‌یـەكی سـەختدا دەژیـام. بۆیـە هەستم بـە پەژارە و نـائومێدی دەكرد و، لـە حەسرەت و پەشیمانیی ڕۆژانی ڕابوردووی تەمەنمدا بـووم. لـە تـاوا بـەدەم داد و هاوارەوە داوای یارمەتیم دەكرد و لە دووی ئومێدێكدا دەگـەڕام كـە دڵـم ڕوونـاك بكاتەوە..

لـە ناكـاودا قورئـانی پیرۆزی ئیعجازبەخش ئـاوری سۆزی لـێ دامـەوە و، دەسـتی یارمەتیی بۆ درێژ كردم و دەرگایەكی گەورەی هیوا و ئومێدی بـۆ خسـتمە سەرپشـت و، نوورێكی هێندە ئومێدبەخش و درەخشانی پێ بەخشیم كە ئەگـەر ئـەو نائومێدی‌یـەم سـەد ئەوەندەش زیاتر و گەورەتر بوایە هـەر هـەمووی دەرەوانـدەوە و دەوروبـەرمی بـۆ ڕوونـاك دەكردمەوە.

بەڵێ، ئەی خوشك و برایانی پیری بەڕێزم!

ئەی ئەو كەسانەی كە وەك من هەموو پەیوەندی‌یەكتان لەگەڵ دنیادا پچڕاوە!

ئایا دەگونجێ: "كردگـاری شـكۆمەند" كـە ئـەم دنیایـەی وەك شـارێكی ڕێكوپێـك و، چەشنی كۆشك و تـەلارێكی ڕازاوە بنیـات نـاوە، لەگـەڵ میوانـە ئازیزەكـانی ئـەم شـار و كۆشكەی خۆیدا نەدوێت، یان ڕوویان تێ نەكات؟

خۆ مادەم خوای گـەورە ئـەم کۆشکەی بـە زانیـاریی خـۆی بنیـات نـاوە و بـە ویسـتی خۆیشی ڕێکی خستووە و ڕازاندوویەتیەوە، ئەوا دەبێ لەگەڵ دانیشتووانیشـیدا بدوێـت، چونکە هەروەك "وەستا زانایە" بە هەمان جۆر "زاناش گۆیایە"!

ئنجا مـادەم ئـەم کۆشـکەی کـردووە بـە میوانخانەیـەکی ڕەنگـین و ئـەم شـارەش بـە مەڵبەندێکی جوانی بازرگانی، ئەوا دەبێ هـەر ئـەو خوایـە نامـە و پرۆگرامـی دانـابێت بـۆ ڕوونکردنەوەی داخوازییەکانی و جۆری پەیوەندییەکانی لەگەڵماندا.

گومانیش لەوەدا نییە کـە پەسـەندترین و ڕێکـترینی ئـەو نامـە و کتێبانـەی نـاردوونی: تەنـها "قورئـانی پـیرۆز"ی خـاوەن ئیعجـازە کـە بـە چـل شـێوە ئیعجازەکـەی چەسـپاوە و سەلمێنراوە[1] و، بە لای کەمەوە لە هەموو خولەکێکدا بەسەر زاری سەد ملیـۆن کەسـەوە دەخوێنرێتەوە و، ڕووناکی پەخش دەکات و، ڕێی ڕاست پیشـانی خـەڵکی دەدات و، لـە بەرامبەر خوێندنەوەی هەر پیتێکیەوە بە لای کەمەوە (دە) دانە چاکە و، لە هـەندێ کـاتدا (دە هـەزار) و تەنانـەت (سی هـەزار) – وەك لـە شـەوی "قـەدر"دا – بـۆ خوێنەرەکـەی دەنووسرێت.

بـەم جـۆرە "قورئـانی پیرۆز" هـەر لـەم دنیایـەدا بـەروبوومی بەهەشـت و ڕوونـاکیی بەرزەخمان پێ دەبەخشێت.

جا ئایا لـە هـەموو گـەردووندا هیـچ کتێبێـك هەیـە بەربـەرەکانێی ئـەم پلەیـەی قورئـان بکات و هیچ کەسێکیش هەیە بتوانێت ئەم لافە لـێ بدات!

کەواتە مادەم ئەم قورئانە پـیرۆزەی کـە لـە بەردەستماندایە "گوفتـاری پـەروەردگاری هـەموو جیهانـەکان"ە و.. فەرمانـەکانی ئـەون بـە ئێمـە ڕاگەیـەنراون و.. سـەرچاوەی میهرەبانییە فراوانەکەیەتی کە هـەموو شتێکی گرتووەتـەوە و.. قورئانێکـە لـە ڕوانگـەی ڕەهـایی پـەروەردگاریتی و گـەورەیی خوایـەتی و فراوانـی و گشـتگیریی میـهرەبانیی بەدیهێنەری شکۆمەندی ئاسمانەکان و زەوییەوە سەرچاوەی گرتووە..

مادەم وایە، ئـەوا هـەتا دەتوانیـت دەسـتی پێـوە بگـرە و بـەری مـەدە. چونکـە دەرمـانی هەموو دەرد و ڕۆشنایی هەموو تاریکی و هیوای هەموو نائومێدییەك تەنها لەودایە.

کلیلی دەرگای ئەم گەنجینـە هەمیشـەییەش بریتییـە لـە: ئیمـان و، تەسـلیم بـوون و، گوێ بیستی و ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی و، لەزەت چەشتن لە خوێندنەوەی.

---

(١) نووسەر لێرەدا ئاماژە بۆ پەیامی "موعجیزاتی قورئـانی" دەکـات کـە وتـەی بیسـت و پێنجـەمی پەیامـەکانی نوورە. (وەرگێڕ)

## ❑ ئومێدی پێنجەم:

لە سەرەتای پیریمدا حەزم لە گۆشەگیری و تەنیایی دەکرد لە سەر گردی "یووشەع"، کە بەسەر گەرووی "بسفۆڕ"دا دەڕوانێت و، "گیان"یشم بە دوای ئاسوودەیی گۆشەگیری و تەنیاییدا عەودالْ بوو..

ڕۆژێکیان لەسەر لوتکەی ئەو گردە ناوبراوە بەرزەوە سەیری ئاسۆکانی دنیام دەکرد. لە ناکاودا هەڕەشەی "پیری" تابلۆیەکی لەو تابلۆ ناسك و خەمناکانەی جودایی و نەمانی پیشاندام. کە سەرنجی ئەو تابلۆیەم دا، بینیم هەر لە چڵەپۆپەی لقی چڵ و پێنجەمی درەختی ساڵەکانی تەمەنمەوە تا قووڵترین ڕەگ و ڕیشەی چینەکانی ژێرەوەی ژیانم، هەموویانم بە تەرمی ئەو دۆست و خۆشەویستانەم دەهاتە پێش چاو کە لە ژمارە نایەن و ئەوانەش کە لە ماوەی ژیانمدا پەیوەندیم لەگەڵیاندا بووە!

لە ناو حەسرەت و پەژارەی جودایی یاران و خۆشەویستاندا، ئەم نالەیەی "فزوولیی بەغدادی"م[1] لەبەر خۆمەوە وتەوە کە لە دەمی جودایی خۆشەویستانیدا وتویەتی:

لەگەڵ یادی وەسڵی تۆدا
فرمێسکی گەش دەبارێنم
تا هەناسەی ژینم مابێت
بە یادی تۆ دەناڵێنم!

لە ناوەندی ئەو هەموو خەفەت و حەسرەتە قووڵانەدا بە دوای دەرووەیەکی ئومێد و کلاوڕۆژنەیەکی ڕووناکیدا دەگەڕام کە دڵی خۆمی پێ بدەمەوە. لەپڕ نووری: "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" هات بە هانامەوە!

بەڵێ، ئەم ئیمانە نوورێکی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە هەرگیز کوژانەوەی نییەو، ئومێدێکیشی خەڵات کردم کە هەرگیز خامۆش نابێت.

بەڵێ خوشك و برا پیرەکانم!

مادەم "ڕۆژی دوایی" هەیە و هەمیشەییە و لە دنیا جوانترە.. مادەم ئەو خوایەی کە ئێمەی بەدی هێناوە خوایەکی دانا و میهرەبانە، ئەوا دەبێ سکاڵا لە دەست پیری

(١) "فزوولیی بەغدادی" شاعیرێکی تورکە لە سەدەی شازدەهەمی زایینیدا ژیاوە و، ناوی "محەممەد"ە، ئەم شاعیرە دەورێکی کاریگەری بووە لە ئەدەبی تورکیدا و، بە دامەزرێنەری ئەدەبی ئازەریی تورکی دادەنرێت. بە زمانەکانی: تورکی و فارسی و عەرەبی شیعری وتووە. چەند بەرهەمێکی هەیە یەکێك لەوانە: "لەیلا و مەجنوون"ە، لە ساڵی ١٥٥٥زدا بە تاعوون کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

نەکەین و لێیشی بێزار و وەڕس نەبین. چونکە ئەو پیرییەی کە ئاوێتەی "ئیمان" و "پەرستش"ە و مرۆڤ کامڵ دەکات، نیشانەی کۆتایی هاتنی فەرمانبەریێتی و ئەرکەکانی ژیان و کۆچکردنی مرۆڤە بەرەو جیهانی پڕ لە میهرەبانی، بۆ پشوودان و حەوانەوە. کەواتە دەبێ زۆر پێی ڕازی بین و تەنانەت مایەی خۆشحاڵیمان بێت!

بەڵێ، سەد و بیست و چوار هەزار لە مرۆڤە هەڵبژاردەکانی گرۆی ئادەمیزاد کە پێغەمبەرانن - دروودی خوایان لەسەر بێت - (بەپێی دەقی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ)[1] کە هەندێکیان پشت بە "شهوود" دەبەستن و هەندێکیتریشیان لە ڕوانگەی "حق الیقین"ەوە دەدوێن.. هەموو ئەوانە، بە گشتی و یەکدەنگ هەواڵی بوونی ڕۆژی قیامەتمان دەدەنێ و ڕایدەگەیەنن کە: سەرجەمی خەڵکی دەدرێنە بەر بۆ ئەو ڕۆژە و، خوای باڵادەست هەروەك بەڵێنی داوە بە بێ گومانیش ڕۆژی دوایی دەهێنێتە کایەوە..

ئنجا ئەم مژدە و هەواڵەی کە ئەو پێغەمبەرە سەروەرانە - درووديان لەسەر بێت - ڕایانگەیاند، سەد و بیست و چوار ملیۆن ئەولیاش بە "کەشف" و "شهوود" و "علم الیقین" دیویانە و ڕاستییەکەیان دەرخستووە و شایەتییان لەسەر داوە. ئەم شایەتیدانەشیان بەڵگەیەکی گومانبڕی بەهێزە لەسەر بوونی "ڕۆژی دوایی"..

هەروەها درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری گەردوون، کە بە سەرانسەی جیهانەوە دیار و درەخشانن، داخوازی بوونی جیهانێکی هەمیشەیین و بەڵگەیەکی ئاشکرای ڕۆژی دواین..

بەڵگەیەکی تری ڕۆژی دوایی، ئەو "توانا ئەزەلی" و "دانستە ڕەها ئەبەدی"یەی خوای گەورەیە کە هەموو ساڵێك لە وەرزی بەهاردا بە فەرمانی: "کن، فیکون" تەرمی ئەو درەختە لەژمارەبەدەرە وشك و مردووانەی سەر ڕووی زەوی زیندوو دەکاتەوە و دەیانکات بە نیشانە و بەڵگەی: "زیندووبوونەوەی پاش مردن" و، سێ سەد هەزار جۆر لە زیندەوەر و ڕووەك زیندوو دەکاتەوە و، بەمەش سەدان هەزار نموونەی حەشر و نەشر و بەڵگەی ئاخیرەتمان بۆ دەردەخات..

هەروەها ئەو "میهرەبانی"یە فراوانەی خوای گەورە کە درێژە بە ژیانی ئەو گیاندارانە دەدات پێویستیان بە ڕۆزییە و، بە کەماڵی میهرەبانی و بە شێوەیەکی تابڵێی دەراسا

---

(١) عن أبي أمامة، قال أبو ذر: "قلت: يا رسول الله كم وفاء عدة الأنبياء؟ قال: مائة ألف وأربعة وعشرون ألفاً، الرسل من ذلك ثلاثمائة وخمسة عشر جماً غفيراً". رواه الإمام أحمد (مشكاة المصابيح ١٢٢/٣ ت ٥٧٣٧ قال المحقق: حديث صحيح) وانظر زاد المعاد المحقق ٤٣/١. (وەرگێر)

دەیانژیێنێت.. هەروەها ئەو "چاودێری"یە بەردەوامەی خواوەندیش کە لە ماوەیەکی کەم و وەختێکی کورتی وەك وەرزی بەهاردا چەندەها جۆری جوانی و ئارایشتکاریی لەژمارەبەدەری هەمەڕەنگمان پیشان دەدات. بێ گومان ئەم "میهرەبانی" و "چاودێری"یەش بە چەشنێکی بەڵگەنەویست داخوازی "بوونی ڕۆژی دوایی"ن..

هەروەها "ئەوینی مانەوە" و "تاسەی هەتاهەتایی" و "ئاواتە هەمیشەییەکان"یش کە لە مرۆڤدا ڕەگیان داکوتاوە و بە تەواوی جێی خۆیان لە ناخی ئەم مرۆڤەدا کردووەتەوە کە: ڕێکوپێکترین بەروبوومی ئەم بوونەوەر و گەردوونەیە و خۆشەویستترین بەدیهاتووی بەدیهێنەریەتی و پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ سەرجەمی بوونەوەرانی گەردووندا هەیە. بێ گومان ئەم تاسە و ئەوین و ئاواتانە، ئاماژە بۆ بوونی جیهانێکی هەمیشەیی پاش ئەم جیهانە بڕاوەیە دەکەن و، بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی و خانەی بەختەوەریی هەمیشەیین.

هەموو ئەو بەڵگانەی کە باس کران، تا ڕادەی باوەڕ پێ کردن و بە ئەندازەی ئاشکرایی و بەڵگەنەویستیی بوونی ئەم جیهانە بینراوە، بوونی "ڕۆژی دوایی" دەچەسپێنن و ئاشکرای دەکەن[1].

جا مادەم وانەی "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" گرنگترین وانەیە کە قورئانی پیرۆز بە ئێمەی دەڵێتەوە و، ئەم ئیمانەش بەم چەشنە و تا ئەم ڕادەیە جێگیر و دامەزراوە و، خاوەنی بەڵگەی ئاوا بەرز و توندوتۆڵە و.. ئنجا ئەو نوور و ئومێد و دڵدانەوانەش کە لە ئیماندان

---

(١) ئاسانیی چەسپاندنی هەواڵێکی "ئیجابی" و دژواریی "نەفی" کردنیشی لەم نموونەیەوە دەردەکەوێت:

ئەگەر یەکێك وتی: (لە سەر زەویدا باخچەیەك هەیە بەروبوومەکانی وەك قوتووی شیر وایە)! یەکێکی تریش لە بەرپەرچیدا وتی: (شتی وا نییە)! ئەوا یەکەمیان دەتوانێت تەنها بە پیشاندانی جێی ئەو باخچەیە، یان بە پیشاندانی هەندێ لە بەروبوومەکەی، قسەکەی بە ئاسانی بچەسپێنێت.

بەڵام دووهەمیان دەبێ هەموو سەرزەوی بگەڕێت و بیپشکنێت و، بەمەش بیچەسپێنێت کە باخچەی وا نییە! (دیارە ئەمەش کارێکی ئاسان نییە)..

هەروەها سەبارەت بەوانەش کە هەواڵی بوونی ڕۆژی دوایی و بەهەشتمان دەدەنێ، هەزاران بەڵگە و بەروبووم و ئەنجامی ئەو بەهەشتەمان پیشان دەدەن، لە کاتێکدا کە دوو شایەتی ڕاستگۆ سەروزیادە بۆ سەلماندنی قسەکەیان.

بەڵام ئەوانەی کە ئەمە ناسەلمێنن، دەبێ ئەم بوونەوەر و زەمانە یەکجار فراوانە بپشکنن و هەموویان بگەڕێن، ئەوجا گەر بەهەشتیان نەدۆزیەوە، دەتوانن قسەکەیان بە بەڵگەوە بچەسپێنن!

جا برایانی پیرم! فەرموون سەیری گەورەیی هێزی "ئیمان بە ڕۆژی دوایی" بکەن و، بزانن چەندە پاڵپشتێکی پتەوی دامەزراوی چەسپاوە! (دانەر)

هێندە بەهێزن کە ئەگەر سەد هەزار "پیری" لە یەك کەسدا کۆببنەوە هەر سەروزیادی پێ بەخشینی دڵنەوایی و ڕووناك کردنەوەی هەموویان دەبێت.. ئەوا دەبێ ئێمەی پیری بەساڵاچوو بە پیرییەکەمان دڵخۆش و شادمان بین و هەمیشە بڵێین:

"الحــــمد لله على كمال الإيمان".

**❑ ئومێدی شەشەم:**

ئەو دەمەی لە شوێنی ڕەهەندەبوونم - کە دیلییەکی ئازاربەخش بوو - بە تەنیایی لەسەر لوتکەی چیای "چام" دەژیام، کە بە سەر سەوزەڵانیی "بارلا"دا دەڕوانێت.. لەو تەنیایی و گۆشەگیرییەدا بە شوێن نوورێکدا دەگەڕام کە دڵم ڕووناك بکاتەوە.

شەوێکیان لەو ژوورە بچکۆلە سەرنەگیراوە دانیشتبووم کە لەسەر درەختێکی سنەوبەری سەر لوتکەی ئەو چیایە (بە تەختە) دروست کرابوو. کتوپڕ پیرییەکەم چەندین جۆری غەریبیی خستە پێشچاوی هەست و شعوورم، وەك ئەوەی کە لە مەکتووبی شەشەمدا بە ڕوونی باس کراوە. چونکە لە هێمنی و کپیی ئەو شەوەدا جگە لە زایەڵەی خەمناکی خشەی گەڵای دارەکان هیچ دەنگێکی تری تێدا نەدەبیسترا، هەستم کرد ئەو زایەڵەیە سەرجەمی هەست و نەستەکانم و ناخی پیری و غەریبیمی پێکا و، بە گوێی دڵمدا چرپاندی و وتی:

(هەروەك ڕۆژی ڕووناك بوو بەم گۆڕە تاریکە و دنیا کفنی ڕەشی پۆشی، ڕۆژگاری تەمەنیشت - بە هەمان جۆر - شەوی بەسەردا دێت و، ڕۆژگاری دنیاش دەگۆڕێت بە شەوگاری بەرزەخ و، ڕۆژی هاوینی ژیانیش دەبێت بە شەوی زستانی مردن)!

"دەروون"یشم بە خەفەتەوە لە وەڵامدا وتی:

(ڕاستە، من لێرەدا نامۆ و دوور لە شار و نیشتمانی خۆمم. بەڵام جودایی خۆشەویستانی درێژایی تەمەنم کە لە پەنجا ساڵ تێپەڕ بووە و لە فرمێسك ڕشتن بە دوایاندا هیچی تر شك نابەم، نامۆیییەکی گەلێ دژوارترە لە نامۆیی نیشتمان. تەنانەت ئەم شەو من هەست بە غەریبییەك دەکەم کە ئازارەکەی گەلێ زیاترە لەچاو غەریبیی سەر لوتکەی ئەم چیایە کە ئەویش پۆشاکی نامۆیی وخەفەتی پۆشیوە! چونکە "پیری" هەڕەشەی نزیکبوونەوەی کاتی جودایی تەواوەتی و کۆچی دواییم لەم دنیایە لێ دەکات).

لەتاوا، هەر لە ناوەندی ئەم نامۆیی‌یەی کە خەفەت گەمارۆی داوە و ئەم خەفەتەش کە ئاوێتەی ئازارە، بە دوای تروسکایی‌یەکی نوور و دەرگایەکی هیوا و ئومێددا دەگەڕام..

لە ناکاودا "ئیمان بە خوا" هات بە فریامەوە و دەستی گرتم و، لە پاش هەستکردن بەو غەریبی‌یە، ئاسوودەیی و دڵنەوایی‌یەکی گەورەی ئەوتۆی پێ بەخشیم کە ئەگەر ئەو ئازار و نامۆیی‌یەم چەندان جار لەوەش زیاتر بوایە هەر دەیڕەواندنەوە و ئاسوودەیی پێ دەبەخشیم.

بەڵێ خوشك و برایانی پیرم!

مادەم بەدیهێنەرێکی میهرەبانمان هەیە، ئەوا ئیتر ئێمە غەریب و نامۆ نین.. مادەم خوای گەورە هەیە، ئەوا ئێمە هەموو شتێکمان هەیە.. مادەم خوا و فریشتەکانی هەن، ئەوا ئەم دنیایە چۆڵ نی‌یە و، ئەم بیابان و هەردانەش کە بە چۆڵ دێنە بەرچاومان، لە ڕاستی‌دا پڕن لە مەلائیکەت و بەندە بەڕێزەکانی خوای گەورە.

بەڵێ، نووری ئیمان بەو خوایە و، ڕوانینە دنیا لەبەر خوای گەورە و لە ڕوانگەی ئەو ئیمانەوە، هەرچی درەخت و دار و بەرد هەیە هەموویان دەکات بە خەمڕەوێن و هاوەڵ و ئاشنامان، جگە لە بەندە خاوەن هەست و شعوورەکانیشی. چونکە دەگونجێ ئەو بوونەوەرانە بە زمانی حاڵیان لەگەڵماندا بدوێن و دڵمان بدەنەوە و بێتاقەتیمان دەربکەن.

بەڵێ، بە ئەندازەی سەرجەمی بوونەوەرانی گەردوون و بە ژمارەی پیتەکانی کتێبی ئەم جیهانە گەورەیە، بەڵگە لەسەر "بوونی خوای گەورە" هەیە.

هەروەها بە ئەندازەی هەموو ئامێرەکانی سەرجەمی گیانداران و ژمارەی ئەو خۆراك و نیعمەتانەش کە بە تایبەتی پێی بەخشیون و تەوەرەی ڕەحمەت و میهرەبانی و چاودێریی خوای گەورەن، بەڵگە بە دەستەوە هەیە کە هەر هەموویان ڕێنماییمان دەکەن و دەمانگەیەننە دەرگای بەدیهێنەری بەخشندە و میهرەبان و پارێزەری خۆشەویستمان.

گومانیش لەوەدا نی‌یە کە چاکترین و گیراترین تکاکار لەو دەرگانەیەدا: "دەستەوسانی" و "لاوازی"ن کە لە سەردەمی پیریماندا پەیدا دەبن و سەرهەڵدەدەن.

کەواتە لە بریی ئەوەی پشت لە پیری هەڵبکەین، دەبێ خۆشمان بوێت و ڕێزی بزانین. چونکە شەفاعەتکارێکی جێی ئومێدە لەو دەرگانە بەرزەی خواوەندا.

### ❑ ئومێدی حەوتەم:

کاتێ کە لە سەرەتای پیریمدا خەندەی خۆشحاڵیی "سەعیدی کۆن" نەما و جێی بۆ شین و گریانی "سەعیدی نوێ" چۆڵ کرد، دنیاخوازانی "ئەنقەرە" پێیان وابوو من وەك باری پێشووم ماومەتەوە و هەر "سەعیدی کۆن"ی جارانم، بۆیە بانگێشتیان بۆ کردم کە بچم بۆ ئەوێ. منیش ڕۆشتم[1].

لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا ڕۆشتمە سەر لوتکەی قەڵاکەی ئەنقەرە، کە لە من گەلێ زیاتر دووچاری پیری و پرتوکان بووبوو!

لەوێ ئەو قەڵایەم وەك ڕووداوە مێژوویی‌یە بەردبووەکان هاتە بەرچاو!

جا بەهۆی پیربوونی ساڵ لە وەرزی پایزدا و، پیریی خۆم و، پیریی قەڵاکە و، پیریی مرۆڤایەتی و، پیریی دەوڵەتی مەزنی عوسمانی و، مردنی خەلافەت و، پیربوونی دنیا بە گشتی، خەمێکی قووڵ، ناخی دەروونمی گرتەوە و تەزوویەکی بەتینیش بە جەستەمدا هات..

ئەو حاڵەتە، ناچاری کردم کە لەسەر لوتکەی ئەو قەڵایەوە چاو بەناو بەرزایی‌یەکانی ئایندە و شیو و دۆڵەکانی ڕابوردوودا بگێڕم و، بە دوای نوور و ئومێد و شتێکی دڵخۆشکەردا بگەڕێم، تاکو شەوەزەنگی چڕ و تاریکی ئەو بارە ڕۆحی‌یەم بۆ ڕووناك بکاتەوە و، لە تاریکایی ئەو هەموو چەشنە پیری‌یە تێك ئاڵاوانەی دەوروبەرم، کە نوقمی بووە، دەری بهێنێت[2]!

بۆ مەبەستی چاوگێڕان بە دوای نوور و ئومێددا، ئاوڕێکم بە لای ڕاستدا - کە ڕابوردووە - دایەوە. ئەم لایەم لە دوورەوە لە شێوەی گۆڕستانی باوك و باپیرانم و

---

(١) ئەمەش لە ١٩٢٢/٩/٩دا بووە، لەم سەفەرەی ئەنقەرەدا و لە ڕۆژی ١٩٢٣/١/١٩دا بەیاننامەیەکی گرنگی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران (مەجلیسی مەبعووثان) نووسی کە (ژەنەراڵ کازم قەرەبەکر) لە ئەنجوومەنەکەدا خوێندیەوە و سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێ‌دەکات: (يا أيها المبعوثون! إنكم لمبعوثون ليوم عظيم)! لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەم وتارەدا نزیکەی (شەست نوێنەر) ڕێگای خواپەرستی و بەجێهێنانی فەرزەکانیان گرتەبەر، پاش ئەوەی ئەو دەوروبەرەی کە لە ئەنقەرەدا تێی کەوتبوون لە سەرچاوەی ئیمان دووری خستبوونەوە. هەر لەم سەفەرەی ئەنقەرەشدا پەیامی (حوباب)ی چاپ کرد، لە بەرامبەر ئەو لەخوادووری‌یەی کە لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەدا بوو. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم حاڵەتە ڕۆحی‌یە لە شێوەی موناجاتدا، بە زمانی فارسی هاتە دڵمەوە و نووسیم، پاشان لە پەیامی (حوباب)دا لە ئەنقەرە چاپ کرا. (دانەر)

تێکڕای مرۆڤایەتی‌دا هاتە پێش‌چاو. واتە لە بریی ئەوەی دڵم بداتەوە و نوورێکم پێ ببەخشێت، کەچی ئەوەندەی تر بێزاری کردم و دڵی داگرتم!

پاشان ئاوڕم بە لای چەپدا دایەوە - کە ئایندەیە - بەو نیازەی دەرمانێکم تێدا دەست بکەوێت. کەچی ئەم لایەم لە شێوەی گۆڕستانێکی گەورە و تاریکی خۆم و هاوچەشنەکانم و نەوەکانی داهاتوودا بینی! بەم جۆرە، ئەم لایەش دەردەکەی گرانتر کردم!

دوای ئەوەی کە دڵم لە "ڕابوردوو" و "ئاینده" هەڵکەندرا، سەیرێکی کاتی "ئێستا"م کرد. یەکسەر لەبەر چاوی ڕوانینی مێژووییمدا ئەم کاتەم لە شێوەی تابووتی تەرمی جەستەی تێکشکاوم و بە وێنەی سەربراوێك لە نێوان ژیان و مردندا هاتە پێش‌چاو!

کە دەستم لەم لایەش داشۆرد، سەرم بەرز کردەوە و بۆ چڵەپۆپەی درەختی تەمەنی خۆم ڕوانی. بینیم تەنها یەك دانە بەری گرتووە، ئەویش تەرمەکەی خۆمە و بۆم دەڕوانێت! یەکسەر لەتاوا سەرم داخست و ڕوانیمە ڕەگ و ڕیشەی درەختی تەمەنم. بینیم خاك و گڵی ژێر پێم تێکڕا گڵی جەستە و ئێسکی پرتووکاوی منن کە تێکەڵی یەکتری بوون و خەڵکی بەسەریاندا دەڕۆن و پێی پێدا دەنێن! بەم شێوەیە، ئەم دوو ڕوانینەش لە بریی ئەوەی دەرمانم بدەنێ و زامەکەم سارێژ بکەن، کەچی دەردەکەیان پتر بۆ گران کردم و هیچ دەرمانێکم تیایاندا بەدی نەکرد!

لە ناچاری‌دا ئاوڕێکم بە لای "دوا"وە دایەوە. بینیم ئەم دنیا فانی‌یە بەرەو شیو و دۆڵی بێهوودەیی و ڕووەو تاریکستانی "نەبوون" تلێر دەبێتەوە! ئەم سەیر کردنە، ژەهری بەسەر زامەکەمدا کرد و، لە بریی ئەوەی سارێژ و تیماری بکات پتر کولاندیەوە و هێنایەوە سۆ.

کە لەم لایەش نائومێد بووم، سەیرێکی "بەردەم"ی خۆمم کرد و ڕوانیمە دوور. دەبینم وا گۆڕەکەم لەسەر چەقی ڕێگادایە و دەمی لێ کردوومەتەوە و چاوەڕێم دەکات! لە پشتیشیەوە ئەو ڕێگا دوور و درێژە نەبڕاوەیە دەردەکەوێت کە چین لە دوای چینی کاروانەکانی گرۆی مرۆڤی پێدا تێپەڕ دەبن!

منیش لە بەردەم ئەم هەموو گیروگرفتە سەخت و سەرسووڕهێنەرانەی کە لە هەر شەش لامەوە ڕووم تێدەکەن، بینیم هیچ پاڵپشتێکم نی‌یە کە پشتی پێ ببەستم و، جگە لە بەشێکی بچووکی ئەو ویستە هەندەکی‌یە(الإرادة الجزئية) نەبێت کە پێم بەخشراوە هیچ چەکێکی ترم بە دەستەوە نی‌یە. کەواتە لە بەردەم هەموو دوژمنانی زۆر و شتانی زیانبەخش و لەژمارەنەهاتوودا تەنها ئەو چەکە مرۆڤانەیە نەبێت کە بریتی‌یە لە (جوزئی

ئیختیاری) هیچی تر شك نابەم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئـەم چەکەش لـە خۆیدا کۆڵـەوار و ناتەواوە و، ناتوانێت بڕواتە ناو کاتی "ڕابوردوو" تاکو خەم و خەفەتەکانی ئەوێم نەهێڵێت و بیشچێتە ناو "ئاینده"وە تاکو هەر شتێکی سامناك لـە ڕێگامدایە لـەناویان ببات، ئەوا دڵنیا بووم لەوەی کە نـە دەستەڵاتی چارەسەر کردنی سەرجەمی ئازارەکانی خۆم هەیە و، نە دەشتوانم گشت هیوا و ئاواتەکانی ڕابوردوو و داهاتووم بهێنمەدی. بۆیە لە ناچاریدا دەست لەئەژنۆ دانیشتم و دۆش دامام!

لەم کاتەدا کە لە هەر شەش لامەوە چەندین جۆری بێزاری و سەرسامی و نائومێدی و تاریکی دەورەیان دابووم، "نوورەکانی ئیمان"م بینی کە لە ڕووی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجازی بەیانەوە دەدرەوشانەوە! ئەم نوورانە بە هانامەوە هاتن و هەر شەش لاکانیان بە چەندین نووری درەخشان بۆ ڕووناك کردمەوە، بە چەشنێك کە ئەگەر ئەو بێزاری و تاریکییە زۆرانەی گەمارۆیان دابووم سەد جارەش ببوونایەتەوە، ئەو نوورانە سەروزیادی ڕووناککردنەوەی هەموویان دەبوون.

بەم جۆرە، ئەو نوورانەی ئیمان یەك بە یەکی ئەو زنجیرە سامناك و درێژانەی گۆڕی بە دڵدانەوە و ئومێد و، سەرجەمی مەترسییەکانیشی کرد بە هیوای گیان و ئارامی و ئاسوودەیی لە دڵ و دەروونداا!

بەڵێ، "ئیمان" توانیی ئەو وێنە سامناکەی "ڕابوردوو" - کە گۆڕستانێکی گەورەبوو - بدڕێنێت و بیگۆڕێت بە ئەنجوومەنێکی نوورانی و کۆگای خۆشەویستان. ئەمەشی بە "عين اليقين" و تەنانەت بە "حق اليقين" پیشان دام..

هەروەها ئەو "داهاتوو"ەی کە کاتێ بە چاوی بێئاگاییەوە سەیری دەکەین وەکو گۆڕێکی گەورە و فراوان دێتە پێشچاومان، "ئیمان" بە "علم اليقين" پیشانی دام کە لە ڕاستیدا ئەنجوومەنی میوانداریی خوای گەورەی میهرەبانە کە لە کۆشکەکانی بەختیاریی هەمیشەییدا بۆ میوانەکانی ئامادەی کردووە..

پاشان "ئیمان" ئەو دیمەنی تابووت و تەرمەی کاتی "ئێستا"ی تێکشکاند و، تێی گەیاندم کە کاتی ئێستام مەڵبەندێکی بازرگانییە بۆ دوارۆژ و میوانخانەیەکی ڕازاوەی خواییە..

پاشان ئەو تاقە "بەر"ەی درەختی تەمەن کە چاوی بێئاگایی لە شێوەی "تەرم"دا پیشانی دام، دەرکەوت کە وا نییە. چونکە بە "علم اليقين" ئیمان پیشانی دام کە ئەوە بریتییە لە دەرباز بوونی "گیان"م - کە شیاوی ژیانی هەمیشەییە و دەستنیشانکراوی

بەختیاریی هەتاهەتایە - لە هێلانە كۆنەكەی خۆی بەرەو ژیانی ناو ئاسۆی ئەستێرەكان و گەشتوگوزار لە ناویاندا..

پاشان ڕازە نهێنییەكانی ئیمان دەریانخست كە خاكی ئێسكی پرتووكاوم و خاكی سەرەتای دروستبوونم بەو شێوە كەم نرخە نییە كە پێی پێدا بنرێت، بەڵكو دەرگای میهرەبانیی خوا و پەردەی سەر ڕووی هۆڵەكانی بەهەشتە..

ئنجا كە یەكەم جار بە چاوی بێئاگاییەوە دەمڕوانییە حاڵ و بارودۆخە داڕووخاوەكانی "دنیا" وا دەهاتنە پێش چاوم كە لە شیو و دۆڵی بێهوودەییەوە بكەونە ناو تاریكایی "نەبوون"ەوە. كەچی "ئیمان" پیشانی دام كە ئەم ئاڵوگۆڕانەی دنیا بریتین لە نامە و نووسراوە صەمەدانییەكانی خواوەند و لاپەڕەكانی نەخشونیگاری ناوە جوانەكانی كە ئەركی سەرشانیان ئەنجامداوە و واتاكانی خۆیان ڕاگەیاندووە و بەرهەم و ئاكامی خۆیان لە بوونەوەردا بەجێ هێشتووە. بەم جۆرە "ئیمان" تا پلەی "علم الیقین" بەها و چییەتی(ماهیة)ی دنیای پێ ناساندم..

پاشان ئەو "گۆڕ"ەی كە لەوەو پێش وامدەزانی بۆم دەڕوانێت و لەسەر چەقی ڕێگا لە مەڵاسدایە و چاوەڕوانم دەكات، "ئیمان" بەهۆی نووری "قورئانی پیرۆز"ەوە دەری خست كە ئەو گۆڕە بیرێك نییە دەمی لێ پان كردبێتەوە، بەڵكو پیشانی دام كە ئەو گۆڕە لە ڕاستیدا بریتییە لە دەرگای چوونەژوورەوە بۆ ناو "جیهانی ڕووناكی". ئەو ڕێگا دوور و درێژەش بە تاریكایی و نەبوون كۆتایی پێ نایەت، بەڵكو ڕاستە شەقامێكە بەرەو جیهانی "ڕووناكی" و "بوون" و "بەختیاریی هەمیشەیی".

بەم جۆرە، ئەم حاڵەتانە بوون بە دەرمانی دەرد و مەڵهەمی زامەكانم. ئەمانەشم بە شێوەیەكی هێندە ئاشكرا بەدی كرد كە گەیاندمیانە قەناعەتێكی تەواو بەو ئەنجامانە.

پاشان ئەم "جوزئی ئیختیاری"یە كەمەی كە تەنها دەستكەوتێكی تابلێیت هەندەكیی هەیە، "ئیمان" بەڵگەنامەیەكی ئەوتۆی پێ بەخشی كە بەهۆیەوە پاڵ بە توانستێكی ڕەهاوە بداتەوە و، پەیوەندیی بە میهرەبانییەكی فراوانیشەوە بكات لە دژی ئەو هەموو دوژمنە لەژمارەبەدەر و تاریكییە زۆرانەی كە لە هەموو لایەكەوە دەورەیان داوە. تەنانەت هەر خودی "ئیمان" دەبێت بە بڕوانامەیەك بە دەست "جوزئی ئیختیاری"یەوە. ئنجا هەرچەندەش ئەم جوزئە ئیختیارییە - كە چەكی مرۆڤە - خۆی لە خۆیدا كۆڵەوار و كەم و كۆتا و ناتەواوە، بەڵام گەر بە ناوی خواوەندی حەق و لە پێناوی خوا و لە ڕێگای ئەودا بەكارهێنرا، ئەوا بە ناوی ئیمانەوە بەهەشتێكی هەمیشەیی و فراوان بە پانتایی

پێنج‌سەد ساڵ ڕێ دەستی خاوەنەکەی دەخات. ئیمـاندار لەمەدا وەك ئەو سەربازە وایە کە ئەگەر هێزە هەندەکی‌یەکەی خۆی بە نـاوی دەوڵەتـەوە بـەکار بـهێنێت، دەتوانێـت بـە ئاسانی چەند کارێکی وا ئەنجام بدات کە هەزاران جاریش لە هێزە تایبەتی‌یەکەی خۆی گەورەتر بێت.

ئنجا هەروەك "ئیمان" بەڵگەنامەیـەك بـە دەستی "جوزئی ئیختیـاری" دەسپێرێت، لـە هـەمان کـاتدا جڵـەوی جوزئی ئیختیـاریش لـە دەسـت "جەستە" دەسـێنێتەوە کـە هیـچ دەستەڵاتێکی بەسـەر ئایندە وڕابوردوودا نی‌یـە و، دەیداتـە دەسـت "دڵ" و "گیـان"! جـا لەبەر ئـەوەی بازنـەی دڵ و گیـان وەکو جەستە پابـەندی "کـاتی ئێستا" نی‌یـە و، چـەند ساڵێکی ئایندە وڕابوردووش لە سنووری بازنەی ژیـانی دڵ و گیـاندان، ئـەوا ئـەم جوزئـە ئیختیاری‌یە لـە هەندەکی‌یەوە دەردەچێت و دەبێت بـە هەمـەکی. جـا هـەروەك بـە "هێزی ئیمان" دەڕواتـە قووڵایی شیو و دۆڵـەکانی "ڕابـوردوو" و تـاریکیی خـەم و خەفەتـەکانی ئەوێ لـەناو دەبـات، بـە هـەمان جـۆر و بـە "نـووری ئیمـان" سـەردەکەوێت و دەفڕێـت تـا دەگاتە لوتکەی بەرزایی‌یەکانی "ئایندە"ش و هەموو مەترسی‌یەکانی تێدا لەناو دەبات!

بـەڵێ، ئـەی خوشـك و برایـانی پیرم و ئـەی ئـەو کەسـانەی کـە دەردیسـەریی پـیری ئازاریان دەدات!

سـوپاس بـۆ خـوا! مـادەم ئێمـە لـە ئیمـاندارانین و، ئـەم ئیمانـەش گەنجینـەی شـیرین و ڕووناکی و خۆشەویستیی تا ئەم ڕادەیەی تێدایە.. مادەم ئـەم پیری‌یـەشمان زیـاتر دەستمان دەگرێـت و دەمانباتـە بـەردەرگای ئـەو گەنجینانـە، ئـەوا دەبـێ هـەزاران شـوکر و ستایش پێشکەش بە خـوای گـەورە بکـەین لەسـەر ئـەم پیری‌یـەی کـە ڕوونـاکیی ئیمـانی ئاراستە کراوە.

### ❑ ئومێدی هەشتەم:

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە چەند تاڵێکی سپی - کە نیشانەی پیری‌یە - تێکەڵی مووی سەرم بووبوون.

ڕووداوە سەختەکانی یەکەم جەنگی جیهانی و، ئاسەوارە قووڵـەکانی دیـل بـوونم لـە ڕووسیا(١) بە سەر ژیانمەوە، خەوی بێ‌ئاگایی منیان قورستر کردبوو. دوای ئەوەش کە لـە

(١) مامۆستا نوورسی لە ١٩١٦/٢/١٩دا لە بەرەی قەفقاز لە کاتی بەرگری کردن لە شاری (بەدلیس) بە دیـل گیرا. لەو کاتەدا مامۆستا سەرکردەی "تیپەکانی یاریدەدەران" بووە، کە لە قوتابی‌یـەکانی و لـە خۆبەخشـەران

دیلی دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ، ئەو پێشوازییە ڕەنگین و گەرمەی لێم کرا چ لە لایەن خەلیفە و چ لە لایەن "شێخولئیسلام" و چ لە لایەن سەرکردەی گشتی و چ لە لایەن قوتابییانی زانستە شەرعییەکانەوە، هەروەها ئەو ڕێزلێگرتنە گرنگەی کە لە ڕادەیەکدا بوو من شایستەی نەبووم، هەموو ئەمانە، هاودەم لەگەڵ مەستی و بێئاگایی لاویدا، بوون بەهۆی دروستبوونی بارێکی ڕۆحیی ئەوتۆ کە خەوی بێئاگایی منیان لە جاران قورستر کرد، بە ڕادەیەك کە دنیام بە هەمیشەیی دەهاتە بەرچاو! هەروەك "دەروون"یشم هێندە بە شێوەیەکی سەیر خۆی پابەندی دنیا کردبوو وەك بڵێی هەرگیز مردنی لە ڕێگادا نەبێت!

ئا لەم کاتە و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا سەرێکی مزگەوتی "بایەزید"م دا لە ئەستەمبووڵ، بەو نیازەی کە لەسەر زاری قورئانخوێنە دڵسۆزەکانی ئەوێ گوێ لە قورئانی پیرۆز ڕابگرم. ئەوەبوو لەسەر زمانی قورئان خوێنەکانەوە ئەو ڕاگەیاندنە توند و بەهێزەی قورئانی پیرۆزی ئیعجازبەخشم بیست کە بە گوفتارە بەرز و ئاسمانییەکەی خۆی مردن و نەمانی مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێکی لە ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ دا (آل عمران:١٨٥) بە ئاشکرا ڕاگەیاندووە!

ئەم ڕاگەیاندنە توند و بەهێزە هێندە بە گەرموگوڕی ڕۆشتە ناو گوێمەوە کە هەموو چینە چڕ و ئەستوورەکانی خەوی بێئاگایی و مەستیی منی بڕیی و جێی خۆی لە ناخی دڵمدا کردەوە!

دوای ئەوە لە مزگەوت دەرچووم.

پاش چەند ڕۆژێك هەستم کرد کە پاشماوەی ئاسەوارەکانی ئەو خەوی بێ ئاگاییەی کە لە مێژە جێی خۆی لە ناخی مندا کردبووەوە، وەك زریانێکی گەورە و سەخت لە سەرمدا دەجوولاو، خۆم وەك کەشتییەك دەبینی کە لە ناو شەپۆلی دەریادا قیبلەنماکەی بە ڕاست و چەپدا بخولێتەوە و لەکار کەوتبێت. دەروونم لەناو ئاگرێکی چەڕە دووکەڵاویدا هەڵدەقرچا. خۆ هەر کات لە ئاوێنەدا سەیری خۆمم دەکرد، مووە سپییەکان پێیان دەوتم: وریابە!!

بەڵێ، ئەم جارە بە پەیدا بوون و بێدارکردنەوەکانی ئەو چەند تاڵە سپییە هەموو شتێکم لە لا ڕوون بووەوە. چونکە بینیم ئەو لاوییەی کە من زۆر جار پێی دەنازیم و

---

پێکهاتبوون. پاشان چاودێریی خوا هات بە هانایەوە و لەو دیلییە ڕزگاری بوو، ئەوەبوو لە ١٩١٨/٦/١٥ گەڕایەوە بۆ ئەستەمبووڵ. (وەرگێڕ)

شەیدای چێژەكانی بووبووم، ئێستا پێم دەڵێ: "خوا حافیز"! هەروەها ئەو ژیانەش كە پەیوەندیی خۆشەویستیم لەگەڵدا بەستبوو، وردە وردە بەرەو كزبوون و كوژانەوە دەڕۆشت. ئەو دنیایەش كە دەستم لە داوێنی گیر كردبوو، تەنانەت زۆریش بۆی پەرۆش بووم، بگرە شەیداشی بووبووم، بینیم پێم دەڵێت: "خوا حافیز، خوات لەگەڵ"! بەمەش پێ ڕادەگەیاندم كە من لێرەدا میوانم و هێندەی نەماوە ئەم میوانخانەیە بەجێ بهێڵم. بەڵكو لەمەش زیاترم دی؛ چونكە بینیم دنیا خۆیشی خەریكی خۆپێچانەوەیە بۆ كۆچكردن و "خواحافیزی" وتن!

ئنجا یەكێ لە واتا هەمەكی‌یەكانی ئایەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَـةُ الْمَـوْتِ﴾ لە ڕووی دڵمدا كرایەوە، كە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

(سەرجەمی مرۆڤایەتی بە گشتی وەك تاقە كەسێك وایە، دەبێ بمرێت تاكو سەرلەنوێ زیندوو بكرێتەوە.. گۆی زەویش كەسێكە دەبێ تامی مردن بچێژێت تاكو شێوەی مانەوە و هەمیشەیی لەخۆ بگرێت.. دنیاش بە هەمان جۆر كەسێكی ترە و دەبێ بمرێت، تاكو لە شێوەی دوارۆژدا دروست بكرێتەوە).

ئنجا بیرم لەو بارە كردەوە كە ئەو كاتە منی تێدابووم. بینیم:

ئەو لاوی‌یەی كە خولگەی هەموو تام و چێژێكە، بەرەو نەمان دەڕوات و شوێن بۆ ئەو پیری‌یە چۆڵ دەكات كە سەرچاوەی هەموو داخ و خەفەتێكە! ئەم ژیانە درەخشان و ڕووناكەش لە ڕۆشتندایە و، مردنی بە ڕواڵەت تاریك و لێڵ خۆی بۆ شوێنەكەی ئامادە دەكات! ئەم دنیا خۆشەویست و شیرینەش كە وا دەزانرێت هەمیشەیی‌یە و خۆشەویستی بێئاگایانە، بینیم زۆر بە پەلە بەرەو ئاوابوون دەڕوات!

منیش بۆ ئەوەی سەر بە ناو بێئاگایی‌دا بكەم و لە دەست ئەو بارە پەرێشانە خۆم بخەڵەتێنم، ئاوڕێكم بە لای ئەو پلە و پایە بەرزە كۆمەڵایەتی‌یەدا دایەوە كە پاش گەڕانەوەم لە دیلی لە ئەستەمبووڵ بەدەستم هێنا و دەروونم پێی خەڵەتا و، سەرتاپا دڵنەوایی و ڕێزلێنان و ڕووتێكردنی خەڵكی بوو بەرامبەرم و، زۆر لە توانا و وزەی خۆیشم زیاتر بوو. بینیم هەموو ئەمانە تا دەرگای گۆڕەكەم لەگەڵمدا دێن كە لێی نزیك بوومەتەوە و، هەر هێندەی گەیشتمە ئەوێ سەرجەم ڕووناكی‌یەكانیان دەكوژێنەوە!

پاشان بۆم دەركەوت كە ڕیایەكی قەبە و خۆپەرستی‌یەكی سارد و سڕ و بێئاگایی‌یەكی كاتی خۆیان لە پشتی پەردەی ڕازاوە و نەخشاوی "لەخۆ ڕازی بوون"ەوە مەڵاس داوە، كە نموونەی بەرز و ئاواتی گەورەی شەیدایانی ناوبانگە! ئیتر

تێ گەیشتم کە ئەم شتانەی تا ئێستا منیان خەڵەتاند، لەمەودوا هیچ دڵنەوایی و ڕووناکی‌یەکم پێ نابەخشن.

جا بۆ ئەوەی ئەم جارەیان بە تەواوی لە خەوی بێ‌ئاگایی بێدار ببمەوە، دەستم کردەوە بە گوێ ڕاگرتن لەو قورئان خوێنە بەرێزانەی ناو مزگەوتی "بایەزید" بۆ مەبەستی خوێندن و وەرگرتنی وانە ئاسمانی‌یەکەی قورئانی پیرۆز. ئیتر لەم ڕێیەوە و لە ناوەندی فەرمانە خاوێن و پیرۆزەکانی پەروەردگاردا مزگێنی‌یەکانی ئەو ڕابەرە ئاسمانی‌یەم بیست کە لە ئایەتی: ﴿وَبَشِّرِ الذينَ آمَنُوا...﴾دا (سورة البقرة:٢٥) ڕایگەیاندووە.

بەڵێ، کاریگەریی ئەو ڕێژنە و بەرەکەتەی لە قورئانی پیرۆزەوە دەستم کەوت، هانی دام کە لە ناو ئەو شتانەی سەرسامیان کردبووم و خستبوومیانە نائومێدی و دڵتەنگی‌یەوە، بە شوێن ئومێد و ڕووناکی‌دا بگەڕێم.

هەزاران شوکر و ستایش بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم کە یارمەتیی دام بۆ دۆزینەوەی دەرمان لە هەمان نەخۆشی‌دا و، بینینی ڕووناکی لە هەمان تاریکی‌دا و، هەست کردن بە دڵنەوایی لە هەمان ئازار و سامناکی‌دا!

یەکەم جار سەیرێکی ئەو "ڕوو"ەم کرد کە خەڵکی دەترسێنێت و لە پێش چاوی هەمواندا سامناك دەردەکەوێت، کە بریتی‌یە لە ڕووی "مردن"! بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کە ڕووی ڕاستەقینەی مردن سەبارەت بە ئیماندارانەوە ڕوویەکی جوانی ڕووناکە، هەرچەند دیوی دەرەوەی بە پەردەیەکی ڕەشی تاریك و ناشیرین و ترسناك داپۆشراوە. ئەم ڕاستی‌یەشمان بە جۆرێکی گومان‌بڕ لە زۆر پەیامدا چەسپاندووە. بە تایبەت لە "وتەی هەشتەم" و "مەکتووبی بیستەم"دا ڕوونمان کردووەتەوە کە: "مردن" لەناودانی هەتاهەتایی و جودایی هەمیشەیی نی‌یە، بەڵکو پێشەکی و سەرەتای ژیانێکی هەمیشەیی‌یە و.. مۆڵەت و حەوانەوەیە و.. کۆتایی هێنانە بە ئەرکی کارمەندیی ئەم ژیانە و.. شوێن گۆڕین و بە یەك شادبوونەوەیە لەگەڵ کاروانی ئەو خۆشەویستانەی کە کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردووە.

بەم جۆرە و لە ڕوانگەی ئەم ڕاستی‌یانەوە، ڕووی گەش و ڕووناکی مردنم دی. بێ گومان نەك بە ترس و لەرزەوە، بەڵکو - لە ڕوویەکەوە - بە ڕوانینی حەز و تاسەمەندی‌یەوە بۆم ڕوانی. کە ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی یەکێك لە نهێنی‌یەکانی یادی مردن(رابطة الموت)م بۆ دەربکەوێت کە ڕێڕەوانی ڕێبازەکانی "تەسەووف" ئەنجامی دەدەن.

پاشان سەرنجی "سەردەمی لاوی"م دا کە سەردەمێکە هەموو کەسێك شەیدایەتی و خەفەت بە نەمانی دەخوات و، وەکو لاویی من، لە هەموو کەسێکی تریش بە بێ‌ئاگایی و گوناهباری دەچێتەسەر! بینیم لە پشت ئەو بەرگە ڕازاوە نەخشاوەی لاوی‌یەوە ڕوویەکی ناشیرین و تەنانەت سەرسووڕهێن و مەستکەر هەیە کە بەو بەرگە داپۆشراوە. خۆ ئەگەر من ڕاستی و چییەتیی لاویم نەزانیبایە، ئەوا با تەمەنێکی سەد سالّییشم ببوایە، هەتا دوا هەناسەی ژیانم دووچاری خەفەت و گریانی دەکردم، بۆ ئەو چەند ساڵە کەمەی کە بە مەستی و پێکەنینەوە دەچێتە سەر، بە وێنەی ئەو شاعیرەی کە بە خەفەت و ئازارێکی تاڵەوە بۆ لاویی خۆی گریاوە و وتوویەتی:

أَلا ليتَ الشبابَ يعودُ يوماً فَأُخبِرَهُ بما فَعَلَ المشيبُ(١)

بەڵێ، ئەو پیرانەی کە بە جوانی لە نهێنی‌یەکانی تافی "لاوی" نەگەیشتوون، بە وێنەی ئەم شاعیرە، تەمەنی پیری‌یان بە خەفەت و گریانەوە دەبەنە سەر، بۆ لەدەستچوونی "سەردەمی لاوی"یان.

ئەگەر گەشە و لێهاتوویی هەرەتی "لاوی" لە باوەڕدارێکی هێمن و ژیر و دڵ بێدار و بە ویقاردا جێی خۆی بکاتەوە و، وزە و هێزی لاوی لە خواپەرستی و کردەوەی چاك و بازرگانیی دواڕۆژدا بەسەر ببات، ئەوا دەبێت بە گەورەترین هێزی خێر و چاکە و باشترین هۆی بازرگانی و جوانترین و بەتامترین مایەی چاکەکاری.

بەڵێ، سەردەمی لاوی، سەردەمێکی گەلێ بەنرخە و نیعمەتێکی گەورەی خوایی و شادمانی‌یەکی بەتام و خۆشە، بۆ کەسێك کە باش بەکاری بهێنێت و ئەرکە ئایینی‌یەکانی سەرشانی جێ‌بەجێ بکات. بەڵام ئەگەر سەردەمی لاوی ڕێگای ڕاستی تێدا نەگیرێتە بەر و لەگەڵ داوێن پاکی و خواپەرستی‌دا هاودەم نەبێت، ئەوا گەلێ مەترسیی سەخت و لەناودەری لە ڕێگادایە. چونکە هاندان و هەڵەشەیی ئەم سەردەمەی تەمەن "بەختیاریی هەمیشەیی" و "ژیانی دواڕۆژی" مرۆڤ لەناو دەبات، تەنانەت لەوانەیە ژیانی ئەم دنیاشی تێکبشکێنێت. کە ئەمەش دەبێت بەهۆی ئەوەی لە سەردەمی پیری‌دا خەفەت و ئازارێکی زۆر دەرخواردی ئەو کەسە بدات، تەنها لەبەر چەند ساڵێکی کەم کە بە کەیف و شادی‌یەوە لێی چووەتەسەر.

---

(١) کورد لە واتای ئەم بەیتە شیعرە عەرەبی‌یەدا وتوویەتی:

خۆزگا گەنجی‌یەکەم ئەگەڕا دواوە گلەیی پیریم ئەکرد بەلاوە

(وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵکی سەردەمی لاوییان بە بێ زیان لێ ناچێتە سەر، ئەوا دەبێ ئێمەی پیر و بەساڵاچوو سوپاسێکی زۆری خوای خۆمان بکەین کە لە زیان و مەترسییەکانی ئەو سەردەمە ڕزگاری کردووین.

لە لایەکی تریشەوە تام و لەزەتەکانی "لاوی" - وەك هەموو شتێکی تر - لە ئەنجامدا دەبڕێنەوە و کۆتاییيان پێ دێت. جا ئەگەر ئەم سەردەمە بە پەرستش و کردەوەی چاك بەسەر ببرێت ئەوا بەروبوومی نەبڕاوە و بەردەوام بە مرۆڤ دەبەخشێت و دەبێت بەهۆی دەستخستنی لاوێتییەکی هەتاهەتایی لە ژیانێکی هەمیشەییدا.

* * *

پاشان سەیرێکی ئەم دنیایەم کرد کە زۆربەی خەڵکی شەیدا و گیرۆدەی بوون. بەهۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بینیم (سێ) دنیای گشتی هەیە کە تێهەڵکێشی یەکتری بوون:

یەکەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ئاوێنەی ئەو ناوانەیە.

دووهەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ڕۆژی دوایی و کێڵگەی چاندنی تۆوی ئەودنیایە.

سێهەم: ئەو دنیایەی کە دەڕوانێتە ئەهلی دنیا و گومڕایان و، جێی گاڵتە و گەپ و ڕابواردنیانە.

هەروەها بۆم دەرکەوت کە هەرچی کەسە لە ناوەندی ئەم دنیایەدا دنیایەکی گەورە و تایبەتیی خۆی هەیە. واتە هێندەی ژمارەی مرۆڤ دنیای تێهەڵکێشی یەکتری هەیە. بەڵام دنیای تایبەتیی هەموو کەسێك لەسەر بناغەی ژیانە تایبەتییەکەی ئەو کەسە ڕاگیر بووە و، هەر کات جەستەی ئەو کەسە ڕووخا و تێکشکا، ئەوا دنیاکەی ڕووخاوە و قیامەتی بەرپا بووە. جا لەبەر ئەوەی بێئاگایان بەم خێرایی و کتوپڕییە هەست بە ڕووخانی دنیا تایبەتییەکەی خۆیان ناکەن کە ئاوا بە زوویی هەرەس دەهێنێت و کۆتایی پێ دێت، ئەوا شەیدای دەبن و پێیان وایە کە وەك دنیا دامەزراوە گشتییەکەی دەوروبەریان وایە!

منیش کە بیرم کردەوە، لەبەر خۆمەوە وتم:

بێ گومان منیش - وەکو خەڵکی - دنیایەکی تایبەتیی خۆم هەیە و، دنیاکەی منیش وەکو هی ئەوان بە خێرایی و لە پڕ دەڕووخێت. ئیتر دەبێ چ سوودێك لە دنیا تایبەتییەکەی تەمەنە کورتەکەمدا ببێت؟!

بە نووری قورئانی پیرۆز بۆم دەرکەوت کە ئەم دنیا تایبەتی‌یەی من و خەڵکی:

خانەیەکی کاتی‌یە بۆ بازرگانی و.. میوانخانەیەکە هەموو ڕۆژێك لە میوان پڕ دەبێت و پاشان خالّی دەبێتەوە و.. بازاڕێکی سەر ڕێگایە بۆ ئەوانەی کە دێن و دەڕۆن و.. کتێبێکی کراوەی بەدیهێنەری وێنەکێشە کە دانستی خوای گەورە نووسین و کوژاندنەوەی بە ویستی خۆی تێدا دەکات و.. هەموو بەهارێکیشی نامەیەکی نەخشاوی ڕازاوەیە و.. هاوینەکانیشی چامەیەکی هۆنراوەی بەسۆز و ڕەنگینە و.. چەند ئاوێنەیەکی هەمیشە نوێ‌بووی ئەوتۆیە کە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی کردگاری شکۆمەندیان تێدا دەردەکەوێت و.. باخچە و کێڵگەی تێداچاندنی تۆوی ئەودنیایە و.. گوڵدانی میهرەبانیی خواوەندە و.. کارگەیەکی کاتی‌یە بۆ ئامادەکردنی ئەو تابلۆ پەرەردگاری‌یە هەمیشەیی‌یانەی کە لە جیهانی هەتاهەتایی و نەمری‌دا پیشان دەدرێن.

ئیتر منیش، کە ئەمەم بینی، لە لایەنی خۆمەوە شوکرانەی زۆرم پێشکەشی خواوەندی بەدیهێنەری بەخشندەم کرد بۆ ئەوەی کە دنیای لەسەر ئەم شێوەیە بەدی هێناوە!

بەڵام ئەو "خۆشەویستی"یەی کە بۆ ئەوە لە ناخی مرۆڤدا جێگیر کراوە تاکو بۆ دوو ڕووە جوانەکەی دنیا بەکاری بهێنێت کە دەڕواننە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ڕۆژی دوایی، کەچی مرۆڤ نیشانەکەی نەپێکا و بە هەڵەدا چوو کاتێ کە ئەو خۆشەویستی‌یەی لە جێگای خۆی‌دا بەکار نەهێنا و بەرەو ڕووە ناشیرینە زیانبەخشەکەی سێ‌هەمی دنیا وەری‌چەرخاند. بۆیە فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ئازیزی ﷺ تێدا هاتەدی کە دەفەرموێ:

"حب الدنيا رأس كل خطيئة"[1].

جا ئەی خوشك و برایانی پیرم!

من بەهۆی نووری قورئان و یادخستنەوەی پیری و ئەو ڕووناکی‌یەی کە ئیمان بە دڵی منی بەخشی، ئەم "ڕاستی"یەم بینی کە بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ و سەلمێنەریش لە گەلێ پەیامدا چەسپاندوومە. ئیتر هەستم کرد کە ئاسوودەیی و دڵنەوایی ڕاستەقینە و

---

(١) رواه البيهقي في الشعب باسناد حسن إلى الحسن البصري رفعه مرسلاً، وذكره الديلمي في الفردوس، ورواه البيهقي أيضاً في الزهد وأبونعيم من قول عيسى بن مريم، وآخرون يعدونه من كلام ابن مسعود أو جندب البجلي رضي الله عنهم. بروانە: (كشف الخفاء:١٠٩٩)، (ضعيف الجامع الصغير وزيادته: ٢٦٨١). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

ئومێدی بەهێز و ڕووناکیی درەخشان سەبارەت بە من هەر تەنها لەو ڕاستیەدایە. بۆیە بە هاتنی پیری و بەسەرچوونی سەردەمی لاویم، ڕازی و دڵخۆش بووم!

دەسا ئێوەش - ئەی خوشك و برایانی پیرم! - لەدەست پیری مەگرین و پێی دڵگران مەبن. بەڵكو هەمیشە لە شوكر و سوپاسی خوای گەورەدا بن. چونكە مادەم ئێوە ئیماندارن و، "ڕاستی"ش بەو جۆرە دەدوێت كە باسمان كرد، ئەوا با گریان و پەژارە هەر بەشی گومڕا و بێئاگایان بێت، نەك هی ئێمە.

## ❑ ئومێدی نۆهەم:

ئەو كاتەی لە یەكەم جەنگی جیهانیدا بە دیل گیرام، لە شارێكی دووری باكووری خۆرهەڵاتی ڕووسیا دەژیام كە ناوی "كۆستڕما" بوو. ئەو شارەش مزگەوتێكی بچووكی تەتارەكانی لێ بوو كە لەسەر كەناری ڕووباری "ڤۆلگا"ی بەناوبانگ بنیات نرابوو.

منیش لە نێوان ئەفسەرە دیلەكانی هاوەڵمدا دڵتەنگی دایگرتبووم و سەودای گۆشەگیری كەوتبووە سەرمەوە، بەڵام نەیاندەهێشت بەبێ ڕوخسەت كەس بڕواتە دەرەوەی ئۆردوگای دیلەكان. پاشان هەرچۆن بوو هێشتیان بە كەفالەتی تەتارەكان بڕۆمە دەرەوە و لە مزگەوتەكەدا بژیم. ئیتر شەو بە تەنیایی لەوێ دەمامەوە و دەخەوتم. بەهاریش نزیك بووبووەوە و، شەوگاری ئەو ناوچە دوورەش گەلێ درێژ بوو.

لەو شەوە درێژ و تاریكانەدا كە بە پەژارەی ڕەشی غەریبی خۆیان داپۆشیبوو، زۆر جار هەتا ڕۆژم دەكردەوە خەو لە چاوەكانم دەزڕا! خۆ لەو شەوانەشدا هیچ دەنگێك بەر گوێ نەدەكەوت جگە لە خوڕەی خەمناكی ڕووباری ڤۆلگا و چركەی ناسكی تكەی باران و پەژارەی جودایی نەبێت كە لە هاژە و وژەی باوە دەهاتە گوێم! هەموو ئەمانەش منیان لەو خەوە قورس و قووڵەی بێئاگایی - بۆ ماوەیەكی كاتی - بێدار كردەوە.

خۆ هەرچەند هێشتا خۆمم بە پیر نەدەزانی، بەڵام هەر كەسێك جەنگی جیهانیی بینیایە دەبوو پیر ببوایە! چونكە چەند ڕۆژێكی ئەوتۆ هاتن و ڕۆشتن كە منالیان تێدا پیر دەبوو! وەك بڵێی یەكێك لە نهێنیەكانی ئایەتی: ﴿يَوماً يَجعلُ الوِلدانَ شيباً﴾(المزمل:١٧) ڕۆشتبێتە ناویانەوە! لەبەر ئەوە بوو كە هەرچەندە بە تەمەن نەگەیشتبوومە چل ساڵ، كەچی خۆمم وەك پیرێكی هەشتا ساڵی دەهاتە بەرچاو!

لەو شەوگارە تاریك و خەمناك و درێژانەدا و، لەو دەوروبەرە نوقم بووەی ناو پەژارەی غەریبی و، لە ناوەندی ئەو بارە ئازاربەخشەی خۆمدا، نائومێدی‌یەکی هێندە قورس خۆی کوتایە سەر سنگم کە بە جارێ هەموو هیوا و ئومێدێکی بڕیم سەبارەت بە ژیانم و گەڕانەوەم بۆ نیشتمانم! خۆ هەرکات کە ئاوڕم بە لای تەنیایی و بێدەستەڵاتیی خۆمدا دەدایەوە، بە تەواوی هەموو ئومێدێکم دەبڕا و بێ هیوایی سەری تێ دەکردم..

بەڵام یارمەتیم لە قورئانی پیرۆزەوە بۆ هات و، "زمان"م دەستی کرد بە دووپاتکردنەوەی: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران:١٧٣).

"دڵ"یشم بە گریانەوە وتی:

غریبم بی کسم ضعیفم ناتوانم الأمان گویم عفو جویم مدد خواهم ز در گاهت إلهی

بەڵام "ڕۆح"م کە خۆشەویستانی زووی شارەکەمی کەوتەوە یاد و مردنمی لەم غەریبی‌یەدا هاتە پێش چاو، شیعرەکانی "نیازی"ی خوێندەوە کە لە دووی هاوڕێ دەگەڕێت:

"بەلای هەموو خەفەتێکی دنیادا گوزەرم کرد و..
دامە شەقەی باڵ بەرەو "نەبوون".
دەفڕیم بە تاسەوە و، لە هەموو ساتێکدا هاوارم دەکرد:
هاوڕێ.. هاوڕێ..."!

بە هەرحاڵ.. "لاوازی" و "دەستەوسانی"م لەو شەوە تاریك و خەمناك و درێژانەی کە تاریکیی جودایی و نامۆیی دایپۆشیبوون، گەیشتنە ڕادەیەك کە لە دەرگای میهرەبانیی خواوەند نزیکیان خستمەوە و بوون بە مایەی گیرابوونی نزا و پاڕانەوەکانم و تکاکارم لە حوزووری خوای گەورەدا. بە شێوەیەك کە تا ئێستاش من سەرسامی ئەوەم کە چۆن توانیم دوای چەند ڕۆژێکی کەم ڕابکەم و، بە جۆرێکی چاوەڕوان نەکراو ماوەیەکی هێندە دوور و درێژ ببڕم کە مەگەر بە ساڵێکی تەواو دەنا بەو ماوە کەمە نابڕێت، بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆش لە زمانی ڕووسی بزانم!! چونکە بە جۆرێکی زۆر سەیر و سەرسووڕهێنەر لەو دیلی‌یە ڕزگارم بوو، ئەویش تەنها بە فەزڵی چاودێریی خوای گەورە بوو کە ناردی بە هانای "لاوازی" و "دەستەوسانی"مەوە. بەم جۆرە لە ڕێی "وارشۆ" و "ڤیەننا"وە گەیشتمەوە "ئەستەمبووڵ". گەشتی دوور و درێژی ئەم ڕاکردنەشم هێندە بە ئاسانی بە دەستەوە هات کە ئازاترین کەس لەوانەی زمانی ڕووسی دەزانن کاری وایان بۆ نەدەچووەسەر.

جا بە ئیلهامی حاڵەتەکەی ئەو شەوەی کە لـە مزگەوتەکـەی لێـواری ڤوڵگـادا بردمـە سەر، ئەم بڕیارەم دا:

(لەمـەولا دەسـت ناخەمـە نـاو کاروبـاری خـەڵکی و، پاشمـاوەی تەمـەنم لــەناو ئەشکەوتەکاندا بە گۆشەگیری دەبەمە سەر. خۆ مادەم هەر دەبێ لە کۆتـاییدا بە تـەنیایی بڕۆمـە نـاو گۆڕەکـەم، دەبـا هـەر لـە ئێستاوە خۆم لەگەڵ ئەو تـەنیایی و گۆشـەگیرییە ڕابهێنم)!

بـەڵێ، وام بڕیـار دا. بـەڵام - بـە داخــەوە - خۆشەویسـتە زۆر و دڵسـۆزەکانی ئەستەمبووڵم و ژیانە بریقەدار و ڕازاوە کۆمەڵایەتییەکەی ئـەوێ، بە تایبـەتی ڕێز گرتـن و ڕووتێکردنـی خـەڵکی لێـم - کـە هیـچ سوودێکیشـی تێـدا نییـە - هـەموو ئەمانـە، بڕیارەکەمیان بـۆ ماوەیـەکی کـەم لـە بـیر بردمـەوە. وەك بڵێـی ئـەو شـەوە تاریکـەی غەریبییەکەم ڕەشێنەی ڕووناك و بینەر بوو بێت لـە چـاوی ژیـانمدا و، ڕۆژگـارە ڕازاوە و ڕەنگینـەکانی ژیـانی ئەستەمبوولیش - لەبەر ئەوەی شـتی دووریـان نـەدەبینی - بەشـە نەبینەکەی سپێنیی چاوم بن! ئیتر بەم جۆرە چاوم لە یەك نا و خەوێکی قووڵی قورسم لـێ کەوت، تا دوای دوو ساڵ لەسەر کتێبی "فتوح الغیـب"ی شێخ عـەبدولقادری گـەیلانی چاوم کردەوە!

دەسا خوشك و برایانی پیرم!

باش بزانن کە "لاوازی" و "دەستەوسانی" بۆ ئەوە لە پیریدا دانراون تاکو ببن بـەهۆی دەستخستنی میهرەبانی و چـاودێریی خـوای پـەروەردگار. مـن خـۆم بـەهۆی گەلـێ ڕووداوی ژیـانی خۆمـەوە شایەتی لەسەر ئەم ڕاستییە دەدەم. جگـە لەمـە، میـهرەبانیی خواوەندیش لەسەر ڕووی زەویدا بە باشی ئەمە دەسەلمێنێت و بە جوانـی دەریدەخـات. چونکـە لـە کـاتێکدا کـە بێ دەستەڵاتترین و لاوازترینـی گیـانداران بێچووەکانیـانن، کەچی جوانترین و ناسکترین و بـەتام و لـەزەتترین شێوە و حاڵەتـەکانی میـهرەبانی لـەو بێچووانـەوە دەردەکـەوێت. نـابینیت دەستەوسـانیی بێچـووی نـاو هێلانـەکان چــۆن دایکانیـان دەکـات بـە خزمـەتکار و سـەربازی چـاوەڕێی فـەرمان؟ ئـەوەتا دوور و نزیـك دەگـەڕێن بـۆ پـەیدا کـردن و هێنـانی ڕۆزیـی ئـەو بێچووانـە؟ بـەڵام هـەر ئــەوەندەی بێچووەکانیان پەڕ و باڵ دەردەکەن و لاوازییان تێدا نامێنێت، هەر خـودی ئەو دایکانە پێیان دەڵێن: بڕۆن، بۆ خۆتان ڕۆزیی خۆتان پەیدا بکەن. ئیتر هیـچ گوێیـان پـێ نـادەن و خەمیان ناخۆن!

هەروەك نهێنیی میهرەبانیی خوای گەورە سەبارەت بەم بێچووانە بەم جۆرە دەکەوێتە کار، بۆ ئەو پیرانەش بە هەمان جۆرە کە لە گۆشەی دەستەوسانی و بێ دەستەلاتی‌یەوە وەکو منالی ساوا و بێچوویان لێ هاتووە!

ئەزموونی تایبەتیی خۆم قەناعەتێکی تەواوی پێ بەخشیوم کە هەروەك میهرەبانیی خواوەند رۆزیی ئەو ساوا و بێچووانە - بەهۆی بێ دەستەلاتی‌یانەوە - بە شێوەکی سەرسوورهێنەر دەنێرێت و سەرچاوەی مەمکان دەتەقێنێتەوە و وەك لافاوی بەخوڕی لێ دەکات بۆیان.. بە هەمان جۆر، رۆزیی ئەو پیرە باوەڕدارانەش کە وەك منالی ساوا و بێ گوناهیان لێ هاتووە، لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەند و لە شێوەی بەرەکەتدا بۆیان رەوانە دەکرێت. ستوون و پشتیوانی بەرەکەتی هەر مالێك تەنها ئەو پیرانەن کە تیای‌دا دەژین. هەر ئەو پیرە نوێژپاکانەن کە مالیان ئاوەدان کردووەتەوە، دەبن بەهۆی پاراستنی مالەکانیان لە هەموو بەلا و گیروگرفتێك.

ئەم راستی‌یەش بەشێکی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەیچەسپێنێت کە دەفەرموێ:
"... لولا الشُّيوخُ الركَّعُ لصُبَّ عليكم البلاء صبّاً"[1].

ئیتر مادەم "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی سەردەمی پیری، دەبن بە تەوەرەی دەستخستنی میهرەبانیی خوای گەورە..

مادەم قورئانی پیرۆزیش لە پێنج پلەدا و بە شێوازێکی ئیعجازبەخشی ناوازە، داوا لە منال و نەوەکان دەکات کە رێزی دایك و باوك بگرن و، بەسۆز و بەزەیی و میهرەبان بن بۆیان:

**﴿إِمّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُما فَلا تَقُلْ لَهُما أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُما وَقُلْ لَهُما قَولاً كَرِيماً ۞ وَاخفِضْ لَهُما جَناحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحمةِ وَقُلْ رَبِّ ارحمهُما كَماَ رَبَّيانِي صَغِيراً﴾** (الإسراء:٢٣ - ٢٤)..

مادەم ئیسلام فەرمانی بە بەزەیی و رێزلێگرتنی پیران داوە و، سروشتی مرۆڤایەتیش خواستی لەسەر ئەم بەزەیی و رێزەیە..

---

(١) لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە: (لولا عباد لله ركّع وصبية رضّع وبهائم رتّع لصُبّ عليكم البلاء – وفي رواية العذاب – صباً). واتە: ئەگەر لەبەر پیرانی نوێژپاك و منالانی شیرەخۆر و ئاژەلانی موحتاج بە لەوەڕ نەبوایە، ئەوا دەردوبەلاتان بەسەردا دەباری. رواه الطيالسي والطبراني وابن منده وابن عدى وغيرهم عن ابي هريرة رفعه... ورواه السيوطي في الجامع الصغير – الحديث نفسه – ثم رُصّ رصّاً، قال المناوي نقلاً عن الهيثمي. وهو ضعيف. (باختصار عن كشف الخفاء ١٦٣/٢). (وەرگێڕ)

ئەوا دەبێ ئێمەی بەساڵاچوو "پیری"یەکەمان بە سەد قۆناغی "لاوی" نەگۆڕینەوە! چونکە لە بریی ئەو چێژە ماددی‌یانەی کە لە لاوی‌دا هەن، ئێمە چەند چێژێکی مەعنەوی و هەمیشەیی و شایستەمان هەیە و، لەو بەزەیی و ڕێزەوە دەستمان دەکەوێت کە لە چاودێریی میهرەبانیی خوا و سروشتی مرۆڤایەتی‌یەوە هەڵقوڵاون.

بەڵێ، لەبەر دڵدانەوە و متمانە بەخشین بە دڵی ئێوەش، دڵنیاتان دەکەمەوە کە: ئەگەر دە ساڵی سەردەمی لاویی "سەعیدی کۆن"م بدەنێ، نایگۆڕمەوە بە یەك ساڵی سەردەمی پیریی "سەعیدی نوێ"!

لەبەر ئەوە، من ڕازیم بە پیریم. دەسا ئێوەش وەك من پێی ڕازی بن!

### ❐ ئومێدی دەهەم:

دوای ئەوەی لە "دیلی" گەڕامەوە، بە درێژایی دوو ساڵ لە ژیانی ئەستەمبوولم - سەر لە نوێ - بێ‌ئاگایی سەری تێ کردبوومەوە. چونکە باری ڕامیاریی ئەو کاتەی ئەوێ و تەوژمەکانی، زەین و بیری منیان شپرزە و پەرتەوازە کرد و سەرقاڵیان کردم بە خۆیانەوە و، نەیانهێشت ئاوڕێك بە لای خۆمدا بدەمەوە و بە قووڵی لە خۆم ورد ببمەوە.

ڕۆژێکیان لە شوێنێکی بەرزی گۆڕستانی "ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری"دا - خوای لێ ڕازیی بێت - کە بەسەر دۆڵێکی قووڵدا دەیڕوانی، دانیشتبووم و سەرنجم لەو ئاسۆیانەی دەوروبەری ئەستەمبووڵ دەدا. کتوپڕ دنیا تایبەتی‌یەکەی خۆمم وا هاتە پێش‌چاو کە لە سەرەمەرگدا بێت! چونکە لە ئەندێشەمدا وام هەست دەکرد کە لە هەندێ لامەوە ڕۆحم دەکێشرێت! منیش لەبەر خۆمەوە وتم: ئایا بڵێیت نووسراوی سەر ئەم کێلانە بۆ ئەم جۆرە ئەندێشانە هانیان دابێتم؟ ئەمەم وت و، ڕووی خۆمم لەو ئاسۆ دوورانە وەرچەرخاند و ڕوانیمە گۆڕستانەکە. لەم کاتەدا ئەم واتایە خرایە دڵمەوە کە:

(ئەم گۆڕستانەی چواردەورت سەد ئەستەمبوولی تێدایە؛ چونکە سەد جار ئەستەمبوولی تێدا ڕۆکراوە! دانستی خواوەندی بەتوانا و دانایش کە دانیشتووانی ئەستەمبوولی لێرەدا خاڵی کردووەتەوە، هەرگیز تۆ لەوان جیا ناکاتەوە و دەبێ تۆش وەك ئەوان بڕۆیت و ئێرە بەجێ بهێڵێت)!

بەم خەیاڵە سامناکەوە گۆڕستانەکەم بەجێ‌هێشت و، ڕۆشتمە ناو ژوورێکی بچووك لە مزگەوتی "ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری"دا، کە پێشتر زۆر جار دەڕۆشتمە ناوی..

لەوێ بیرم لە خـۆم کـردەوە و، بۆم دەرکـەوت کـە مـن لـە سێ لاوە میـوانم. چونکـە هەروەك لەم ژووره بچکۆلەیەدا میوانم، بە هەمان جۆر لـە ئەستەمبوولیشـدا، تەنانـەت لـە دنیاشـدا میـوانم و دەبێ بـڕۆم و بـەجێی بـهێڵم! خـۆ دیـارە میوانیـش دەبێ بـیر لـە ڕێگـا و سەفەری خۆی بکاتەوە و مشووری بۆ بخوات! بەڵێ هەروەك لەم ژووره بچوو کە دەڕۆمە دەرەوە و چۆڵـی دەکـەم، بـە هـەمان شـێوە ڕۆژێکیـش دێـت کـە لـە ئەستەمبوول دەڕۆمـە دەرەوە و بەجێی دەهێڵم، هەروەك دەبێ ڕۆژێك بێتە پێشەوە کە ئەم دنیایەش بەجێ بهێڵم!

خەفـەت و ئـازارێکی لێڵ و تـەماوی لـەم حاڵـەدا خـۆی هاویشـتە سـەر دڵ و بـیر و ئەندێشـەم! چونکـە بێ گومـان کــە مـن کـاتێك ئەسـتەمبوول بـەجێ دەهێڵـم تەنـها لـە ژمارەیەکی کـەمی هـاوڕێ و دۆسـت و خۆشـەویستانم دانـابڕێم، بـەڵکو لـە هـەزاران دۆسـت و خۆشەویستی ئەستەمبوول دوور دەکەومـەوە. تەنانـەت کـە لــەم دنیـا جوانـە دەردەچم هەزاران بەڵکو سەدان هەزاریان لە دوای خۆم لـێ بەجێ دەهێڵم!

بەم حاڵە و بەدەم خەفەتەوە جارێکی تر ڕۆشتمەوە بۆ هەمان شوێنی ناو گۆڕستانەکە. ئەم جارەیان دانیشتووانی ئەستەمبوولـم وەك چـەندین تـەرم هاتنـە پێش‌چـاو کـە هەڵسـابنە سـەر پێ و بـەڕێدا بـڕۆن! بـە وێنـەی ئـەو ئەکتەرانـەی کـە خۆیـان مـردوون، کـەچی لـە فلیمـەکانی سینەمادا - چونکـە بـە نیـازی وەرگرتنـی پـەند و عیـبرەت جـار بـەجارێك دەڕۆشتمە سەیریان - دەردەکەون و دەجوولێنەوە!

ئەندێشەم پێی وتم:

مادەم هـەندێك لـەم تەرمانـەی کـە ئێستا لـەم گۆڕستانەدا نوستوون، دەگونجێ وەك ئەکتەرەکانی سینەما دەربکەون و بجوولێنەوە، کەواتـە بـیر لـەو خەڵکانـەش بکـەرەوە کـە دێنە ناو ئەم گۆڕستانە و هـەر لـە ئێستاوە وا دابنێ کـە ڕۆشتوونەتە نـاو گۆڕەکانیانـەوە! کەواتە ئێستا هەموو ئەوانە تەرمن و دەجوولێنەوە!

لەم کاتەدا کە من بەم خەفـەت و بـارە ئازاربەخشـەوە دەتلامـەوە، لـە ناکـاودا بـەهۆی نووری قورئانی پیرۆز و، بە ڕابەریی شێخی گەیلانی - قُدِّسَ سِـــرُّهُ - نورێکـی خـۆش و بەتام و لەزەتم لە قورئانی پیرۆزەوە بە هاناوە هات کە ئەو حاڵەتـە خەفـەت بزوێنـەی لـەناو برد و گەشاندمیەوە و دڵی خۆش کـردم. چونکـە ئـەو نـوورەی کـە لـە قورئـانی پـیرۆزەوە هات بە هانامەوە و لە ڕووی دڵمدا کرایەوە، ئەمانەی خوارەوەی یاد خستمەوە:

(لە دەمی دیلیت لـە "کۆستڕما" یەك دوو ئەفسەری دیلـی هـاوڕێت لەگـەڵدا بـوون و، بـە دڵنیاییشـەوە دەتزانـی کـە ڕۆژێـك دێـت هـەموویان دەگەڕێنـەوە بـۆ ئەستەمبوول. خـۆ

ئەگەر ئەو کاتە یەکێکیان لێی بپرسیتایە: " ئایا لێرە دەمێنیتەوە یان دەگەڕێیتەوە بۆ ئەستەمبوول"؟ بێ گومان - ئەگەر نەختێك هۆش و ژیریت بوایە - بەوپەڕی شادمانی و خۆشحاڵییەوە ڕۆشتنەوەت بۆ ئەستەمبوول هەڵدەبژارد. چونکە لە نێوان هەزار دۆست و خۆشەویست و هاوڕێدا نۆسەد و نەوەد و نۆیان لەوێن، بەلام لێرەدا مەگەر یەك دوانێکیانت لەگەڵدا بن، کە ئەوانیش بە دڵنیاییەوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوێ. واتە ڕۆشتنەوەت بۆ ئەستەمبوول هیچ نابێتە مایەی خەفەت و ئازار. خۆ وا هاتیتەوە و، لە وڵاتی دوژمنان و شەوگارە دوور و درێژە ڕەش و تاریکەکانی و زستانە سارد و سڕەکەی ڕزگارت بوو و، گەیشتیتەوە ئەو ئەستەمبوولە جوان و خەملاوەی کە دەڵێی "بەهەشتی سەر ڕووی زەوی"یە. ئایا هێشتا بەمە ڕازی نابیت و شوکری خوای گەورەی لەسەر ناکەیت؟!

بە هەمان جۆر، لە سەدا نەوەد و نۆی خۆشەویستانی درێژایی تەمەنیشت، هەر لە منالێتەوە تا ئێستا، کۆچیان بۆ ئەو گۆڕستانە کردووە کە بە ڕواڵەت ترسناك دیارە. خۆ ئەگەر یەك دوانێکیشیان لە دنیادا مابن، ئەوانیش لە ڕۆشتندان بۆ ئەوێ. کەواتە مردنت جودایی و لێکدابڕان نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا پێ شادبوون و بەیەك گەیشتنەوەیە لەگەڵ ئەو خۆشەویستانەتدا..

بەڵێ، "گیان"ی نەمری ئەوان هەندێکیان هێلانە ڕووخاوەکەی ژێر زەوییان جێهێشتووە و لە گەشتی ناو ئەستێرەکاندان و، هەندێکی تریشیان لە ناو چینەکانی جیهانی بەرزەخدا دەژین).

بەم جۆرە ئەو نوورەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە هات بە هانامەوە و لە ڕووی دڵمدا کرایەوە، ئەمانەی سەرەوەی یاد خستمەوە.

"قورئان" و "ئیمان" ئەم ڕاستییەیان بە جۆرێکی هێندە بەهێز و گومانبڕ چەسپاندووە کە ئەگەر کەسێك "دڵ" و "گیان"ی خۆی لەدەست نەدابێت، یاخود نوقمی گومڕایی نەبووبێت، وەك بە چاو بیبینێت ئاوا باوەڕ بەم ڕاستییە دەهێنێت و هەستی پێ دەکات. چونکە ئەو خوایەی کە بۆ ئاشکرا کردنی کەرەم و میهرەبانیی پەروەردگارێتییەکەی، ئەم جیهانەی بە لوتف و سۆزی خۆی و نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی ڕازاندووەتەوە و پارێزگاریی هەموو شتێکی بوونەوەر، تەنانەت شتە بچووکە هەندەکییەکانی وەك تۆوی ڕووەك و درەختەکانیش دەکات.. ئاشکرایە ئەم بەدیهێنەرە میهرەبان و بەخشندەیە، نایەوێت ئەو مرۆڤەی کە ڕێکوپێکترین و ڕێزلێگیراوترین و گرنگترین و

خۆشەویستترینی بەدیهێنراوانیەتی، هەروا بە بێ دوارۆژ و بێ بەزەییی‌یانە لەناو بباتو بە لە ناوبردنی هەمیشەیی بیفەوتێنێت - وەك لە ڕوالەتدا وا دەردەکەوێت - بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ هەروەك چۆن جووتیار تۆوی دەغڵ و دان لە زەوی‌دا دەچێنێت تاکو لە شێوەی ژیانێکی تری وەك گوڵە گەنمدا دروست بکرێتەوە، خواوەندی میهرەبانیش کە مرۆڤ بۆ ماوەیەکی کەم دەخاتە ژێر خاکی دەروازەی چوونە ژوورەوەی جیهانی پڕ لە میهرەبانی و بەزەیی‌یەوە، بۆ ئەوەیە کە لە ژیانی دوارۆژدا ئەو مرۆڤە بەروبوومی خۆی بەخشێت[1].

پاش ئەوەی کە ئەم ئاگاداری‌یەم لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگرت، لە ئەستەمبووڵ زیاتر دڵم بەو گۆڕستانە دەکرایەوە و، گۆشەگیری و تەنیاییشم لە تێکەڵاویی خەڵکی گەلێ پێ خۆشتر بوو! هەر ئەمەش بوو کە هانی دام جێگایەك بۆ گۆشەگیری بدۆزمەوە لە "صاری یەر"دا کە بەرزایی‌یەکە بەسەر دەربەندی "بسفۆڕ"دا دەڕوانێت. ئیتر بۆ خۆم لەوێ دادەنیشتم و، شێخی گەیلانی - خوای لێ ڕازی بێت - لە ڕێی کتێبی "فتوح الغیب"ەوە بوو بە مامۆستا و پزیشك و ڕابەرم و، "ئیمامی ڕەببانی"یش- خوای لێ ڕازی بێت - بەهۆی "مەکتوبات"ەکەیەوە بوو بە مامۆستایەکی دڵدەرەوەی بەسۆزم.

بەم جۆرە، منەتباری و ڕەزامەندی‌یەکی تەواوم بە پیری و دوورکەوتنەوەم لە ڕابواردن و چێژە شارستانێتی‌یەکان و خۆکشانەوەم لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەربڕی و، شوکرانەبژێری‌یەکی زۆرم لە دەرگانەی خوای گەورەدا پێشکەش کرد.

ئەی ئەو کەسەی کە وەك من بەرەو پیری دەڕوات!

ئەی ئەوانەی کە بەهۆی هەڕەشەی پیری‌یەوە هەردەم لە یادی مردندان!

پێویستە ئێمەمانان نەك هەر تەنها بە "پیری" و "نەخۆشی" و "مردن" ڕازی بین، بەڵکو پێویستە خۆشمان بوێن و، لە ڕوانگەی ئەو نوورەی ئیمان کە قورئانی پیرۆز هێناویەتی بە جوان و خۆشیان بزانین!

خۆ مادەم ئێمە گەورەترین نیعمەتمان هەیە کە ئیمانە، ئیتر "پیری" شتێکی خۆشە. "نەخۆشی" و "مردن"یش هەر بەو جۆرەن.

---

(١) لە هەموو پەیامەکاندا، بە تایبەتی: "وتەی دەهەم - پەیامی حەشر" و "وتەی بیست و نۆهەم - لە بارەی مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژەوە" ئەم ڕاستی‌یەمان بە جۆرێکی وا بەهێز و دامەزراو چەسپاندووە وەك گومان نەبوون لەوەی کە: "دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار". (دانەر)

تەنها شتێك کە بە تەواوی ناشیرین و بێز لێکراو بێت بریتی‌یە: لە گوناهـ و هەرزەیی و بیدعەت و گومڕایی. خۆ ئێمەش - سوپاس بۆ خوا - لەوانەوە دوورین.

### ❐ ئومێدی یازدەهەم:

کاتێ کە لە دیلی گەڕامەوە، لەگەڵ "عەبدوڕڕەحمان"ی برازامدا[١] لەناو خانوویەك لەسەر لوتکەی "چاملیجە"ی ئەستەمبوڵ نیشتەجێ بووبووم.

دەکرێت ئەو جۆرە ژیانە - لە لایەنی دنیایی‌یەوە - بۆ ئێمەمانان لە چەند ڕوویەکەوە بە ژیانێکی میسالی دابنرێت. چونکە لە لایەکەوە لە دیلی ڕزگارم بووبوو. لە لایەکی تریشەوە دەرگاکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی "دار الحكمة الإسلامية"[٢] بەپێی پیشە و ئەرکی زانستیی سەرشانم لە من کرابوونەوە. ئنجا ناوبانگیش بە ڕادەیەك دەورەی دابووم کە من شایستەی نەبووم. ئەمە جگە لەوەی کە من لە خۆشترین شوێنی ئەستەمبوڵ (چاملیجە)دا دەژیام و، هەموو شتێکم بە گوێرەی دڵ بوو، چونکە خوالێخۆشبوو "عەبدوڕڕەحمان"ی برازامم لەگەڵدا بوو، کە جگە لەوەی لەوپەڕی وریایی و زیرەکی‌دا بوو، لە هەمان کاتدا قوتابی و خزمەتگوزار و نووسەر و مرۆڤێکی گیانفیدا بوو، بە ڕادەیەك کە من بە کوڕێکی مەعنەویی خۆمم دادەنا.

لەم کاتەدا کە خۆم بە بەختەوەرترین کەسی ئەم جیهانە دەزانی، سەیرێکی ئاوێنەم کرد. هەر هێندەی چەند تاڵێکی سپیم لە سەر و ڕیشمدا بەدی کرد، یەکسەر ئەو بێداربوونەوە ڕۆحی‌یەی سەردەمی دیلیم کە لە مزگەوتەکەی "کۆستڕما"دا هەستم پێ کرد، بە بینینی ئەم تاڵە مووە سپی‌یانە سەری هەڵدایەوە! لەمەوە دەستم کرد بە سەرنجدان و بیرکردنەوە لەو شتانەی کە بە دڵ پەیوەستیان بووم و وامدەزانی مایەی بەختەوەریی ژیانی دنیان. بەڵام دوای سەرنجدانێکی ورد بۆم دەرکەوت کە هەموو یەکێکی ئەو حاڵەت و هۆکارانە، کەم نرخ و مرۆڤ خەڵەتێنەرن و شیاوی ئەوە نین کە

---

(١) ناوی "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا"یە و برازای مامۆستا نوورسی‌یە. لە ساڵی (١٩٠٣ز) لە گوندی "نوورس" لە دایك بووە و، لە ساڵی (١٩٢٨ز)یشدا لە گوندی "زولفەزڵ"ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسیی نووسیوە کە هەر لە سەرەتای ژیان و لەدایکبوونی مامۆستاوە تا ساڵی (١٩١٨ز) باسی ژیانی ئەوی تێدا کردووە و، لە کتێبێکدا کە لە ئەستەمبوڵ چاپی کردبوو، بڵاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

(٢) (دار الحكمة الإسلامية): باڵاترین دام و دەزگای زانستیی ئەو سەردەمە و سەر بە (مەشیەختی ئیسلامی)ی دەوڵەتی عوسمانی بووە. (وەرگێڕ)

دڵیان پێوە ببەسترێت. سەرەڕای ئەمانەش، لەم کاتەدا بچڕانی پەیوەندیی هاوڕێیەتی، تەنانەت بێ وەفایی‌یەکی چاوەڕوان نەکراوم لە هاوەڵێکی دڵسۆزم دی کە هەرگیز شتی وام بە دڵدا نەدەهات.. ئەمانە هەموویان، بوون بە مایەی دوورکەوتنەوە و بێزاری و نەفرین کردنم لە ژیانی دنیا و، لە دڵی خۆمم پرسی:

(ئایا من خەڵەتاوم کە دەبینم زۆربەی خەڵکی بە چاوی غیبتە و حەسوودی‌یەوە سەیری ئەم ژیانەی ئێمە دەکەن، کە لە ڕاستی‌دا شایستەی شیوەن و گریانە؟! ئایا ئەو هەموو خەڵکە شێت بوون؟ یان من بەرەو شێتی دەڕۆم کە ئەو شەیدایانەی دنیا بە شێت دەزانم)؟!

بە هەرحاڵ.. ئەم بێداربوونەوەیەی کە بە هۆی بینینی پیری‌یەوە ڕووی دا، بە باشی و جوانی نەمانی شتانی "فانی"ی پیشان دام و تێی گەیاندم کە دەبێ هەر بڕۆن و چاوەڕێی مانەوە نەکەن!

کە ئاوڕم بە لای خۆمدا دایەوە، بینیم لەوپەڕی دەستەوسانیدام. "گیان"یشم کە داخوازی مانەوە و نەمری‌یە و، دەستی لە داوێنی دنیا و ئەو شتانە گیر کردبوو کە ڕوو لە نەمانن، چونکە پێی وابوو نەمری و مانەوەیان تێدایە، ئەم گیانە کە دەوستەوسانیی منی بۆ دەرکەوت، بە دەم هاوارەوە و وتی:

(مادەم جەستەم فانی بێت، دەبێ چ سوودێکم لەم شتە "فانی"یانە دەست بکەوێت؟.. کە خۆم بەم جۆرە دەستەوسان بم، دەبێ چاوەڕێی چی بم لە دەستەوسان و بێ دەستەڵاتان؟! کەواتە ئەم دەردە هیچ دەرمانێکی نی‌یە و چارەسەر ناکرێت، مەگەر تەنها لای ئەو خواوەندە باڵادەستەی کە هەر بووە و هەر ئەبێ و دەمێنێتەوە).

بەم جۆرە کەوتمە گەڕان و بەدواداچوون..

یەکەم شت کە بۆ مەبەستی دۆزینەوەی هیوا و ئومێد پیای‌دا ڕۆشتمەوە، ئەو زانستانە بوون کە زووتر خوێندبوومن و دەستم کەوتبوون. بەڵام بەداخەوە من تا ئەو کاتەش زانستە ئیسلامی‌یەکان و زانستە فەلسەفی‌یەکانم تێکەڵ کردبوون و پێکەوە لێم هەڵدەگۆزین. ئنجا لەبەر ئەوەی کە من لەڕادەبەدەر بەهەڵەدا چووبووم، وامدەزانی ئەم بابەتە فەلسەفی‌یانە سەرچاوەی کامڵ بوون و پێشکەوتن و تەوەرەی "ڕۆشنبیری"ن! کەچی لە ڕاستی‌دا هەر ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانە بوون کە سەریان لە ڕۆحم شێواند و لەکەی زۆریان لەسەر هەڵچنی و هەر ئەوانیش بوون بە تەگەرە لە ڕێی بەرزبوونەوەی مەعنەویمدا.

بەڵێ، لەو کاتەدا کە من بەم حاڵەوە دەتلامەوە، میهرەبانی و کەرەمی خوای گەورەی بەتوانای باڵادەست دانستە بەرز و پیرۆزەکەی قورئانی پیرۆزی نارد بە هانامەوە و، لەکەی ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانەی داشۆرد و "گیان"ی منیان لەوانە پاك کردەوە، وەك لە زۆر پەیامدا باس کراوە. چونکە ئەو تاریکی‌یە ڕۆحی‌یەی کە لە زانستە فەلسەفی‌یە تازەکانی لەمەڕ بوونەوەرەوە سەرچاوە دەگرن، نزیك بوو ڕۆحی منیش داپۆشن و ڕۆشنایی‌یەکەی لە ناوەندی بوونەوەراندا نغرۆ بکەن. ئەوەبوو هەرکاتێ کە دەمڕوانی‌یە هەر لایەنێکی ئەو بابەتە فەلسەفی‌یانە، تروو سکایی‌یەك ڕوونا کیم تێدا نەدەبینین و تەنانەت تەنگە نەفەسیش دەبووم! هەتا ئەو دەمەی کە نووره درەخشانە تەوحیدی‌یەکەی قورئانی پیرۆز هات و تەلقینی "لا إله إلاّ هو"ی دادام و، ئەو تاریکی‌یەی لەسەر ڕەواندمەوە و سنگم کرایەوە. ئنجا توانیم بەوپەڕی حەوانەوە و دڵنیایی هەناسەی ئاسوودەیی هەڵبکێشم.

بەڵام نەفس و شەیتان، بەهۆی ئەو دەرس و ئامۆژگاری‌یانەی کە لای گومرایان و ئەهلی فەلسەفە خوێندبوویان، خۆیان بۆ ڕانەگیرا و پێکەوە هێرشیان کردە سەر "دڵ" و "ژیری"م. ئەوەبوو لەم هێرشەدا چەند گفتوگۆ و وتووێژێك لە نێوان هەردوو لادا ڕووی دا، کە سوپاس بۆ خوا بە سەرکەوتنی "دڵ" و دام و دەستەکەی کۆتایی پێ هات!

جا لەبەر ئەوەی بەشێکی ئەم گفتوگۆ و وتووێژانە لە زۆربەی پەیامەکاندا باس کراون، ئەوا لێرەدا دووپاتیان ناکەینەوە، بەڵام تەنها یەك بەڵگەی نێوان هەزاران بەڵگە دەهێنین بۆ دەرخستنی ئەو سەرکەوتنەی "دڵ" بەسەر "نەفس و شەیتان"دا و، بۆ ئەوەش کە ئەم بەڵگەیە دڵ و گیانی هەندێ لەو پیرە بەرێزانە پاك و خاوێن بکاتەوە کە تاوێك بە گومرایی و تاوێك بە خۆخەریك کردن بە شتی بێ‌هوودەوە "گیان" و "دڵ"یان لەکە و تەپوتۆزی لێ نیشتووە و "دەروون"یشیان لە سنووری خۆی دەرچووە بەو شتانەی کە لە ژێر پەردەی زانیاری و هونەرە شارستانی‌یەکاندا خۆیان مەڵاس داوە و دووچاری ئەو پیرە بەرێزانە بووە، تاکو - پشت بە خوا - ئەوانیش خۆیان لە زیانەکانی نەفس و شەیتان ڕزگار بکەن.

گفتوگۆکە بەم شێوەیەی خوارەوە دەستی پێ کرد:

"دەروون"م - بە ناوی زانستە فەلسەفی‌یە ماددی‌یەکانەوە - ئەم پرسیارەی ئاراستەی دڵم کرد:

(سروشتی شتانی نـاو گـەردوون وایـە کـە تێکـەڵی بوونـەوەران دەبـن و دەڕۆنـە ناویانەوە.. ئەوەتا هەموو شتێك پەیوەستە بە هۆکار(سبب)ێکـەوە و لـەو هۆکـارەوە پـەیدا بـووە. بـۆ نموونـە: "بـەر" لـە درەخـت و، "دانەوێڵـە" لـە خاکـەوە وەردەگـیرێت. ئیـتر ئایـا پاڕانەوە لە خوا و داواکردنی بچووکترین شتی جوزئی لەو خوایە چ واتایەکی تێدایە)؟!

یەکسـەر لـەم کاتـەدا بـەهۆی نـووری قورئـانی پـیرۆزەوە نـهێنیی "تـەوحید"م لـێ دەرکـەوت و "دڵ"یـش بـەم شـێوەیەی خـوارەوە کـردی بـە وەڵامـی پرسـیارەکەی "دەروون" و، وتی:

بچووکـترین شـت - کتومـت وەك گـەورەترین و مـەزنترین شـت - ڕاسـتەوخۆ لـە توانسـت و گەنجینـەی بەدیهێنـەری بوونـەوەرەوە دێـت و پـەیدا دەبێـت. جگـە لەمـە هیـچ ڕێیەکی تر لـە ئارادا نییـە و، "هۆکارەکـان"یـش تەنـها پـەردەی ڕووی توانسـتی خـوای گەورەن. چونکـە ئـەو شتەی کـە بـەپێی بۆچوونـی ئێمـە بـە بچووکـترین و کـەم نرخـترین بوونەوەر دەردەکەوێت، دەگونجێ لە ڕووی دروسـتکردن و بەدیـهێنان و ڕێکوپێکیـیەوە لە مەزنترین بەدیهاتوو گرنگتر و گەورەتر بێت..

بۆ نموونە: ئەگەر "مێش" لە ڕووی بەدیهێنانەوە لە "مریشك" وردتر و گرنگتر نـەبێت، ئەوا هەرگیز هیچی لەو کەمتر نییـە! کەواتـە لـە ڕوانگـەی بەدیهێنانـەوە نـاتوانرێت هیـچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوان "گەورە" و "بچووك"دا بکرێـت. یـان ئەوەیـە دروسـتکردنی هەموویان - بە گەورە و بچووکەوە - بدرێتە پـاڵ هۆکـارە ماددییەکان، یـان ئەوەیـە بـە گشتی بدرێتە پاڵ خوای تاك و تەنیا..

جا لە کاتێکدا کەرتی یەکـەمیان کـارێکی نـەگونجاوی مەحاڵـە و لـە پەسـەند کردنـی ژێرییەوە دوورە، کەچی کـەرتی دووهـەم باوەڕێکـە لـە پلـەی "وجـوب"دایـە و پێویستە باوەڕمان پێی ببێت.

چونکە:

مـادەم زانسـتی خـوای گـەورە دەورانـدەوری هـەموو شتێکی داوە و هــەموو شـتێك دەگرێتـەوە، وەك لـە ڕێکوپێکـی بوونــەوەر و حیکمەتەکانیــەوە دەردەکـەوێت.. مـادەم ئەندازەی هەموو شـتێك لـە زانسـتی خـوای گـەورەدا دەستنیشـان دەکرێـت.. مـادەم ئـەم بوونەوەرانـەی کـە لەوپـەڕی ڕێکوپێکـی و جوانـیدان، وەك لــە بەرچـاودایـە، بەوپـەڕی ئاسانی لـە نەبوونەوە دێنە جیـهانی بوون.. مـادەم ئـەو زانـا بەتوانایـە خـاوەنی توانستێکی وەهایـە کـە لـە مـاوەی چاوتروو کـاندنێکدا هـەموو شتێك بـە فـەرمانی: "کـن فیکـون"

بەدیدەهێنێت، وەك لە زۆر پەیامدا بە بەڵگەی بەهێز چەسپاندوومانە، بە تایبەتی لە مەکتووبی بیستەم و کۆتایی بریسکەی بیست و سێ‌هەمدا..

ئەوا دەبێ ئەم ئاسانی‌یە ڕەها و دەراسایەی کە بە چاو دەبینرێن تەنها هی گشتگیری(الإحاطة)ی زانستی خواوەند بێت بە هەموو شتێك و ئەنجامی مەزنیی توانستە ڕەهاکەی بێت بەسەر هەموو شتێکدا.

بۆ نموونە: ئەگەر ماددەیەکی کیمیایی تایبەتی بەسەر کتێبێکدا بهێنیت کە بە مەرەکەبێکی کیمیایی تایبەتی و نەبینراو نووسرابێتەوە، یەکسەر نووسراوی نەبینراوی کتێبەکە دەردەکەوێت و هەموو کەسێك دەتوانێت بیخوێنێتەوە، بە هەمان جۆر ئەندازەی هەموو شتێکیش لە زانیاریی گشتگیر و بێ‌سنووری خوای گەورەدا دیاری کراوە، جا کاتێ کە ئەو خواوەندە بەتوانا و خاوەن دەسەڵاتە بەوپەڕی ئاسانی و بە فەرمانی: "کن فیکون" هێزی توانستی خۆی - بە وێنەی ماددە کیمیایی‌یەکەی ناو نموونەکە - بە توانستی ڕەها و ویستی جێبەجێ کراوی خۆی بەسەر ئەو ماهییەتە زانستی‌یەدا دەهێنێت، یەکسەر بوونی دەرەکیی پێ دەبەخشێت و دەیهێنێتە پێش‌چاو، ئەو کاتەش نەخشونیگارەکانی دانستی ئەو بە ڕوونی دەخوێنرێنەوە.

(ئەمە ئەگەر کاری "بەدیهێنان" بدرێتە پاڵ خوای تاك و تەنیا و خاوەن زانستی گشتگیر و توانستی ئەزەلی).

بەڵام ئەگەر بەدیهێنان و دروستکردنی هەموو شتێك تێکڕا نەدرێتە پاڵ خاوەن زانستی ڕەها و توانستی ئەزەلی، ئەوا دەبێ بۆ بەدیهێنان و دروستکردنی بچووکترین بەدیهاتووی تەنانەت وەك مێشێك هەرچی شت لەم بوونەوەرەدا پەیوەندی‌یەکی بەو مێشەوە بێت، بە کێشانە و تەرازوویەکی وردی تایبەتی لە جەستەی ئەو مێشەدا کۆ بکرێنەوە! تەنانەت دەبێ هەموو ئەندام و گەردیلەیەکی کارگوزاری جەستەی ئەو مێشە ئاگاداری‌یەکی تەواوی لە نهێنیی بەدیهێنانی مێش و حیکمەتی بوونی ببێت، بەڵکو دەبێ بە دوور و درێژی ئاگادار و شارەزای ئەو وردەکاری‌یەش بێت کە لە بەدیهێنانی‌دا هەیە!

جا مادەم هۆکارە ماددی و سروشتی‌یەکان - وەك لای هەموو مرۆڤێکی ژیر و هۆشمەند ئاشکرایە - هەرگیز ناتوانن هیچ شتێك لە نەبوونەوە بەدی‌بهێنن، ئەوا ئەوپەڕی توانای ئەو هۆکارانە تەنها "کۆکردنەوە"ی شتانە. جا لەبەر ئەوەی لە کۆکردنەوە زیاتر هیچی تریان لە توانادا نی‌یە و، لە لایەکی تریشەوە هەموو زیندەوەرێك نموونەی زۆربەی توخمەکانی بوونەوەری تێدایە (وەك بڵێی تۆوی بوونەوەر و پوختەکەی بێت) ئەوا دەبێ

گشت گەردیلەکانی "تۆو" لە درەختێکی تەواودا دەربهێنرێن و کۆ بکرێنەوە و، هەموو توخمەکانی زیندەوەر و گەردیلەکانیشی، دوای پاڵفتەکردن و ڕێکخستن و ئەندازەکردنیان زۆر بە وردی و بە چەند تەرازوویەکی تایبەتی و چەند پاڵێوگەیەکی زۆر ورد، لە سەرانسەری جیهاندا بهێنرێن و کۆ بکرێنەوە!

بەڵام لەبەر ئەوەی هۆکارە ماددی و سروشتییەکان وشك و ڕەق و بێ ئاگان، ئەوا نازانن پلان و پرۆگرام و پێرستێك بۆ ئەم کارە دابڕێژن و ڕێکیبخەن و، لە توانایاندا نییە مامەڵە لەگەڵ گەردیلەکانیاندا بکەن و لە چەند قاڵبێکی مەعنەویدا بیانتوێننەوە بۆ ئەوەی بڵاو نەبنەوە و ڕێکوپێکییان تێك نەچێت، لە کاتێکدا کە دەگونجێ هەر یەك لە بەدیهاتووان لە چەندین شکڵ و شێوەی بێ سنووردا دەربکەون..

لەبەر ئەوە، بەخشینی یەکێك لەو شێوە بێ سنوورانە بەو بەدیهاتووە جگە لە شێوەکانی تر و، و ڕێکخستنی ئەو شێوەیە بەوپەڕی ڕێکوپێکی و بە ئەندازەیەکی دیاریکراو، بەبێ بڵاوبوونەوەی گەردیلەکانی توخمەکان - کە وەك لافاو وان - پاشان بنیاتنانیان یەك لەسەر یەك بەبێ هیچ جۆرە قاڵبێکی تایبەتی و بەبێ دەستنیشانکردنی ئەندازەیەکی دیاریکراو، پاش ئەمانەش بەخشینی بوونێکی ڕێکوپێك و دەرەکی بەو زیندەوەرە.. ئاشکرایە کە ئەنجامدانی ئەم هەموو کارانە - بەم جۆرە لە لایەن هۆکارە ماددییەکانەوە - کارێکە لە سنووری توانا بەدەرە و، تەنانەت لە سنووری ژیری و گریمانیشدا نییە!

دیارە هەرکەسێك بینایی ژیر و هۆشی لەدەست نەدابێت، دەزانێت کە ئەمە مەحاڵە و هەرگیز هۆکارەکان کاری وایان لە دەست نایەت.

بەڵێ، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿**إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوْ اجْتَمَعُوا لَهُ**﴾! (الحج:٧٣).

واتە: (ئەگەر هەموو هۆکارە ماددییەکان کۆببنەوە هێشتا ناتوانن تاقە مێشێك دروست بکەن و، ناتوانن ئامێرەکانی بە تەرازوویەکی ورد و تایبەتی ڕێك بخەن، تەنانەت گەر ئەو هۆکارانە ویست و ئیختیاریشیان پێ درابێت). خۆ ئەگەر بیشتوانن جەستەی مێشێك کۆبکەنەوە و پێکیەوە بنێن، خۆ ناتوانن مانەوە و بەردەوامیی بۆ دابین بکەن. خۆ ئەگەر ئەمەشیان بە ئەندازەیەکی تایبەتی توانی، ئەوا ناتوانن ئەو گەردیلانە بە ڕێکوپێکی بجوولێنن کە هەمیشە تازە دەبنەوە و دێنە ناو ئەو بوونەوەرە و کاری خۆیانی تێدا ئەنجام دەدەن!

کەواتە زۆر ئاشکرایە کە هۆکارەکان هەرگیز خاوەنی ئەم شتانە نەبوون و نین، بەڵکو خاوەنی ڕاستەقینەیان غەیری هۆکارەکانە و، ئەو کەسەیە کە وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەخات: ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ وَاحِـــدَةٍ﴾ (لقمـان:٢٨) کاروباری بەدیهێنانی هێندە بەلاوە ئاسانە کە زیندووکردنەوەی هەموو بوونەوەرانی سەر زەویی وەك زیندووکردنەوەی تەنیا مێشێك پێ ئاسانە و، دروستکردنی وەرزی بەهاریشی بەلاوە وەك ئاسانیی بەدیهێنانی تاقە گوڵێك وایە..

چونکە لەبەر ئەوەی خاوەنی فەرمانی: "کن فیکون"ە، ئەوا پێویستی بە "کۆکردنەوە" نی‌یە!!

هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو بەهارێك، جگە لە ماددەی تۆخمەکانی بوونەوەرە لە ژمارەنەهاتووەکانی بەهار، هەر ئەو خواوەندە سیفەت و شکڵ و شێوەشیان لە نەبوونەوە دروست دەکات..

هەروەها لەبەر ئەوەی پلان و نموونە و پێڕست و نەخشەی هەموو شتێك لە زانیاریی ئەودا دیاری کراوە و..

لەبەر ئەوەش کە هەموو گەردیلەکانی بوونەوەر تەنها لە بازنەی زانست و توانستی ئەو خوایەدا دەبزوێن..

لەبەر هەموو ئەمانە، ئەو خوایە ویستی لە هەر شتێك بێت بە ماوەی چاوتروکاندنێك و بەوپەڕی ئاسانی لە نەبوونەوە بەدیی‌دەهێنێت و، هیچ شتێك ناتوانێت بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش لەو کارەی کە پێی سپێرراوە لابدات. دەبینیت هەسارە گەڕۆکەکان دەبن بە سوپایەکی گوێ ڕایەڵی ڕێکوپێك و، گەردیلەکانیش دەبن بە سەربازی ملکەچی فەرمانەکانی ئەو.

جا لەبەر ئەوەی هەموویان بەپێی زانست و توانستی ئەزەلیی ئەو خوایە دەڕۆن و دەجووڵێنەوە، ئەوا نابێ بە چاوێکی سووك و بچووك و گرنگی پێ نەدان سەیری هیچ کام لەو ئاسەوارانە بکرێت کە بەو توانستە دێنە وجوود، چونکە "مێش"ێك کە سەر بەو توانستە خوایی‌یە بێت "نەمروودێك" لەناو دەبات و، "مێروولە"یەك کۆشکی "فیرعەونێك" دەڕووخێنێت و تۆوی سنەوبەریش - کە تابڵێی بچووکە - ئەو درەختە سنەوبەرە لەسەر شان هەڵدەگرێت کە دەڵێی چیایەکی گەورە و زەبەلاحە!

جا وەك لە گەلێ پەیامدا ئەم ڕاستی‌یەمان چەسپاندووە، لێرەشدا، دووپاتی دەکەینەوە و دەڵێین:

هەروەك سەربازێکی سەر بە دەوڵەت دەتوانێت بەهۆی نهێنیی ئەو "پەیوەندی بوون"ەی بە دەوڵەتەوە، چەند کارێکی ئەوتۆ ئەنجام بدات کە بە سەدان جاریش لە وزەی خۆی گەورەتر بێت، وەك ئەوەی کە لەم ڕێیەوە سەرکردەیەکی گەورەی دوژمن دیل بکات.. بە هەمان جۆر، هەموو شتێکی سەر بەو توانستە ئەزەلیەی خواوەندیش، سەد هەزار جار لەو هۆکارە سروشتییانە زیاتر، دەبێت بە سەرچاوەی موعجیزاتی وردەکاری و سنعەتی خواوەند.

**بە پوختی:**

ئەو وردەکارییە ناوازە و ئاسانییە ڕەهایەی کە لە بەدیهێنانی هەموو شتێکدا هەن، پێکەوە دەریدەخەن کە ئەو بەدیهاتووە: جێ دەست و ئاسەوارێکی خوای خاوەن زانستی گەورە و توانستی ئەزەلیە. دەنا شتێکی سەد لە سەد مەحاڵە و تەنانەت لە سنوور و بازنەی ئیمکان بەدەرە کە بەبێ ئەو توانست و زانستە هیچ شتێك بتوانێت لە "نەبوون"ەوە بێتە جیهانی "بوون"!

بەم جۆرە، ئەم بەڵگەیە کە تابلێی قووڵ و ورد و تابیشڵێی بەهێز و ئاشکرایە، توانیی "دەروونی سەرکەشم" دەمکوت بکات، کە بووبوو بە قوتابییەکی کاتیی شەیتان و وەکیلێکی گومڕایان و ڕێڕەوانی ڕێی فەلسەفە، بە ڕادەیەك کە - سوپاس بۆ خوا - ئیمانێکی دامەزراوی هێنا و، وتی:

بەڵێ، دەبێ من بەدیهێنەر و پەروەردگارێکم هەبێت کە بچووکترین خورپە و خەیاڵەکانی دڵم و نادیارترین پاڕانەوە و ئومێدەکانم ببیستێ و.. خاوەنی دەستەڵاتێکی هێندە ڕەها بێت کە شاراوەترین پێویستییەکانی گیانم جێبەجێ بکات و.. ئەم دنیا گەورەیەش بگۆڕێت بە دنیایەکی تر، تاکو بەختیاریی هەمیشەییشم لەو دواڕۆژەدا پێ ببەخشێت، دوای ئەوەی کە ئەم دنیایەی هەڵگرت و دواڕۆژی هێنایە جێ..

ئەو پەروەردگارە هەروەك مێشێك بەدیدەهێنێت، ئاسمانەکانیش دروست دەکات.. هەروەك بە چاوی خۆر ڕووی گەشی ئاسمانی ڕازاندووەتەوە، بە گەردیلەش بیلبیلەی چاوی منی ڕازاندووەتەوە..

دەنا گەر یەکێك نەتوانێت مێشێك بەدیبهێنێت، هەرگیز ناشتوانێت دەست لە ختوورەی دڵم وەربدات و گوێی لە نزا و پاڕانەوەکانی گیانم بێت.. ئەو کەسەی نەتوانێت ئاسمانەکان بەدیبهێنێت، ناشتوانێت بەختیاریی هەمیشەییم پێ ببەخشێت.

کەواتە پەروەردگاری من تەنها ئەو کەسەیە کە: گوێی لە ختوورەی دڵمە و تەنانەت ڕێنمایی و چاکسازیی دەکات. جا هەروەك ئەو خوایە لە ماوەی یەك سەعاتدا ئاسمان لە هەور پڕ دەکات و پاشان خاڵیشی دەکاتەوە، هەر ئەو خوایە ئەم دنیاش دەگۆڕێت بەودنیا و، بەهەشت ئاوەدان دەکاتەوە و دەرگاکانی دەخاتە سەرپشت و پێم دەفەرموێ: "وەرە بڕۆرە ژوورەوە"!

دەسا برایانی پیرم!

ئەی ئەو کەسانەی کە وەك من - بەهۆی بەدبەختیی دەروونی سەرکەشەوە - بەشێکی تەمەنیان لە بەهەڵەبردن(مغالطة)ی زانستە بیانی‌یەکان و شەوەزەنگی فەلسەفەی تاریکدا بەسەر بردووە!

باش بزانن ئەو فەرمانە قودسی‌یەی: (لا اله الا هو) کە هەمیشە قورئانی پیرۆز دووپاتی دەکاتەوە، پایەیەکی ئیمانیی هێندە ڕاست و توندوتۆڵ و دامەزراوە کە هەرگیز لەجێی خۆیدا نابزوێت و جێی پێ لێژ نابێت، چونکە هەموو تاریکی‌یەك دەڕەوێنێتەوە و زامە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤیش تیمار دەکات.

گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە دوور و درێژەش لە نێوان بابەتەکانی هیوا و ئومێدی پیریمدا، بەدەست خۆم نەبوو. بەڵکو لە ترسی وەڕس بوونی خوێنەر هەر حەزم لە نووسینیشی نەبوو. بەڵام دەتوانم بڵێم: ئەمە لە دەست خۆمدا نەبوو، بەڵکو پێم نووسرا!

بەهەر حاڵ.. با بڕۆینەوە سەر باسەکەی خۆمان:

بەڵێ، نەفرەتکردنم لەو ژیانە ڕازاوە دنیایی‌یەی ئەستەمبوولم - کە لە ڕواڵەتدا لەزەت و خۆشحاڵی بوو - بەو جۆرە بوو کە باسمان کرد و، لە ئەنجامی ئەو ڕوانین و تێفکرینەوە بوو کە لە دوای بینینی تاڵە مووە سپی‌یەکانی سەر و ڕیشم و، دوای بێ وەفایی هاوڕێ دڵسۆزەکەم، ڕووی دا.

ئیتر "دەروون"م لە بریی ئەو چێژە ماددی و دنیایی‌یانەی کە پێشتر پێیان خەڵەتابوو، بەدوای چێژە مەعنەوی‌یەکاندا دەگەڕا و، سۆراخی ئومێد و نوورێکی بۆ ئەم پیری‌یە دەکرد کە سارد و سڕ و قەبە و قورس دەردەکەوێت لە بەرچاوی بێ‌ئاگایاندا، تاکو تین و گەرموگوڕیی پێ ببەخشێت!

جا هەزاران شوکر و سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردم ئەو چێژە ڕاستەقینە هەمیشەیی‌یانە لە: (لا إلە إلا هو) و نووری "تەوحید"دا بدۆزمەوە، لە بریی ئەو چێژە دنیایی‌یە بێ‌ئاکامانەی کە هیچ ڕاستی و تامێکیان نی‌یە. هەروەها سوپاس بۆ ئەو خوایەی

کە ڕەزای پیریی لەلا شیرین کردم و، لە گەرمایی و ڕووناکیی پیریدا حەواندمیەوە. بە پێچەوانەی پیریی گومڕایان کە تابلێی سارد و سڕ و ڕەزا گرانە!

بەڵێ برایانم!

مادەم ئێوە خاوەنی ئیمانن و، نوێژ و پاڕانەوەشتان هەیە (کە پتر ئەو ئیمانە دەگەشێننەوە و پەرەی پێ دەدەن)! ئەوا دەتوانن وەك لاوێیەکی هەمیشەیی سەیری پیرییەکەتان بکەن، لەو ڕووەوە کە لاوێیەکی هەمیشەیی پێ بەدەست دەهێنن. چونکە لە ڕاستیدا پیریی سارد و سڕ و قەبە و تاریك و ناشیرین و ئازاربەخش، تەنها پیریی گومڕایانە، بەڵکو سەردەمی لاویشیان بە هەمان شێوەیە!

کەواتە با هەر ئەوان لە شین و گریاندا بن و، هەر ئەوان ئاخ و داخی کەسەر و حەسرەتیان لێ بەرز بێتەوە و بڵێن: بەداخەوە! چیمان بەخۆمان کرد!

بەڵام ئێوەی پیری باوەڕدار و بەڕێز دەبێ هەردەم لە شوکرانەی خوای گەورەدا بن و بەوپەڕی شادی و خۆشحاڵییەوە بڵێن:

"الحمد لله علی کل حال"!

### ❐ ئومێدی دوازدەهەم:

لەو کاتەدا کە بە تەنیایی لە "بارلا"ی سەر بە پارێزگای "ئیسپارتە" دەژیام و، بە دەست ئەو دیلییە ئازاربەخشەوە دەتلامەوە کە پێی دەوترێت: "ڕەهەندەیی" و، تێکەڵیی خەڵکی و تەنانەت نامە گۆڕینەوەشم لەگەڵ هەر کەسێکدا لێ قەدەغە کرابوو، سەرەڕای نەخۆشی و پیری و غەریبیی خۆیشم..

لەم کاتەدا کە من گرفتاری ئەم حاڵە بووم و خەم و خەفەتی تاڵم لەدەست دەچەشت، نوورێکی دڵدەرەوە و درەخشانم لە سەرنج و نهێنییە وردەکانی قورئانی پیرۆزەوە لێ دەرکەوت، کە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی پێی دەبەخشیم و ڕێی پێ ڕووناك دەکردەوە بۆم.

منیش تێدەکۆشام کە بە هۆی ئەو نوورەوە ئەشکەنجە و بارودۆخە ئازاربەخشەکەم لە بیری خۆم بەرمەوە، بە ڕادەیەك کە توانیم لەو ڕێیەوە شار و خزمان و خۆشەویستانم لە بیر بچێتەوە، تەنها یەکێك لەو خۆشەویستانە نەبێت کە - بە داخەوە - هەرگیز لە یادم نەچوو، ئەویش "عەبدوڕڕەحمان"ی برازام بوو، کە لە ڕاستیدا کوڕی مەعنەوی و هاوڕێی ئازا و قوتابیی دڵسۆزم بوو، نزیکەی حەوت ساڵیش دەبوو لێك دابڕابووین.

نەشمدەزانی لە کوێیە تا بە هەر جۆرێك بووە نامەی بۆ بنێرم و قسەی لەگەڵدا بکەم و پێکەوە هاوبەشی خەمی یەکتر بین، هەروەك ئەویش جێگای منی نەدەزانی تا بێت بۆ لام و بۆ دڵدانەوە و خزمەتکردنم لێ ببڕێت..

بەڵێ، لەم پیریەمدا گەلێ پێویستم بە یەکێکی تێکۆشەر و ڕاست و ڕاستگۆی وەك: "عەبدوڕڕەحمان" هەبوو!

ڕۆژێکیان لە ناکاودا نامەیەکیان دایە دەستم.. هەر کە هەڵم پچڕی سەیر دەکەم ئەم نامەیە کەسێتیی "عەبدوڕڕەحمان"ی بە تەواوی پێوە دیارە. (بەشێك لەو نامەیە لە مەکتووبی بیست و حەوتەمدا دانرا، بە شێوەیەك کە سێ کەرامەت دەردەخات).

لە ڕاستیدا ئەم نامەیە زۆر گریاندمی و تا ئێستاش هەر دەمگریێنێت! چونکە "عەبدوڕڕەحمان" لەم نامەیەدا دەریبڕیبوو کە بە تەواوی دەستی لە چێژە دنیاییەکان و لە هەموو خۆشی و لەزەتێکی هەڵگرتووە و، نووسیبووی کە ئەوپەڕی ئاواتی ئەوەیە: بگاتە لای من و لە پیریمدا چاودێریم بکات هەروەك من لە کاتی منالیی ئەودا چاودێریم دەکرد. تاکو بە قەڵەمە کارامەکەشی لە کارمەندی و ئەرکی ڕاستەقینەی ئەم دنیایەمدا یارمەتیم بدات کە بریتییە لە بلاوکردنەوەی ڕاز و نهێنییەکانی قورئانی پیرۆز. جگە لەمەش داوای "سی" پەیامی کردبوو کە بۆی بنێرم تاکو بە خۆی و یارمەتیدەرانیەوە لە هەریەکەیان "سی" دانە بنووسنەوە!

ئەم نامەیە بە هیوایەکی توندوتۆڵ منی بە دنیاوە بەستەوە و، لەبەر خۆمەوە دەموت: (وا من قوتابیی دڵسۆز و ئازا و زیرەك و بەوەفای خۆم دۆزیەوە، ئەو کەسەی کە پەیوەندیی نێوانمان لە پەیوەندیی نێوان باوك و کوڕ گەلێ بەهێزتر بوو. وا دۆزیمەوە و، ئاشکراشە کە دێت بۆ لام بۆ چاودێری کردنم).

ئەم هیوایە هەرچی ئازاری دیلی و تەنیا باڵی و غەریبی و پیری بوون، هەموویانی لە بیر بردمەوە!

ئەم نامەیە ئیمانێکی گەلێ درەخشان و بەهێزی پێوە دیاربوو. وەك بڵێی کاتێ "عەبدوڕڕەحمان" نووسیویەتی چاوەڕێی ئەجەلی خۆی کردووە! چونکە لەو ماوەیەدا نوسخەیەکی لە "وتەی دەهەم - پەیامی حەشر" دەست کەوتبوو کە سەبارەت بە (ئیمان بە ڕۆژی دوایی) دەدوێت و چاپم کردبوو. جا ئەو پەیامە بە وێنەی مەڵهەمێك هەموو زام و برینە مەعنەوییەکانی ماوەی حەوت ساڵی ڕابوردووی تیمار و سارێژ کردبوو.

لە پاش نزیکەی دوو مانگ کە مـن لـەم هیوایـەدا دەژیـام و چـاوەڕێی گەیشـتنی "عەبدورڕەحمان" بووم، تاکو پێکەوە ژیـانێکی پڕ لـە بـەختیاری لـە دنیـادا بەرینـە سـەر، کەچی لە ناکاودا دەنگوباسی مردنی هات!!

ئەم دەنگ و باسە وەها ڕاپتەکاندم کە تا ئێستاش و بە درێژایی ئەم پێنج ساڵەی مردنـی ئەو هێشتا کاریگەری و خەفەتی هەر لە دڵمدا ماوە و، ئازار و پەژارەیـەکی هێنـدە زۆری بۆ بـەجێ هێشتم کە لـەو دیلـی و تـەنیاباڵی و غـەریبی و پیری و نەخۆشـییەی تیایـاندا دەتلامەوە گەلـێ زۆرتر و زیاتر بوو!

پێشتر دەموت: (نیوەی دنیا تایبەتییەکەی خۆم بە مردنی دایکم لەدەست دەرچوو). کەچی وا ئێستا نیوەکەی تریشی بە مردنی "عەبدورڕەحمان" تەواو بوو، کەواتە ئیـتر مـن هیچ پەیوەندییەکم بە دنیاوە نەماوە!

بەڵێ، ئەگەر "عەبدورڕەحمان" لە ژیـاندا بمایە، لـە دنیـادا دەبـوو بـە جەمسـەرێك بـۆ کارمەندییەکەی سەر بە دواڕۆژم و، دوای خۆیشم دەبوو بـە باشـترین جێگـەدارم و، لـە مـاوەی دنیاشـدا هاوڕێیـەکی بە وەفـا دەبوو بۆم و، دڵـم پێی دەکرایـەوە و، دەبـوو بـە ئەمینداریکی دڵسۆز و قوتابییەکی زیرەکی "پەیامەکانی نوور".

بـەڵێ، کۆچـی دوایـی "عەبدورڕەحــمان" سـەبارەت بـە کەسـێکی وەك مـن – وەك مرۆڤێك – لە دەستچوونێکی ئازاربەخش و دڵ سووتێنەرە.

خـۆ هەرچـەندە هـەوڵێکی سـەرومڕم دەدا بـۆ ئـارامگرتن و خۆڕاگـری، کـەچی ڕووبەڕووی زریانێکی هێندە بـەتین وتـەوژم بووبوومـەوە کە هـەموو سوو چ و قوژبنێکی گیانمی گرتبووەوە. خۆ ئەگەر ئەو دڵدانەوانە نەبونایە کە هـەندێ جـار لـە نهێنییـەکانی قورئـانی پـیرۆزەوە دەهاتنـە فریـام، ئـەوا کەسـێکی وەك مـن هـەرگیز بەرگـەی ئـەو گەردەلوولەی نەدەگرت و، ئارامی لا هەڵدەگیرا و، بە تەواوی ئۆقرەی لەبەر دەبڕا!

هەر بەم خەفەت و ئازارانەوە، هەندێ جار دەڕۆشتم بۆ ناو هەردوو شاخە چۆڵەکانی "بارلا" و لـەوێ بـە گۆشـەگیری و تـەنیایی دادەنیشـتم و، بـە وێنـەی فلیمـی سینەما تـابلۆ جوانەکان و دیمەنە نیانەکانی ئەو ژیانی بەختەوەرییەم بە پێش چاودا دەهات و دەڕۆشـت کـە لەگـەڵ قوتابییـەکانمدا – لـە کەسـانی وەك عەبدورڕەحـمان – بردبوومەسـەر. جـا هەرکات ئەو تابلۆیانە لە بەردەم ئەندێشەمدا تێدەپەڕین، هەست ناسکیی پیری و غـەریبیم ئـەوەندەی تر لـە هێزی بـەرگریی کـەم دەکردمـەوە و، پـتر ورەی دەڕووخـاندم و، زیـاتر هەستی دەبزواندم!

بەڵام لە ناکاودا یەکێك لە نهێنییەکانی ئایەتی: ﴿**كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاَّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**﴾ (القصص:٨٨) هێندە بە ئاشکرا و ڕوونی لە ڕووی دڵمدا دەرکەوت کە هانی دام دوو جار "یا باقي أنت الباقي" لەبەر خۆمەوە دووپات بکەمەوە و، بەمەش دڵم بە تەواوی کرایەوە.

بەڵێ، بەهۆی نهێنی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە و، لە نێوان ئەو هەردوو شیوە چۆڵەدا و، لەگەڵ ئەو دەروونە پڕ ئازارەدا، خۆمم لەلای سەرووی سێ تەرمی گەورەدا بینییەوە، وەك لە پەیامی: "پلیکانەی سوننەت"دا ئاماژەم بۆ کردووە:

یەکەم: خۆمم وەك کێلی گۆڕێك هاتە پێش‌چاو، کە پەنجا و پێنج سەعیدی مردووی ماوەی ژیانی منی تێدا ئەسپەردەی خاك کرابوون، بە درێژایی تەمەنم کە خۆی لە پەنجا و پێنج ساڵ دابوو!

دووهەم: خۆمم بە وێنەی زیندەوەرێکی بچووکی وەك "مێروولەیەك" دەبینی کە بەسەر ڕووی ئەم چەرخەدا دەڕۆشت، کە لە جێی کێلی گڵکۆی تەرمە گەورەکەی گرۆی مرۆڤە، هەر لە ئادەم پێغەمبەرەوە - درووودی لەسەر بێت - تا دەگاتە ئێستا.

سێهەم: بەهۆی نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە مردنی ئەم دنیا گەورەیەم لە پێش‌چاودا بەرجەستە بوو، وەك ئەوەی کە هەموو ساڵێك - بە وێنەی مردنی مرۆڤ - چەندین دنیای گەڕۆك دەمرێت و بە تازەبوونەوەی ساڵ، ساڵی پێشوو کۆچ دەکات.

کاتێ کە من لەم حاڵەدا بووم، واتا ئاماژەیی‌یەکەی ئایەتی: ﴿**فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ**﴾ (التوبة:١٢٩) هات بە فریامەوە و، نوورێکی نەکوژاوەی هێنا بە هانامەوە و، ئەو خەم و پەژارە زۆرەی کە لە مردنی "عەبدوڕڕەحمان"ەوە تووشم بوو هەمووی ڕەواندەوە و، دڵنەوایی ڕاستەقینەی پێ بەخشیم.

بەڵێ، ئەم ئایەتە پیرۆزە پێی سەلماندم کە مادەم خوا هەیە، ئیتر ئەو خوایە جێی هەموو شتێکمان بۆ دەگرێتەوە و، بوونی ئەو سەروزیادی بوونی هەموو شتێکی ترە. چونکە دەرکەوتنی چاودێری و عینایەتێکی ئەو جێی هەموو جیهان دەگرێتەوە و، تاقە تیشکێکی نووری ئەویش ژیانێکی وا بەو سێ تەرمە دەبەخشێت کە دەری دەخات ئەوانە تەرم نین، بەڵکو بریتین لەوانەی کە ئەرکی فەرمانبەرییان لەم سەرزەوییەدا کۆتایی پێ هێناوە و بۆ جیهانێکی تر کۆچیان کردووە.

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م نهێنی و حیكمه‌ته‌مان له‌ "بریسكه‌ی سێهه‌م"دا ڕوون كردووه‌ته‌وه‌، به‌ پێویستی نازانم لێره‌دا زیاتر ڕوون بكرێته‌وه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ ده‌ڵێم كه‌:

ئه‌و شته‌ی بوو به‌هۆی ڕه‌وینه‌وه‌ی سه‌رجه‌می داخ و خه‌فه‌ته‌ زۆره‌كانم ته‌نها دووپات كردنه‌وه‌ی دوو جاره‌ی: "یا باقي أنت الباقي" بوو، كه‌ واتای: ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَهُ﴾ لێك ده‌داته‌وه‌. بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌مه‌ش ده‌ڵێم:

كاتێ كه‌ بۆ یه‌كه‌م جار "یـــا بـــاقي أنـــت البـــاقي"م وت، هه‌ستم كرد به‌ وێنه‌ی نه‌شته‌رگه‌ری له‌ ده‌روونمـدا تیماری ئه‌و برینه‌ مه‌عنه‌وی‌یه‌ زۆرانه‌ ده‌كرێت كه‌ به‌هۆی ته‌واوبوونی دنیا و كۆچكردنی خۆشه‌ویستانی وه‌ك "عه‌بدوڕڕه‌حمان"ه‌وه‌ له‌ دڵمدا په‌یدا بووبوون..

به‌ڵام بۆ جاری دووهه‌م ڕسته‌ی: "یا باقي أنت الباقي" بوو به‌ مه‌ڵهه‌مێك و گشت ئه‌و برینانه‌ی بۆ سارێژ كردم، ئه‌ویش به‌ تێڕامان له‌م واتایه‌ی خواره‌وه‌:

(كێ ده‌ڕوات با بڕوات! خۆ تۆ هه‌ر ده‌مێنیته‌وه‌! تاقه‌ دره‌وشانه‌وه‌یه‌كی میهره‌بانیی تـۆ سه‌روزیاده‌ بۆ هه‌موو شتێكی فانی و بڕاوه‌. هه‌روه‌ها مادەم تۆ هه‌یت، ئیتر ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ به‌هۆی باوه‌ڕهێنانی پێت و گوێ ڕایه‌ڵیی بـۆ ئایینه‌كه‌ت - كه‌ ئیسلامه‌ - په‌یوه‌ندیی به‌ تۆوه‌ هه‌یه‌، له‌ هیچ شتێكی كه‌م نی‌یه‌ و هه‌موو شتێكی هه‌یه‌. نه‌مان و ڕۆیشتن و مردن و نه‌بوونیش، هه‌موویان په‌رده‌ی تازه‌كردنه‌وه‌ و هۆكاری گه‌شتوگوزارن به‌ناو چه‌ندین جێ و شوێنی جیاجیادا)!

ئیتر به‌م بیركردنه‌وه‌یه‌، ئه‌و حاڵه‌ته‌ ڕۆحی‌یه‌ خه‌فه‌ت به‌خش و سامناك و تاریك و سـووتێنه‌رانه‌م نـه‌مان و، خۆشحـاڵی‌یه‌كی ڕوونـاك و به‌لـه‌زه‌ت و خه‌مـڕه‌وێن جێـی گـرتنه‌وه‌ و، ئنجا دڵ و زمانم و ته‌نانه‌ت هه‌موو خانه‌ و گه‌ردیله‌یه‌كی جه‌سته‌شم - به‌ زمانی حاڵ - ده‌ستیان كرد به‌ وتنی: "الحمد لله" و سوپاسكردنی خوای گه‌وره‌.

یه‌ك لـه‌ هـه‌زارانی ئه‌و تیشكی میهره‌بانی‌یه‌ی خواوه‌ندم به‌م جۆره‌ی خـواره‌وه‌ لـێ ده‌ركه‌وت:

كاتێ به‌و خه‌م و په‌ژارانه‌وه‌ له‌ خه‌فه‌تگای ئه‌و هه‌رد و شیوانه‌وه‌ گه‌ڕامه‌وه‌ بۆ "بارلا"، لاوێك به‌ ناوی: "مسته‌فا قوله‌ ئونلی" هات بۆ لام و، چه‌ند پرسیارێكی فیقهیی ده‌رباره‌ی

نوێژ و دەستنوێژەوە ئاراستە کردم. خۆ هەرچەندە من لەو کاتانەدا پێشوازیم لە هیچ میوانێك نەدەکرد، کەچی وەك ئەوەی ڕۆحم "ئیخلاس"ی ناو ڕۆحی ئەو لاوەی خوێندبێتەوە و بە هەستی پێش ڕوودان (الإحساس بالشيء قبل وقوعه) هەستی بە ئایندەی ئەم لاوە و خزمەتگوزارییەکانی بۆ پەیامەکانی نوور[1] کردبێت، پێشوازیم لێ کرد و بە میوانێکی خۆم وەرم گرت[2]. پاشان بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە ئەم لاوەی لە بریی "عەبدوڕڕەحمان"ی جێگەداری ڕاستەقینەم پێ بەخشیوم و، کردی بە هەوڵدەری بێ وچانی ڕێگای خزمەتکردنی "پەیامی نوور".

خوای گەورە ناردنی ئەم "مستەفا"یەی کرد بە نموونەیەك بۆ بەخشینی "سی" کەس لە هاوچەشنی "عەبدوڕڕەحمان". وەك بلێی خوای گەورە دەفەرموێ: من تەنها "عەبدوڕڕەحمان"ێکم لێ سەندیتەوە، بەڵام لە بریی ئەو چەندەها کەسی وەك ئەم لاوەت دەدەمێ کە بێ وچان لەو فەرمانبەرییە ئایینییە بەرزەدا هەوڵ دەدەن و، بۆت دەبن بە

---

(١) "عەلییە بچکۆلە"ی برای ئەم "مستەفا"یە بە ڕاستی سەلماندی کە "عەبدوڕڕەحمان"ێکە بۆ خۆی. چونکە بە تەنها خۆی و بە قەڵەمە جوان و کارامەکەی حەوت‌سەد نوسخەی لە پەیامەکانی نوور نووسییەوە. جگە لەوەی کە چەندین "عەبدوڕڕەحمان"یشی پەروەردە کرد. (دانەر)

(٢) بەڵێ، دەرکەوت ئەم لاوە نەك هەر شیاوی وەرگرتنە، بەڵکو شایستەی پێشوازی لێ کردنیشە(*). (دانەر)

(*) (ئەمەی خوارەوە ڕووداوێکە بۆ دەرخستنی ڕاستیی ئەو فەرمایشتەی مامۆستام دەیگێڕمەوە کە دەڵێت: مستەفا - کە یەکەم قوتابیی پەیامەکانی نوورە - شایستەی پێشوازی لێ کردنە:

ڕۆژێك لە پێش "عەرەفە"دا مامۆستا ئارەزووی لە گۆشت و گەڕان بوو. لەبەر ئەوە، منی نارد تاکو ئەسپێکی بۆ ئامادە بکەم. منیش پێم وت: تۆ مەیەرە خوارەوە بۆ داخستنی دەرگاکە، من دایدەخەم و لە دەرگای پشتەوە دەڕۆمە دەرەوە. وتی: نەخێر، هەر لەو دەرگایەوە بچۆرە دەرەوە، ئیتر کە من دابەزیم ئەویش لەگەڵمدا دابەزییە خوارەوە و کە من ڕۆشتمە دەرەوە دەرگاکەی بە کیلۆن داخست و سەرکەوتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی بۆ پاڵکەوتن.

پاشان ئەم "مستەفا"یە لەگەڵ حاجی عوسماندا هاتبوون. مامۆستاش لەو کاتانەدا، بە تایبەتی دوو میوانیش، زۆر دوور بوو ئیزنیان بدات بڕۆن بۆ لای.. بەڵام ئەم "مستەفا" ناوبراوە هەر کە گەیشتبووە لای دەرگاکە، ئەو دەرگایە بە زمانی حاڵ پێی وت: مامۆستام ناساغە و توانای میوانداریی نییە، بەڵام من خۆم دەکەمەوە بۆت! ئیتر ئەو دەرگا داخراوە کرایەوە لێی!

بەڵێ، فەرمایشتەکەی مامۆستام گەلێ ڕاستە کە دەڵێت: "مستەفا شایستەی پێشوازی و وەرگرتنە". چونکە هەروەك ئایندە شایەتیی لەسەر ئەم ڕاستییە دا، دەرگای خانووەکەشی بە هەمان جۆر ئەو شایەتییەی دا)! (خەسرەو).

(ئەمەی کە خەسرەو نووسیویەتی ڕاستە و، دەرگای خانووەکەم لە بریی من "مستەفا"ی وەرگرت و پێشوازیی لێ کرد)! (دانەر)

چەند قوتابی‌یەکی بە وەفا و برازای دڵسۆز و کوڕی مەعنەوی و برایانی بەڕێز و هاوڕێی گیانفیدا و تێکۆشەر.

بەڵێ، زۆر سوپاس بۆ ئەو خوایە، چونکە سێ دانە "عەبدوڕڕەحمان"ی وەك ئەم لاوەی پێ بەخشیم!

لەم کاتەدا ڕووم کردە دڵم و پێم وت:

(ئەی دڵی بریندار و چاو پڕ لە فرمێسکم!

خۆ بە چاوی خۆت ئەم نموونەیەت بینی و، برینە ناسۆرە شاراوەکانت پێ تیمار کرد. کەواتە ئۆقرە بگرە و، دڵنیابە کە هەر ئەو خواوەندە سەرجەمی برینەکانی تریشت بۆ ساڕێژ دەکات و لە ئازاریان ڕزگارت دەکات).

ئەی خوشك و برایانی پیرم!

ئەی ئەو کەسانەی کە - وەك من - لە پیری‌دا خۆشەویستترین مناڵ و ڕۆڵەی خۆیان لەدەست چووە، یان خزمێکیان کۆچی ماڵئاوایی کردووە!

ئەی ئەو کەسەی کە "پیری" ئەرکی سەرشانی قورس کردووە و لەگەڵ ئەوەشدا ناڵە و خەفەتی جودایی لەسەر خۆی کۆکردووەتەوە!

وا بۆ خۆتان حاڵی پەرێشانی منتان زانی و بۆتان دەرکەوت کە هەرچەند ئەو حاڵەی من بە چەندین جار لەو بارە ناسۆر و پەشێوەی ئێوە زیاتر و بەهێزتر بوو، کەچی ئەم ئایەتە پیرۆزە هات بە فریا و هانامەوە و بە ئیزنی خوای گەورە هەموو پەرێشانی و زامەکانی منی ساڕێژ کرد. خۆ گومانی تێدا نی‌یە کە دەرمانخانە پیرۆزەکەی قورئانی پیرۆز پڕە لە چارەسەر و دەرمانی هەموو نەخۆشی‌یەکانتان. جا ئەگەر توانیتان لە ڕێی "ئیمان"ەوە سەری لێ بدەن و، بە "پەرستش" تیماری خۆتان بکەن، ئەوا بێ‌هیچ گومانێك قورسی و خەم و خەفەتەکانی پیری لەسەر شانتان دەرەوێنێتەوە.

هۆی درێژەدانیش بە نووسینی ئەم باسە، تەنها بۆ ئەوەیە کە تکای دوعای خێر و زۆرتان لێ بکەم بۆ "عەبدوڕڕەحمان"ی خوالێخۆشبوو. هیوادارم لە دوور و درێژی‌یەکەی بێزار نەبن.

مەبەستیشم لە گێڕانەوەی زامە سامناکە ناسۆرەکەم بەم شێوە پڕ لە خەفەت و ئازارە - کە لەوانەیە زامی ئێوەش بکولێنێتەوە - تەنها بۆ ڕوونکردنەوەی شیفای بێ وێنە و نووری درەخشانی دەرمانەکانی قورئانی پیرۆزە.

## ❑ ئومێدی سیازدەهەم:[١]

لەم ئومێدەدا لە بارەی یەکێك لە تابلۆ گرنگەکانی بەسەرهاتی ژیانم دەدوێم. تکام وایە دوور و درێژی‌یەکەی بێزارتان نەکات.

دوای ئەوەی کە لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە دیلیی ڕووسەکان دەرباز بووم و گەڕامەوە بۆ ئەستەمبووڵ، نزیکەی سێ ساڵ بۆ خزمەتکردنی ئایین لە "دار الحكمة الإسلامية"دا مامەوە. بەڵام بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و هیممەتی شێخی گەیلانی و بێداربوونەوەم بە پیری، لە ژیانی شارستانیی ئەستەمبووڵ بێزار بووم و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتی‌یە ڕەنگینەم لێ بێزرا. ئنجا ئەو تاسەمەندی‌یەی پێی دەوترێت "دەردی غەریبی" هانی دام کە بڕۆمەوە بۆ شارەکەم. چونکە دەموت: مادەم هەر دەمرم، دەبا لە شارەکەی خۆمدا بمرم! بەم جۆرە ڕۆشتمەوە بۆ "وان".

لەوێ پێش هەموو شتێك ڕۆشتم بۆ سەردانی قوتابخانەکەم کە ناوی "خوڕخوڕ" بوو. بینیم لە دەمی داگیرکردنی ئەم شارەدا لە لایەن ڕووسەکانەوە، ئەرمەنەکان قوتابخانەکەم و خانووەکانی ئەم شارەیان سووتاندووە!

ئنجا سەرکەوتمە سەر قەڵا بەناوبانگەکەی "وان" کە تاشە بەردێکی زەبەلاحە و قوتابخانەکەم ڕاستەوخۆ لە تەنیشت و داوێنی ئەو قەڵایەدا بنیات نرابوو..

لەم کاتەدا تارمایی هاوەڵ و برایانی ڕاستەقینەم، لە قوتابییانی قوتابخانەکەم، بە پێش‌چاودا دەهات و دەچوو کە حەوت ساڵ بوو بەجێم هێشتبوون! ئەوەبوو دوای ڕوودانی ئەو کارەساتە سەخت و ناهەموارە، هەندێ لەو هاوڕێ گیانفیدایانەم لە ڕاستی‌دا شەهید بووبوون و، هەندێکی تریشیان پلەی شەهیدی مەعنەوی‌یان بەدەست هێنابوو. کە ئەمەم دی، خۆم پێ ڕانەگیرا و بەکوڵ دامە گریان!

پاشان ڕۆشتمە سەر لوتکەی ئەو قەڵایە، کە بە ئەندازەی هەردوو منارەکە بەرز بوو و بەسەر قوتابخانەکەمدا دەیڕوانی. لەوێ دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە و تێڕامان..

جا لەبەر ئەوەی من لەوێ تەنیا بووم و، هیچ شتێکیش نەبوو ڕێی یادکردنەوەی ئەو ڕۆژگارانەم لێ بگرێت و، لە خۆیشمدا ئەندێشەم بەهێزە.. ئەوا بە بیر و ئەندێشەم گەڕامەوە بۆ هەشت ساڵ پێشتر و یادی ئەو کاتانەم کردەوە کە لەوێ بەسەرم بردبوون..

---

(١) ڕوودانی کارەساتی ئەو قوتابخانەیەی کە لەم ئومێدی سیازدەهەمەدا باس کراوە، پێش سیازدە ساڵ ڕووی داوە. ئەمەش "تەوافوق"ێکی جوانە! (دانەر)

بینیم: لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا گۆڕانێکی گەلێ گەورە بەسەر ئەم شارەدا هاتووە! تەنانەت هەر کە چاوم دەکردەوە هێندە گۆڕانکاریم بەدی دەکرد کە دەتوت چەرخێك بە خۆی و ڕووداوەکانیەوە بەسەر ئەم شارەدا تێپەڕیوە! چونکە سەنتەری ئەم شارە مەزنەی دەوراندەوری قوتابخانەکەم - کە لە تەنیشتی ئەو قەڵایەدا بوو - سەرانسەر سووتێنرابوو یان بە تەواوی کاول کرابوو!

ئنجا بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە سەیرێکی ئەم دیمەنەم کرد و خەفەتێکی گەلێ زۆرم پێ خوارد، چونکە جیاوازی‌یەکی یەکجار گەورەم لە نێوان ئێستا و ئەوسای ئەم شارەدا دەبینی! وەك بڵێی دوو سەد ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕ بووبێت! زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەم خانووانەیان ئاوەدان کردبووەوە دۆست و خۆشەویست و ئازیزانی من بوون. کەچی وا ئێستا هەندێکیان بە کۆچ کردنیان لەم شارە، تیاچوون و تاڵیی کۆچکردنیان چەشت، خوای گەورە بە سۆز و میهرەبانیی خۆی لە هەموویان خۆش بێت. چونکە جگە لە گەڕەکی ئەرمەنەکان، سەرانسەری شار و سەرجەمی خانووی موسڵمانەکان کاول کرابوو!! ئەوەندە لە ناخی دڵمەوە خەفەتم بەو دیمەنە خوارد کە ئەگەر هەزار چاوم ببوایە بە هەر هەموویان فرمێسکم هەڵدەڕشت!

پێشتر وام دەزانی بە گەڕانەوەم بۆ شارەکەم لە غەریبی ڕزگارم دەبێت. کەچی - بە داخەوە - دڵتەزێنترین جۆری غەریبیم لە شارەکەی خۆمدا بەدی کرد! چونکە بە سەدان کەسم دەبینی لە قوتابی و خۆشەویستانی وێنەی "عەبدوڕڕەحمان"ی ناوبراو لە ئومێدی دوازدەهەمدا لەوانەی کە پەیوەندی‌یەکی ڕۆحیی توندوتۆڵمان لە نێواندا بوو، دەمبینی هەموویان کەوتوونەتە ژێر خاك و داروپەردووی کەلاوەی ئەم شارە و، تەنها شوێنەواری خانووەکانیان نەبێ هیچی تریان بەرچاو ناکەوێت!

لە بەردەم ئەم تابلۆ خەمناکەدا ناوەڕۆکی ئەو وتەیەم لەبەرچاودا بەرجەستە بوو کە لە مێژە لە یادم ماوە و زووتر بە تەواوی لێی تێ نەدەگەیشتم، کە دەڵێت:

لولا مفارقةُ الأحبابِ ما وَجَدَتْ     لـها المنـايا إلى أرواحِنا سُبُلاً[1]

واتە زۆربەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەفەوتێنن: جودایی خۆشەویستانە!

بەڵێ، هیچ شتێك بە وێنەی ئەم کارەساتەی باسم کرد، ئازاری نەداوم و نەیخستوومەتە گریانەوە! خۆ ئەگەر یارمەتیم لە "قورئانی پیرۆز" و "ئیمان"ەوە بۆ نەهاتایە، ئەوا ئەو خەم و پەژارانە سەروزیادی ئەوە بوون گیانم بکێشن!

---

(١) ئەم شیعرە هی موتەنەببی‌یە. بڕوانە: (ديوان المتنبي) ص١٧ نشر دار الجيل - بيروت. (وەرگێڕ)

بە چاوی خۆم تـابلۆی خـەمناکی ئـەو جوداییـەم دی کـە هـەر لـە کۆنـەوە شـاعیران کاتێ مەنزڵگای دێرینی خۆشەویستانیان بەسەر دەکردەوە، دەیانبینی و فرمێسکیان بۆ هەڵدەڕشت. ئیتر هاودەم لەگەڵ "چاو"مدا "دڵ" و "گیان"یشم بـە وێنـەی کەسێك پاش دووسەد ساڵ گەڕابێتەوە بۆ شوێنەواری مەنزڵگای خۆشەویستانی، بەکوڵ دەستیان دایـە پرمەی گریان!

لەم کاتەدا بە وێنەی دیمەنەکانی فلیمـی سینەما، یـەك لـە دوای یـەکی لاپەڕە جـوان و بەلەزەتەکانی ژیانی ڕابوردووم بـە پێش‌چـاودا دەڕۆشـت، هـی ئـەو ژیانـە شـادەی کـە بـۆ نزیکەی بیست ساڵ لەگەڵ قوتابی‌یە بەڕێزەکانمدا و هەر لەم جێگایەدا بردبوومە سەر کـە پێشتر شوێنێکی ئاوەدان و خۆش و پڕ لە شادمانی بوو، کەچی وا ئێستا جگە لە کەلاوە و شوێنەوار هیچی تری لێ بەدی ناکرێت!

کاتێکی زۆرم لە تێڕامان و سەرنجدانی ئەو تابلۆیانەی ژیانم بردە سەر. هەر لەو کاتەدا سەرم لە خەڵکی ئەم دنیایە سووڕ دەما کە چۆن خۆیان دەخەڵەتێنن و بـە چی‌یـەوە خۆیـان دەستخەڕۆ کردووە، کەچی ئەمـەش حـاڵی دنیایـە و مـرۆڤ تیـایدا لـە ڕێبـوار و میوانێـك زیاتر هیچی تر نی‌یە!

هەروەك بە چاوی خـۆم مـەودای ڕاستیی ئـەو وتەیـەی ئـەهلی حەقیقەتیشـم بینـی کـە دەڵێن: "دنیا غەددارە.. فێڵبازە.. فانی‌یە.. پێی مەخەڵەتێن"!

هـەروەها بـۆم دەرکـەوت کـە مـرۆڤ چۆن پـەیوەندیی لـەگـەڵ لـەش و مـاڵ و منـاڵی خۆیدا هەیە، بە هەمان جۆر پەیوەندی لەگەڵ شار و وڵات و تەنانەت دنیاکەشی‌دا هەیە.

لەم کاتەدا کە دەمویست بە چاوەکانم بۆ پیریی خـۆم تێر بگریـم، دەشمویسـت بـە "دە" چاو نەك تەنها بۆ پیری بەڵکو بۆ مردنی قوتابخانەکەم بگریم، تەنانـەت هەستم دەکـرد کـە پێویستم بە "سەد" چاو هەیە تاکو پێیان بگریم بۆ شارە جوانە لە مردووچووەکەم!

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هـاتووە کـە دەفـەرموێ: هـەموو سـەر لـە بەیانی‌یـەك فریشتەیەك بانگ لە خەڵکی دەکات و دەڵێت: "لدوا للموت و ابنوا للخـراب"[1]! لـەم کاتەدا ڕاستیی ئەم فەرموودەیەم نەك بە گوێ بەڵکو بـە چـاو دەبیسـت! جـا هـەروەك ئـەو

(١) رواه البيهقي في الشعب من حديث عن أبي هريرة والترمذي مرفوعاً، وأبو نعيم في الحليـة عـن أبي ذر مرفوعاً، وأحمد في الزهد عن عبدالواحد قال: قال عيسى عليه السلام، فذكره (الدرر المنتثرة) وانظر كشـف الخفاء (٢٠٤١). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

بارە ناهەموارە منی لەو کاتەدا خستە گریان، وا بیست ساڵە خەیاڵیشم هەر فرمێسك هەڵدەڕێژێت هەر کاتێ یادی ئەو کارەساتە دەکاتەوە!

بەڵێ، ڕووخانی خانووەکانی سەر لوتکەی ئەو قەڵایە کە هەزاران ساڵە ئاوەدانە و، پیربوونی شارەکەی ژێر قەڵاکە لە ماوەی هەشت ساڵدا کە دەڵێی هەشت سەد ساڵی ڕەبەقی بەسەردا تێپەڕ بووە و، مردنی قوتابخانەکەم - لە داوێنی قەڵاکەوە - کە جموجووڵ و ترپەی ژیانی لێ دەهات و کۆگای خۆشەویستان بوو.. هەموو ئەمانە، ئاماژە بۆ مردنی قوتابخانە ئایینییەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن و، مەزنیی مەعنەویی تەرمە گەورەکەیان پیشان دەدەن، تەنانەت ئەم قەڵایە - کە تەنها یەك تاشە بەردی گەورەیە - بووە بە کێلی گڵکۆی هەموویان! دەمبینی قوتابیانی پێش هەشت ساڵی ئەم قوتابخانەیەم - خوا لێیان خۆش بێت - لەناو گۆڕەکانیاندا هاودەم لەگەڵ مندا دەگرین! تەنانەت خانووە هەڵوەشاوەکانی شارەکە و دیوارە ڕووخاوەکانی و بەردە پەرتەوازەکانیشیم دەبینی هاوبەشی خەفەت و گریانم بوون!

بەڵێ، هەر شتێکم دەبینی وامدەزانی لەگەڵ مندا دەگری! ئیتر تێ گەیشتم کە ناتوانم لەوە زیاتر ئەم غەریبییە لە شارەکەمدا هەڵبگرم! بۆیە هاتمە سەر ئەوەی کە یان بڕۆم بۆ لای ئەو ئازیزانە لەناو گۆڕەکانیاندا.. یان بڕۆمە ئەشکەوتێکەوە، هەتا منیش لەوێ بۆ خۆم وەك ئەوان دەمرم! چونکە دەموت: "مردن" گەلێ باشترە لەم جودایی و لێکدابڕانانەی کە لەم دنیایەدا دێنە ڕێی مرۆڤ و لە ڕادەیەکدان هەرگیز ئارامیان لەسەر ناگیرێت و، ئازار و زامیشیان لە پلەیەکی وەهادایە کە ناتوانرێت بەرگری بکرێت.

لەتاوا چاوم بە هەر شەش لای خۆمدا گێڕا، کەچی لە تاریکی زیاتر هیچی ترم تێدا بەدی نەکرد. ئەو پەژارە و ئێش و ئازارە قورسانە دووچاری "بێ ئاگایییان" کردم و.. ئەو بێ ئاگاییەش دنیای سامناك و چۆڵ پیشان دام؛ دەتوت هەر ئێستا دنیام بەسەردا دەڕووخێت!

لەو کاتەدا "گیان"م لەتاو ئەم هەموو بەڵا و گیروگرفتە زۆرانەی کە شێوەی دوژمنیان لەخۆ گرتبوو، بە دوای پشت و پەنایەکدا دەگەڕا تاکو پشتی پێ ببەستێ و، چاوی بۆ یارمەتیدەرێك دەگێڕا کە بتوانێت ئارەزووە لە ژمارە نەهاتووەکانی بۆ بهێنێتەدی کە هێندە زۆرن تا "ئەبەد" کۆتاییان نایەت..

لەو کاتەدا کە "گیان"م بە دوای ئەو "پشتیوان" و "یارمەتیدەر"ەدا دەگەڕا و، چاوەڕوانی دڵدانەوە و دەرووەیەکی دەکرد کە لێی بکرێتەوە سەبارەت بەو خەم و خەفەتە

زۆرانەی کە ئەنجامی کاولکاری و لێکدابڕان و جودایی‌یە بێ‌سنوورەکان بوون.. ئا لەو کاتەدا، ڕاستیی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز بە ڕوونی لە بەردەم دیدی ئەندێشەمدا دەرکەوت کە دەفەرموێ:

﴿سَبَّحَ لله مَا فِي السَّموات والأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ * لَــهُ مُلْــكُ السَّــموات والأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الحديد: ١-٢)..

ئیتر لەو ئەندێشە ئازاربەخشە و لە ئازارەکانی جودایی و لێکدابڕان ڕزگاری کردم و، چاوی سەر و بینایی دڵی کردمەوە.

دوای ئەوەی کە حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە هات بە هانامەوە، ئاوڕم لە درەختە بەردارەکان دایەوە، بینیم بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە بۆم دەڕوانن و، پێم دەڵێن:

"تەنها سەیری ئەو شوێنەوارە ڕووخاوانە مەکە.. ئەی سەیرێکی ئێمەش ناکەیت و سەرنجمان نادەیت"؟!

بەڵێ، ڕاستیی ئەم ئایەتە بە توندی ڕایەکاندم و بێداری کردمەوە و، پێی وتم:

(بۆچی هەتا ئەم ڕادەیە خەفەت بۆ لەدەستچوونی ئەو نامە ئاوەدانەی سەر لاپەڕەی "وان" دەخۆیت، کە مرۆڤ بە دەستی خۆی نووسیبووی و بنیاتی نابوو تا ئەوەی شێوەی شارێکی ئاوەدانی لەخۆ گرتبوو؟ بۆچی بەم ئەندازەیە خەم و پەژارەی نەمانی ئەم شارە دایگرتوویت کە لافاوی سامناکی داگیرکردنی ڕووس بردی و گشت خەت و شوێنەوارێکی کوژاندەوە؟ سەرت بۆ لای خواوەندی بەدیهێنەر هەڵبڕە کە پەروەردگار و خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە و جڵەوی هەموو شتێکی لە دەستدایە.. دڵنیابە نووسراوەکانی خواوەند لەسەر لاپەڕەی "وان"دا هەمیشە بە کەماڵی ورشەداری و ڕەنگینی هەر لە گەشەکردن و تازەبوونەوەدان. ئەو ڕووداوانەش کە تۆ زووتر بینیتن و شیوەن و گریانیش بەسەر چۆڵی ئەو جێگایانە و کاول بوونیاندا تەنها لە ئەنجامی بێ‌ئاگایی مرۆڤەوەیە لە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو جێگایانە و، هی ئەوەیە کە مرۆڤ - بە خەیاڵی هەڵەی - خۆی بە خاوەنیان لە قەڵەم دەدات و، نازانێت کە لە ڕێبوار و میوانێك زیاتر هیچی تر نی‌یە)!

لە ناوەندی ئەم حاڵەتە دڵ سووتێنەر و بۆچوونە هەڵەیەی مندا، دەرگایەکی گەورەم لێ خرایە سەرپشت کە بەسەر ڕاستی‌یەکی زۆر گرنگدا دەیڕوانی و، بە وێنەی ئاسن کە دەخرێتە ناو ئاگر و هەندێ نەرم دەبێت و ئنجا شێوەیەکی تایبەتیی بۆ دیاری دەکرێت، "نەفس"یشم بە دیتنی ئەو حاڵەتە گەرم و سووتێنەر و خەفەتە ئازار بەخشانە نەرمیی

بەدەست هێنا و ئامادەیی وەرگرتنی ئەو ڕاستی‌یە گرنگەی پەیدا کرد و، قورئانی پیرۆز لە ناوەندی ڕاستیی ئەم ئایەتەوە بەرەکەتی ڕاستی‌یەکانی ئیمانی بە ڕوونی پیشان دا. ئیتر دەروونم وەری گرتن و ملی بۆ کەچ کردن.

بەڵێ، هەروەك لە "مەکتووبی بیستەم" و پەیامەکانی هاوچەشنی‌دا چەسپاندوومانە: ڕاستیی ئەم ئایەتە پیرۆزە - سوپاس بۆ خوا - لە ڕیزنەی **"ئیمان بە خوا"**وە پشت و پەنایەکی گەورەی بە "گیان" و "دڵ"م بەخشی کە هەریەکەیان بەپێی پلەی خۆی لەم ئیمانەدا سوودی لێ وەرگرت. ئەم پشتیوانەش هێندە مەحکەم و توندوتۆڵ بوو کە ئەگەر بەڵا و گیروگرفت و بارە ترسناکەکانم سەد هێندەش گەورەتر بوونایە هەر دەیتوانی بەرامبەر هەموویان ڕابووەستێت و ڕووبەڕوویان ببێتەوە. چونکە ڕاستیی ئەم ئایەتە یادی خستمەوە کە: (هەموو شتێك ملکەچ و فەرمانبەرداری بەدیهێنەری تۆیە، کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم بوونەوەرەیە و جڵەوی هەموو شتێکی لە دەستدایە. ئیتر تۆ ئەوەت سەروزیادە کە پەیوەندیت بەو بەدیهێنەرەوە بێت).

منیش هەر کە بەدیهێنەری خۆمم بەم شێوەیە ناسی و پشتم پێ بەست، ئیتر هەموو شتێك وازی لە دوژمنایەتی کردنم هێنا! تەنانەت ئەو حاڵەتانەی کە خەفەت و ئازاریان دەرخوارد دەدام ئێستا دڵخۆش و شادمانم دەکەن.

ئنجا هەروەك لە زۆر پەیامدا بە بەڵگەی گومانبڕ چەسپاندوومانە: ئەو نوورەش کە لە **"ئیمان بە ڕۆژی دوایی"**یەوە هات بە فریامەوە، هێزێکی هێندە گەورەی یارمەتیدانی لە بەرامبەر هیوا و ئارەزووە بێ سنوورەکانمەوە پێ بەخشیم کە نەك تەنها بەشی حەز و ئارەزووە کاتی و بچووکەکان و پەیوەندی‌یە دنیایی‌یەکانی نێوان من و خۆشەویستانی ئەم دنیام بکات، بەڵکو بەشی حەز و ئارەزووە لە ژمارە نەهاتووەکانی جیهانی نەمری و بەختیاریی هەمیشەیی ئەودنیاشم بکات. چونکە هەر تەنها درەوشانەوەیەکی میهرەبانیی خواوەندی "بەخشندەی میهرەبان" نیعمەتە بەتام و ناوازە و لە ژمارەبەدەرەکانی ڕووی زەوی - کە یەکێکە لە مەنزڵگاکانی میوانخانەی دنیا - لەسەر سفرەی هەموو بەهارێکدا بە میوانەکانی دەبەخشێت، تاکو بۆ ماوەی چەند ساتێك دڵیان خۆش بکات. وەك بڵێی ئەمەی لە دنیادا پێی بەخشین ژەمی بەیانیان بێت و پاشان بیانگوێزێتەوە بۆ شوێنە هەمیشەیی‌یەکانی هەر هەشت بەهەشتە پڕ لە نیعمەتەکەی خۆی کە بۆ بەندەکانی ئامادەی کردوون.

بێ گومان کەسێك باوەڕی بە میهرەبانیی ئەم خواوەندە "بەخشندە و میهرەبان"ە بێت و بە دڵنیاییەوە پاڵی پێوە بدات و هەست بکات کە پەیوەندیی بەو خواوەندە خاوەن دەسەڵاتەوە هەیە، ئەوا خاڵێکی یارمەتیدانی هێندە مەزنی دەست دەکەوێت کە نزمترین پلەی ئەو خاڵە بە هانای سەرجەمی هیوا و ئاواتە لە ژمارە نەهاتووەکانیەوە دەڕوات و دەیانهێنێتەدی.

جا ئەو نوورەی کە لە باوەڕهێنانم بە ڕاستیی ئەم ئایەتەوە لێم دەرکەوت، هێندە درەخشان بوو کە هەر شەش لا تاریکەکەمی بە وێنەی ڕۆژ بۆ ڕووناك کردمەوە و، ڕۆشنایی تەواوەتیی بەو حاڵەتی خەفەت و گریانەشم بەخشی کە بۆ قوتابخانەکەم و قوتابییەکۆچ کردووەکانم دووچارم بوو. بە ڕادەیەك کە تێی گەیاندم: جیهانێك ئەو خۆشەویستانە کۆچیان بۆ کردووە هەرگیز جیهانێکی تاریك نییە، بەڵکو جیهانێکی ڕووناکە و، ئەوانیش تەنها ئەوەندە نەبێ کە جێگاکانیان گۆڕیوە هیچی تریان نەکردووە و، پاش ماوەیەکی تر لەگەڵ یەك کۆدەبینەوە و بە یەکتری شاد دەبینەوە.

بەم جۆرە، ئەم نوورە بە تەواوەتی وازی لە گریان و شیوەن پێ هێنام و، تێی گەیاندم کە جێگەدار و قوتابیی وەك ئەوانم دەست دەکەوێت.

دەسا شوکر و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە قوتابخانەی "ئیسپارتە"ی[1] لە بریی قوتابخانە کۆچکردووەکەی "وان" پێ بەخشیم و، ئەو خۆشەویستانەشی لە شێوەیەکی تردا و بە ئەندازەیەکی زۆرتر و لە شێوەی ئەم قوتابییە بەڕێز و خۆشەویستانەی ئێستامدا بۆ زیندوو کردمەوە.

هەروەها ئەو نوورە تێی گەیاندم کە من لەوەوپێش بە هەڵەدا چووبووم کاتێ وامدەزانی ئەم دنیایە چۆڵ و ڕووخاوە و کاول کراوە! چونکە تێی گەیاندم کە خاوەنی ڕاستەقینەی دنیا - بە گوێرەی خواستی حیکمەتی خۆی - ئەو تابلۆ کاتییانەی کە بە خامەی مرۆڤ کێشراون، دەگۆڕێت بە چەند تابلۆیەکی تر. بەمەش نووسراوە جۆراوجۆرەکانی خۆی نوێ دەکاتەوە. چونکە هەروەك بەرێك لە درەختێك دەکرێتەوە بەرێکی تری دەچێتەوە جێ، جودایی و نەمانی ناو گرۆی ئادەمیزادیش بە هەمان جۆرە و بۆ مەبەستی نوێ بوونەوە و تازەکردنەوەیە. کەواتە ئەو خۆشەویستانە بە تەواوەتی لەناو نەچوون، تاکو خەفەتێکی ئازاربەخش و بەسۆیان بۆ بخورێت. نەخێر، بەڵکو دەبێ لە

---

(١) مەبەست بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوورە لە پارێزگای "ئیسپارتە"دا. (وەرگێر)

ڕوانگەی ئیمانەوە خەفەتێکی ناسکی بەلەزەتیان بۆ بخۆین بۆ ئەو لێکدابڕانەی کە بۆ مەبەستی بە یەك شادبوونەوەیە لە خانەیەکی تری ڕەنگین و جواندا!

هەروەها ئەم نوورە، سەرجەمی ئەو سەرسامی و ڕەشبینی‌یانەمی سەبارەت بە بوونەوەر ڕەواندەوە و ڕووناکی کردنەوە. جا کاتێ کە ویستم لە بەرامبەر ئەمەوە شوکر و ستایش بۆ خواوەند دەربڕم، ئەم بڕگەیەی خوارەوەم بە زمانی عەرەبی بۆ هات کە وێنەی ڕاستەقینەی ئەو ڕاستی‌یە پیشان دەدات:

(الحمد لله على نور الإيمان المصور ما يُتوهم أجانب أعداءً أمواتاً موحشين أيتاماً بـاكين، أوداء إخواناً أحياءً مؤنسين مرخّصين مسرورين ذاكرين مُسَبِّحين).

بە واتای: من شوکر و ستایشێکی لە ژمارەبەدەر پێشکەشی بەدیهێنەری شکۆمەندی خۆم دەکەم لەسەر پێبەخشینی نووری "ئیمان" کە سەرچاوەی ئەو هەموو نیعمەتە لەژمارەبەدەرانەیە. چونکە ئەو تابلۆ سامناکەی کە لەو حاڵەتە ئازاربەخشەوە سەری هەڵدا و منی وا تێگەیاندبوو کە گوایا بەشێك لەم بوونەوەرانە دوژمن و بێگانەن بە ئێمە[1] و، بەشێکی تریان چەند تەرمێکی سامناکن و، بەشێکی تریشیان چەند هەتیوێکی بێ‌کەسن و هەردەم لە گریاندان.. سوپاس بۆ خوا کە ئەو نوورەی ئیمان ئەم تابلۆ سامناکەی گۆڕی بە شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی، تەنانەت بە "عین الیقین" بینیم کە ئەوانەی من بە دوژمن و بیانیم دەزانین لە ڕاستی‌دا برا و هاوڕێی منن و، ئەوانەش کە وەك تەرمی سامناك دەمبینین، دەرکەوت تەرم نین بەڵکو هەندێك لەوانە زیندوون و هەندێکی تریشیان لەوانەن کە ئەرك و کارمەندیی ئەم ژیانەیان تەواو کردووە. ئنجا ئەوەش کە وەهمی مرۆڤ بە گریان و شیوەنی هەتیوانی دادەنێت، لە ڕاستی‌دا زیکر و ویرد و تەسبیحاتی بوونەوەرانە.

واتە: بە ئەندازەی ئەو بوونەوەرانەی کە دنیا تایبەتی‌یەکەی منیان ئاوەدان و پڕ کردووەتەوە، کە ئەویش بە ئەندازەی هەموو دنیایە، لەگەڵ خۆمدا هەموویان بە "نییەت" و "تەسەوور" لەو شوکر و سوپاسەدا بەشدار دەکەم کە پێشکەشی ئەو خواوەندەی دەکەین و، بە زمانی حاڵی سەرجەمی بوونەوەران دەڵێین:

"الحـــمد لله على نور الإيمان"!

پاشان چێژ و تام و لەزەتەکانی ژیان کە لە ئەنجامی ئەو بارە سەرسامکەر و بێ‌ئاگایی

---

(١) وەك: بوومەلەرزە و زریان و تۆفان و تاعون و ئاگر و... هتد. (دانەر)

بەخشەوە پەرتەوازە بوون.. هەروەها هیوا و ئاواتەکانم کە هەر هەموویان کشانە دواوە و سەرچاوەکانیان وشك بوون.. نیعمەت و لەزەتە تایبەتی‌یەکانیشم کە لە چوارچێوەیەکی گەلێ تەسکدا مابوونەوە، تەنانەت هەر نەیشمان.. هەموو ئەمانە، بەو نوورەی "ئیمان" - وەك لە چەند پەیامێکی تردا چەسپاندوومانە - گۆڕانیان بەسەردا هات و لەسەر شێوەی پێشوویان نەمان، چونکە نووری ئیمان سنووری بازنە تەسکەکەی دەوری دڵمی هێندە فراوان کرد کە جێگای سەرانسەری گەردوونی تێدا بووەوە و، تەنانەت دنیا و قیامەتیشی کرد بە دوو سفرەی پڕ لە نیعمەت و میهرەبانی لە بریی ئەو نیعمەتانەی کە لە باخچەکەی "خوڕخوڕ"دا[1] وشك بوون و چێژ و لەزەتیان لەدەست دا. ئەم نوورەی ئیمان تەنها بەمەشەوە ڕانەوەستا، بەڵکو هەر یەك لە "چاو" و "دڵ" و "گوێ" و هەستە هاوچەشنەکانی تری وەك ئەمانە و تەنانەت دەیان کۆئەندام و ئامێری مرۆڤی - هەر کەسەش بەپێی پلەی ئیمانیی خۆی - کرد بە "دەست" تاکو بە هۆیانەوە لەسەر ئەو دوو سفرە و خوانەی هەردوو دنیادا و لە هەموو لا و سووچێکیانەوە خۆشەچنیی نیعمەتەکانی ئەویان پێ بکات! منیش، لە بەردەم ئەم ڕاستی‌یە هەرەمەزنەدا و بۆ سوپاسکردنی خوای گەورە لەسەر ئەو هەموو نیعمەتە زۆر و زەبەندانە، وتم:

(الحمد لله على نور الإيمان المصوّر للدارين مملوءتين من النعمة والرحمة، لكل مؤمنٍ حقــاً أن يستفيد منهما بحواسه الكثيرة المنكشفة بإذن خالقه).

بە واتای:

سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئیمانێکی ئەوتۆی پێ بەخشیوم کە نیعمەتی نووری ئەو ئیمانە دنیا و قیامەتمان بە دوو سفرەی پڕ لە نیعمەت و میهرەبانی پیشان دەدات و، هەر ئەو خواوەندەش سوود وەرگرتنی هەموو ئیمانداریێکی ڕاستەقینەی لەو دوو سفرە پڕ لە نیعمەتانە لە ڕێی دەستی ئەو هەست و نەستانەیانەوە دەستەبەر دەکات کە بە نووری ئیمان و ئیسلام دەردەکەون. خۆ ئەگەر بمتوانیایە بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی جەستەم و پڕ بە دنیا و قیامەت شوکر و ستایشم پێشکەش بکردایە، ئەوا پێشکەشم دەکرد.

جا مادەم "ئیمان" هەر لەم دنیایەدا کار و ئاسەواری ئاوای لەدەست بێت، دەبێ لە جیهانی نەمری و هەمیشەیی‌دا ڕێژنە و بەروبوومی گەلێ گەورەتر و زیاتری بە لاوە بێت،

---

(١) "خوڕخوڕ" ناوی قوتابخانەکەی مامۆستا نوورسی بووە لە شاری "وان" لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی‌دا. (وەرگێڕ)

بە ڕادەیەك کە عەقڵە دنیاییەکانی ئێمە نەتوانێت پەیی پێ ببات و لە ناساندنیدا دەستەوسان دەبێت.

* * *

ئەی خوشك و برایانی پیر و، ئەی ئەوانەی کە لەبەر "پیری" جودایی خۆشەویستانیان ئازاری تاڵیان دەرخوارد دەدات!

پێم وایە من لە ناوەرۆکدا زۆر لە ئێوە پیرتر بم، هەرچەند لەوانەشە هەندێکتان بە تەمەن لە من گەورەتر بن! چونکە من، لەبەر ئەو بەزەیی و میهرەبانییە زۆر و زیادەی کە خوای گەورە لە سروشتمدا بەرامبەر هەموو گرۆی مرۆڤی هاوڕەگەزم دایناوە، جگە لە ئازاری تایبەتیی خۆم، ئازاری هەزاران برای ترم لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە و بە ئازاری هەموویان ئازار دەچێژم! وەك بڵێی پیرێك بم تەمەنم خۆی لە سەدان ساڵ دابێت! بەڵام ئێوەی بەڕێز با جودایی و لێکدابرانی زۆریشتان چەشتبێت هێشتا هەر هێندەی من تووشی بەڵا و گیروگرفت نەبوون. چونکە هەرچەندە من کوڕم نییە تا بیرم بە لایەوە بێت، بەڵام بەهۆی نهێنیی ئەو سۆز و شەفەقەتەی لە سروشتمدایە، هەست بەوپەڕی دڵناسکی و ئازار دەکەم بۆ هەزاران ڕۆڵەی نەتەوەی ئیسلام کە دووچاری ئەشکەنجە و گیروگرفت دەبن! تەنانەت بۆ ئازاری ئاژەڵە بێ زمانەکانیش هەست بەو دڵنەرمی و ئازارە دەکەم! ئەمە جگە لەوەی کە لە ڕووی غیرەتی ئیسلامییەوە خوای گەورە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەرامبەر بەم وڵاتە و تەنانەت سەرجەمی جیهانی ئیسلامی پێ بەخشیوم و، هەرچەندەش بۆ خۆم خانوویەکی تایبەتیم نییە، کەچی هەموو جیهانی ئیسلامی بە ماڵ و خانە و لانەی خۆم دەزانم.. لەبەر ئەوە، زۆریی خەفەت و ئازارەکانی من هی خەفەت و ئازاری خەڵکی ئەم وڵاتە و سەرجەمی جیهانی ئیسلامییە، کە گەلێ خەفەت بۆ جودایی و ئازاری ئەوان دەچێژم.

جا لەبەر ئەوەی هەرچی خەفەتی پیری و ئازاری جودایی و بەڵا و گیروگرفتی زۆرم هەبوون، ئەو نوورەی ئیمان هەموویانی لەناوبرد و، لە بریی ئەوانە: هیوا و ئاواتێکی توندوتۆڵ و دوور لە نائومێدی و، ڕووناکییەکی نەکوژاوە و، دڵنەواییەکی نەبڕاوە و هەمیشەیی پێ بەخشیم، ئەوا ئێوەی بەڕێزیش هەر ئەو ئیمانەتان سەروزیادە لە بەرامبەر ئەو تاریکی و بێئاگایی و خەم و پەژارانەی کە لە پیرییەوە سەری تێ کردوون. لە ڕاستیدا پیریی تەواو تاریك و نووتەك هی هەرزە و گومڕایانە. هەروەها سەختترین ئێش و ئازاری قورسی جوداییش بریتییە لە ئێش و ئازار و جودایی ئەوان.

بەڵێ، چەشتنی ئەم ئیمانەی کە ئومێد بە دڵی مرۆڤ دەبەخشێت و تیشکی ڕووناکی پەخش دەکات و، هەست کردن بە دڵدانەوە و دڵنەوایی ئەو ئیمانە و چەشتنی تام و لەزەتی ئەو دڵدانەوەیە، لە: هەست پێ کردنی شعووری و ئەنجامدانی ئەو پەرستشەدایە کە شایانی سەردەمی پیرییە و ئایینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانی پێ داوە، نەك ڕەفتاری پێچەوانەوەی ئەمە کە ئەو پیرانە دەیکەن سەریان لێ شێواوە و دڵدانەوەی خۆیان لە لاسایی کردنەوەی لاوان و چاولێکەریی مەستی و بێئاگایی ئەواندا دەبینن. ئێوە هەمیشە بیر لەو فەرمووده پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ بکەنەوە کە دەفەرموێ: "خيرُ شبابِكم مَنْ تَشبَّهَ بكهولِكم، وشرُّ كهولِكم مَنْ تَشَبَّهَ بشبابِكم"(١) أو كما قال. واتە: باشترین لاوانی ئێوە ئەوانەن کە وەك پیرەکان لەسەرخۆن و دوورن لە کاری هەرزە و خراپەکاری. خراپترین پیریشتان ئەوانەن کە چاو لە لاوان دەکەن لە هەرزەیی و بێئاگایی و کاری ناڕەوادا.

دەسا خوشك و برایانی پیرم!

لەواتای فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە کە دەفەرموێ: "میهرەبانیی خوا شەرم دەکات دەستی بەرزکراوەی نزا و لالانەوەی هەر پیرێکی ئیماندار بگێڕێتە دواوە"(٢).

جا مادەم میهرەبانی خوای گەورە بەم جۆرە ڕێزتان لێ دەگرێت، دەسا ئێوەش بە پەرستنی ئەو خواوەندە ڕێزی خۆتانی لێ بگرن.

### ❑ ئومێدی چواردەهەم:

لە سەرەتای "تیشکی چوارەم"دا کە بریتییە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ (آل عمران:١٧٣) باسێك هەیە کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

کاتێ دنیا پەرستان منیان لە هەموو شتێك کرد، کەوتمە ناوەندی پێنج جۆری غەریبییەوە. هێندەش تەنگیان پێ هەڵچنی بووم و بێزاریان کردبووم کە "بێئاگایی" سەری تێ کردم و نەیهێشت ئاوڕێك بەلای ڕووناکیی "پەیامەکانی نوور"دا بدەمەوە تاکو

---

(١) أخرجه أبو يعلى والطبراني في الكبير من حديث واثلة وغيرهم. قال الحافظ العراقي في تخريج الإحياء ٦٢/٣ بإسناد ضعيف، وأخرجه البيهقي في شعب الإيمان من حديث أنس ومن حديث ابن عباس وأخرجه ابن عدي في الكامل من حديث ابن مسعود وقال ابن الجوزي: لا يصح. انظر فيض القدير ٤٨٧/٣ ورمز السيوطي لحسنه. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەوە)

(٢) روى السيوطي في الجامع الكبير عن ابن النجار بسند ضعيف.. إن الله عز وجل يستحي من ذي الشيبة إذا كان مسدداً كروماً للسنة ان يسأله فلا يعطيه. (بأختصار عن كشف الخفاء ٢٤٤/١). (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەکەوە)

هێز و یارمەتیی لێ وەربگرم و دڵنەوایی خۆمی پێ بکەم، بەڵکو ڕاستەوخۆ ڕوانیمە "دڵ"م و، "ڕۆح"ی خۆمم تاقی کردەوە..

بینیم: عیشقێکی تابڵێی بەهێز بۆ "مانەوە" و "نەمری" و، خۆشەویستی‌یەکی یەکجار بەتین بۆ "وجوود" و، سەودایەکی گەورەش بۆ "ژیان" بەسەر دەروونمدا زاڵە و خۆی بەسەر مندا سەپاندووە. هاودەم لەگەڵ ئەوەشدا: "دەستەوسانی"یەکی بێ سنوور و "هەژاری"یەکی لە ئەندازە بەدەرم لە خۆمدا هەست پێ دەکرد. کەچی لە بەرامبەر هەموو ئەمانەوە دەمبینی "فەوتان" و "نەمان"ێکی سامناك و گرنگم لە ڕێدایە، کە ئەو "مانەوە" و "ژیان"ە لەناو دەبەن و هەموو ئاواتەکانیشم دەکوژێننەوە!

کە ئەمەم بەدی کرد، یەکسەر منیش وەك ئەو شاعیرە دڵ سووتاوە، لەبەر خۆمەوە شیعرەکەی ئەوم خوێندەوە کە دەڵێت:

"دانست" خوازیاری فەنای جەستەمە — "ئەبەد" ئاواتی: دڵی خەستەمە
دەروونم کەیلی پەژارە و دەردە — لوقمان سەرسامە و تیمار ئەستەمە

ئیتر بە نائومێدی‌یەوە سەرم داخست.. کەچی لە ناکاودا ئایەتی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ هات بە هانامەوە و، پێی وتم: "بە وردی بمخوێنەرەوە".

منیش هەموو ڕۆژێك پێنج سەد جار دەمخوێندەوە و، لە هەر جارێکدا هەندێ لە نوور و بەرەکەتەکانیم بۆ دەردەکەوت! تا وام لێ هات کە نەك هەر تەنها بە "علم الیقین" بەڵکو بە "عین الیقین"یش نۆ پلەی "حەسبی"م لەم ئایەتەوە دەست کەوت:

**یەکەم پلەی نووریی "حەسبی":**

ئەو "عیشقی مانەوە"یەی کە لە مندایە، لە ڕاستی‌دا ناڕوانێتە مانەوەی "من"، بەڵکو دەڕوانێتە "بوون"ی ئەو خاوەن کەماڵە ڕەهایە و "کەماڵ" و "مانەوە"ی ئەو. چونکە یەکێك لە سێبەرەکانی درەوشانەوەیەکی ناوێکی خوای گەورەی خاوەن کەماڵی ڕەها و جوانیی ڕاستەقینە – کە خۆی لە خۆی‌دا خۆشەویستە – لە چییەتی(ماهیة)ی مندا هەیە. جا ئەو عیشقی "مانەوە"یەی کە لە مندایە و دەڕوانێتە "بوون" و "مانەوە"ی ئەو خاوەن کەماڵە ڕەهایە، بەهۆی بێ‌ئاگایی‌یەوە، ڕێگای ون کرد و سەری لێ شێوا و دەستی بە سێبەرەکەوە گرت و، عیشقی مانەوەی ئاوێنەکەی کەوتە سەر!

بەڵام هەر کە ئایەتی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾ هات و پەردەی لە ڕووی ئەم ڕاستی‌یە لادا، هەستم کرد بەڵکو بە "حق الیقین" چەشتم و بینیم کە: خودی لەزەتی مانەوە و بەختیاریم، تەنانەت لەزەتی لەوە باشتریشم لەوەدایە کە بە دڵنیایی و

ملکەچی‌یەوە باوەڕ بە "مانەوە"ی ئەو خواوەندە باقی و خاوەن کەماڵە بهێنم و، ئیمانم ببێت بەوەی کە هەر تەنها ئەو خوا و پەروەردگارمە.

ئەمەشمان لە پەیامی "الحسـبية"دا و لەو دوازدە بڕگەیەدا کە هەریەکەیان بە: "هەروەها.." دەست پێ دەکات، بە چەندین بەڵگەی لەوپەڕی ورد و قووڵی‌دا ڕوون کردووەتەوە. هەموو ئەو هەست و شعووره ئیمانی‌یانەشمان تێدا باس کردوون کە ئیمان دروستیان دەکات و، گشت خاوەن هەستێك سەری لێیان سووڕ دەمێنێت.

**دووهەم پلەی نووری "حەسبی":**

لەگەڵ ئەو بێ‌دەستەڵاتی و کۆڵەواری‌یەی کە لە سروشتمدایە و، ئەو پیری‌یەی کە سەری تێ کردبووم و، ئەو غەریبی‌یەی کەوتبوومە ناویەوە و، ئەو بێ‌کەسی و تەنیا باڵی‌یەشدا کە تیای‌دا بووم و لە هەموو شتێك دابڕ کرابووم، دنیاپەرستان - بە پلانی خۆیان و لە ڕێی سیخوڕەکانیانەوە - هێرشێکی بێ‌بەزەیی‌یانەیان کردبووە سەرم.. ئا لەم کاتەدا، ڕووم لە دڵم کرد و پێم وت:

"چەندین سوپای چڕوپڕ و زۆر و زەبەندە هێرش دەکەنە سەر تاقە کەسێکی لاوازی نەخۆشی دەست بەستراو! ئایا من هیچ پشت و پەنایەکم نی‌یە"؟

گەڕامەوە بۆ ئایەتی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل﴾. ئەویش پێی ڕاگەیاندم کە:

لەبەر ئەوەی تۆ خاوەنی (ناسنامەی پەیوەندیی ئیمان)یت ئەوا سەر بە پادشایەکی گەورە و خاوەن دەستەڵاتی ڕەهایت، کە پادشایەکە لە وەرزی بەهاردا بەوپەڕی ڕێکوپێکی پێداویستیی سەرجەم سوپاکانی ڕووەك و زیندەوەران - کە لەسەر زەوی‌دا بڵاون و لە چوارسەد هەزار ڕەگەزی جۆراوجۆرن - دابین دەکات و، ڕۆزیی سوپای هەموو گیانلەبەران دابەش دەکات کە مرۆڤ لە پێشەکی هەموویانەوەیە. ئەمەش نەك بە وێنەی ئەو ڕۆزی‌یانەی کە ئێستا مرۆڤ لە شێوەی پوختەکراوەکانی شەکر و گۆشت و شتی تردا دۆزیویانەتەوە، بەڵکو لە شێوەی چەندین پوختەکراوی سەد جار لەوانە تەواوتر و باشتردا. ئەو ڕۆزی‌یانە، کاکڵە و پوختەکراوی هەموو جۆرە خۆراکێکن. تەنانەت ئەو شتانەی کە پێیان دەوترێت "ناوك" و "تۆو" لە ڕاستی‌دا "پوختەکراوە خوایی‌یەکان"ن. جا ئەو پوختەکراوانە بە چەند بەرگێکی تایبەتی "قەدەر" کە لەگەڵ پێگەیشتن و نەشونمایاندا بگونجێ، دەپێچێتەوە و، لە چەندین قوتو و سندووقی بچووکدا دەیانپارێزێت. ئەم سندووقانەش لە کارگەی "ك. ن" و بە فەرمانی "كُنْ" بە خێرایی و بە

ئاسانی‌یەکی ڕها و بە زۆری‌یەکی لەسنووربەدەر دروست دەکرێن، بە ڕادەیەك کە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿**فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ**﴾ (البقرة:١١٧).

جا مادەم بەهۆی "پێناسی پەیوەندیی ئیمان"ەوە پشتیوانێکی وەك ئەمەت دەست کەوتووە، ئەوا دەتوانیت بە دڵنیایی‌یەوە پاڵ بە هێز و دەستەڵاتێکی گەورە و ڕەهاوە بدەیت و ئارامیی دڵی خۆتی پێ بەدەست بهێنیت.

لە ڕاستیشدا هەر کاتێك ئەم وانەیەم لەم ئایەتە پیرۆزەوە وەردەگرت، هەستم بە هێز و توانایەکی گەورەی مەعنەوی دەکرد و، لە خۆمدا هێزێکی وام شك دەبرد کە بتوانم نەك هەر ئەوانەی دەوروبەر و نزیکی خۆم، بەڵکو بەرەنگاری هەموو دوژمنێکی لە جیهاندا پێ بکەم! هەر ئەمەش بوو کە هانی دام لە قووڵایی و ناخی ڕۆحمەوە: ﴿**حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ**﴾ بخوێنمەوە و دووپاتی بکەمەوە.

**سێهەم پلەی نووریی "حەسبی":**

کاتێ پاڵەپەستۆی نەخۆشی و هەموو شێوەکانی نامۆیی و جۆرەکانی ستەم لە سەرم توند بوون، هەستم کرد بەوەی کە سەرجەم پەیوەندی‌یەکانم لەگەڵ دنیادا دەپچڕێن .. "ئیمان"یش لەلای خۆیەوە ڕێنمایی دەکردم و، پێی دەوتم:

(تۆ بۆ دنیایەکی تری ئەبەدی دەستنیشان کراویت و شایستەی وڵاتێکی هەتاهەتایی و بەختیاری‌یەکی هەمیشەییت).

لەم کاتەدا هەر شتێك حەسرەتی لێ بچۆڕایە و بیخستمایەتە داخ و خەفەتەوە، وازم لێ هێنان و دەستم لێ داتەکاندن و، گۆڕیمن بەو شتانەی کە مزگێنیی خێر و خۆشی‌یان تێدایە و بەردەوام دەمخەنە شوکر و سوپاسی خواوەندەوە.

بەڵام ئایا ئەم ئامانجە چۆن هەتاسەر دێتەدی کە ئەوپەڕی ئاوات و ئامانجی ئەندێشە و مەبەستی ڕۆح و ئاکامی سروشتی مرۆڤە، ئەگەر ئەو خواوەندە بەدەستەڵاتە نەیهێنێتەدی کە خاوەنی توانستی ڕەهایە؟ ئەو خوایەی کە ئاگای لە هەموو جموجووڵ و وەستان و کردار و گوفتاری بەدیهاتووانیەتی و تۆماری دەکات لەسەریان؟ ئەم ئامانجە چۆن دێتەدی ئەگەر چاودێریی بێ سنووری ئەو خوایە نەبێت بۆ ئەم مرۆڤە بچووکەی کە لەناو بێدەستەڵاتیی ڕەهادا دەتلێتەوە و، ئەو خوایە هێندە ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە کە گوفتاری خۆی ئاراستە کردووە و لە نێوان هەموو بەدیهاتووانی‌دا پلەی بەرزی بەو بەخشیوە؟

بەڵێ، کاتێ کە بیرم لەم دوو خاڵە دەکردەوە، واتە: کارایی و لێهاتوویی ئەم

دەستەڵاتە بێ سنووره و، ئەو گرنگی‌یە ڕاستەقینەیەش کە خوای باڵادەست بەم مرۆڤەی داوه کە لە ڕواڵەتدا کەم نرخ دیارە.. کاتێ بیرم لەم دوو خاڵە دەکردەوە، دەمویست ئەم دوو خاڵەم لە ڕووی ئیمانەوە بە چەشنێك لـێ دەربکەوێت و بۆم ڕوون ببێتـەوە کە بە تەواوی دڵنیاییم بێ ببەخشێت.

بۆ ئەم مەبەستە سەرم لە هەمان ئایەتی پیرۆزی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيـــلُ﴾ دایەوە. ئەویش پێی وتم: (سەرنج لەو "نا"یە بدە کە لە "حسبنا"دایە و، بزانە ئەوانە کێـن کـە چ بـە زمـانی حـاڵ و چ بـە زمـانی قسـە و گوفتـار لەگـەڵ تۆدا دەڵێـن: "حسبنا" و، بـۆ خـۆت گوێیان لـێ ڕابگرە).

بەڵێ، ئەم ئایەتە بەم جۆرە فـەرمانی پێ دام.. منیش کـە سـەیرم کـرد و سـەرنجـم دا، چەندین جۆری لە ژمارەبەدەری باڵندەی گەورە و مێرووی باڵداری یەکجار بچووکی وەك مێـش و، چـەندەها جـۆر زینـدەوەری گـەورە و بچـووك و ڕووەك و درەختـی لەژمارەبەدەری بەرز و بچکۆلەی بێ کۆتاییم بینی کـە هـەموویان بـە زمـانی حـاڵ لەگـەڵ منـدا واتـای: ﴿حَسْـبُنا اللهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيـــلُ﴾یـان دەوتـەوە و یـادی غـەیری خۆیشـیان دەخستەوە!

هـەروەها بینیـم: ئـەم بوونەوەرانـە باشـترین وەکیلیـان هەیـە کـە دابینکردنـی هـەموو مەرجەکانی ژیانی ئەوانی گرتووەتە ئەستۆ. تەنانەت لەو هێلکانەی کە لەیەك دەچن و لـە هەمان ماددەی یەکتر پێکهاتوون، هـەروەها لـەو "مەنی"یانـەی کـە وەك یـەك وان و، لـەو ناوك و تۆوانەی شێوەیان لە یـەکتر دەچێـت، بەبێ هەڵـە و ناتـەواوی و لـێ تێکچـوون و زۆر بە ڕێکوپێکی و جوانی و هاوسەنگی و ڕازاوەیی: سەد هەزار جۆر زینـدەوەر و سـەد هـەزار شـێوە پەلـەوەر و سـەد هـەزار جـۆر ڕووەك و سـەد هــەزار جـۆر درەخـت بـەدی دەهێنێت و لێکیـان جیـا دەکاتـەوە. ئـەم بەدیهێنانـەش بـە بـەردەوامی و بەوپـەڕی زۆری و ئاسانی و فراوانی لە کاردایە، بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا کە بە چاوی خۆمان دەیبینین.

جا بەدیهێنانی ئەم شتانە بە کۆمەڵی و بە چەشنێکی لەیەکچووی تێهەڵکێش و لەسـەر هەمان شێوە و لە ناوەندی مەزنایەتیی ئەم توانستە ڕەهایـەدا، بـە ڕوونـی: "تـاك و تـەنیایی" خوامان بۆ دەردەخات.

ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە تێی گـەیاندم کـە: هەرگیزاوهـەرگیز کـەس نـاتوانێت خـۆی هەڵبقورتێنێت و دەست بخاتە ناو ئەم کارانەی پەروەردگاریتیی ڕەها و بەدیهێنـەریتیی ئەو خوایەی کە ئەم موعجیزە لە سنوور بەدەرانە دەردەخات و بڵاویان دەکاتەوە.

جا ئه‌و که‌سانه‌ی که ده‌یانه‌وێت له ناسنامه و چیه‌تیی مرۆڤانه(الماهیة الإنسانیة)ی من - وه‌ك هی هه‌ر ئیمانداریٚکی تر - تێ‌بگه‌ن.. ئه‌وانه‌ی که ده‌یانه‌وێت وه‌ك من وابن، ئه‌وا با سه‌رێکی ئه‌و کۆیه‌ی "نا" بکه‌ن و سه‌یرێکی ته‌فسیری "من" (واته خۆم) و ڕێگا و شوێنی له‌و کۆیه‌دا بکه‌ن و، له بوونی من و جه‌سته‌ی لاوازی منی هه‌ژار - که وه‌ك جه‌سته‌ی هه‌ر موسڵمانێکی تر لاوازه - تێ‌بگه‌ن و، با بزانن که ژیان خۆی چی‌یه؟ مرۆڤایه‌تی چی‌یه؟ ئیسلام چی‌یه؟ ئیمانی ته‌حقیقی چی‌یه؟ ناسینی خوا چی‌یه و، چۆن خۆشه‌ویستی خوامان ده‌ست ده‌که‌وێت؟

با له‌مانه تێ‌بگه‌ن و.. وانه‌یه‌کی لێ فێر ببن!

**چواره‌م پله‌ی نووری "حه‌سبی":**

ئه‌و ته‌گه‌ره و له‌مپه‌رانه‌ی هاتنه ڕێم و له‌رزه‌یان به "بوون"م خست، وه‌ك پیری و غه‌ریبی و نه‌خۆشی و ده‌ست‌به‌سه‌ری، هه‌موو ئه‌وانه پێکه‌وه له‌و کاته‌دا هێرشیان بۆ هێنام که "بێ‌ئاگایی" سه‌ری تێ‌کردبووم! وه‌ك بڵێی "بوون"ی خۆم که زۆر به توندی ده‌ستم لێ گیر کردبوو، به‌ره‌و عه‌ده‌م هه‌نگاو بنێت، ته‌نانه‌ت "بوون"ی هه‌موو بوونه‌وه‌رانیش به‌ره‌و "نه‌بوون" بڕوات. ڕۆشتنی هه‌موو ئه‌مانه‌ش به‌ره‌و "نه‌مان" خه‌م و په‌ژاره و نیگه‌رانی‌یه‌کی توند و تیژیان بۆ فه‌راهه‌م هێنام..

ئا له‌م کاته‌دا سه‌رم له ئایه‌تی: ﴿**حَسْبُنا اللّٰهُ وَنِعْمَ الْوَكِيل**﴾ دایه‌وه.. ئه‌ویش پێی وتم: (له واتاکانم ورد به‌ره‌وه و به چاوی ئیمان بۆیان بڕوانه)!

منیش که به چاوی ئیمانه‌وه بۆم ڕوانین، بینیم: "بوون"ی من که - وه‌ك بوونی هه‌ر موسڵمانێکی تر - گه‌ردیله‌یه‌کی ئابڵێی لاواز و بچووکه، له ڕاستی‌دا ئاوێنه‌یه‌که بۆ بوونێکی بێ سنوور و، هۆکارێکه بۆ ده‌ستکه‌وتنی جۆره‌ها بوونی زۆر و له ژماره نه‌هاتوو که به چه‌شنێکی بێ‌کۆتایی ده‌کرێنه‌وه و ده‌رده‌که‌ون. هه‌روه‌ها وه‌کو وشه‌یه‌کی پڕ له دانایی وایه که چه‌نده‌ها "بوون"ی هه‌میشه‌یی ده‌به‌خشێت که زۆر له خۆی گرانتر و به‌رزتر و به‌نرخترن[1]. ته‌نانه‌ت به "علم الیقین" زانیم که تاقه چرکه‌یه‌کی ئه‌م بوونه‌ی من *- له ڕووی په‌یوه‌ندیی ئیمانی‌یه‌وه - به ئه‌ندازه‌ی بوونێکی هه‌میشه‌یی گران و به‌نرخه.*

(١) ئه‌و شته‌ی به‌ره‌و "نه‌مان" ده‌ڕوات، چه‌ند جۆرێکی "بوون" له دوای خۆی به‌جێ ده‌هێڵێت، واته: هه‌موو شتێکی "فانی" له چه‌ند لایه‌که‌وه "باقی"یه. بۆ نموونه: ده‌نکه گه‌نمێك که به دارزانی ناو خاك ده‌مرێت، له پاش خۆی گوڵێك به‌جێ ده‌هێڵێت که سه‌د ده‌نکه گه‌نمی تێدایه. ئیتر له‌به‌ر ئه‌مه‌و له‌م ڕوانگه‌یه‌وه، ترسان له "مردن" و "نه‌بوون" و خه‌فه‌ت خواردن بۆ "نه‌مان" کارێکه له جێی خۆی‌دا نی‌یه. (وه‌رگێڕ)

چونکە لەبەر ئەوەی بە هەستی ئیمانی دەمزانی کە بوونی مـن تەنـها درەوشـانەوە و ئاسەوارێکی خوای گـەورەی "واجـب الوجـود"ە و یەکێکـە لـە بەدیـهاتووە ڕێـك و جوانەکانی، ئەوا ئەم زانینە لەو تاریکی‌یە بێ‌سنوورانەی کە زادەی چەند وەهمێکی ترسناك بوون و، لـە ئازاری دوور و درێژی جودایی و لێکدابرانە بێ‌کۆتایی‌یەکانیش ڕزگاری کردم و، هەر ئەم زانینەش بە ئەندازەی ژمارەی کـار و نـاوە جوانەکانی خـوای گەورە - کە پەیوەندی‌یان بە بوونەوەرانـەوە هەیە - پەیوەندیی برایانەی لـە نێـوان مـن و بوونەوەردا، بە تایبەتی لەگەڵ زیندەوەراندا، بۆ دروست کـردم. هـەروەها ئەوەشـم زانـی کە لـە ناوەندی جودایی و لێکدابڕانێکی کـاتیی وەك "مردن"دا، بە یـەك گەیشتنەوە و پەیوەندی‌یەکی هەمیشـەییم دەسـت دەکـەوێت لەگـەڵ سـەرجەمی خۆشەویسـتانم لـە بوونەوەردا!

بەم جۆرە، "بوون"ی من - وەك بوونی هـەر بـاوەڕدارێکی تر کە ئیمـان و پـەیوەندیی ئیمـانیی ببێـت - چەندین ڕوونـاکیی "بـوون"ی ئەوتۆی دەسـت کـەوتووە کـە جودایـی بوونەوەرانی نایەتەڕێ. تەنانەت گەر ئەم "بوون"ەی مـن بـڕوات و لـە دەستم دەربچێـت، ئەوا مانەوەی جۆرەکانی تری "بوون" دوای من جێی دەگرنەوە و، وەك ئەوە وایە کە هەر خۆی بە تەواوی مابێتەوە!

بـە کورتـی: "مـردن" جودایی نی‌یە، بەڵکو بریتی‌یـە لـە بـە یـەك گەیشـتنەوە و جـێ گۆڕینەوە و بەرهەمهێنانی بەروبوومێکی باقی و هەمیشەیی!

**پێنجەم پلەی نووریی "حەسبی":**

ماوەیەك ژیانم لە ژێر چەندین کۆڵی قورسدا دەیناڵاند، بە ڕادەیەك کـە ئاوڕیـان بـەلای ژیان و "تەمەن"ـدا پێ دامـەوە. سەرنجـم دا تەمـەنم ڕووەو ئەودنیا بـە پەلـە و خێـرایی لـە ڕۆیشتندایە و، ژیـانی نزیکبـووی ئاخیرەتیشـم - لـە ژێـر ئەم کۆڵـە قـورس و تـەنگ پـێ هەڵچنینەدا - بەرەو کوژانەوە هەنگاو دەنێت! کەچی فەرمانبەری‌یە بەرزەکانی "ژیـان" و سـوودە بەنرخـەکانی دەری دەخـەن کـە: ژیـان شایسـتەی ئـەوە نی‌یـە بـەم خێرایی‌یـە بکوژێتەوە، بەڵکو شایستەی ژیانێکی درێژخایەنە. لەبەر ئەوە، بە خەفەتێکی زۆرەوە بـیرم لەم کێشەیە دەکردەوە و، بۆ ئەم مەبەستە سەرێکم لە مامۆستاکەم: ﴿**حَسْبُنا اللهُ وَنِعْـــمَ الْوَكِيل**﴾ دایەوە. ئەویش پێی وتم:

(بەو جۆرە بڕوانە بۆ ژیان کە خـواوەندی "حَيّ" و "قَيُّوم" دەیەوێت بۆی بڕوانیت).

منیش کە لەم ڕوانگەیەوە سەیرم کرد، بۆم دەرکەوت کە: ئەگەر "ژیان" بە تەنها یەك ڕوو بۆ من بڕوانێت، ئەوا سەدان ڕووخسار و ڕووی هەیە کە پێیان دەڕوانێتە خواوەندی "حَيّ" و "قَيُّوم".. ئەگەر تەنها بەرهەمێکی بۆ من بگەڕێتەوە ئەوا هەزار بەرهەمی بۆ بەدیهێنەرم دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوە، تەنها ساتێکی ژیان کە لە چوارچێوەی ڕەزامەندی‌یەکانی خوادا بێت سەروزیادی مرۆڤە و، پێویست بە ژیانێکی دوور و درێژ ناکات!

ئەم ڕاستی‌یەش بە چوار مەسەلە ڕوون دەبێتەوە. جا با ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ژیانیان دەست بکەوێت یان ئەوانەی کە نەمردوون، با بێن و لە ناوەندی ئەو چوار مەسەلەیەدا بە شوێن ماهییەت و ڕاستیی "ژیان" و مافە ڕاستەقینەکانی ژیاندا بگەڕێن، تاکو دەستیان بکەوێت و بتوانن بژین! پوختەکەشی ئەمەیە کە:

"ژیان" هەتا بڕوانێتە خواوەندی "حەیی" و "قەییوم" و، ئەو خواوەندە مەبەست بێت لە ژیاندا.. هەتا ئیمان "ژیان" و "گیان"ی ژیان بێت، ئەوا ژیان "مان"ی دەست دەکەوێت و بەروبوومی مانەوە و هەمیشەیی دەبەخشێت. تەنانەت هێندە بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو پلەیەی کە درەوشانەوەی "نەبڕاوەیی"(سەرمەدی‌یەت) بەدەست بهێنێت. دیارە ئەو کاتەش ئاوڕ بەلای کورتی و درێژیی تەمەندا نادرێتەوە!

**شەشەم پلەی نووریی "حەسبی":**

لە ناوەندی ئەو پیری‌یەی کە جودایی تایبەتیی خۆمم یاد دەخاتەوە و.. لە نێوان ڕووداوەکانی ئاخرزەماندا کە هاودەم لەگەڵ جودایی‌یە گەورە و گشتی‌یەکاندا هەواڵی کاول بوونی دنیاش ڕادەگەیەنن و.. لە ناوەندی گەشە کردن و دەرکەوتنی لەعادەت‌بەدەری هەستەکانم لە کۆتایی تەمەنمدا بە شێوەیەکی فراوان سەبارەت بە: جوانی و عاشق بوونی ئەو جوانی‌یە و شەیدابوونی ناخی سروشتم بۆ کەماڵات.. لە ناوەندی هەموو ئەمانەدا، بینیم: ئەو "نەمان"ەی کە هەمیشە خەریکی ڕووخان و کاول کردنە و، ئەو "مردن" و "نەبوون"ەش کە بەردەوام جودایی دەنێنەوە، بە شێوەیەکی سامناك جوانیی ئەم دنیا جوان و ڕازاوەیە دەشێوێنن و، بە تێك شکاندنیشی ناشیرینی دەکەن و، ناسك و نیانی و جوانیی ئەم بەدیهاتووانەش لەناودەبەن!

لە قووڵایی ناخی خۆمەوە ئازارێکی گەلێ قورس و لەڕادەبەدەرم چەشت و، لە بەرامبەر ئەم کارەساتە ناهەموارەوە عیشقی مەجازیی ناو سروشتم کەوتە هەڵچوون و کەفوکوڵ و ملنەدان و سەرپێچی کردن! هیچ چارەیەکیشم بەدەستەوە نەبوو بۆ

ڕزگاربوون لەم بارە پەرێشانە و دڵدانەوەی خۆم جگە لە سەردانەوەم لەم ئایەتە پیرۆزە..
ئەویش پێی وتم:

(بە جوانی بمخوێنەرەوە و لە واتاکانم ورد بەرەوە).

منیش ڕۆشتمە ناو ڕوانینگا(مرکز إرصاد)ی سوورەتی نوور لە ئایەتی: ﴿**اللَّهُ نُورُ السَّموات وَالأَرْضِ**﴾دا و، لەوێ بە دووربینی ئیمان ڕوانیمە دوورترینی چینەکانی ئایەتی "حەسبی" و، بە مایکرۆسکۆبی هەستی ئیمانیش سەیری وردترین نهێنییەکانیم کرد..

بینیم: هەروەك ئاوێنە و شووشە و هەموو شتێکی ساف و بریقەدار تەنانەت کەف و بڵقی سەر دەریاکانیش جوانییە پەنهان و ڕەنگاوڕەنگەکەی "خۆر" دەردەخەن و، هەریەکەیان چەندین جۆری جوانیی حەوت ڕەنگەکەی ئەو ڕووناکییە پیشان دەدەن..
هەروەها وەك بە گوێرەی تازەبوونەوە و جووڵانەوەی ئەو ماددانە و بەپێی توانا و قابیلییەتیان و شکانەوەی جۆراوجۆریان، ئەو جوانییەی "خۆر"یش تازە دەبێتەوە و بە شێوەیەکی ڕازاوەی سەرنج ڕاکێش جوانیی پەنهان و حەوت ڕەنگەکەی تیشکی خۆر دەردەخەن..

بە هەمان جۆر، ئەو بەدیهاتووە ناسکۆڵە و جوانانەش کە لە جێگای ئاوێنەدان و جوانیی خاوێن و پیرۆزی خواوەندی جوان و شکۆمەندیان تێدا دەدرەوشێتەوە کە ڕووناکیی ئەزەل و ئەبەدە.. ئەم بەدیهاتووانەش بە هەمان جۆر و بە بێ وەستان، هەر لە هاتن و ڕۆیشتندان و، بەمەش درەوشانەوەی ئەو جوانییە هەمیشەییەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە تازە دەکەنەوە!

کەواتە ئەو جوانییە درەخشان و ئاشکرایەی کە بەسەر ڕوخساری ئەم بوونەوەرانەوە دەبینرێت – لە ڕاستیدا – موڵکی خۆیان نییە، بەڵکو ئاماژە بۆ ئەو جوانییە خاوێن و هەمیشەییەی خواوەند دەکەن کە داخوازی خۆپیشاندانن و، ئاماژە و نیشانە و درەوشانەوەی ئەو جوانییە پاك و بێ گەردەن کە دەیەوێت بە ئاشکرا ببینرێت و پیشانی کەسانی تریش بدرێت.

بەڵگەکانی ئەممان لە پەیامەکانی نووردا بە درێژی باس کردووە، بە تایبەتی لەو پەیامەدا کە بەم ڕستەیە دەست پێ دەکات:

"لێرەدا بە شێوەیەکی پوخت سێ دانە لەو بەڵگانە باس دەکرێن..."[١].

---

(١) مەبەست: شەشەم پلەی نووریی حەسبییە، لە تیشکی چوارەمی "تیشکەکان"دا. (وەرگێڕ)

الحُكْمُ وَإلَيهِ تُرجَعُونَ﴾ (القصص:٨٨) تُهَدِّدُني وَتَقطَعُ عَلاقَاتي الكَثـــيرَةَ مِـــنَ الأشـياء. وَبانقِطاعِ كَلِّ عَلاقَةٍ يَتولَّدُ جَرْحٌ وَأَلَمٌ مَعنَويٌّ في رُوحي. وَلا حَولَ عَنْ تِلكَ الجُرُوحاتِ الغَيرِ المَحدُودَة؛ وَلاقُوَّةَ عَلى أدوِيَتِها إلاّ بكَ يا مَنْ يكفي لِكُلِّ شَيءٍ، وَلا يَكفـــي عَــنْ شَيءٍ واحِدٍ مِنْ تَوَجُّهِ رَحمَتِهِ كُلُّ الأشياء، وَيا مَنْ اذا كَانَ لشيءٍ كَانَ لَهُ كُلُّ شيءٍ ومَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ لا يَكُونُ لَهُ شَيءٌ مِنَ الأشياء.

إلَهي! لِي عَلاقاتٌ شَديدَةٌ وَابتِلاءٌ وَمَفتُونيَّةٌ مَعَ شَخصيَّتِي الجِسمانيَّةِ، حَتَّـــى كَــأنَّ جسمي عَمُودٌ في نَظَري الظَّاهِريِّ لِسَقفِ جَميعِ آمالي وَمَطَالِبي؛ وَفِيَّ عِشـــقٌ شَــديدٌ لِلبَقاء؛ مَعَ أنَّ جسمي لَيسَ مِنْ حَديدٍ وَلا حَجَرٍ لِيَدُومَ في الجُملَةِ، بل مِـــنْ لَحـــمٍ وَدَمٍ وَعَظمٍ عَلى جَناحِ التَّفَرُّقِ في كُلِّ آن؛ وَمَعَ أنَّ حَياتي كَجسمي مَحـــدودةُ الطَّرَفَـــين، سَتُختَمُ بِخَاتَمِ المَوتِ عَنْ قَريب؛ مَعَ أنِّي قَد اشتَعَلَ الرَّأسُ شَيباً مِنِّي، وَقد ضَرَبَ السَّـقَمُ ظَهري وَصَدري، فَأنا في قَلَقٍ وَضَجَرٍ وَاضطِراب وَتَأَلُّمٍ وَتَحزُّن شَديدٍ مِنْ هذهِ الكَيفيَّـةِ. فَلاحَولَ عَنْ هذِهِ الحَالَةِ الهَائِلَةِ؛ وَلا قُوَّةَ عَلى ما يُسَلِّيني عَمَّا يَحزُنُني، وَعَلى ما يُعَوِّضُـــني ما يَضيعُ مِنِّي، وَعَلى ما يَقُومُ مَقَامَ ما يَفُوتُ مِنِّي إلاّ بكَ يا رَبِّيَ الباقي، وَالباقي ببَقَائِـــهِ وَإبقائِهِ مَنْ تَمَسَّكَ باسمٍ مِنْ أسمائِهِ الباقِيَةِ.

إلَهي! لِي وَلِكُلِّ ذي حَياة خَوفٌ شَديدٌ مِنَ المَوتِ وَالزَّوالِ اللَّذَينِ لا مَفَرَّ مِنـــهُما؛ وَلِي مَحَبَّةٌ شَديدَةٌ لِلحَياة وَالعُمْرِ اللَّذينِ لا دَوامَ لَهُما؛ مَعَ أنَّ تَسارُعَ المَوتِ إلى أجسامِنا بهُجُومِ الآجالِ لا يُبقي لِي وَلا لأحَدٍ أمَلاً مِنَ الآمالِ الدُّنيَويَّةِ إلاّ وَيَقطَعُها، وَلا لَــذَّةً إلاّ وَيَهْدِمُها. فَلا حَولَ عَنْ تِلكَ البَلِيَّةِ الهائِلَةِ وَلا قُوَّةَ عَلى ما يُسَلِّينا عَنها إلاّ بكَ ياخَـــالِقَ المَوتِ وَالحَياة! وَيامَنْ لَهُ الحَياةُ السَّرمَديَّةُ، الَّذي مَنْ تَمَسَّكَ بِهِ وَتَوجَّـــهَ إلَيـــهِ وَيَعرِفُـــهُ وَيُحِبُّهُ؛ يَدُومُ حَياتُهُ وَيَكُونُ المَوتُ لَهُ تَجَدُّدَ حَياة وَتَبديلَ مَكَان. فَإذاً فَلا حُزنَ لَـــهُ وَلا أَلَمَ عَليهِ بسرٍّ: ﴿**ألا إنَّ أولِيَاءَ اللهِ لا خَوفٌ عَلَيهِمْ وَلا هُمْ يَحزَنُونَ**﴾ (يونس:٦٢).

إلَهي! لِي لأجلِ نَوعي وَجنسي عَلاقَاتٌ بتَأَلُّمات وَتَمَنِّيـــات بالسَّـــموَاتِ وَالأرضِ وَبأحوَالِها. فَلا قُوَّةَ لِي بوَجهٍ مِنَ الوُجُوه عَلى إسماعِ أمري لَهُما، وَتَبليغِ أمَلـــي لِتِلــكَ الأجرامِ، وَلاحَولَ عَنْ هذا الإبتِلاءِ وَالعَلاقَةِ إلاّ بكَ يا رَبَّ السَّموَاتِ وَالأرضِ! وَيا مَــنْ سَخَّرَهُما لِعِبادِهِ الصَّالِحينَ.

إلَهي! لِي وَلِكُلِّ ذي عَقلٍ عَلاقَاتٌ مَعَ الأَزمِنَةِ الماضِيَةِ وَالأَوقات الإستِقبَاليَّةِ؛ مَعَ أَنَّنا قَدِ انْحَبَسْنَا في زَمانٍ حاضِرٍ ضَيِّقٍ لا يَصِلُ ايدِينا إلى أدنى زَمانٍ ماضٍ وَمُستَقبَلٍ لِجلب مِنْ ذاكَ ما يُفرِّحُنا، او لِدَفْعٍ مِنْ هذا ما يُحزِنُنا. فَلاحَولَ عَنْ هٰذِهِ الحَالَةِ، وَلا قُوَّةَ عَلى تَحويلِها إلى أحسَنِ الحالِ إلاّ بِكَ يارَبَّ الدُّهُورِ وَالأَزمَان.

إلَهي! لِي في فِطرَتي وَلِكُلٍّ أحَدٍ في فِطرَتِهِمْ آمالٌ أبَديَّةٌ وَمَطالِبُ سَرمَدِيَّةٌ تَمْتَدُّ إلى أبَدِ الآباد. إذ قَد أَودَعْتَ في فِطرَتِنَا استِعداداً عَجيباً جامِعاً، فِيهِ احتِياجٌ وَمَحَبَّةٌ لا يُشبِعُهُما الدُنيا وَما فيها، وَلا يَرضى ذلِكَ الإحتِياجُ وَتِلكَ المَحَبَّةُ إلاّ بِالجَنَّةِ الباقِيَةِ؛ ولا يَطمَئِنُّ ذلِكَ الإستِعدادُ إلاّ بِدارِ السَّعادَةِ الأبَدِيَّةِ. يارَبَّ الدُّنيا وَالآخِرَةِ وَيارَبَّ الجَنَّةِ وَدَارِ القَرارِ(١).

---

(١) لە سەرەتادا بڕیار وابوو کە دە دانە پلە لە پلەکانی "لا حول ولا قوة.." بنووسرێن، پاشان بەو هیوایەی لە کۆتاییدا بیاننووسم دوامخستن، کە گەیشتینە کۆتایی جارێکی تر دواخران، چونکە ئەگەر ئەو بەڵگانە ڕوون بکرێنەوە گەلێ دوور و درێژ دەردەچن، ئەگەر تەنها بە ئاماژەش بنووسرێن، کە تەنها خۆم لێیان تێدەگەم، ئەوا سوودی کەمیان لێ وەردەگیرێت. ناچار هەڵمان گرتن بۆ کاتێکی تر. (دانەر)

# بریسکەی سیهەم

**لە مەکتووبی سی و یەکەم و، یەکێك لە بەروبوومەکانی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"و، پاشکۆی پاشکۆ بۆ وتەی سیهەم. کە بریتی‌یە لە شەش سەرنج**

**ئەم وانە بەنرخە، بەرێکە لە بەروبوومەکانی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و ئاکام و بەرهەمی قوتابخانە یووسفی‌یەکەی ئەوێیە. بە وێنـەی پـەیامی "بـەری درەختی ئیمان" کە بەرێك بوو بەندیخانـەی "دەنـیزلی" هێنایـە بـەر و، پـەیامی "الحجة الزهراء"یش کە وانەیەکی ڕەوان بـوو لـە بەندیخانـەی "ئـافیوون" بـە وێنەی گوڵ دەمی پشکووت.**

**جا ئـەم پەیامـە - کـە بریسکەی سـیهەمە - چـەند سـەرنجێکی وردی سەبارەت بە شەش دانە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە لەخۆ گرتووە، کـە "ئیسمی ئەعزەم"ن.**

لـەو بەشـەی کـە تایبەتـە بـە نـاوی "الحـــي" و "القیّـــوم"ی ئیسمی ئـەعزەمی خـوای گـەورەوە، بـاس و بابـەتی گەلـێ ورد هـەن، کـە لـەوانەیە هـەموو کەسـێك نـەتوانێت بـە تەواوەتی لێیان تێ بگات و پەی بە چێژی هـەموویان ببـات. بـەڵام لـە هـەمان کـاتدا هیـچ کەسێك لێیان بێ بەهرە نابێت، بەڵکو بەشی خۆی بەهرە و سوودیان لـێ وەردەگرێت.

# سەرنجی یەکەم

## تایبەتە بە یەکێك لە سەرنجەکانی ناوی:

## (القُدُّوس)

کە یەکێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە

بسم الله الرّحمن الرّحيم

﴿وَالأَرضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُون﴾ (الذاريات:٤٨)

لە دەمی بەندبوونم لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"و، لە کۆتایی مانگی شەعبانی پیرۆزدا، یەکێك لە سەرنجەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە و درەوشانەوەیەکی ناوی "القدوس"ی خوای گەورەم لێ دەرکەوت، کە ئیسمی ئەعزەمە، یاخود یەکێکە لە شەش نوورەکانی. ئەم سەرنج و درەوشانەوەیە، بەوپەڕی ڕوونی، "بوون"ی خوای گەورەی بۆ دەرخستم و، بە جوانی "یەکتایی"ی پەروەردگاری پیشان دام. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەم "گەردوون" و "گۆی زەوی"یەم وەك: کارگەیەکی لەکارنەوەستاوی گەورە و، ئوتێل و میوانخانەیەکی فراوان هاتە پێشچاو کە هەمیشە پڕ دەکران و پاشان خالی دەکرانەوە. خۆ ئاشکرایشە میوانخانەیەکی ئاوا فراوان کە ئەم هەموو میوانەی تێ دێن و دەڕۆن، لە خاشاك و داروپەردوو پڕ دەبێت و، پیس و چەپەڵی گشت لایەکی ناوی دەگرێتەوە و، هۆکارەکانی ژیانی تێدا کەم دەبنەوە. جا ئەگەر دەستی خاوێنکاری و ڕێکخستن بە بەردەوامی کاری تێدا نەکات، ئەوا چڵك و چەپەڵیەکانی ناوی لە ئەنجامدا دەبن بەهۆی خنکانی مرۆڤ و لەدەستدانی ژیانی.

کەچی ئێمە لەم کارگە مەزنەی گەردوون و لەم میوانخانەیەی گۆی زەویدا هیچ ئاسەوارێکی چەپەڵی و خاشاك نابینین، هەروەك لە هیچ گۆشەیەکی گەردوون و گۆی زەویدا ماددەیەك نییە بێ سوود بێت، یان پێویست نەبێت، یاخود بە هەڕەمەکی دانرابێت! خۆ ئەگەر ماددەیەکی ئاوا سەرهەڵبدات، ئەوا یەکسەر لەگەڵ پەیدابوون و

سەرهەڵدانی‌دا فڕێ دەدرێتە ناو چەندەها ئامێر و مەکینەی ئەوتۆ کە دەیگۆڕن و دەیکەن بە ماددەیەکی پاك و خاوێن!

جا ئەم کارە گەرموگوڕ و کارامەیە، بەڵگەیەکە ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەوەی کە: "چاودێر"ی ئەم کارگەیە، بەوپەڕی وردی و بایەخ پێدانەوە، چاودێریی دەکات و، "خاوەن"ەکەشی فەرمان بە خاوێن کردنەوە و ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی بەردەوامی دەدات، تاکو سەرباری گەورەیی ئەم کارگەیە هیچ ئاسەوارێکی خاشاك و چڵك و چەپەڵیی وەهای پێوە نەبینرێت کە لە ئاستی گەورەیی ئەو کارگەیەدا بێت. کەواتە بایەخ پێدان و چاودێریی پاکوخاوێنیی ئەم کارگەیە هەمیشە بەردەوامە و، لەگەڵ فراوانی و گەورەیی کارگەکەدا لەبار و شیاوە. ئەوەتا ئەگەر هەر تاکە مرۆڤێك بۆ ماوەی یەك مانگ خۆی نەشوات و ژوورەکەی خاوێن نەکاتەوە، ژیانی دنیای لێ دێتەوە یەك. ئەی ئەگەر کۆشکی مەزنی جیهان خاوێن نەکرێتەوە دەبێ چۆن بێت؟!

کەواتە ئەو خاوێنی و پاکی و ڕوونی و سافی و جوانی‌یەی بەم کۆشکە ناوازەیەی جیهانەوە دەبینرێت، دەبێ ئەنجامی خاوێن کردنەوەیەکی ورد و دانایانە و بەردەوام بێت. دەنا گەر ئەم چاودێری‌یە بەردەوامەی پاکوخاوێنی و بایەخ پێدانە هەمیشەیی‌یەی پاکژیی سەر زەوی نەبوایە، ئەوا تەنها لە ماوەی یەك ساڵدا سەدان هەزار زیندەوەر لەسەر ڕووی چەپەڵبووی زەوی دەخنکان و.. گەر ئەو چاودێری‌یە ورد و بایەخە لەڕادەبەدەرەش لە بۆشایی ئەو ئاسمانە پڕ لە هەسارە و ئەستێرە و شوێنکەوتە و مانگانەش نەبوایە، کە گرفتاری مردن و داڕووخان دەبن، ئەوا داروپەردووە زۆر و پەرتەوازەکانیان بەناو بۆشایی‌دا، سەری ئێمە و گیاندارانی تریان دەشکاند، تەنانەت سەری دنیاشیان ورد و خاش دەکرد و، بارستایی گەورە گەورەی بە قەدەر چیاکانیان بەسەردا دەباراندین و، ناچاریان دەکردین لەم نیشتمانەی دنیامان هەڵبێین! کەچی هەر لە دێر زەمانەوە تاکو ئێستا لە ئەنجامی ئەو داڕمانانەدا چەند "نیزەك"ێك نەبێت هیچی تر لە بۆشایی دەرەوەی زەوی‌یەوە نەکەوتوونەتە خوارەوە بۆ ناو زەوی، خۆ ئەوانەش بەر هیچ کەسێك نەکەوتوون، بەڵکو بوون بەهۆی پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسانەی کە دەرس و ئامۆژگاری وەردەگرن.

هەروەها ئەگەر پاکژی و خاوێن کردنەوە لە ڕووی زەوی‌دا بەردەوام نەبوایە، ئەوا لە ئەنجامی بەدوای یەکدا هاتنی مردن و ژیانی سەدان هەزار جۆری زیندەوەران، هێندە چەپەڵی و تەرم و داروپەردوو کۆ دەبوونەوە کە وشکایی و دەریایان پڕ بکردایە و،

چڵك و چەپەڵیش دەگەیشتە ئاستێك کە هەموو کەسێکی خاوەن هەست بێزی لە تەماشا کردنی ڕووی چەپەڵی زەوی بکردایەتەوە، بەڵکو لە تاوا بەرەو مردن و نەمان هەڵبهاتایە، چ جای ئەوەی خۆشی بویستایە و شەیدای بوایە!

بەڵێ، هەروەك باڵندە بەوپەڕی ئاسانی باڵەکانی پاك دەکاتەوە و، نووسەریش زۆر بە سووك و ئاسانی خاوێنیی لاپەڕەکانی کتێبەکەی ڕادەگرێت.. باڵەکانی ئەم زەوی‌یە باڵندەیە و، مەلە ئاسمانی‌یەکانی تری ناو بۆشایی و، لاپەڕەکانی ئەم کتێبە مەزنەی گەردوونیش، بە هەمان ئاسانی خاوێن دەکرێنەوە و جوان دەکرێن و ئارایشت دەدرێن! بگرە خاوێن کردنەوە و ڕێکخستن و ئارایشتدانی گۆی زەوی لە ڕادەیەکی هێندە ڕێك و ورددایە کە ئەو کەسانەی لە ڕێی ئیمانەوە جوانیی "دوارۆژ"نابینن، شەیدای جوانی و خاوێنیی ئەم جیهانەی "دنیا" دەبن، تەنانەت هەندێ جار دەیشی پەرستن!

کەواتە ئەم کۆشکە بەرزەی جیهان و ئەم کارگە گەورەیەی گەردوون بەهرەمەندی لێ‌درەوشانەوەیەکی ناوی "القدوس"ی خوای گەورە بوون. بە ڕادەیەك کە هەر هێندەی ئەو فەرمانە موقەددەسە خوایی‌یانە دەردەچن کە تایبەتن بە خاوێن کردنەوە و پاكژ کردنەوە، ئەوا نەك تەنها هەر تەنها گیانلەبەرە دڕندە گەورەکانی دەریا و هەڵۆ گۆشت خۆرەکانی وشکایی کە ئەرکی خاوێن کردنەوەیان لە ئەستۆدایە، بەڵکو جگە لەوانیش، سەرجەم جۆرەکانی "کرم" و "مێروولە" کە تەرمی مردارەوەبووان کۆ دەکەنەوە و ئەرکی کارمەندانی تەندروستیی گشتی و پاکژی لە ئەستۆ دەگرن و لەم جیهانەدا چاودێریی خاوێنی دەکەن، گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمانانە دەبن و.. خڕۆکە سوور و سپی‌یەکانی ناو خوێنیش - بە هەمان جۆر - گوێ لەم فەرمانی پاکژی‌یانەی خواوەند ڕادەگرن و بۆ جێ‌بەجێ کردنیان ڕادەپەڕن! ئەوەتا ئەو خڕۆکانە خاوێن کردنەوەی خانەکانی لەشیان گرتووەتە ئەستۆ. هەروەك هەناسەدانیش خوێنی مرۆڤ پاڵفتە دەکات. بەڵکو پێڵووە نەرم و ناسکەکانیش بۆ گوێ ڕایەڵی و جێ‌بەجێ کردنی ئەو فەرمانانە لێدەبڕێن و بەردەوام چاو خاوێن دەکەنەوە. تەنانەت "مێش"یش فەرمانبەردار و گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمانانەیە؛ نابینیت بەردەوام لە خاوێن کردنەوەی باڵەکانیدایە؟!

جا هەروەك هەموو ئەوانەی باسمان کردن فەرمانبەردار و گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمانە قودسی‌یانەن کە لە لایەن خواوەندەوە لەمەڕ پاکژی دەردەکرێن، بە هەمان جۆر "ڕەشەبا" و "هەورە قورسەکان"یش گوێ ڕایەڵیان دەبن. ئەوەتا یەکێکیان ڕووی زەوی لە پیس و چەپەڵی خاوێن دەکاتەوە و ئەوی تریشیان بە ئاوێکی خاوێن ئاودێریی

باخچەکەی دەکات و تەپوتۆزی تێدا دەسڕەوێنێت و، پاشان بە خێرایی و ڕێسایەکی تایبەت ئامێرەکانی لەگەڵ خۆدا هەڵدەگرێت و دەکشێتە دواوە، تاکو جوانی و سافی و درەوشاوەیی بە ڕووی ئاسمان ببەخشێتەوە!

ئنجا هەروەك ئەستێرە و توخم و کانزا و ڕووەکەکان – بە جۆرە جیاجیاکانیانەوە – گوێ ڕایەڵی ئەو فەرمانانەن کە لە بواری پاکژی و خاوێن کردنەوەدا دەردەکرێن، بە هەمان جۆر، سەرجەمی "گەردیلە"کانیش گوێ ڕایەڵی دەبن. بە ڕادەیەك کە لە ناوەندی ئەو ئاڵوگۆڕە سەرسووڕهێنەرانەشدا کە دێنە ڕێیان هەر چاودێریی سافی و گەشی و پاکوخاوێنیی خۆیان دەکەن و، لە هیچ گۆشە و جێگایەکدا بە بێ سوود کۆ نابنەوە! خۆ ئەگەر چەپەڵیش بن، ئەوا یەکسەر خاوێن دەکرێنەوە و لە لایەن توانستێکی داناوە بەرەو خاوێنترین و سافترین و درەخشانترین و جوانترین و ناسکترین بار و شێوە، دەدرێنە بەر!

جا ئەم پاکژکارییە، کە تەنها یەك "کار"ە و تەنها یەك "حەقیقەت" دەردەبڕێت، لە ڕاستیدا درەوشانەوەیەکی هەرە گەورەی نێوان درەوشانەوەکانی ئیسمی ئەعزەمی "القدوس"ە و، تەنانەت لە گەورەترین و فراوانترین بازنەکانی گەردوونیشدا دەبینرێت، بە شێوەیەك کە بە وێنەی خۆری ڕووناکی ئاسمان "بوون"ی پەروەردگار و "یەکتایی" خوای گەورە و سەرجەم ناوە جوانەکانی دەردەخات و، چاوانی تیژ دەیانبینن.

لە زۆربەی بەشەکانی "پەیامەکانی نوور"دا بە چەندەها بەڵگەی توندوتۆڵی گومانبڕ چەسپاوە کە:

کاری: "ڕێکخستن" و "ڕێسا" کە یەکێکن لە درەوشانەوەکانی ناوی "الحَکَم و الحکیم"..

هەروەها کاری: "کێشان و لە تەرازووداان" کە یەکێکن لە درەوشانەوەکانی ناوی: "العدل والعادل"..

هەروەها کاری: "ئارایشتدان" و "چاکەکاری" کە یەکێکن لە درەوشانەوەکانی ناوی: "الجمیل والکریم"..

هەروەها کاری: "پەروەردەکردن" و "نیعمەت بەخشین" کە یەکێکن لە درەوشانەوەکانی ناوی: "الرب الرحیم"..

هەموو کارێك لەم کارانە، لە خۆیدا: یەك کار و، یەك حەقیقەتە و، هەریەکەشیان بە ئاشکرا لە ئاسۆی سەرانسەری گەردووندا دەبینرێت و، ئاماژە بۆ "پێویستیی بوون"ی یەکێکی "تاکی تەنیا" دەکات و، بە ڕوونی "یەکتایی"یەکەشی پێش چاو دەخات.

جا هەروەك هەموو یەكێك لەو كارانە بەو جۆرەن، كاری: "پاكژی و خاوێن‌كردنەوەش" كە یەكێكە لە درەوشانەوەكانی ناوی: "القدوس" بە هەمان شێوەیە و وەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان بەڵگەیە لەسەر "بوون"ی ئەو "واجب الوجود"ە و، بە وێنەی ڕۆژی رووناكیش "یەكتایی"یەكەی ئەو دەردەخات.

ئنجا هەروەك ئەو كارە ناوبراوانەی: ڕێكخستن و، تەقدیر و، خاوێن كردن و، كارە سەرتاپا دانستەكانی تری هاووێنەیان، بە یەكبوونی جۆرەكەیان و دەركەوتنیان لە فراوانترین ئاسۆكانی گەردووندا، بەدیهێنەرێكی تاكی تەنیا دەردەخەن.. بە هەمان جۆر، زۆربەی ناوە جوانەكان، بەڵكو هەموو یەكێك لە هەزار و یەك ناوە جوانەكانی خوای گەورە - بە وێنەی ئەوانەی باسمان كردن - درەوشانەوەیەكی هەرە گەورەیان لە فراوانترین بازنەكانی گەردووندا هەیە. ئیتر ئەو كارەی كە ئەنجامی ئەو لێ‌درەوشانەوەیەی خواوەندی تاك و تەنیایە، هێندە بە ڕوونی دەردەكەوێت كە لەگەڵ فراوانی و ڕوونیی ئەو كارەدا بگونجێ.

بەڵێ، ئەو "دانستە گشتی"یەی كە هەموو شتێك بۆ یاسا و ڕێسای خۆی ملكەچ دەكات و.. ئەو "بایەخدانە هەمەلایەنگر"ەی كە هەموو شتێك جوان دەكات و دەیڕازێنێتەوە و.. ئەو "میهرەبانی‌یە فراوانە"ی كە شادی و خۆشحاڵی بە دڵی هەموو شتێك دەبەخشێت و دەیخاتە سوپاسگوزاری‌یەكی بەردەوامەوە و.. ئەو "ڕۆزی‌یە گشتی"یەش كە هەموو زیندەوەرێك لەسەری دەژی و لەزەتەكانی دەچێژێ و.. ئەو "ژیان" و "ژیان بەخشین"ەی كە پەیوەندیی هەموو شتێك بە شتانی ترەوە گرێ دەدات و، وای لێ دەكات، كە وەك بڵێی موڵكی خۆی بن، سوود لە هەموو شتێك وەربگرێت..

ئەم ڕاستی‌یانە و ڕاستی‌یەكانی تری هاوچەشنیان كە بە ئاشكرا دەبینرێن و، "یەكبوون"یان پێوە دیارە و، ڕەونەق و جوانی و شادمانی‌یان بە ڕووی گەردوون بەخشیوە، بە ئاشكرا و بە وێنەی ئەوەی كە "ڕووناكی" دەبێت بە بەڵگە لەسەر "خۆر"، ئەو ڕاستی‌یانەش ئاوا بەڵگەن لەسەر خواوەندی: "دانا و، بەخشندە و، میهرەبان و، ڕۆزی بەخش و، زیندوو و، ژیان بەخش"!

جا هەموو یەكێك لەم كارە فراوانانەی كە لە سەدان كار تێپەڕ دەبن، بەڵگەیەكی تەواو ڕوون و ئاشكرایە لەسەر "وەحدانییەت". چونكە ئەگەر ئەو كارانە نەدرێنە پاڵ خوای "تاك و تەنیا" ئەوا سەدان مەحاڵ لە سەدان ڕووەوە، پەیدا دەبن..

بۆ نموونه:

نـەك هـەموو کارەکـانی وەك: "دانـایی و، چـاودێری و، میـهرەبانی و، ژیـاندن و، ژیانبەخشین و، مراندن" کـه لـه بەڵگه و ڕاستیيه بەدیهیيەکانی "تەوحید"ن.. بەڵکو تەنها یەك دانه کـاریش، کـه "پـاکژ کـردن"ە، ئەگـەر نەدرێتـه پـاڵ پـەروەردگاری گشـت جیهانەکان، ئـەوا دەبێ – لـه ڕێـی کوفـر و گومڕایـیدا – هـەر شـتێك کـه پـەیوەندیی بـه کـاری "خـاوێن کردنەوە"وە ببێـت، هـەر لـه گەردیلەکانەوە بۆ مێرووەکـان و ئنجـا بـۆ توخـــمەکان و تـا دەگاتـه ئەســتێرەکان، هـەموویان ئاگایـان لـه خـاوێن کردنـــەوە و جوانکـردن و ئارایشـتدان و هاوسـەنگیی شـتانی نـاو ئـەم گەردوونـه مەزنـه ببێـت و، کارەکانیان بەو پێيه ڕەچاو بکەن و، بتوانن بۆ ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان، لە بـواری پاکژی و خاوێن کردنەوەدا، ڕاپەڕن!

یان دەبێ: هـەموو یـەکێکیان گشـت سیفەته قودسـی و شـکۆمەندەکانی خـواوەنـدی پەروەردگاریان تێدا بێت!

یاخود دەبێ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریی فراوانی به ئەندازەی گەردوون هـەبێت کـه لـه گەردیله و مێروو و ئەسـتێره لەژمارەبـەدەرەکان پێکـهاتبێت، بـۆ ڕێکخستنی کاروبـاری سەرجەم ئارایشتدان و خاوێن کردنـەوەکانی گـەردوون و، هەڵسـەنگاندن و دەستنیشـان کردنی هەموو ئەو شتانەی دێنه ناوی و لێی دەردەچن و ڕاگرتنی هاوسەنگیيان!

بەم جۆره، ڕێبواری ڕێی کوفر دەگاته سەدان ئەفسانه و خورافاتی بێ نرخ و مـەحاڵی سۆفسـتائیيانەی وەك ئەمانـه، تـاکو ئـەو ئارایشــتدانه گشــتگیر و خــاوێن کردنـــەوە هەمەلایەنەیەی کە لە هەموو شوێنێکدا دەبینرێت، بێنه دی و پێشچـاو بکـەون. واتـه نـەك تەنها یەك دانه مەحاڵ، بەڵکو سەدان هەزار مەحاڵ لەم ڕێيەدا پەیدا دەبن.

بەڵێ، گەر ڕووناکیی ڕۆژ و ئەو ورده خۆره میسالیيانەی کـه بەسـەر هـەموو شـتێکی ڕووی زەویيەوە دەبریسـکێتەوە، نەدرێتـه پـاڵ ئـەو تـەنیا خـۆرەی ئاسمـان و، بـه دانـەوەی دەرکەوتن و درەوشانەوەی ئەو تاکه خـۆره لێـك نەدرێتـەوە، ئـەوا دەبێ بـاوەڕ بـه بوونـی خۆرێکی ڕاستەقینه بکرێت لە هەموو: دڵۆپه ئاوێکی بریسکەدار و، پارچـه شووشـەیەکی ڕوون و، کلوويەکی بریسکاوەی بەفر، تەنانەت لە هـەموو گەردیلەیـەکی هەوادا، تـاکو ئەو ڕووناکیيەی کە دنیای گرتووەتەوە، دەربکەوێت!

بەم جۆرە:

"دانایی" ڕووناکی‌یە و.. "میهرەبانیی فراوان" ڕووناکی‌یە و.. هەریەك لە: ئارایشتدان و.. هاوسەنگی و.. ڕێکخستن و.. پاکژ کردن، ڕووناکی‌یەکی هەمەلایەنە و گشتگیرن و، تیشکێکن لە تیشکەکانی نووری ئەزەلی، کە خوای گەورەیە.

ئێستا فەرموو بە نووری ئەم ئیمانە بڕوانە، تاکو ببینیت کە چۆن کافر و گومڕایان دەکەونە ناو زەلکاوێکی بۆگەنی ئەوتۆ کە ناتوانن لێی دەرباز ببن و، بە چاوی خۆت مەودای گەوجی و نەفامیی گومڕایان ببینە و، ئنجا سوپاسی خوا بکە و بڵێ: "الحمد لله علی دین الإسلام و کمال الایمان"!

بەڵێ، ئەم کارە بەرز و هەمەلایەنگرەی: "خاوێن کردنەوە و پاکژی" کە بە چاو دەبینرێت و کۆشکی جیهانی بە پاك و خاوێنی و جوانی ڕاگرتووە، یەکێکە لە درەوشانەوە و خواستەکانی ناوی جوانی: "القدوس"ی خوای گەورە.

جا هەروەك تەسبیحاتی سەرجەمی بوونەوەران ڕوویان لە ناوی "القدوس"ە و بۆی دەڕوانن.. ناوی "القدوس"یش داخوازی پاکوخاوێنی ئەو بوونەوەرانەیە[1]! بە ڕادەیەك کە حەدیسی پیرۆز لە واتای: "النظافة من الایمان"دا پاکوخاوێنی(الطهور)[2]ی بە یەکێك لە نوورەکانی ئیمان داناوە، چونکە پەیوەندی‌یەکی قودسیی بە ئیمانەوە هەیە. هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوەش دەری خستووە کە "خاوێنی" مایە و خولگەی خۆشەویستیی خوای گەورەیە:

﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَ يُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة:٢٢٢).

* * *

(١) دەبێ لە یادمان نەچێت کە: ڕەوشتە چەپەڵ و بیروباوەڕە بەتاڵ و بیدعەت و گوناهـ و تاوانەکانیش، هەموویان چڵك و چەپەڵیی مەعنەوین. (دانەر)

(٢) گەلێ فەرموودە بەم واتا و ناوەرۆکە هەیە، وەك: "الطهور شطر الأيمان والحمد لله تملأ الميزان". رواه مسلم وأحمد والترمذي عن أبي مالك الأشعري. (وەرگێڕ - لە: چاپی عەرەبیی: "اللمعات"ەوە).

# سەرنجی دووهەم

## تایبەتە بە یەکێك لە سەرنجەکانی ناوی:

## (العَدل)

کە یەکێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ (الحجر:٢١)

بە وێنەی سەرنجی پێشوو، لە کاتی بەندبوونم لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر"دا سەرنجێکی ناسکی ئەم ئایەتە پیرۆزە و نوورێکی درەخشانی ناوی "العدل"ی خوای گەورەم لە دوورەوە لێ دەرکەوت، کە ئیسمی ئەعزەمە یاخود یەکێکە لە شەش نوورەکانی. جا بۆ ئەوەی ئەم نوورە لە تێگەیشتنەوە نزیك بخەینەوە، بە هەمان جۆر رێی "نموونە هێنانەوە" دەگرینەبەر و، دەڵێین:

ئەم گەردوونە کۆشکێکی ناوازەی وەهایە کە شارێکی فراوانی لەخۆ گرتووە و، هەردەم هۆکارەکانی رووخاندن و بنیاتنانەوە لەم شارەدا دەست بەکارن.. هەر ئەم شارەش ولاتێکی فراوانی تێدایە کە بەردەوام لەتاو دیاردەکانی: جەنگ و کۆچ کردن، لە گەرمەی قوڵپدان و هەڵچوون و کوڵاندایە.. ئنجا لەم وڵاتەشدا جیهانێکی تابڵێی مەزن هەیە کە هەموو کاتێك لە ناوەندی شەپۆلەکانی دەریای مردن و ژیاندا سەرگەرمی مەلەوانییە! کەچی سەرباری گشت ئەم دیاردە و رواڵەتانەی پشێوی، دەبینین هاوسەنگییەکی گشتی و، هەڵسەنگاندنێکی هەستیارانە و، لەتەرازوودان و کێشانەیەکی یەکجار ورد بەسەر گشت لاکانی "کۆشك" و شوێنەکانی "شار" و سەرجەم جێگاکانی "وڵات" و کەنارەکانی "جیهان"دا، زاڵ بووە و بە تەواوی باڵی راکێشاوە. بە رادەیەك کە بە روونی و بەڵگەنەویستی دەری دەخەن:

ئەو ئاڵوگۆڕە لە ژمارەبەدەرانەی کە لەم بوونەوەرانەدا روو دەدەن و، سەرجەمی ئەو شتانەش کە دێنە ناوی و لێی دەردەچن، هەموویان بە کێشانە و پێوانەی کەسێك ئەنجام

دەدرێن کە لە یەك کاتدا چاوی لە هەموو لایەکی گەردوونە و، بە هەمیشە و بەردەوامیش سەرجەمی بوونەوەران لە ژێر چاودێریی ئەودایە، کە خوای تاك و تەنیایە.

دەنا گەر ئەو هۆکارانەی کە بۆ تێکدانی "هاوسەنگی" تێدەکۆشن، بە سەربەستی کاریان بکردایە، یان جڵەویان بە دەست "ڕێکەوت"ی هەڕەمەکی و "هێز"ی کتوکوێر و "سروشت"ی تاریکی گەلحۆ بوایە، ئەوا گەرای تەنها یەك دانە ماسی، کە لە هەزاران تێپەڕ دەبن، یان تۆوەکانی تەنها یەك گوڵە خەشخاش کە لە بیست هەزار دانە زیاترن، ئەو هاوسەنگییەیان تێکدەدا! ئەمە چ جای هەڵقوڵانی توخمەکان کە وەك لافاو وان و، ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنانەش کە لە گەردووندا ڕوو دەدەن. چونکە هەرکام لەمانە گەر سەربەست و هەڕەمەکی بوونایە ئەوا دەگونجا ئەو هاوسەنگییە وردەی نێوان بوونەوەران و هاوسەنگیی کامڵی نێوان بەشەکانی ئەو بوونەوەرانەشی لە ماوەی یەك ساڵ، بەڵکو لە ماوەی یەك ڕۆژدا تێك بدایە و، ئەو کاتەش پشێوی و گیروگرفت و ئاڵۆزیت لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا دەبینی:

"دەریاکان" لە کەلاك پڕ دەبوون و بۆگەنیان دەکرد..

"هەوا"ش بە گازە زیانبەخشە خنکێنەرەکان ژەهراوی دەبوو..

"زەوی"ش دەبوو بە قەسابخانە و سەرەنوێلك و لیتاوێکی بۆگەن کە ژیانی تێدا نەبرایەتە سەر!

ئەگەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ دەربکەوێت، ئەوا فەرموو:

بە وردی سەیری هەموو بوونەوەران بکە، هەر لە خانەکانی لەشەوە تا دەگاتە خڕۆکە سپی و سوورەکانی خوێن و.. لە ئاڵوگۆڕەکانی گەردیلەکانەوە بۆ پێکەوە گونجانی نێوان کۆئەندامەکانی لەش و.. لە دەرامەت و خەرجیی دەریاکانەوە تا دەگاتە دەرامەت و خەرجیی ئاوەکانی ژێر زەوی و.. لە تازە لەدایکبووان و مردووانی گیانلەبەر و ڕووەکەکانەوە تا دەگاتە کاولکارییەکانی پایز و ئاوەدانکردنەوەکانی بەهار و.. هەر لە کارمەندیی توخمەکان و جموجووڵی ئەستێرەکانەوە تا دەگاتە ئاڵوگۆڕی مردن و ژیان و.. لە بەریەك کەوتنی ڕووناکی و تاریکییەوە تا بەرەنگاربوونەوەی یەکتریی گەرمی و ساردی و.. شتانی تری وەك ئەمانە، تاکو بە چاوی خۆت ببینیت کە هەموویان:

بە تەرازوویەکی تەواو سەرنەکەری دەراسا دەکێشرێن و دەستنیشان دەکرێن، هەروەك هەموو شیان بە پێوانەیەکی لەوپەڕی وردیدا پێوانە دەکرێن. بە ڕادەیەك کە

ژیریی مرۆڤ ناتوانێت لە هیچ جێیەکدا ئیسرافێکی راستەقینە، یاخود لە هیچ بەشێکیدا کارێکی هەڕەمەکی و بێ ئامانج ببینێت. بەڵکو "زانستی مرۆڤ" لە هەموو شتێکدا تەواوترین و رێکترین "رێسا" دەبینێت و هەوڵ دەدات پیشانی بینەرانیشی بدات و، لە هەموو بوونەوەرێکیشدا جوانترین و ناوازەترین "هاوسەنگی"ی چاو پێ دەکەوێت و تێدەکۆشێت کە پێش‌چاویشیان بخات!

بەڵێ، ئەو "زانستانە"ی کە مرۆڤ بەدەستی هێناون و پێیان گەیشتووە، جگە لە تەرجەمەیەکی ئەو "رێسا" ناوازەیە و دەربڕینێکی ئەو "هاوسەنگی"یە رەنگینە هیچی‌تر نین!

سەرنج لەو هاوسەنگی‌یە جوانەی نێوان خۆر و دوازدە هەسارە گەڕۆکەکان بدە کە هیچیان لەوانی تر ناچێت، ئایا ئەم هاوسەنگی‌یە، بە وێنەی رووناکیی ئەو خۆرە، نابێت بە بەڵگەیەکی روون لەسەر زاتێك کە خاوەنی ناوی: "العدل القدیر"ە؟

پاشان بیر لەم زەوی‌یە بکەرەوە کە یەکێکە لەو هەسارانە و، کەشتی‌یەکە لەم دەریایەی بۆشایی ئاسماندا مەلە دەکات و، بە ماوەی ساڵێك مەودایەك دەبڕێت کە درێژی‌یەکەی بە بیست و چوار هەزار ساڵ رێ خەمڵێنراوە. دەبینیت لەگەڵ ئەم خێرایی‌یە سەرسوورهێنەرەشدا، هیچ کام لە ماددە رێکخراوەکانی سەرپشتی پەرتەوازە ناکات و فڕێیان ناداتە ناو بۆشایی دەوروبەریەوە! خۆ ئەگەر ئەندازەیەکی کەم لە خێرایی‌یەکەی زیاد یان کەم بکرایەتەوە ئەوا نیشتەجێکانی ناوی فڕێ دەدایە دەرەوە و، گەر بۆ ماوەی یەك خولەك تەنانەت یەك چرکەش هاوسەنگیی خۆی تێك بدایە ئەوا دەشڵەژا و گرفتاری هەڵەنگووتن دەبوو، یان لەوانەیە بەر هەسارەیەکی تر بکەوتایە و قیامەت هەڵبسایە!

پاشان بە تێڕامانەوە بڕوانە بۆ لەدایکبوون و مردوون و ژیان و بەخێوکردنی زیندەوەرانی سەر رووی زەوی کە ژمارەی رەگەز و جۆرەکانیان لە چوارسەد هەزار جۆر تێپەڕ دەبێت. دەبینیت هاوسەنگی‌یەکی رەنگینی میهرەبان و بەسۆزیان لە نێواندا راگیر کراوە. ئەمەش بە وێنەی رووناکی، کە دەبێت بە بەڵگەی خۆر، ئاوا لە پێش‌چاوتدا دەبێت بە بەڵگەیەکی بێ‌گومان لەسەر زاتێك کە خاوەنی ناوی: "الخالق، العادل، الرحیم"ە.

پاشان بیر لە ئەندامەکانی هەر کام لە زیندەوەرە لەژمارەنەهاتووەکان بکەرەوە و، لە کۆئەندام و هەستەکانیان ورد بەرەوە.. دەبینیت هێندە پێکەوە گونجانی تەواوەتی و

ڕێکوپێکیی کامڵ و هاوسەنگیی وردیان تێدایە، کـە بـە جۆرێکـی ڕوون و ئاشـکرا بـۆت دەبن بە بەڵگە لەسەر ئەو کردگارەی کە خاوەنی ناوی: "العدل الحکیم"ە.

دوای ئەوە، سەرنج لە خانەکانی لەشی هەر زیندەوەرێك و، مولوولـەکانی خوێـن و، خڕۆکە مەلەوانەکانی نـاو ئـەو خوێنـە و، گەردیلـەکانی ئـەو خڕۆکانـە، بـدە.. دەبینیـت هێنـدە هاوسـەنگیی دەراسـا و ناوازەیـان تێدایـە کـە بـە چەشـنێکی بێ‌گومـان بـۆت دەچەسـپێنن: ئـەم هاوسـەنگی‌یە ڕەنگیـن و، بەڕێوەبردنـە گشـتی و، پەروەردەکردنـە حەکیمـە، هـەرگیز پـەیدا نـەدەبوون ئەگـەر تەرازوویـەکی سـەرنەکەر و، یاسـایەکی جێبەجێ‌کراو و، ڕێسـایەکی توندوتیـژی بەدیهێنـەری تـاك و تـەنیای "دادگـەر و دانـا" نەبوایە کە کلیل و جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە و، هیـچ شـتێکی لـێ پەنـهان نی‌یـە و، وەك ئاسانیی بەڕێوەبردنی یەك دانە شت هەموو شتێك بە ئاسانی بەڕێوە دەبات.

جا ئەو کەسەی باوەڕی نی‌یە بـەوەی کە کردەوەکـانی جیننـی و ئـادەمیزاد لـە ڕۆژی حەشری گەورەدا بە تـەرازووی دادی خـوای گـەورە دەکێشـرێن و، ئـەم کـارە بـە دوور دەزانێـت و ئیمـانی پێـی نی‌یـە، گـەر بتوانێـت بیر لـەو جـۆرە کێشـانە و لەتەرازوودانـە گەورانـە بکاتـەوە کـە هـەر لـەم دنیایـەدا و لـە پێش‌چـاوی خـۆی‌دا ڕوو دەدەن و بـە چـاو دەبینرێن، ئەوا ئینکاریی ئەوەی حەشریشی نەدەکرد و بە دووری نـەدەزانی و، ئیمـانی پێ دەهێنا.

دەسا ئەی مرۆڤی هەڵەخەرجی ستەمکار و چەپەڵ!

باش بزانە کە "دەست پێوەگرتن" و "خاوێنی" و "دادگەری" چەند یاسـایەکی خوایـی ئەوتۆن کە لە سەرانسەری گەردووندا دەست بەکارن و، چەند دەستوورێکی وەهایشـن کە سەرجەمی بوونەوەران لە دەوری کۆبوونەتەوە و، جگە لە تۆی بەدبەخت هیچ شتێك نی‌یە ملکەچ نـەبێت بـۆ ئـەو یاسـا و دەستوورانە. خـۆ تۆیـش بـەم جیابوونەوەیـەت لـە بوونـەوەران لـەوەدا کـە بـەپێی ئـەو یاسـا هەمەلایەنگرانـە دەڕۆن، خـۆت گرفتـاری بـێز و نەفرەت و ڕقی ئەو بوونەوەرانە دەکەیت و شایانی ئەو دەرەنجامەشیت..

ئایـا پشـت بـە چـی دەبەسـتیت وا ڕقـی سـەرجەمی بوونـەوەران لـە دژی خـۆت دەورووژێنیـت کاتـێ کـە تـاوانی سـتەم و هەڵەخـەرجی ئـەنجام دەدەیـت و گـوێ بـە هاوسەنگی و پاکوخاوێنی نادەیت؟

بەڵێ، ئەو دانستە گشتی‌یەی کـە بەسـەر گـەردووندا زاڵـە و لـە درەوشـانەوەی نـاوی (العدل)ی خوای گەورەوە سەرچاوەی گرتووە، لە ڕاستی‌دا هاوسـەنگیی هـەموو شـتان بەڕێوەدەبات و، داوای هێنانەدیی (دادپەروەری) لە مرۆڤ دەکات.

ئەو دادگەرییە گشتییەش کە لە گەردووندا دەست بەکارە و، لە درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی: "العدل"ەوە هەڵقوڵاوە، لە ڕاستیدا کاری کێشانە و هاوسەنگیی سەرجەمی شتان بەڕێوە دەبات و، فەرمان بە گرۆی مرۆڤیش دەدات کە: لە نێوان خۆیاندا "دادگەری" دابمەزرێنن!

ناوهێنانی "تەرازوو"ش تا چوار جار لەم ئایەتانەی سوورەتی "الرحمن"دا کە دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ ۞ أَلاَّ تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ۞ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ﴾ (الرحمن:٧-٩). ئاماژەیە بۆ چوار جۆری "تەرازوو" لە چوار پلەدا و، بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگیی لەڕادەبەدەر و نرخ و بەهای هەرە مەزنی "تەرازوو"ە لە گەردووندا.

بەڵێ، هەروەك "ئیسراف" لە هیچ شتێکدا نییە، بە هەمان جۆر "ستەمی ڕاستەقینە"ش لە هیچ شتێکدا و "تەرازووبازی"ش هەرگیز لە تەرازووی گەردووندا نییە. بەڵکو ئەو خاوێن کردنەوە و پاکژییەی کە لە درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "القدوس"ەوە دەرچووە، هەمیشە بوونەوەران لە جوانترین شێوە و ناوازەترین ئارایشتدا پێشچاو دەخات و، هیچ چڵك و چەپەڵییەك لە هیچ بوونەوەرێکدا نابینیت، تەنانەت لە هیچ شتێکدا ناشیرینییەکی ڕاستەقینە نابینیت، گەر دەستی چەپەڵی مرۆڤی بەر نەکەوێت!

لەمەوە بزانە کە حەقیقەت و دەستوورە قورئانییەکانی وەك: (دادگەری و، دەست پێوەگرتن و، خاوێنی) چەندە بە ناخی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕۆچوون و، دارای دامەزراوی و ڕەسەنایەتین. ئنجا لەمەشەوە لە مەودای هێزی پەیوەندیی ئەحکامی قورئان بە گەردوونەوە تێبگە و، بزانە کە چۆن هەریەکەیان چەندەها ڕەگی قووڵی بە ناخی گەردووندا بڵاوکردووەتەوە و، بە چەند دەستاوێزێکی قایمی نەپچڕاو دەورانەدەوری گەردوونیان داوە! ئنجا لەمەشەوە تێبگە کە: هەروەك تێکدانی ڕێسای گەردوون و شێواندنی ڕوخسار و شێوەی کارێکی مەحاڵە، بە هەمان جۆر تێکدانی ئەم ڕاستییانەش هێندە مەحاڵ و دژوارە!

پاشان هەروەك ئەم سێ حەقیقەت و نوورە مەزنانەی (دادگەری و، دەست پێوەگرتن و، خاوێنی) کە دەورانەدەوری گەردوونیان داوە، داخوازی حەشر و دوارۆژ دەبن.. بە هەمان جۆر سەدان حەقیقەتی هەمەلایەنگر و نووری گەورە گەورەی تریشیان لەگەڵدایە، وەك: (میهرەبانی و، بایەخدان و، چاودێری) کە هەرهەموویان داخوازی حەشر و ژیانی ئەودنیان.

چونکە ئایا دەگونجێ ئەم چەشنە حەقیقەتانەی کە بەسەر بوونەوەراندا زاڵن و دەوراندەوری گەردوونیان داوە، بەوە سەرنخوون بنەوە و هەڵبگەڕێنەوە کە: حەشر و قیامەت بەرپا نەکرێن؟ واتە "میهرەبانی" ببێت بە دژی خۆی کە ستەمە و، "دانایی" و "دەست پێوەگرتن"یش ببێت بە دژەکەی کە بێمەبەستی و هەڵە خەرجی‌یە و، پاکو خاوێنیش ببێت بە دژی خۆی کە هەڕەمەکی و پیس و چەپەڵی‌یە؟! دیارە نەخێر، هەرگیز کاری وا لە خوای گەورە ناوەشێتەوە.

ئەو "میهرەبانی‌یە خوایی" و "دانستە پەروەردگاری"یەی کە بە میهرەبانی‌یەکی فراوان مافی ژیانی تەنانەت مێشوولەیەکی لاوازیش دەپارێزن، هەرگیزاو هەرگیز بە: نەهێنانی حەشر و بەرپانەکردنی قیامەت، مافی لەژمارەبەدەری هەموو خاوەن هەست و بوونەوەرانی بێ سنوور، پێشێل ناکەن و پشتگوێیان ناخەن!

ئایا (گەورەیی پەروەردگارێتی)ی خواوەند کە وردەکاری و هەستیاری‌یەکی تەواو ورد لە میهر و شەفەقەت و دادگەری و دانایی پیشان دەدات و.. ئەو (خوایەتی)یەش کە توانا و دەستەڵاتی بەسەر هەموو بوونەوەراندا زاڵە و، دەیەوێت لە ڕێی: ئارایشتدانی بوونەوەرانەوە بە سنعەتە ناوازەکانی و ئەو نیعمەتانەی بەسەریاندا پەخشی کردوون، کەماڵاتی خۆی دەربخات و خۆی بناسێنێت و لە لای بوونەوەرانی خۆشەویستی بکات..
ئایا دەگونجێ ئەم "پەروەردگارێتی" و "خوایەتی"یە بوار بە نەهاتنەدیی حەشر و بەرپانەبوونی قیامەت بدەن، کە ئەمەش کارێکی وەهایە دەبێتە هۆی داشکانی نرخی سەرجەم کەماڵات و بەهای گشت بەدیهاتووانی؟

نەخێر، خوای گەورە هێندە گەورە و بڵندە کە کاری وای لێ ناوەشێتەوە، چونکە - وەك ئاشکرایە - جوانیی ئاوا ڕەها بەم چەشنە ناشیرینی‌یە ڕەهایە ڕازی نابێت!

کەواتە ئەو کەسەی دەیەوێت ئینکاری دوارۆژ بکات، دەبێ لە پێشدا ئینکاریی گەردوون و سەرجەم حەقیقەتەکانی ناوی بکات، دەنا هەموو بوونەوەران و گشت حەقیقەتە ڕەگداکوتاوەکانی ناوی، بە هەزاران زمان، بەدرۆی دەخەنەوە و، دەیچەسپێنن کە ئەو کەسە خۆی درۆزنی سەرسەخت و لەخۆ بایی و خۆ بە گەورە زانە!

"پەیامی حەشر" بە چەندەها بەڵگەی گومانبڕ چەسپاندی کە: بوونی ئەودنیا بە ئەندازەی بوونی ئەم دنیایە بێ گومان و چەسپاوە.

* * *

# سەرنجی سێهەم

## ئاماژە بۆ نووری سێهەمی شەش نوورەکانی ئیسمی ئەعزەم دەکات، کە بریتی‌یە لە ناوی:

## (الْحَكَم)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿أُدْعُ إِلى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ﴾ (النحل:١٢٥)

لە بەندیخانەی ئەسکی شەهر و لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا، سەرنجێکی وردی ئەم ئایەتە پیرۆزە و نوورێکی درەوشانەوەکانی ناوی جوانی "الْحَكَم"ی خوای گەورەم لێ دەرکەوت، کە ئیسمی ئەعزەمە، یاخود یەکێکە لە نوورەکانی. منیش، بە پەلە، ئەم سەرنجەم نووسی، کە پێنج خاڵی لەخۆ گرتووە. لە دواییشدا هیچ دەستکاری‌یەکی ڕەشنووسەکەیم نەکرد و وەك خۆی هێشتمەوە.

**خاڵی یەکەم:**

وەك لە وتەی "دەهەم"دا باسمان کرد:

درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحکم"ی خواوەند ئەم گەردوونەی وەك کتێبێکی هێندە گەورە لێ کردووە کە: سەدان کتێب لە هەموو لاپەڕەیەکی‌دا نووسراوە و.. سەدان لاپەڕەش لە هەموو دێڕێکی‌دا تۆمار کراوە و.. سەدان دێڕیش لە هەموو وشەیەکی‌دا حەشار دراوە و.. سەدان وشەش لە ژێر هەموو پیتێکی‌دا دەخوێنرێنەوە و.. هەموو یەکێك لە نوختەکانیشی پوختە پێرستێکی بچووکی تێدا هەڵگیراوە کە ناوەرۆکی سەرجەمی کتێبەکەی بە پوختی تێدا دانراوە!!

جا ئەم کتێبە، لە ڕێی لاپەڕە و دێڕەکانی، تەنانەت نوختەکانیشیەوە و بە سەدان ڕوو، دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکرا و درەخشان لەسەر نووسەر و نەخشەکێشەکەی. تەنانەت هەر تەنها بینینی ئەم کتێبەی گەردوون بەڵگەیەکی سەروزیادە لەسەر بوونی نووسەرەکەی. بەڵکو ئەو کتێبە چەندە دەبێت بە بەڵگە لەسەر خۆی، گەلێ زیاتر لەوە

دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەو نووسەرە و، بە "بوون" و "یەکتایی"یەکەی ئاشنامان دەکات و پێمان دەناسێنێت..

نابینیت یەك "پیت" لە پیتەکانی نووسین تەنها بە ئەندازەی پیتێك خۆی دەناسێنێت و دەبێت بە بەڵگە لەسەر خۆی، کەچی بە ئەندازەی دێڕێك وەسفەکانی نووسەرەکەی دەردەخات؟!

بەڵێ، ڕووی زەوی کە "یەك لاپەڕە"ی ئەم کتێبە مەزنەیە؛ بە ئەندازەی ژمارەی جۆر و ڕەگەزی ڕووەك و زیندەوەران، کتێبی لەخۆ گرتووە و ئەم کتێبانەش لە وەرزی بەهار و لە پێش چاوی خۆماندا بەوپەڕی وردی و تەواوەتی و بێ هەڵە و بە شێوەیەکی تێهەڵکێش و لە تەنیشتی یەکترەوە و لە یەك کاتدا، دەنووسرێن..

باخ و بێستانیش "دێڕ"ێکی ئەم لاپەڕەیەن؛ ئەوەتا چەندین پارچە شیعری تێدا دەبینین کە بە ئەندازەی ژمارەی گوڵ و درەخت و ڕووەکەکان و، بە نووسینێکی تێهەڵکێش و لە تەنیشتی یەکترەوە و، بێ ڕوودانی هیچ هەڵەیەك، لەبەر چاوی خۆماندا دەنووسرێن..

درەختە گەشەکردووە خاوەن گەڵا جوانەکانیش، کە دەمیان بە گوڵ پشکوتووە و بەرەکانی وەختە سەر دەربهێنن، تەنها یەك "وشە"ی ناو ئەو دێڕەن! ئەوەتا ئەم وشەیە بڕگەیەکی تەواوی پڕ واتا دەنوێنێت، کە بە ڕەوانی سوپاس و ستایشی خۆی دەردەبڕێت و، بە ئەندازەی گەڵا ڕێکوپێکەکانی و بە ژمارەی گوڵە ئارایشت دراوەکانی و بە قەدەر بەروبوومە هاوسەنگ و بە تەرازوو کێشراوەکانی، دەبێت بە بەڵگە لەسەر خواوەندی "حەکەم"ی خاوەن جوانی! تەنانەت ئەو درەختەی کە گوڵانی دەمیان پشکوتووە وەك قەسیدەیەکی مەدح و ستایش وایە بە باڵای نیعمەتەکانی بەدیهێنەری وێنەکێشی مەزندا!

دەڵێی خواوەندی شکۆمەندی "حەکیم" دەیەوێت بەندەکانی بە هەزاران چاو سەیری ئاسەوارە ناوازە و بەدیهاتووە سەرسووڕهێنەکانی ئەو بکەن کە لە پیشانگای زەویدا پێش چاوی خستوون! وەك بڵێی ئەو دیارییە بەنرخ و، مەدالیا بەقیمەت و، نیشانە ناسکانەی کە خواوەند بەو درەختەی بەخشیون، هێندە شکڵ و شێوەی جوان و ڕازاوە و، ڕوخساری بە تەرازوو کێشراوی ڕێکوپێك و، خۆدەرخستنی دانایانە و ڕەوانیان بەو درەختە دابێت کە ئامادەی پێش چاو خستنی پادشای مەزنی بکات لە ڕۆژی جەژنە شادمانەکەی و لە نمایشی گشتیی بوونەوەراندا، کە وەرزی ڕەنگینی بەهارە!

ئیتر چه‌نده‌ها زمان و ڕووی زۆر و زه‌به‌نده و تێهه‌ڵکێش، له لایه‌ن هه‌موو گوڵ و به‌رێکی ئه‌م دره‌خته‌وه، ده‌که‌ونه شایه‌تیدان له‌سه‌ر "بوون"ی به‌دیهێنه‌ری وێنه‌کێش و، تێکڕا ده‌بن به به‌ڵگه له‌سه‌ر هه‌موو ناوه جوانه‌کانی.

بۆ نموونه:

هه‌رچی شت له گوڵ و به‌ری دره‌ختدا هه‌ن، به ته‌رازوویه‌کی ورد کێشانه کراون و.. ئه‌و ته‌رازووه‌ش به ڕێکوپێکی‌یه‌کی ناوازه ده‌ستنیشان کراوه و.. ئه‌و ڕێکوپێکی‌یه‌ش به‌شانی ڕێکخستن و هاوسه‌نگی‌یه‌کی هه‌میشه تازه‌وه بوو، ده‌ڕوات و.. ئه‌و ڕێکخستن و هاوسه‌نگی‌یه‌ش له ناوه‌ندی ئارایشتێکی نایاب و سنعه‌تێکی ورددان و.. ئه‌و ئارایشت و وردی‌یه‌ش به چه‌ند بۆن و به‌رامه‌یه‌کی پڕ له واتا و به چه‌ند چێژێکی سه‌رانسه‌ر دانست ده‌رده‌که‌ون. به‌م جۆره، هه‌موو تاقه گوڵێك به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی گوڵه‌کانی دره‌خته‌که‌ی، ئاماژه بۆ خواوه‌ندی "الحکم"ی شکۆمه‌ند ده‌کات و ده‌بێت به به‌ڵگه له‌سه‌ری.

ئنجا دره‌خت که وه‌کو یه‌ك دانه وشه وایه و.. به‌روبوومه‌کانیشی که له حوکمی پیته‌کانی ئه‌و وشه‌یه‌دان و.. تۆوه‌کانی ئه‌و به‌ره‌ش که وه‌ك نوخته‌کانی ئه‌و پیتانه وان و، پێڕست و نه‌خشه و به‌رنامه‌ی کاره‌کانی ئه‌و دره‌خته‌یان به ته‌واوه‌تی له‌خۆ گرتووه.. گه‌ر ئه‌م دره‌خته وه‌ك نموونه‌یه‌ك بهێنین و کتێبی گه‌وره‌ی گه‌ردوونی له‌سه‌ر قیاس بکه‌ین، ده‌بینین که به‌هۆی لێ‌دره‌وشانه‌وه‌ی نووره‌کانی ناوی "الحَکیم، الحَکَم"ه‌وه هه‌موو یه‌کێك له دێڕ و لاپه‌ڕه‌کانی بووه به موعجیزه‌یه‌کی دره‌خشان. ته‌نانه‌ت هه‌موو لاپه‌ڕه و دێڕ و وشه و پیت و نوخته‌یه‌کی، موعجیزه‌یه‌کی هێنده گه‌وره‌ن که ئه‌گه‌ر سه‌رانسه‌ری هۆکاره ماددی‌یه‌کان کۆ ببنه‌وه و بیانه‌وێت شتێکی وه‌ك ئه‌و نوخته‌یه (واته ئه‌و تۆوه) بهێنن و دروستی بکه‌ن، ئه‌وا تێکڕا ده‌سته‌وسانی و نه‌توانایی ڕه‌ها و ته‌واوه‌تیی خۆیان له لاسایی کردنه‌وه و هێنانی شتێکی وه‌ك ئه‌ودا، ده‌رده‌بڕن!

به‌ڵێ، هه‌موو یه‌کێك له ئایه‌ته گه‌ردوونی‌یه‌کانی قورئانی گه‌وره‌ی بینراوی گه‌ردوون، به شێوه‌یه‌ك پێش‌چاو خراون که به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی نوخته و پیته‌کانی، موعجیزه‌ی ڕوون و ئاشکرایان تێدایه! که‌واته بێ هیچ گومانێك "ڕێکه‌وت"ی هه‌ڕه‌مه‌کی و "هێز"ی کتوکوێر و "سروشت"ی که‌ڕ و گه‌لحۆ، که هیچ ئامانج و ته‌رازوویه‌کیان له لا نی‌یه، ناتوانن له هیچ لایه‌که‌وه ده‌ست له‌م ته‌رازووه ورده تایبه‌تی‌یه

وەربدەن و، خۆیـان لـەم ڕێکوپێکی‌یـە ورد و ناوازەیـەدا هـەڵبقورتێنن کـە دانسـت و بەسیرەتیان پێوە دیارە! خۆ ئەگـەر بـە فـەرزی مـەحاڵیش گریمانی دەسـت تێوەردانیـان لـە ئارادا بوایە، ئەوا ئاسەوارەکەی دەردەکەوت، کەچی لە هیچ شوێنێکدا هیچ جیاوازی و ناتەواوی‌یەك بـەرچاو ناکـەوێت، کـە ئاسـەوار و ئـەنجامی حـەتمیی ئـەو دەسـت تێوەردانـە گریمان کراوەیە!

**خاڵی دووهەم:**

کە بریتی‌یە لە دوو مەسەلە:

◆ مەسەلەی یەکەم:

(ئەو جوانی‌یـەی کـە لەوپـەڕی کەماڵدایـە، دەیـەوێت جوانی‌یەکـەی خـۆی ببینێـت و پیشانی غەیری خۆیشی بدات. هەروەها ئەو کەماڵەش کە لەوپەڕی جوانیدایە، دەیـەوێت کەماڵی خۆی ببینێت و پیشانی کەسانی تریشی بدات).

ئەمـەش یەکێکـە لـە دەستوورە بنەڕەتی و جێگیربووەکـان. وەك لـە وتـەی "دەهـەم"دا ڕوون کراوەتەوە.

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە گشتی‌یە: بەدیهێنـەری وێنەکێشـی ئـەم بەدیهاتووانـە، کـە خـوای گـەورەیە و ئـەم کتێبـە گەورەیـەی گـەردوونی داهێنـاوە، دەیـەوێت بـە زمـانی بچووکترین جوزئیی بەدیهاتووانیەوە تا گەورەترین کوللی‌یان، جوانیی کەماڵی خۆی بـە خـاوەن هەستان بناسێنێت و لـە لایـان خۆشەویستی بکـات و.. بـەم کتێبـی گـەردوونـە ڕەنگینە و بە هەموو لاپەڕە و دێڕ و وشە و پیتێکی تەنانەت بە هەموو نوختەیەکیشی: زاتـی موقەددەسی خۆی بناسێنێت و، کەماڵی بەرزی خۆی لە خاوەن هەستان تێبگەیـەنێت و، جوانیی ناوازەی خۆی بۆ ئەوان دەربخات.

دەسا ئەی مرۆڤـی بێئاگـا! ئـەم خواوەنـدە جـوان و شـکۆمەندەی کـە خـاوەنی نـاوی "الحکیم، الحکَم، الحاکم"ە و، لـە ڕێـی هـەمـوو یـەکێك لـە بەدیهـاتووانی و بـەم شـێوە ڕەنگین و هۆکارە زۆر و ناوازانە خۆیت پێ دەناسێنێت و خۆشەویستی دەکات لـە لات، ئەگەر لـە بەرامبـەر ئـەم خۆناسـاندنەوە تۆیـش بـە "ئیمـان" نەیناسـیت و، لـە بەرامبـەر خۆشەویست کردنـی خۆیـەوە لـە لات تۆیـش بـە "پەرستن" خۆتـی لـەلا خۆشەویسـت نەکەیت، چەندە مرۆڤێکی نەزان دەبیت و، چ زیانێکی گەورە لە خۆت دەدەیت! کەواتە وریابە و لەو بێئاگایی‌یەت بێدار بەرەوە!

◆ مەسەلەی دووهەم:

ئەم گەردوونە فراوان و گەورەیەی کە بەدیهێنەری بەتوانای دانا بە توانست و دانستی خۆی دایهێناوە، هەرگیز جێگای هاوبەش(شیرك)ی تێدا نابێتەوە. چونکە ئەوپەڕی ڕێسا لە هەموو شتێکی گەردووندا هەیە، کە ئەمەش - وەك ئاشکرایە - بە هیچ جۆرێك بوار بە "هاوبەش" نادات! خۆ ئەگەر چەند دەستێکی جیاجیا لە بەدیهێنانی هەر شتێکدا بەشدار ببوونایە، ئەوا جیاوازی و ناڕێکی لەو شتەدا دەردەکەوت، بە وێنەی ئالۆزبوونی کاروباری وڵات کە: ئەگەر دوو پادشا لە وڵاتێکدا و دوو بەرپرس لە شارێکدا و دوو بەڕێوەبەر لە شارۆچکەیەکدا هەبن! یان وەك ئاساییترین کارمەندی هەر فەرمانگەیەك کە بوار بە دەست تێوەردانی هیچ کەسێك نادات لەو کاروبارانەی کە تایبەتن بە فەرمانبەری و ئەرکی سەرشانیەوە..

هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە: "سەربەخۆیی" و "تەنیایی" دوو تایبەتکاریی بنەڕەتیی "فەرمانڕەوایەتی"ن.

جا هەروەك "فەرمانڕەوایەتی" داخوازی: "تەنیایی"یە، بە هەمان جۆر "ڕێکوپێکی"ش داخوازی: "یەکبوون"ە.

لە کاتێکدا کە سێبەرێکی بێ تین و کز و لاواز و لەناوچووی "فەرمانڕەوایەتی" لای ئەم مرۆڤە هەژار و دەستەوسانە، ئاوا بە هەموو هێزێکیەوە، ڕێ لە دەست تێوەردانی غەیری خۆی بگرێت، دەبێ "فەرمانڕەوایەتیی ڕاستەقینە"ی خاوەندی خاوەن توانستی ڕەها چۆن بێت، کە لە پلەی پەروەردگارێتیی ڕەهادایە؟ ئایا بەوپەڕی هێزەوە ڕووبەڕووی "هاوبەش" ڕاناوەستێت و بە توندی دەری ناکات و دووری ناخاتەوە!

خۆ ئەگەر بە ئەندازەی تەنها گەردیلەیەکیش گریمانی خۆهەڵقورتاندنی هاوبەش بوایە، ئەوا شتانی ناو گەردوون تێکەڵی یەکتر دەبوون و ڕێکوپێکی و پێکەوە گونجانی نێوانیشیان نەدەما، هەروەك ڕێسا و تەرازووکارییش تێك دەچوون و لاسەنگ دەبوون. لە کاتێك کە دەزانین ئەم گەردوونە هێندە بە جوانی و ناوازەیی بەدی هێنراوە کە بۆ بەدیهێنانی تەنها یەك "تۆو" پێویست بە توانای دروستکردنی درەختێکی سەربەخۆ دەکات، هەروەك بۆ دروستکردنی تەنها یەك درەختیش پێویست بە توانستێکی ئەوتۆ دەبێت کە سەرجەمی گەردوون بەدیبهێنێت!

جا ئەگەر گریمانی بوونی هاوبەش لە بەدیهێنانی سەرجەمی گەردووندا بوایە، ئەوا دەبوو بەشی دەست تێوەردانی ئەو هاوبەشە - بۆ نموونە - لە بەدیهێنانی بچووکترین

"تۆو"دا دەربکەوتایە (چونکە تۆو نموونەیەکی پوختی بوونەوەرانە). خۆ ئەو کاتەش دەبوو دوو پەروەردگاریتیی هێندە گەورە کە لە گەردوونی مەزندا جێیان نابێتەوە، لە تۆوێکی بچووکدا تەنانەت لە گەردیلەیەکدا جێیان ببوایەتەوە و تیایدا جێگیر ببوونایە!! دیارە ئەمەش بێنرخترینی مەحاڵ و ئەندێشە بەتاڵ و نارەواکانە و، لە هەمووشیان زیاتر لە مەنتیق و ژیرییەوە دوورترە!

دەسا تۆش لەمەوە بزانە کە: "کوفر" و "شیرك" ئەفسانەیەکی چەندە بێنرخن و، چ وشەیەکی ساختە و چ درۆ و دەلەسەیەکی دەست هەڵبەستی نامۆ و نەشیاون. چونکە داخوازی ئەوە دەبن کە ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەی جڵەوی هەموو ئاسمانەکان و زەویی لە دەستدایە و نایەڵێت بترازێن و، بە تەرازووی دادگەری و ڕێسای دانایی خۆی بەڕێوەیان دەبات.. داخوازی ئەوە دەبن کە ئەم خاوەن توانستە، لە بەدیهێنانی تەنانەت تۆوێکی بچووکیشدا، دەستەوسان و بێ دەستەڵات بێت!

پاشان بیشزانە کە "تەوحید" حەق و حەقیقەتێکی چەندە ڕاستە و، ڕاستی و دروستییەکی چەندە دادگەرانەیە! ئەمانە بزانە و بڵێ: "الحمد لله على الايمان".

**خاڵی سێهەم:**

کردگاری بەتوانا، بە ناوی "الحَكَم و الحكيم"ی خۆی، هەزاران جیهانی ڕێکوپێك و ناوازەی لە ناوەندی ئەم جیهانەدا حەشار داوە و.. ئەم مرۆڤەش، کە لە هەموان زیاتر دانستە ئامانجەکانی بەدیهێنانی گەردوون لە خۆدا دەنوێنێت و دەریاندەخات، خاوەند پلە و پایەی هەرە بەرزی داوەتێ و کردوویەتی بە مەڵبەند و تەوەرەی سەرجەمی ئەو جیهانانە، چونکە گشت ئەو دانست و بەرژەوەندییانەی کە لە جیهانەکاندان، هەموویان ڕوویان لە مرۆڤە.

هەروەها ئەو بەدیهێنەرە بەتوانایە "ڕۆزی"شی وەك مەڵبەند و چەقی بازنەی ژیانی مرۆڤ لێ کردووە. ئەوەتا زۆربەی دانست و ئامانج و بەرژەوەندی و سوودەکانی ناو جیهانی ئادەمیزاد ڕوویان لە ڕۆزییە و بەو ڕوون دەبنەوە. لەبەر ئەوە، درەوشانەوەکانی ناوی "الحكيم"ی خواوەند، بە جوانترین و درەخشانترین شێوەی، لە ناوەندی هەست و نەستەکانی مرۆڤ و لە دووتوێی تام و چێژەکانی ڕۆزیدا دەردەکەون. تەنانەت هەموو یەکێك لەو سەدان زانستانەی کە مرۆڤ بەهۆی هەستەکانیەوە دۆزیونیەتەوە و بەدەستی هێناون، یەکێك لە درەوشانەوەکانی ناوی جوانی "الحَكَم" بەسەر جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەرانەوە، بە خاوەن هەستان دەناسێنێت.

بۆ نموونە:

ئەگەر پرسیار لە زانستی "پزیشكی" بكرێت كە:

ئایا ئەم بوونەوەرانە چین؟

لە وەڵامدا دەڵێت: دەرمانخانەیەكی تابلێی گەورەیە و زۆر بە وردەكاری گشت دەرمانەكانی تێدا ئامادە و پاشەكەوت كراوە.

ئەگەر پرسیار لە زانستی "كیمیا"ش بكرێت كە: ئەم گۆی زەوی‌یە چی‌یە؟

لە وەڵامدا دەڵێت: تاقیگەیەكی كامڵ و ڕێكوپێك و ناوازەیە.

بەڵام زانستی "ماشینسازی"(علم المكائن) لە وەڵامدا دەڵێت: گۆی زەوی كارگەیەكی هێندە ڕێكوپێك و تەواوە كە هیچ كەموكوڕی‌یەكی تێدا نابینیت.

زانستی "كشتوكاڵ"یش لە وەڵامدا دەڵێت: باخچەیەكی دڵگیر و كێڵگەیەكی بە پیتی بەرهەم بەخشی ئەوتۆیە كە هەموو جۆرە داهاتەكان و هەریەكەیان لە كاتی خۆیدا، سەوز دەكات.

زانستی "بازرگانی"ش دەڵێت: زەوی پیشانگایەكی گەورەی بازرگانی و، بازاڕێكی لەوپەڕی ڕێسا و جوانی و، خانەیەكی بازرگانیی وەهایە كە چاكترین و بەنرخترینی كەرەسە و كاڵا دروست كراوەكانی تێدا دانراوە.

زانستی "ژیانسازی"(علم الإعاشـــة)ش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەم گۆی زەوی‌یە گەنجینەیەكی مەزنی ئەوتۆیە كە هەموو بەش و جۆرەكانی ڕۆزیی تێدا عەمبار كراوە.

زانستی "خۆراكسازی"ش لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت:

زەوی كوڵاندنگە(مطبخ)ێكی پەروەردگاری و مەنجەڵێكی ڕەحمانی‌یە، كە سەدان هەزار خۆراكی بەتام و لەزەتی لە تەنیشتی یەكتردا و بە ڕێسایەكی لەوپەڕی وردی و كامڵی تێدا دەكوڵێنرێت.

خۆ ئەگەر لە بارەی زەوی‌یەوە پرسیار لە زانستی "سەربازی" بكرێت، لە وەڵامدا دەڵێت:

"زەوی" سەربازگەیەكی بەسام و شكۆی ئەوتۆیە كە لە هەموو بەهارێكدا هێندە سەربازی چەكداری نوێی بۆ ڕەوانە دەكرێت كە ژمارەیان دەگاتە زیاتر لە چوارسەد هەزار نەتەوەی جیاجیای ڕووەك و گیانداران و، لە هەموو شوێنێكی ڕووی زەوی‌دا خێوەتیان بۆ هەڵدەدرێت. خۆ هەرچەندەش ڕۆزی و پۆشاك و چەك و تەعلیمات و پشوودانی هەریەك لەو نەتەوانە لەوانی تر جیایە، كەچی بە چاكەی میهرەبانیی خوای

گەورە و بە فەرمانێکی خۆی کە لە گەنجینە فراوانەکەیەوە دەرچووە، بە ڕێکوپێکی‌یەکی جوان و ڕەنگین، کاروبـاری هـەموویان بـەڕێوە دەچێـت و پێداویستی‌یەکانیشیان بە بێ لـێ‌تێکچوون و لـەبیرچوونی هیچ کامێکیان، ئامادە دەکرێن.

ئەگەر پرسیار لە زانستی "کارەبا" بکرێت و، بوترێـت: ئـەم جیهانـە چی‌یـە؟ هەڵبەت دەڵێت:

بنمیچی ئەم کۆشکە ناوازەیەی گەردوون بە چەندەها گڵۆپی درەخشانی بێ‌سنوور و تەواو ڕەنگین و ڕێکوپێـك ئارایشـت دراوە. تەنانـەت "ڕێسـا"ی نـاوازە و "ڕێکوپێکیی" جوان و ڕەنگینی گەردوون ڕێگا نـادەن بـەو چرا ئاسمانی‌یە هەمیشە داگیرساوانەی کە هەزار جـار لـە زەوی گـەورەترن و "خـۆر" لـە پێشـەکیی هەموویانەوەیە، بتەقێنـەوە، یـان هاوسەنگی‌یان کەم بکات، یاخود ئاگر لە نێوانیاندا بکەوێتەوە..

ئایا ئەم چرا زۆر و زەبەندانەی کە داگیرسانی بەردەوامیان کۆتـایی پـێ نایـەت، لـە چ سەرچاوەیەکەوە ڕووناکی و وزەی بەردەوامیان بۆ دابین دەکرێـت؟ بۆچی هاوسـەنگیی سووتانی بەردەوامیان لاسەنگ نابێت؟ لە کـاتێکدا کە هـەر چرایـەکی زەیتیـی بچـووك، گەر بە هەمیشە و بەردەوامی بایەخی پێ نەدرێت، کز دەبێت و دەکوژێتەوە!

دەسا پاکوخاوێنی بۆ ئـەو خواوەنـدە بـەتوانا و دانـا و شـکۆمەندەی کـە بـە بێ ڕۆن و سووتەمەنی[1] و بێ هیچ کوژانەوەیەك، ئەم خۆرە زەبەلاحەی داگیرسـاندووە، کـە بـەپێی زانستی گەردووونناسی: یەك ملیۆن جار لە زەوی گەورەترە و، یەك ملیۆن ساڵیش بەسەر تەمەنی‌دا تێپەڕیوە؟!

بیر لـەمە بکـەرەوە و بـە ئەندازەی ژمـارەی ئـەو چرکانـەی کـە بەسـەر تەمـەنی خۆردا تێپەڕیوە، تەسبیحاتی ناوی پەروەردگاری مەزنت بکە و بڵێ: "مـا شـاء الله، تبـارك الله، لا إلـه إلا الله"..

---

(١) ئەم خۆرەی کە سۆپا و چرای کۆشکی گەردوونە، گەر لێك بدرێتـەوە کـە ڕۆژانـە پێویسـتی بـە چـەندە زەیت و سووتەمەنی دەبێت تاکو ئەو ڕووناکی‌یە پەخش بکاتـەوە، ئـەوا بـەپێی لێکدانـەوەی گەردوونناسـەکان پێویستی بە هێندە سووتەمەنی دەبێت کە قەبارەکەی بە ئەندازەی یەك ملیۆن ا . بارستایی گۆی زەوی بێت و بە قەدەر هەزاران ئەوەندەی قەبارەی دەریاکانیش زەیتی بۆ ئەم مەبەستە پێویسـت دەبێت!! دەسـا ەرموو بیر لـە گـەورەیی ئـەو بەدیهێنەرە بەتوانـا و شـکۆمەندە بکەرەوە کە بەبێ هیچ زەیـت و سووتەمەنی‌یەك ر بـە هەمیشـە و بەردەوامی ئەو سۆپا و چرا درەخشانە دادەگیرسێنێت و، بیر لە فراوانیی دانسـتی ڕەهـای توانستی بکـەرەوە و، بڵێ: بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی خۆر: سبحان الله.. ما شاء الله.. تبارك الله. (دانەر)

بێ گومان ڕێسایەکی لە ڕادەبەدەر ناوازە و دەراسا و کارامە هەیە کە بەسەر ئەم چرا ئاسمانی‌یە درەوشاوانەدا زاڵە و جڵەوی ئەوانی لە دەستدایە. چاودێری کردنیشیان هێندە بە وردی ئەنجام دەدرێت کە تەنانەت سەرچاوەی "گەرمی" و مەنجەڵی هەڵمی ئەو بارستایی‌یە ئاگرینانە، کە لەوپەڕی گەورەیی و زۆریدان، دۆزەخێکە هەرگیز گەرمی‌یەکەی تەواو نابێت و، بە تاریکی و بێ هیچ ڕووناکی‌یەك ئەو گەرمی‌یە بۆ هەموویان دەنێرێت. وەك بڵێی مەکینە و سەرچاوەی ڕووناکیی ئەو چرا ڕووناك و گڵۆپە ڕووناکی بەخشانەی کە لە ژمارە نایەن، بەهەشتێکی هەمیشەیی بێت نوور و ڕووناکی‌یان بۆ بنێرێت و، بەم چەشنە، داگیرسانی ڕێکوپێکی ئەوان بە لێ‌درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحَکَم والحکیم"ی خواوەند، بەردەوام دابین ببێت.

بەم جۆرە و بە قیاس بۆ سەر ئەم نموونانە، هەموو یەکێك لەو سەدان زانستانە، بەوپەڕی بێ گومانی، شایەتی دەدەن کە:

ئەم گەردوونە بە چەندین دانایی و بەرژەوەندیی جۆراوجۆر و لە ناوەندی ڕێکوپێکیی کامڵ و بێ کەموکووڕی‌دا ڕازێنراوەتەوە و، ئەو ڕێسا ناوازە و دانستە بەرزانەش، کە لەو دانستە خاوەن ئیعجازە گەردوون گیرەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە پێوانەیەکی بچووکتر، لە بچووکترین زیندەوەر و بچووکترین گەردیلەدا حەشار دراوە و دانراوە.

خۆ ئاشکرا و بەڵگەنەویستیشە کە: بەدوای یەکدا هاتنی ئامانج و دانست و سوودەکان، بە ڕێکوپێکی و جوانی، هەرگیز بە بێ: ویست و ئیختیار و نیاز و مەبەست نایەتەدی. چونکە هەروەك ئەم کارە ناوازەیە هەرگیز لە توانای "سروشت" و "هۆکارەکان"دا نی‌یە کە ویست و ئیختیار و نیاز و هەستیان تێدا نی‌یە، بە هەمان جۆر توانای ئەوەشیان نی‌یە دەستی تێ وەربدەن و خۆیانی تێدا هەڵبقورتێنن!

کەواتە ئەو کەسە چەندە نەفام و نەزانە کە کردگاری خاوەن ئیختیار و بەدیهێنەری دانا ناناسێت، یان باوەڕی پێ ناهێنێت، لە کاتێکدا کە ئەم هەموو ڕێسا ناوازە و دانستە بەرز و لەژمارەبەدەرانەی ناو هەموو بوونەوەرانی گەردوون بەڵگەن لەسەری!

بەڵێ، تەنها شتێك لەم دنیایەدا هەبێت کە نامۆ بێت و سەرسووڕمان لە مرۆڤدا بورووژێنێت، بریتی‌یە لە ئینکاری کردنی بوونی خوای گەورە! چونکە هەموو جۆرە ناوازە و لەژمارەبەدەرەکانی "ڕێکوپێکی" و.. شێوە بەرز و بێ‌سنوورەکانی "دانست" کە لەناو هەموو شتێکی گەردووندا هەن، شایەتی ڕاستن لەسەر "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" خواوەند.

دەسا ئەو کوێری و نەزانی‌یە ئەولاتر بچێت کە ئەم پەروەردگارە دانایە نابینێت!

تەنانەت دەتوانم بڵێم: ئەو سۆفستائی‌یانەش کە لەبەر ئینکاری کردنی بوونی گەردوون بە گەوج و نەفام دانراون، گەلێ لە کافران عاقڵترن! چونکە باوەڕهێنان بە بوونی گەردوون و پاشان ئینکاری کردنی بەدیهێنەرەکەی - کە خوای گەورەیە - هەرگیز مومکین نی‌یە و بە هیچ جۆرێك لە ژیری‌دا وەرناگیرێت، ئەو سۆفستائی‌یانەش پەی‌یان بەمە بردبوو، بۆیە لە پێشدا ئینکاریی بوونی گەردوون و ئنجا ئینکاریی بوونی خۆیشیان کرد و، وتیان: "هەرگیز هیچ شتێك مەوجوود نی‌یە". بەمەش ژیریی خۆیان لەکارخست. بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەندێك لە ژیری‌یەوە نزیك بووبوونەوە، ئەوا خۆیان ڕزگار کرد لە چاو "گومڕایی" ئەو نەفامی و گەوجی‌یە لەڕادەبەدەرەی کە ئینکارە سەرسەخت و نەفامەکان دەینوێنن، ئەوانەی کە نەفامیی خۆیان لە ژێر پەردەی "ژیری"دا شاردووەتەوە!

**خاڵی چوارەم:**

هەروەك لە وتەی دەهەمدا ئاماژەی بۆ کراوە:

گەر ئەندازیارێکی وەستا و کارامە و دانا کۆشکێکی مەزنی بنیات نا و، سەدان دانایی و سوود و بەرژەوەندیی لە هەموو یەکێکی بەردەکانی ئەو کۆشکەدا ڕەچاو کرد، ئەوا هەرکەسێك خاوەنی هەست و شعوور بێت هەرگیز ئەوەی بە ئەندێشەدا نایەت کە وەستای ئەو کۆشکە بنمیچێکی بۆ دروست نەکات کە لە دارمان بیپارێزێت. چونکە ئەم چەشنە کارە کۆشکەکە دووچاری نەمان و، دانست و سوودەکانیشی گرفتاری تیاچوون دەکات. خۆ دیارە هیچ خاوەن هەستێك بە کاری وا ڕازی نابێت..

یان ئەگەر خاوەن دانستێکی ڕەها لە کێشی درەمێك "تۆو"، سەدان تەن سوود و دانست و ئامانج دروست بکات و، یەك لە دوای یەك بەدییانبهێنێت و بەڕێوەیان بەرێت، ئەوا هیچ مرۆڤێکی ژیر بە ئەندێشەی‌دا نایەت کە ئەو کەسە کاری هەڕەمەکی و ئیسرافی لێ بووەشێتەوە. کە دوو شتی تەواو دژ و پێچەوانەی دانایی ڕەهای ئەو خاوەن دانستە ڕەهایەن و، بەو پێ‌یە بچێت تەنها سوودێکی جوزئی و ئامانجێکی بێ‌نرخ و بەرێکی کەم بە درەختێکی گەورە و زەبەلاحدا هەڵبواسێت. لە کاتێکدا کە بۆ دروستکردن و وەبەرهێنانی ئەو درەختە خەرجی ومەسرەفێکی زۆر دەکێشێت!

بەڵێ، هەروەك مرۆڤی ژیر و هۆشمەند تەسەووری هیچ کام لەم دوانە ناکات، بە هەمان جۆر ناشگونجێ کەسێك خاوەنی تۆزقاڵێك ژیری بێت تەسەووری ئەوە بکات کە

"کردگاری دانا" بە نەهێنانی دواڕۆژ و بەرپانەکردنی حەشر و قیامەت، کاری بێهوودە و هەڕەمەکی و ئیسرافی لێ ببینرێت، لە کاتێکدا کە سەدان دانست و بەرژەوەندیی بە گەردنی هەموو شتێکی ناو ئەم گەردوونەدا هەڵواسیوە و، سەدان ئەرکی لە ئەستۆ ناوە. تەنانەت هەموو درەختێك، بە ئەندازەی ژمارەی بەرەکانی، دانستی لە مل کردووە و بە قەدەر ژمارەی گوڵەکانیشی کارمەندی و ئەرکی پێ سپاردووە.. بەڵێ، هەرگیز ناگونجێ ختوورەی وا بە ئەندێشەی هیچ مرۆڤێکی ژیردا بێت کە ئەم "دانا شکۆمەندە" گشت ئەو دانست و ئامانج و کارمەندییانە، بە نەهێنانی دواڕۆژ و بەرپانەکردنی قیامەت، بفەوتێنێت!

چونکە ئەم کارە ئەوە دەگەیەنێت کە: کۆڵەواری و دەسەوسانیی تەواوەتی بدرێتە پاڵ (توانستی خاوەن توانای ڕەها) و.. بێهوودەیی و لەناوچوون بخرێتە ئەستۆی (دانستی نەبڕاوەی خاوەن دانستی موتڵەق) و.. ناشیرینیی ڕەهاش بۆ (جوانیی سۆز و بەزەیی خاوەن میهرەبانیی ڕەها) بگێڕرێتەوە و.. ستەمی موتڵەقیش بدرێتە پاڵ (دادگەریی تەواوەتیی خاوەن دادگەریی ڕەها)! واتە ئەوە دەگەیەنێت کە بە تەواوی ئینکاریی ئەو "دانست" و "میهرەبانی" و "دادگەری"یە ئاشکرایە بکرێت کە لە بوونەوەراندا دەبینرێن! خۆ ئەمەش سەیرترینی شتە مەحاڵەکانە و لە هەمووشیان بێنرختر و بەتاڵترە!

دەبا گومڕایان بێن و سەیری "گومڕایی"یەکەیان بکەن. تاکو بزانن چەندە تاریك و پڕ لە مار و دووپشکە، بە وێنەی گۆڕەکانیان کە دەچنە ناوی! ئنجا با بیشزانن کە ڕێی ئیمان بە دواڕۆژ، وەکو بەهەشت، جوان و ڕووناکە. تاکو بیگرنەبەر و بۆ خۆیان لە سایەی نیعمەتی ئیماندا بحەوێنەوە!

**خاڵی پێنجەم:** (بریتییە لە دوو مەسەلە):

❐ مەسەلەی یەکەم:

بەدیهێنەری دانا، بەپێی خواستی ناوی "الحکیم"ی خۆی، لە هەموو شتێکدا بە دوای ناسکترین وێنە و کورتترین ڕێ و ئاسانترین چۆنێتی و سوودمەنترین شێوەدا دەگەڕێت. ئەم کارە، بە ئاشکرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ چەشنە ئیسراف و بێهوودەیییەك لە بەدیهێنانی شتاندا نییە. چونکە هەرچی شت هەیە سوود و مەبەستی خۆی تێدا ڕەچاو کراوە. جا هەروەك "ئیسراف" پێچەوانەی خواستی ناوی "الحکیم"ە و لەگەڵیدا یەك ناکەوێت، ئەوا "ئیقتیصاد" لەگەڵیدا یەك دەکەوێت و خواست و دەستووری بنەڕەتیی ئەو ناوەیە.

دەسا ئەی هەڵەخەرجی ئیسرافکار! بزانە چەندە لە ڕاستی دوور کەوتوویتەوە کاتێ کە جێبەجێ کردنی گەورەترین دەستووری گەردوونت پشتگوێ خستووە کە لەسەر دەستپێوەگرتن بنیات نراوە. بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکەرەوە: ﴿**وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا**﴾ (الأعراف:٣١) تاکو مەودای ڕەگداکوتاویی ئەو دەستوورە گشتی و فراوانە بزانیت کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕێنمایی خەڵکیی بۆ لا دەکات.

❐ مەسەلەی دووهەم:

دروستە بوترێ: دوو ناوی "الحَكَم" و "الحكيم"ی خواوەند، بە ئاشکرا داخوازی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدن ﷺ و دەبن بە بەڵگە لەسەری!

بەڵێ، مادەم کتێبی خاوەن ئامانج و واتای ڕەوان بە ئاشکرا داخوازی بوونی مامۆستایەکی کارامەیە؛ تاکو بە دەرس بیڵێتەوە و ڕوونی بکاتەوە.. هەروەها مادەم جوانیی لەڕادەبەدەریش داخوازی بوونی ئاوێنەیەکە تاکو تیایدا دەربکەوێت و جوانییەکەی پیشانی بینەرانی بدات.. هەروەها وەك سنعەتی ناوازەش داواکاری ئەوەیە کە دەلاڵ و ناسێنەرێکی ببێت بیناسێنێت..

بە هەمان جۆر، دەبێ گرۆی مرۆڤیش کە گوفتاری ئەو کتێبە مەزنەی گەردوونی ئاراستە کراوە کە هەموو یەکێك لە پیتەکانی سەدان واتای ڕەوان و دانستی وردیان لەخۆ گرتووە.. دەبێ لەناو ئەم گرۆی مرۆڤەدا:

پێشەوایەکی تەواو کامڵ و مامۆستایەکی هەرە گەورە هەبێت، تاکو خەڵکی بۆ لای ئەو دانستە ڕاستەقینە و خاوێنانە ڕێنمایی بکات کە لەو کتێبەدان و، دانستەکانی ناو هەموو شوێنێکی ئەو کتێبەیان بە دەرس پێ بڵێتەوە و.. ببێت بەهۆی دەرکەوتنی ئەو ئامانجە پەروەردگارییانەی کە لە بەدیهێنانی گەردووندا هەن، تەنانەت هۆی هاتنەدیی ئەو ئامانجانە بێت و.. خەڵکی بەو ویست و ئامانجەی بەدیهێنەر ئاشنا بکات کە دەیەوێت "کەماڵی سنعەتی ناوازە" و "جوانیی ناوەکانی" خۆی دەربخات و، ئەو زاتەش ببێت بە ئاوێنەیەکی ساف و خاوێن بۆ دەرخستنی ئەو کەماڵە ناوازە و جوانییە لەڕادەبەدەرەی بەدیهێنەر و.. بە ناوی هەموو بەدیهاتووانەوە بەندایەتییەکی فراوان لە بەرامبەر ڕواڵەتە پەروەردگارییە فراوانەکانەوە ئەنجام بدات و، تاسە و شەوق لە ئاسۆی سەرجەم وشکایی و دەریاکاندا بورووژێنێت و.. بە بانگەواز و، پاڕانەوە و، تەهلیل و، تەسبیح و، تەقدیسێك کە هەموو گۆشەیەکی زەوی و ئاسمانەکانی پێ بزرنگێتەوە، سەرنجی هەموو لایەك بۆ لای کردگاری مەزن ڕابکێشێت و.. بەو دەرسە خاوێن و بەرز و ڕێنمایییە

حەکیمانەش کە لە قورئانی حەکیمەوە دەیانلێتەوە لـە دەرگـای گوێی هـەموو کەسێکی ژیر و هۆشمەند بدات و.. بەم قورئانە مەزنە و، لە جوانترین و ڕووناکترین شـێوەدا ئامانجـە خواییـەکانی ئـەو کردگـارە "حەکـەم" و "حـەکیم"ە دەربخـات و.. بـە تـەواوترین و کاملترین دیدار و ڕووبەڕووبوونـەوە پێشـوازی لـە ڕوالەتـەکانی: دانسـت و، جوانـی و، شکۆمەندی بکات کە لە ئاسۆکانی گەردووندا دەدرەوشێنەوە..

بوونی مرۆڤێك کە ئەمانە ئەرکی سەرشانی بن، گەلـێ پێویستە، تەنانـەت گـەردوون چەندە پێویستی بە خۆرە، ئاوا پێویستیشی بەو مرۆڤەیە!

جا ئەو کەسەی کە بە جوانترین شێوە ئەو ئەرکـە گرنـگ و کارمەندییانـە جێبەجێ دەکات، وەك لە بەرچاودایە، جگە لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کەسی تر نییە. لەبەر ئەوە، هەروەك چۆن خۆر داخـوازی ڕووناکیـە و ڕوونـاکیش داخـوازی ڕۆژگـارە، بـە هـەمان جۆر ئەو حیکمەتانـەش کـە لـە ئاسۆکانی گـەردوون و گشـت لایـەکیدا هـەن، داخوازی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدن ﷺ.

ئنجا هەروەك درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی: "الحَکَـــم والحکیـم"، لـە فراوانـترین مەودایدا، داخوازی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد بوو ﷺ.. بە هـەمان جۆر، زۆربـەی ناوە جوانـەکانی تـری وەك: "الله، الرحمن، الرحیـم، الـودود، المنعم، الکریـم، الجمیـل، الـربّ" و هاوچەشـنیان، لـە مـەزنترین درەوشـانەوەیان و دەورەدانیـان بـە سـەرجەمی گەردووندا و بە چەشنێکی بێ گومان، داخوازی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدن ﷺ.

بۆ نموونە:

میهرەبانیی فراوان، کە درەوشانەوەی ناوی "الرحیـم"ە، بـەو کەسە دەردەکـەوێت و ئاشکرا دەبێت کە "رحـــمة للعالمین"ە..

هـەروەها خۆشەویسـت کردنـی خوایـی و خۆناسـاندنی پـەروەردگاری، کـە لـە درەوشانەوەکانی ناوی "الودود"ن، لە بەرامبەر خۆیانەوە "حبیب رب العالمین" دەبینن و، لەو ڕێیەوە بە ئامانجەکەیان دەگەن..

هەروەها گشت جۆرەکانی "جوانی": هەر لە جوانیی زاتەوە تـا جوانیـی ناوەکـان و، جوانیـی سنعەت و ڕێکوپێکـی و جوانیـی دروسـتکراوان و بەدیـهاتووان.. هـەموو ئـەم جۆرانـەی جوانـی، کـە هـەندێکن لـە درەوشـانەوەکانی نـاوی "الجمیـل"ی خـواوەنـد، لـە ئاوێنەی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەون و دەبینرێن..

تەنانەت درەوشانەوەکانی: گەورەیی پەروەردگاری و، زاڵ بوونی دەستەڵاتداریی خواوەند، تەنها بەهۆی پێغەمبەرێتیی ئەم بانگەوازکارە مەزنەوە، کە خەڵکی بۆ لای دەستەڵاتی پەروەردگاریّتی بانگ دەکات، دەناسرێن و دەردەکەون و تەسدیق دەکرێن و وەردەگیرێن.

بەم جۆرەی کە ئێستا باس کرا، زۆربەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە بەڵگەیەکی درەخشانن لەسەر ڕیسالەتی ئەحمەدی، علی صاحبها الصلاة والسلام.

**بە پوختی:**

مادەم گەردوون لە ڕاستی‌دا هەیە و ئینکاریی بوونی ناکرێت، ئەوا ناشگونجێ ئەو شتانەی کە بە وێنەی: ڕەنگەکان و، ئارایشت و، ڕووناکی و، ڕێکوپێکی و، جۆرەکانی ژیان و پەیوەندیی شتانی ناو گەردوون وان، ئینکاری بکرێن، کە بریتین لە حەقیقەتە بەرچاوەکانی چەشنی: دانایی و، چاودێری و، میهرەبانی و، جوانی و، ڕێسا و، تەرازووکاری و، ئارایشتدان و، ڕاستی‌یەکانی تری هاوچەشنیان.

جا مادەم ناکرێت ئینکاریی ئەم سیفەت و کارانە بکرێت، ئەوا ناشگونجێ ئینکاریی خاوەنی ئەو سیفەتانە و بکەری ئەو کارانە و خۆری ئەو ڕووناکی‌یانە بکرێت، کە زاتی ئەقدەسی خواوەندی "واجب الوجود" و، دانا و، بەخشندە و، میهرەبان و، جوان و، حەکەم و، دادگەرە!

هەروەها ناگونجێ ئینکاریی ئەو کەسەش بکرێت کە هۆ و مایەی دەرکەوتنی ئەو سیفەت و کارانەیە، بەڵکو خولگەی دەرخستنی کەماڵاتیانە. بەڵکو هۆکاری هاتنەدیی درەوشانەوەکانیانە، کە حەزرەتی محەممەدی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و، پێشەوای هەرەگەورە و، مامۆستای هەرە کامڵ و بانگەوازکاری هەرە مەزن و، حەلکەری مەتەڵی بوونەوەران و، ئاوێنەی صەمەدانییەت و، خۆشەویستی خواوەندی میهرەبانە.

بەڵێ، هەرگیز ئینکاریی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە توانادا نی‌یە. چونکە درەخشانترین ڕووناکی‌یە لەم گەردوونەدا و، بە وێنەی درەخشانیی ڕووناکیی جیهانی حەقیقەت و نووری ڕاستیی بوونەوەرانە.

عليه وعلى آله واصحابه الصلاة والسلام، بعدد عاشـــرات الأيام وذرّاتِ الأنَامِ.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ مَا عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ .

* * *

# سەرنجی چوارەم

## تایبەته بە ناوی:

## (الفَرْد)

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾

له دەمی بەندبوونم له بەندیخانەی "ئەسكی شەهر" و لـە مـانگی شـەوالدا، سـەرنجێكی ورد و ناسكی ئەم ئایەته پیرۆزە و، پرشـنگێكی ڕووناكیـیەكانی نـاوی "الفـرد"ی خـوای گەورەم لـــێ دەركـەوت، كـە "ئیـسمی ئـەعزەم"ە، یـاخود یەكێكـە لـە شـەش نوورەكـانی ئیسمی ئەعزەم و، واتـای دوو نـاوی جوانـی: "الواحـد" و "الأحـد"ی خـوای گەورەشی لەخۆگرتووە.

وا لێرەدا بـە حـەوت "ئامـاژە"ی یـەكجار كـورت ئـەو "تـەوحید"ە ڕاستەقینەیە ڕوون دەكەینەوە كە ئەو درەوشانەوە مەزنەی ناوی "الفرد"ی خوای گەورە دەری‌دەخات:

**ئاماژەی یەكەم:**

بەهۆی ئـەوەی كـە ئیسمی ئـەعزەمی "الفـرد"ی خـوای گـەورە درەوشـانەوەی هـەرە مەزنی خۆی ئاراستەی گشت لایەكی گەردوون كردووە، ئەوا جێ مۆركە ئاشكراكانی "تەوحید" و، مۆرە بەرجەستە و ڕوونـەكانی "یـەكتایی" خـوای گـەورەی لەسـەر هـەموو لایەكی سەرجەمی گەردوون و، گشت "جۆر"ێك لە جۆرەكانی ناوی و، یـەك بـە یـەكی "تاك"ەكانی ئەو جۆرانەی ناو گەردوون، نەخشاندووە.

لەبـەر ئـەوەی "وتـەی بیسـت و دووهـــەم" و "مـەكتووبی سـی و سـێهەم" ئـەو درەوشانەوەیەیان بە درێژی باس كردووە، وا لێرەدا تەنها ئاماژە بـۆ سـێ دانـە مۆر و سێ مۆركی ئەوتۆ دەكەین كە دەبن بە بەڵگەی "تەوحید".

❍ مۆری یەكەم:

درەوشـانەوەی هـەرە مـەزنی "فەردییـەت"ی خـوای گـەورە شـەقڵێكی تایبـەتیی "تەوحید"ی لەسەر ڕوخساری گەردوون نەخشاندووە و، مۆرێكی ئاشكرای "تـاكی"ی

خواوەندیشی لێ داوە، بە چەشنێ کە سەرجەمی گەردوونی وەك "کلّ"ێك لێ کردووە کە هەرگیز لەتکردن هەڵنەگرێت. بە ڕادەیەك کە (ئەگەر کەسێك نەتوانێت دەستی لە هەڵسووڕاندنی کاروباری سەرجەمی گەردووندا بێت، هەرگیز ناشتوانێت بە جۆرێکی ڕاستەقینە خاوەنی هیچ "بەش"ێکی گەردوون بێت)!

با ئەم مۆرە تایبەتی‌یە ڕوون بکەینەوە:

فەرموو بۆ خۆت سەرنج لە بوونەوەران بدە؛ دەبینیت: هەموو جۆرە جیاجیاکانی ناو گەردوون بەوپەڕی مەحکەمی و توندوتۆڵی هاوکاریی یەکتری دەکەن و، یارمەتیی یەکدی دەدەن و، هەر بەشێك لە بەشەکانی لە پێناوی تەواوکردنی ئەرکی ئەوانی تردا تێدەکۆشێت، بە چەشنێ کە دەڵێی هەموویان پێکەوە شێوەی چەرخ و جەرەوپێچەکانی کارگەیەکی ناوازەیان گرتووەتە خۆ.

جا ئەم پشتگیری‌یەی یەکتر و ئەم یارمەتیدانەی نێوان بەشەکانی گەردوون و فریاگوزاری و بەدەمەوە چوونیان بۆ ئەنجامدانی داخوازی و پێویستی‌یەکانی یەکتری، تەنانەت ئەم دەست لە ملی یەکتر کردن و ئاوێتە بوونەی بەشەکانی گەردوون، وای لەو بەشانە کردووە کە وەك یەك دانە پارچەی یەککگرتوویان لێ هاتووە؛ لەتبوون و لێك جیاکردنەوە هەڵناگرن، چەشنی جەستەی مرۆڤ کە ناکرێت ئەندامەکانی لە یەکتری جیا بکرێنەوە!

لەمەوە تێدەگەین کە ئەو کەسەی جڵەوی تەنها یەك توخمی ئەم بوونەوەرە بە دەستەوە دەگرێت، گەر لە ڕاستی‌دا جڵەوی سەرجەمی توخمەکانی گەردوونی بە دەستەوە نەبێت، هەرگیز ناتوانێت بەسەر ئەو تەنها توخمەشدا زاڵ بێت!

کەواتە ئەو "هاوکاری" و "پشتگیری" و "بەدەم یەکەوە چوون" و "دەست لە ملانێ" ڕوون و ئاشکرایانەی کە بەسەر ڕوخساری گەردوونەوە دەبینرێن، تەنها چەند مۆرێکی مەزن و چەند شەقڵ و مۆرك و ئاسەوارێکی ئاشکرا و ڕووناکی "تەوحید"ن.

❍ مۆری دووهەم:

درەوشانەوەی ڕۆشن و ئاشکرای ناوی "الفرد"ی خوای گەورە، مۆرێکی بریسکاوەی "تەنیایی" و نیشانەیەکی ڕوونی "تاکی"ی خواوەندمان لەسەر ڕووی زەوی، بە تایبەتی لە وەرزی بەهاردا، پیشان دەدات. بە چەشنێ کە دەری دەخات:

ئەو کەسەی یەك بە یەکی هەموو زیندەوەرانی سەر ڕووی زەوی و گشت بارودۆخ و کاروبارەکانی ئەو بوونەوەرانە بەڕێوە نەبات و هەموویان نەبینێت و دروستیان نەکات و

لە یەك کاتدا ئاگای لە هەموویان نەبێت، هەرگیز ناتوانێت لە ڕووی بەدیهێنانەوە دەستی لە کاروباری هیچ کام لەو بوونەوەرانەدا بێت.

با ئەم مۆرە ڕوون بکەینەوە:

سەرنجی ئەم ڕایەخە مەزنەی بەردەمت بدە کە بەسەر ڕووی زەوی‌دا ڕاخراوە و بە دووسەد هەزار کۆمەڵ و تاقم و جۆری زیندەوەران و ڕووەکی زۆر و زەبەندە تانوپۆ کراوە، کە تاك تاکەکانی ئەو جۆرانەش هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن و، بە هەر هەموویشیان "ئارایشت" و "شادی"یان بەسەر ئەو ڕایەخەی ژیاندا پەخش کردووە کە بە پڕاوپڕیی ڕووی زەوی چنراوە، بە تایبەت لە دەمی بەهاردا..

فەرموو بە وردی سەرنجی بدە و بە بەردەوامی بۆی بڕوانە؛ دەبینیت: هەموو ئەمانە، وێڕای جیاوازیی شێوە و ڕوخساریان و.. لە یەك نەچوونی کارمەندیی ئەستۆیان و.. جۆراوجۆریی ڕزق و ڕۆزی و کۆئەندامەکانیان و.. تێکەڵ بوونیان لەگەڵ یەکتری‌دا، کەچی هەموو زیندەوەرێك لەوانە ڕۆزیی خۆی پێ دەگات و، بێ ئەوەی لە حسابیشی‌دا بوو بێت لە هەموو شوێنێکەوە بۆی دێت و، بێ هیچ هەڵە و لەبیرچوون و سەرقاڵ بوون و شڵەژان و لێ تێکچوونێکیش بە دەستی دەگات. ئەوەتا دەبینیت یەك بە یەکی ئەو زیندەوەرانە لە کاتی گونجاودا و بە بێ هیچ جۆرە تەکەللوف و ئەرك بوونێك و بێ تێکەڵ بوونی ڕۆزیی هیچ کامیان لەگەڵ ئەوانی تردا، گشت پێداویستی‌یەکانی پێ دەدرێت، لە کاتێکدا کە ئەو زیندەوەرە لە ناوەندی شەپۆلەکانی ئەم تێکەڵ بوونە مەزن و بوونەوەرە تێهەڵکێش بووانەدا تەپاوتل دەدات و، هەر وەختە بە ئەندێشەی مرۆڤیشدا نەیەت! ئەمە هەر تەنها لە ڕووی زەوی‌دا، با ناوەوەی زەوی لەولاوە بوەستێ کە لە ڕێی: ڕێکوپێکیی کانزا و توخمە بێ گیانەکانی ناویەوە، چەندەها نیشانەی ڕەنگین و درەخشانی "تەوحید"ی لە خۆی‌دا حەشار داوە!

کەواتە ئەم "کارسازی" و "بەڕێوەبردن"ەی کە هەمیشە لە ڕووی زەوی‌دا دەبینرێت و، ئەوانەش کە لە ناوەوەی‌دا شاردوونیەتەوە، نیشانەیەکی درەخشانی "تەنیایی" و مۆرێکی ئاشکرای "تاکی"ی خوای گەورەیە. بە ڕادەیەك کە:

ئەو کەسەی لە "نەبوون"ەوە گشت ئەو بوونەوەرانەی بەدی نەهێنابێت و لە یەك کاتدا کاروباری هەموویان نەسازێنێت و بەڕێوەیان نەبات، هەرگیز ناتوانێت لە ڕووی پەروەردگاریتی و بەدیهێنانەوە لە هیچ کامێکی ئەو بوونەوەرانەدا خۆی هەڵبقورتێنێت! چونکە ئەگەر بهاتایە و دەستی لەوانە وەربدایە، ئەوا ئەو بەڕێوەبردنە هاوسەنگ و

فراوانەی تێك دەدا. مەگەر ئەو کارمەندیە سروشتی و ڕواڵەتییەی کە مرۆڤ بە باشی و ڕێکوپێکی و بە فەرمانی خوای گەورە خۆی و، بۆ مەبەستی دەرخستنی ئەو یاسا پەروەردگاریيانە، ئەنجامی دەدات.

○ مۆری سێ‌هەم: لە ڕوخساری مرۆڤدا.

دروشم و مۆری "تەوحید" هێندە ئاشکرایە کە هەر کەسێك سەرنج لە ڕوخسار و دەموچاوی هەر مرۆڤێك بدات، دەیبینێت و هەستی پێ دەکات. چونکە:

هەموو مرۆڤێك چەندەها نیشانەی ئەوتۆ لە سەر و سیمایدا دانراوە کە لە کەسانی تری جیا دەکاتەوە. جا ئەگەر کەسێك نەتوانێت ئەو نیشانە جوداکەرەوانە لە هەموو دەموچاوێکدا دابنێت و ئاگاداری گشت دەموچاوەکانی پێشین و دوایین نەبێت، هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا قیامەت، هەرگیز ناتوانێت لە ڕووی دروستکردن و بەدیهێنانەوە دەست بهێنێتە پێش تا ئەو نیشانە جوداکەرەوە یەکجار زۆرانە لە دەموچاوە بچووکەکەی یەك کەسیشدا دابنێت!

بەڵێ، ئەو کەسەی کە بەو نیشانە جوداکەرەوانە مۆری وەها جیا جیا و نیشانەی ئاوا ئاشکرای لە ڕوخساری مرۆڤدا نەخشاندووە، دەبێ یەك بە یەکی تاکەکانی سەرجەمی مرۆڤی لە بەرچاودا بووبێت و هەموویان لە بازنەی زانیاریی ئەودا بن، تاکو ئەو مۆرەی "تەوحید" لەو ڕوخسارەدا بنەخشێنێت! چونکە هەرچەند ئەندامە سەرەکییەکانی مرۆڤ وەك چاو و لووت و ئەندامەکانی تریشی بە ڕواڵەت لە یەکتر دەچن، کەچی ئەگەر لێیان ورد ببیتەوە دەبینیت هەرگیز بە تەواوی وەکو یەك دەرناچن، بەهۆی نیشانە جوداکەرەوەکان کە لە هەموویاندا دانراون!

جا هەروەك لەیەکچوونی ئەندامە سەرەکییەکانی وەك لووت و چاو لە ڕوخساری سەرجەمی مرۆڤەکاندا، بەڵگەیەکی گومانبڕی "یەکتایی" بەدیهێنەری گرۆی مرۆڤە، بە هەمان جۆر، نیشانە جوداکەرەوەکانی سەروسیمای هەمووشیان (کە لەبەر پاراستنی مافی هەموو تاکێکی ناو کۆمەڵ و، لێ تێکنەچوون و، جیا کردنەوە و، گەلێ دانستی تر، لەو ڕوخسارانەدا دانراون) بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ویستی ڕەها و تەواوەتیی ئەو تاکە بەدیهێنەرە و، نیشانەیەکی ناوازە و ڕوونە بۆ "تەنیایی"یەکەی. چونکە:

"ئەو کەسەی نەتوانێت گشت مرۆڤ و زیندەوەران و ڕووەکەکان، بگرە سەرجەمی گەردوون بەدیبهێنێت، دیارە ناشتوانێت ئەو نیشانە جوداکەرەوانە لە ڕوخساری هیچ کەسێکدا دابنێت"!

**ئاماژەی دووهەم:**

"جیهان"ەکانی گشت بوونەوەرە جۆراوجۆرەکان و، "جۆر"ە هاوچەشنەکانیان و، "توخم"ە جیاوازەکانیان، بە تەواوی لەگەڵ یەکتریدا یەکیان گرتووە و ئاوێتەی یەکدی بوون، بە چەشنێ کە:

(ئەگەر کەسێك خاوەنی گشت گەردوون نەبێت، هەرگیز ناتوانێت بە تەواوی و ڕاستی دەست لە کاروباری یەك "جۆر" یان یەك "توخم"ی ناو ئەم گەردوونە وەربدات).

چونکە ئەو نوورەی تەوحید کە لە ناوی "الفرد"ی خوای گەورەوە درەوشاوەتەوە، سەرجەمی گەردوونی ڕووناك کردووەتەوە و، لە یەك پارچەی یەکگرتوودا گشت بەشەکانی پەیوەستەی یەکتری کردووە و، وای لە هەموو بەش و گۆشە و سووچێکی گەردوون کردووە کە ئەو یەکتاییە ڕابگەیەنێت.

بۆ نموونە: هەروەك یەکبوونی ئەو خۆرەی کە ئەم بوونەوەرانە ڕووناك دەکاتەوە، بەڵگەی ئەوەیە کە: هەموو ئەو بوونەوەرانە موڵکی یەك کەسن..

به هەمان جۆر:

یەکبوونی ئەو هەوایەی کە بۆ خزمەتی زیندەوەران تێدەکۆشێت و یەکبوونی ئەو ئاگرەی کە بۆ دابین کردنی پێداویستیی گشتیان دادەگیرسێت و..

یەکبوونی ئەو هەورەی کە ئاودێریی زەوی دەکات و..

یەکبوونی ئەو بارانەی کە فریای گشت زیندەوەران دەکەوێت و..

پەرش و بڵاویی زۆربەی زیندەوەرە ڕووەکی و ئاژەڵییەکان بە سەربەستی لە سەرجەمی ڕووی زەویدا، هاودەم لەگەڵ: یەکبوونی جۆرەکانیان و شوێنی نیشتەجێ بوونیان..

هەموو ئەمانە، چەند ئاماژەیەکی گومان نەهێڵن و، چەند شایەتێکی ڕاستگۆن لەسەر ئەوەی کە: ئەو بوونەوەرانە و شوێن و نشینگەکانیشیان، موڵکی تەنها یەك کەسی "تاك" و "تەنیا"ن.

جا بەم پێوەرە و لەبەر تیشکی ڕووناکیی ئەمەی باسمان کرد، دەبینین کە: تێکەڵی و پەیوەستەیی توندوتۆڵی "جۆر"ە جودا و جیاوازەکانی بوونەوەران لەگەڵ یەکتریدا، وای لە هەموویان کردووە کە وەك "کُـلّ"یك وابن؛ هەرگیز لە ڕووی بەدیهێنانەوە لەتبوون و دابەشکردن هەڵنەگرن.

کەواتە ئەو کەسەی نەتوانێت فەرمانی خۆی بەسەر گشت گەردووندا بسەپێنێت و جێبەجێی بکات پێیان، هەرگیز لە ڕووی بەدیهێنان و پەروەردگاریتیشەوە ناتوانێت هیچ شتێك ملکەچی پەروەردگارێتیی خۆی بکات، با ئەو شتە گەردیلەیەك یان لەویش بچووکتر بێت!

**ئاماژەی سیهەم:**

بەهۆی درەوشانەوەی ناوی هەرە مەزنی "الفرد"ی خوای گەورەوە، سەرجەمی گەردوون وەك چەند نامەیەکی صەمەدانی و نووسراوی پەروەردگاریی دەست لە ملان و ئاوێتەی یەکتریان لێ هاتووە، کە هەموو یەکێك لەو نامانە پڕن لە نیشانەکانی "یەکتایی" و مۆرەکانی "تەوحید" و، بە ئەندازەی ژمارەی وشەکانیشیان ئاسەوار و مۆرکی "تەنیایی"یان لەسەر دانراوە، تەنانەت هەموو یەکێك لەو وشانە بە ڕاشکاوی و زمانێکی پاراو "یەکتایی" نووسەرەکەیان ڕادەگەیەنن. چونکە هەروەك "مۆر" یان "ئیمزا"ی سەر هەر نامەیەك بەڵگە و ناسێنەری نووسەرەکەیەتی، بە هەمان جۆر، گشت گوڵ و، بەر و، گژوگیا و، ئاژەڵ و، درەختێکیش وەك مۆر و تەمغەی "صەمەدانییەت"ی خواوەند وان لە شوێنەکانی خۆیاندا، کە هەر یەك لەو شوێنانە ڕوخساری نامەیەکیان گرتووەتە خۆیان و، لەم ڕێیەوە نووسەرەکەیان بە بینەران و خوێنەران دەناسێنن.

بۆ نموونە: هەر گوڵێکی زەرد لە هەر باخچەیەکدا ببێت، وەك مۆرێك وایە، بە ڕوونی: وێنەکێش و داهێنەری باخچەکەمان پێ دەناسێنێت. کەواتە ئەو کەسەی خاوەنی ئەو مۆرە (واتە ئەو گوڵە) بێت، هەر ئەویشە کە خاوەنی جۆرە هاوچەشنەکانی تری ئەو گوڵەیە لە سەرانسەری ڕووی زەویدا بە گشتی و، بەڵگەی ئەوەیشە کە ئەو باخچەیە نووسینی ئەوە.

واتە هەموو شتێك سەرجەمی شتانی تر دەداتە پاڵ بەدیهێنەریان و، ئاماژە بۆ درەوشانەوەیەکی ڕوون و مەزنی "یەکتایی" ئەو بەدیهێنەرە دەکات!

**ئاماژەی چوارەم:**

بەشە زۆر و زەبەندەکانی "پەیامەکانی نوور" بە چەندەها بەڵگەی جۆراوجۆر ڕوونیان کردووەتەوە کە: وێڕای ئەوەی: درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الفرد"ی خوای گەورە وەك خۆری ئاسمان ئاشکرا و لەبەرچاوە، لە هەمان کاتدا تا ڕادەی ئاسانیی ڕەها لە ناخی مرۆڤیشدا پەسەند کراوە و، ژیری و مەنتیق هەتا ڕادەی واجب بوون و بەداهەت، پێیان ڕەوایە.. بە پێچەوانەشەوە "شیرك" (واتە بوونی هاوبەش بۆ

بەدیهێنەر، یان بوونی چەند بەدیهێنەرێك بۆ گـەردوون) کـە دژی ئـەو درەوشـانەوە هـەرە مەزنەی ناوی "الفرد"ی خوای گەورەیە، کارێکە لەوپەڕی دژواری و ئاڵۆزیدایـە و، بـە یەکجارەکی پێچەوانەی مەنتیقە و، تا مەودای مەحاڵی و نەگونجاویش لـە ژیریی مرۆڤـەوە دوورە.

وا لـێرەدا تەنـها "سێ خـاڵ" لـەو بەڵگـە زۆرانـە دەهێنـین و، درێـژەی باسـەکە بـە پەیامەکانی تر دەسپێرین.

● خاڵی یەکەم:

بە کورتی لـە "کۆتایی وتـەی دەهـەم" و "وتـەی بیسـت و نۆهـەم"دا و، بـە درێژیـش لـە "مەکتووبی بیستەم"دا، بە چەندەها بەڵگەی گومانبڕ، چەسپاندمان کە:

سـەبارەت بـە توانستی ڕەهـای خـواوەنـدی تـاك و تـەنیاوە، بەدیـهێنانی "مــەزنترین" و "بچووکـترین" قـەبارە وەکـو یـەك ئاسـانە. ئـەوەتا خـواوەنـد بـە ئـەندازەی ئاســانیی دروستکردنی یـەك دانـە گـوڵ، بـەهاری فراوانیش دروسـت دەکـات و.. وەك لـە پێـش چاودایە، هەموو بەهارێکیش بەوپەڕی ئاسانی هەزاران نموونەی حەشر و نەشر پێش چـاو دەخـات و.. ئـەوەندەی ئاسـانی بایـەخ پێـدان و چـاودێری کـردنـی بـۆ یـەك دانــە میـوەی بچووك، چاودێریی درەختێکی زەبەلاحیش دەکات.

جـا ئەگـەر بایەخ پێدان و دروستکردنی هەرکام لەوانەی باس کران، کاری هۆکارە جۆراوجۆرەکـان بوایـە، ئـەوا بەدیـهێنانی یـەك دانـە گـوڵ بـە ئەندازەی گیروگرفتـەکانی بەدیـهێنانی بـەهارێکی فـراوان و.. دروستکردنی یـەك دانـە بـەریش هێنـدەی سـەختی و دژواریی دروستکردنی درەختێکی بالآبەرز، گیروگرفتی دەهاتە ڕێ!

بەڵێ، ئەگەر دابین کردنی ئازووقە و تەقەمەنییەکانی سەرجەمی سـوپا بـە فـەرمانێکی یـەك پێشـەوا و لـە یـەك سـەرچاوەوە ئەنجام بدرێـت، ئـەوا بـە ئـەندازەی دابـین کردنـی پێداویستییەکانی یـەك دانـە سـەرباز کارەکـە ئاسـان دەبێـت.. بـەڵام گـەر یـەك بـە یـەکی سـەربازەکانی سـوپا ئـەو پێداویستییانەیان لـە چـەندەها کارگـەی جیـا جیـا وەربگـرن و فەرمانیشـیان لـە چـەند بەڕێوەبەرایــەتی و فەرماندەیــەکی جۆراوجــۆری زۆرەوە بــۆ دەربچێـت، ئـەوا کارەکـە پێچەوانـە دەبێتــەوە و دەبێـت بـە کـارێکی دژواری سـەرتاپا گیروگرفت و تەنانەت مەحاڵیش! چونکـە ئـەو کاتـە هـەموو یـەکێك لـە سـەربازەکان بـە ئەندازەی پێداویستیی سەرجەمی سوپا، پێویستی بـە کارگـە دەبێـت تـا ئـەو داخـوازی و پێداویستییانەی بۆ فەراهەم بهێنرێت!

جا هەر وەك بەم جۆرەی کە بینیمـان و لـە ڕێی "یـەکبوون"ەوە ئەنجامدانی ئـەم کـارە ئاسان دەبێت و، گەر بیشدرێتە پاڵ "زۆری" گیروگرفتی سـەختی دێتـە پێش.. بـە هـەمان شێوە، گەر مەسەلەی "بەدیهێنان" بدرێتە پاڵ خواوەندی "تاك" و "تەنیا" ئەوا بە ئەندازەی ئاسانیی بەدیهێنانی یەك تاك(فرد) بەدیهێنانی گشت دانە و تاکە لە سنووربەدەرەکانی یەك جۆر (نوع) ئاسـان دەبێـت[1]، بـەڵام گـەر ئـەم کـارە بـە هۆکارەکـان بسپێررێت، ئـەوا بەدیـهێنانی یـەك "تـاك" هێنـدەی بەدیـهێنانی "جـۆر"ێکـی زۆر و بـەربڵاو سـەختی و گیروگرفتی دێتەڕێ!

بەڵێ، "تاکی" و "تەنیایی" هەموو شوێنێکی ئەم گەردوونە بە زاتـی خـواوەنـدی تـاك و تـەنیاوە پەیوەسـت دەکـەن، ئنجـا ئـەم نیسبەت و پەیوەندیـیەش بـۆ ئـەو شـتە دەبێـت بـە "هێز"ێکی بێ سنووری ئەوتۆ کە بتوانێت بەهۆیەوە کاری گەورە گـەورە ڕابپـەڕێنێت و، ئەنجامی وەها مەزنیش بەرهەم بهێنێت کە هەزاران جار لە توانای خۆی زیاتر بێت.

بـەڵام گـەر هـەر شتێك پـاڵی بـە خـاوەنی ئـەو هـێزە مەزنـەوە نـەدابێت و نیسـبەت و پەیوەندیی لەگەڵدا نەبەستبێت، هەر تەنها هێندە کاری لـێ دەوەشێتەوە کە هێزە یـەکجار کەموکوورەکـەی خـۆی توانـای بەسـەریدا بشـکێت و، ئاکامـەکانی ئـەو کارەشـی بـە هەمان ڕێژە کەم و بچووك دەبنەوە.

بۆ نموونە: ئەو کەسەی بە سیفەتی "سـەربازی" پـەیوەندیی بـە فەرماندەیـەکی مەزنـەوە کردبێت و پـاڵی پێـوە دابێـت، ئـەو پـەیوەندی و نیسـبەت و پـاڵ پێوەدانـەی بـۆ دەبێـت بـە هێزێکی پشتگیر و پاڵپشتێکی نەبڕاوە. چونکە ئەو کاتە ناچار نابێت کەرەسـە و تێشـوو و تەقەمەنییەکانی بە کۆڵی خۆی هەڵبگرێت. (بەڵکو ئەو کەرتانەی سوپا کە ئەم کارەیـان خراوەتە ئەستۆ، بۆی هەڵدەگرن). لەبەر ئەوە، کاتێ وا هەیە ئەم سەربازە بەهێز و مـاندوو نەبووە، دەتوانێـت بـەهۆی ئـەو هـێز و پاڵپشـتەی پـاڵی پێـوە داوە، فـەرماندەی سـوپایەکی تێکشکاوی دوژمن و هـەزاران کەسی تریـش لـەو سوپایە بـە "دیـل" بگرێـت. بـا ئـەم لـە شوێنی خۆیشیدا لە سەربازێك زیاتر هیچی تر نەبێت!

---

(١) بۆ ڕوونبوونەوەی واتـای ئـەم زاراوانـە، پێویسـتە بزانیـن کـە: هـەموو زیندەوەران بە یەك ڕەگـەز(جنس) دادەنرێن، بـەڵام ئـەم ڕەگـەزەش بەسـەر چـەند جۆر(نوع)ێکدا دابەش دەبن، وەك: مـرۆڤ و، باڵنـدە و، خشۆك و...هتد. ئنجا هەر یەك لەم جۆرانەش لە چەند تاك(فرد)ێـك پێکهاتوون. کەواتـە: ئـازاد و، نـەوزاد و، شێرزاد و...هتد، چەند "تاك"ێکی "جۆر"ی مرۆڤن، کـە ئـەویش لـە "ڕەگـەز"ی زیندەوەرانـە. وەك لـە زانسـتی مەنتیقدا ئەم واتا و زاراوانە ڕوون کراونەتەوە، کە دانەر لەو ڕەهەندەوە ئەم چەشنە پۆلێنانە دەکات. (وەرگێڕ)

بەڵام ئەو کەسەی کە لە جەنگدا سیفەتی "سەربازی"ی نەبێت و نەرۆشتبێتە ناو ڕیزەکانی سوپاوە، ناچارە هەر بە کۆڵی خۆی تفاق و تەقەمەنی‌یەکانی هەڵبگرێت. ئنجا هەرچەندە ئازا و لێهاتووش بێت، هێشتا هەر ناتوانێت بەو هێزە تایبەتی‌یەی خۆی بەرەنگاری سوپای دوژمن - مەگەر چەند کەسێکی کەمیان - ببێتەوە. لەوانەشە هەر تەنها ماوەیەکی کەم لەو جەنگە و لە بەردەم دوژمندا بەرگریی پێ بکرێت و بتوانێت خۆی ڕابگرێت.

ئا لێرەوە دەردەکەوێت: هێزی پەیوەندی بوون و پاڵ پێوەدان، کە لە "تاك" و "تەنیایی"دا هەن، وا لە مێروولەیەکی بچووك دەکەن کە بتوانێت فیرعەونێکی سەرسەخت لەناوببات و.. مێشوولەیەکی لەڕ و لاواز نەمروودێکی ستەمکار بکوژێت و.. میکرۆبێکی ئاسایی و ساکاریش زاڵمێکی تاوانکار لەناوبەرێت، بە چەشنی "تۆو"ی بچووك، کە بە ناوی ئەو پەیوەندی‌یە و، بەهۆی نهێنیی ئەو پاڵ پێوەدانەوە، درەختێکی سنەوبەری بەرز و زەبەلاح لەسەر پشتی خۆی هەڵدەگرێت!

بەڵێ، فەرماندەی مەزن و ئازا و جوامێر، لە پێناوی ڕزگارکردن و فریاگوزاریی یەك سەربازی سوپاکەی‌دا، کە دووچاری گیروگرفت بووبێت، سەرجەمی سەربازەکانی سوپا بە هانای ئەو یەك دانە سەربازەوە دەبات. خۆ ئەو سەربازەش کە بەمە دەزانێت، هەست دەکات هێندە ورەی بەرزە وەك سوپایەکی تەواو پشتی گرتبێت و هێزی پێ بەخشێت و ورەی زیاد بکات. بە ڕادەیەك کە دەتوانێت بە ناوی فەرماندەکەیەوە کاری گەورە ونائاسایی ڕاپەڕێنێت.

خواوەندی مەزنیش - ولله المثل الأعلـــــى - لەبەر ئەوەی "تاك" و "تەنیا"یە، ئەوا هەرگیز پێویستی بە غەیری خۆی نی‌یە. خۆ ئەگەر لە هەر لایەکدا گریمانی پێویست بوونی غەیری ئەو بکرێت، ئەوا هەر ئەو خواوەندە خۆی گشت بوونەوەران دەخاتەگەڕ بۆ پشتگیری و فریاکەوتنی ئەو تەنها شتە و، سەرجەمی گەردوونی لە پێناودا کۆ دەکاتەوە.

بەم جۆرە، هەموو شتێکی ناو ئەم دنیایە پاڵ بەو هێزە مەزنەوە دەداتەوە کە جڵەوی سەرجەمی گەردوونی بە دەستە و، هێز و تواناش هەر تەنها لەو هێزە ڕەهایەی خواوەندی "تاك"ی "تەنیا" وەردەگرێت. کەواتە ئەگەر "تاك" و "تەنیایی" لە گۆڕێدا نەبوایە، ئەوا هەرچی شتی ناو بوونەوەر هەن ئەو هێزە مەزنەیان لەکیس دەچوو و، دەکەوتنە ناو چاڵی عەدەمەوە و، گشت ئەنجامەکانیشیان لەدەست دەدا.

ئەو ئاكامە یەكجار مەزنانەی كە بە ڕواڵەت دەیانبینیت لە چەندین شتی ساكاری كەم نرخەوە پەیدا دەبن، لە ڕاستی‌دا وەك ڕابەر وان دەستمان دەگرن و، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی بۆ لای "فەردییەت" و "ئەحەدییەت"ی خواوەند ڕێنماییمان دەكەن. چونكە ئەگەر ئەم "تاكی و تەنیایی"یە نەبوایە، گشت ئەنجام و بەروبوومەكانی هەموو شتێك دەترنجانە هێزە تایبەتی و مادەدە كز و لاوازەكەی خۆیان و، بەو ڕێژەیە بچووك دەبوونەوە، تەنانەت هەر نەشدەمان.

زۆر و زەبەندەیی شتانی بەنرخی وەك سەوزە و میوەجات و هاوچەشنیان لە بەردەستماندا، تەنها هی نهێنیی "یەكتایی" و "پەیوەندی بوونیان"ە بەو خواوەندە "تاك و تەنیا"یە و، ئەنجامی جەمكردنی گشت هێزەكانی ناو گەردوونە بۆ بەدیهێنانیان. دەنا ئەگەر "فەردییەت" نەبوایە، ئەو كاڵەك و هەنارەی ئێستا بە چەند درەمێكی كەم دەستمان دەكەون، گەر هەزاران درەمیشمان بدایە هێشتا هەر دەستمان نەدەكەوتن. كەواتە هەرچی: ساكاری و، ئاسانی و، هەرزانی و، دەستكەوتن لە شتاندا دەبینرێن، تەنها ئەنجامی ئەو "یەكتایی"یەن و شایەتی لەسەر "فەردییەت"ی خواوەند دەدەن.

● خاڵی دووهەم:

بوونەوەران بە دوو شێوە بەدی‌دەهێنرێن و پەیدا دەبن:

یەكەم: بەدیهێنان لە نەبوونەوە، كە بە: "دروستكردن و بەدیهێنان"(الخلق والإبداع) ناودەبرێت.

دووهەم: بنیاتنان و پێكهێنانیان لە بوونەوەرانی ئامادە و حازری و، بەخشینی "بوون" پێیان لەم ڕێیەوە. واتە بە: "پێكهێنان و بنیاتنان"(التركیب والإنشاء).

جا ئەگەر لە گۆشەی نهێنیی "تەنیایی" و درەوشانەوەی "یەكتایی"یەوە سەیری بوونەوەران بكەین، دەبینین بەدیهێنانیان تا ڕادەی پێویست و بەداهەت كارێكی سووك و ئاسان دەبێت. بەڵام گەر بەدیهێنان و دروستكردنیان بە "یەكتایی" و "تەنیایی" نەسپێررێت، ئەوا كاروبارەكان بە تەواوی دەئاڵۆزێن و تێكەڵی یەكتری دەبن و چەندەها شتی لە ژێری بەدەر و دوور لە مەنتیق تا ڕادەی مەحاڵی و نەگونجاوی دێنە پێش.

خۆ مادەم ئێمە دەبینین هەموو بوونەوەران بێ هیچ چەشنە سەختی و گیروگرفتێك و بە تەواوترین شێوە وچۆنێتی دێنە "بوون" و بەدی دەهێنرێن، ئەوا درەوشانەوەی "فەردییەت" بە ئاشكرایی و بەڵگەنەویستی دەردەكەوێت و، بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە: هەرچی شتی ناو ئەم گەردوونە هەیە داهێنان و بەدیهاتووی خواوەندی بەخشندەی شكۆمەندی تاك و تەنیایە.

بەڵێ، ئەگەر مەسەلەی بەدیهێنان بدرێتە پاڵ خواوەندی "فەرد"ی "تاك و تەنیا" ئەوا بە توانستی ڕەها و مەزنی خۆی کە ئاسەوارەکانی لەبەرچاودایە هەموو شتێك (بەوپەڕی ئاسانی و لە ماوەی چاوترووکاندنێکدا) لە "نەبوون" دروست دەکات و لە زانیاریی ڕەها و گشتگیر(محیـط)ی خۆی‌دا چەندین نەخشە و پلان و ئەندازەی چەشنی قاڵبی مەعنەوی و غەیبی، بۆ دروستبوونی ئەو شتەی دەیەوێت بەدیی بهێنێت، دیاری دەکات. چونکە هەموو شتێك لە زانستی خوای گەورەدا نەخشە و پلانی بۆ دەستنیشان کراوە:

﴿وكلّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدارٍ﴾ (الرعد:٨).

جا هەروەك سەربازە گوێ ڕایەڵەکانی سوپایەکی ڕێکوپێك و بە فەرمانی فەرماندەکەیان و بەپێی ئەو پلان و نەخشەیەی فەرماندە لە زانیاریی خۆی‌دا کێشاویەتی، لە شوێن و سەنگەرەکانیاندا دادەمەزرێن.. ئەو گەردیلانەش کە سەرجەم گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەندن، بە هەمان جۆرن؛ چونکە بەوپەڕی ئاسانی و لە ڕێی توانستی پەروەردگارەوە بەرەو جێگاکانی خۆیان دەدرێنەبەر و پارێزگاریی شوێنەکانیشیان دەکەن ، بەپێی ئەو شێوە و نەخشەیەی کە لە ئاوێنەی زانستی ئەزەلیی خوای گەورەدا هەیە. تەنانەت ئەگەر پێویست بکات گەردیلەکان لە چەندەها شوێنی جیاجیاوە کۆبکرێنەوە، ئەوا کۆکردنەوەی ئەو گەردیلانە (کە پەیوەست و پابەندی یاسای زانستی گشتگیری خواوەندن و، پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵیان بە دەستوورەکانی توانستی خوای گەورەوە هەیە) ئەوەندە کارێکی ئاسان دەبێت کە کتومت وەك سەربازە گوێ ڕایەڵەکانی سوپایەکی ڕێکوپێك خۆیان دەنوێنن و، بەخێرایی و بەپێی ئەو یاسایە و ملکەچ بوونیان بۆ توانستی ڕەهای خوای گەورە، دەڕۆن و جێی خۆیان دەگرن، بەپێی نەخشە و پلانی ئەو قاڵبە "زانستی" و ئەندازە "قەدەری"یەی زانستی خواوەند کە گشت لایەکی "بوون"ی ئەو شتەیان گرتووەتەوە..

واتە: هەروەك چۆن لە وێنە فۆتۆگرافی‌یەکاندا وێنە میسالی‌یەکەی ناو ئاوێنەکە بۆ سەر کاغەزێکی تایبەتی و هەستیاری کامێراکە دەگوێزرێتەوە و لەوێ‌دا دەردەکەوێت و جێگیر دەبێت و بوونی دەرەکیی هەست پێکراو دەکاتەبەر.. هەروەها وەك چۆن نووسینی نهێنی و نەبینراوی سەر کاغەزێك، کە بە ماددەیەکی تایبەتی نووسرابێتەوە، تەنها بەوەی کە ماددەیەکی کیمیایی تری بەسەردا بهێنرێت، ئەو نووسینە پەنهانە دەردەکەوێت و دەبینرێت و دەخوێندرێتەوە..

هەروەك ئەمانە وان، وێنە و شێوەی هەموو بوونەوەران و.. ماهییەتی سەرجەمی شتانیش، لەناو ئاوێنەی "زانست"ی خواوەندی تاك و تەنیادا، بە هەمان جۆرن؛ چونكە "توانست"ی خوایی بەوپەڕی ئاسانی بوونی هەست پێكراوی دەرەكییان پێ دەبەخشێت و، لەم ڕێیەوە دێنە جیهانی بینراو(عالم الشهادة) پاش ئەوەی كە زووتر لە جیهانی واتا و پەنهان(عالم الغيب)دا بوون و، لە بەرچاودا دەرنەدەكەوتن.

بەڵام ئەگەر مەسەلەی "بەدیهێنان" بۆ خوای گەورەی تاك و تەنیا نەگێڕدرێتەوە، دەبێ بۆ دروستكردن و بەدیهێنانی تەنها یەك "مێش" پێوانە و پشكنینی سەرجەمی ڕووی زەوی و شەن وكەو كردن و لە بێژنگدانی گشت توخم و گەردیلەكانی ناوی بكرێت بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی "بوون"ێكی دیاریكراو بۆ ئەو تەنها مێشە. پاشان دەبێ ئەو توخمانە بە تەرازوویەكی یەكجار ورد و هەستیار و سەرنەكەر بكێشرێن، تاكو هەموو یەكێك لە گەردیلەكانی جەستەی ئەو مێشە لە شوێنی تایبەتی و لەبار و شیاوی خۆیدا و بەپێی چەندین قاڵبی "ماددی"ی هێندە زۆری بە ئەندازەی ژمارەی ئەندام و كۆئەندامە ورد و بچووكەكانی، دابنرێت.. هێشتا بەمانە كارەكە تەواو نابێت؛ چونكە جگە لەمانەش دەبێ هەست و نەستە ڕۆحییە نیان و ناسكەكان و لایەنە مەعنەوییەكانیشی لە جیهانە مەعنەوی و ڕۆحییەكانەوە بۆ بهێنرێن، دوای پێوانە و كێشانە كردنیان بەوپەڕی وردەكاری و بە گوێرەی داخوازی و پێداویستییەكانی ئەو مێشە!!

ئایا ئیتر دروستكردنی تەنها یەك مێش، لەم ڕێیەوە، كارێكی دژوار و نەگونجاو نییە؟ ئایا بە ئەندازەی بەدیهێنانی سەرجەمی بوونەوەران گیروگرفت و مەحاڵی یەك لەناو یەك و یەك لە دوای یەكی لێ ناوەشێتەوە؟!

لەبەر ئەوەیە كە: هەموو ئەهلی "ئیمان" و "زانست" لەو باوەڕەدا یەكیان گرتووە كە: تەنها خواوەندی بەدیهێنەری "تاك و تەنیا" شتان لە نەبوونەوە بەدی دەهێنێت. چونكە ئەگەر ئەم كارە لە ئەستۆی "هۆكارەكان" و "سروشت" بنرایە، دەبوو بۆ بەدیهێنانی "یەك شت" ماددەكانی بەدیهاتنی لە زۆربەی شتانی ناو گەردووندا كۆ بكرانایەتەوە!

● خاڵی سێهەم:

لە چەندەها پەیامدا چەندین نموونەی زۆرمان هێناوەتەوە كە هەر هەموویان ئاماژە دەكەن بۆ ئەوەی كە: گێڕانەوەی "بەدیهێنان" بۆ خوای "تاك و تەنیا" كارێك دەكات دروستكردن و بەدیهێنانی هەموو شتان وەك بەدیهێنانی یەك دانە شت ئاسان بێت. بە

پێچەوانەشەوە ئەگەر "بەدیهێنان" بدرێتە پاڵ "سروشت" و "هۆکارەکان" ئەوا هێندە گیروگرفت دێنە پێش کە دروستکردن و بەدیهێنانی یەك دانە شت بە ئەندازەی بەدیهێنانی هەموو شتان سەخت و مەحاڵ دەبێت.

لێرەدا تەنها سێ دانە لەو نموونانە دەخەینە ڕوو:

*نموونەی یەکەم:*

ئەگەر بەڕێوەبردنی "هەزار" سەرباز بە "یەك" ئەفسەر بسپێررێت و، لەولاشەوە بەڕێوەبردنی "یەك" سەرباز بخرێتە ئەستۆی "دە" ئەفسەرەوە، ئەوا بەڕێوەبردنی ئەم یەك سەربازە دە ئەوەندەی بەڕێوەبردنی ئەو لەشکرەی حاڵەتی یەکەم سەختی و گیروگرفتی دێتە ڕێ..

چونکە بێ هیچ گومانێك فەرماندە زۆرەکانی حاڵەتی دووهەم دژایەتیی یەکتری دەکەن و فەرمانەکانیان بۆ ئەو سەربازە، جۆراوجۆر و پێچەوانەی یەکدی دەبن. دیارە سەربازەکەش لە نێوان مشتومڕ و قاڵەی سەرکردە و فەرماندەکانیدا دەتاسێت و، گرفتاری حەپەسان دەبێت و، حەوانەوەی لەکیس دەچێت. بە پێچەوانەی حاڵەتی یەکەمەوە؛ ئەوەتا کاری ئەو یەك ئەفسەرە هێندە ئاسانە کە بە ئەندازەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی یەك دانە سەرباز ئەو لەشکرە زەبەندەیە بەڕێوەدەبات و، هەر نەخشە و پلانێکیش دابڕێژێت بەوپەڕی ئاسانی جێبەجێی دەکات. دەبێ بیشزانین کە: ئەم ئەنجامە مەزنە پەیدا نەدەبوو ئەگەر سەربازەکان ئەو تەنها فەرماندەیەیان نەبوایە و بە هەڕەمەکی جڵەویان بۆ بەرەڵا بکرایە!

*نموونەی دووهەم:*

گەر بسەلمێنرێت کە بنیاتنانی گومەزی مزگەوتی "ئەیا سۆفیا" کاری یەك وەستای کارامەیە، ئەوا دەزانرێت کە بەوپەڕی ئاسانی دروستی دەکات و بنیاتی دەنێت. بەڵام ئەگەر ئەم کارە بە هی ئەو وەستایە دانەنرێت و بە خودی بەردەکانی ئەو گومەزە بسپێررێت، دەبێ هەموو یەکێك لەو بەردانە فەرمانڕەوای ڕەها بێت بەسەر بەردەکانی تردا و، لە هەمان کاتدا لە ژێر فەرمانی یەك بە یەکیشیان بێت، تاکو ئەو گومەزە هەڵواسراوە مەزن و بڵندە، شێوە ناوازەکەی ئێستای بۆ بڕەخسێت!

جا لە کاتێکدا ئەو وەستا کارامەیەی کە بنیاتنانی گومەزەکەی گەلێ بەلاوە ئاسان بوو، بە هەوڵ و ماندووبوونێکی کەم کارەکەی ڕاپەڕاند، کەچی سەدان "بەردە وەستا" چەندین ئەوەندەی تەقالا و ماندووبوونی وەستا کارامەکە هەوڵ دەدەن و، هەر ناشگەنە ئەنجام!!

*نموونەی سێهەم:*

"گۆی زەوی" کارمەندێکە لە لایەن خواوەندی تاك و تەنیاوە ئیشی پێ سپێرراوە و کاری لە ئەستۆ نراوە و، چەشنی سەربازی گوێ ڕایەڵ وایە بۆ ئەو خواوەندە تاك و تەنیایە..

جا هەر کات لە لایەن فەرماندە تاك و تەنیاکەی خۆیەوە فەرمانێك وەردەگرێت، یەکسەر (بەدەم مەستیی شادبوونیەوە بە فەرمانی خاوەنەکەی) ڕادەپەڕێت و، بە شەوق و تاسەمەندییەکی یەکجار گەرموگوڕەوە دەکەوێتە حاڵ و جەزبەی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی و، وەك مەولەویی شەیدا لە دەمی حاڵ لێ هاتنی کۆڕی زیکر و سروودیدا دەکەوێتە سووڕخواردن و خولانەوەیەکی ئەوتۆ کە چوار وەرزەکان و ڕۆژ و شەوانی لێ پەیدا دەبێت و، چەندین بزووتن و جووڵەی بەرز و مەزنی لێ دەردەکەوێت و، چەندەها دیمەنی سەرنج ڕاکێشی گومەزی پڕ سام و شکۆی ئاسمان دەردەخات و، چەشنی دیمەنەکانی سینەما یەك لە دوای یەك دیمەنە بەرچاوەکانی ئاسمان دەگۆڕێت و، بەم پێیە سووڕ و خولانەوەی زەوی، دەبێ بەهۆی سەرهەڵدان و پەیدا بوونی ئەم چەشنە ئەنجامە مەزنانە. بە ڕادەیەك کە گۆی زەوی، لەو مانۆڕ و نمایشە سەربازییەدا، لە شێوەی فەرماندەی ئەستێرەکانی ناو گەردوونی فراواندا دەردەکەوێت!

بەڵام گەر ئەم کارە بۆ خوای "تاك" و "تەنیا" نەگێڕرێتەوە، کە فەرمانی خوایەتی و دەستەڵاتی پەروەردگارێتییەکەی سەرانسەری گەردوونی گرتووەتەوە و، حوکم و فەرمانیشی لە هەموو شتێکی گەورە و بچووکی بوونەوەردا جێبەجێ دەکرێت.. ئەوا دەبێ ملیۆنەها ئەستێرەی مەزنی ئەوتۆ هەبن کە هەزاران جار لە زەوی گەورەتر بن و، دەشبێ هەر هەموویان لە خولگەیەکی ملیۆنەها جار لە چاو خولگەی زەوی گەورەتردا بسووڕێنەوە و بەڕێ بخرێن، تاکو ئەو مانۆڕە ئەرزی و ئاسمانییە بەسام و شکۆیە و سەرجەم بەروبووم و ئەنجامەکانیشی دروست بکەن کە خواوەندی "تاك" و "تەنیا" بەوپەڕی ئاسانی، لە بزووتنە ساڵانە و ڕۆژانەکەی زەوییەوە دروستیان دەکات و دەیانخاتە ڕوو.

کەواتە هاتنەدیی ئەم بەرهەمە مەزنانە، لە ئەنجامی هەردوو بزووتنە ساڵانە و ڕۆژانەکەی زەوییەوە بە دەوری تەوەرەی خۆی و خولگەکەیدا، مەودای ئاسانی و سروشتی بوون و ساکاریمان لە ڕێی "تاك" و "تەنیایی"دا بۆ دەردەخات و.. لە هەمان کاتیشدا ڕوونی دەکاتەوە کە چەندە ڕێی "شیرك" و "کافرێتی" پڕە لە کاری مەحاڵ و بەتاڵ و نارەوا و دوور لە ژیریی مرۆڤەوە!

**پاشان..**

فەرموو لە ڕوانگەی ئەم نموونەیەی خوارەوە، سەیری نەزانی و نەفامیی هۆپەرستان و ئەو کەسانە بکە کە دەمیان بە وشەی "سروشت" بادەدەن، تاکو بزانیت لەناو چ لیتاوێکی گەوجیدا چەقیون و، لە چ بیابانێکی وەهم و گومانیشدا سەرگەردانن و، ڕادەی بێئاگایی و دووریی ئەوانەت لە مەیدانی مەنتیق و ژیریی ساغەوە بۆ دەربکەوێت:

کارگەیەکی مەزن.. پەڕاوێکی ڕەنگین.. کۆشکێکی بنیات نراو.. کاتژمێرێکی وردکار..

بێ هیچ گومانێك ئەو کەسەی کە هەر یەك لەمانەی دروست کردووە، بەوپەڕی وردی و چاودێری و بایەخ پێدانەوە، ڕێکی خستوون و دەشتوانێت بە باشی بەڕێوەیان بەرێ و سەرپەرشتییان بکات. گومانیش لەوەدا نییە کە لە دروستکردنی هەریەك لەوانەدا مەبەستی: دەرخستنی جوانیی سنعەت و قەشەنگیی کارە ناوازەکانی بووە.

جا ئەگەر یەکێك لەو سروشت پەرست و هۆپەرستانە، بەڕێوەبردنی کارگەکەی بۆ چەرخ و جەڕ و پێچەکانی خودی کارگەکە گێڕایەوە و.. بنیاتنانی کۆشکە مەزنەکەشی بە دار و بەردەکانی خودی کۆشکەکە سپارد و.. واتا ڕەنگینەکانی پەڕاوەکەشی دایە پاڵ پیتەکانی ئەو کتێبە، ئەوا لە ڕاستیدا وەك ئەوە وایە کە هەموو بەشێکی ئەو کارگەیەی بە خاوەن توانستێکی وا مەزن لە قەڵەم دابێت کە بتوانێت خۆی و غەیری خۆیشی ڕێك بخات و.. یەك بە یەکی پیتەکانی پەڕاوەکەش، تەنانەت کاغەز و قەڵەمەکەشی کردبێت بە شتێکی دەراسا(خارق)ی ئەوتۆ کە خۆی لە نەبوونەوە بەدیبهێنێت!!

واتە بەم بۆچوونەی، جوانی و ڕێکوپێکیی کار لەناو کارگەکەدا بۆ خودی کارگەکە دەگێڕێتەوە و، قەشەنگی و بەرزیی واتا نایابەکانی پەڕاوەکەش دەداتە پاڵ یەکگرتنی خۆیی و هەڕەمەکیی پیتەکان!!

ئەمە چ وەهم و ئەندێشە و وڕێنەیەکە؟!

ئایا ئەو کەسەی وتەی وای لە زار دەردەچێت، بە چەندەها قۆناغ لە ژیریی ساغی مرۆڤەوە دوور نەکەوتووەتەوە؟!

خۆ ئەوانەی کە کاروباری "بەدیهێنان" لەم گەردوونە ناوازەیەدا بۆ "هۆکارەکان" و "سروشت" دەگێڕنەوە، دەکەونە ناوەندی نەفامییەکی قووڵ و ئاڵۆزی چەشنی ئەمەی باسمان کرد. چونکە دیاردە و ڕواڵەتەکانی: "بەدیهاتوویی" بەسەر خودی سروشت و

هۆکارەکانیشەوە بە ئاشکرا لە بەرچاودان. کەواتە ئەوانیش وەك گشت شتانی تر بەدیهاتوون و، هەرگیز بە "بەدیهێنەر" ناژمێررێن. ئەو کەسەی کە بەم شێوە ناوازەیە بەدیی‌هێناون هەر ئەویشە کە ئاسەوار و ئەنجامەکانیان بەدی‌دەهێنێت و، پێکەوە دەیانخاتە ڕوو. واتە ئەو کەسەی "تۆو"ی دروست کردووە، هەر ئەویشە کە درەختە مەزنەکەی لەسەر بنیات ناوە و، هەر ئەویشە کە بەر و گوڵەکانی ئەو تۆوە لە خونچەکانیاندا دەردەهێنێت و دەمیان دەپشکوتێنێت.

بەڵام ئەگەر بەدیهێنانی "سروشت" و "هۆکارەکان" و سەرجەمی ئاسەوارەکانیشیان نەدرێتە پاڵ خواوەندی "تاکی تەنیا" دەبێ بۆ دروستبوونی جۆرەها سروشت و هۆکاری جۆراوجۆر، چەندەها سروشت و هۆکاری ڕێکخراوی ڕێکوپێکی تر هەبن!! هەروەها بەم جۆرە، زنجیرەیەکی وەهمی و نەشیاوی دوور لە واتا و بێ کۆتایی، درێژە دەکێشێت!

ئەمەش یەکێکە لە دەرەنجامە حەتمی‌یە سەیر و سووکەکانی بیری نەفامی!!

**ئاماژەی پێنجەم:**

لە چەند شوێنێکی پەیامەکاندا و بە گەلێ بەڵگەی گومانبڕ، چەسپاندوومانە:

"سەربەخۆیی" و "تاك و تەنیایی" تایبەتمەندترینی سیفەتەکانی: "فەرمانڕەوایەتی"ن. تەنانەت ئەم مرۆڤەی کە دەستەوسان و کۆڵەوارە و، سێبەرێکی کز و لاوازی "فەرمانڕەوایەتی" نەبێ هیچی تر شك نابات، لە پێناوی پاراستنی "سەربەخۆیی" و "تەنیایی" خۆی‌دا هەتا بتوانێت بوار بە دەست تێوەردان و خۆ تێهەڵقورتاندنی کەسانی تر لە کاروباری‌دا، نادات. تەنانەت کتێبەکانی مێژوو بۆمان دەگێڕنەوە کە: زۆر پادشا هەبوون بە ناحەق خوێنی کوڕانی جگەرگۆشە و برایانی ئازیزی خۆیان ڕشتووە، تەنها لەبەر ئەوەی کە هەستیان کردووە دەست لە کاروباری "فەرمانڕەوایەتی"یەکەیاندا وەردەدەن و خۆیانی تێدا هەڵدەقورتێنن!

کەواتە "سەربەخۆیی" و "تاك و تەنیایی" دەرفەت بە دەست تێوەردانی کەسانی تر نادەن و، تایبەتی‌ترینی سیفەتەکانی "فەرمانڕەوایەتی"ی ڕاستەقینەن و لێی جیا نابنەوە، بگرە خواست و پێداویستیی هەمیشە بەردەوامی فەرمانڕەوایەتین.

لەبەر ئەم ڕاستی‌یە، "فەرمانڕەوایەتی"ی خوای گەورە کە لە ناوەندی پەروەردگاریتی‌یەکی ڕەها(مطلق)دایە، بەوپەڕی توند و تیژی دەست بە ڕووی هەموو چەشن و جۆرەکانی شیرك و هاوبەشەوە دەنێت و، جگە لە خۆی بوار بە دەست تێوەردان و خۆهەڵقورتاندنی کەسانی تر نادات. ئا لێرەوەیە کە قورئانی پیرۆز پەیتا پەیتا

بە ڕوونی و درێژی لە باسی تەوحیدی خاوێن و بێ گەرد دەدوێت و، لە شێوازێکی توند و تیژدا و بە هەڕەشەی ترسناکیش بەرپەرچی بیری هاوبەشایەتی (شیرك) دەداتەوە.

پاشان هەروەك فەرمانڕەوایەتیی خوای گەورە، کە لە ناوەندی پەروەردگاریتی‌یەکی ڕەهادایە، تا ڕادەیەکی ئاوا توندوتۆڵ داخوازی "تەوحید"ە و دەری خست کە چەندە "یەکتایی" بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتی‌یە پێویستە.. بە هەمان جۆر، ئەو ڕێسا وردەکار و لەگەڵ یەك گونجانە ناوازەیەش کە لەم گەردوونەدا دەبینرێن، هەر لە ئەستێرە و زەوی و ڕووەك و گیانداران و کانزاکانەوە تا دەگاتە شتانی هەندەکی و گشت تاك و گەردیلەکان.. هەموو یەکێکیان، شایەتێکی ڕاستگۆ و بەڵگەیەکی ئاشکرا و گومان نەهێڵن لەسەر "تاك و تەنیایی" خوای گەورە. چونکە ئەگەر هەر دەست تێوەردانێك لە لایەن غەیری خواوەندی تاك و تەنیاوە ڕووی بدایە، ئەوا ئەم ڕێسا قایم و هاوسەنگی‌یە مەحکەمەی ئێستای دەشێواند کە لە سەرجەمی گەردووندا بە چاو دەبینرێن. خوای گەورە چەندە ڕاستی فەرمووە:

﴿لَوْ كانَ فيهما آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتا﴾ (الأنبياء:٢٢)!

بەڵێ، ئەگەر هەر چەشنە دەست تێوەردانێك ڕووی بدایە، ئاسەوارەکەی دەردەکەوت، خۆ ئەو بانگەوازەی کە بە ڕاشکاوی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرى مِنْ فُطُورٍ﴾ (الملك:٣) ڕایگەیاندووە، بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی، ئەم ڕێسا ناوازەیەت پیشان دەدات، بە چەشنێ کە هیچ کەلێن و ناتەواوی و لێ تێکچوونێك لە هیچ جێیەکی گەردووندا، هەر لە گەردیلەکانەوە هەتا گەلەستێرەکان، بەدی ناکەیت.

کەواتە، ڕێسای مەحکەمی گەردوون و.. ڕێکوپێکیی ڕەنگین و ناوازەی سەرجەمی بوونەوەران و.. هاوسەنگیی وردی نێوانیان، درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الفرد"ی خوای گەورەمان بۆ دەردەخەن و، شایەتی‌یەکی ئاشکرا لەسەر "یەکتایی" خواوەند دەدەن.

پاشان بەپێی داخوازیی درەوشانەوەی "تەنیایی" خوای گەورە، هەموو بەدیهاتوویەك با زۆر بچووکیش بێت نموونەیەکی پوخت و پێرستێکی کورتکراوەی سەرجەمی ئەم گەردوونە مەزنەیە. کەواتە جگە لەو کەسەی جڵەوی گشت بوونەوەران و هەموو کاروبارێکی ناو گەردوونی بە دەستە، کەسی تر خاوەنی ئەو بوونەوەر و زیندەوەرە بچووکەش نی‌یە! جا لەبەر ئەوەی هەموو "تۆو"ێکی بچووك، لە ڕووی داهێنانکاری و ناوازەیی دروستبوونیەوە، هیچی لە "درەخت"ێکی گەورەی بالابەرز کەمتر نی‌یە و..

بەدیهێنانی گشت درەختێکی گەورە و پێ گەیشتوویش وەك بەدیهێنانی "گەردوون" وایە و.. هەموو زیندەوەرێکی بچووکیش لە حوکمی جیهانێکی بچووك کراوەدایە، ئەوا ئەم درەوشانەوەیەی "تەنیایی" خوای گەورە، دەست بە ڕووی شیرك و بوونی هاوبەشەوە دەنێت لە بەدیهێنانی هەریەك لەوانەدا و، بە بیرێکی بەتاڵ و مەحاڵی لە قەڵەم دەدات.

پاشان لە ڕووناکیی ئەم نهێنی‌یەدا دەردەکەوێت کە: گەردوون نەك هەر تەنها "کُلّ"ێکی وەهایە لەتکردن هەڵناگرێت، بەڵکو لە ماهییەتدا "کلّـــــــیّ" (واتە: هەمەکی)یشە، چونکە دابەشبوون و، هاوبەش و، لەتکردن و، دەست تێوەردانی دەستانی زۆر، قبووڵ ناکات. ئەوەتا هەموو "بەش"ێك لەم گەردوونەدا لە حوکمی "هەندەکی" و "تاك"ێکدایە و، سەرجەمی گەردوونیش بەم پێیە حوکمی هەمەکیی گرتووەتە خۆ، کەواتە لە هیچ لایەکی‌دا جێی هیچ چەشنە هاوبەشێك نابێتەوە.

ئەم درەوشانەوە هەرە مەزنەی ناوی "الفرد"ی خوای گەورە، بەم نهێنیی "تەنیایی"یەی باسمان کرد، تا ڕادەی ڕوونیی "بەڵگەنەویستی" ڕاستیی "تەوحید" دەچەسپێنێت.

بەڵێ، یەکگرتن و تێکەڵ بوونی جۆرەکانی ناو بوونەوەران لەگەڵ یەکتری‌دا و ڕوانینی کاری هەریەکەیان بۆ سەرجەمی گەردوون، هەروەك لە ڕووی بەدیهێنان و پەروەردگاریتی‌یەوە گەردوون دەکات بە "کُلّ"ێکی تەنیای ئەوتۆ کە هەرگیز لەتکردن هەڵنەگرێت، بە هەمان جۆر ئەو کارە هەمەلایەن و گشتگیرانەش کە هەموو شتێکیان گرتووەتەوە و لە سەرانسەری گەردووندا ئاسەوار و کار و لێهاتنیان پێش‌چاو دەخەن، لەو ڕووەوە کە تێهەڵکێشی یەکتری بوون، سەرجەمی گەردوون دەکەن بە یەك "کُلّ"ی تەنها و سەربەخۆی ئەوتۆ کە هەرگیز بوار بە لەتکردن نادات. وا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە ئەم نموونەیەی خوارەوە دەهێنینەوە:

هەر لەو دەمەدا کە ژیان بە زیندەوەر دەبەخشرێت، یەکسەر کاری: "ژیاندن و ڕۆزیدان" پەیدا دەبێت.. لە نێوان ئەم کاری ژیاندن و ڕۆزیدانەشدا، یەکسەر کاری: "ڕێکخستن"ی جەستە و ئەندامەکانی ئەو زیندەوەرە دەردەکەوێت و پێداویستی‌یەکانی بۆ دابین دەکرێت و بۆی دەنێررێت.. هەر لە دەماودەمی دەرکەوتنی کاری ژیاندن و ڕۆزیدان و ڕێکخستن و دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی‌دا، یەکسەر: وێنەکێشانی شێوە و ڕوخسار و، پەروەردە و، کارسازی لە جەستەی ئەو زیندەوەرەدا دەست بەکار دەبێت... بەم جۆرە... هتد..

جا ئاوێتەیی و تێهەڵکێش بوونـی ئەم کـارە هەمەلایـەنی و گشـتگیرانە و یـەکگرتنیان لەگەڵ یەکتریدا بە وێنەی حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆر.. ئنجـا گشـتگیری و هەمەلایەنـە و یـەك شـێوەیی هـەموویان لـە سـەرجەمی گـەردووندا، هـاودەم لەگـەڵ یەکبوونیان لە ماهیەتدا.. هەروەها دەرکەوتنی نیشانەی تەنیایی "بکەر" لە یـەك بە یـەکی ئـەو کارانـەدا.. هـەموو ئەمانـە، بەڵگەیەکی گەلـێ ڕوونـن لەسـەر ئـەوەی کـە بکـەری هەریەك لەو کارانە یەکێکی تاك و تەنیایە.

ئنجا هـەروەك زاڵ بوونـی هەریـەك لـەو کارانـە بەسـەر تێکـڕای بوونـەوەراندا و، یەکگرتن و هاریکاریی پتەوی لەگەڵ کارەکانی تردا، سـەرجەمی گـەردوون دەکـات بـە "کُلّ"ێکی وەها کە لەتکردن هەڵنەگرێت..

بە هەمان جۆر، هەموو بەدیهێنراوێکی زیندوو، لەو ڕووەوە کە وەك "تۆو" و پێرست و نموونەیەکی گەردوون وایە، وا لە گەردوون دەکات کە لە ڕووی بوونی پەروەردگارەوە بۆی بوار بە دابەشبوون و لەتکردن نەدات، تەنانەت دابەشـبوونی گـەردوون لـەم ڕووەوە دەکات بە کارێکی مەحاڵ و دوور لـە ئیمکـان. واتـە بەمـە دەردەکـەوێت کـە گـەردوون "کُلّ"ێکە لەتکردن هەڵناگرێت. کەواتە ئەو کەسەی پەروەردگاری "کُـــلّ" نـەبێت هـی "جوزء"یش نابێت.. هەروەها "هەمەکی"یشە، بە ڕادەیەك کە هەموو بەشێکی لە حوکمی "تـاك"ێکدایـە؛ لـەبـەر ئـەوە، ئـەو کەسـەی جڵـەوی ئـەو هەمەکی‌یـەی بـە دەستەوە نـەبێت ناشتوانێت ببێت بە پەروەردگاری هیچ تاکێك لەو هەندەکی‌یانە!

**ئاماژەی شەشەم:**

**هەروەك "تەنیایی" خوای گەورە لە پەروەردگارێتیی‌دا و "یەکتایی"ی لـە خوایـەتی‌دا: بناغەی گشت کەمالاتێك و[1]، بنچینەی هەموو ئامانجێکی بـەرز و، سەرچاوەی گشت ئەو دانستانەیە کە لە بەدیـهێنانی گـەردووندا هـەن.. بە هـەمان جۆر، ئەوپەڕی ئامـانج و دەرمانی شیفابەخشیشە سەبارەت بـە هێنانـەدیی ئـاوات و ئارەزووەکـانی هـەموو خـاوەن هەست و ژیری و شعوورێك، بە تایبەتی مرۆڤ. چونکە ئەگەر "تاك" و "تەنیایی" نەبوایە،**

---

(١) تەنانەت خودی "تەوحید"یش ڕوونترین و درەخشانترین بەڵگەیە لەسەر جوانـی و کـەماڵی خـوای گـەورە، چونکە گەر زانرا: دروستکەر و بەدیهێنەری گەردوون یەکێکی تاك و تەنیایە، ئەوا دەشـزانرێت کـە سـەرجەمی کەمالات و جوانی‌یەکانی ناو بوونەوەر چەند سێبەر و نیشـانەیەکن بۆ جۆرەهـا "کـەماڵی خـاوێن" و "جوانیـی پاك و بێ گەرد"ی ئەو بەدیهێنەرە تاك و تەنیایە. بەڵام گەر ئەو بەدیهێنـەرە تـاك و تەنیایـە نەناسرێت، گشـت ئـەو کەمالات و جۆرەها جوانی‌یانە بۆ: هۆکارە بێ هەسـت و نەستەکان و بەدیـهاتووە کوێـلەوارەکان دەگێڕرێنـەوە! ئەو کاتەش مرۆڤ لە بـەردەم گەنجینـەکانی کـەماڵ و جوانیی هەمیشـەیی‌دا دەستەوسان و سەرسام دەمێنێـت، چونکە کلیلەکانی ئەو گەنجینە هەمیشەییانەی لە کیسی خۆی داوە! (دانەر)

بلێسەی هەموو خواست و حەز و ئارەزووەکانی دەکوژایـەوە و، گشـت حیکمەتـەکانی گەردوون تیادەچوون و، زۆربەی ئەو کەمالاَتانەش کە ئێستا هەن، دەفەوتان و نەدەمان..

بۆ نموونە: ئارەزووی خۆشویستن، تەنانەت "شەیدابوونی مانەوە" ئارەزوویەکی بەتینە گەلـێ بە قووڵی لە ناخی مرۆڤدا ڕۆچووە. دەی خۆ لە ڕاستی‌دا هیـچ کەسـێك نـاتوانێت ئەم ئارەزووە قووڵ و بەتینە بۆ ئـادەمیزاد بهێنێتـە دی و لـەم ڕووەوە دڵنیـایی بداتێ، جگـە لەو کەسەی کە جڵەوی گەردوونی بەدەستە و بە هێنانەدیی قیامەت دەرگای "مانەوە" بـۆ مرۆڤی "شەیدای ژیانی هەتاهەتایی" دەخاتە سەرپشت، دوای ئەوەی کە کۆتایی بـەم دنیا فانی‌یە دەهێنێت و بەوپەڕی ئاسانیی چەشـنی داخستنی دەرگـای ژوورێـك و کردنـەوەی دەرگای ژوورێکی تر، دەرگای دنیا دادەخات و هی ئەودنیا بە ئاسانی دەکاتەوە.

چەندەها حـەز و نیـاز و ئـارەزووی زۆری تـری وەك ئەمـە هـەن کـە لـە نـاخی مرۆڤـدا ڕەگیان داکوتاوە و، هێندەش بەربلاَون کە لـق و پـەلیان بـۆ گشـت لایـەکی بوونـەوەران هاویشـتووە و کۆتایی‌یـەکی دیاری‌کراویـان بـۆ نی‌یـە. جـا ئـەم حـەز و ئارەزووانـە هـەر هەموویان بەوپـەڕی تونـدی پەیوەستی "ڕاستیی تـەوحید"ن و بـە نـهێنیی "فەردییـەت"ەوە بەستراونەتەوە. خۆ ئەگەر ئەو نهێنی‌یە نەبوایە گشت ئەو حەز و خواست و ئارەزووانـەی مرۆڤ نەزۆك و بێ ئەنجام دەردەچوون و، لەتوپـەت دەبـوون و دەپچڕان و، نەدەگەیشتنە مـەوداکانی خۆیـان.. گـەر تەنـها خواوەنـدی تـاك و تـەنیاش لـە سـەرجەمی گـەردووندا خاوەن دەسـتەلاَت نەبوایە، ئەو حـەز و ئارەزووانـە، مەگـەر بـە جۆرێکـی شـپرزە و پچڕ پچڕ و ناتـەواو، دەنـا هـەرگیز هیچیـان نەدەهاتنـە دی. کەواتـە تەنـها ئیمـان بـوون بـە "یەکتایی" و بە توانستی ڕەهای خواوەندی "فەرد"ی تاك و تـەنیا، دەتوانێـت حەوانـەوە و دڵنیایی بەو ئارەزووە بلێسە سەندووانەی ناو ناخی مرۆڤ ببەخشێت و بۆی بهێنێتە دی.

لـە پێنـاوی ئـەم نهێنی‌یـە مەزنەدایـە کـە دەبینـین قورئـانی پـیرۆز بەوپـەڕی شـیرینی و گەرموگوڕی و تاسە و شەوقەوە، لە "تـەوحید" دەدوێـت و ڕوونـی دەکاتـەوە. ئنجا هـەر لەبەر ئەم نهێنی‌یەش بووە کە گشت پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێـت - و سـەرجەمی زانایان و ئەولیا و پیاوچاکـانیش، ئـاوات و چێژی بـەرزی خۆیـان لـە گـەورەترین وتـە و گوفتاریاندا دۆزیوەتەوە کە بریتی‌یە لە: "لا إله إلاّ هُو".

**ئاماژەی حەوتەم:**

ئەم تەوحیدە ڕاستەقینەیە، بـە هـەموو پلەکانیـەوە و بـە تـەواوترین شـێوەی، حـەزرەتی محـەممەد ﷺ چەسـپاندوویەتی و ڕایگـەیاندووە و ڕوونـی کردووەتـەوە. کەواتـە دەبـێ

"پێغەمبەرایەتی"یەکەشی بە ئەندازەی چەسپاوی و بێ گومانیی "تەوحید" بێ گومان و چەسپاو بێت! چونکە مادەم تەوحید مەزنترین ڕاستیی جیهانی "بوون"ە و، هەر پێغەمبەری مەزنیش بووە ﷺ کە ڕاگەیاندنی ئەو تەوحیدەی خستووەتە ئەستۆی خۆی و، هەموو ڕاستییەکانی تەوحیدی بە خەڵکی ناساندووە و بۆی ڕوون کردوونەتەوە.. ئەوا سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە "تەوحید" دەچەسپێنن، لە هەمان کاتدا، بەڵگەی چەسپێنەریشن لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتییەکەی و، لەسەر ئەوەش کە بانگەوازەکەی لە هەموو شتێك حەق و ڕەواترە.

ئاشکرایە کە پێغەمبەرایەتییەك هەزاران ڕاستیی چەشنی ئەم ڕاستییە بەرزانەی لەخۆ گرتبێت و، پەردەی لەسەر "ڕاستیی تەوحید" هەڵدابێتەوە و، ڕێنمایی گرۆی مرۆڤی بۆ لای ئەو تەوحیدە کردبێت و شارەزای ئەو ڕێیەی کردبێت، بێ هیچ گومانێك پێغەمبەرایەتیی ئاوەها یەکێك دەبێ لە داخوازییەکانی ئەو "تەوحید"ە و خواستێکی ئەو "تەنیایی"یەی خوای گەورە.

جا ئایا کێ هەیە جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ بە باشترین شێوە و جوانترین ڕوو ئەو ئەمانەت و پێغەمبەرایەتییەی ڕاگەیاندبێت؟!

وا لێرەدا و لە نێوان ئەو بەڵگە زۆر و زەبەندە و هۆکارە جۆراوجۆرانەی کە شایەتی لەسەر مەزنیی کەسایەتیی مەعنەویی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ دەدەن و، بەڵگەی پایەبەرزیی ئەون و، دەریدەخەن کە هەر تەنها ئەو چرای ڕووناك و خۆری تیشك بەخشی ئەم بوونەوەرانەیە.. تەنها سێ نموونە باس دەکەین:

☐ بەڵگەی یەکەم:

چەندە پاداشتی کردەوەی باش دەستی یەك بە یەکی کەسانی نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت بە درێژایی هەموو ڕۆژگار و سەردەمەکان، بە وێنەی ئەو پاداشتە لە لاپەڕەی تۆماری کردەوەکانی ئەو پێغەمبەرەشدا ﷺ دەنووسرێت! چونکە بەپێی ناوەرۆکی: "السَّببُ کالفاعل" هەر ئەو هۆی سەرەکیی ئەو پاداشتانەیە بۆ نەتەوەکەی، هەتا ڕۆژی دوایی! بۆ خۆت سەرنج لەمە بدە و، پاشان بیر لەو پلەوپایە مەزن و شایستەیە بکەرەوە کە سەرجەم و کۆی ئەو دوعا و نزا و سڵاواتە گیرا و لەسنووربەدەرانە داخوازی دەبن کە ڕۆژانە لە لایەن نەتەوەکەیەوە پێشکەشی دەکرێن!!

ئەو کاتە پەی بە پلەوپایەی بەرزی ئەو دەبەیت و، تێدەگەیت کە: کەسایەتی مەعنەویی ئەو پێغەمبەرە ﷺ خۆری تیشك بەخشی بوونەوەران و چرای ڕووناککەرەوەی سەرجەمی بەدیهاتووانە.

❑ بەڵگەی دووھەم:

ژیان و، سەرچاوە و، ھۆی گەشە کردن و، تۆوی: درەختی "ئیسلام" تەنھا ڕاستیی "ماھییەتی" محەممەدییە ﷺ، لەبەر ئەو سروشتە بەرز و بەدیھاتنە کامڵەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە. جا فەرموو ئەمە لە یادتدا دابنێ و، پاشان بیر لە بەرز بوونەوەی ڕۆحیی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ بکەرەوە کە لە سەرچاوەی: ھەستکردنی کامڵ و پەی بردنی تەواوەتییەوە بە گشت واتا و پلەکانی پەرستش و زیکر و وشە پیرۆزەکانیەوە بەدەستی ھێناوە کە بە ھەموویان کاکڵە و گیانی "ئیسلام" پێکدەھێنن. بەڵێ، بیر لەمە بکەرەوە، تاکو ڕادەی پایەبەرزیی ویلایەتی "بەندایەتی"ی ئەو پێغەمبەرە ﷺ لەو پلە بەرز و بڵندەدا بزانیت کە پلەی "خۆشەویستی"یە!

ڕۆژێکیان لە سوژدەی نوێژدا خوای گەورە دەرگای لەسەر ھەندێ واتا و نووری پرشنگداری وشەی: "سبحان ربي الأعلى" لێ خستمە سەرپشت، بە شێوەیەکی نزیك لە تێگەیشتنی ھاوەڵان لەم وشە خاوێن و پیرۆزە. لەمەوە بە دڵنیایی بۆم دەرکەوت کە خێری ئەو سوژدەیەم لە پەرستنی یەك مانگ گەلێ زیاتر بووە. ئنجا ھەر لەم ڕێیەشەوە لە پایەی مەزن و پلەی بەرزی ھاوەڵان - خوایان لێ ڕازی بێت - تێ گەیشتم.

بەڵێ، ئەو تیشکی ڕووناکی و ڕێژنە نوورانییانەی کە وشە خاوێن و موقەددەسەکان لە سەرەتای ھاتنی ئیسلامدا پەخشیان کردووەتەوە، لەبەر نوێ بوونیان لەو سەردەمەدا، گەلێ تایبەتکاریی و، تەڕی و، پاراوی و، نیانی و، تام و چێژیان بووە کە بە درێژایی ڕۆژگار لە ھەست و شعووری خەڵکیدا کەم بوونەتەوە و، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەردەی بێئاگایی داپۆشیون.

ئێستا فەرموو، لەبەر تیشکی ڕووناکیی ئەوانەدا کە باس کران، بیر لە پلە و پایەی بڵندی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بکەرەوە کە: گوفتاری موقەددەسی لە سەرچاوە ھەرە خاوێنەکەی خۆیەوە وەرگرتووە و، لە ڕێی سرووش(وەحی)ی خواییەوە بە کەماڵی تازەیی و پاراوی و نیانی پەیی بە ھەموو واتا و ناوەرۆك و نوورەکانی ئەو گوفتارە بردووە، وێڕای ئەو توانست و لێھاتنە کامڵەش کە لە سروشتی خۆیدا ھەیە.

کەواتە ڕووناکی و ڕێژنە نوورانییەکانی یەك تەسبیحاتی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە ﷺ گەلێ گشتیترە و خێریشی یەکجار زیاترە لە چاو سەرجەمی ئەو نوورانەی کە لە خواپەرستیی ساڵێکی تەواوی غەیری ئەودا دەست دەکەون!

بەم پێوەرە، ھەموو پەرستشەکانی تری پێغەمبەر ﷺ لێك بدەرەوە، تاکو بزانیت بۆ چ پلە و پایەیەکی بەرز و بڵندی "کەماڵ" سەرکەوتووە و بەرز بووەتەوە!

❑ بەڵگەی سێهەم:

"مرۆڤ" مەزنترین ئامانج و مەبەستەکانی خوای گەورەیە لە بەدیهێنانی گەردووندا و، شایستەی تێگەیشتن و پەی بردنە بە گوفتاری پەروەردگار و، خواوەند لە نێوان گشت بەدیهاتووانیدا هەر تەنها ئەوی بۆ مەبەستی ئاراستە کردنی فەرمایشت و گوفتاری خۆی هەڵبژاردووە..

ئنجا لە نێوان گرۆی ئەم مرۆڤە ڕێز لێگیراوەشدا کەسێکی هەڵبژاردووە کە بە شایەتیی کردار و ئاسەوارە کاملەکانی، کاملترین و بەرزترین و مەزنترین مرۆڤە. تاکو بیکات بە نوێنەری هەموو گرۆی مرۆڤ تەنانەت سەرجەمی بوونەوەران، بۆ ئەوەی گوفتارەکانی خۆی ئاراستە بکات و، ئنجا لە ڕێی ئەو هەڵبژاردە و نوێنەرەیەوە بەوانی تریشی ڕابگەیەنێت.

بێ هیچ گومانێك، خواوەندی تاك و تەنیا و مەزن کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی خۆی ﷺ بۆ ئەم پلە و پایە شایستەیە ئامادە کردووە، ئەوەندەش "کەماڵ" و "ڕووناکی"ی پێ بەخشیوە کە سنووری بۆ دیاری نەکردبێت.

* * *

بەم جۆرە و بە وێنەی ئەم سێ بەڵگانەی پێشوو و چەندەها بەڵگەی زۆر و زەبەندەی تریش، بەوپەڕی دڵنیایی بۆمان دەچەسپێت کە:

کەسێتیی مەعنەویی پێغەمبەری ئازیز ﷺ خۆرێکی درەخشانی مەعنەوی و چرایەکی ڕووناك و تیشك بەخشی ئەم بوونەوەرانەیە. هەروەك ئایەتی هەرە مەزنی قورئانی گەردوون و، ئیسمی ئەعزەمی ناو قورئانی هەرە مەزن و، ئاوێنەیەکی ساف و بێ گەردیشە بۆ دانەوەی درەوشانەوەی یەکجار مەزنی نوورەکانی ناوی "الفرد"ی خوای گەورە.

دەسا ئەی خوای گەورە و مەزنی تاك و تەنیا و صەمەد!

لە ڕێژنە و پیت و بەرەکەتەکانی گەنجینە پڕاوپڕ و نەبڕاوەکانی میهرەبانیی خۆت و، بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی گەردوون، کە لە ژمارەی خولەك و "عاشیرە"ی کاتەکانی تەمەنی گەردوون درابێت، صەلات و سەلام بەسەر زاتی پیرۆزی ئەو پێغەمبەرە مەزنەدا ﷺ بیارێنە. ئامین.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العليمُ الحكيمُ﴾.

* * *

# سەرنجی پێنجەم

## ئیسمی ئەعزەمی

## (الحيّ)

بسمِ اللهِ الرّحمنِ الرّحيمِ

﴿فَانْظُرْ إِلى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتى وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم: ٥٠)

﴿أَللهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ﴾ (البقرة: ٢٥٥)

لە بەندیخانەی "ئەسكی شەهر" و لە مانگی "شەوال"دا، سەرنجێكی وردی ئەم دوو ئایەتە ناوبراوە و، یەكێك لە درەوشانەوەكانی نووری ئیسمی "الحـي" كە ئیسمی ئەعزەمە، یان یەكێكە لە دوو نوورەكانی ئەو ئیسمە، یاخود نوورێكە لە شەش نوورەكانی، لە ئاسۆی ژیریمدا دەركەوت. لەو كاتەشدا نەمتوانی ئەو باڵندە بەرزە بگرم، بەڵام پاش دووركەوتنەوەی شەوقە درەخشانەكەی، ناچار بووم بە دانانی چەند "هێما"یەك، كە ڕەمزی تیشكەكانی ئەو حەقیقەتە مەزن و نوورە هەرەگەورەیەن، ئاماژەی بۆ بكەم.

وا لێرەدا بە پوختی ئاماژە بۆ ئەو هێمایانە دەكەم:

**هێمای یەكەم:**

ئەو "ژیان"ە چی‌یە كە درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحـي المحـيي"ی خوای گەورەیە؟

ماهییەتەكەی چی‌یە؟

چ ئەركێكی لە ئەستۆدایە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە، لە شێوەی پێرستێكی بچووكدا و بەم جۆرەی خوارەوە پێشچاو دەخەین:

"ژیان" سەبارەت بە بوونەوەران:

* گرنگترین ئامانج و..
* گەورەترین ئەنجام و..
* درەخشانترین ڕووناکی و..
* ناسکترین هەوێن و..
* پوختترین پاڵفتە و..
* پێگەیشتووترین بەروبووم و..
* بەرزترین کەماڵ و..
* جوانترین جوانی و..
* ڕەنگینترین ئارایشت و..
* نهێنیی یەکبوونیان و..
* پەیوەندیدەری یەکێتی‌یان و..
* شوێنی سەرهەڵدانی کەمالاتیانە و..
* ناوازەترین خاوەن گیانی ناو بوونەوەرانە، لە ڕووی وردەکاری و ماهییەتەوە و..
* حەقیقەتی خاوەن ئیعجازی ئەوانە؛ چونکە بچووکترین بەدیهاتوو دەکات بە جیهانێکی سەربەخۆ و..
* جوانترین موعجیزاتی توانستی خوای گەورەشە؛ چونکە "زیندەوەر" وەکو گەردوونێکی بچووك لێ دەکات. تەنانەت دەڵێی "ژیان" هۆکارێکە بۆ جێبوونەوەی سەرجەمی بوونەوەران لەو زیندەوەرە بچووکەدا، بەوەی کە شتێکی وەك پێرستی گەردوونی مەزنی تێدا دەردەخات، هەروەك بە پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵیش بە زۆربەی بوونەوەرانەوە گرێی دەدات و دەیبەستێتەوە و..
* سنعەتێکی دەراسای خوایی‌یە؛ ئەوەتا "جوزء"ی بچووك دەکات بە گەورەترین "کولل" و، تەنانەت "تاك"یش وا لێ دەکات کە بە وێنەی شتی "کوللی" لە حوکمی "جیهان"دا بێت و، لە ڕووی پەروەردگاریێتیشەوە گەردوون وەك "کولل" و "کوللی"یەکی ئەوتۆ پیشان دەدات کە هەرگیز لەتکردن و هاوبەشایەتی و دابەشبوون نەگرێتە خۆ و..
* درەخشانترین و چەسپاوترین و تەواوترین بەڵگەیە لە نێوان ماهییەتی بوونەوەراندا، کە شایەتی دەدات لەسەر: "پێویستیی بوون"ی خواوەند و، لەسەر ئەوەش کە هەر تەنها ئەو خوایە "حەیی و قەییوم"ە و، دەشبێت بە بەڵگە لەسەر "تاك" و "تەنیایی"یەکەی و..

* ڕەوانـــترین و، پەنـــهانترین و، ئاشـــکراترین و، بەنرخـــترین و، هـــەرزانترین و، خـاوێنترین و، بریقەدارترین شێوەی سنعەتێکی حەکیمی پەروەردگاری‌یانەیە، لە ناوەندی سنعەت و بەدیهاتووە خوایی‌یەکاندا و..

* ناســکترین و نــەرمترین و وردتریــن درەوشــانەوەی میـــهرەبانیی خواوەنـــدە و، بوونەوەران دەکاتە خزمەتگوزاری خۆی و..

* لەچاو هەموو ئاوێنەکانی تر زیاتر کاروبارە خوایی‌یەکان لە خـۆدا کۆ دەکاتـەوە و پێش‌چاویان دەخات و..

* بەدیــهاتووی سەرســووڕهێنی پــەروەردگارە؛ چونکــە درەوشــانەوەکانی نــاوی: "الرحمن، الرزاق، الرحیم، الکریـم، الحکیـم" و نـاوە جوانـەکانی تـری هاوچەشنیان لـە خـۆدا کـۆ دەکاتــەوە و، حەقیقەتــە زۆر و بینراوەکــانی وەك: ڕۆزی و، دانســت و، چـاودێری و، میهرەبانی، دەکات بە شـوێنکەوتەی خۆی و پێشیان دەکـەوێت. هـەروەك کانگا و مایەی سەرهەڵدانی گشت هەست و نەستە گشتی‌یەکانی وەك: بینین و بیسـتن و هەست و شعووریشە و..

* مەکینەیەکی گەورەی خاوێن کردنەوە و، ئامێرێکی سەرسووڕهێنی گۆڕینـی شتانە لە کارگەی بوونـەوەراندا؛ چونکـە کـاری پـاکژ کـردن و خـاوێن کردنـەوەی لـە هـەموو لایــەکی بوونــەوەراندا گرتووەتـە ئەسـتۆ و، شـــتان پـــاك دەکاتـــەوە و بەرزبوونـــەوە و ڕووناکی‌یان پێ دەبەخشێت، وەك بلێـی جەستەی زینـدەوەر - کـە هێلانـەی ژیانـە - میوانخانە و قوتابخانە و سەربازگەی کاروانە یەك لە دوای یەکـەکانی گەردیلـەکان بێـت، تیای‌دا فێری ئەرکەکانی ئەستۆیان ببن و لەسەر کارەکانیان مەشق بکەن و، لـەم ڕێیـەوە ڕووناکی بەدەست بهێنن و..

* هۆکارێکە خواوەندی "حەیی" و "موحیی" جیهانی تاریك و فانی و نزمی دنیای پێ ڕووناك دەکاتەوە و، جۆرە مانەوەیەکی پێ دەبەخشێت و، بە مەکینەی "ژیان" ئەم جیهانە فانی و تاریکەی ئێرە، تەنك و ناسك و ئامادەی ڕۆشتن دەکات بەرە و جیهانی باقی و..

* پاشـان هـەردوو ڕووی ژیـان، واتـە مولـك و مەلـەکووت(دیـار و پەنـهان) سـاف و خاوێن و بەرزن و هیچ ناتەواوی‌یەکیان تێدا نی‌یە. "ژیان" بەدیهاتوویەکی تایبەت و جیایە لە هەموو بەدیهاتووەکانی تر، چونکە وەك شتانی تر هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکانی تێدا نەکراون بە پەردە لە ڕووی هەڵسوکەوتەکانی توانستی خوای گەورەدا، تـاکو ڕاستەوخۆ و بەبێ هیچ پەردە و هۆکارێك لە دەستی توانستی پەروەردگارەوە دەربچێت و..

★ حەقیقەتەکەشی نوورانی‌یە، چونکە دەڕوانێتە هەر شەش پایەکانی ئیمان و بە واتـا و هێما دەیانچەسپێنێت، واتە:

★ "بوون" و "ژیان"ی هەمیشەیی خواوەندی "واجب الوجود" و..

★ ژیانی دوارۆژ و هەتاهەتایی و..

★ بوونی مەلائیکەت، دەسەلمێنێت و.. بە تەواوەتی ڕوو دەکاتە چەسپاندنی هەر شەش پایەکانی ئیمان و دەیانچەسپێنێت و..

★ پوختترین پاڵفتەیە کە لـە سـەرجەمی گەردوونەوە پـاڵێوراوە، هـەروەك مـەزنترین نهێنیـیە بۆ بەرهەمهێنانی: شـوکر و، پەرستش و، حـەمد و، مەحەببـەت، کـە گرنگـترین ئامانجەکانی خواوەندن لە گەردووندا و، گرنگترین ئەنجامی بەدیهێنانی ئەم جیهانەشن.

* * *

سەرنج لەم بیست و نۆ "تایبەتکاری"یـە گرنـگ و بەنرخـەی "ژیـان" بـدە و، بـە وردی سـەیری ئەرکـە بـەرز و گشـتی‌یەکانیان بکـە و، پاشـان لـە پشـت نـاوی "المحـيـي"یـەوە بـۆ گەورەیی ناوی "الحيّ" بڕوانە و بزانە کە چۆن ناوی "الحيّ" لە گۆشەی ئەم تایبەتکاری‌یـە مەزنانە و لە ڕووی بەروبووم و ئەنجامەکانی ژیانەوە، دەبێـت بـە ئیسـمی ئـەعزەمی خـوای گەورە، هەروەها لەوەش تێبگە کە مادەم "ژیـان": مـەزنترین ئـەنجام و ئامـانج و بـەنرخترین بەری درەختی بەدیهاتووانە، ئەوا خاوەنی ئامـانجێکی گـەورەی بـە ئـەندازەی گـەردوونـە! چونکـە هـەروەك "بـەر" ئـەنجامی "درەخـت"ە، بە هـەمان جـۆر ئـەنجامی بـەریش، بـەهۆی تۆوەکەیەوە، درەختێکی تری داهاتووە!

بـەڵێ، ئامـانج و ئـەنجامی "ژیـان" بریتی‌یـە لـە ژیـانی هەمیشـەیی. هـەروەك یـەکێك لـە بەروبوومەکانیشـی بریتی‌یە لـە: شـوکر و، پەرستش و، حـەمد و، مەحەببـەت بەرامبـەر بەخشـەری ژیـان کـە خـواوەندی "حـەیی" و "موحیـی"یە و، ئـەم شـوکر و پەرسـتش و حەمـد و مەحەببەتەش هەروەك بەری ژیانن، ئامانجی بەدیهاتنی بوونەوەرانیشن.

ئنجـا لەمـەوە بزانـە کـە ئەوانـەی ئامـانجی ئـەم ژیـانە دەتربچێننـە نـاو: "گـوزەرانێکی خۆش و، لەزەت چەشتنێکی ئاوێتەی غەفڵەت و، ڕابواردنێکی هـەواو ئـارەزوو" ئەوانـە، لە ڕاستی‌دا، بە نەزانی‌یەکی ناشیرین و چەپەڵ، سووکایەتی بەم نیعمەتە بـەنرخ و مەزنـەی "ژیان" و دیاریی "هەست و شـعوور" و چاکـە و بەخششـەی "ژیـری" دەکـەن و، بـە کـەم بۆیـان دەڕوانـن و، ئینکـاری بـەڵکو ناشکوریشـیان لـە بەرامبـەرەوە دەنوێنـن و، بـەم کارەشیان گرفتاری کوفرانی نیعمەت و دووچاری تاوانێکی یەکجار گەورە دەبن.

**هێمای دووهەم:**

"ژیـان" مـەزنترین درەوشـانەوەی نـاوی "الحــيّ" و ناسکترین درەوشــانەوەی نـاوی "المحيي"ی خوای گەورەیە. باسکردنی پلە و سیفەت و کارمەندییەکانی - کە لە هێمای یەکەمدا پێرستەکەیان پێش‌چاو خرا - پێویستی بە نووسینی ئـەوەندە نامیلکـە دەبێـت کـە ژمارەیـان بـە ئـەندازەی ئـەو تایبەتکارییانـە بێـت. بۆیـە وا بـە پوختی ئامــاژە بـۆ چـەند دانەیەکیان دەکەین و، درێژەی باسەکەیان بـە بەشـەکانی "پەیامـەکانی نـوور" دەسپێرین، چونکـە ئـەو پەیامانـە هـەندێك لــەو ئـەرك و پلــە و تایبەتکارییانــەی "ژیــان"یــان ڕوون کردووەتەوە.

ئـەوەتا هـەردوو ڕووی "ژیـان" ڕوون و خــاوێنن و، توانسـتی پـەروەردگار هۆکــارە ڕواڵەتییەکانی تێدا نەکردوون بە پەردە لە ڕووی هەڵسوکەوتەکانی خۆیدا.

نهێنیی ئەم تایبەتکارییەش ئەمەی خوارەوەیە:

هەموو شتێکی ئەم گەردوونە "خێر" و "جوانی"ی تێدایە.. بەڵام "شەڕ" و "ناشـیرینی" دوو شتی تابلێی جوزئین و لە حوکمی دوو "یەکەی پێوانە"دان. واتە بۆیـە بـەدیهێنراون تــاکو ئــەو پلــە زۆر و زەبــەندە و حەقیقەتــە جۆراوجۆرانــە دەربخــەن کــە لــە "خــێر" و "جوانی"دا هەن. لەبەر ئەوە، لەم گۆشەیەوە "شەڕ" بە "خێر" و "ناشیرینی"ش بە "جوانی" دادەنرێـت. واتـە لـەو گۆشـەیەوە کـە هۆکـاری دەرخستنی پلـە و حەقیقەتـەکانی خـێر و جوانین.

بەڵام ئەو دیاردانەی: ناشیرینی و، شەڕ و، بەڵا و، موسیبەتەکان، کـە خـاوەن هەستان دەیانبینن، هەندێ جار دووچاری ناشکوری و سکاڵا و بێزارییان دەکـەن. لەبـەر ئـەوە، هۆکـارە ڕواڵەتیـیەکان بـە وێنـەی پـەردە لـە بـەردەم هەڵسـوکەوت و دەسـت تێوەردانـی "توانستی خوایی"دا دانراون، تاکو سکاڵای ناحەق و ڕقی ناڕەوا ڕوو نەکاتە خواوەندی "حەیی" و "قەییوم".

جگە لەمەش، هەندێ جـار ڕوانینـی ڕواڵـەتی و کـورت بینـی "ژیـری" پێـی وایـە کـە: دەستی خاوێنی توانستی خواوەند نابێت مامەڵەی ڕاستەوخۆ لەگـەڵ ئـەو شـتانەدا بکـات کە بە ڕواڵەت نزم و چەپەڵ و ناشیرین دیـارن، چونکـە دژ و پێچەوانـەی یـەکترین! لەبـەر ئەوە، هۆکارە ڕواڵەتیـەکان وەك پـەردە لـە بـەردەم هەڵسـوکەوت و دەسـت تێوەردانـی توانستی پـەروەردگاریدا دانـراون، تـاکو عیززەتی توانستی خواوەنـد لــەو دژایــەتی و نەگونجانە ڕواڵەتییە بپارێزن و خاوێنییەکەی ڕابگرن.

دەشزانین کە "هۆکارەکان" ناتوانن بۆ خۆیان هیچ شتێك بەدیبهێنن، بەڵکو ئەوان بۆ مەبەستی پاراستن و خاوێن ڕاگرتنی توانستی خوایی دانراون، تاکو سکاڵا ناحەق و بڕوبیانووە نارەواکان ڕاستەوخۆ ئاراستەی ئەوان بکرێن.

لە پێشەکیی مەقامی دووهەمی "وتەی بیست و دووهەم"دا، وتمان:

کاتێ حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - زانیی ئەو ئەرکی "گیان کێشان"ەی پێی سپێرراوە، مایەی ڕق و وەڕس بوونی ئادەمیزادە و، لە ئەنجامی ئەم کارەیدا دووچاری ڕق و بێزاریی ئەوان دەبێت، ڕووی گوفتاری کردە پەروەردگار و، وتی:

- خوایە گیان! بەندەکانت ڕقیان لەم کارەیە و، لێم وەڕس دەبن!

لە وەڵامدا پێی وترا:

- پەردەکانی: نەخۆشی و موسیبەت و بەڵا و گرفتەکان لە نێوان ئەوان و کارەکەی تۆدا دادەنێم، ئیتر تیری سکاڵا و بڕوبیانوو دەگیرێنە ئەو پەردانە، نەك تۆ!

جا بەپێی ناوەرۆکی ئەم گفتوگۆیە، ئێمەش دەڵێین:

ئەو کەسانەی کە ڕووی جوان و خەندان و ڕاستەقینەی "مردن" نابینن کە لە ئەهلی ئیمانەوە دیارە و، پەی بەو میهرەبانی‌یە پاشەکەوت کراوە نابەن کە تیایدایە، دەچن سکاڵا لە دەست مردن دەکەن، ئا لەو کاتەدا ئەرکەکەی ئەستۆی حەزرەتی عیزرائیلیان - دروودی لەسەر بێت - بە وێنەی پەردە لە بەردەمدا دەردەکەوێت! ئیتر سکاڵا نارەوا و بڕوبیانووە ناحەقەکان ڕوو ناکەنە زاتی خاوێنی "حەیی" و "قەییوم". جا هەروەك کارەکەی سەرشانی حەزرەتی عیزرائیل پەردەیە، هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکانیش، بە هەمان جۆر، پەردەن!

بەڵێ، "عیززەت" و "مەزنایەتی"ی خواوەند داخوازی ئەوەن کە لە بەرچاوی ژیریدا هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان بکرێن بە پەردەی ڕووی دەستی توانست.. بەڵام "شکۆمەندی" و "یەکتایی"یەکەشی داخوازی ئەوەن کە هۆکارەکان دەستیان بگێڕنە دواوە و هیچ کاریگەری‌یەکی ڕاستەقینەیان نەبێت!

بەڵام سەبارەت بە "ژیان"ەوە، ئەوا هەردوو ڕووی: ئاشکرا و پەنهانی (واتە ڕووی مولك و مەلەکووتی) خاوێن و تەواون و هیچ کەموکورتی‌یەکیان تێدا نی‌یە؛ نە شتێکی وەهایان تێدایە کە داخوازی سکاڵا لێکردن و بیانوو گرتن بێت، نە شتێکی ئەوتۆش کە دژی "عیززەت" و خاوێنیی خواوەند بێت، وەك: ناشیرینیی ئاشکرا و ڕواڵەتی

بێزلێکراو. لەبەر ئەوە، هەردوو ڕووەکەی "ژیان" ڕاستەوخۆ بە دەستی نـاوی "المحیی"ی زاتی حەیی و قەیيومی خواوەند سپێرراون، بێ دادانەوەی پـەردەی هۆکارەکـان لـە ڕوویاندا.

هەروەك "ژیان" وایە، "وجوود" و "ئیجاد"یش بە هەمان شێوەن. بۆیە دەبینین کە ئیجاد و بەدیهێنان ڕاستەوخۆ و بێ پەردە ڕوویان لە توانستی خواوەندی بەدیهێنەرە. تەنانەت "باران" – کە جۆرێکی ژیان و دیاریی میهرەبانیی خوایە – یاسایەکی هەمیشە و بەردەوامی نی‌یە کە کاتی بارینی دەستنیشان بکات، تاکو لە کاتی پێویستی‌دا دەستی نزا و لالآنەوەی مرۆڤ لە دەرگانەی میهرەبانی‌دا لە ئومێد و پاڕانەوە بێ بەش نەبێت. چونکە ئەگەر بە وێنەی هەڵهاتن و ئاوابوونی "خۆر" بارانیش بەپێی یاسایەکی بەردەوامی دیاری‌کراو بباریایە، ئەوا خەڵکی لە هەموو کاتێکدا بۆ باراندنی ئەو نیعمەتەی ژیان نەدەپاڕانەوە!

**هێمای سێ‌هەم:**

لە تایبەتکاریی بیست و نۆهەمدا وترا:

"ژیـان" ئاکـامی بوونەوەرانـە. هـەروەك ئـەنجامی ژیـانیش "شـوکرانەبژێری" و "خواپەرستی"یە. چونکە ئەم دوانە هۆکاری سەرەکی و ئەنجامی مەبەستی بەدیهێنانی بوونەوەرانن..

بەڵێ، خواوەندی "حەیی" و "قەیيوم" و بەدیهێنەری گەردوون، هەروەك لـە ڕێـی نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانیەوە خۆی بە زیندەوەران دەناسێنێت و لەلایان خۆشەویستی دەکات، بە هەمان جۆر داوای ئەوەشیان لێ دەکات کە لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەوە: شوکرانەبژێر بن و.. لە بەرامبەر ئەو خۆشەویستی‌یەش: خواوەندیان خۆش بوێـت و.. لـە ئاستی سنعەتە ناوازەکانی‌دا: بەجوان زانین و ستایش دەربڕن و.. لە ڕووی فەرمانـە پەروەردگاری‌یەکانیشی‌دا: گوێڕایەڵی و بەندایەتی ئەنجام بدەن.

کەواتـە بـەپێی ئـەم نهێنی‌یـە پەروەردگاری‌یـە: "شـوکرانەبژێری" و "خواپەرستی" مەزنترین ئامانجی هەموو جۆرەکانی ژیانە و، "ژیان"یش ئامانجی سەرتاسەری گەردوونـە. لەبەر ئەمەیە کە دەبینین قورئـانی پیرۆز زۆر بـە گەرموگوڕی و نەرمونیانی و سازگاری خەڵکی بۆ "شوکر" و "پەرستش" هان دەدات و، پەیتا پـەیتا دووپات و ڕوونی دەکاتەوە کە:

"پەرستش" تەنها تایبەتە بە خواوەنـدەوە و.. "شـوکر و سوپاسـگوزاری"ش تەنـها شایستەی خوای گەورەن و.. هەرچی کاروباری ناو ئەم ژیانەش هەن تێکڕا و بە تەنها لـە

دەستی هەڵسوکەوت و توانستی ئەو خوایەدان. قورئان بەم کارەی و بە ڕاشکاوییەکی تەواو نەفیی کاریگەریی ناوەند و هۆکارەکان دەکات و، "ژیان" و سەرجەم شتانی ناویشی ڕاستەوخۆ بە دەستی توانستی "حەیی" و "قەییوم" دەسپێرێت. ئەوەتا – بۆ نموونە – دەفەرموێ:

﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلافُ اللَّيْلِ والنَّهَارِ﴾ (المؤمنون:٨٠).

﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ فَإِذَا قَضى أَمراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (غافر:٦٨).

﴿فَيُحْيِي بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ (الروم:٢٤).

بەڵێ، ئەو شتەی کە لە دوای نیعمەتی "ژیان" مرۆڤ بۆ شوکرانە و سوپاس و پێزانین بانگ دەکات و هەستی مەحەبەت و ستایشی خواوەندی تێدا دەهەژێنێت، بریتییە لە: "ڕۆزی و، شیفا و، باران" و داخوازەکانی تری شوکرانە و سوپاسگوزاری..

خۆ ئەمانەش – بە وێنەی ژیان – تەنها لە دەستی خواوەندی "ڕەززاق" و "شافی" دان و، هۆکارەکان جگە لە پەردەی ڕواڵەتی هیچی تر نین. چونکە بەپێی "ڕێزمانی عەرەبی" نیشانەی: "حەصر" و "تەخصیص"ی: "هو الرزاق"، "هو الـــذي"، ئەو کارە ناوبراوانە تایبەت دەکات بەو خواوەندەوە. وەك لەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت:

﴿هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينِ﴾ (الذاريات:٥٨).

﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ (الشعراء:٨٠).

﴿وَهُوَ الَّذِي يُنَـــزِّلُ الْغَيْثُ مِنْ بَعْدِ مَا قَنَطُوا﴾ (الشورى:٢٨).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە و ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان، دەریدەخەن کە:

بەخشینی "ڕۆزی و، شیفا و، باران" تایبەتە بە خوای گەورەوە و، تەنها لە دەستی توانستی "حەیی" و "قەییوم"دایە. کەواتە ئەو کەسەی تایبەتکاریی دەرمان و چارەسەرییەکانی بەخشیوە، هەر تەنها ئەو شیفابەخشی ڕاستەقینەیە، نەك کەسی تر.

**هێمای چوارەم:**

لە بیست و هەشتەمین تایبەتکاریی(خاصية)ی "ژیان"دا وتراوە کە: "ژیان" هەر شەش پایەکانی ئیمان دەچەسپێنێت و ڕووی لێیانە و ئاماژە بۆ هاتنەدییان دەکات.

بەڵێ، مادەم حیکمەت و کاکڵە و ناوەڕۆك و گرنگترین ئەنجامی بەدیهێنانی بوونەوەران بریتی بێت لە "ژیان" (واتە: "ژیان" خاوەنی ڕاستییەکی ئاوا بەرز و بڵند

بێت) ئەوا هەرگیز جێی ئەو ڕاستی‌یە بەرزە لەم ژیانە فانی و کورت و ئازاربەخش و ناتەواوەی دنیادا نابێتەوە. بەڵکو مەزنیی ماهییەتی "ژیان" و.. هەر بیست و نۆ تایبەتکاری‌یەکەی و.. ئەو ئەندازەیەش کە مرۆڤ لە ئامانج و ئەنجامی درەختی "ژیان" پەیی پێ دەبات و.. بەروبوومە مەزن و شایانەکەی ئەو درەختە، تەنها "ژیانی هەمیشەیی دوارۆژە" کە ژیانێکە یەکپارچە بە دار و بەرد و خاك و خۆڵیەوە - لە خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی‌دا - زیندووە و دارای ژیانە. دەنا گەر وا نەبێت، دەبێ درەختی "ژیان"، کە لە خاوەن هەست و شعوورەکان بە تایبەتی لە مرۆڤدا ئەم هەموو ئامێرە زۆر و جۆراوجۆرانەی پێ بەخشراوە و تیای‌دا دانراوە، زڕ و بێ بەر و بێ سوود بێت و دارای هیچ ڕاستی‌یەك نەبێت.. مرۆڤیش - لە چاو بەختەوەریی ژیاندا - بە کلۆڵی و بەدبەختی بژی و، لە تام و چێژی ژیاندا بیست پلە لە خوارووی پلەی چۆلەکەکانەوە بێت، لە کاتێکدا کە مرۆڤ بالاترین بەدیهێنراوە و، بەڕێزترینی زیندەوەرانە و، لە سەرووی چۆلەکەیشەوە، بە بیست پلە، پایەی بۆ دیاری کراوە.

تەنانەت ئەو "ژیری"یەش کە بە نرخترین نیعمەتە بۆ ئەم مرۆڤە، هەر کە بیر لە "پەژارەکانی دێرین" و "مەترسی‌یەکانی دوارۆژی ژیان"ی دەکاتەوە، لە نیعمەت دەردەچێت و دەبێت بە مایەی بەڵا و پەرۆشی و گیروگرفت و، هەردەم ئازاری بەسۆ دەرخواردی ناخی دڵی دەدات و، تامی ساف و بێ گەردی "یەك دانە" لەزەتی ئەم دنیایەی بە "نۆ دانە" ئازار بۆ لێڵ و تەماوی دەکات!

ئەمەیە بەروبوومی "ژیان" ئەگەر تەنها پابەندی ئەم دنیایە بێت! خۆ ئەنجامی ئاوا لە سەدا سەد مەحاڵە بۆ ئەو "ژیان"ەی کە دارای ئەو تایبەتکاری‌یە ناوبراوانە بێت!

کەواتە هەر ئەم "ژیان"ەی دنیا، بەوەی کە هەرچی بەهارە سێ‌سەد هەزار نموونەی حەشرمان بۆ دەردەخات، بە چەشنێکی گومانبڕ پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بە دوارۆژ"مان بۆ دەچەسپێنێت.

ئایا دەگونجێ پەروەردگارێکی بەتوانای وا کە هەرچی پێداویستی و داخوازی ژیانت هەن و، سەرجەمی ئەو ئامێرانەی چ لە جەستەی خۆت و چ لە باخچەکەت و چ لە شارەکەتدا بۆ ژیانت پێویست دەبن، ئەو سەرجەمی ئەوانەت بۆ ئامادە و دابین بکات و، بە: "دانایی" و "چاودێری" و "میهرەبانی" لە کاتی پێویست و شیاودا بیاننێرێت، بە ڕادەیەك کە ئاگای لە ئارەزووی گەدەی تۆیە لەوەدا کە ژیان و مانەوەت بۆ مسۆگەر بکات و، گوێیشی لەو دوعا و نزا تایبەت و هەندەکی‌یەی گەدەیە کە بۆ ڕزق و ڕۆزیی

پێویست دەری دەبڕێت و، بەو خواردەمەنی‌یە بەتام و لەزەتە خۆش و لەژمارەبەدەرانە - کە لە سەرزەوی‌دا بلاوی کردوونەتەوە - گیرابوونی ئەو دوعایەی گەدەی ئاشکرا کردووە و دلنیایی پێ بەخشیوە!

ئایا دەگونجێ ئەم کارسازە بەتوانایە: تۆ نەناسێت و، نەتبینێت و، هۆکارە پێویستەکانی مەزنترین ئامانجی مرۆڤ - کە ژیانی هەمیشەیی‌یە - ئامادە نەکات و، گەورەترین و گرنگترین و گشتی‌ترین دوعا ونزای مرۆڤ کە نزای مانەوە و هەتاهەتایی‌یە، بە دروست نەکردنی ژیانی ئەودنیا و بەدی‌نەهێنانی بەهەشت گیرا نەکات و، ئەم نزا و لالانەوەیەی مرۆڤ - کە بەرزترینی بوونەوەرانی گەردوونە، بەلکو پادشا و ئەنجام و پوختەی گۆی ئەم زەوی‌یەیە - نەبیستێت، کە نزایەکە لە قوولایی ناخیەوە دەرچووە و عەرش و فەرشی هەژاندووە؟! ئایا دەگونجێ بە ئەندازەی ئەو بایەخەی کە بە دوعای گەدەی مرۆڤی دا، بایەخ بەم دوعا مەزنە نەدات و مرۆڤ ڕازی نەکات و، "دانایی" کامڵ و "میهرەبانی"ی ڕەهای خۆیشی ڕووبەڕووی ئینکاری لێ‌کردن بکاتەوە؟ نەخێر.. هەزار هەزار جار نەخێر.

ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەو خواوەندە بەتوانایەی کە کزترین دەنگی نزمترین بەش لە ژیاندا ببیستێت و، گوێ لە سکالای ڕابگرێت و، پاشان بە هانایەوە بڕوات و، بە نەرمونیانی ڕەفتاری لەگەڵدا بنوێنێت و، بە گرنگی‌یەکی لەڕادەبەدەر و چاودێری‌یەکی تەواو، پەروەردە و سەرپەرشتیی بکات و، گەورەترین بەدیهێنراوانی گەردوونیشی بۆ ژێربار بخات.. کەچی هەر ئەو خواوەندە بەتوانایە گوێی لە دەنگێك نەبێت کە وەك نەعرەتەی هەوری ئاسمان وایە و، داوای گەورەترین و بەرز و بالاترین و نەرمونیانترین و بەردەوامترین ژیان دەکات؟

ئایا دەچێتە عەقڵەوە بایەخ بە دوعا گرنگەکەی نەدات کە دوعای مانەوەیە و، ئاوڕی میهرەبانی لە تکا و نزا و لالانەوەکەی نەداتەوە و، وەك ئەو کەسەی لێ بێت کە بەوپەڕی بایەخ پێدان و چاودێری‌یەوە تەنها یەك سەرباز پڕچەك بکات و کەرەسە و تفاقی پێویستی بۆ فەراهەم بهێنێت، بەلام چاودێریی سوپایەکی گەورە و زۆری خۆی نەکات؟ یان وەك ئەو کەسەی کە گەردیلەیەك ببینێت، بەلام خۆر نەبینێت؟ یان وەك ئەوەی دەنگی ویزەی مێش ببیستێ، بەلام نەعرەتەی هەوری ئاسمان نەبیستێ؟! نەخێر.. هەزار هەزار جار نەخێر..

ئایا بە هیچ جۆرێ دەچێتە عەقڵەوە کە خواوەندی بەتوانای، دانای، خاوەنی میهرەبانیی فراوان و خۆشەویستیی لەسنووربەدەر و بەزەیی گشتی کە سنعەتی خۆی گەلێ خۆشدەوێت و، بەم سنعەتەشی خۆی لە لای بەدیهێنراوانی خۆشەویست دەکات.. ئەم خوایەی کە سەبارەت بەوانەی خۆشیاندەوێت ئەم ئەوانی زیاتر خۆشدەوێتەوە.. ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەم خواوەندە لەناو هەموو بەدیهێنراوانیدا "ژیان"ی کەسێك بە تەواوەتی لەناو ببات کە هەر ئەوە لەچاو ئەوانی تردا پتر خوای خۆشدەوێت و، خۆشویستراوی خوای گەورە خۆیەتی و، شایستەی خۆشویستنە و، هەر بە سروشت بەدیهێنەری خۆی دەپەرستێ؟.. هەروەها کاکڵەی "ژیان"یش کە "ڕۆح"ە، بە: مردنی هەمیشەیی و ئیعدامی هەتاهەتایی لەناوببات و، وەڕسی و بێزاری بخاتە نێوان خۆی و خۆشەویستانیەوە و، ئازارێکی سەختیان دەرخوارد بدات و، بەم کارەش نهێنیی "میهرەبانی" و نووری "خۆشەویستی"ی خۆی گرفتاری ئینکاری کردن بکات؟!

نەخێر.. سەد هەزار جار نەخێر.. چونکە بێ هیچ گومانێك: ئەو "جوانی‌یە ڕەها"یەی کە بە درەوشانەوەی خۆی ئەم گەردوونەی ڕازاندووەتەوە و.. ئەو "میهرەبانی"یەش کە سەرجەمی بوونەوەرانی دڵخۆش کردووە و ئارایشتی داون.. ئەم دوانە، تابڵێی لەم توندوتیژی و، سەختی و، ئەنجامە ناشیرین و ستەمە ڕەهایە دوور و خاوێنن.

ئەنجام: مادەم لە دنیادا "ژیان" هەیە، ئەوا بێ هیچ گومانێك، ئەو مرۆڤانەی پەی بە نهێنیی "ژیان" دەبەن و بە هەڵە نایخەنەکار، شایستەی "ژیانێکی" هەمیشەیی ناو خانە و بەهەشتێکی هەتاهەتایین.. آمنا.

* * *

پاشان هەروەك پرشنگدانەوەی مادە بریسکەدارەکانی سەر ڕووی زەوی و کەف و بڵقەکانی سەر ڕووی دەریاکان و، ئنجا کوژانەوەی پرشنگ و بریسکانەوەکانیان بە نەمانی ئەو بڵق و کەفانە و، پاشان بریسکانەوەی ئەوانەی کە دوای خۆیان دێن، بە چەشنێ کە وەك بڵێی هەموویان ئاوێنەی چەند خۆرێکی میسالی بن. هەروەك ئەمانە، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی، دەریدەخەن کە سەرجەمی ئەو بریسکانەوە یەك لە دوای یەکانە درەوشانەوەی تیشکی تەنها یەك "خۆر"ی بەرز و مەزنن و، بە چەندین زمانی جیاجیا یادی خۆر دەکەنەوە و، بە پەنجە نوورانی‌یەکانیان ئاماژە بۆ ئەو خۆرە دەکەن..

هەروەك ئەم مادە بریسکەدارانەی سەر ڕووی وشکایی و دەریاکانی زەوی ئەم ڕاستی‌یەیان بەدەستەوە دا.. بە هەمان جۆر، بریسکانەوەی "ژیان" - بەهۆی توانستی

خوای گەورە و درەوشانەوەی ناوی: "المحيي"ی ئەو - لە هەموو گیاندارانی سەر ڕووی زەوی و دەریاکانیدا و، پاشان ون بوونی ئەو خاوەن ژیانانە و ئاوابوونیان لە پشتی پەردەی غەیبەوە، تاکو دوای ئەنجامدانی زیکری: "یا حيّ" بڕۆن و، بواری هاتن بەوانەی دوای خۆیان بدەن.. هەموو یەکێك لەمانە، شایەت و ئاماژەیەکی بێ گومانن لەسەر "بوونی ژیانی هەمیشەیی" و "پێویستیی بوونی خواوەندی زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون".

هەروەها هەموو ئەو بەڵگانەی شایەتی "زانست"ی خوای گەورەن، ئەو زانستەی کە لە ڕێکخستنی کاروباری بوونەوەراندا ئاسەوارەکانی بە ئاشکرا دەبینرێن..

سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە "توانست"ی کارگێڕ و کارسازی خوای گەورە لە گەردووندا دەچەسپێنن..

گشت ئەو بەڵگانەی "ویست"ی خواوەند دەچەسپێنن، ئەو ویستەی کە بەسەر ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری گەردووندا زاڵ و فەرمانڕەوایە..

هەموو ئەو نیشانە و موعجیزاتانەی "ناردنی پێغەمبەران" - دروودیان لەسەر بێت - دەچەسپێنن، کە ناردنی ئەوانیش - خۆی لە خۆیدا - خولگە و بەڵگەی سیفەتی: "گوفتاری پەروەردگاری و وەحیی خوای گەورە"یە..

سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە شایەتن لەسەر هەر حەوت سیفەتە مەزنەکانی خوای گەورە..

هەموو ئەو بەڵگە ناوبراوانە، هەروەك شایەتن لەسەر هەموو یەکێك لەوانەی باس کران، بە هەمان جۆر و بە یەکدەنگی، شایەت و بەڵگەیشن لەسەر: "ژیان"ی خواوەندی "حيّ" و "قيّوم" واتە: زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون.

چونکە هەر شتێك خاوەنی "بینین" بێت، دەبێ خاوەنی "ژیان"یش بێت.. گەر "بیستن"یشی هەبێ، ئەوە دیارە نیشانەی "ژیان"ە.. خۆ گەر "قسە" بکات، قسەکەی ئاماژەی بوونی "ژیان"یەتی.. گەر خاوەنی "ویست" و ئیختیاریش بێت، ئەوە دیاردەی "ژیان"ە..

بەم جۆرە، هەموو بەڵگەکانی ئەو سیفەتە مەزنانەی خوای گەورە، کە ئاسەواریان بە ئاشکرا دەبینرێت و بە بێ گومانی بوونی ڕاستەقینەیان دەزانرێت، چەشنی: توانستی ڕەها و، ویستی شامیل و، زانستی گشتگیر، هەموویان بەڵگەن لەسەر "ژیان"ی خواوەندی زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون و، لەسەر "پێویستیی بوون"ی و، شایەتن

لەسەر بوونی ئەو "ژیانە هەمیشەیی"یەی پەروەردگار کە تەنها بە یەك دانە تیشكی خۆی سەرجەمی گەردوونی ڕووناك کردووەتەوە و، بە یەك دانە درەوشانەوەشی، ژیانی بە سەرتاپای ئەودنیا بەخشیوە، بە هەموو گەردیلەکانیەوە!

* * *

"ژیان" - بە هەمان جۆر - دەڕوانێتە پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بە مەلائیکەت" و، دەبێت بە بەڵگە بۆی و، بە هێما دەیچەسپێنێت. چونکە:

مادەم "ژیان" گرنگترین ئەنجامی گەردوون بێت و.. "ژیانداران"یش لەبەر نرخ و بەهای بەرزیان لە هەموو بەدیهاتووان پتر بڵاو بن و زیاتر پەرەبسێنن و زۆر ببن و، هەر ئەوانیش بن کە یەك لە دوای یەك و کاروان لە دوای کاروان بۆ ناو ئەم میوانخانەیەی دنیا بێن و دنیا بەوان ئاوەدان ببێتەوە و شادی و دڵخۆشی ببەخشێت و..

مادەم گۆی زەویش شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەم لافاوی زیندەوەرانەیە و.. هەمیشە بەپێی حیکمەتی: نوێ کردنەوە و وەچەخستنەوە و زۆر بوونی بەردەوامیان، ئەم زەوی‌یە لەوان پڕدەکرێت و خاڵییش دەکرێتەوە و.. هەردەم لە شتانی بێ‌نرخ و گەنیویش گیانداری زۆر و زەبەندە بەدی‌دەهێنرێت، بە ڕادەیەك کە گۆی زەوی بووە بە پیشانگایەکی گشتی بۆ سەرجەمی زیندەوەران و..

مادەم کاکڵە و پوختەی "ژیان" کە بریتی‌یە لە: "هەست و شعوور"و "ژیری" و "ڕۆح" - ئەو ڕۆحەی کە شتێکی نیانە و دارای جەوهەرێکی دامەزراوە - بە زۆری‌یەکی لەڕادەبەدەر لەسەر ئەم زەوی‌یەدا بەدی‌دەهێنرێن، بە چەشنێ کە دەڵێی خودی گۆی زەویش دارای ژیانە و بە "ژیان" و "ژیری" و "هەست و شعوور" و "گیان" ڕازاوەتەوە..

مادەم هەموو ئەمانە وان، ئەوا هەرگیز ناگونجێ قەبارەکانی ئاسمان کە لەچاو زەوی‌دا پتر نیان و زیاتر ڕووناکن و دارای گرنگی‌یەکی گەلێ مەزنترن، بێ "گیان" و "ژیان" و "هەست و شعوور" بن! کەواتە، ئەوانەی وان لە ئاسمانەکاندا و، ئەوێ ئاوەدان دەکەنەوە و، شادی و زیندەیی بە خۆر و ئەستێرەکان دەبەخشن و، ئەنجام و بەری بەدیهاتنی ئەو ئاسمانانەن و، لەوێ‌دا شەرەفمەندی گوفتاری خواوەند دەبن.. هەموو ئەوانە، چەند خاوەن "هەست و شعوور" و "ژیان"ێکن و، سەرنشینی لەبار و شیاوی

ئاسـمانەکان و بـەهۆی نـهێنیی "ژیـان"ەوە لـەوێ ئـامادەن. ئـەوانەش بریتـین لـە: "مەلائیکەت".

* * *

هەروەها نهێنی و ماهییەتی "ژیـان" دەڕوانێتە پایەی ئیمـانیی: "بـاوەڕ بە پێغەمبەران، دروودیان لەسەر بێت" و، بە هێما دەیچەسپێنێت.

بەڵێ، مادەم گەردوون لە پێنـاوی "ژیـان"دا بەدیهێنراوە و، "ژیـان"یـش گـەورەترین درەوشـانەوە و، تـەواوترین نەخشـونیگار و، جوانـترین سنعەتی خواوەنـدی "حـــيّ" و "قيّوم"ە و..

مادەم "ژیانی هەمیشەیی" ئەو خواوەندەش بە نـاردنی پێغەمبـەران - درووديـان لەسـەر بێت - و نازڵ کردنی کتێبەکان، خۆی ئاشکرا دەکـات، چونکـە ئەگـەر "پێغەمبـەران" و "کتێبـەکانیان" نەبوونایـە هـەرگیز "ژیــانی ئەزەلــی"ی خواوەنديـش نـەدەزانرا. ئـەوەتا هـەروەك قسـە و ئاخـاوتنی هـەر کەسێك، زیندوویـی و ژیـانی ئـەو کەسـە دەردەخـات، پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - و کتێبەکانیشیان بە هەمان جـۆرن، ڕوونکـەرەوە و بەڵگەن لەسەر ئـەو خـاوەن گوفتـار و قسـەکەرە زینـدووەی کـە بـە وشـە و گوفتارەکـانی خـۆی لـە پشـت پـەردەی غـەیبی داپۆشـراوی پشـت پـەردەی گـەردوونـەوە، ئـەمر و نەهییەکانی ڕادەگەیەنێت.

کەواتە ئەو "ژیان"ەی وا لە گەردووندا، بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر "زیندوویـی" و "پێویستیی بوونی" زیندووی ئەزەلـی کە خـوای گەورەیـە. هـەروەك تیشـکەکانی "ژیـانی ئەزەلــی"ی خـوای گـەورە و درەوشانەوەکانیشی، بۆ هـەموو ئەو شـتانە دەڕوانـن کـە وابەستەی ئەو "ژیانە ئەزەلـی"یەن وەك پایەکانی ئیمان، چەشـنی: "نـاردنی پێغەمبـەران" و "نـازڵ کردنـی کتێبـەکان" و، ئـەم دوانـە بـە هێمـا دەچەسپێنن، بـە تایبــەت پێغەمبــەرێتیی "حـەزرەتی محەمـەد ﷺ" و "وەحـی"ی قورئـانی پیرۆز. چونکـە دەتوانرێـت بوتـرێ: "ئـەم دوانە بە ئـەندازەی ژیـان چەسپاون". چونکـە هـەردووکیان - کتومـت - وەك "ڕۆح" و "عەقڵ" و "ژیان" وان.

بەڵێ، هەروەك "ژیان" پوختەیەکی داچۆڕاوی ئەم گەردوونەیە و..

"هەست و شعوور"یش چەند نمێکن لە ژیانەوە داچۆڕاون و پوختەی ژیانن و..

"ژیری"یش لە هەست و شعوورەوە داچۆڕاوە و پوختەی هەست و شعوورە و..

"گیان"یش پوختە و کاکڵەی بێگەرد و خاوێن و، زاتی سەربەخۆی ژیانە..

هەروەك ئەمانە وان، بە هەمان جۆر "ژیان"ی - ماددی و مەعنەویی - حەزرەتی محەممەدیش ﷺ نم نم لە "گیان"ی گەردوون و پێغەمبەرایەتی‌یەکەیشی لە "هەست و نەست و شعوور" و "ژیری"ی گەردوونەوە داچۆڕاون و پوختەی خاوێن و بێ گەردی ئەو گەردوونەن. تەنانەت ژیانی ماددی و مەعنەویی حەزرەتی محەممەد ﷺ - بە شایەتیی ئاسەوارەکانی ژیانی - "ژیانی گەردوون"ە و.. پێغەمبەرایەتی‌یەکەشی هەست و شعووری "شعووری گەردوون"ە و.. وەحیی قورئانی پیرۆزیش - بە شایەتیی ڕاستی‌یە زیندووەکانی - "گیان"ی ژیانی گەردوونە و، "ژیری"ی هەست و شعووریەتی!..
بەڵێ.. بەڵێ.. بەڵێ..

خۆ ئەگەر "نووری پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ" گەردوون بەجێ بهێڵێت، ئەوا سەرتاپای گەردوون و بوونەوەران دەمرن و گیان لەدەست دەدەن و.. گەر "قورئانی پیرۆز"یش ماڵئاوایی لێ بکات و دوور بکەوێتەوە، ئەوا گەردوون بە جارێ شێت دەبێت و، گۆی زەوییش هاوسەنگیی خۆی لەدەست دەدات و، بێ هەست و نەست دەمێنێتەوە و، لە تاوا خۆی بە هەسارەیەکی گەڕۆکی ئاسماندا دەکێشێت و، قیامەت بەرپا دەبێت!

* * *

هەروەها "ژیان" دەڕوانێتە پایەی ئیمانیی: "باوەڕ بە قەدەر" و، دەبێت بە بەڵگە لەسەری و، بە هێما دەیچەسپێنێت.

چونکە مادەم "ژیان" ڕووناکیی جیهانی بینراو بێت و.. هەموو لایەکی ئەم جیهانەی گرتبێتەوە و بەسەریدا زاڵ بووبێت و.. ئەنجام و ئامانجی "بوون" و.. فراوانترین ئاوێنەی درەوشانەوەکانی بەدیهێنەری گەردوون و.. تەواوترین پێڕست و نموونەی کارایی(فعّالیة)ی خوای پەروەردگار بێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی "ژیان" چەشنە پلان و پرۆگرامێکە بۆ ئەو "کارایی"یەی پەروەردگار، گەر ئەم تەشبیهە دروست بێت..

مادەم وایە، ئەوا نهێنیی "ژیان" داخوازی ئەوەیە کە بە هەمان جۆر "جیهانی پەنهانی غەیب"یش واتە: ڕابوردوو و ئاینده، بە واتایەکی تر: بوونەوەرانی پێشین و پاش ئێستاش، دارای ڕێسا و ڕێکوپێکی بن و، زانراو و، بینراو و، دەستنیشان کراو و، ئامادەی جێبەجێ کردنی فەرمانە تەکوینی‌یەکانی خواوەند بن. واتە: لە حوکمی ئەوەدا بن کە دارای "ژیانێکی مەعنەوی" بن، چەشنی "تۆو"ی ئەسڵی درەخت و "ناوك" و

"بەرەکان"ی کە لە کۆتایی پەلەکانی‌دان و دارای چەند تایبەتکاری‌یەکی "جۆرە ژیانێکی" تایبەتیی کتومت وەك "ژیان"ی درەختەکەیانن، بگرە هەندێ جار ئەو تۆوانە چەند یاسایەکی گەلێ وردتر لە هی "ژیانی خودی درەختەکە" لە خۆیاندا هەڵدەگرن.

جا هەروەك ئەو تۆوانەی کە بنەچەی درەختن و پایزی پێشوو بەجێی هێشتن و، ئەو تۆوانەش کە ئەم بەهارە نوێیە پاش خۆی بەجێیان دەهێڵێت، بەپێی چەند یاسایەکی لەمەڕ "ژیان" دەڕۆن و ڕووناکیی "ژیان" لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن، چەشنی ئەو "ژیان"ەی کە ئەم بەهارە هەڵی گرتووە.. درەختی بوونەوەرانیش بە هەمان جۆرە، هەموو پەل و لقێکی دارای ڕابوردوو و داهاتووی خۆیەتی و خاوەنی زنجیرەیەکی وەهایە کە لە چەندین بارودۆخی ڕابوردوو و داهاتوو پێکهاتووە و، هەموو جۆر و بەشێکیشی لە زانیاریی خوای گەورەدا خاوەنی چەند "بوون"ێکە بە چەند تەرزێکی جیاجیا. بەمەش زنجیرەی بوونی زانستی (الوجود العلمي) پێکدەهێنن. ئەم بوونە زانیاری‌یەش کە لە بوونی دەرەکی دەچێت، جێی لێ درەوشانەوە و، لێ‌دەرکەوتنی مەعنەویی ژیانە گشتی‌یەکەیە، چونکە ئەو چارەنووسانەی کە بۆ "ژیان" تەقدیر کراون لەو لەوحە قەدەری‌یە مەزنە پڕ واتایانەوە وەردەگیرێن.

بەڵێ، پڕبوونی "جیهانی ڕۆح" - کە جۆرێکی جیهانی غەیبە - لەو ڕۆحانەی کە لە ڕاستی‌دا: خود و مادە و کاکڵە و زاتی "ژیان"ن، داخوازی ئەوەیە: ڕابوردوو و داهاتوویش - کە جۆرێك و بەشێکی تری جیهانی غەیبن - "ژیان"یان تێدا بدرەوشێتەوە.. هەروەها ڕێکوپێکیی کامڵ و تەواوەتیی بار و شێوە پڕ واتا نیان و ناسکەکانی "بوونی زانستی"ی خوایی بۆ هەر شتێك و، ئەنجام و قۆناغە زیندەکارەکانی، دەری‌دەخەن کە ئەو شتە شایانی جۆرە ژیانێکی مەعنەوی‌یە.

بەڵێ، ئەم چەشنە درەوشانەوەیە، واتە درەوشانەوەی "ژیان" کە لە ڕاستی‌دا ڕووناکیی خۆری "ژیانی ئەزەلی"یە، تەنها بەم جیهانە بینراوە و بەم کاتەی ئێستا و لەم بوونە دەرەکی‌یەدا بەند نی‌یە، بەڵکو هەموو یەکێك لە جیهانەکان - هەریەکەیان بەپێی لێهاتنی خۆی - ئەو ڕووناکی‌یەی ژیانی تێدا دەردەکەوێت.

کەواتە سەرجەمی گەردوون بە هەموو جیهانەکانیەوە، بە لێ‌دەرکەوتن و درەوشانەوەی خۆری "ژیانی ئەزەلی" بووە بە گەردوونێکی زیندوو و تیشك بەخش و ڕووناك. دەنا هەموو یەکێك لەو جیهانانە، لە ژێر پەردەی ئەم دنیا کاتی و ڕواڵەتی‌یەدا،

دەبن بە تەرمێکی زەبەلاحی سامناك و جیهانێکی کاولی تاریك، وەك ئەوەی کە گومڕایانی بێبەش لە نووری ئیمان دەیبینن.

بەم جۆرە، مرۆڤ لە ڕێی نهێنیی "ژیان"ەوە، لە ڕوویەکی "ئیمان بە قەدەر" تێدەگات و، بەو نهێنی‌یەی "ژیان" ئیمان بە "قەدەر"ی لە لا دەچەسپێت و بۆی ڕوون دەبێتەوە. واتە هەروەك زیندەیی "جیهانی بینراو" و بوونەوەرەکانی کاتی "ئێستا" بە ڕێکوپێکی‌یان و ئەنجامەکانیان، دەردەکەوێت.. بە هەمان جۆر، بوونەوەرەکانی "پێشین" و ئەوانەش کە "لەمەولا" دێن و بە "جیهانی پەنهانی غەیب" دادەنرێن، دارای بوونێکی زیندووی مەعنەوی و خاوەنی چەسپاوی‌یەکی زانستیی گیاندارن، بە چەشنێ کە بەناوی "مقدّرات"ەوە، ئاسەوارەکانی ئەو ژیانە مەعنەوی‌یە، لە ڕێی لەوحی قەزا و قەدەرەوە دەردەکەون و ئاشکرا دەبن.

**هێمای پێنجەم:**

لە شازدەهەمین تایبەتکاریی "ژیان"دا وترا:

هەر ئەوەندەی "ژیان" دەچێتە ناو شتێکەوە، یەکسەر دەیکات بە جیهانێکی سەربەخۆ. چونکە هێندە "جامیعییەت"ی پێ دەبەخشێت کە ئەگەر "جوزء" بێت بیکات بە "کولل" و گەر "جوزئی"یش بێت بیکات بە "کوللی"!

کەواتە ژیان ئەوەندە جامیعییەتی تێدایە کە بتوانێت زۆربەی ئەو ناوە جوانانەی خواوەند لە خۆی‌دا دەربخات کە بە ڕووی سەرجەمی بوونەوەرانەوە دەدرەوشێنەوە؛ دەڵێی "ژیان" ئاوێنەیەکی گشتیی وەهایە کە درەوشانەوەکانی "ئەحەدییەت"ی خواوەند دەردەخات. چونکە هەر ئەوەندەی "ژیان" دەچێتە ناو هەر لەشێکەوە یەکسەر دەیکات بە جیهانێکی بچووك و، دەڵێی وەك تۆوێکی ئەوتۆی لێ دەکات کە پێڕستی درەختی بوونەوەرانی لەگەڵ خۆ هەڵگرتبێت. جا هەروەك "تۆو" جگە لە ئاسەواری توانستی بەدیهێنەری درەختەکە زیاتر هیچی تر نی‌یە، بە هەمان جۆر ئەو کەسەش کە بچووکترین زیندەوەری بەدی‌هێناوە دەبێ هەمان بەدیهێنەری سەرجەمی گەردوون بێت!

ئەم ژیانە، بەم جامیعییەتەی خۆی، پەنهانترین و وردترینی نهێنی‌یەکانی "ئەحەدییەت" لە خۆی‌دا دەردەخات. واتە هەروەك "خۆری مەزن" بە: ڕووناکی و حەوت ڕەنگەکانی و تیشکدانەوەی لە هەموو پارچە شووشە و دڵۆپە ئاوێکی بەرامبەری‌دا دەردەکەوێت.. بە هەمان جۆر، هەموو زیندەوەرێکیش سەرجەم درەوشانەوەکانی ناوە

جوانەکان و نوورەکانی سیفەتە خواییەیە گەردوون گیرەکانی تێدا دەردەکەوێت. جا "ژیان" – لەم گۆشەیەوە – وا دەکات لە گەردوون کە لە ڕووی "ڕبووبییەت" و "ئیجاد"ەوە لە حوکمی "کوللی"یکی ئەوتۆدا بێت لەتکردن و دابەشبوون هەڵنەگرێت و، دەیخاتە حوکمی "کوللی"یەکی وەهایش کە لەتبوون و هاوبەشایەتی نەگرێتە خۆ!

بەڵێ، ئەو مۆرەی کە بەدیهێنەر لە ڕوخساری تۆی مرۆڤی داوە، بە ڕوونی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەری تۆ بەدیهێنەری سەرجەم هاوڕەگەزەکانی تۆیشە، چونکە ماهییەتی مرۆڤانەی هەمووتان هەر یەکێکە و دابەشبوونی ئەو ماهییەتە هەرگیز لە توانادا نییە و کارێکی مەحاڵە. بەشەکانی گەردوونیش بە هەمان جۆر، چونکە ئەو بەشانە بەهۆی "ژیان"ەوە وەك تاکەکان(أفراد)ی بوونەوەرانە و.. بوونەوەرانیش بە وێنەی جۆر(نوع)ی ئەو تاکانەیان لێ هاتووە.

پاشان هێندە کاری دەراسای سنعەتی پەروەردگاری و موعجیزاتی داهێنانی ڕوون و ئاشکرا لە "ژیان"دا هەن کە ئەگەر کەسێك نەتوانێت سەرجەمی گەردوون بەدی بهێنێت، بە تەواوەتی لە بەدیهێنانی بچووکترین زیندەوەری ناو گەردوونیشدا دەستەوسان دەبێت.

بەڵێ، ئەو قەڵەمەی کە پێڕست و موقەددەراتی درەختی زەبەلاحی سنەوبەر لە تۆوە بچووکەکەیدا دەنووسێت – بە وێنەی نووسینەوەی هەموو قورئان لەسەر دەنکە نۆکێك – هەمان قەڵەمە کە لاپەڕەکانی ئاسمانیشی بە ئەستێرە درەخشانەکان ئارایشت داوە..

هەروەها ئەو کەسەی توانا و لێهاتنێکی وەهای لە سەری بچووکی "هەنگ"دا داناوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت گشت گوڵەکانی ناو باخچەکانی جیهان بناسێت و، بتوانێت پەیوەندی لەگەڵ زۆربەیاندا ببەستێت و، بەتامترین دیاریی میهرەبانیی خواوەند – کە هەنگوینە – پێشکەش بکات و.. هانی "هەنگ" بدات کە هەر لە یەکەم هەنگاویەوە بۆ ناو "ژیان" فێری مەرجەکانی ژیانی ببێت.. بێ گومان ئەو کەسەی ئەم لێهاتنە فراوان و توانا مەزن و کۆئەندامە وردانەی لە هەنگدا داناوە، هەر ئەو کەسەیە کە بەدیهێنەری سەرجەمی گەردوونە!

**بە کورتی:**

"ژیان" نیشانەیەکی درەخشانی "تەوحید"ە بەسەر ڕوخساری بوونەوەرانەوە و.. هەموو گیاندارێکیش – لە ڕووی ژیانەکەیەوە – نیشانەیەکی "ئەحەدییەت"ە و.. ئەو

سنعەتە وردەش کە لە هەموو تاك و دانەیەکی زیندەوەراندا هەیە مۆری "صەمەدییەت"ە بە سەریانەوە.. بەم جۆرە، هەموو زیندەوەران، بە مۆر و جێ پەنجەکانیان، تەسدیقی ئەم نامەیەی گەردوون دەکەن و، ڕایدەگەیەنن کە: لە لایەن خواوەندی "حەیی" و "قەییوم"ی "تاك" و "تەنیا"وە هاتووە!

کەواتە هەموو یەکێکی زیندەوەران مۆرێکی وەحدانییەتە بەو نامەیەوە، هەروەك مۆری ئەحەدییەت و صەمەدییەتیشە بەسەریەوە.

بەڵێ، "ژیان" لە ڕاستیدا بریتییە لە: مۆر و جێ پەنجەی "گیاندار" و "زیندوو"ی بە ئەندازەی ژمارەی جوزئییات و دانە دانەی زیندەوەران، کە بە هەرهەموویان شایەتی لەسەر: یەکتایی خواوەندی حەیی و قەییوم دەدات. هەروەك کاری "ژیان بەخشین"یش بە ئەندازەی ژمارەی یەك بە یەکی زیندەوەران، مۆری تەسدیق لەسەر "تەوحید"ی خواوەند دەنەخشێنێت.

ئەوەتا "ژیاندنەوەی زەوی" کە تەنها یەك نموونەی زیندووکردنەوەیە، شایەتێکی ڕاست و درەخشانی وەك خۆرە لەسەر "تەوحید"، چونکە زیندووکردنەوەی زەوی لە بەهاردا، لە ڕاستیدا مانای زیندووکردنەوەی دانە دانەی جۆرە لەژمارەبەدەرەکانی زیندەوەرانە کە لە سێ سەد هەزار جۆر زیاتر دەبن. دەبینیت هەموویان پێکەوە و بێ ناتەواوی و کەموکووڕی و بە چەشنێکی تێهەڵکێش و ڕێکوپێك و تەواوکەری یەکتری زیندوو دەکرێنەوە. جا ئەو کەسەی کە بەم تەنها کارە چەندین کاری ڕێکوپێکی بێ سنوور ئەنجام دەدات، تەنها ئەو کەسەیە کە بەدیهێنەری سەرجەمی بەدیهاتووانە و، هەر ئەویش ئەو حەیی و قەییومەیە کە سەرانسەری زیندەوەران دەژیێنێت و، هەر ئەوە تاك و تەنیایە و لە پەروەردگارێتییەکەیدا هەرگیز هاوبەشی نییە!

بەم ئەندازە کەم و پوختە، وازمان لە باسکردنی تایبەتکارییەکانی "ژیان" هێنا و، باسکردنی تایبەتکارییەکانی تر و درێژە پێ دانیان بۆ بەشەکانی پەیامەکانی نوور و، بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین.

# کۆتایی

"ئیسمی ئەعزەم" بۆ هەموو کەسێك یەك "ئیسم" نی‌یە، بەڵکو لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت و جیاواز دەبێ. بۆ نموونە: لای ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - شەش ناوی جوانە، کە بریتین لە: "فردٌ، حيٌ، قيومٌ، حَكَمٌ، عَدْلٌ، قدوسٌ".. لای ئیمامی ئەبوحەنیفەی نوعمانیش - خوای لێ ڕازی بێت - بریتی‌یە لە دوو ناوی: "حَكَم" و "عَدْل".. لای شێخی گەیلانیش - قدّس سره - تەنها یەك ناوە، کە بریتی‌یە لە: "يا حيّ".. لای ئیمامی ڕەببانیش - خوای لێ ڕازی بێت - تەنها ناوی: "القيّوم"ە.. هەر بەم جۆرە و، لای گەلێ کەسی تری گەورە مەردانی ئیسلام چەند ناوێکی تر بە "ئیسمی ئەعزەم" دانراون..

جا لەبەر ئەوەی ئەم سەرنجی پێنجەمە تایبەتە بە ناوی "الحـيّ"ی خوای گەورەوە و، پێغەمبەری مەزنیش ﷺ لە موناجاتە بەرزەکەی‌دا کە پێی دەوترێ: "الجوشن الكبير" خواناسی‌یەکی هێندە جامیع و بەرزی سەبارەت بە خواوەندەوە دەرخستووە کە تەنیا شایانی خوای گەورەیە، ئەوا ئێمەش شایەتی و، بەڵگە و، تەبەرڕوك و، دوعایەکی گیرا و کۆتایی‌یەکی باش بۆ ئەم پەیامە، لەو موناجاتە نەبەوی‌یە وەردەگرین و دەیهێنین بۆ ئێرە و، بە ئەندێشە دەڕۆین بۆ ئەو ڕۆژگارە و، "ئامین.. ئامین" بۆ ئەو نزایانە دەکەین کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەیانکات و، لە دوای زایەڵەی ئەو فەرمایشتە نەبەوی‌یە پیرۆزەوە ئێمەش هەمان "موناجات" دووپات دەکەینەوە و، دەڵێین:

يا حـيٌّ قَبْل كُلِّ حيّ * يا حيٌّ بَعدَ كلّ حيّ
يا حـيٌّ الذي لا يشْـبهُهُ شيء * يا حيٌّ الذي لَيس كَمثلِه حَيّ
يا حـيٌّ الذي لا يُشـاركه حيّ * يا حيٌّ الذي لا يحتاج الى حيّ
يا حـيٌّ الذي يُميت كلّ حيّ * يا حيٌّ الذي يَرزُق كلّ حيّ
يا حيٌّ الذي يُحيي الموتى * يا حيٌّ الذي لا يموت
سبحانك لا إلهَ إلا أنت الأمانُ الأمان نجّنا من النار

آمين.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

# سەرنجی شەشەم

## دەروانێتە ئیسمی ئەعزەمی

## (القیّوم)

ئەو پوختە باسەی کە لەسەر ناوی جوانی "الحي" نووسرا، بوو بە پاشکۆیەك بۆ "سەرچاوەی نوور". هەروەك بە باش زانرا ئەم سەرنجەش کە تایبەتە بە ناوی "القیوم"ی خوای گەورەوە، بکرێت بە پاشکۆیەك بۆ "وتەی سیهەم".

**داوای لێبوردن:**

ئەم بابەتانەی کە لە رادەبەدەر گرنگن و، درەوشانەوەی هەرە مەزنی ئەو ناوە جوانەی "القیوم"ن کە بەسەر رووی ژیانەوە دەدرەوشێتەوە و بە ناخی "وجوود"یشدا رۆچووە.. ئەم باس و بابەتانە، بە شێوەیەکی رێکوپێك و یەك لە دوای یەك نەهاتنە ناو دڵمەوە، بەڵکو هەموویان پێکەوە و بە وێنەی هەورە بروسکەی کتوپڕ لە ئاسمانی دڵدا چەخماخەیان دا و، چرای دڵیان داگیرساند و، ویژدان و هەناویان رووناك کردمەوە. ئنجا چۆن بە دڵدا هاتن منیش هەروەها نووسیمنەوە، بێ ئەوەی قەڵەمی راستکردنەوە و ئاڵوگۆڕ و دەستکارییان تێدا بگێڕم. دیارە لە ئەنجامی ئەمەشدا هەندێ کەموکووڕی و نارێکییان لە رووی دەربڕین و دارشتنی رەوانبێژییەوە، پێوە دەردەکەوێت. بۆیە تکا لە خوێنەرانی بەرێز دەکەم کە لەبەر خاتری جوانیی واتا و ناوەڕۆکەکانی ئەم باسانە چاو لە ناتەواویی شێوە و هەڵبزرکاویی روخساریان بپۆشن!

**بێدارکردنەوەیەك:**

ئەو مەسەلە ناسك و سەرنجە وردانەی کە تایبەتن بە "ئیسمی ئەعزەم"ەوە گەلێ ورد و قووڵن، زیاتریش ئەوانەیان کە هی ناوی "الحيّ القیّوم"ن و، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەتی "تیشکی یەکەم"یان کە لەچاو ئەوانی تردا بە شێوەیەکی قووڵتر هاتە دڵمەوە، چونکە راستەوخۆ رووی لە ماددییەکانە[1].

---

(١) گەر خوێنەری ئەم پەیامە شارەزاییەکی فراوانی لە زانستەکاندا نەبێت، با ئەم تیشکە نەخوێنێتەوە، یان لە کۆتاییەوە بیخوێنێتەوە و لە تیشکی دووهەمەوە دەست پێ بکات. (دانەر)

لەبەر ئەوە، هەموو خەڵکی لە تێگەیشتنی گشت باس و بابەتەکانی ئەم پەیامەدا یەکسان نین. لەوانەیە هەندێ کەس تەنانەت تێگەیشتنی تەواوەتیی هەندێ لەو باسانەشی بەلاوە سەخت بێت و تێگەیشتنی بەشێك لێرە و بەشێك لەوێی لەدەست بچێت. بەڵام ئێمە دڵنیاین لەوەی کە هەر کەسێك سەیری بکات بێ بەهرە نابێت لە سوودەکانی، بەڵکو بێ هیچ گومانێك بەشی خۆی لە هەموو بابەت و مەسەلەیەکی ئەم پەیامە بەدەست دەهێنێت. چونکە بەپێی دەستووری بەناوبانگی: "ما لا يُدرك كلّه لا يُترك كلّه" مرۆڤ کارێکی ژیرانە ناکات گەر نەڕواتە ناو ئەم باخە مەعنەوییە پڕ لە میوەیە، بە بیانووی ئەوەی کە ناتوانێت هەموو میوەکانی لێ بکاتەوە! چونکە هەرچەندی دەست بکەوێت و لێی بکاتەوە هەر دەستکەوت و قازانجی ئەوە.

جا هەروەك ئەو مەسەلە و بابەتانەی کە تایبەتن بە ئیسمی ئەعزەمەوە هی وایان تێدایە هێندە فراوانە مرۆڤ ناتوانێت دەوراندەوریان بدات، بە هەمان جۆر هی وەهاشیان تێدایە کە ئەوەندە وردن چاوی "ژیری" ناتوانێت بیانبینێت! بە تایبەت: ئەو هێمایانەی "ژیان" کە لە ناوی "الحـــي"ی خوای گەورەدان و شەش پایەکانی ئیمانیان گرتووەتەوە و.. ئاماژەکانی "ژیان"یش بۆ "ئیمان بە قەزا و قەدەر" لەو باسەدا و.. تیشکی یەکەمیش کە تایبەتە بە ناوی "القيوم"ی خوای گەورەوە..

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کەس نییە بەشی خۆی وەرنەگرێت لێیان. بگرە هەر کەسێك ئەو باسانە بخوێنێتەوە، ئیمانەکەی پێ قایم دەبێت، هیچ نەبێت مەودا و فراوانییەکەی پتر زیاد دەکات. ئەمەش کارێکی سەیر نییە، چونکە زیادبوونی ئیمان – کە کلیلی بەختەوەریی هەمیشەییە – گەلێ گرنگە. جا ئەو زیادبوونە با بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت لە ڕاستیدا گەنجینەیەکی گەورەیە، وەك ئیمامی ڕەببانی (ئەحمەدی فاروقیی سەرهەندی) خوای لێ ڕازی بێت، فەرموویەتی:

"ڕوون بوون و دەرکەوتنی مەسەلەیەکی بچووکی ئیمانم لە سەدان چێژ و کەرامەت پێ باشترە".

بِسمِ اللهِ الرّحْمنِ الرّحيمِ

﴿بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (يس:٨٣).

﴿لَهُ مَقَالِيدُ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (الزمر:٦٣).

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ﴾ (الحجر:٢١).

﴿مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا﴾ (هود:٥٦).

لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و لە مانگی "ذي‌القعدة"دا، درەوشانەوەیەکی مەزنی نوورەکانی ئیسمی ئەعزەمی "القیّوم"ی خوای گەورە لە ژیریم دەرکەوت، کە ئیسمی ئەعزەمە یا شەشەم دانەیە لە نوورەکانی. هەروەك سەرنجێکی ئەم ئایەتە پیرۆزانەشم لێ دەرکەوت کە ئاماژە بۆ "قەییومییەت"ی خوای گەورە دەکەن. بەڵام ئەو بارودۆخەی کە لە بەندیخانەدا دەوری دابووم بواری بۆ نەدەڕەخساندم مافی تەواو بە ڕوونکردنەوەی ئەو نوورانە بدەم.

جا لەبەر ئەوەی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - لە قەسیدەی "السـكينة"دا ئیسمی ئەعزەمی پێش‌چاو خستووە و، لە قەسیدەی "البديعـة"شدا و لە ناوەندی باسکردن و هێنانی ناوە جوان و شکۆمەندەکانی خوای گەورەدا بایەخێکی تایبەتیی بەو شەش ناوە داوە، ئەمە وێڕای ئەوەش کە باسکردنی ئەو ناوانە لە لایەن ئیمامی عەلی‌یەوە - بە کەرامەتێکی خوایی - دڵدانەوە و دڵنیاییمان پێ دەبەخشێت.. ئەوا بە وێنەی پێنج ناوەکانی تر، بە پوختی و لە پێنج "تیشك"دا ئاماژە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم نووره هەرە مەزنەی ناوی "القیّوم"یش دەکەین:

**تیشکی یەکەم:**

بەدیهێنەری شکۆمەندی ئەم گەردوونە: "قەییوم"ە. واتە: هەر خۆی ڕاگیرکەری خۆیەتی و بەردەوامی و مانەوەشی لە زاتی خۆیەوەیە و، سەرجەم شتان و بوونەوەرانیش بەو خواوەندە ڕاگیر دەبن و، بەردەوامی و مانەوەشیان لە وجووددا لە لایەن ئەو بەدیهێنەرەوە دابین دەبێت. خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمتر لە چاوتروکاندنێکیش پەیوەندیی "قەییومییەتی خواوەند" لە گەردوون بپچڕێت، سەرانسەری گەردوون "مەحوو" دەبێتەوە و نامێنێت!

پاشان ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەی گەردوون، هەروەك قەییوومە، قورئانیش بە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ وەسفی دەكات! واتە: نە لە زاتی نە لە سیفاتی نە لە کردارەکانیدا، هاووێنە و هاوبەشی نییە.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە گەردوون لە چنگی پەروەردگاریتیی خۆیدا ڕادەگرێت تا نەترازێت و، گشت کاروبارەکانی بەڕێوەدەبات و، سەرجەم چۆنێتی و بارودۆخەکانی بە کەماڵی ڕێکوپێکی و بەوپەڕی کارسازی و چاودێری و بە ئاسانییەکی ڕەهای وەك بەڕێوەبردنی کۆشکێك یان ماڵێك، دەسازێنێت.. بێ گومان مەحاڵە ئەو کەسە هاووێنە و هاوبەش و هاوتای هەبێت!

بەڵێ، ئەو کەسەی بەدیهێنانی ئەستێرەکانی وەك بەدیهێنانی گەردیلەکان بەلاوە ئاسان بێت و.. لە ناوەندی توانستی ڕەهای خۆیشیدا گەورەترین شت وەکو بچووکترین شتی ناو ئەم بوونەوەرە ملکەچ و گوێڕایەڵ بکات و.. هیچ شتێك ڕێی شتێکی تری لێ نەگرێت و هیچ کارێکیش دەستی نەگرێت بۆ ئەنجامدانی کارێکی تر و، بەو پێیە دانە و تاکە لەژمارەبەدەرەکان لەبەرچاویدا وەك یەك دانە وابن و گشت دەنگەکانیش بە یەکەوە ببیستێت و بە یەك جار و لە یەك کاتدا پێداویستیی هەموان دابین بکات و هیچ شتێك و هیچ حاڵەتێك - هەرچییەك بن - لە بازنەی ویست و خواستی ئەو دەرنەچن، بە شایەتیی ئەو ڕێسا و تەرازووانەی لە گەردووندا دەست بەکارن.. ئنجا هەروەك "شوێن" سنوورێکی بۆ دیاری ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە توانست و زانستی خۆی لە هەموو شوێنێکدا ئامادە بێت و.. هەروەك بە چەشنێکی ڕەها هەموو شتێك لێیەوە دوورە، کەچی ئەو لەچاو هەموو شتێك لە هەموو شتێکەوە نزیکتر بێت..

بێ گومان ئەم حەیی و قەییوم و شکۆمەندەی کە ئاوایە، دەبێ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ بێت. کەواتە هەرگیز هاووێنە و هاوبەش و وەزیر و دژ و نەیاری نییە، بگرە هەموو ئەمانە سەبارەت بەو مەحاڵن. هەرچی کاروبارە حەکیم و خاوێنەکانیشی هەن ئەوا دەکرێ لە چاویلکەی نموونە هێنانەوەوە تەماشا بکرێن (گشت ئەو جۆرە نموونە و تەشبیهانەی کە لە پەیامەکانی نووردا هێنراون، لەم جۆرە نموونە هێنانەوەیەن).

جا ئەم زاتە ئەقدەسەی کە: هاووێنەی نییە و، "واجب الوجود"ە و، دەستبەرداری ماددەیە و، مونەززەهە لە شوێن و مەکان و، مەحاڵە دابەش ببێت و، ئاڵوگۆڕی بەسەردا نایەت و، هەرگیز مومکین نییە تەسەووری دەستەوسانی و موحتاجیی بکرێت.. ئەم زاتە

ئەقدەسەی کە ئاوایە، هەندێ لە "گومڕایان" ئەحکامی خوایەتی‌یە مەزنەکەی ئەویان داوە بە هەندێ لە بەدیهاتووانی، کاتێ کە لەو گومانەدا بوون درەوشانەوەکانی خواوەند بەسەر لاپەڕەکانی گەردوون و چینەکانی بوونەوەرانەوە، خودی زاتی ئەقدەسی خواوەندە. ئەوەتا بەشێك لەو گومڕایانە هەندێ ئاسەواری درەوشانەوەکانی خواوەندیان بە هی "سروشت" و "هۆکارەکان" لە قەڵەم داوە. لە کاتێکدا کە بە چەندەها بەڵگەی ڕوونی جۆراوجۆر و لە چەندین پەیامی نووردا، چەسپاوە کە:

"سروشت" سنعەتێکی خوایی‌یە، نەك سنعەتکار.. کتێبێکی پەروەردگاری‌یە نەك کتێب دانەر.. نەخشونیگارێکی ناوازەیە و، مەحاڵە نیگارکێشی داهێنەر بێت.. پەڕاوێکە، نەك دانەری یاسا و خاوەنی پەڕاو.. یاسایەکە، نەك توانست.. وەك ڕاستە ئامرازی پێوانەی شتانە، نەك سەرچاوەی "بوون".. شتێکی کارتێکراوە، نەك بکەر.. ڕێسایە، نەك ڕێکخەر و سازێنەری ڕێسا.. شەریعەتێکی فیتری‌یە، نەك دانەری شەریعەت!

خۆ ئەگەر فەرزی مەحاڵ بکرێت و بەدیهێنانی بچووکترین زیندەوەر بخرێتە ئەستۆی "سروشت" و، گریمان پێی بوترێت: "ئەم زیندەوەرە دروست بکە"! ئەوا دەبێ "سروشت" بە ئەندازەی ئەندامەکانی ئەو زیندەوەرە: مەکینە و قاڵبی ماددی ئامادە بکات، تاکو بتوانێت ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنێت! مەحاڵیی ئەم گریمانەمان لە زۆر شوێنی پەیامەکانی نووردا چەسپاندووە.

پاشان هەندێك لە گومڕایان کە پێیان دەوترێ "ماددی‌یەکان"، هەست بە درەوشانەوەی هەرە مەزنی "بەدیهێنەرێتی"ی خواوەند و "توانستی پەروەردگار" دەکەن لە جموجووڵ و ئاڵوگۆڕە ڕێکوپێکەکانی گەردیلەکاندا، بەڵام سەرچاوەی ئەو درەوشانەوەیە نازانن و ناتوانن پەی ببەن بەوەی کە لە کوێوە ئەو هێزە گشتی‌یە بەڕێوە دەبرێت، کە لە سەرچاوەی درەوشانەوەی توانستی صەمەدانیی خواوەندەوە هەڵقوڵاوە! جا لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوەیە نازانن و لێی بێ‌ئاگان، ئەوا ئاسەوارەکانی "خوایەتیی بەدیهێنەر"یان داوەتە پاڵ خودی گەردیلەکان و جموجووڵەکانیان و، کەوتوونەتە وەهمی: ئەزەلییەتی "ماددە" و "هێز"ەوە!!

بەخوا گەلێ سەیرە! ئایا دەگونجێ مرۆڤ بەرەو ئەم پلە نزم و قووڵەی نەزانی و ئەفسانەی ڕووت و بێ‌گومان بەربیێتەوە و، بچێت ئاسەوارە ناوازەکانی "بەدیهێنەری ناوازە" و کارە سەرتاپا حیکمەتەکانی "زانای بینەری خاوێن لە زەمان و مەکان" بداتە

پاڵ چەندین گەردیلەی ئەوتۆ کە شلەژاوی دەستی تەوژمەکانی "ڕێکەوت"ن و، کوێـر و بێ گیان و بێ هەستن و، خاوەنی هیچ هێز و توانایەك نین؟ یان بیانداتە پاڵ جموجوولەکانی ئەو گەردیلانە؟ ئایا دەگونجێ کەسێك بیێت دان بەمەدا بنێت؟ بێ گومان هەر کەسێك کەمێك ژیریی هەبێت دەزانێت کە ئەم بۆچوونە لەوپەڕی ئەفسانەگەری و نەفامیدایە!

ئەو بەدبەختانە خۆیان گرفتاری پەرستنی چەندین خواوەندی درۆینەی زۆر و زەبـەندە کردووە! چونکە لەبەر ئەوەی پشتیان لـە "وەحدانییـەت"ی ڕەهـا هـەڵکرد و ئیمانیـان بـە خوایەکی تاك و تەنیا نەهێنا، ناچاربوون باوەڕ بە چەندین خـوای درۆینـەی لەژمارەبەدەر بکەن! بە واتایەکی تر: لەبەر ئەوەی نەیانتوانی ئەزەلییەت و بەدیهێنەریێتیی زاتی ئەقدەسی خواوەنـد - کـە دوو سیفەتی پێویسـتی زاتــی خواوەنــدن - لــە ژیری‌یــە تەســك و کورتەکانیاندا جێ بکەنـەوە، ئـەوا بـە حوکمـی ڕێبـازی گومڕایـی خۆیـان: ناچـار بـوون بـاوەڕ بـە ئەزەلییـەتی گەردیلـە بێ گیانـە لــەژمارە و سـنووربەدەرەکان بکـەن! تەنانـەت ئیمانیش بە خوایەتیی گەردیلەکان بهێنن!!

دەسا بۆ خۆت بیر لە قووڵیی ئەو چاڵـە و نزمیـی پلـەی یـەکجار نـەویی ئـەو جەهالـەتـە بکەرەوە کە ئەوانە تێی کەوتوون!

بەڵێ، درەوشانەوەی ئاشکرای خواوەندی "حـەیی و قـەییوم" لـە گەردیلـەکاندا، بـە هێز و توانا و فـەرمانی خواوەنـد، ئـەو گەردیلانـەی وەك سـوپایەکی ڕێکوپێکـی بەسام و شکۆ لــێ کـردووە. خـۆ ئەگـەر بـۆ ماوەیـەکی کـەمتر لــە چاوتروو کـاندنێك فـەرمانی سەرکردەی هەرە مەزن لەو گەردیلە بێ گیان و بـێ هەسـت و ژیری‌یـە لەسنووربەدەرانە بوەستێنرێت، ئەوا هەموویان بەرباد دەبن، تەنانەت بە تەواوەتی مەحوو دەبنەوە و هیچیـان لە وجووددا نامێنن.

پاشان کەسانێکی تر هەن خۆیان وا پیشان دەدەن کە دارای "دووربینی" و "زیرەکی" بن و، دەچــن بـیرێکی لــەوەی پێشــوو نەفامانــەتر و قووڵــتر لــە خورافـاتدا دەهێنـن و، پێش‌چاوی دەخەن و، لەو گومانەدان کە: ماددەی "ئەثیر" سەرچاوە و بکەری ئەو کارانە بێـت، کاتێ کە دەبینـن ئـەو ماددەیـە ئـەرکی ئاوێنـەی گرتووەتـە ئەسـتۆ بـۆ دانـەوەی درەوشانەوەکانی پەروەردگارێتیی بەدیهێنەری مەزن!!

کـەچی هـەموان دەزانـین مـاددەی "ئـەثیر" ناسـکترین و نـەرمترین و دەسـتەمۆترین لاپەڕەکانی کـار بـەڕێ کردنی کردگـاری شـکۆمەندە و لـە هەموو شیان زیـاتر ملکـەچ و گوێڕایەڵی ئەوە و، هۆی گواستنەوەی فەرمانە شکۆدارەکانیەتی و، مەرەکـەبێکی نیانـە

بۆ نووسینەکانی و، پۆشاکێکی ڕەنگین و ڕوونە بۆ بەدیهێنانەکانی و، هەوێنی بنەڕەتی‌یە بۆ بەدیهاتووەکانی و، زەویی بەپیتە بۆ دەغڵ و دانەکانی!

بێ‌گومان ئەو جەهالەتە سەیر و سامناکەی ئەوان، داخوازی گەلێ مەحاڵی بێ سنوور و لەژمارەبەدەر دەبێت، چونکە ماددەی "ئەثیر" گەلێ لەو ماددەی گەردیلانە ناسکترە کە ماددی‌یەکانی پێ نووقمی چلکاوی گومڕایی بووە و، لە ماددەی "هەیوولا"[(١)]ش چڕترە کە فەیلەسووفەکانی دێرینی تێدا ون و سەرگەردان بوون. چونکە ماددەیەکی بێ گیان و بێ ویست و ئیختیار و شعوورە.

جا گێڕانەوەی کار و ئاسەوارەکان بۆ ئەم ماددەیەی کە لەتبوون و دابەشبوونی لەباردایە و، ئامادەکراوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی گواستنەوە و تایبەتکاریی کارتێداکردن.. یان گێڕانەوەی کار و ئاسەوارەکان بۆ گەردیلەکانی ئەم ماددەیە کە زۆر لە گەردیلەکانی تر ورد و بچووکترن.. بێ‌گومان ئەم کارە، هەڵە و تاوانێکی گەورەی بە ئەندازەی ژمارەی گەردیلەکانی ماددەی ئەثیرە، چونکە ئەو کار و ئاسەوارە پەروەردگاری‌یانە بە ویستی ئەو کەسە نەبێت کە هەموو شتێك لە هەر شتێکدا دەبینێت و، زانستێکی گشتگیری هەمەلایەنەی هەیە، هەرگیز ناگونجێ ڕوو بدەن و ئەنجام بدرێن.

بەڵێ، ئەو کاری "بەدیهێنان"ەی کە لە بوونەوەراندا دەبینرێت، لە چۆنێتی‌یەکی دیاریکراو و شێوازێکی تاقانە و بێ وێنەی وەهادایە کە بە ئاشکرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەدیهێنەریان: خاوەنی توانست و ئیختیارێکی ڕەهایە و، لە کاتی بەدیهێنانی هەر شتێکدا بە تایبەت لە بەدیهێنانی زیندەوەراندا زۆربەی شتان بەڵکو سەرانسەری گەردوونیش دەبینێت و، ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە کە ئەم بەدیهاتووەی پەیوەندیی پێیانەوە هەیە و، پاشان ئەو شتە لە شوێنی شیاوی خۆی‌دا دادەنێت و، مانەوەشی لەو شوێنەدا بۆ دەستەبەر دەکات. واتە هەرگیز ناگونجێ "هۆکارە ماددی‌یە نەزانەکان" بکەری بەدیهاتووان بن!

بەڵێ، هەر کارێکی بەدیهێنان - چەندەش جوزئی بێت - بەهۆی نهێنیی "قەییوومییەت"ەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: کاری ڕاستەوخۆی بەدیهێنەری گەردوونە. بۆ نموونە: ئەو کارەی ڕووی لە بەدیهێنانی یەك دانە "هەنگ"ە، لە دوو ڕووەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کاری تایبەتیی بەدیهێنەری گەردوون و پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە:

---

(١) هەیوولا: وشەیەکی کۆنی یۆنانی‌یە، واتاکەی لای فەیلەسووفەکان بریتی‌یە لە: ماددەی یەکەمی ڕووت لە شێوە و قەبارە و درێژی و ڕەنگ و شتانی وەك ئەمانە. (وەرگێڕ)

❍ ڕووی یەکەم:

کاتێ کە ئەم هەنگە لەگەڵ هەنگەکانی تری سەرانسەری زەویدا هەمان کار لە هەمان کاتدا ئەنجام دەدات، ئەوا ئەم کارە جوزئی‌یەی کە لەم یەك دانە هەنگەدا دەیبینین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چمکێکی کارێکی هێندە گەورەیە کە دەوراندەوری ڕووی زەویی داوە! واتە ئەو کەسەی بکەر و خاوەنی ئەو کارە گەورە و فراوانە بێت، هەر تەنها ئەو بکەر و خاوەنی ئەم کارە جوزئی‌یەشە!

❍ ڕووی دووهەم:

بۆ ئەوەی بکرێ کەسێك بکەری ئەم "کار"ە جوزئی‌یە بێت کە ڕووی لە بەدیهێنانی ئەم هەنگەی بەرچاومانە، دەبێ ئەو بکەرە هەل و مەرجەکانی ژیانی ئەو هەنگە بزانێت و ئاگای لە کۆئەندامەکان و پەیوەندی‌یەکانی بە بوونەوەرانی ترەوە بێت و، چۆنێتیی مسۆگەرکردنی ژیان و گوزەرانیشی شارەزا بێت! کەواتە دەبێ کەسێکی وابێت کە حوکم و فەرمانەکانی لە سەرانسەری گەردووندا جێ‌بەجێ کراو بێت، تاکو ئەو "کار"ەی "تەواوی" و "کەماڵ" بەدەست بهێنێت.

واتە بچووکترین کاری "جوزئی" لە دوو ڕووەوە دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە: تایبەتە بە "بەدیهێنەری هەموو شتێك"ەوە!

بەڵام ئەوەی کە لە هەموو شتێك زیاتر مرۆڤ سەرسام دەکات و سەرنجی ڕادەکێشێت، بریتی‌یە لەوەی کە:

"ئەزەلییەت" و "سەرمەدییەت" کە تایبەت‌ترین تایبەتکاری‌یەکانی خوایەتی و پێویست‌ترین سیفەتی زاتی ئەقدەسی ئەو خوایەن کە خاوەنی بەهێزترین پلەی وجوودە کە بریتی‌یە لە "وجووب" و.. چەسپاوترین پلەیە لە بووندا کە "دەستبەرداری‌یە لە ماددە" و.. دوورترین شتە لە "نەمان" کە "خاوێنی‌یە لە شوێن و کات" و.. سەلامەت‌ترین سیفەتە لە وجووددا و خاوێنترینیشیانە لە ئاڵوگۆڕ و نەمان کە بریتی‌یە لە "یەکتایی"..

دەڵێم ئەو شتەی کە مرۆڤ سەرسام دەکات و نیگەرانیی تێدا دەهەژێنێت و سەرنجی ڕادەکێشێت ئەوەیە کە: هەندێ کەس دەچێت سیفەتی "ئەزەلییەت" و "سەرمەدییەت" بە ئەثیر و ئەو شتە ماددی‌یانەی هاوچەشنی دەبەخشێت کە لاوازترین و وردترین پلەکانی وجوودیان هەیە و، لەو قۆناغەدان کە لە هەموو قۆناغێکی تر ئاڵوگۆڕی زیاتری دێتە ڕێ و، لە هەموو بوونەوەرانی تر زیاتر لە شوێن و مەکاندا پەرش و بڵاو بوونەتەوە و، دارای زۆری‌یەکی لەژمارەبەدەریشن!!

چونکـه دابڕینـی سیفەتی "ئەزەلییـەت" بەسـەر ئـەو ماددانـەدا و، تەسـەوور کردنیان بەوەی کـە ئـەزەلی بـن و، وەهمـی ئـەوەی بەشـێك لـە ئاسـەوارە خواییـیـەکان لەوانـەوە سـەریان هـەڵدابێت، لـە ڕاسـتی‌دا، دوور کەوتنەوەیـەکی تەواوەتی‌یـە لـە حەقیقـەت و، کارێکی تابلێی پێچەوانەی واقیعە و، بە یەکجارەکی دوورە لە مـەنتیقی ژیری‌یـەوە و، بـە ئاشکرا ناڕەوا و بەتاڵە. ئەمەشمان بە چەندین بەڵگەی بەهێز و توندوتۆڵ لە گەڵـێ پـەیامدا چەسپاندووە.

**تیشکی دووهەم:**

بریتی‌یە لە دوو مەسەلە:

❑ مەسەلەی یەکەم:

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿**لا تأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلا نَوْمٌ**﴾ (البقرة:٢٥٥).

﴿**مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا**﴾ (هود:٥٦).

﴿**لَهُ مَقَالِيدُ السَّمـوَاتِ وَالأَرْضِ**﴾ (الزمر:٦٣).

هـەروەها ئایەتـە پیرۆزەکـانی تـری هاوچەشنیان، لەوانـەی کـە حەقیقـەتێکی هێنـدە گەورەیان لەخۆ گرتووە کە ئاماژە بۆ درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "القیوم"ی خوای گەورە دەکات.. وا تەنها یەك ڕووی ئەو حەقیقەتە بەم شێوەیەی خوارەوە باس دەکەین:

ڕاگیربوون و، بەردەوامی و، مانـەوەی: قـەبارەکانی ئاسمـان تەنـها بـەهۆی نـهێنیی "قەییوومییەت"ەوەیە. چونکە ئەگەر نهێنی و درەوشانەوەی "قەییوومییەت" ڕووی خـۆی تەنانەت بۆ ماوەی لە یەك خولەك کـەمتریش لـەو تەنـە ئاسمانی‌یانـە وەربچـەرخێنێت، ئـەوا ئەو تەن و قەبارانەی کە هەندێکیان هەزاران جـار لـە گـۆی زەوی گـەورەترە و ژمارەیـان ملیۆنەها دەبێت، لە بۆشایی‌یەکی بێ لێواردا پەرتـەوازە دەبـوون و دەکـەوتن بـە یـەکدا و بەرەو چاڵی قووڵی عەدەم بەردەبوونەوە!

با ئەمە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

گەر کەسێك، لە بریی فڕۆکە، هەزاران کۆشك و تەلاری گەورە گـەورە بـە ئاسمـاندا بگێڕێت، ئـەوا هـەروەك بـە ئـەندازەی مانـەوە و بـەردەوامیی ئـەو بارستایی‌یە گەورانـە و مەودای ڕێکوپێکـیی هاتوچۆیـان و گوێڕایـەڵییان بـۆ هەڵسوڕێنەرەکەیان، لـە توانستی قەییوومییـەتی ئـەو کەسـە تێدەگـەین.. بـە هـەمان جـۆر، دەشتوانین لـە ڕێـی بەخشـینی:

"ڕاگیربوون و مانەوە و بەردەوامی"یەوە، کە خواوەنـدی قـەییومی شکۆمەند بـە "نـهێنیی قەییوومییەتی" خۆی بە قەبارە ئاسمانیيە لەسنووربەدەرەکانی ناو ئەثیری بۆشـایی بـەرینیان دەبەخشێت و، لـەو جموجوولانەشیاندا کـە بەوپـەڕی تـەقدیر و ڕێسـا و گوێڕایەڵییـەوە ئەنجامیان دەدەن و، لە ڕێی ڕاگیرکردن و بەردەوامی و هێشتنەوەشیان بێ هیچ کۆڵەکـە و پاڵپشتێك.. دەتوانین لـەم ڕێیـەوە لـە درەوشـانەوەی ئیسـمی ئـەعزەمی "القیـوم"یـش تێبگەین. لە کاتێکدا کە دەزانین هەندێك لـەو قەبارانـە هـەزاران جـار، بگـرە هـەندێکی تریان ملیۆنەها جار لە گۆی زەوی گەورەترن! وێڕای گوێڕایەڵ کردنی هەر یەکەیان و بەکارهێنانیان لـە ئـەرکێکی گرنـگ و تایبـەتیدا، کـە ئەمـەش وەکـو سوپایەکی بەسام و شکۆی ئەوتۆی لـێ کردوون کە بە تەواوەتی ملکەچ و فەرمانبەرداری ئـەو فەرمانانـە بـن کە لە لایەن خاوەنی فەرمانی: "کن فیکون"ەوە دەردەچن.

جـا هـەروەك دەکرێ ئـەم ئەستێرانە نموونەیـەکی قیاسـی بـن بـۆ درەوشـانەوەی هـەرە مـەزنی نـاوی: "القیـوم"ی خـوای گـەورە، ئـەوا بـە هـەمان جـۆر گـەردیلـەکانی هـەموو بوونـەوەرێکیش، کـە وەکـو ئەستێرە مەلەوانـەکانی نـاو بۆشـاییـوان.. بـەهۆی "نـهێنیی قەییوومییەت"ەوە "بەردەوامی" و "ڕاگیربوون" و "مانەوە"یان بەدەست هێناوە.

بەڵێ، "مانەوە"ی گەردیلەکانی جەستەی هـەموو زیندەوەرێـك بـێ ئـەوەی پەرتـەوازە بن و.. "کۆبوونەوە" و "پێکهێنان"یان لەسەر شکڵ و شێوەیەکی دیاریکراوی ئەوتۆ کە لەگەڵ هەریەك لە ئەندامەکانی ئەو زیندەوەرەدا بگونجێـت و.. "پارێزگـاری"ی قـەوارە و شێوەی خۆیـان لـە بـەردەم لافـاوی ڕامالـەری توخمـەکاندا، بـێ ئـەوەی بـڵاو ببنــەوە و.. مانەوەشیان لەسەر ڕێسا ڕێکوپێکەکانی خۆیان..

هەموو ئەم کارانە - وەك ڕوون و ئاشکرایە - لە لایەن خودی گەردیلەکانەوە ئـەنجام نـادرێن، بەڵکو لـە نـهێنیی ئـەو "قەییوومییـەت"ەی خـوای گـەورەوە بـەڕێ دەکرێـن کـە هەموو "یەکێك" لە زیندەوەران، بە وێنەی گوێڕایەڵیی سەربازەکانی سوپا گوێڕایـەڵی دەبن و، هـەموو "جـۆر"ێکیـش لـە جۆرەکـانی گیانلەبـەران، وەك سـوپای ڕێکوپێـك، ملکەچی بۆ فەرمانەکانی ڕادەگەیەنن.

جا هەروەك مانەوە و بەردەوامیی زینـدەوەران و پێکـهاتووانی سـەر ڕووی زەوی و.. گەشت و گەڕانی ئەستێرەکانی ناو بۆشایی ئاسمان، نهێنیی "قەییوومییەت" ڕادەگەیەنن.. ئـەم گەردیلانـەش - وەك ئـەوان - بـە چـەندین زمـانی لەژمارەبـەدەر، هـەمان نـهێنی ڕادەگەیەنن و پێشچاوی دەخەن.

❑ مەسەلەی دووهەم:

ئەم مەقامە داخوازی ئامـاژە کردنـە بۆ بەشێك لـەو سـوود و حیکمەتانـەی کـە لـەناو شتاندا هەن و، پەیوەستی نهێنیی "قەییوومییەت"ن..

هەریـەك لـە: حیکمـەتی بـوون و، ئامـانجی فیـترەت و، سـوودی بەدیـهاتن و، ئـەنجامی ژیانی هەموو شتێك، سێ جۆرن:

جۆری یەکەم: ئەوەیە کە ڕووی لە خۆی و، لە مرۆڤ و، بەرژەوەندی‌یەکانی مرۆڤە.

جۆری دووهەم: (کە لە یەکەم گرنگترە) ئەوەیە کە: هەموو شتێکی ناو ئەم بوونەوەرە وەك: ئایەتێکی مەزن و، نووسراوێکی پەروەردگاری و، کتێبێکی ڕەوان و، قەسیدەیەکی ڕەنگین وایـە، کـە گشـت خـاوەن هەستێك دەتوانێـت بیخوێنێتـەوە و، لـەو ڕێیـەوە بـە درەوشـانەوەی ناوەکانی بەدیهێنەری شکۆمەند ئاشـنا ببێـت. واتـە: هـەموو شـتێك واتـا زۆر و زەبەندەکانی خۆی بۆ خوێنەرە لەژمارەبەدەرەکانی دەردەبڕێت.

بەڵام جۆری سێ‌هەم: تایبەتـە بـە کردگـاری شـکۆمەندوە و ڕووی لـەوە. جـا ئەگـەر سوودی بەدیهێنانی هەر شتێك بۆ خودی شتەکە تەنها یەك سوود بێت، ئەوا سەدان سوود لە بەدیهێنانی ئەو شتەدا هەن کە ڕوویان لە بەدیهێنەری شکۆمەندە. چونکە خوای گەورە ئەو شتەی کردووە بە شوێنی بۆ ڕوانینی خۆی کاتێ بـۆ سـنعەتە ناوازەکـانی دەڕوانێـت و سەیری درەوشانەوەی ناوە جوانـەکانی خـۆی لـەو شـتەدا دەکـات. جـا لـە نـاوەندی ئـەم جۆرەی سێ‌هەمدا، کە جۆرێکی مەزنی حیکمەتی وجوودە، ماوەی یەك چرکەی "ژیان" سەروزیادە!

جگە لەمە، لە "تیشکی سێ‌هەم"یشدا یەکێك لە نهێنی‌یـەکانی "قەییوومییـەت" ڕوون دەکرێتەوە، کە داخوازی بوونی هەموو شتێکە.

ڕۆژێکیان لە گۆشەی دەرکەوتن و شیکردنەوەی "تەلیسمی بوونـەوەران" و "مەتـەڵی بەدیهێنان"ەوە، بیرم لە سوود و حیکمەتەکانی بوونەوەران دەکردەوە. لەبەرخۆمـەوە وتم: "بۆچی ئەم شتانەی کە خۆیان دەردەخەن، هێندەی پێ نـاچێت لـە پێش‌چـاودا ون دەبن و بە پەلە کۆچ دەکەن"؟

فەرموو بۆ جەستە و کەس(شخص)ی ئەو شتانە بڕوانە، دەبینیت: هەریەکەیان زۆر بـە جوانی ڕێك خراوە و.. "بوون"ێکیشی دراوەتێ کـە بـە خواسـتی حیکمـەتێکی ئاشـکرا، بەقـەد بـاڵا و بـەهای خـۆی بڕراوە و.. بە جوانـترین و ناسـك و نیانـترین ڕازاندنـەوەش ئارایشت دراوە و.. بە کەسایەتی‌یەکی خاوەن حیکمەت و لەشولارێکی ڕێکوپێکیشەوە

ڕەوانە کراوە. تاکو لەم پیشانگا فراوانە و لە بەردەم بینەراندا پێش‌چاو بخرێت.. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، دوای چەند ڕۆژێك یان دوای چەند خولەکێك نامێنێت و لە پێش‌چاودا ون دەبێت بێ ئەوەی هیچ سوودێك بەجێ بهێڵێت! بۆیە لە خۆمم پرسی و وتم: چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە کە ئەم شتانەمان بۆ ماوەیەکی ئاوا کەم پێش‌چاو دەخرێت؟

زۆر موشتاق و تاسەمەندی زانینی ئەم ڕازە بووم. هێندەی نەخایاند لوتفی پەروەردگاری مەزن هات بە هانامەوە و، هەر ئەو کاتە لە حیکمەتێکی گرنگی هاتنی بوونەوەران، بە تایبەت زیندەوەران بۆ قوتابخانەی زەوی، تێی گەیاندم. ئەو حیکمەتەش بریتی‌یە لەوەی کە:

هەرچی شت هەیە، بە تایبەت زیندەوەران، لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لە: وشەیەکی خوای گەورە و، نامەیەکی پەروەردگاری و، قەسیدەیەکی ڕەنگین و، ڕاگەیاندننامەیەکی ڕاشکاو لەوپەڕی ڕەوانبێژی و حیکمەتدا. جا دوای ئەوەی ئەو شتە هاتە وجوود و، خاوەن هەست و شعوورەکان خوێندیانەوە و، سەرجەم واتاکانی ڕاگەیاند و، ئامانجەکانی خۆی بەدەستەوە دا، ڕوخساری جەستەکەی دەڕوات و ماددەکەی - کە لە حوکمی لەفز و پیتەکانی وشەدایە - لە پێش‌چاودا ون دەبێت و، دوای خۆی واتاکانی لە "وجوود"دا بەجێ دەهێڵێت!

زانینی ئەم حیکمەتە، بەشی ساڵێکی تەواوی کردم. بەڵام پاش تێپەڕبوونی ئەو ساڵە، موعجیزاتی ورد و ڕێکوپێکی و وردەکاریی ناوازەی ناو بەدیهاتووانم دی، بە تایبەت زیندەوەران. لەمەوە بۆم دەرکەوت کە:

ئەم وردەکاری‌یە یەکجار ناوازە و تەواو وردەی کە لە هەموو بەدیهاتوواندا هەن، تەنها بۆ گەیاندن و دەرخستنی واتاکانیان نی‌یە لە بەرچاوی خاوەن هەست و شعوورەکاندا، چونکە هەرچەند گەلێ خاوەن هەست و شعووری زۆر و زەبەندە هەن کە موتالای هەموو بوونەوەرێك دەکەن و دەیانخوێننەوە، بەڵام هەرچۆن بێت ئەم خوێندنەوەیەی ئەوان هێشتا هەر کەمە و لە سنوورێکی دیاریکراودایە. ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە هەموو خاوەن هەستێك ناتوانێت پەی بە وردەکاری و داهێنانی سنعەت ببات لە زیندەوەردا و، سەر لە گشت نهێنی‌یەکانی دەربکات.

کەواتە گرنگترین ئەنجام و مەزنترین ئامانجی بەدیهێنانی زیندەوەران بریتی‌یە لە: "پێش‌چاو خستنی سنعەتە ناوازەکانی قەیومی ئەزەلی و دەرخستنی دیاری‌یەکانی

میهرەبانی و نیعمەتە زۆر و زەبەندەکانی، کـە بـە زیندەوەرانـی بەخشیوە، لـە پێش‌چـاوی "شهوود"ی خۆی‌دا"!

زانینی ئەم ئامانجە، تا ماوەیەکی زۆر، دڵنیایی‌یەکی سـەروزیاد و قەناعـەتێکی تـەواوی پێ بەخشیم و، لەم ڕێیەوە تێگەیشتم کە:

وردەکـاریی سـنعەت و نـاوازەیی بەدیـهێنان، کـە بـە شـێوەیەکی لەڕادەبـەدەر لـە بوونەوەراندا بە تایبەت لـە زیندەوەرانـدا هـەن، تەنـها بـۆ ئـەوەن کـە: لـە بـەردەم قـەییومی ئەزەلی‌دا پێش‌چاو بخرێـن. واتـە حیکمـەتی بەدیـهێنان لەوەدایـە کـە: خـواوەنـدی قـەییومی ئەزەلی، هەر بۆ خـۆی، سـەیری نـاوازەیی بەدیـهاتووانی خـۆی بکـات. خـۆ ئـەم بینینـەش شایانی ئەوەیە ئەم خەرجی‌یـە زۆرەی لـە پێنـاودا بکرێـت و ئـەم گشـت بەدیـهاتووە زۆر و زەبەندانەشی لە پێناودا بەدی‌بهێنرێت!

بـەڵام پـاش تێپـەڕبوونی ماوەیـەك بەسـەر ئەمەشـدا، بینیـم کـە وردەکـاری و ناوازەیی‌یەکانی سنعەت لە خودی بوونەوەران و شێوە ڕواڵەتی‌یەکەیاندا بەردەوام نابن و نامێننەوە، بەڵکو بە خێرایی‌یەکی سەرسووڕهێن نوێ دەبنەوە و دەم بـە دەم و لـە نـاوەندی بەدیهاتنێکی هەمیشـە تازەوەبووی بەردەوام و کارایی(فعالية)یـەکی ڕەهـادا ئاڵوگۆڕیـان بەسـەردا دێـت.. ماوەیـەك بـە قووڵـی بیرم لەمـە دەکـردەوە و دەمـوت: حیکمـەتی ئـەم خەللاقییەت و کارایی‌یە، دەبێ بە ئەندازەی خودی کارایی‌یەکـە گـەورە و مـەزن بێـت.. هەر لەو کاتەدا دوو حیکمەتـەکانی پێشـووم کـورت و ناتـەواو هاتنـە پێش‌چـاو. بۆیـە بـە تاسـە و حەزێکی گەرموگوڕ و بایەخ پێدانێکی لەڕادەبەدەرەوە کەوتمە گەڕان و پشـکنین بە دوای حیکمەتێکی تردا..

سوپاس بۆ خـوا، پـاش ماوەیـەك لـە ڕێژنـەی نـووری قورئـانی پـیرۆز و سـەرچاوەی "قەییومییەت"ەوە حیکمەت و ئامانجێکی تری هێندە مەزنم لـێ دەرکـەوت کـە مـەزنی و گەورەیی‌یەکەی سنوور و کۆتایی بۆ نی‌یە.

بـەم حیکەمەتـەش لـە نهێنی‌یـەکی تـەواو گـەورەی خـواوەنـد تێگەیشـتم سـەبارەت بـە "بەدیـهێنان"ی شـتانەوە، کـە بریتی‌یـە لـەوەی پێـی دەوتـرێ: "مەتـەڵی بەدیـهاتووان". لـە تیشـکی پێنجـەمی ئێرەدا بە کورتی چـەنـد خاڵێك لەم نهێنی‌یە باس دەکەین، چـونکـە بـە تێر و تەسەلی لە مەکتووبی بیست و چوارەمی کتێبی "مەکتووبات"دا درێژەی پێ دراوە.

بەڵێ، لەم گۆشەیەی خوارەوە سەیری درەوشانەوەی "قەییومییەت" بکە:

خوای گه‌وره بوونه‌وه‌رانی له‌ تاریکستانی "عه‌ده‌م" ده‌رهێناوه‌ و وجوودی پێ به‌خشیون و، ڕاگیربوون و مانه‌وه‌شی له‌م بۆشاییه‌ فراوانه‌دا داونه‌تێ و، ڕێ و شوێنێکی شایسته‌ی به‌ بوونه‌وه‌ران داوه‌، تاکو یه‌کێك له‌ دره‌وشانه‌وه‌کانی "نهێنی قه‌ییوومییه‌ت" به‌ده‌ست بهێنن، وه‌ك ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ ڕوونی کردووه‌ته‌وه‌:

﴿اللهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمواتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ (الرعد:٢).

خۆ ئه‌گه‌ر بوونه‌وه‌ران ئه‌م بناغه‌ مه‌زن و پالپشته‌ مه‌حکه‌م و تۆندوتۆڵه‌یان نه‌بوایه‌، ئه‌وا هیچ شتێك نه‌ده‌مایه‌وه‌. به‌ڵکو هه‌موو شتێك له‌ ناوه‌ندی بۆشاییه‌کی بێ سنووردا ده‌تلایه‌وه‌ و به‌ره‌و عه‌ده‌م ده‌که‌وته‌ خواره‌وه‌.

ئنجا هه‌روه‌ك هه‌موو بوونه‌وه‌ران له‌ "وجوود" و "ڕاگیربوون" و "مانه‌وه‌"یاندا پاڵیان به‌ قه‌ییوومی ئه‌زه‌لی‌یه‌وه‌ داوه‌ و، هه‌موو شتێك به‌و ڕاگیر بووه‌.. به‌ هه‌مان جۆر سه‌ره‌تای هه‌موو بارودۆخه‌کانی گشت بوونه‌وه‌ران و سه‌رجه‌م چۆنیه‌تی‌یه‌ یه‌ك له‌ دوای یه‌که‌کانیشیان، ڕاسته‌وخۆ به‌ نهێنیی قه‌ییوومییه‌ته‌وه‌ په‌یوه‌سته‌. وه‌ك ئایه‌تی پیرۆزی: ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الأَمْرُ كُلُّهُ﴾ (هود:١٢٣) ڕوونی ده‌کاته‌وه‌. چونکه‌ ئه‌گه‌ر هه‌موو شتێك پاڵی به‌و خاڵه‌ نوورانی‌یه‌وه‌ نه‌دابوایه‌، ئه‌وا هه‌زاران ته‌نانه‌ت به‌ ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی بوونه‌وه‌ران "ده‌ور" و "ته‌سه‌لسول" سه‌ریان هه‌ڵده‌دا. که‌ ئه‌مانه‌ش لای که‌سانی ژیر و هۆشمه‌ند مه‌حاڵ و به‌تاڵن.

با ئه‌مه‌ به‌ نموونه‌یه‌ك ڕوون بکه‌ینه‌وه‌:

پارێزگاری(الحفظ) و، نوور و، وجوود و، ڕۆزی و شتانی هاووێنه‌یان که‌ له‌ هه‌ر شتێکدا هه‌ن، له‌ ڕوویه‌که‌وه‌، پاڵیان به‌ شتێکی تره‌وه‌ داوه‌، ئه‌ویش به‌ شتێکی تره‌وه‌... هتد. که‌واته‌ ده‌بێ له‌ ئه‌نجامدا کۆتایی‌یه‌کی ببێت. چونکه‌ به‌ لای ژیری‌یه‌وه‌ ناگونجێ ئه‌و زنجیره‌یه‌ به‌ شتێك کۆتایی پێ نه‌یه‌ت. جا کۆتایی سه‌رجه‌می ئه‌م زنجیرانه‌ له‌ "نهێنیی قه‌ییوومییه‌ت"دایه‌.

خۆ پاش په‌ی بردن به‌م نهێنیی قه‌ییومییه‌ته‌، ئیتر هیچ پێویستی و واتایه‌ك له‌وه‌دا نامێنێته‌وه‌ که‌ یه‌ك به‌ یه‌کی ئه‌ڵقه‌کانی ئه‌و زنجیره‌ وه‌همی‌یه‌ پاڵ به‌ یه‌که‌وه‌ بده‌ن، به‌ڵکو به‌ ته‌واوه‌تی زنجیره‌که‌ هه‌ڵده‌گیرێت و هه‌موو شتێك ڕاسته‌وخۆ ڕووی له‌ "نهێنیی قه‌ییومییه‌ت" ده‌بێت!

**تیشكی سێ‌هەم:**

وا لـه نـاوەندی یـەك دوو "پێشـەكی"دا ئاماژە بۆ چمكێكی دەركەوتنی ئەو نـهێنیی قەییومییەتـه دەكەین كه لـه ناوەندی خەلاقییەتی خواوەنـد و كـارایی پـەروەردگاردا هەیە، وەك ئەوەی كه ئەم چەشنە ئایەتانەی خوارەوە ئاماژەیان بۆ دەكەن:

﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ (الرحمن:٢٩).

﴿فَعَّالٌ لِما يُرِيدُ﴾ (البروج:١٦).

﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ (الروم:٥٤).

﴿بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (يس:٨٣).

﴿فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ (الروم:٥٠).

كاتێ به چاوی تێرامانەوە دەڕوانینە بوونەوەران، دەبینین ئەو بوونەوەرانە: لە ناوەندی لافـاوی زەمـانـدا تـەپاوتل دەدەن و، كـاروان لـه دوای كـاروان دێـن و دەڕۆن. ئـەوەتا بەشێكیان كه دێن چركەیەكیان پێ ناچێت و یەكسەر ئاوا دەبن.. بەشێكی تریان تەنها بۆ ماوەی یەك خولەك دێن و پاشـان بـه ڕێـی خۆیـاندا دەڕۆن.. جۆرێكـی تریـان بـه پەلـه بـەم جیهانە بینراوەدا تێپەڕ دەبن و پاش سەعاتێك دەڕۆنە ناو جیـهانی غەیبـەوە.. هـەندێكی تـر بۆ ماوەی یەك ڕۆژ بارەكەی دەخات و پاشان كۆچ دەكات.. بەشێكی دیكـەیان سـاڵێك دەمێنێتـەوە ئنجـا دەڕوات.. بەشـێكی تریـش بـۆ مـاوەی چـەرخێك دێـت و پاشـان كـۆچ دەكات.. هەندێ تریان بۆ ماوەی چەند سەردەم و چەرخێك دەمێننەوە، ئنجا ئـەم جیهانـە بـەجێ دەهێڵـن.. بـەم جـۆرە، هەریەكـەیان دێـت و پـاش تـەواوكردنی ئـەو ئەركـەی پێـی سپێرراوە، كۆچ دەكات و ئەم جیهانە بەجێ دەهێڵێت.

جا ئەم گەشتوگوزارەی كـه ژیریـی مرۆڤ سەرسام دەكـات و ئـەم لافـاوە بـەخوڕ و سـەفەرە ڕانەوەسـتاوەی بوونـەوەران و بەدیـهاتووان، بـه ڕێسـایەكی ڕێكوپێـك و تەرازوویەكی ورد و حیكمەتێكی تەواو ئەنجام دەدرێت و، ئەو كەسەش كه جڵـەوی ئـەم گەشتە بەردەوامەی لەدەستدایە و سەركردەیی دەكات، بـه "بەسیرەت" دەیداتـه بـەر و بـه "دانست"یـش دەیخاتـه گـەڕ، هـەروەك بـه كارسازی‌یەكی ئـەوتۆیش بـەڕێی دەخـات كـه ئەگەر هەرچی ژیری هەن كۆ ببنەوە و ببن بە یەك هێشـتا ناگاتـه ئاستی زانینی حەقیقـەتی ئەم كۆچە و، پەی بە حیكمەتی نابات، چ جای ئەوەی كورتی و ناتەواویی تێدا ببینێت!

جا لە ناوەندی ئەم خەللاقییەتەی پەروەردگاردا، خواوەندی بەدیهێنەر ئەو بەدیهاتووە ناسك و خۆشەویستانەی خۆی، بە تایبەت زیندەوەران، دەباتەوە بۆ جیهانی پەنهانی غەیب، بێ ئەوەی مۆڵەتیان بدات کە لەم جیهانەدا بحەوێنەوە و.. ئەرکی سەرشانی ژیانی دنیایان لەکۆڵ دەکاتەوە، بێ ئەوەی بواریان بدات پشتێنی لێ شل بکەن و ماندوێتی‌یان دەربچێت. ئەوەتا بەردەوام ئەم میوانخانەیەی خۆی لە میوان پڕ دەکات و پاشان بێ ڕەزامەندیی ئەوان چۆڵی دەکات لێیان. بەم کارەش گۆی زەوی وەك تیانووسێکی چەشنی "تەختەی ڕەش" لێ دەکات و، قەڵەمی قەزا و قەدەریش، بە درەوشانەوەی ئەو زاتەی کە "یُحْـیِي و یُمِیـت"ە، هەمیشە تیایدا دەنووسێت و، ئەو نووسینەوانەش بە بەردەوامی دەگۆڕێت و نوێیان دەکاتەوە!

بەم پێیە، نهێنی‌یەك لە نهێنی‌یەکانی ئەم "کارایی"یەی پەروەردگار و "خەللاقییەت"ەی خواوەند و، داخوازی‌یەك لە داخوازی‌یەکانی و یەکێك لە هۆکارەکانی، لە ڕاستی‌دا، بریتی‌یە لە حیکمەتێکی گەورە و نەبڕاوە و لە سنووربەدەر. ئەم حیکمەتەش سێ لقی گرنگی لێ دەبێتەوە:

**لقی یەکەمی** ئەو حیکمەتە بریتی‌یە لەوەی کە:

هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی "کارایی" - چ جوزئی بێت و چ کوللی - لەزەتێك بەجێ دەهێڵێت، تەنانەت هەموو کارایی‌یەك لەزەتێکی تێدایە، بگرە کارایی‌یەکە خۆی لە خۆی‌دا خودی لەزەتەکەیە، بەڵکو لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لە خۆدەرخستنی ئەو وجوودەی کە خودی لەزەتەکەیە و ڕاپەڕینێکە بۆ خۆ دوورخستنەوە لەو عەدەمەی کە عەینی ئازارە.

جا مادەم هەموو خاوەن توانا و لێهاتنێك، بە لەزەت و تاسەمەندی‌یەوە چاوەڕوانە بزانێت کە لە ئەنجامی کارایی‌یەکی تایبەتی‌یەوە توانا و لێهاتنەکانی چی دەردەخەن و چ بەرهەمێکیان دەبێت؟.. هەروەها مادەم خۆدەرخستنی هەموو توانا و لێهاتنێك لە ئەنجامی کارایی‌یەکەوە - لە ڕاستی‌دا - لە چێژ و لەزەتێکەوە سەری هەڵداوە، هەروەك لەزەتێکیش بەرهەم دەهێنێت.. هەروەها هەموو خاوەن کەماڵێك بە تاسەمەندی و لەزەتەوە بە دوای خۆدەرخستنی کەمالاتی خۆی‌دا دەگەڕێت، کە بە "کارایی" خۆیان دەردەخەن..

لە کاتێکدا لەزەت و کەماڵێکی هەست پێ کراوی وەك ئەمە لە توێی هەموو "کارایی"یەکدا هەبێت و، کاراییش لە خۆی‌دا کەماڵ بێت و.. لە لایەکی تریشەوە لە

جیـهانی زیندەوەرانـدا چـەندین درەوشـانەوەی ئـەزەلیی میهرەبانی‌یـەکی فـراوان و خۆشەویستی‌یەکی بێ‌کۆتـایی بـەرچاو دەکـەوێت کـە لـە ژیـانێکی هەمیشـەیی‌یەوە هەڵقوڵاون.. ئەوا بێ هیچ گومانێ ئەو درەوشانەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە:

ئەو کەسەی خۆی لە لای بەدیهاتووانی خۆشەویست دەکات و، خۆشی دەوێن و، بە پێ‌بەخشینی نیعمەت و چاکە و بەخششەکانی بەم شێوە ڕەهایە، بەزەیی پیایاندا دێتەوە.. ژیـانی هەمیشـەیی و ئەبـەدیی ئـەو کەسـە، بێ‌گومـان داخـوازی: عیشـقێکی ڕەهـا و، خۆشەویسـتی‌یەکی خـاوێنی ڕەهـا و، لـەزەتێکی پـاك و بـەرزی ڕەهـا و، کاروبـارە موقەددەسە خوایی‌یەکانی تری وەك ئەمانەیە، کە شایانی قودسییەتی ئـەون و لەگـەڵ "پێویستی بوون"ی‌دا گونجاون. (گەر ئەم تەعبیرانە دروست بن).

جـا ئـەو کاروبـارە خوایی‌یانـە، بـەم چەشـنە کارایی‌یـە بـێ سـنوور و بەدیهێنەری‌یـە نەبڕاوەیە، هەردەم جیهان دەگۆڕێت و تازەی دەکاتەوە و ڕایدەوەشێنێت.

**لقـی دووهـەمی** حیکمـەتی ئـەم کارایی‌یـە خوایی‌یە ڕەهایـەی کـە ڕووی لـە "نـهێنیی قەییوومییەت"ە:

ئەم حیکمەتە بەسەر "ناوە جوانەکانی خوا"دا دەڕوانێت.

ئاشکرایە کە هەموو خاوەن "جوانی"یەك حەز دەکات جوانی‌یەکەی خۆی ببینێت و، پیشـانی غـەیری خۆیشـی بـدات.. هـەموو خـاوەن "کارامـەیی"یـەکیش پێـی خۆشـە بـە ڕاگەیاندن و پێش‌چاو خستنی کارایی‌یەکەی سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. کەواتە ئەو حەقیقەتە جوانە پەنهان و واتا ڕەنگینـە شـارراوەیە، چاوەڕوانن دەربـاز بـبن و پێش‌چاو بخرێن و سەرنجەکان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن.

ئنجا مادەم ئەم دەستوورە توندوتۆڵ و دامەزراوانە لـە هـەموو شتێکدا و، هـەر شتەش بەپێی پلەی خۆی، دەست بەکارن.. ئەوا دەبێ هەموو پلەیەکی یەك بە یەکی هەزار و یەك "نـاوە جوانـەکان"ی خـاوەن جوانیـی ڕەهـا و قـەییوومی شـکۆمەند، "جوانـی" و "کەماڵ"ێکی ڕاستەقینە و "حەقیقەت"ێکی ڕەنگینیـان تێـدا بێـت، بە شایەتیی: سـەرجەم بوونـەوەران و، درەوشـانەوە ئاشـکراکانی ئـەو ناوانـە بەسـەریانەوە و، ئامـاژەی نەخشونیگارەکانیان لەواندا. بەڵکو هەموو پلەیـەکی یـەك بـە یـەکی ئـەو نـاوە جوانانـەی خوای گەورە، هێندە "جوانی" و "کەماڵ" و "حەقیقـەتی قەشـەنگ و ڕەنگیـن"یـان تێدایـە کە سنووریان نی‌یە و لە ژمارە نایەن.

جـا لەبەرئـەوەی ئـەم بوونەوەرانـە لـە ڕاسـتیدا: ئاوێنـەی دەرخسـتن و دانـەوەی درەوشـانەوەکانی جوانیـی ئـەو نـاوە خاوێنانـە و چەند تابلۆیـەکی نـاوازەی ئـەوتۆن کـە نەخشونیگارەکانی ناوە جوانەکانیان تێدا پێشچاو دەخرێن و، لاپەڕەکانی ئـەو ناوانـەن، کە حەقیقەتە جوانەکانیان دەردەبڕن..

ئەوا ئـەو نـاوە بـەردەوام و هەمیشـەییانە، دەبێ درەوشـانەوە بێ سنوور و نـەخش و نیگـارە حەکیمـە لـە ژمارەبەدەرەکانیان پێشچاو بخەن و، لاپـەڕەی کتێبەکانیشـیان لـە پێشچاوی خاوەنە حەق و ڕەواکەی خۆیاندا ئاشکرا بکەن، کە خواوەندی "قـەییووم"ی شکۆمەندە، چ جای پیشاندانیان لە پێشچاوی گیاندار و خـاوەن هەسـت و شعوورە لـە ژمارەبەدەرەکاندا، تاکو ئەوانیش بیانخوێننەوە و سەرنجیان بدەن..

هەروەها دەبێ ئەم ناوانە: بە درەوشانەوەکانی خۆیـان هەمیشـە بوونـەوەران بگـۆڕن و بەردەوام نوێیان بکەنەوە، بەپێی ئەو عیشقە ئیلاهییە موقەددەسە و لەسەر بناغەی نهێنیی قەییوومییەت. تاکو لە تەنها یەك شتی دیاریکراودا چەندین تابلۆی نەبڕاوە و بێکۆتـایی پیشان بدرێن و، لە تەنها یەك کەسیشدا چەندین کەسی بێ سنوور پێشچـاو بخرێـن و، لـە تەنها یەك حەقیقەتیشەوە گەلێ حەقیقەتی زۆر و زەبەندە دەربخرێن.

**تیشکی چوارەم:**

کە **لقی سێهەمی** حیکمەتی کارایی بەردەوام و سەرسووڕهێنی ناو گەردوونە..

کە بریتییە لەوەی:

هەموو "میهرەبان"ێك دڵخۆشە بەوەی کە خەڵکی ڕازی بکـات و.. هـەموو "خـاوەن سۆز و بـەزەیی"یـەکیش شـادمان دەبێـت ئەگـەر شـادمانی بخاتە دڵـی کەسـانی تـرەوە و.. گشت "خاوەن خۆشەویستی و مەحەبەت"ێکیش دڵخۆش دەبێت گەر ئـەو بەدیهاتووانـە دڵخـۆش بکـات کـە شایسـتەی دڵخـۆش کـردنن و.. هەمـوو "خـاوەن هیممـەت و شەهامەت و غیرەت"ێکیش بە بەختەوەرکردنی کەسانی تر بەختـەوەر دەبێـت و.. گشـت "دادپەروەر"ێکیش پێی خۆشە کە خـاوەن مافەکان مـافی خۆیـان وەربگـرن و سوپاسـی بکەن لەسـەر ئـەوەی کـە مـافی ڕەوای بە حـەق داوە و سزای ئاراستەی ئـەو کەسـانەش کردووە کـە حـەقیان پێشێل کـردووە و.. هـەموو "وەستایەکی کارامە"ش بـە پێشچـاو خستنی سنعەتەکەی دەنازێت و، شـانازیش بـە ناوبـانگ دەرکردنـی کارامـەیی و لێـهاتنی خۆیـەوە دەکـات کاتێ سنعەت و دروستکراوەکانی بـە جوانـترین شـێوە ئــەو ئەنجامانـە بەرهەم دەهێنن کە چاوەڕانی دەکرد لێیان..

هەریەك لەم دەستوورانەی باس کران، قاعیدەیەکی بنەڕەتی و قووڵ و دەست بەکار و ڕەگداکوتاون، چ لە سەرجەمی گەردوون و چ لە جیهانی مرۆڤدا.

لە "هەڵوێستی دووهەمی وتەی سی و دووهەم"دا سێ نموونەمان هێناوەتەوە کـە دەری دەخەن: ئەم دەستووورە بنەڕەتی‌یانە، لە درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورەدا دەست بەکارن. پێمان باشە لێرەدا ئەو سێ نموونەیە کورت بکەینەوە. بۆیە دەڵێین:

هـەر کەسـێك میهرەبانی‌یـەکی زۆر و هیممـەتێکی بـەرزی لەگـەڵ ئەوپـەڕی سەخاوەت و کەرەمدا بێت، گەلێ بەختەوەر و خۆشحاڵ دەبێت کە لـە بەخشندەیی و کەرەمی خۆیـەوە دەستگرۆیی هـەژار و دەستکورت و بێ‌نەوایان بکـات. بۆیـە چـەندین سفرەی نایاب و پڕ لە خواردەمـەنیی بـەنرخیان لەسـەر پشتی کەشتی‌یەکی ئـاوەداندا بـۆ ڕادەخات کە بـەناو دەریاکانی زەوی‌دا بیـانگێڕێت، تـاکو لـە نـاوەندی گەشتوگوزار و سەیرانێکی جوان و نیاندا، دڵخۆشـی و شـادمانی بخاتـە دڵیانـەوە.. ئـەو کەسـەی کـە ئـەم میواندارییـە سـاز دەکـات، لـەزەت لـەو ڕوواڵـەتی شـوکر و پێزانینـە دەچێژێـت کـە ئـەو هەژارانە دەری دەبڕن و، گەلێ دڵخۆش دەبێت کـە دەبینێـت ئـەو هەژارانـە لـەزەتی ئـەو نیعمـەتە جـوان و بەتامانـە دەچێـژن و، شـانـازی بە خۆشـحاڵیی ئـەوان دەکـات و بـە دڵخۆشی و شادمانی‌یان دەنازێت. هەموو ئەمانە، بـەپێی ئـەو خووڕەوشتە بڵند و سیفەتە بەرزانەی کە خواوەند لە سروشتی ئەودا داینـاون.

جـا ئەگـەر ئـەو مرۆڤـەی کـە وەك ئـەمینداریێك وایە بەسـەر سـپاردە و ئەمانەتـەکانی بەدیهێنەری بەخشندەوە و، جگە لە فەرمانبەر و کارمـەندێکی دابەشـکردنی نیعمەتـەکانی خواوەند هیچی تر نی‌یە، بە: ڕێزنانی لە خەڵکی لە ناوەندی میواندارییـەکی جوزئـی‌دا، تا ئەم ڕادەیە، لەزەت بچێژێت و شادمان و دڵخۆش بێت.. دەبـێ خواوەنـدی "حـەیی" و "قەییوم" - ولله المثل الأعلى - چۆن بێت کە لە لایەن چەندین بەدیهاتووی بـێ سنووری زینـدەوەران و مـرۆڤ و مەلائیکـەت و جیننـی و ڕۆحانی‌یەکانـەوە، شـوکرانە و سـوپاس دەکرێت و دەستی ستایش و ڕازی بوون و نزا و لاڵانەوەی بۆ بـەرز دەکرێتـەوە، لەوانـەی کـە لـە کەشتیی خواوەنـدی میـهرەبان(زەوی)دا هـەڵی گرتوون و، بـە جۆرەکـانی ئـەو خواردەمەنی‌یانـەی کـە لەگـەڵ چێـژ و ڕۆزیـی ئـەواندا بگونجێـت نیعمەتـە ئاشـکرا و پەنهانـەکانی خۆی بەسـەردا بـاراندوون و، بـە فـەزڵ و چاکـەی خۆیشـی ئـەم گەشـتە

پەروەردگارییانەی بەناو هەموو لایەکی گەردووندا پێ کردوون؟ ئەمە جگە لەوەی کە هەموو یەکێك لە بەهەشتەکانی ئەودنیای خانەی هەمیشەییشی بۆ کردوون بە میوانخانەیەکی بەردەوامی ئەوتۆ کە هەرچی دەروون حەزی لێ بکات و چاویش لەزەتی لێ ببات تیایاندا ئامادەی کردووە!

جا هەموو نیشانەکانی: حەمد و سوپاسگوزاری و، ڕەزامەندی، کە ڕوویان لە خواوەندی حەیی و قەییوومە و، لە سەرانسەری بوونەوەرانەوە دەردەچن و، خۆشی و شادمانیی ئەوان دەردەخەن بەو نیعمەت و بەخششە گشتی و زۆر و زەبەندانەی پێیان بەخشراوە.. هەموو ئەمانە، لەو کاروبار، خواییە موقەددەسانەوە پەیدا بوون کە داخوازی ئەم کارایی و خەللاقییەتە بەردەوامەن. ئەو کاروبارانەی کە لە تەعبیرکردنیاندا دەستەوسانین و مۆڵەت نەدراوین ئاشکرایان بکەین. بەڵکو تەنها دەکرێ بە چەند ناوێکی وەك: "ڕەزامەندیی موقەددەس" و "شانازیی موقەددەس" و ناوەکانی تری هاوچەشنیان ئاماژەیان بۆ بکرێت، لەو چەشنە ناوانەی کە ئێمەی مرۆڤ واتا خاوێنەکانی پەروەردگارێتییان پێ تەعبیر دەکەین.

نموونەیەکی تر:

ئەگەر سنعەتکارێکی کارامە و لێهاتوو "گرامفۆن"ێکی بێ قەوانی وا دروست بکات کە خاوەنەکەی چیی لێ دەوێت ئەو دەری ببڕێت و بە باشترین شێوەش کە ئەو پێی خۆشە کار بکات. دەبێ ئەو وەستایە چەندە شانازی بەم سنعەتەیەوە بکات و، چەندە لەزەت بچێژێت کە ببینێت سنعەتەکەی بەم جۆرە کار دەکات و، چەندەش پێی شادمان بێت تا وای لێ بێت لەبەر خۆیەوە بڵێت: "ماشاء اللّٰه"!

جا ئەگەر سنعەتێکی بچووکی ڕواڵەتی - کە بەدیهێنانی ڕاستەقینەش نییە - تا ئەم ڕادەیە هەستی شانازی و ڕازی بوون لە گیانی وەستا و داهێنەرەکەیدا بورووژێنێت.. دەبێ کردگاری دانا چۆن بێت کە هەموو ئەم بوونەوەرانەی بەدی هێناوە و، سەرجەم بەدیهاتووانی کردووە بە مۆسیقایەکی خوایی ئەوتۆ بە چەندین جۆر گوفتار و ئاواز، شوکر و تەسبیح و تەقدیسی خۆیان دەربڕن و، وەك کارگەیەکی سەرسووڕهێنی لێ کردوون. وێڕای ئەوەی کە سنعەتێکی وردی جیاواز و خاوەن ئیعجازی بە هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەران و گشت جیهانێك لە جیهانەکانی گەردوون

بەخشیوە و، جگە لەو مەکینە زۆرانەی کە لە ناو کەللە سەری هەموو زیندەوەرێکدا داینراون و لە "گرامفۆن" و "کامێرا" و ئامێرەکانی "پەخش و وەرگرتن" دەچن. تەنانەت لەسەری بچووکترین زیندەوەریشدا شتی گەلێ سەیرتری لەم ئامێرەدا ئیعجاز بەخشانە داناوە! تەنانەت نەك تەنها گرامی بێ قەوان و، کامێرای بێ عەدەسە و، تەلەفۆنی بێ وایەر، بەڵکو جگە لەوانەش گەلێ مەکینەی سەرسوورهێنەرتر و کاری موعجیز و دەراسای لەوانە گەلێ گەورەتری لە کەللەسەری مرۆڤدا داناوە!

جا واتاکانی: "شانازیی موقەددەس" و "ڕەزامەندیی موقەددەس" و واتا مەزن و کاروبارە موقەددەسە پەروەردگاری‌یەکانی تری هاوچەشنیان، کە بە ویستی خواوەند ئەم مەکینانە لە سەری ئەم مرۆڤەدا بەرهەمیان دەهێنن، کە لە "أحسن تقویم"دا بەدی هاتووە.. ئەم کارە بە حەتمی داخوازی ئەم "کارایی"یە بەردەوام و بینراوەیە.

نموونەیەکی تر:

فەرمانڕەوای دادگەر کاتێ مافی ستەم لێکراو لە ستەمکار دەسێنێتەوە و حەق لە شوێنی خۆیدا دادەنێت، لەزەت و خۆشی و ڕەزامەندی لەم کارەی دەچێژێت و.. بە پاراستنی لاوازان لە شەڕی زلهێزان، شانازی دەکات و.. کاتێ کە مافی ڕەوا و شایان بە هەموو کەسێك دەدات، دڵخۆش و شادمان دەبێت. هەموو ئەمانەش لە داخوازی‌یەکان و یاسا بنەڕەتی‌یەکانی "دادگەری" و "فەرمانڕەوایەتی"ن.

کەواتە فەرمانڕەوای دانا و دادگەر و حەیی و قەییووم، کاتێ مەرجەکانی ژیان لە شێوەی مافی ژیاندا بە بوونەوەران بە تایبەتی زیندەوەران دەبەخشێت و.. چەند کۆ ئەندامێکی ئەوتۆیان دەداتێ کە پارێزگاریی ژیانیان بکات و.. بەوپەڕی سۆز و میهرەبانی‌یەوە لاوازان لە شەڕی زلهێزان دەپارێزێت و.. دەرخستنی "نهێنیی دادپەروەری" لە گەردووندا دەخاتە ئەستۆی خۆی، بەوەدا کە مافی تەواوەتی بە هەموو زیندەوەرێك دەبەخشێت و، هەندێك سزای ستەمکاران لەم دنیایەدا دەدات و، بە تایبەتیش لە دادگای گەورەی حەشری مەزندا دادگەریی هەرە مەزنی بە تەواوەتی دەدرەوشێتەوە.. ئەوا هێندە کاروباری پەروەردگاری و واتای قودسی لە هەموو ئەمانەوە سەر هەڵدەدەن کە ئێمە لە دەربڕینیاندا دەستەوسانین و، هەمووشیان داخوازی ئەم کارایی‌یە بەردەوامەی ناو گەردوونن.

بەم جۆرە و لەبەر ڕووناکیی ئەم سێ نموونەیەدا، دەڵێین:

ناوە جوانەکانی خوای گەورە بە گشتی و یەك بە یەکیشیان بە تایبەتی، داخوازی ئەم خەلاقیەتە بەردەوامەن. چونکە ئەو "ناو"ە لە ناوەندی ئەم کاراییە بەردەوامەدا دەبێت بە تەوەرەی بەشێك لەم کاروبارە خواییە موقەددەسانە.

جا مادەم:

هەموو توانا و لێهاتنێك لە کاتی دەرکەوتن و ئاشکرابوونیدا سوود و بەروبووم دەبەخشێت و، ئەم کارەشی لەزەت و شادی و خۆشحاڵیی دەداتێ.. هەروەها هەموو کارمەندێك لە دەمی تەواوکردن و ئەنجامدانی کارەکەیدا بە جۆری پێویست، هەست بە حەوانەوەیەکی لەڕادەبەدەر دەکات و.. بەرچنیی چەندەها بەروبوومی زۆریش لە تەنها یەك دانە تۆو، یان بەدەستهێنانی قازانجی سەدان درەم لە مایەی تەنها یەك درەم، چەند حاڵەتێکن کە دڵی خاوەنەکانیان خۆش دەکەن و بە بازرگانییەکی قازانج بەخش دادەنرێت بۆیان..

مادەم هەموو ئەمانە وان، ئەوا دەبێ مرۆڤ لەم ڕوانگەیەوە لە ڕادەی گرنگیی ئەو واتا موقەددەس و کاروبارە پەروەردگارییانە بگات کە ئەنجامی ئەو کاراییە بەردەوام و خەلاقییەتە پەروەردگارییەن، کە:

کۆتایی بە ئەرکی سەرشانی هەموو بەدیهاتووان دەهێنن، دوای ئەوەی کە لە چەندین کارو ئەرکی گرنگدا خستنیە کار و، بەم کۆتایی هێنانەش بە کارەکانی ئەستۆیان بۆ چەندین پلەوپایەی بەرز و بڵندتر بەرزی کردنەوە. وەك ئەوەی: تۆڤەکان بۆ پلەی کانزایی و، کانزاکانیش بۆ پلەی ژیانی ڕووەکی و، ڕووەکەکانیش بۆ ژیانی ئاژەڵی، بەو ڕۆزی پێ بەخشینەی دەیانداتێ، بەرزی کردنەوە، هەروەها زیندەوەرە ئاژەڵەکانیشی، بە شوکر و حەمد، بۆ پلەی بەرز و خاوەن هەستی مرۆڤایەتی برد و بڵندی کردنەوە و.. وا لە هەموو بوونەوەرێکیش دەکەن کە دوای نەمانی بوونە ڕواڵەتییەکەیان چەندین وجوودی وەك: گیان و، ماهییەت و، هەوییەت و، شێوەکەیان بەجێ بهێڵن، تاکو دوای خۆیان ئەرکەکانی سەرشانیان بۆ ئەوان بهێڵنەوە. "وەك لە مەکتووبی بیست و چوارەم"دا ڕوون کراوەتەوە.

**وەڵامێکی گومانبڕ بۆ پرسیارێکی گرنگ:**

هەندێك لە گومڕایان دەڵێن:

ئەو کەسەی کە بە کاراییەکی بەردەوام ئاڵوگۆڕ بە بوونەوەران بکات، دەبێ خۆیشی ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت.

**وەڵام:**

حاشا.. سەد هەزار جار حاشا.. هەرگیز وا نییە!

گۆڕانی ڕووی ئاوێنەکانی سەر زەوی، هەرگیز نابێت بە بەڵگە لەسەر گۆڕانی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان، بەڵکو دەبێت بە بەڵگە لەسەر دەرخستنی نوێ بوونەوەی درەوشانەوەکانی ئەو خۆرە..

جا لە کاتێکدا کە "خۆر" وا بێت، دەبێ خواوەندی ئەزەلی و ئەبەدی و سەرمەدی چۆن بێت کە لە کەماڵێکی ڕەها و پێویستی نەبوونێکی ڕەهادایە بە خەڵکی و، گەورە و موتەعال و خاوێنە لە ماددە و شوێن و سنوور و ئیمکان و حدووث؟ کەواتە گۆڕانی ئەم زاتە ئەقدەسە بە یەکجاری مەحاڵە.

پاشان گۆڕانی بوونەوەران هەرگیز بەڵگە نییە لەسەر گۆڕانی خوای گەورە، بەڵکو - بە پێچەوانەوە - بەڵگەیە لەسەر نەگۆڕانی. چونکە ئەو کەسەی بە ڕێکوپێکییەکی ورد چەندین شتی زۆر و زەبەندە بجووڵێنێت و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا بهێنێت، دەبێ خۆی نەجووڵێت و گۆڕانی بەسەردا نەیەت. وەك ئەوەی کە ئەگەر تۆ چەند "تۆپ"ێکی گەورە و بچووك بە چەند تاڵە دەزوویەکەوە ببەستیت و بە جووڵەیەکی ڕێکوپێك و بەردەوام بیانبزوێنیت و لە چەند بارودۆخێکی ڕێکوپێکدا دایانبنێیت، دەبێ خۆت لە شوێنی خۆتدا نەجووڵێیت، دەنا ئەو ڕێکوپێکییە دەشێوێنیت و لە دەستی دەدەیت!

هەروەها یەکێك لە دەستووره بەناوبانگەکان ئەوەیە کە دەڵێت: "ئەو کەسەی شتێك بە ڕێکوپێکی دەبزوێنێت دەبێ خۆی نەبزوێت و، ئەوەش کە بەردەوام شتان دەگۆڕێت دەبێ خۆی گۆڕانی بەسەردا نەیەت. تاکو ئەو کارە لەو ڕێکوپێکییەی خۆیدا بەردەوام بێت".

دووهەم: "ئاڵوگۆڕ" لە: حدووث و، لە نوێ بوونەوە بە نیازی گەیشتن بە کەماڵ و، لە پێویستی و، مادییەت و، ئیمکانەوە.. سەرهەڵدەدات..

بەڵام خۆ زاتی ئەقدەسی خواوەند: قەدیم و، ئەزەلییە و، لە کەماڵ و، پێویستی‌نەبوونێکی ڕەهادایە و، خاوێنە لە مادده و، "واجب الوجود"ە.. کەواتە ئاڵوگۆڕ سەبارەت بەو کارێکی تەواو مەحاڵە.

**تیشکی پێنجەم:**

*مەسەلەی یەکەم:*

ئەگەر بمانەوێ درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "القیّوم"ی خوای گەورە ببینین، دەبێ ئەندێشەمان هێندە فراوان بکەین کە بتوانێت سەرانسەری گەردوون ببینێت و، دوو چاویلکەشی لێ دروست بکەین: یەکێکیان بە وێنەی ڕوانینگا(المرصد) وابێت دوورترین شوێنی لێ دیاربێت و، ئەوی تریشیان بتوانێت بچووکترین گەردیلە ببینێت!

جا ئەگەر بە چاویلکەی یەکەم بڕوانین، دەبینین:

ملیۆنەها "تۆپ"ی گەورە و بارستایی زەبەلاح، کە هەندێکیان هەزاران جار لە گۆی زەوی گەورەترن، بە لێ‌درەوشانەوەی ناوی "القیوم" و بێ ئەوەی هیچ ستوونێکیان لە ژێردا ببینین، بەرز کراونەتەوە و، لە ناوەندی ماددەی "ئەثیر"ێکی لە هەوا ناسکتردا دەڕۆن و، بۆ ئەنجامدانی چەند ئەرکێکی گەورە و گرنگ لە جوولە و وەستانی ڕواڵەتی‌یاندا دەخرێنە کار و ملکەچ دەکرێن.

با ئێستاش بڕۆین چاویلکەکەی تر بکەینە چاومان، تاکو بچووکترین شت ببینین:

ئەوەتا ئێمە لە بەردەم چەندین گەردیلەی لەڕادەبەدەر بچووکداین، کە بەهۆی نهێنیی "قەییوومییەت"ەوە جەستەی زیندەوەرانیان پێکهێناوە و، بە وێنەی ئەستێرەکانیش چەند بارودۆخێکی ڕێکوپێکیان گرتووەتە خۆ و، بەپێی ڕێسایەکی دیاریکراو و ڕێکخستنێکی تایبەتی دەجوولێن و، بەم جموجوولەشیان گەلێ ئەرکی زۆر و زەبەندە ئەنجام دەدەن. گەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ ڕوون بێتەوە، فەرموو سەیری خڕۆکە سوور و سپی‌یەکانی ناو خوێن بکە؛ دەبینیت بە چەند جموجوولێکی تایبەتی و وەك جوولەی موریدی تەریقەتی مەولەوی لە دەمی حاڵ و جەزبەدا دەجوولێن، تاکو بەم جموجوولانەیان لە ناو لافاوی بە خوڕەمی خوێندا، گەلێ ئەرکی گرنگ ئەنجام بدەن.

* * *

**پوختەی پوختەی ئەم باسە[1]**

پێمان باش بوو لێرەدا پوختەیەك بنووسین کە ئەو ڕووناکی‌یە خاوێنەی ئەنجامی تێکەڵبوونی نوورەکانی هەر شەش ناوەکانی ئیسمی ئەعزەمە، بە یەك جار دەربخات، بە وێنەی تێکەڵبوونی حەوت ڕەنگەکانی ڕووناکیی خۆر، ولله المثل الأعلى.

(١) ئەمە بناغەیەکە شەش نامیلکە بچووکەکانی بریسکەی سی‌هەم پاڵیان پێوە داوە و کورتەی باسەکانیانە و، پوختەیەکی یەکجار کورتی نهێنی‌یەکانی هەر شەش ناوەکانی ئیسمی ئەعزەمە. (دانەر)

جا بۆ مەبەستی بینینی ئەم نووره خاوێنە، وا ئەم پوختەیە دەهێنین:

فەرموو بیر لە بوونەوەرانی ناو سەرانسەری گەردوون بکەرەوە و، لە پشتی ئەم درەوشانەوە هەرە مەزنەی ناوی "القیوم"ەوە کە "ڕاگیربوون" و "بەردەوامی" و "مانەوە"ی پێ بەخشیون، بۆیان بڕوانە.. دەبینیت کە: درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحيّ" ئەو بوونەوەرە زیندووانەی بە درەوشانەوەی ڕوونی خۆی درەخشاندووە و، بە نووره جوانەکەشی سەرجەم بوونەوەرانی ڕووناك کردووەتەوە، بە ڕادەیەك کە دەتوانرێت بریسکانەوەی نووری "ژیان" بەسەر هەموو زیندەوەرانەوە ببینرێت..

ئێستا لە پشت ناوی "الحيّ"ەوە بۆ درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الفرد" بڕوانە.. دەبینیت: ئەم ناوە جوانە، سەرجەم بوونەوەرانی - بە گشت جۆر و بەشەکانیەوە - لە ناوەندی یەك "وەحدەت"دا کۆکردووەتەوە، ئەوەتا مۆری "وەحدانییەت" لە ناوچاوی هەموو شتێك دەدات و هی "ئەحەدییەت"یش لەسەر ڕوخساری هەموو شتێك دەنەخشێنێت و، بەم کارەی وا لە هەموو شتێك دەکات کە بە چەندین زمانی نەبڕاوەی بێ سنوور درەوشانەوەی ناوی "الفرد"ی خواوەند ڕابگەیەنن..

پاشان لە پشتی ناوی "الفرد"ەوە بۆ درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحکم" بڕوانە.. دەبینیت: ئەم ناوە جوانە هەموو بوونەوەرانی کوللی و جوزئیی، هەر لە مەزنترین بازنەوە تا بچووکترینیان و هەر لە ئەستێرەکانەوە تا گەردیلەکان، هەموویانی لە خۆدا کۆکردووەتەوە و، ڕێسایەکی بەرهەمدار و ڕێکوپێکیەکی حەکیم و پێکەوەگونجانێکی سوودبەخشی ئەوتۆشی بە هەموو بوونەوەرێك داوە کە شایانیەتی و لەگەڵیدا دەگونجێت. بە ڕاستی ئیسمی ئەعزەمی "الحکم" سەرجەمی بوونەوەرانی ڕازاندووەتەوە و، بە لێدەرکەوتنی درەخشانی خۆیشی ئارایشتی داوە!

پاشان لە پشتی درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "الحکم"ەوە، بۆ درەوشانەوەی هەرە گەورەی ناوی "العدل" بڕوانە کە لە سەرنجی دووهەمدا ڕوونمان کردەوە.. دەبینیت: ئەم ناوە جوانە: گشت بوونەوەران و سەرجەم شتانی ناوی، بە کێشانە و پێوانەی ورد و بە تەرازووی دادگەری خۆی و لە ناوەندی کاراییەکی بەردەوامدا، بەڕێوە دەبات. بە ڕادەیەك کە ژیریی هەموو عاقڵانی گرفتاری سەرسامی و سەرسوورمان کردووە! چونکە ئەگەر تەنها یەك دانە لە ئەستێرەکانی ئاسمان بۆ ماوەی تەنها یەك چرکە هاوسەنگیی خۆی لەدەست بدات، واتە بۆ یەك چرکە لە تەجەللیی ناوی "العدل" بترازێت، ئەوا بە

تەواوی پشێوی لە نێوان هەموو ئەستێرەکاندا دەنێتەوە و، بێ هیچ گومانێك ئەم کارە دەبێت بەهۆی بەرپابوونی قیامەت!

کەواتە هەموو یەکێك لە "بازنەکانی وجوود" و گشت بەدیهاتووەکانی ناویشیان، هەر لە بازنە گەورەکانەوە کە ناوی ڕێی کاکێشانی لێ نراوە، هەتا جموجوولەکانی بچووکترین بوونەوەرانی وەك خڕۆکە سوور و سپییەکانی لەش، هەریەکەیان بە بڕین و دوورینێکی تایبەتی بڕراوە و، بە تەقدیرێکی ورد هەڵسەنگێنراوە و، بە چەند تەرازوویەکی هەستیاریش قیاس کراوە و، بارێکی تایبەتی و شێوەیەکی دیاری کراویشی پێ دراوە، بە چەشنێك کە هەموو یەکێکیان، هەر لە سوپای ئەو ئەستێرە زۆر و زەبەندانەوە کە لە بۆشایی ئاسماندا دەدرەوشێنەوە تا دەگاتە سوپای گەردیلە یەکجار بچووکەکان، گوێڕایەڵیی تەواوەتی و ملکەچ کردنی ڕەها و فەرمانبەرداریی کامڵ بۆ ئەو فەرمانانە دەنوێنن کە لە لایەن خاوەنی فەرمانی "کن فیکون"ەوە دەردەچن.

جا ئێستا لە ناوەند و لە پشتی درەوشانەوەی هەرە مەزنی ناوی "العدل"ەوە، بڕوانە و سەیری ئەو درەوشانەوە ئەعزەمەی ناوی "القدوس"ی خواوەند بکە کە لە سەرنجی یەکەمدا ڕوونمان کردەوە.. دەبینیت: ئەم درەوشانەوە هەرە مەزنەی ناوی "القدوس" سەرجەم بوونەوەرانی بە پاکوخاوێنی و ساف و بریسکاوەیی و ڕازاوەیی و جوانی ڕاگرتووە و، وەك چەند ئاوێنەیەکی جوان و خاوێن و شایانی دەرخستنی جوانیی خواوەندی "بدیع"ی لێ کردوون و، شایستەیی پێشچاو خستنی درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی، پێ بەخشیون!

* * *

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

ئەم ناوانە و شەش نوورەکانی ئیسمی ئەعزەم، سەرجەمی گەردوونیان گرتووەتەوە و.. گشت بوونەوەرانیان بەسەر کردووەتەوە و.. چەند پەردەیەکی ئەوتۆشیان بەسەر ئەو بوونەوەرانەدا داوە کە بە ڕەنگە جۆراوجۆرەکان و نەخشونیگارە ناوازە و ئارایشتە ڕەنگینە جیاجیاکان - ئەو پەردانە - ڕازاونەتەوە.

* * *

*مەسەلەی دووهەمی تیشکی پێنجەم:*

هەروەك جیلوەیەکی درەوشانەوەی "قەییوومییەت" و تیشکێکی ڕووناکییەکەی بەسەر ئەم گەردوونەوە، سەرانسەری گەردوون دەکات بە مەزهەری "تاکی" و

"شکۆمەندی"ی خوای گەورە.. ئەوا هەر ئەو جیلوە و تیشکە، مەزهەری: "تەنیایی" و "جوانی"ی خواوەند بەسەر ئەم مرۆڤەشەوە دەردەخات کە تەوەرە و بەروبوومی خاوەن هەست و شعووری گەردوونە! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە:

ئەم بوونەوەرانەی بە نهێنیی "قەییوومییەت" ڕاگیر بوون، لە ڕوویەکی ترەوە لەسەر ئەم مرۆڤە بەندن کە کامڵترین مەزهەری درەوشانەوەی ناوی "القیوم" دەنوێنێت! واتە "قەییوومییەت" بە چەشنێك لە مرۆڤدا دەردەکەوێت کە مرۆڤی کردووە بە ستوونێکی ڕاگیرکەری سەرجەمی بوونەوەران. بەو واتایەی کە: زۆربەی ئەو دانست و بەرژەوەندی و ئامانجانەی بە بوونەوەرانەوە دەبینرێن، ڕوویان لە مرۆڤە.

بەڵێ، دروستە بوترێ: خواوەندی حەیی و قەییووم ویستوویەتی "مرۆڤ" لەم گەردوونەدا بێت، بۆیە ئەم گەردوونەی لەبەر ئەو دروست کردووە! چونکە "مرۆڤ" بەو تایبەتکارییە گشتییانەی کە خوای گەورە لەودا دایناون، دەتوانێت پەی بە هەموو ناوە جوانەکانی خوا ببات و بیانچێژێت. ئەوەتا بۆ نموونە: لە ڕێی چەشتنی لەزەتی ئەو ڕۆزییانەی بەسەریدا دەبارێن، لە گەڵی واتای ئەو ناوانە دەگات. کەچی مەلائیکەت لەبەر ئەوەی ڕۆزییەکان ناچێژێت، ناگاتە ئاستی پەی بردن بەو ناوانە!

جا لەبەر جامیعییەتی گرنگیی مرۆڤ، خواوەندی حەیی و قەییووم مرۆڤی وا بەدیهێناوە کە هەست بە هەموو ناوە جوانەکانی بکات و گشت جۆرەکانی چاکەکاریی خۆیشی پێ دەناسێنێت و تامی نیعمەتەکانی خۆیشی پێ دەچێژێت. دەبینیت "گەدەیەکی ماددی"ی بە مرۆڤ داوە، تاکو بتوانێت لە ڕێیەوە ئەو نیعمەتە بەتامانە بچێژێت کە خواوەند پێی بەخشیوە و لەسەر سفرەیەکی فراوانی بە ئەندازەی زەوی بۆی داناوە..

پاشان "ژیان"ێکی داوەتێ و، ئەم ژیانەشی بە وێنەی ئەو گەدە ماددییە لێ کردووە، ئەوەتا مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێی ئەم ژیانەوە لەزەتی جۆرەهای ئەو نیعمەتانە بچێژێت کە لەسەر سفرەیەکی فراوان و ڕاخراوی بەردەمیدا ئامادە کراون و، بەو هەست و نەستانەش، کە دەتوانرێت بە وێنەی دەست بۆ ئەو نیعمەتانە درێژ بکرێن، لەزەت لەو نیعمەتانە ببات. ئەو کاتەش ئەم ژیانە دەتوانێت، بە جۆرەها شوکرانە و سوپاسگوزاری، مافی تەواو بەو نیعمەتانە بدات..

پاشان لە سەرووی ئەم گەدەی ژیانەشەوە، گەدەی "مرۆڤایەتی"ی پێ بەخشیوە! کە ئەویش - بە هەمان جۆر - داوای نیعمەت و ڕۆزیی خۆی دەکات. بۆیە خواوەند "ژیری" و "بیر" و "ئەندێشە"ی بە وێنەی دەست بەو گەدەیە بەخشیوە، کە هەریەك لەمانە

دەتوانێت بگاتە چەند ئاسۆیەکی گەلێ فراوانتر لە مەیدانەکانی ئەم ژیانە بەرچاوە. ئەو کاتەش "ژیانی مرۆڤ" دەتوانێت ئەو شوکر و سوپاسەی لە ئەستۆیدایە بەرامبەر بەدیهێنەری خۆی، جێبەجێی بکات. چونکە سفرەیەکی پڕ لە نیعمەتی ئەوتۆ لە بەردەم ئەم گەدەیەدا ڕاخراوە کە بە فراوانیی ئاسمانەکان و زەوییە..

پاشان بۆ ئەوەی سفرەیەکی گەورەی پڕ لە چەندین نیعمەتی تر لە بەردەم مرۆڤدا ڕابخات، عەقیدە و باوەڕی "ئیسلام و ئیمان"ی وەك گەدەیەکی مەعنەوی لێ کردووە کە ئەوانیش داوای چەندین ڕۆزیی مەعنەویی زۆر دەکەن! بۆیە سفرەیەکی پڕ لە ڕۆزیی مەعنەویی بۆ ئەم گەدە ئیمانییە لە دەرەوەی مومکیناتی بینراودا ڕاخستووە و، ناوە جوانەکانی خوای گەورەی لەو سفرە مەزنەدا داناوە! لەبەر ئەوە، "مرۆڤ" لە ڕێی ئەم گەدە مەعنەوییەوە، هەست بە چەشتنی چەند چێژێکی نەبڕاوەی بەرز دەکات کە لە سەرچاوەی درەوشانەوەکانی "الرحمن" و "الحکیم"ەوە هەڵقوڵاون و، لە تاوا (الحمد لله علی واسع رحمته وجلیل حکمته) لەبەر خۆیەوە دووپات دەکاتەوە.. بەم جۆرە، بەدیهێنەری بەخشندە مرۆڤی لە ڕێی ئەم گەدە مەعنەوییە مەزنەوە لەو سفرەیە بەهرەمەند کردووە، تاکو مرۆڤ چەندین نیعمەتی لە ژمارەبەدەری خواوەند دەستی خۆی بخات، بە تایبەت چێژەکانی: خۆشویستنی خوای گەورە لەو گەدە مەعنەوییەدا، چونکە ئەو چێژانە دارای چەند ئاسۆ و مەیدانێکی نەبڕاوە و بێ سنوورن.

بەم جۆرە، خواوەندی "حەیی و قەییووم" مرۆڤی کردووە بە مەڵبەند و تەوەرەی گەردوون، تەنانەت گەردوونی بۆ گوێڕایەڵ و ملکەچ کردووە و، سفرەیەکی گەورەی بە ئەندازەی گەردوونیشی لە بەردەمدا ڕاخستووە، تاکو هەموو جۆرە گەدە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ تامی نیعمەتەکانی سەر ئەو سفرەیە بچێژن و لەزەتی لێ ببەن!

سەبارەت بە حیکمەتی ئەوەش کە: گەردوون لە ڕوویەکەوە بەهۆی "نهێنیی قەییوومییەت"ەوە لەسەر مرۆڤ ڕاگیر بووە، ئەوا لەبەر ئەو سێ کارمەندی و ئەرکە گرنگەیە کە خراونەتە ئەستۆی مرۆڤەوە:

یەکەمیان:

ڕێکخستنی گشت جۆرەکانی نیعمەتە بڵاوەکانی ناو گەردوونە بەم مرۆڤە و.. گرێدانیانە بە پەیوەندیی ئەو سوودانەی تایبەتن بە مرۆڤەوە، کتومت وەك هۆنینەوەی مورووەکانی تەزبێح بە تاڵە دەزوویەك. ئەوەتا دەبینیت سەری دەزووی نیعمەتەکان بە:

مرۆڤ و، بەرژەوەندی و سوودەکانیەوە بەستراون! بەم جۆرە، مرۆڤ وەك پێڕست و نموونەیەکی لێ هاتووە بۆ گشت جۆرەکانی ئەو نیعمەتانەی کە لە گەنجینەکانی میهرەبانیی خوای گەورەدان.

ئەرکی دووهەم:

ئەم ئەرکە لەوەدایە کە: "گوفتاری خواوەند" ئاراستەی مرۆڤ کراوە، لەبەر ئەو تایبەتکاری‌یە گشتی‌یانەی کە لەودا دانراون و کردوویانە بە شایستەی ئەوەی ئاراستەکراوی گوفتاری خواوەند بێت و، ڕێزی شایان لە سنعەتە ناوازەکانی بنێت و سەری لێیان سوور بمێنێت و، بە هەست و شعوورێکی تەواو، شوکرانە و ستایش و سوپاسگوزاری لەسەر جۆرەکانی ئەو نیعمەتە زۆرانەی لە بەردەمی‌دا ڕاخراون، پێشکەش بکات!

ئەرکی سێ‌هەم:

بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ بە "ژیانی خۆی" ئەرکی: "ئاوێنە"ی دەرخەری کاروبارەکانی خواوەندی "حەیی و قەییووم" و، سیفەتە مەزنە گشتگیرەکانی ڕادەپەڕێنێت. ئەمەش لە سێ ڕووەوە:

ڕووی یەکەم:

هەستکردنی مرۆڤە بە "توانستی ڕەها"ی بەدیهێنەری خۆی و پلە بێ سنوورەکانی ئەو توانستە، بەهۆی ئەو "دەستەوسانی"یە ڕەهایەی کە لە خۆی‌دا هەستی پێ دەکات! ئەوەتا مرۆڤ لە ڕێی پلەکانی ئەو "کۆڵەواری و دەستەوسانی"یەی کە لە خۆی‌دایە، لە پلەکانی ئەو "توانست"ە ڕەهایەی بەدیهێنەر تێ دەگات و.. بە "هەژاری"یەکەی خۆیشی پەی بە پلەکانی "میهرەبانی"یە فراوانەکەی بەدیهێنەری دەبات و.. بە "لاوازی"یەکەشی لە "هێز"ی مەزنی بەدیهێنەری دەگات... هتد.

بەم جۆرە، مرۆڤ بەو سیفەتە کەموکورت و ناتەواوانەی کە لە خۆی‌دا هەستیان پێ دەکات، ئەرکی ئاوێنەیەکی قیاسیی بچووك دەبینێت بۆ تێگەیشتن لە سیفەتە کاملەکانی بەدیهێنەری. چونکە هەروەك "تاریکی" تا چڕوپڕتر بێت زیاتر "ڕووناکی"ی تێدا درەخشان دەبێت و ئەو تاریکی‌یە ئەرکی پیشاندانی چرا و گڵۆپەکان زیاتر ڕادەپەڕێنێت.. مرۆڤیش بە هەمان جۆرە، چونکە بە سیفەتە تاریك و ناتەواوەکانی، ئەرکی پیشاندانی کەماڵاتی سیفەتەکانی بەدیهێنەری خۆی ئەنجام دەدات.

ڕووی دووەم:

پاشان ئەو: ویستە جوزئی و، زانستە کەم و، توانستە بچووك و، مولکایەتی‌یە ڕواڵەتی‌یەی کە لە مرۆڤدایە و ئەو قابلییەتەش کە هەیەتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی ماڵەکەی بە دەستی خۆی، وا لە مرۆڤ دەکەن کە بەم سیفەتە جوزئی‌یانەی خۆی، بەدیهێنەری مەزنی گەردوون بناسێت و، لە: مولکایەتیی فراوان و، وردەکاریی مەزن و، ویستی فراوان و، توانستی زاڵ و، زانستی هەمەلایەنگیری ئەو بەدیهێنەرە تێبگات و، بزانێت کە هەموو یەکێك لەو سیفەتانەی خواوەند: گەورە و، ڕەها و، بێ سنوور و، بێ کۆتایین. مرۆڤ بەم جۆرە، ئەرکی ئاوێنەیەکی بچووك دەبینێت بۆ دەرخستنی ئەو سیفەتانە و تێگەیشتنی لێیان.

بەڵام ڕووی سێهەم لەوەی کە مرۆڤ ئەرکی ئاوێنەی دەرخەری کەماڵاتی سیفەتە خوایی‌یەکان ڕادەپەڕێنێت، دوو ڕووخساری گرتووەتە خۆ:

ڕوخساری یەکەم: بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ: "ناوازەیی" و "درەوشانەوە" جیاجیاکانی ناوە جوانە جۆراوجۆرەکانی خوای گەورە، لە خودی خۆیدا دەربخات. چونکە مرۆڤ، لەبەر سیفەتە گشتی‌یەکانی، وەکو نموونە و پێڕستێکی پوخت و بچووکی سەرانسەری گەردوون وایە. بۆیە دەبینین ئەو درەوشانەوانەی کە هی ناوە جوانەکانی خوای گەورەن و، بە سەرتاسەری گەردوونەوە دەبینرێن، بە پێوەرێکی بچووکتر لەم مرۆڤەشدا دەرکەوتوونەتەوە.

ڕوخساری دووهەم: بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ ئەرکی ئاوێنەی دەرخەری کاروبارە خوایی‌یەکان دەبینێت. واتە هەروەك مرۆڤ بە ژیانی خۆی ئاماژە بۆ ژیانی خواوەندی "حەیی و قەییووم" دەکات، بەهۆی هەستەکانی: بیستن و بینین و هاوچەشنیان لەو هەستانەی کە لە ژیانی زاتیی خۆیدا دەردەکەون، لە سیفەتی "بیستن" و "بینین" و سیفەتە مەزن و ڕەهاکانی تری خواوەندی "حەیی و قەییووم" تێدەگات و بۆ کەسانی تریشیان ڕوون دەکاتەوە.

پاشان ئەم مرۆڤە گەلێ هەست و نەستی تابلێی ورد و زۆر و زەبەندەی هەیە، کە لەوانەیە لە ناوەندی ژیانی‌دا دەرنەکەون، مەگەر لەو کاتانەدا کە دەهەژێنرێت ئەو هەست و نەستانەی بە چەند شێوە و ئینفیعالێکی جۆراوجۆر دەربکەون.

جا مرۆڤ بەهۆی ئەم هەستە ورد و واتا قووڵانەوە، ئەرکی پێش‌چاو خستنی کاروبارە زاتی‌یەکانی خواوەندی "حەیی و قەییووم" ڕادەپەڕێنێت. بۆ نموونە: مرۆڤ بە

واتاکانی: خۆشەویستی و، شانازی و، ڕەزامەندی و، شادمانی و، خۆشحالّی و، واتا هاوچەشنەکانی تریان کە لە چەند دۆخ و حالّەتێکی تایبەتیدا لای مرۆڤ بە وێنەی کانیاو دەتەقێنەوە، ئاماژە بۆ ئەم جۆرە کاروبارە خواییيانە دەکات بە چەشنێك کە لەگەلّ قودسییەتی زاتی خواوەند و دەولّەمەندییە ڕەهاکەیدا بگونجێت و شایانی بێت.

پاشان هەروەك مرۆڤ بەهۆی جامیعییەتی ژیانیەوە: یەکەیەکی پێوانەیە بۆ ناسینی سیفەتە مەزن و کاروبارە حەکیمەکانی خواوەند و.. پێڕستێکە بۆ ناوە جوانەکانی و.. ئاوێنەیەکی خاوەن هەستە – لە چەند ڕوویەکەوە – بۆ زاتی خواوەندی "حەیی و قەیيووم".. بە هەمان جۆر، یەکەیەکی پێوانەشە بۆ ناسینی ڕاستییەکانی ئەم گەردوونە و، پێڕست و پێوانە و تەرازوویەکە بۆی..

بۆ نموونە: بەلّگەی گومانبڕ لەسەر بوونی "لوح المحفـــوظ" لە گەردووندا لە نموونە بچووکەکەی ئەو "لوح المحفوظ"ەدا بەرجەستەیە، کە: "هێزی پاریزکار" یان "ذاکرة"ی مرۆڤە.. بەلّگەی بێ گومانیش لەسەر بوونی "جیهانی میسال"، ئەو نموونە بچووکەیەتی کە لە خۆماندا هەستی پێ دەکەین و بریتییە لە "هێزی ئەندێشـە"ی مرۆڤ[1].. بەلّگەی گومانبڕیش لەسەر بوونی "ڕۆحانییات" لە گەردووندا، ئەو نموونە بچووکەیەتی کە لە خۆماندایە و بریتییە لە: "لایەنە ناسك" و "هێزەکان"ی مرۆڤ.

بەم جۆرە، مرۆڤ دەبێت بە: پێوەرێکی بچووك و، ڕاستییەکانی ئیمان لە گەردووندا تا پلەی "شهوود" پێش چاو دەخات.

جگە لەمانەش کە باسمان کردن، مرۆڤ گەلێ کارمەندی و ئەرك و خزمەتگوزاریی تری لە ئەستۆدایە. چونکە مرۆڤ: ئاوێنەی تیادەرکەوتنی "جوانی"ی باقییە و.. جاڕدەر و دەلاّلی "کەمالّ"ی سەرمەدییە و.. موحتاجی شوکرانەبژێرە بۆ نیعمەتەکانی "میهرەبانی"ی فراوانی هەمیشەیی..

---

(١) بەلّێ، هەروەك تۆخمەکانی مرۆڤ ئاماژە بۆ تۆخمەکانی گەردوون دەکەن و، ئێسکەکانیشی پەنجە بۆ بەردەکانی ئەو ڕادەکێشن و، مووەکانیشی ئاماژەن بۆ ڕووەك و درەختەکانی و، خوێنی ناو جەستەی و ئەو شلەمەنییە جیاوازانەش کە لە چاو و لووت و دەمیەوە دەردەچن، هەوالّی سەرچاوە و کانی و ئاوە کانزاییيەکانی زەوی ڕادەگەیەنن.. بەهەمان جۆر، گیانی مرۆڤ هەوالّی جیهانی "گیانەکان" دەدات و، زاکیرەشی هەوالّی "لوح المحفوظ" ڕادەگەیەنێت و، هێزی ئەندێشەیشی هەوالّی جیهانی میسالّی دەداتێ. بەم جۆرە هەریەك لەم ئەندام و ئامێرانە هەوالّی یەکێك لەو جیهانانە ڕادەگەیەنێت و شایەتییەکی گومان لێ نەکراوی لەسەر دەدات.(دانەر)

جا مادام "جوانی" باقی‌یە و.. "کەماڵ" سەرمەدی‌یە و.. "میهرەبانی"ش هەمیشەیی‌یە، ئەوا ئەم مرۆڤەی کە ئاوێنەی تاسەمەندی ئەو جوانی‌یە باقی و.. جارِدەری شەیدای ئەو کەماڵە سەرمەدی و.. موحتاجی شوکرانە بژێری ئەو میهرەبانی‌یە هەمیشەیی‌یەیە، دەبێ رەوانەی خانەی مانەوەی هەمیشەیی بکرێت، تاکو بۆ هەتاهەتایی تیای‌دا بمێنێتەوە و، دەبێ بڕوات بۆ "ئەبەد" تاکو لەوێ ببێت بە هاوڕێی هەتاهەتایی و ئەبەدیی باقی‌یە هەمیشەیی‌یەکان و، هاودەمی ئەو جوانی‌یە باقی و.. کەماڵە سەرمەدی و.. میهرەبانی‌یە هەمیشەیی‌یە! تەنانەت ئەمە گەلێ پێویستە، چونکە "جوانیی ئەبەدی" هەرگیز بە: موشتاقی فانی و خۆشەویستی لەناوچوو ڕازی نابێت! نابینیت "جوانی" هەروەك خۆی خۆش دەوێت، داوای خۆشویستنیش دەکات؟ خۆ "فەنا" و "نەمان" ڕێ لەو خۆشویستنە دەگرن و دەیگۆڕن بە ڕق و دوژمنایەتی!

جا ئەگەر مرۆڤ کۆچ بەرەو ئەبەد نەکات و بە هەمیشەیی تیای‌دا نەمێنێتەوە، ئەوا دوژمنایەتی‌یەکی توند و تیژ لە سروشتی‌دا سەر هەڵدەدات، لەبەر ئەو خۆشەویستی‌یە قووڵەی هەیەتی بۆ "جوانیی سەرمەدی" کە نهێنی‌یەکە لە سروشتی‌دا جێگیر کراوە. وەك لە پەراوێزی وتەی دەهەمدا ڕوونمان کردەوە کە: ئافرەتێکی لەڕادەبەدەر جوان یەکێك لە شەیداکانی لە کۆڕی تایبەتی خۆی‌دا دەرکرد و، یەکسەر "عیشقی جوانی" لە لای ئەم شەیدا دەرکراوە گۆڕا بە "ناشیرینی" و "ڕق". تەنانەت دڵی خۆی بەوە دایەوە کە وتی: "دەك ئەولاتر بچێت! چەندە ناشیرینە"! بەمەش ئینکاری و ڕقی خۆی بەرامبەر بەو جوانی‌یە دەربڕی!

بەڵێ، هەروەك مرۆڤ دوژمنایەتیی ئەو شتانە دەکات کە نایانزانێت، دەشچێت بە دوای ناتەواوی و کەموکوڕی لەو شتانەدا دەگەڕێت کە دەستی نایانگاتێ و ناتوانێت بیانگرێت و پارێزگاری‌یان بکات! تەنانەت لەم گەڕانەشی بە دوای ناتەواویی ئەو شتەدا: ڕق و دوژمنایەتی لە دڵدا هەڵدەگرێت، بەڵکو دەشچێتە دۆخی جۆرە دوژمنایەتی‌یەك لە بەرامبەریەوە.

جا مادەم سەرانسەری "گەردوون" شایەتی دەدات لەسەر ئەوەی کە: مەحبووبی ڕاستەقینە و خاوەن جوانیی ڕەها، لە ڕێی هەموو ناوە جوانەکانیەوە، خۆی لە لای مرۆڤ خۆشەویست دەکات و، بەرامبەر بەمەش داوای خۆشەویستی‌یەکی گەورەی بۆ خۆی لێ دەکات.. ئەوا هەرگیز ئەم خواوەندە کارێك ناکات کە مرۆڤی خۆشویستراو و خۆشەویستی خۆی ڕقی لێی ببێتەوە و، بە نەهێنان و بەرپا نەکردنی

قیامەت شتێکی ئەوتۆ لە سروشتی مرۆڤدا دابنێت کە دوژمنایەتیی بەرامبەر بە خواوەند تێدا بهەژێنێت و، هەرگیز شتێکی تەواو پێچەوانەی سروشتی مرۆڤ وەك "دوژمنایەتیی نادیار و پەنهان" لە سروشتی ئەم بەدیهاتووە ڕێز لێگیراوە تایبەتمەندەی‌دا دانانێت، کە خۆشویستراوی پەروەردگاری میهرەبانە و هەر لە بنەڕەتدا بۆ پەرستنی ئەو بەدی‌هێنراوە. هەروەك ناشگونجێ خواوەند ڕقەبەرایەتی کردنی خۆی لە ئەستۆی گیانی مرۆڤ بنێت، چونکە مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ئەو برینە بەسۆ و زامە قووڵەی ساڕێژ بکات کە ئەنجامی: جودایی و لێکبڕانی هەتاهەتایی‌یەتی لەو جوانی‌یە ڕەهایەی کە خۆشی دەوێت و نرخی دەزانێت، مەگەر بە: دەربڕینی دوژمنایەتی بەرامبەری.. یان بە ڕق لێ بوونی.. یان ئینکاری کردنی. هەر لەم گۆشەیەوەیە کە: کافران بە "دوژمنانی خوا" دانراون!!

لەبەر ئەمە، ئەو جوانی‌یە ئەزەلی‌یە – بە حەتمی – مرۆڤی ئاوێنەی موشتاق و تاسەمەندی خۆی، بۆ ڕێی هەتاهەتایی ڕەوانە دەکات، تاکو هاودەمی ئەو جوانی‌یە ڕەها و مانەوە و هەمیشەیی‌یە بێت و، بێ هیچ گومانێکیش ژیانێکی باقیی لە خانەیەکی باقی و هەمیشەیی‌دا پێ دەبەخشێت!

ئنجا مادەم مرۆڤ بە سروشت موشتاقی جوانی‌یەکی باقی‌یە و، هەر کە بەدی هێنراوە ئەو جوانی‌یەی خۆشویستووە و.. "جوانیی باقی"ش بە موشتاقی فانی ڕازی نابێت و.. مرۆڤیش ئازار و خەمەکانی خۆی، کە ئەنجامی ئەو شتانەن دەستی پێیان نەگەیشتووە یا نەیتوانیوە پارێزگاری‌یان بکات یان نەیانی زانیوە، بەوە دادەمرکێنێت کە بە دوای ناتەواوی‌دا بگەڕێت تیایاندا، یان دوژمنایەتی‌یەکی پەنهانیان لە بەرامبەرەوە هەڵبگرێت و، دڵی خۆی بەم دوژمنایەتی‌یە بداتەوە و..

مادەم گەردوونیش لەبەر ئەم مرۆڤە و، مرۆڤیش بۆ ناسین و خۆشویستنی خواوەند بەدی هێنراوە و..

مادەم ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری گەردوونیش سەرمەدین و درەوشانەوەکانیشی باقی و بەردەوامن..

ئەوا دەبێ ئەم مرۆڤە ڕەوانەی خانەی مانەوە و هەمیشەیی بکرێت و، ژیانێکی باقی و بەردەوام بەدەست بهێنێت!

جگە لەمە، پێغەمبەری خۆشەویست و مەزنیش ﷺ کە: مرۆڤی تەواو کامڵ و، بەڵگەی هەرە گەورەیە لەسەر بوونی خواوەند، هەموو ئەو کەماڵات و نرخ و بەها و

گرنگی و ڕەوشتە ئادەمی‌یانەی باسمان کردن، تێکرا لە خۆی و ئایینەکەیدا بە ڕوونترین و کاملترین شێوە، دەرخستووە. ئەمەش بۆمان دەبێت بە بەلگە لەسەر ئەوەی کە هەروەك بوونەوەران لە پێناوی مرۆڤدا بەدیهێنراون، واتە مرۆڤ ئامانجی هەرە گەورەی بەدیهێنانی بوونەوەران و هەلبژاردەی نێوانیانە، ئەوا مەزنترین ئامانج لە بەدیهێنانی مرۆڤدا و، باشترین هەلبژاردەی نێوانیان و، تەنانەت جوانترین و درەخشانترین ئاوێنەی خواوەندی تەنیا و صەمەد، تەنها: حەزرەتی محەممەدە.. علیه وعلى آله وأصحابه الصلاة والسلام بعدد حسنات أمته!

فيا الله، يا رحمان، يا رحيم، يا فرد، يا حيّ، يا قيّوم، يا حَكَم، يا عدل، يا قدوس!

نسألك بحق فرقانك الحكيم و بحرمة حبيبك الأكرم ﷺ وبحق أسمائك الحسنى و بحرمة إسمك الأعظم، أن تحفظنا من شر النفس والشيطان ومن شر الجنّ والإنسان. آمين.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ ما عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الحَكِيمُ﴾.

* * *

# بریسکەی سی و یەکەم

ئەم بریسکەیە دابەش بوو بەسەر "تیشکەکان"دا. بە پشتیوانیی خوا لە بەرگێکی سەربەخۆدا بلاو دەکرێتەوە

# بریسکەی سی و دووهەم

## چەند بریسکانەوەیەك

### لە نێوان هەردوو مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان و جەژندا

**چەند گوڵێکن کە لە ناوك و تۆوی حەقیقەتەکانەوە دەمیان پشکوتووە و، دیوانێکی شیعری ئیمانی‌یە بۆ قوتابییانی نوور**

**ڕوونکردنەوەیەك:**

ئەم دیوانەی کە ناوی "لوامع"ی لێ نراوە، وەك دیوانەکانی تر لەسەر یەك ڕەوت و یەك شێواز ناڕوات، چونکە دانەری بەڕێز لەم دیوانەدا وتە ڕەوان و پوختەکانی دانراوێکی کۆنی خۆی ڕوون کردووەتەوە و لێکی‌داوەتەوە کە ناوی: "ناوکەکانی حەقیقەت"ە. ئنجا لەبەر ئەوەی بە شێوازی پەخشان نووسراوە و، جگە لەمەش جڵەو بۆ ئەندێشە شل ناکات و، هەست و نەستە بێ تەرازووەکانیش ناکات بە بناغەی باسەکانی، ئەوا – ئەم دیوانە – تەنها ئەو ڕاستی‌یانەی تێدا جەم کراون کە بە تەرازووی مەنتیق و ڕاستی‌یەکانی قورئان و ئیمان کێشراون و هەڵسەنگێنراون و، لە ڕاستی‌دا وانەیەکی زانستی، بگرە دەرسێکی قورئانی و ئیمانی‌یە کە دانەرەکەی بە برازاکەی خۆی و هاووێنەی ئەوی وتووەتەوە کە لەو دەمەدا دەرس و ڕێنمایی‌یان لێ وەردەگرت.

مامۆستای بەڕێزمان لە ڕێژنەی ئایەتی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ﴾ (یس:٦٩) بەهرەمەند بووە و بەو ڕێچکەیەدا هەنگاوی ناوە.. لەبەر ئەوە، ئارەزووی لە هۆنینەوە و وتنی شیعر

نەبووە و، هیچ کاتێکی خۆی پێوە خەریك نەکردووە، هەروەك خۆی لەو بێدارییەی سەرەتای کتێبەکەدا ڕوونی کردووەتەوە و ئێمەش بۆ خۆمان پەیمان بەم ڕاستییە بردووە.

ئەم دیوانی پەخشانە شیعرە، لە ئەنجامی هەوڵێکی سەروەر و، تەنها لە ماوەی بیست ڕۆژدا، کە هەموو ڕۆژێك دوو سەعات یان دوو سەعات و نیوی دەخایاند، نووسراوە و دانراوە! هەرچەندەش دانەر لەو دەمەدا گەلێ کار و ئەرکی مەزن و گرنگی "دار الحكمة الاسلامية"ی لە ئەستۆدا بووە. جا دانانی کتێبێکی بەو جۆرە لە ماوەیەکی یەکجار کورت و کەم خایەندا، وێڕای سەختیی نووسینی یەك لاپەڕەی هۆنراو کە بە ئەندازەی دە لاپەڕەی پەخشان قورسە و، سەرباری ئەوەش کە بە چەشنێکی سروشتی واتاکان بۆ دڵی هاتوون و پاشان دەستکاری نەکردنی ئەو ڕەوتە سروشتییەش بۆ مەبەستی لە چاپدانی.. هەموو ئەمانە، وامان لێ دەکەن کە ئەم دیوانە بە یەکێك لە کارە دەراساکانی "پەیامەکانی نوور" دابنێین و، هیچ دیوانێکی تری شیعر شك نابەین کە بە وێنەی ئەم دیوانە بتوانرێت بە ئاسانی و بێ تەکەللوف لە شێوەی پەخشاندا بخوێنرێتەوە.

لە خوا داواکارین ئەم کتێبە بەنرخە وەك مەسنەویی مەولانای ڕۆمی لێ بکات بۆ قوتابییانی نوور. چونکە پوختە و کورتەیەکی بەپێز و بەهاداری پەیامەکانی نوورە و لە حوکمی پێڕستێکدایە مژدەی هاتنی ئەو پەیامانەی پێیە کە پاش تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر نووسینی ئەم دیوانەدا هاتنە گۆڕێ و، لە ماوەی بیست و سێ ساڵی ڕەبەقدا بە تەواوی و کاملی کەوتنە بەردەستی خوێنەران.

لە قوتابییانی نوور:
صونگور، محەممەد فەیزی، خەسرەو

**بێدارکردنەوەیەك**[1]:

لەم دیوانەدا ڕێزی شایانم لـە "هۆنـین" و "سـەروا" نـەناوە، چونکـە شـارەزایان نیـم و، وەك وتراویشە: (مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت)!

نەیشم ویست وێنە و شێوەی "ڕاستی" بگۆڕم تاکو لەگەڵ ئارەزووی سەروا(قافیـە)دا بگونجێ، بە چەشنی "بەختکردنی صافیە لە پێناوی قافیە"دا[2]! هـەر بۆیـە لـەم کتێبـە دوور لە "هۆنـین" و "سـەروا"یـەدا بێ کـەڵکترین پۆشـاکم کردووەتـە بـەر لەشـولاری بـەرزترین "ڕاستی"! چونکە:

**یەکەم:**

من لەمە باشتر نازانم. لەبەر ئەوە، بیری خۆم بە چڕی تەنها ئاراستەی واتاکان دەکرد، نەك وشە و ڕووی ڕواڵەتی..

**دووهەم:**

ویستم، بەم شێوازە، ڕەخنەی خـۆم بەرامبـەر بـەو شـاعیرانە دەربـبڕم کـە لـە "جەستە" دادەتاشن تاکو لەگەڵ "بەرگ و پۆشاك"دا بیگونجێنن!

**سێهەم:**

ویستم لەم مانگی ڕەمەزانە پیرۆزەدا بـە چەشـنی "دڵ"م، "دەروون"یشـم بـە ڕاستی‌یە بەرز و بڵندەکانەوە سەرقاڵ بکەم..

لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە، لەم دیوانەدا ئـەم شێوازە هـەڵبژێررا کـە لـە شێوازی ئـەو کەسانە دەچێت لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی شیعر نووسیندان!

بەڵام خوێنەری بەرێز!

ئەگەر من هەڵەم کردبێت - کە دان بەو هەڵەیەشمدا دەنێـم - نەکـەی تۆش بـە هەڵـەدا بچیت و سـەیری شێوازە شڕ و شێواوەکەم بکـەیت و، سـەرنج لـە ڕاستی‌یە بڵندەکـانی ناوی نەدەیت و، بە کەم و ناتەواویان ببینیت!

---

(١) تێبینی: ئەم دیوانە لـە پەخشـانچووە، دواهـەمین دانراوەکـانی "سـەعیدی کـۆن"ە و، لـە سـاڵی ١٣٣٧ (١٩٢١ز) لە چاپی داوە و بڵاوی کردووەتەوە. ئنجا پاش دانان و بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور وەسـێتی بۆ قوتابییـانی کـردووە کـە ئەم دیوانە - دوای کـەناردانی چـەند بڕگەیـەکی - بخەنـە کۆتـایی کۆمەڵـە پـەیامی "وتەکان"ەوە. پاشان لە سەرەتای ساڵەکانی پەنجادا چەند پەراوێزێکی نوێی بۆ دانا و فـەرمانی دا بـەم شێوەیەی ئێستای بڵاو بکرێتەوە. (وەرگێڕی چاپە عەرەبی‌یەکە)

(٢) پەندێکی تورکی‌یە. دەڵێن پیاوێك خەریکی دانانی شیعرێك بوو، ڕستەیەکی لە شیعرەکەدا بەکارهێنا کە تەڵاقی (صافية)ی هاوسـەری پێ کەوت و لە پێناوی (قافیـــــة)دا خێزانەکەی بەخت کرد! (وەرگێڕی چاپە عەرەبی‌یەکە).

